ناوی کتێب:ئۆدیسه/ هۆمیرۆس

*-بابەت: داستان

*-پێشەکی وپاچڤە: حەمەکەریم عارف

*-دەرهێنانی هونەری: زانا کمال

*-پیتچنین: رزگار حەساری

*-هەڵەچن:زنار محەمەد

*-چاپخانە:شڤان

*-چاپی یەکەم:٢٠١١

*-وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان-بەرێوەبەرایەتی خانەی وەرگێڕان

پێشکەشە بە :

١-سەرگوڵ محمد امین

٢-کارۆ

# سەرنجێکی پێویست

لە رۆژی (٢٠١٠/١٢/١٥) لە شاری سلێمانی لە وەرگێڕانی ئەم داستانە بوومەوە. کە لەم سەرچاوانەوەی خوارەوە وەرمگێڕاوە. هەموو ئەم سەرچاوانەم پەرەگراف بەپەرەگراف لەبەریەك گرتووە، لەهەر شوێنێکدا کامیان لەگەڵ ڕەوتی گشتی دەقەکەدا گونجاوتر هاتبێتە بەر مەزەندە و تێگەییشتنی بەندە، ئەوەیانم کردووە بەبناخە. بەهەرحاڵ کارەکەی من کارێکی بەراوردکارانەیە. بۆیە پەرەگرافی وام هەیە هەر دەستەواژە و ڕستەیەکی لە یەکێك لەو سەرچاوانەوە وەرگێڕدراوە.. هەڵبەتە ئەو سەرچاوانە ئەگەر لە هێڵە گشتییەکاندا تێکبکەنەوە، ئەوا لە وردەکاری وپاژاندا جیاوازی زۆریان هەیە. کە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی زمانی

ئـەو سەرچـاوانەی کارەکـەیان لێـوە وەرگێـڕدراوە لەلایـەك و بـۆ جیـاوازی شـێواز وداڕشـتن و دەوڵەمەندی و هەژاری فەرهـەنگی زمانـەوانی هـەر یـەکێك لـە وەرگێـڕە بـەڕێزەکان. بەهـەرحاڵ من مەبەستم نەبووە خوێنـەری کورد فێـری عـەرەبی یـا فارسـی بکـەم، بۆیـە خـۆم لـە وەرگێڕانـی وشـە بەوشـە دوورگرتـووە و ئـەم کـارەم بـەو ئاوایـە کـردووە، زۆر بەدرەنگـەوە وەڵامـی ئـەم پرسـیارەم داوەتەوە: بۆچی تائێستا شاکارێکی وەکو ئودیسە نەکراوە بەکوردی؟

بەئومێدم لەڕیزی وەرگێڕانەکانی دیکەدا جێی ببێتەوە ،دەنا ماڵی قەڵب سەری ساحێبی..

چونکە هەرکەسێکی ئەهلی قەڵەم بەتەمای ستایش وئافەرین ودەستخۆشی بێ، بەتایبەتی لە کۆمەڵگا پاشکەوتووەکاندا کە مەخابن کوردستانی ئێمە لەوەشدا هەر قڕەیە، ئەوا وەرگێڕ نابێ چاوەنواری ئەمە بێ، وئەگەر سەرزەنشت نەکرێ و بەر تانە وتەشەران نەدرێ دەبێ مەمنونی بەختی خۆی بێ.. بەهەرحاڵ ئەمە سەرچاوەکانی لەمەڕ وەرگێڕانە بەراوردکارییەکەی بەندەیە:

*- اودیســه هــومیروس/الترجمــه الکاملــه عــن الاصــل الیونــانی/ط٢-منقحــه ومزیــده(١٩٧٧-١٩٧٨)دارالفکر العربی/امین سلامه

*- درینی خشبه/الاودیسه/لشاعرالخلود هومیروس/دارالعوده-بیروت/٢٠٠٥

*- سلسله الملاحم:هومیروس/الاودیسه/ترجمه حنا عبود/دارالحقائق/٢٠٠٧

*- اودیسه/هومر/مترجم:سعید نفیسی/چاپ شانزدهم/١٣٨٥/شرکت انتشارات علمی وفرهنگی

*- ادیسه/هومر/ترجمەی میر جلال الدین کزازی/نشر مرکز/چاپ پنجم/١٣٨٥

## پیشەکی

### حەمەکەریم عارف

"١"

ئیلیادەو ئۆدیسە دوو شاکاری داستانی کۆنی یۆنانین ودراونەتە پاڵ شاعیرێکی کۆن ونابینـای یونـانی بـە نێـوی هـۆمیرۆس کـە مشـتومڕو چەندوچـوونێکی یـەجگار فـرەی دەربـارە هەیـەوتا رۆژگاری ئەمرۆش بەردەوامە.بەهەرحاڵ چەندوچوون وبیروباوەڕو بۆچوونەکان چەند زۆرو چەند جیاوازبن،بە تۆزقاڵێش لەو حەقیقەتە ناگۆڕن کـە دوو دانـە گەوهـەری دانسـقە بـە نێـوی (ئیلیـادەو ئودیسـە) گەییونەتـە دەسـتی خـەڵکی ئـەم سەردەمەوپەساپۆرتی ئـەم گەشـتە دوورو درێژەشـیان

تەنیا هونەریەتی خۆیان بووە،جا خوای دەکرد لەبنی خاوەنیان نەدەبوو.چونکە ئەوەی بۆ خوێنەر گرینگە دەقی داستانەکانە وەکو چۆن هەن،نەك هۆنەرو شاعیرەکەیان.بەگوێرەی بۆچونی شارەزایان ئەم دوو داستانە دەگەڕێنەوە بۆ ساڵی ٨٥٠پ.ز..بەهەرحاڵ وەکو دەگوترێ شاعیری ناڤبری سەر بە تیرەی ئیونی بووە،لە سیمیرناهاتووەتە دنیا،لە شیوس ژیاوە ولە لوس کۆچی دوایی کردووە.

**

وشەی ئیلیادە بە مانای واریقات وسەربهوردو بەسەرهاتی(ئیلوس)ـە.هەڵبەتە دەبێ ئەوە بگوترێ کە جەنگی تەروادە،تەوەرەو تانوپۆی هەردوو داستانەکە پێکدێنێ.ئیلیادە بریتییە لە چیرۆکی تۆران وتوڕەبوونی ئەخیل،کە لە پشت چیرۆکی گەمارۆی تەروادەوە دێتە گێڕانەوە.واتە گێڕانەوەی چیرۆکی گەمارۆی تەروادە زیاتر بۆ بەرجەستە کردنی چیرۆکی تورەبوون وتۆرانەکەی ئەخیلە.ئەخیل کاراکتەرێکی سەرەکییە:گەنجێکی گەڕناس وجوانخاس و بەهێزوتوانایە.لە شەڕا بوێرو چاونەترس وکەڵەمێردە.هیچ جەنگاوەرو شەڕڤانێکی یۆنانی هاوتای ناکاتەوە.بوونی لە مەیدانی شەڕا،بە بێ چەکیش،مایەی نیگەرانی وترسی تەروادەییەکانە.کەسێکی بە دەم وزمان وقسە زانە.کەسایەتییەکی زۆر کاریگەرو ئیجابییە،عەیبی سەرەکی ئەوەیە کە توندەتەبیعەت ودڵناسك وزوو ڕەنجە،لێ وێرای ئەوەش سەرپێچی لە فەرمانی خواوەندان ناکات..بۆ نموونە کە لێدەبرێ ئاگامەمنوون بکوژێت، ئەتینا داوای لێدەکات کاری وانەکات.ئەویش یەکسەر بە گوێی دەکات وشمشێرەکەی دەخاتەوە کێلان.

**

ئودیسیوسی شا قارەمانی ئودیسەش،کاراکتەرێکی نموونەیی و ئایدیالییە،هەرچەندە لە مرۆڤی ئاساییەوە نزیکە.بە هەمان گەنجی و جوانی ئەخیل نییە،هەمان قۆزی و بەژن و بالأو جورئەتی ئەدەبی ئەخیلی نییە.بەلأم بە دەم و زمان وقسە زانە،کە دێتە قسە وشە وەکو نمەباران لە زارییەوە دەبارێت وبە جۆرێ کار لە گوێگران دەکات،کە شێوەو روخساری لە بیردەکەن.لە گەنگەشەوموناقەشەدا زۆر بە زەین وکارامەو لێزانە. بۆ نموونە کە لەگەڵ نوسیکادا دەدوێ لە تۆ وایە لە جیاتی وشە گوڵ لە زاری دەبارێت.یان چەند لێزانانە وچەند بە مەعلانی پولیفیمۆس لە خشتە دەبات!پیاوێکی یەجگار زیتەڵ وچەلەنگ وچالاکە،زۆر ئازایە، خۆراگرە،پشوو درێژە،لە بەردەم هەر بەلأیەکدا کە خواوەندان بەسەریا دەدەن بەسەبرە. زۆر زیرەکانە خۆی لە تەنگانەو ئاستەنگ وسەختی ودژواریان دەپەڕێنێتەوەو دەربازدەکات.قارەمانێکی یەجگار ئازایە.بەلأم هەندێجار بێباك وخەمساردو کورتبینە کە چاوەروانکردنی گەڕانەوەی پۆلیفیموس بۆ ئەشەوتەکەی نموونەیەکی ئەو حاڵەتەیە.بەلأم ئەم خاڵە لاوازانەی لێ جوانە..بە شێوەیەکی گشتی فریوی هیچ ئیغراو تەماحێکی حسی ناخوات وبە درێژایی ساڵانی ئاوارەیی ودەربەدەری هەر بیری لە لای نیشتمانەو بەو هەوایە دەژی کە لە وڵاتی خۆیەوە دێت، بەو یادو یادگارانەوە دەژی کە لەمەڕ زاگەو مەفتەنی خۆی هەیەتی وهەرچەندە ساڵانێکی زۆر دەگەڵ کالیپسودا دەمێنێتەوە،بەلأم ئەمەی لە ناچارییەو بە خوایشتی خۆی نییە.عەشقی وڵات وکەسوکارو پنلۆپی

ژنی به جۆرێ له ناخیا ریشاژۆ بووه،له پێناوی گەرانەوه بۆ وەلات،ژیانی جاویدانی و خوایانه رەفزدەكات.

ئیلیادەو ئودیسه، زیاتر تەرخانن بۆ وەسف وباسی بەسەرهات وكارێن قارەمانانەی هەردوو قارەمانی سەرەكی(ئەخیل وئودیسیوس)،بەلآم شاعیر هەوڵی ئەوەی نەداوه هەموو شتێكان دەرباره بهۆنێتەوه،بەڵكو بەشێكی دیاریكراوی له ژیانی هەر یەكێكیان وەرگرتووەو كردوویەتی به تیمەو بابەتی هەردوو داستانەكه.

له ئیلیادەدا تورەبوونەكەی ئەخیل و ئاكامەكانی ئەو تۆران وتوڕەبوونەی هونەراندووه.له ئۆدیسەدا گەڕانەوەی ئودیسیوسی بۆ وەلآتی خۆی له دوای كەوتنی شاری تەروادە،كردووه به بابەت.كار له هەردوو داستانەكەدا دیاریكراوه،سەرەتاو كۆتایی خۆی هەیه.رووداوه جۆراوجۆرەكان به شێوەیەكی زنجیرەیی و به دووی یەكتردا دێن.هەركارێك به شێوەیەكی ئاسایی،خۆی به كاری پاش خۆی دەسپێرێت،واته یەكێتییەكی ئۆرگانیكی تەواو له بویەروكارەكاندا هەیه.بەلآم ئەمه بەو مانایه نییه كه له رووی بونیادو رێختمانەوه هیچ عەیبێكیان نییه.به تایبەتی له ئیلیادەدا عەیبی پێكهاتەی بونیادی زەق بەدی دەكرێت.

ئەم دوو داستانه كۆنترین داستانن له مێژووی داستانانی ئەوروپاییدا،بوون به سەرچاوەو ئیهامبەخشی كۆمەڵێك داستانانی ئەدەبی،له سەردەم وقۆناغانی دواتردا.به تایبەتی ئنیادەی فەرجیل.لێ دەبێ ئەوه بگوترێ كه جیاوازی له نێوان ئەو دوو جۆره داستانەدا هەن.گرینگترینیان ئەوەیه كه داستانی ئەدەبی بۆ خوێنەر نووسراوه، بەلآم داستانەكانی هۆمیرۆس بۆ گوێگر هۆنراونەتەوه،بۆیه تایبەتمەندی زمانی زارەكیان بەسەردا زاڵه.

هەردوو داستانەكه،مەگەر به دەگمەن،دەنا له خەسڵەته گشتییەكاندا هاوبەشن:تیمەو بابەتی ئیلیاده جەنگ وشەڕە،زۆر درامییەو كۆتاییەكی تراجیدی هەیه.ئەفسوونی ئودیسه له ریسككاری و ژیانه كۆمەلآیەتییەكەیدایه،كۆتاییەكەی دوو لایەنی هەیه،سەبارەت به ئودیسیوس،كۆتاییەكی خۆشه،وسەبارەت به خوازگارەكان كۆتاییەكی ناخۆش وكارەساتباره. ریسكەكانی ئودیسیوس ئەفسووناوی وئەفسوون ئامێزن.ئامادەگی وحوزوری ژنان له ئودیسەدا زۆر چڕترو زیاتره تا له ئیلیادەدا.شاعیر له رێگەی بەرجەستەكردنی نوسیكاوه وێنەیەكی ئاشكرای ئازادی و دەنگ ودەورو شادمانی كیژێكی گەنجی سەردەمی پاڵەوانییەتی دەخاته روو.له كەسایەتی پنلۆپیدا نەك هەر وێنەی هاوسەرێكی دڵسۆزو ئەمەكدار دەنوێنێ،بەڵكو وێنەی ژنێكی زرینگ وپاك وسەلارو سەنگین و به وەج و به نموود نیشاندەدات.له كەسایەتی ئاریتی دا،ئەو رێزو حورمەته زۆره وێنه دەگرێت كه له ژنان دەگیرێت،وكاریگەریی ژن نیشاندەدات.

ئەوەی مایەی سەرنجه شاعیر بێلایەنانه داستانەكه دەگێرێتەوه،بەشی هەره زۆری گێرانەوەكانی به كاراكتەروقارەمانەكان سپاردووه.وكەسایەتییەكانی زیاتر له دیوی دەرەوه وەسف كردووه و دیوی ناوەوەیان پتر له رێگای كرداریانەوه بەرجەسته دەبێت.ئەگەر ویستبی رووداوێك یان كاراكتەرێك بەرجەستەتر بنوێنێ وكاریگەرتری نیشان بدات، پەنای بردووەته بەر

لێکچوون،لێکچـوونەکانی لــە جەرگــەی ژیــان وتەبیعەتــەوە هەڵبــژاردووە:مینــاکی ســتێرانی ئاسمان،زریـان،تۆف وکرێوە،شێرودڕندە،دێوودرنج،هەڵۆودالأشـان،شـەڕەژنی گـەرەك و بانان،یـان کچـۆڵەیەك کـە چـمکی داوێنـی دایکـی گرتبـێ..هەڵبەتـە ئـەم لێکچـوونانە تـەنیا بـە مەبەسـتی رازانەوەی هونەری بەکار نەهێناوە،بەڵکو بۆ ئەوەشە کە کاریگەری رەوتی داستانەکە زیاتر بکا.

ئاوێتەکردنی کارێن خوایی ومرۆڤانی لە تایبەتمەندیەکانی ئەم جووتە داستانەیە،رەنگە هەندێ کـەس پێیـان وابـێ ئـەم دیـاردەو تایبەتمەندییـە لـەزەتی خوێندنـەوە لای خوێنـەروگوێگر کـەم بکاتـــەوە،لێ وانییـــە.خوابـــانۆو خواوەنـــدەکانی هۆمیرۆس،راســـتە زۆر زۆر لـــە مـــرۆڤ بـــە تواناترن،وئـەوەی بـەوان دەکرێت،هـەرگیز بـە مـرۆڤ ناکرێت،بـەلأم لـە رووی کەسـایەتییەوە زۆر لـە بەشەر دەچن.واتـا خوابـانۆو خواوەنـدانی هـۆمیرۆس، لـە سەرانسـەری ئیلیـادەو ئۆدیسـەدا دێـن و دەچن،دەوردەبینن،بەشــــداری رووداوان دەکــــەن،پشــــتیوانی ئــــەم قارەمــــان و دژایــــەتی ئەویتردەکەن.رێنوێنی ئـەم دەکـەن وسـەر لـەو دەشـێوێنن،وتەنانـەت هەڵیدەخەڵەتێنن،بەلأم وێـرای ئەوەش کەسایەتی قارەمانەکان ناسڕنەوەو نابن بە بوکەڵەی بێوەج و بێنموود،وداستانەکە لەزەتە ئیستاتیکییەکەی خۆی لە دەست نادات و خوێنەروگوهدار لێی تەوەلا نابێت.

"٢"

ئۆدیســە بریتییــە لــە ســەربهوردو بەســەرهاتی ئۆدیســیوس،کە لــە دووی ئەخیل،مــەزنترین و بـەنێوبانگترین قارەمـانی یۆنانـە.یـەجگار زیـرەك وچـەلەنگ چالاك ولێزانـە.ئۆدیسـیوس،پاشـای ئەفســـانەیی ئیتاکایـــە،کوڕی لایرتیســـە،دایکـــی نێـــوی ئانتیکلیایـــە.ئۆدیســـیوس خـــەڵکی ئیتاکایە،هێشتا بابی لـە ژیانـدا بـوو کـە عەرشـی پاشـایەتی لێوەرگرت.پنلـۆپی کیـژی ئیکارۆسـی خواست وکورێکی لێـی بـوو بـە نێـوی تیلیمـاخۆس.ئۆدیسیوس بەرلـەوەی پنلـۆپی بێنێت،یـەکێك بـوو لـە خوازگـارانی هـیلین.ئـەو ژنـە جوانـەی کـە ڕفاندنەکـەی بـووە مایـەی هەڵگیرسـاندنی شـەڕی تەروادە.ئۆدیسیوس نایەوێ بچێتە شەڕی تـەروادەو بـۆ ئـەو مەبەسـتە خـۆی لـە شـێتی داوە.بـەلأم هەوڵەکـەی بێهـوودە بـووەو لـە ئەنجامـدا بـووە بـە یـەکێك لـە قارەمانـە هـەرە بەناوبانگـەکانی ئـەو شەڕە.پاش دە ساڵ،بە نەخشـەیەکی کاراو زیرەکانە،شاری تـەروادە،ئەو قـەلأ قایمـەی لـە بـەردەم یۆنانیەکاندا کردەوە:تەگبیری بۆ کـرد کـە ئەسـپە دارینەیـەکی گـەورە دروسـتبکەن وبـە خۆیـان بـە فیڵ پاشەکشە بکەن وئەسپەکە لە مەیداندا بەجێ بێڵن. ئازاترین شەڕڤانی یونـانی خۆیـان لـە نێـو سـکی ئەسـپە دارینەکـەدا مـەلأس دا،لەشـکری یۆنـان بـە درۆ کەوتـە پاشەکشـە،تەروادەییەکان،کە چاویان بەئەسپە دارینە کەوت،بە نوقلأنەی خێریان زانی،پێیان وابوو شـارەکەیان لـە وەیشـوومەو بـەلأیان دەپـارێزێ.ئیـدی بـە خۆشـحاڵییەوە وەکـو دەسـکەوتی شـەڕو نیشـانەی سـەرکەوتن رایدەکێشـن ودەیگەیەننـە ناوشـار،بەو جـۆرە شـەڕڤانانی یۆنـانی بـە ئاسـانی دەچنـە نـاو شـاری تەروادە. شـەوێ کـە خـەڵکی تـەروادە بـە خـەیاڵی خۆیـان،رزگاربوون،ئاهـەنگی ئـازادی شـارەکەیان دەگێـڕن وسـەرقاڵی ئاهـەنگ دەبن،شـەڕڤانانی یۆنـانی دەسـت بـە چـەك لـە ئەسـپەکە دێنـە دەرێ ودەرگـاوان وپاسـەوانەکان دەکـوژن.لەشـکرەکەیان کـە بـە فێـڵ پاشەکشـەی کردبوو،دەگەرێنـەوەو شەبەیخون دەکەنە سەر شاری تەروادەو دەکەونە تالأن و بڕۆوقەتڵ وعامی خەڵکەکە و وێرانکردن

وســــووتاندی شـــارەکەو ژنـــەکانیان بەســـــەر یۆنانییەکانـــدا دابـــەش دەکـــەن.دوای گرتنــــی تەروادە،ئودیسـسیوس ڕێـی گەڕانـەوە بـۆ ئـاخی ئیتـاك دەگرێتـە بـەر ودەشـت ودەریایـان تـەی دەکات،وئـــەم ســـەفەری گەڕانەوەیـــە دە دانـــە ســـاڵ درێـــژە دەکێشـــێت، ئودیســـیوس،ئاوارەو ســـەرگردان،ڕێی دەکەوێتـــە وڵات وشـــوێنانی جۆراوجۆر،تووشـــی ڕەنـــج ودەردو مەینـــەتی زۆر دەبێت.ئیدی چیرۆکی ئەم گەڕانەوەیە بووە بە هەوێن وتیمەو بابەتی داستانی ئودیسە کە بریتیە لە بیست وهەشت هەزاروهەشت سەد بەیت.ئەم داستانە بەسەر سێ بەشدا دبەش کراوە:

*- تیلیماخۆس(سەفەرەکانی تیلیماخۆس):ئەم بەشە لە سروودی یەکەمەوە تا سروودی چوارەم لە خۆ دەگرێت.تیلیماخۆس بۆ تاقیب و سۆراخی بابی(ئودیسیوس) سەفەری ئیلۆس دەکات ودەچێتە نك نەستوور و لەوێ میواندارییەکی گەرم وگوڕو شاهانە دەکرێت.پاشان هەر بە نیازی ئەوەی هەواڵێکی بابی بزانێت دەچێت بۆ لاسیدیمون و مینیلاوس دەبینێت.

*-گەڕانەوەی ئودیسیوس:ئەم بەشە لە سروودی پێنجەمەوە تا سروودی سیانزەیەم لە خۆ دەگرێت.زیاتر باسی ژیانی ئودیسیوسە لە دوورگەکەی لەمەڕ کالیپسو،ئەم خوابانۆیە کە ئاشق وشەیدای ئودیسیوس بووە، بۆ ماوەیەکی زۆر لە دوڕگەکەی خۆیدا گلی دەداتەوەو بەڵێنی دەداتێ کە ئەگەر لەوێ وەمێنێ وبیخوازێت کارێکی وەها دەکات کە ژیانی جاویدانی پێببەخشێت وهەرگیز پیری بە خۆیەوە نەبینێت، لێ ئودیسیوس نایەتە ڕەداو هەربیری لای نیشتمان وکەسوکارو ژنەکەیەتی وخەیاڵی گەڕانەوە بەری نادات..سەرەنجام بە هەر هەنجەت و بیانوویەك بێت، خۆی لەوێندەر دەرباز دەکات.بەڵام زریان و تۆفانی ترسناك راپێچی دەکات و خۆی لە سەرزەمین وقەڵەمڕەوی فیاسیاندا دەبێنێتەوە. ئودیسیوسی قارەمان لەوێ نوسیکای کیژی شا ئالسینۆسی فەرمانڕەوای فیاسیان دەبینێت. نوسیکا، ڕێگەی پێنیشان دەدات وڕەوانەی لای بابی دەکات وزۆر بە گەرمی پێشوازی لێدەکات وداوای لێدەکات سەربهوردی خۆی بۆ بگێڕێتەوە. ئیدی ئودیسیوس گشت بەسەرهاتەکانی خۆی بۆ شا ئالسینۆس دەگێڕێتەوە..دوای گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانی،فیاسیان بە کەشتی خۆیان،ئودیسیوس بە دەریادا دەبەن تا دەیگەیەننەوە ئیتاك.ئیدی لەوێوە بەشی سێیەمی داستانەکە واتە

*- تۆڵە سەندنەوەی ئودیسیوس:دەست پێدەکات.ئەم بەشە لە سروودی چواردەیەمەوە تا سروودی بیست وچوارەم لە خۆی دەگرێت.ئودیسیوس کە دەگاتەوە ئیتاکا،لە شێوەی پیرە پیاوێکی شڕۆڵەی گەدادا خۆی بەلای یۆمایۆسی بەرەزەوانی خۆیدا دەکات.یۆمایۆس نایناسێتەوە.دوای ماوەیەکی کەم تیلیماخۆسی کوڕی دەبینێت.بەرەبەرە خۆی پێدەناسێنێت و ئەوسا بە دووقۆڵی و زۆر بە نهێنی تەگبیرورِاوێژ دەکەن ونەخشەو پلان دادەنەن کە چۆن تۆڵە لە خوازگارەکان بسەننەوە.ئەو خوازگارانەی کە بە ناهەق و بەوپەڕی گۆساخی و بێ ئەدەبی موڵك وماڵەکەیان بە فیرۆ دەداو چاوی تەماحیان دەبڕییە هاوسەرە سەلاروسەنگین وجوانەکەی، کە بە درێژایی بیست دانە ساڵ هەر بە داوێنپاکی وئەمەکداری ووەفاداری مابووەوەو خۆی نەدۆڕاندبوو.دیارە ئەتینا، خوابانۆی چاوگەش پشتیوانی ئودیسوس بوو.ئیدی ئودیسیوس بە ڕێنوێنی ئەتینا، لە شێوەوهەیئەتی گەدایەکی ڕوتەڵەی شڕۆڵەدا خۆی بە کۆشك وسەراکەی

خۆیــدا دەکاتــەوە، ئیــدی ئــەو بێگانەیــەوخوازگارەکان خــاوەن ماڵن،واتــە مــاڵ لــە مــاڵخۆ حەرامە.خوازگارەکان زۆری ئازار دەدەن.جنێوی دەدەنێ..سوکایەتی پێدەکەن و ئەویش خۆی شێلو ناکات وتەحەمولیان دەکات..ئیدی پنلۆپ کە گوشاری خوزگارەکان تەنگەتاوی دەکات و زۆری لێدەکەن کە یەکێك لەو خوازگارانە هەڵبـژێرێت وشووی پێبکات و بڕێتەوە،هەڵدەستێ پێشبڕکێیەکیان بۆ دادەنێ ،کە هەرکەسێك پێشبڕکێیەکە بەرێتەوە، شوو بەو دەکات و بە گەڵی دەکەوێت وبە ناچاری وبە نەبەدڵی ئەم کۆشك و سەرایە، کە زۆر لە دڵیا شیرینە ومـاڵی بوکێنیەتی بۆ تیلیماخۆسی کوڕی بەجێدێڵێ.پێشبڕکێیەکە ئەوەیە هەرکەسێك لە خوازگارەکان بتوانێت کەوانەکەی ئودیسیوس بهێنێتە سەرپێ وتیرێك بە کونی دوازدە پاچی بەریز دانراوا ئاودیو بکات،دەبێت بە مێردی پنلۆپی.هەڵبەتە کەس ئەم کارەی پێناکرێت.ئەنجام ئودیسیوس کەوانەکە وەردەگرێت وگرەوەکە دەباتەوەو ئەوسا بە یارمەتی کوڕەکەی ویۆمایۆس و نۆکەرە وەفادارەکەی تری،هەموو خوازگارەکان بە سزای خۆیان دەگەیەنێت.ئودیسیوس کە گەڕابووەوە دۆخی جارانی خۆی،خۆی بە پنلۆپی دەناسێنێت و سبەینێ بۆ ئەوەی لە تۆڵەی کەسوکاری کوژراوەکان بخەلەسێت ودووربێت،لەشار وەدەردەکەوێ و دەچێت بۆ دەشت بۆ دیدەنی لایرتیسی بابی. دژمنان دووی دەکەون و لەوێ هێرشی دەکەنە سەر،لێ دوای چەند سووکە شەڕو پێکادانێك، خواوەندان دەکەونە بەینەوەوسوڵحیان دەکەن.

"٣"

ئودیسە یەکێکە لەو شاکارە ئەدەبییە هەرە بەرزانەی لە کۆنەوە تا رۆژگاری ئەمرۆ کاریگەری بەسەر ئەدەبیاتی دنیاوە، بە تایبەتی ئەدبیاتی ئەوروپاوە هەبووە..زۆربەی تراجیدیا یۆنانییەکان لە ئودیسەوە هەڵێنجراون وسێبەری بەسەر زۆربەی کارەکانی ئیسخیلۆس و سۆفۆکلیس ویوریبیدسەوە دیارە.

شاعیری رۆمانی فرجیل، لە داستانی(ئینیادە)دا لە ژێر کاریگەری هەردوو داستانی(ئیلیادەو ئودیسە)دایە.کار گەییوەتە رادەیەك کە بەوە تاوانبار دەکرێت کە ئودیسەی کۆپی کردووەتەوەو بە شێوازێکی هەندێ جیاواز لە شێوازی هۆمەری داپڕشتووەتەوە..فینلۆن لە (تیلماك)ەکەی خۆیدا،هەر گەڕانەکەی تیلیماخۆسی لە ئودیسیۆس،وەرگرتووەو تۆزێ درێژی کردووەتەوەو شاخ و باڵی لێناوە،دەنا وەکو رەوتی گشتی داستان، هیچ شتێکی تازەی دانەهێناوە.

لەسەردەمانی تازەشدا، جگە لە تۆلستۆی کەسی تر لاسایی ئیلیادەی نەکردووەتەوە.ئەم کەڵە ئەدیبە هەوڵی داوە بە چاولێکەری ئیلیادە، مامەڵە دەگەڵ (شەڕو ئاشتی)یەکەی خۆیدا، کە بەراستی لوتکەیەکی ئەدەبی یەجگار بەرزە بکات،بەڵام نەیتوانیوە کاراکتەرو قارەمانەکانی بە هەمان نەفەسی هۆمیرۆس بهونەرێنێ و بەرجەستە بکات.ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی هەلومەرجە کۆمەڵایەتی وقۆناغە مێژووییەکان.

دەکرێ بگوترێ ئودیسە لە ئیلیادە زیاتر سەرنجی رۆماننووسانی رۆژگاری تازەی راکێشاوەو بووە بە سەرچاوەی ئیلهام وسەرۆیان..بۆ نموونە (ئۆلیس)ی جیمس جویس کە لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا لە سەرانسەری دنیادا دەنگی دایەوەو جۆرە دابڕان و وەرچەرخانێکی

رۆمانەوانی دروستکرد،ڕێك لە ژێر کاریگەریی ئۆدیسەدایە،بەڵام جویس نەفەسی ڕۆژگاری خۆی پێبەخشیوە..بەوەش ویستوویەتی ئەوەمان پێبڵێ کە شاکاری وەکو ئۆدیسە لەم ڕۆژگارەدا دووبارە نابێتەوە.ئەگەر دووبارەش ببێتەوە لە قاڵب وڕێختمان وتیمەو ناوەڕۆکێکی مۆدێرندا دووبارە دەبێتەوە.ئیدی زۆر هەوڵی ڕۆمانەوانی دیکە هەن، گەر لێیان وردببیتەوە دەبینی ئۆدیسە بە شێوەیەك لە شێوەکان ئیلهامبەخشیان بووە.بۆ نموونە(موبی دیك)ی هرمان ملفیل یان(پیرەمێردو دەریا)ی هەمینگوای، یان چیرۆکی(چیرۆکی دەریاوانێکی خنکاو)ی گابریل گارسیا ماکیز..هەڵبەتە هەموو ئەو بەرهەمانە شەقڵی ڕۆژگارو هەلومەرجی کۆمەڵایەتی و قۆناغی مێژوویی خۆیانیان بەسەردا زاڵە.زەمەن وڕۆژگار حوکمی خۆی هەیە..گومان لەوەدا نییە کە ئۆدیسە تا ڕۆژگاری ئەمرۆش سەرچاوەی ئیلهامی ئەهلی ئەدەب وئەدیبانی دنیایە.پتر لە سێ هەزار ساڵە بە بەردەوامی دەخوێنرێتەوەو بەگەڵ کاروانی ژیانی تیرەی بەشەر کەوتووەو هاتووە. ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە هۆمیرۆس توانیویەتی ساتە هەرە زندووەکانی ژیانی بەشەر وێنە بگرێت وکەڵکەڵەو ئەڵها دەروونی و ڕۆحییەکانی مرۆڤ بهونەرێنێ و بەها بەرزەکانی میناکی قارەمانیەتی،ئازایەتی،ودادپەروەری وعەدالەت وبێگەردی وپاکی و پاکیزەیی وئەمەکداری ودڵسۆزی ونیشتمانپەروەری لە لای بەشەر شیرین بکات،وخیانەت ودڵرەشی و پیلانگێڕی و پیلان لە دڵو دەروونـدا ڕەشبکات و بیکورهێنێ..یەکێك لە نیشانەکانی زندوویەتی ئۆدیسە،وێڕای ئەوەی بە درێژایی ڕۆژگار سەدان پاچڤە کراوە،تا ئەمرۆش ساڵانە دەیان پاچڤەی تازەی، بە دەیان زمانی زندووی جیهان لێ دەخرێتە بازاڕەوەو ئەم داستانە هەر تەڕو تازەیەو پیرنابێت وبە نیاز نییە بەم زووانەش مل بۆ پیربوون بدات.

جا خوێنەری بەرکەتی بەندە پێشەکییەکی لەمە درێژترم بۆ ئیلیادە نووسیوە،کە لەوێدا باسی ئۆدیسە کراوەو بۆ کەسێك مەبەستی بێت دەتوانێت بچێتەوە سەری.بۆیە دووپاتی دەکەمەوە کە ئەم پێشەکییە هەرچییەك بێت وهەرچۆنێك بێت، ئەلتەرناتیفی دەقەکە نییە،ناتوانێت هەمان سوود ولەزەتی ڕاستەوخۆی دەقەکەت بداتێ.بۆیە لەوەی پتر بە تانیا ناڕۆم ،ولە لەزەتی خوێندنەوەی دەقی ئەم داستانە ئەدەبییە نەمرە مەحرومت ناکەم کە بریتییە لە داستانی گەڕانەوەی ئۆدیسیوس بۆ زاگەو وڵاتی خۆی کە نۆستالیژاو خۆشەویستیی وڵات لە جوانترین وبالاترین گوزارشتدا هونەرێنراوە،هیچ تەماحێك، تەنانەت ژیانی جاویدانی و هەرمانیش ناتوانێت قارەمانی داستانەکەمان، ئۆدیسیوس،لە گەڕانەوە بۆ ئیتاکای زێدو نیشتمانی سارد بکاتەوە،بۆ لای پنلۆپی،هاوسەرە سەلارو سەنگین وپاکیزەو بەسەبرو حەوسەڵەو ئەمەکدارو وەفادارەکەی، بۆ لای تیلیماخۆسی کوڕی کە کون نامێنێت بە دوای بابی بەرزەیدا سەری پێدا نەکات،سارد ناکاتەوە..ئیدی ئۆدیسە هەر خۆی ئۆدیسەیەو فەرموون ئێوەو دەقەکە..

**تێبنی:**

بۆ نووسین و ئامادەکردنی ئەم پێشەکییە سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:

*- ئلیادە/هۆمیرۆس/و:حەمەکەریم عارف/دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم/چ۱/۲۰۰۹

*- ایلیاد/هومر:مترجم:سعید نفیسی/چاپ سوم۱۳۸۵/ناشر/دنیای کتاب

*- اديسه.هومر،ترجمەی میر جلال الدين كزازی،نشر مركز،چاپ:پنجم/١٣٨٥
*- هـوميروس شـاعرالالياده والاوديسـا/بقلـم:الـدكتور عبـدالمعطـى الشـعراوى/الهيئـه المصـريه العامه للتاليف والنشر/١٩٧١
*- اساطير اليونان/د.عماد حاتم/٢٠٠٨/دارالشرق العربی للطباعة والنشر والتوزيع
*- دليـــــــــل القــــــــــارى الى الادب العــــــــــالمى.تـــــــــاليف:ليليـــــــــان هيرلاند/ج.د.بيرسى،ستيرلنج.أ.براون..ترجمه:محمد الجورا.دارالحقائق/١٩٨٦

## سرووديی یەكەم

### كورتەی سروودەكە:

لە غيابی پوسيدون، خواوەنـدی دەريايـان، كـە لـە ئوديسيوسـی قارەمـانی دلاوەرو بـە تەحـەمولو بەردەباروچارەئەندێشی جەنگی تەراوەدا،چووە بە ڤيناو لـە گەڕانەوەيدا بۆ وڵاتـی خـۆی ئـاوارەو سەرگەردانی كردووە، خواوەندان كۆبوونەوەيەك سازدەكەن، ولەسەر داوای ئاتينای كیژی زيوس كـە لايەنگروپشـتيوانی ئۆديسيوسـە (ئـۆليس) بڕيـاری گەڕانـەوەی بـۆ وڵاتـی خـۆ دەدەن، ئـەوجا ئاتينـای خواوەنـدی حيكمـەتو تـەگبيران لـە هەيئـەتی (مينتـور)دا كـە يەكێكـە لـە دۆسـتانی ئوديسيوس، خۆی لـە تيلماخۆس (تلمـاك)ی كوڕی ئۆديسيوس ئاشـكرا دەكـاتو هـانی دەداتو غيرەتی دەنێتە بەر كە بكەوێتە تاقيبوسۆراخی بابیو بـە مەبەسـتی زانـينی هـەواڵو سـۆراخێكی

بـابی سـەفەر بكـات، ولـە هەنبـەر ئـەو میرو‌پاشـاو دەوڵەمەندانـەدا كـە دووری ئودیسیوسـیان بـە دەرفەت زانیوەو هاتوونەتە خوازگاری ژنە جوانو بە ئەمەكو وەفادارەكەیولە كۆشكو تەلارەكەی ئەودا خڕبوونەتەوەو سەروەتو سامانەكەی بەفیڕۆ دەدەن، بەرەڤانیومقاوەمەت بكات.

***

## پاڕانەوە لەبەر كیژەكەی زیوس

خوداوەنـدا، باسـی ئـەو پیـاوە بـەردەبارو بـە راویـژو تـەگبیرەم بـۆ بكـە، كـە دوای ئـەوەی قـەڵای تەراودەی پیرۆزی ویران كرد، وێڵو سەرگەردان بە هـەر چوارنكالی زەویـدا سوڕایەوە،وڵاتی زۆر پیاوانی بینی، زۆر شتیان لێوە فێربوو، لە جەرگەی روبارو دەریایاندا زۆر كارەساتو تەنگانـەی بینی، لـە هـەوڵو تەقـەلای ئـەوەدا بـوو خـۆی رزگاروگەڕانـەوەی هاوڕێكـانی دابین بكـات. كەچـی زێدەباری هەموو هەوڵوتەقەلایەك، نەیتوانی هاوڕێكانی رزگار بكات، لەبەر بێ ئەقڵیو هێڕی خۆ خڕ تیاچوون– چوون گەوجانە گاگەلەكەی (هیلیوس)یـان كوشتـەوەو خواردیـان، ئـەویش لێیـان چوو بە قیناو، هەموویانی لەناوبردو بە ئاواتی گەڕانەوە نەگەیین، خواوەندا، ئـەی كیـژی زیـوس، باسی ئەو شتانەمان بۆ بگێڕەوە. بە كەیفی خۆت بكەو لەو شوێنەوە كە خۆت پێت خۆشە دەست بە گێڕانەوەیان بكە.

## پوسیدون لە ئودیسیوس تورە دەبێ

ئەمێستا هەموو ئەوانـەی لـە مـەرگی شـەڕو تـەفروتونا بـوونی كەشتیان رزگـار بـوون، سـاغو سـەر سەلامەت بە وڵاتو نیشتمانی خۆ شادوشوكر بوونەتـەوە، تـەنیا ئودیسـیوس نـەبێت. هەرچـەندە یەجگار تاسەمەندی گەڕانەوە بوو، بۆ وڵاتو بۆ لای ژنەكەی، بـەڵام حـۆری گرانقـەدرو خواوەنـدی بەشكۆ، كالیپسو، بەو ئومێدەی رامی بكاتو شووی پێبكات لە شكەفتە گـەورەكانی خۆیـدا گلـی دایەوە. ئیدی ساڵان هاتنوساڵان بورین، تا خواوەندان قرێریـان دا كـە ئودیسـیوس بـۆ (ئیتاكـا)ی وڵاتو مەفتـەنی خـۆ بزڤرێتـەوە، بـەڵام كـە گەڕاشـەوە نـاو كەسـوكاری خۆیشـی هـەر لـە مەینـەتو چەڵەمەوسەریەشە رەهـا نـەبوو، هـەر هـەموو خواوەنـدەكان بـەزەییان پێداهاتـەوە تـەنیا پوسـیدون نـەبێ كـە بـەردەوام دژایـەتی دەكـردو دەیچەوسـاندەوەو حـەزی نـەدەكرد ئودیسیوسـی نیمچـە خواوەند بە سەلامەتی بگاتەوە وڵاتی خۆی،كە لە ئەنجامدا هەرگەیشتەوە.

پۆسیدون چووبووە سەفەرێكی دوور بۆ لای ئیسیوپییەكان، ئەو ئیسیوپیانەی لەوپـەڕی دنیـاداو دوور لە بەشەران،لە دوو بەردا، دەژیانو ئاكنجی بوون. بەشێكیان لەبەری خۆرنشینو بەشێكیان لەبەری خۆرهەڵات. بۆ قەبوڵكردنی قوربانیەكی مەزن، كوشتنەوەی سەد سەر گاوپەزان، چوو بـوو بۆ ئەوێندەر، لـە كاتێكـا ئـەو سـەرگەرمو دڵخۆشـی ئـەم ئاهـەنگو رێوڕەسمـە بـوو، خواوەنـدەكانی دی لـە ئولـەمپ، لـە بارەگـای زیوسـدا، لـە بارەگـای خـودانی خواوەنـدانو بەشـەران كۆبوونـەوەو زیوس بەر لە هەمووان كەوتە قسان، لە كاتێكا لـە دڵـی خۆیـدا بیری لـە ئیجیستوس–ی خانـەدان دەكردەوە كە ئوریسـتیس–ی بەنێوبانگ، كوڕی ئاگامـەمنون كوشـتی، رووی دەمـی كـردە كـۆڕی خواوەندانو گـوتی: "گـوێبگرن، بـا بۆتـانی روون بكەمـەوە كـە چـۆن بەشـەران دەسـتە چـەورەكەی خۆیان بەسەری ئێمـەدا دەسـوونو باوەڕیـان وایـە ئێمـە سەرچاوەی هـەموو خراپـەو شـەڕو خـەمو

پەژارەیەکین کە لە ئەنجامی گەوجیەتی خۆیاندا، بەسەریاندا هاتووەو دێت. ئێوە تەماشای ئیجیستوس بکەن، چۆن پێی لە بەرەی خۆی درێژتر کردووە،ژنەکەی کوڕی ئۆتریوس-ی بۆ خۆی زەوت کردووەو بە تەمایە لە هاتنەوەدا خۆیشی بکوژێت، وسووریش دەزانیٚ ئەم کارە مەرگی خۆی بە دواوەیە، بۆیە قسەمان دەگەڵ کرد، هیرمیس-ی چاپوكوچەلەنگمان بۆ لای نارد تا دەست لە کوشتنی ئەو پیاوەو ئاشقێنی دەگەڵ ژنەکەیدا هەڵبگرێت، چونکە خوێنی کوڕی ئوتریوس (ئاگامەمنون) بەفێرۆ ناڕوات، هەر کە ئوریستیس گەورە بوو، بوو بە پیاو بۆ خانەو لانە،ماڵو وەڵاتی خۆ گەڕایەوە، تۆڵەی دەستێنیٚ. هیرمیس بەوپەڕی نیازپاکی ئەوەی پێدەڵێت، بەڵام دڵی ئیجیستوس نەرم نابێت، وگوێی لێناگرێت، ئێستاش کردەوەی خۆی هاتووەتەوە رێیو باجی هەموو کردەوەکانی خۆی داوە.

**هەنگیٚ ئەتینای چاوگەش هەڵیدایەو گوتی:**

"بابە گەورە، ئەی رۆڵەی کرونوس، شای شاهان، ئیجیستوس بە سزای خۆی گەیی، ئەو پیاوە زۆر زەلیلو زەبوونە، لە تالوکەدا دەژی، هیوادارین هەر کەسێك ئەو کاروکردەوانە دەکات، گیرۆدەی هەمان چارەنووس ببیٚ. بەڵام ئیجیستوس نە لێرەیەو نە لەویٚ، من خەمی (ئودیسیوس)ی بەردەبارودانامەو کە بیری لێدەکەمەوە چۆن بە تاقی تەنیا، لەو دوڕگە چۆڵو هۆڵە، دوور لە دۆستو یاران، چەند لە مێژە داخو کەسەران دەچێژێت، دڵم بۆی دەسووتیٚ، بەتاقی تەنیا لە دوڕگەیەکی چڕە دارودارستانی ناوەندی دەریادا،کە خواوەندێك لەویٚ دەژی، کیژی ئەتڵەس، ئەتڵەسی جادوگەری ئەقڵمەندی دانا بە قوڵایی هەموو دەریایانە کە هەر هەموو ئەو کۆڵەکانەی کە ئاسمانیان راگرتووەو لە زەویان جیا کردووەتەوە، لەسەر شانی خۆ داناوە..

جا کیژی ئەم ئەتڵەسە، کە لەو دوڕگەیەدایە، ئودیسیوسی کلۆڵی، داماوی، خەمباری لای خۆی گلداوەتەوە، لە هەوڵی ئەوەدایە بە زاری شیرینو قسەی خۆش فریوی بداتو ئیتاکای لە بیر بەرێتەوە، بەڵام ئودیسیوس، هێندە بێزار بووە،مردن بە ئاوات دەخوازیٚ، هەموو هیواو خۆزگەیەکی هاتووەتە سەر ئەوەی جارێکی دی دوکەڵی وجاخەکەی خۆی بە چاو بدینیٚ.. کەچی تۆ، ئەی مەزنی ئۆڵەمپو ئەی وەچاخزادەی وەچاخزادان، هەر بیری لێناکەیتەوە، باشە کە ئودیسیوس لە دەشتی تەروادە بوو، لە پاڵ ئوستولی ئارگوسیەکاندا کەمی قوربانی بۆ کردی؟ ئیدی ئەم پەشموغەزەبەت لە پای چیە، زیوسا؟

## زیوس خواوەندان لە پوسیدون هاندەدا

زیوسی هەورەوان بەرسڤی دایەوەو گوتی: "کچۆڵەکەم، ئەوە تۆ چ دەڵێی، ئەم قسەیە چ بوو لە زارت دەرچوو؟ من چۆن ئودیسیوس، ئەو نیمچە خوایە، کە داناترین خەڵکی سەر زەوییە،و زۆرترین قوربانی بۆ خواوەندانی جاویدانی ئاسمانی بەرین کردووەو کەس لەو رووەوە هاوتای ناکاتەوە، لە بیردەکەم؟ نا، نەخێر... بەڵام پوسیدون، زۆری لیٚ بە داخەو قینی دانامرێتەوە، چونکە ئودیسیوس، چاوی پولوفیموس-ی دەرهێنا، کوێرونابینای کرد، پولوفیموس، سکلۆپێکی نیمچە خوا بوو، گەورەومەزنی هەموو سکلۆپەکان بوو، پولوفیموس،کوڕی پۆسیدۆن

بوو،لە توساى كيژى فوركوس-ى شاى دەريايە، جا ئەم پەرى دەرياييە، لە ئەشكەوتە بەرينەكاندا،دەگەڵ پوسيدوندا جووت بوو. ئيدى لەو ساتەوە، پۆسيدۆنى هەژێنەرى زەوى لێڕا كە ئوديسيوس نەكوژێت، بەڵام ئاوارەو سەرگەردانى بكاتو نەيەڵێ بۆ وڵاتى خۆى بزڤڕێتەوە. جا ئێستا وەرن با هەموومان، ئەوانەى لێرە ئامادەن، پێكەوە بير لە گەڕانەوەى ئوديسيوس بۆ وڵاتى خۆى بكەنەوە.كە قسەمان كرد بە يەك، هەنگێ پۆسيدۆن ناچار دەبێ دەستبەردارى غەزەبى خۆى ببێ، چونكە ناتوانێ بە تەنێ دژايەتى گەلى خواوەندانى جاويدان بكات.".

## ئەتينا بۆ ئيتاكا دەچێت

خوابانۆ،ئەتيناى چاودرشتى چاوگەش گوتى: "بابى هەموومان، ئەى كوڕى كرونۆس، ئەى خانەدانو وەچاخزادەى وەچاخزادان، كە ئێستا خواوەندانى پيرۆزو مبارەك پێيان باش بێ، ئوديسيوسى بەردەباروداناا بۆ وڵاتى خۆ بگەڕێتەوە، كەواتە با هيرميس، پەيكو تەتەرى روح سووكو گورجو گۆڵ، بۆ دورگەى ئوجيجيا بنێرين، تا بە زووترين كات بەڕێبكەوێ، تا پەرى (كاليپسو) بسك جوانى زوڵف شۆڕ تێبگەيەنێ كە ئێمە دوا بڕيارمان داوە،كە ئوديسيوسى بەردەبارى ورە بەرزو يەك دڵ، بۆ وڵاتى خۆى بگەڕێتەوە. بەڵام من بۆ ئيتاكا دەچم، بەڵكو تيلماخۆسى كوڕى ئوديسيوس هاندەدەم، زاتى وەبەر دەنەم، كە كۆبوونەوەيەك بە ئاخاييانى قژ درێژ بكات، وقسە بۆ هەموو خوازگارانى دايكى بكات، ئەو خوازگارانەى شەوو رۆژ وەكو تەڕاح لە كۆشكەكەى ئەودا پاڵياينداوەتەوەو بە كەيفى خۆ پەزەكانى، گارەشو قەڵەوەكانى دەكوژنەوەو دەيخۆن. جا لەوێندەرەوە بۆ ئەسپارتە، بۆ لاى پولوس-ى دەبەم، بەڵكو گوێ هەڵخاتو هەواڵێكى گەڕانەوەى بابە ئازيزەكەى چنگ بكەوێت. خۆ ئەگەر بەختى يار بێو هەواڵێكى دەست بكەوێ، كە رەنگە لە نێو خەڵكى ئەوێ هەواڵى خۆش هەبێ، ئەوا شتەكە دەنگدەداتەوە.

## ئەتينا لە هەيئەتى رابەردا

ئەو قسەيەى كردو ئەوسا سەندەڵە جوانە جاويدانە زێڕەكانى لە پێكرد، كە دەيتوانى بە هۆيانەوە وەكو با بەسەر ئاوى دەريايان،ودەشتى بەريندا بفڕێت. هەنگێ دەستى دايە ڕمە تۆكمە بتەووقورسو نووك تيژە برۆنزەكەى، كە هيچ لەشكرێكى شەڕڤانانى كارامە خۆى لەبەر نەدەگرت، چونكە كيژى خودانى خواوەندان بوو. ئەوسا لە بەرزترين لوتكەكانى ئوڵەمپەوە داگەڕاو دەمودەست لە خاكى ئيتاكادا، لەبەر دەركەى حەسارىماڵى ئوديسيوس دا بە خۆو رمە برۆنزيەكەيەوە، لە شێوەو هەيئەتى مينتيس-ى پێشەواى تافيانيەكاندا گيرسايەوە. سەيرى كرد هەموو خوازگارە لە خۆباييەكان خەريكى دامەن، لە بەردەركە لەسەر كەوڵى ئەو گايانەى كە بە خۆيان كوشتوويانەتەوە دانيشتوون، خزمەتكارو بەردەستانيش بە دەوريياندا دێنو داواكانيان بۆ جێبەجێ دەكەن، هەندێكيان ئاويان بۆ لە بادان دەكەنو هەندێكيان بە ئيسفەنجان خوانو سفرەيان بۆ دەشۆنو ئامادە دەكەن،وهەندێكى تر گۆشتى مشەيان بەسەردا دابەش دەكەن.

## تیلماخۆس پێشوازی ئەتینا دەکات

تیلماخۆسی نیمچەخوا، یەکەم کەس بوو کە بینی. لە ناوەندی خوازگارەکانی دایکی دا رۆنیشتبوو، مات‌وخەمبار، بیری لە بابە نەجیمزادەو خانەوادەکەی دەکردەوە، کە بەڵکو ئەمە خوایە لە شوێنێکەوە،وبە رێکەوت پەیدا ببێ،وئەم خوازگارانەی لە ماڵی ئەواندا پاڵیان داوەتەوە، وەدەربنێ‌و تڕۆیان بکات.ئا خۆزگا دەگەڕایەوەو دەورانی شکۆداری جارانی دووبارە دەبووەوە، لە کاتێکا بەدەم ئەو بیرو خەیاڵانەوە، لە نێو خوازگارەکاندا دانیشتبوو، لە پڕ چاوی بە ئەتینا کەوت، یەکسەر بەرەو دەرکەی حەسار چوو، چونکە بە شەرمی دەزانی، ئەو غەریبەیە زۆر لەبەر دەرکە بوەستێ‌و چاوەڕوان بێ. کە لێی نزیك بووەوە دەستی راستی گرت، ڕمە بڕونزیەکەی لێوەرگرت، وبەپەلە گوتی: "ئەی غەریب خێرهاتی، میوان ئازیزەو رێزی خۆی هەیە. پاش ئەوەی نانت دەگەڵ خواردین، نمەکت کردین، هەڵبەتە پێمان دەڵێیت بۆچی هاتوویت".

***

بە دەم ئەو قسانەوە پێشکەوت‌و ئەتیناش بە دووی کەوت، کە چوونە نێو کۆشکە بەرزەکەوە رمەکەی لێوەرگرت‌و بە ئەستونێکی بەرزی ساف‌ولوسییەوە هەڵواسی کە چەند ڕمێکی دیکەی ئودیسیوسی شێرە پیاوی،دڵشێری پێوە هەڵواسرا بوو، رێنوێنی ئەتینای کرد، لەسەر کورسیەکی دانا، دوای ئەوەی پارچە کەتانێکی نایابی بەسەردا دان، بەڕاستی کورسیەکی زۆر جوان‌و گەلەك نایاب بوو، وتەپڵەکێکی چکۆلەشی لەبەردەمدا بوو کە پێی بخاتە سەر. کورسیەکیشی لە تەنیشتییەوە بۆ خۆی دانا، تا لە خوازگارەکانەوە دوور بن، وئەم میوانە غەریبە لە دەنگە دەنگ‌و ژاوە ژاویان قەڵس نەبێت‌و بە ئیسراحەت نانەکەی بخوات‌و بە دڵیەوە بنووسێت،وهەروەها بتوانێت بە ئازادی هەواڵێکی بابی لێ بپرسێت.

***

ئەوسا کارەکەرێك، لە ئافتاوەیەکی زێڕی جوان دا ئاوی بۆ هێنان‌و لە تەشتێکی زیوی کرد تا دەستیان بشۆن. ئەوجا خوانێکی رازاوەی بۆ ئامادەکردن، ئەوجا کابان‌و سفرەچییەکی دی نانی بۆ هێنان‌و لە بەردەمی دانان، ئیدی دنیایەك خواردنی بەلەزەتی بۆ دانان،و هەموو جۆرە گۆشتێکی لە قاپی گوڵداری قوڵدا بۆ دانان‌و دوو پەرداخی زێڕیشی بۆ دانان،و ساقیەك بەدەم هاتوچۆوە بادەی بۆ تێکردن.

***

ئەوسا خوازگارانی خۆپەسند وەژوورکەوتن‌و بەڕیز لەسەر کورسی‌و تەختانی بەرز دانیشتن، و خزمەتکاران ئاویان بە دەستا دەکردن‌و کارەکەران بە سەبەتە نانی پڕەوە کەوتنەگێڕانی نان بەسەریاندا، وساقیان سوراحی بادەیان بۆ تەژی کردن، ئەوسا دەستیان بۆ ئەو خۆراکە بەلەزەتە برد کە لەبەردەمیاندا دانرابوو.کە تێرو پڕیان خواردو خواردەوە، ئیدی حەزیان چووە سەر گۆرانی‌و سەمایان.. ئیدی خزمەتکارێك گیتارێکی جوانی بۆ فیمیوس هێناو ناچاریان کرد گۆرانیان بۆ بچڕێ، ئیدی بە گوێرەی ئاوازو دەنگی خۆی کەوتە ژەنینی پیرە گیتار.

## تیلماخۆس و کابرای غەریب..

بەڵام تیلماخۆس، سەری لە ئەتینای چاوگەش بردە پێشەوەو بە دەنگێکی نزم کە ئەوانی دی گوێیان لێنەبێت گوتی: "ئەزبەنی، برای غەریبی ئازیز، تکایە لە قسەکانم توڕە مەبە، ئەم پیاوانە کە ئەوەندەیان کەیف بە گۆرانی و گیتارژەنی دێت، تەنیا لەبەر ئەوەیە کە خۆیان پارەی ئاشقەکە نادەن،خۆراکی مفت و خۆڕایی پیاوێک دەخۆن، کە ڕەنگە ئێسک و پروسکە سپییەکەی لە دەشتێکا، لە بیابانێکدا لەبەر باران رزی بێ، یان شەپۆلان بۆ دەریایان رادەبێ، خۆزگە بابم بۆ ئیتاکا دەگەڕایەوە، ئەوسا دەتبینی چۆن ئەمانە یەکی دوولاقی تریشیان قەرز دەکردو دەیان قوچاندو سەروەت و سامان و زێڕو زیوان فریایان نەدەکەوت. لێ مەخابن کەوتە دەستی قەدەرێکی شووم و تازە تیاچوو،وهیچ چارێکمان نیە، وتەنانەت ئەگەر جارجارێ یەکێکیش بڵێ دێتەوە، باوەڕ ناکەین. پێمان وایە جارەکی دی نای بینینەوە. دەیسا ئەزبەنی وەرە پێم بڵێ، راستم پێ بڵێ، تۆ کێی؟ لە کوێوە دێی؟ خەڵکی چ شارو وڵاتێکی، داک و بابت کێن؟ بە چ کەشتییەك هاتووی، کەشتیوانەکان چۆنیان بۆ ئیتاکا هێناوی؟ خەڵکی چ وڵاتێك بوون؟ پێم وانیە تۆ بە پێیان لە وشکانیەوە بۆ ئێرە هاتبیت. راستم پێ بڵێ، کە ئاخۆ ئەمە یەکەمجارتە بۆ ئێرە دێی، یان تۆ دۆستی کۆنی بابمی؟ چونکە جاران میوانی زۆرمان دەهات، بابم دۆست و بناژۆی زۆری هەبوو، ئەویش لێرەو لەوێ سەردانی خەڵکی دەکرد."

***

ئەتینای چاو درشت بەرسڤی دایەوە: "کەواتە، رێك و راست،حەقیقەتت پێ دەڵێم، هەموو شتێکت پێ دەڵێم، من مینیتس(مینیتور)-م کوڕی ئەنخیالوسی دانا، من گەورەو پاشای تافیانیە سەوڵەوانەکانم.جا بە کەشتی و دەریاوانەکانمەوە بۆ ئێرە هاتووم، وەختێ بە دەریای مەنگی تۆخی بادە ئاسادا، بە بارێك ئاسنەوە، بەرەو تیمیسی دەهاتم، تووشی خەڵکانێکی زمانخوار بووم و بە تەمام بە بارێ مسەوە بگەڕێمەوە، کەشتییەکەم لەوێندەر، لە دووری شار، لە بەندەری ریترون لەولای چیای نایون-ی چڕە دارستان لەنگەری گرتووە.جا ئێمە خۆمان بە دۆست دەزانین، وەکو چۆن باوانمان لە کۆنەوە دۆست بوون. جا ئەگەر حەزدەکەی، بڕۆ لە پیرە جەنگاوەرو شەڕڤانی دێرین لایرتیس بپرسە.کە دەڵێن نایەتە شارو وبەتاقی تەنیا لە گوندی دەژی و وەختێ لە رەزەکانی دێتەوە پیرەژنێکی زورهان خزمەتی دەکات و نان و ئاوی بۆ ساز دەکات و پێی رادەگات.جا ئێستاکێ وا من هاتووم پێت دەڵێم کە دەبوایە بابت لە نێو قەوم وقیلەکەی خۆیدا بوایە، لێ سەد حەیف ومەخابن خواوەندێك گلی داوەتەوەو نایەڵێ بزڤڕێتەوە، و ئودیسیوسی مەزن لەسەر زەویەو نەمردووە. بەڵام پێموایە هێشتا لە دورگەی پەری دەریادا، لە ناو جەرگەی ئوقیانوسدا دەست بەسەرە، یان کەوتووەتە نێو تایفەیەکی هۆڤی وبە تۆبزی و بەبێ مەیلی خۆی دەستبەسەریان کردووەو نایەڵن بێتەوە. هەرچەندە من غەیبزان و فاڵبین نیم، بەڵام وەکو شتێك خواوەندان لە دڵیان نابم، پێم وایە بابت، ئەگەر دەست وپێ بە کۆت و زنجیریش بێ، بەو زووانە بۆ وڵات و مەفتەنە ئازیزەکەی دەگەڕێتەوە،چونکە پیاوێکی بەردەبارو ئەقڵمەندو لێزانە. بەڵام تۆ وەرە راستیم پێ بڵێ، ئایا تۆ بەڕاستی کوڕی ئودیسیوسی؟ چونکە بەژن و باڵا

بەرزەکەت،سەروچاوە جوانەکەت یەکجار لەو دەچێت،چونکە ئێمە بەر لەوەی بۆ جەنگی تەروادە بڕوات دۆستی دڵسۆزو گیانی بە گیانی بووین، زۆرمان یەکتر دەبینی، بەڵێ دوای ئەوەی ئەو و گەلێك لە شێرە پیاوانی ئارگوسییان بە کەشتییە گەورەکانیان بۆ تەروادە رۆییشتن، ئیدی لەوساوە نە من ئودیسیوس–م بینیوەو نە ئەویش منی بینیوە."

*

تیلماخۆسی دانا بەرسڤی دایەوەو گوتی: "جا با من بە راشکاوی، ڕێكوراست بە تۆی بڵێم، دایکم دەڵێ من کوڕی ئودیسیوس–م، بەڵام من ئەمە نازانم، هیچ مرۆڤێك لە دنیادا، وتا ئێستا خۆ بە خۆ ئەسڵ‌و فەسڵی خۆی نەزانیوە. خۆزگە کوڕی پیاوێکی موبارەك بام، ولە نێو موڵکە تایبەتیەکانی خۆیدا پیر ببوایە. بەڵام کە تۆ ئێستا لە ئەسڵ‌و رەسەنم دەپرسیت، بە گوتەی خەڵکی، من لە کڵۆڵترین‌و بەدبەختترین پیاوی رووی زەمینم.

*

خوابانۆ، ئەتینای چاوگەش گوتی: "کەواتە دڵنیابە خواوەندان ئەسڵ‌و فەسڵێکی رەسەنیان هەڵبـژاردووە تا تۆی لێ ببی. خەمت نەبێ، تۆوی ئێوە نابڕێتەوە مادامێکی پنلوپ کوڕێکی جوان‌و قۆزی میناکی تۆی هەیە. بەڵام وەرە ڕێكوراست پێم بڵێ، هیچم لێ مەشارەوە، ئەم ئاهەنگ‌و دەعوەتە چیە؟ ئەم خەڵکە کێن؟ ئەم ئاپۆرایە چیە؟ بۆچی ئەمە دەکەیت؟ ئەمە ئاهەنگی بادەو بادەنۆشیە، یان داوەت‌و زەماوەندە؟ چونکە دیارە ئەمە دەعوەتێك نیە کە هەر کەسەو بە گوێرەی توانای خۆی بەشداری تیا کردبێت‌و توێشووی خۆی دەگەڵ خۆدا هێنا بێ، ئەم هەراو هەنگامەیە، ئەم درشت رەفتاریە، ئەم مەستی‌و بەدمەستییە چیە لەماڵەکەتا بەرپایان کردووە. هەر پیاوێکی بەڕێز بێتە ناویانەوە خەجاڵەت دەبێ، هەست بە شەرمەزاری دەکات".

تیلماخۆسی ئاقڵ‌و ژیر وەڵامی دایەوە: "ئەزبەنی سەبارەت بە پرسیارەکەت، کە بابم لێر بووە، سەروەت‌و سامان‌و ناوبانگ‌و شکۆیەکی زۆرمان هەبووەو ماڵ وەکو سەعاتی میقاتکراو بەڕێوە چووە.بەڵام ئەمێستا غەزەبی خواوەندان گرتوویەتی،و ئەو غەیب بوونەی غەیب بووە، بەسەر هیچ بەنی بەشەرێکدا نەهاتووە. هیچ پێم ناخۆش نەدەبوو گەر مردابا، یان دەگەڵ هاوڕێکانیا لە وڵاتی تەروادەدا کوژرابا، یان لە شەرداو لەبەر دەستی هاوڕێکانیا مردبا، هەنگێ لەشکری ئاخاییان گۆڕێکیان بۆ هەڵدەبەست‌و منیش سەربەرزو ئابڕومەند جێم دەگرتەوە. بەڵام ئەوی راستی بێ، گەرداوگێژەنگان لوولیان داوەو ڕایان ماڵیوەو نە هیچ هەواڵێکی هەیەو نە قولاغێك. منیش تەنیا عەزاب‌وگریانم بۆ ماوەتەوە. جا خەم‌وگریانی من تەنیا بۆ مردنی بابم نیە، ئەوەتا خواوەندان خەم‌و پەژارەیەکی دیکەشیان بەسەرا داوم. میران‌وحوکمڕانانی هەموو دورگەکانی، – دولیخیوم، سامی، وزاکونتوس–ی چڕە دارستان،حاکمانی ئیتاکای بەردەڵان، هەر هەموویان تەماعیان کردووەتە دایکم‌و بە بیانوی خوازگاریەوە بەسەر ماڵەکەمدا رژاون،دەخۆن و دەخۆنەوەو چاوەڕانی وەڵامی دایکمن، ئەویش تیا ماوە، نە بە ئا، نە بە نە وەڵام ناداتەوەو سنوورێك بۆ ئەم بەزمە دانانێت.ئیدی بەمجۆرە ماڵ‌وحاڵم وێران دەکەن، کاتێکت زانی خۆشمیان لە نێو برد."

***

ئـەتينا زۆر قـەڵس بـوو، پێـی گـوت: "نـەيخۆن تاڵـە! بەڕاسـتی تـۆ پێویسـتت بـە گەڕانـەوەی ئوديسيوسـە، تـا چـاری ئـەم خوازگـارە بـیٚ ئابڕوانـە بكـات. خۆزيـا ئێسـتا پەيـدا دەبـوو، و بـەكڵاوخودو قـەڵغانو جووتـە رمەكەيـەوە لەبـەر دەروازەی دەرەوەدا دەوەسـتا، بـەو شـێوەو هەيئەتەوە پەيدا دەبوو كە يەكەمجار لە ماڵی خۆماندا ديتم دەيخواردەوەو كەيفی دەكرد، هـەنگیٚ لـە ئـيفيری يـەوە، لـە مـاڵی ئيلـوس، كـوڕی مـێر ميروسـەوە هـاتبوو، بـە كەشـتييە تيژڕۆكـەی بـۆ ئەوێنـدەر چوو بـوو تـا دەرمـانێكی كوشـندەی دەسـت بكـەویٚو سـەری تيرەو بڕۆنزيەيـەكانی پـیٚ چەور بكات، بەڵام ئيلوس ئەو دەرمانەی نەدابويە، لە غەزەبی خوداوەندان ترسا بوو، بەڵام بـابم، چـونكە زۆری خۆشدەويسـت ئـەو دەرمانـەی دابويـە.خۆزگـە ئوديسـيوس بـەو تەدارەكـەوە پەيـدا دەبوو،وئەوسا دەتبـينی چ تـاڵاوێكی بـەم خوازگارانـە دەنۆشتوچۆن قـڕی دەكـردن، بـە هـەرحاڵ ئەمە قەراری خواوەندانە كە ئاخۆ دەگەڕێتەوەو تۆڵەی حورمەتی پـیٚ شـێلكراوی خـۆی دەسـتێنیٚ يان ناگەڕێتەوە. بەڵام كوڕی خۆم، من ئامۆژگاريت دەكەم بيرێك لەوە بكەوە كـە ئـەم نێرەحەيتانـە، ئـەم خوازگارانـە لـە مـاڵی خـۆت وەدەربنـەی. كـوا گوێـت بێنـە، بـاش گـوێم لێگـرە. سبەينیٚ نـاوی خواوەندانی لیٚ بێنەو خانەدانانوپاڵەوانانی ئاخاييان كۆ بكەوەوگيروگرفتەكەی خۆتيان بۆ باس بكەو،سەبارەت بە خوازگارەكانيش، ئەمريان پـیٚ بكـە بڵاوەی لێبكـەنو هەركـەس بـۆ مـاڵی خـۆی بڕواتەوە،دايكيشت ئەگەر دڵی بـە شـووكردنەوەيە، ئـەوا ئيزنـی بـدە بـا بـۆ مـاڵی بـابی بڕواتـەوە،و لەوێندەر شوو بكاتو زەماوەندو ئاهەنگێك سازبكات،و جيازيـەكی ئـەوتۆی بـۆ بكـەن كـە بـۆ هـيچ كيژە عازەبێك نەكرێت.سەبارەت بە خـۆتيش، هەڵبەتـە مـن بـۆ تۆمـە، ئەگـەر بـە گـوێم دەكـەی، بـڕۆ باشترين كەشتی بە بيست دانە دەرياوانەوە ئامادە بكەو بڕۆ سۆراخێكی بابت بكە، لە مێژە بـزرە، لەوەيە بە رێكەوت كەسێك پەيدا ببیٚو هەواڵێكی بزانیٚ، يان لەوەيـە دەنگێكـت لـە ئاسمانـەوە، لـە زيوسەوە بەرگویٚ بكەویٚ، كە زۆرجار خەڵكی ئەو جۆرە دەنگو پەيامانەيان بەرگویٚ كەوتووە.لـە رێوە بچۆ بۆ پولوسو پرسيار لە نەستووری مەزن بكە. ئەوسا لەوێندەرەوە بۆ ئەسپارتە، بـۆ لای مينيلاوسـی قـژجوان، چـونكە دوا ئاخييـای بـوو كـە گەيشـتەوە وڵاتو مـاڵی خـۆ. خـۆ ئەگـەر هەواڵێكی بابت دەست كەوتو زانيت هێشتا لە ژياندايە،وبەرێوەيە بۆ وڵات، هـەنگیٚ دەتـوانی بـۆ مـاوەی يـەك سـاڵی دی، چـاوەڕیٚ بـیو تەحـەمولی ئـەو خوازگارانـە بكـەی. بـەڵام ئەگـەر زانيـت مـردووەو بڕاوەتـەوە، ئـەوا بـۆ وڵاتـە ئازيزەكـەت بگـەڕێوە، پرسـەيەكی بـە شـكۆی بـۆ دابنـە، لـە شوێنێكی بەرز مەزارێكی بۆ دروست بكە، با ناووشوێنەواری بمێنیٚ، ئەوسا رێگەی دايكت بدە با شوو بكاتەوە. كە هەموو ئەم كارانەت كردو لێبوويتەوە هـەنگیٚ لـە دڵـی خـۆدا بير لە چۆنيەتی كوشتنی ئەو خوازگارانە بكەوە، ئيدی چ بە نهێنی بێتو چ بەئاشكرا، تۆ منداڵەكەی جاران نيت، گـەورە بوويـت، بـووی بـە پيـاوی تـەواو. ئـەدی تـۆ نەتبيسـتووە خـەڵكی چ تـاريفو مـەدح و سەنايەكی ئوريستيس–ی قارەمان دەكەن، چونكە ئيجيستوسی بكوژی بابی كوشتەوە؟ تۆش وا بە هاوڕێم، تۆ لاوێكی خورتو جوانخاسـی، غيرەت بنـە بـەرخۆت، نـاوی خـۆت لـە مێژوودا تۆمـار بكە،با نەوەكانی داهاتوو يادی بە خێرت بكەنەوە، تاريفی ئازايەتيت بدەن. ئێستا دەبیٚ بچمەوە

بۆ لای کەشتییەکەمو دەریاوانەکانم، پێموایە ئێستا تورە بوون، دەمێکە چاوەڕوانن، تۆش باش بیر بکەوە، قسەکانم بە هەندبگرە، قسەم لە عاردی مەدە".

*

تیلماخۆسی ژیر وەڵامی دایەوە: "ئەزبەنی، سوپاس بۆ ئەو هەموو دڵسۆزیەت، بە ڕاستی بە نیازێکی پاکەوە ئامۆژگاریم دەکەی، ئامۆژگاری بابە بۆ کوڕی خۆی، هەرگیز ئەمە لە بیر ناکەم. هەرچەندە تۆ پەلەتەو لەسەر رۆییشتنی، بەڵام تاوێکی دی لامان وەمێنە، حەمامێ بکە، خۆت فێنك بکەوە، کامی دڵت بشکێنە،وهەنگێ دەتوانی بە دیاریەکی هەرە جوانی پڕ بەهاوە، کە من وەکو یادگارو، وەکو دیاری هاوڕێیەکی دڵسۆز بۆ هاوڕێیەکی ئازیزی، پێشکەشتی دەکەم، بەوپەڕی دڵخۆشی بۆ لای کەشتیەکەت بگەڕێیتەوە.

*

ئەتینا،خوابانۆی چاوگەش بەرسڤی دایەوە: "نا، لەوەی پتر ماتەڵم مەکە، پەلەمەو دەبێ بگەڕێمەوە. سەبارەت بەو دیاریەشت کە حەزدەکەی پێشکەشی بکەی، لای خۆت هەڵیگرە تا ئەمجارە دێمەوە،لێتی وەردەگرمو بۆ ماڵەوەی دەبەمەوە، هەنگێ منیش دیاریەك لەوەی خۆت بەنرختری پێشکەش دەکەم".

## ئەتینا کاری خۆی ئەنجامداو رۆیی

ئەتینا،خوابانۆی چاوگەش، وەکو چۆن تەیرێك لە شەقەی باڵ بداتو بە ئاسمانا بچێت، بەو ئاوایە بەرز بووەوەو رۆیی.غیرەتو جورئەتی خستە دڵودەروونی تیلماخۆسەوە،کارێکی وای کرد لە هەموو کاتێ زیاتر بیر لە بابی بکاتەوە. لە ناخی خۆیدا هەستی بە گۆڕانێك کرد، زانی کە ئەم غەریبەیە دەبێ خواوەندێك بێ، یەکسەر وەکو پیاوێکی نیمچە خوا، خواوەند ئاسا خۆی بە کوڕی خوازگارەکاندا کرد.

## پنلوپ گۆرانی تەراودەی بە دڵ نابێ

فیمیوس،ئاشقو شایەری بەنێوبانگ گۆرانی دەگوتو ئەوانیش کڕوکپ رۆنیشتبوونو گوێیان دەگرت،بە دەنگوئاوازێکی پڕ سۆزەوە گۆرانی بۆ دەچڕین، گۆرانی گەڕانەوەی سەختو دژواری ئاخیان لە تەروادەو ئەو مەینەتیوکارەساتانەی کە پالاس ئەتینا بەسەری هێنا بوون، بۆ دەچڕین. پنلوپ-ی ژیر، کیژی ئیکارۆس، لە سەرەوە لە ژوورەکەی خۆیەوە گوێی لە گۆرانیەکە بوو، لە ژوورەکەی خۆی هاتەدەر، بەپلیکانە بەرزەکەدا،دەگەڵ دوو کارەکەری خۆیدا هاتە خوارێ،خانمی نازەنین گەییە نێو خوازگارەکان، لەبەر دەرکەو لە نێوان دوو کارەکەری دڵسۆزدا وەستا،پەچەکەی هەڵدایەوەو دەستی بە گریانێکی بەکوڵ کرد، ورووی کردە ئاشقی پیرۆزو گوتی:

"فیمیوس، تۆ زۆر گۆرانی خۆشودڵگیر لەمەڕ کاری خواوەندانو بەشەران دەزانی، ئەو گۆرانیانەی کە هەمیشە بەسەر زاری ئاشقانو شایەرانەوەیە، تۆ کە لێرەیتو گۆرانی دەڵێی، یەکێك لەو گۆرانیانەیان بۆ بڵێ، با بادەکەیان بە بێدەنگیوهێمنی بخۆنەوە، ئەم گۆرانیە خەمناکە کە دڵم تۆی تۆی دەکات مەڵێ، چونکە مێردە بێ سەرو شوێنەکەم، کە هەرگیز خەمیم لە دڵ

دەرناچێت بیردەخاتەوە. ئەو مێردە ئازیزەی لە سەرانسەری هیلاس و ئارگوسدا بەناو ناوبانگ بوو.

## تیلماخۆس دایکی وەدەردەنێ

تیلماخۆسی دانا بەرسڤی دایەوە: "دایکە وازی لێ بێنە، با بە کەیفی خۆی بکات، چی لە دڵدایە ئەوە بڵێت،ئاشقان، بەرپرس نین لەو مەینەتی و مسیبەتانەی بە گۆرانی دەیڵێین، ئەوان تەنیا وتنەکەیان لەسەرە، پێم وایە زیوس بەرپرسە، ئەو چارەنووسی بەشەران دیاریدەکات، کەس لەم پیاوە تورە نابێت، ئەگەر گۆرانی بە مەینەتی و چارەنووسی شومی داناییەکاندا هەڵبڵێ، بەشەران زیاتر حەزیان لە گۆرانی تازەیە. تۆش خۆت بگرەو سەبرت هەبێ، خۆ ئودیسیوس بە تەنێ نیە، زۆر کەسی دی وەکو ئەو لە تەروادە نەگەڕاونەتەوەو لە نێوچوون و بێ سەروشوێنن. دەی بڕۆرەوە بۆ ژوورەکەی خۆت و خەریکی کاروباری خۆت بە، بە ریس وخەرەکی خۆت ڕابگە. ئەمڕۆ فەرمان بە کارەکەرەکانت بکە، قسە کاری پیاوانە، وبەر لە هەموو کەسێك کاری منە، چونکە من گەورەی ئەمماڵەم".

## پنلوپ دەگری و کوڕەکەی قسە دەگەڵ خوازگارەکانا دەکات

بەسەرسامی بۆ ژوورەکەی خۆی زڤرییەوە، بیری لە قسەی کوڕەکەی کردەوە، لە حیکمەتی قسەکەی حاڵی بوو،دەگەڵ هەردوو کارەکەرەکەیدا بە پلیکانەکەدا سەرکەوت و چووە ژوورەکەی خۆی، تاوێکی باش بە کەسەروخەمەوە بۆ مێردە ئازیزەکەی گریا، تا ئەتینای چاوگەش، خەوێکی خۆشی لێخست.خوازگارەکانیش هەموو لە ڕاڕەوە خۆش و سێبەرەکاندا کردبوویان بە ژاوەژاوو هەموو دەپاڕانەوە ئەو خانمەیان ببێ بە نسیب و بە هەڤخەو. بەڵام تیلماخۆسی ئاقڵ و ژیر ڕووی دەمی تێکردن وگوتی:

"ئەی عاشقانی دایکم،خوازگارانی ڕوو قایم، با ئێستا واز لە هەموو شەڕو گەنگەشەیەك بێنین و کاتێکی خۆش دەگەڵ ئاهەنگەکەمان بەرینە سەر، بەڕاستی گوێگرتن لە دەنگێکی موبارەکی وەکو دەنگی فیمیوس، لە سەرووی هەموو شتێکەوەیە.کە ڕۆژ بووەوە، هەنگێ کۆبوونەوەیەکتان دەگەڵ دەکەم و پێتان ڕادەگەیەنم کە لێرە وەدەربکەون، بڕۆن بۆ خۆتان بەزم و ئاهەنگان بگێڕن، لە ماڵی خۆتان نانی خۆتان لەسەر حیسابی خۆتان بخۆن، بەڵام ئەگەر پێتان ڕێی دانەگرت،و قازانجی خۆتان لەوەدا بینی، بێ هیچ هۆیەك ماڵی کەسێکی دی بخۆن و بە فیڕۆبدەن، ولێرە وەمێنن، ئەوا بەردەوام بن، منیش پەنا دەبەمە بەر خواوەندانی نەمر، هەواڵەی زیوستان دەکەم کە بە خۆی تۆڵەی ئەم کردارانەتان لێ بستێنێ، هەنگێ لە ماڵی بابی مندا دەکوژرێن، فەوت و فەنا دەبن وکەسیش نابێ بەرگریتان لێبکات و تۆڵەتان بستێنێ".

بەو شێوەیە قسانی کرد،وخوازگارەکان لێویان گەست، سەریان لەو جورئەت و قسانەی تیلماخۆسی سوڕما.

## دەمە قاڵەی تیلماخۆس و خوازگارانی دایکی

ئـەنتینوس،کوڕی پـوپیتیس، وەڵامـی دایـەوە: "لـەوە دەچـێ خواوەنـدان فێـری گۆسـاخیو زماندرێژیان کردبیت، فێریان کردبیت بەجورئەتەوە قسان بکەی، خۆزیا زیوسی کوڕی کرونوس قەبوڵی نەدەکرد ببی بە پاشای ئیتاکا وەکو بابت پێشتر پاشا بوو.

***

تیلماخۆسی دانا وەڵامی دایەوەو گوتی: "ئەنتینوس، پێویست بە توڕەبوون ناکات، پەنا بە خواوەندان منیش دەبم بە پاشا، ویستی زیوس هەرچیەك بێ بە ڕەزامەندیەوە قەبوڵمە، گوایە ئەمە ئەو چارەنووسە خراپەیە کە تۆ بۆ منی پێشبینی دەکەی؟ نا، پاشایەتی خراپ نیە، پیاو پێی دەوڵەمەندو گەورە دەبێت. ئەگەر ئودیسیوس–ش مردبێ، خەڵکێکی زۆر لە میرانی دیکەی ئاخیـایی، لـە ئیتاکـای گـوێی دەریا،لـە پیروجـەوانان، هـەن، لەوەیـە یـەکێك لـەوان ئـەم شـوێنە بگرێتەوە... بەڵام هەر من دەبم بە گەورەی ماڵی خۆمو بە پاشای ئەو ڕەعیەتەی کە ئودیسیوسی مەزن بۆی جێهێشتووم".

*

هـەنگێ یورومـاخوس، کـوڕی پولیبـوس هەڵیدایـەو گـوتی: "تیلمـاخۆس، ئـەوە بـە دەسـتی خواوەندانە، ئەوان بریاردەدەن کە کێ لە ئاخییەکان دەبێ بە پاشای ئیتاکای گوێ دەریا، بەڵام موڵكوماڵەکەت حەڵاڵی خۆتە، بۆت هەیە پاشای ماڵی خۆت بیت، تا ئتیاکا پیاوی تیا مابێ کەس ناتوانێ دەست درێژیت بکاتە سەرو بە تۆبزی دزیت لێبکات. ئێستاش حەزدەکەم پرسیاری ئەو پیاوە غەریبەت لێبکەم، کەی هات، کوێندەرییە؟ سەر بە چ بنەماڵەیەکەو لە چ دەڤەرێکە؟ هەواڵی گەڕانەوەی بابی بۆ هێنابوویت، یان بە کاری تایبەتی خۆی بۆ ئێرە هاتبوو؟ چۆن وا زوو هەستاو یەکسەر ڕۆیی! ئەوەندە نەوەستا تا بیناسین، پیاوێکی بێ نموودو ناشیرین نەبوو".

*

تیلماخۆسی بەردەبار گوتی: "یورماخوس، من دڵنیام کە بابم مردووەو بڕاوەتەوە، جارێکی دی بۆ وڵات ناگەڕێتـەوە. هـەر دەنگۆیـەکیش، لـە هـەر سەرچاوەیەکەوە بـێ، مـن بـاوەڕی پێناکـەم، و گـوێ بـەو پێشـبینیاینەش نـادەم کـە دایکـم لـە غـەیبزانو فاڵبینـەکانی دەزانـێ، سـەبارەت بـەو غەریبەش، کۆنە دۆستێکی بابمە، خەڵکی تافوسە، نێوی مینتس–ی کوڕی ئەنخیلوسی دانایە،و گەورەی تافیانیەکانە...

تیلماخۆس بەزار ئەو قسانەی کرد، بەڵام بەدڵ دەیزانی کە خواوەندێکی نەمرە.

## خوازگاران دەرەقسنو تلیماخۆس دەنوێ

خوازگاران کەوتنە سەماو گۆرانیو کەیفوسەفا، کە بەدەم کەیفوخۆشیەوە شەویان بەسەرا داهات، هەرکەسەو چووەوە بۆ ماڵی خۆی تا لەوێندەر بخەوێ. ژوورەکەی تیلماخۆس لە سەرەوە بـوو، لـە شـوێنێکی بـەرز بـوو ودەیڕوانییـە حەسـارو مەیـدانی دەرەوە، بەدەم هـەزارو یـەك بـیرو خەیاڵەوە چوو بۆ ئەوێندەر، پیرە دایەنە دڵسۆزەکەی، یوریکلیا، کیژی ئوپس، کوڕی پیسینور بە دوو مەشـخەڵی هەڵایسـاوەوە پێشـی کـەوت. لایـرتیس کـاتی خـۆی، زوو، ئـەم ژنـەی، لـە تـاڤی هەرزەکاریدا، بە سامانی خۆی کڕی بوو، بیست گای لە بری دابوو، لە ماڵی خۆیدا، وەکو ئەوەی

ژنی شەرعی خۆی بێت ڕێزوحورمەتی دەگرت. بەڵام لە ترسی ژنەکەی خۆی، هەرگیز لەگەڵیا نەدەخەوت، لە ناو هەموو کارەکەرەکاندا ئەم پیرەژنە مەشخەڵە هەڵایساوەکانی هەڵگرت تا ڕێی تیلماخۆس بۆ ژوورەکەی خۆی روناك بکاتەوە. تیلماخۆسی زۆر خۆشدەویست، چونکە لە منداڵییەوە بە خێوی کردبوو. تیلماخۆس دەرکەی ژووری نووستنەکەی کردەوە، لەسەر تەختەکەی دانیشت، عەبا نەرمەکەی داکەندو دایە دەستی پیرەدایەنی دڵسۆز، ئەویش قەدی کرد، بە عەلاگەیەکی نزیکی تەختە خەوەکەیەوەی هەڵواسی، ئەوسا لە ژوورەکە وەدەرکەوت، دەرگاکەی، لە دوای خۆیەوە، بە دەسکە زیوینەکەی ڕاکێشا،وتوند بە زنجیر دایخست. کە تیلماخۆس چووە ژێر بەتانی خوریەوە، بە درێژایی شەو لەبەر خۆیەوە بیری لەو سەفەرە دەکردەوە کە ئەتینا نەخشەی بۆ کێشابوو.

## پەراوێز:

*- هیلیوس هوپیرون: ڕۆمانەکان (سول)ی پێدەڵێن، واتە خواوەندی هەتاو، لەگەڵ ئەپولودا تێکەڵ دەکرێ. هیلیوس، بە گوتەیەکی وردتر، خواوەندی هەتاوە لە کاتی هەڵاتنیا تا ئاوا بوونی، واتا لە ئاوابوونیا ئەپولۆ دەبێ بە خواوەندی هەتاو. یانی ئەپولو ئەو کاتە پەیوەندی بە هەتاوەوە هەیە کە ئاوا دەبێت، بە ڕۆژەوە پەیوەندی پێوەنیە.هیلیوس، کوڕی هوپیریون، هەموو بەیانیەك لە ڕۆژهەڵاتی ئوقیانوسەوە هەڵدەهات، ئەوجا بە عەرەبانە چوار ئەسپیەکەیەوە ئاسمانانی تەی دەکردو لە ڕۆژاوای ئوقیانوسدا ئاوا دەبوو. لە هەردوو بەری ڕۆژهەڵاتو ڕۆژاوادا کۆشکێکی گەورەی قایمی هەبوو، خۆیو ئەسپەکانی لەوێ لایان دەداو ئیسراحەتیان دەکرد.

*- زیوس: فەرمانڕەوای دنیاو گەورەی هەموو خواوەندانو بەشەرانە.

*- ئودیسیوس: کوڕی پاشای ئیتاکایە، پنلوپی خواستو کوڕێکی لێ بوو بە نێو تیلماخۆس. ئودیسیوس بەناوبانگ ترین قارەمانی گریك بوو، لە هەرزەکاریدا، لە سەردانێکیدا بۆ لای باپیرو نەنکی لە پارناسوس، بەشداری ڕاوە بەرازێك دەکاتو بەگژ بەرێزیکا دەچێتو بەرازەکە ئەژنۆی زامدار دەکاتو شوێنەواری ئەو زامەی پێوە دەمێنێ. لایرتیس-ی بابی بە کارێك بۆ لای لاکیدایمونی دۆستی خۆی دەنێرێ، ودۆستەکەی کەوانی یوروتوسی بە دیاری دەداتێ کە لە زۆر بۆنەدا بە کەڵکی دێت. دوای چەند ساڵێك سەفەری دووەم دەکات تا ژەهرێکی کوشندە بۆ تیرەکانی پەیدا بکات، زۆر شوێنانی کرد تا لە پافوس دا، گیرسایەوە، کە ئیلوسی هاوڕێی لەو نزیکانە ئاکنجی بوو. لە ترسی خواوەندان ژەهرەکەی ناداتێ. هەر لەو سەروبەندەدا یان تۆزێ زووتر بەگەڵ خوازگارانی هیلین دەکەوێ، کە هەر هەموویان بەو بیرۆکەیەی ئودیسیوس قایل دەبن کە واز لە هیلین بێنن بە ئازادی شووی دڵخوازی خۆی هەڵبژاێرێتو لە ئایندەشدا لە هەر دەست درێژیەکی بپارێزن. ئودیسیوس وەکو یەکێك لە خوازگارەکان، نەیتوانی دڵی هیلین بە دەست بێنێو بیکات بە هاوسەری خۆی، ئیدی دڵخۆشی خۆی بەوەدایەوە کە پنلوپی ئاقڵو دەوڵەمەندی خواست. ئەوە بوو ژیانێکی سادەو ئاسانو دوور لە خەمو پەژارەی بۆ خۆ

هەڵبژارد. پیاوێکی شادو بەختەوەر بوو، پاشایەکی بەناوبانگ بوو، خواردەو نانبدەو ڕێزگری خواوەندان بوو، بە تایبەتی زیوس و ئەتینا. کوڕێکی بوو ناوی نا تیلماخۆس.

*- کالیپسو: خواوەندو پەری دەریایی بوو لە دوڕگەی ئوجیجیا، کە کەشتییەکەی ئودیسیوس لەویٚ تێکشکا. حەزی لە ئودیسیوس کردو بەڵێنی دایە ئەگەر لەگەڵ ئەودا بمێنێتەوە، ژیانی نەمری پیٚ ببەخشێت، بەڵام ڕەفزی کرد، ئیدی حەوت ساڵانی لە دەف خۆ گلدایەوە، ئەوسا بە فەرمانی زیوس ڕەهای کرد، ئەوسا یارمەتی دا کەشتییەکی دیکەی دروست کردو ئازووقەو پێداویستی دایەو بەڕێی کرد.

*- پوسیدون: خواوەندی دەریایە، گەرداو باو باهۆزانی لە ژێر ڕکێفدان، ماڵوێرانی وسەلامەتی دەریاوانانی لە دەستدایە، سەرپەرشتی هەر هەموو کردارێکی دەریاوانی وەکو ڕاوو بازرگانی و دەریاوانی دەکات.

*- ئیجیستوس: کە ئاگامەمنون بۆ شەڕی تەروادە دەڕوات، ئیجیستوس حەز لە کلوتمنیسترای ژنی دەکات. کە ئاگامەمنون دەگەڕێتەوە بە دوو قۆڵی دەیکوژن، ئەوسا ئیجیستوس حەوت دانە ساڵ حوکمڕانی موکینای کرد تا ئوریستیس-ی کوڕی ئاگامەمنون کوشتییەوە.

*- ئوریستیس: کوڕی ئاگامەمنون و کلوتمنیسترایە، کە بابی بە دەستی کلوتمنیستراو دۆستەکەی، ئیجیستوس کوژرا، ئەو هێشتا منداڵ بوو، خۆ کلوتمنیسترا لە زگبوو ئورتسیتس-ی کوڕی خۆشی بکوژێت ئەگەر کارەکەرەکەیان لە دەستی نەڕفاندبوایە. کە ئوریسیتس گەییە تەمەنی بیست ساڵان، ئەپولو هانی دا تۆڵەی بابی بستێنیٚ، ئەوە بوو بۆ موکینای گەڕایەوە، ئیجیستوس و کلوتمنیسترای کوشت.

*- ئاگامەمنون: بابی ئوریستس، لە کلوتمنیسترا. ئاگامەمنون، دوای ئەوەی دەرکرا بوو، بۆ موکینای گەڕایەوەو تەخت و تاجەکەی خۆی سەندەوەو بوو بە سەخت ترین و توندترین پاشای وڵاتی یونان.

*- ئوتریوس: بەرخێکی زێڕینی هەبوو کە ڕەمزو نیشانەی هێزو دەسەڵاتی خاوەنەکەی بوو، هیرمیس-ی پەیکی خواوەندان دابویە، وەکو تۆڵەیەك بۆ مەرگی کوڕەکەی کە پیلوپس کوشتی.

*- هیرمیس: کوڕی زیوس و یەکێکە لە خواوەندە مەزنەکانی عەرشی ئولەمپ. کارو ئەرکی ئەم زۆر جیاوازە لە هی خواوەندەکانی دی. خواوەندی بایەو هەمان لەزی و خێرایی بای هەیە، تەتەرو جاڕچی زیوس و خواوەندەکانی ترە. خواوەندی یاریە وەرزشیەکانە. خواوەندی فریودان ودزانە، وخواوەندی بەخت و هەروەها خواوەندی قوماربازانە. خوای بازرگانی و بازاڕە. خواوەندی ڕێبوارانی وشکانی ودەرياییە، خواوەندی تەڕزمانی وقسەزانییە، داهێنەری ئەلفباو ژمارانەو داهێنەری قوربانی و فەلەکناسیە، خواوەندی عودو زوڕنایە، سەرپەرشتیاری تەندروستی و پیتاندنی گیانلەبەران و ڕووەکانە. هەروەها خواوەندی شوانکاران و خەوو خەونانە، و ڕێنوێن و ڕابەری ڕۆحی مردوانە بۆ جیهانی ژێرین (هادیس).

*- کرونوس: بابی زیوسە.

*- ئەتلەس: لەگەڵ تیتانەکاندا دژی خواوەندان وەستا، کە شکستی هێنا ڕەهەندەی ئەوپەڕی ڕۆژاوا کراو ناچار کرا ئاسمانان لەسەر هەردوو شانی هەڵگرێ.

*- ئوڵەمپی: زیوس.

*- پولیفیموس: کوڕی پوسیدونە، یەکێکە لەو سیکلۆپە زەبەلاحە یەکەڵە چاوانەی کە لە ئەشکەوتەکانی کەناری دەریادا، بە خواردنو بەخێو کردنی پەزان دەژین. پولیفیموس لە هەموویان بە هێزتر بوو، گۆپاڵ وەشێنێکی بێ وێنە بوو، دەیتوانی ترۆپكو لوتکەی چیایان توڕ بدایە دەریاوە. کاتێ ئودیسیوس لە دوڕگەکەی ئەودا لەنگەری گرتو خۆیو هاوڕێکانی چوونە ئەشکەوتەکەی پولیفیموسەوە، پولیفیموس، لە ئەشکەوتەکەی خۆیدا حەپسی کردن، تاشە بەردێکی گەورەی دەنا بە دەرگای ئەشکەوتەکەوە تا هەڵنەیەن، هەندێکیانی کوشتو خواردنی، بەیانی هەستاو پەزەکانی دایە پێشو ئودیسیوسو هاوڕێکانی لە ئەشکەوتەکەدا بە جێهێشتو تاوێرە زلەکەی بە دەرگاکەیەوە نا. ئودیسیوس، نەخشەیەکی دانا کە خۆیو هاوڕێکانی هەڵێن. کاتێ پولیفیموس ئێوارێ بۆ ئەشکەوتەکەی گەڕایەوە، ئودیسیوس بادەیەکی بە قوەتی لەو بادەیەی دەگەڵ خۆی هێنابووی،دایەو مەستو سەرخۆشی کرد، ئەوجا دارێکی تەڕی گەورەی لە ئاگردا سوور کردەوە، بە خۆیو هاوڕێکانی گرتیانو کردیان بە چاویاو تاقە چاوەکەیان دەرهێنا، بۆ بەیانی پولیفیموس تاوێرەکەی لابرد تا پەزەکانی رابدات، بەڵام لەبەر دەرکە وەستا، دەستی بە پشتو بە تەنگەی پەزەکاندا دێنا تا دڵنیا بێ کە زەلامەکان لە بەینی پەزەکانەوە دزە ناکەنە دەرێ. بەڵام ئودیسیوس، بەرانەکانی سێ سێ بە یەکەوە بەست، تا پیاوەکانی بتوانن خۆیان بە ژێر سکی بەرانەکانەوە هەڵواسن. کە هەموویان بە گوێرەی ئەو نەخشەیە دەرباز بوونو بۆ لای کەشتیەکەیان گەڕانەوە، ئودیسیوس لە پولیفیموسی خوڕی، پولیفیموس-ش دوای دەنگەکەی کەوتو بەرەو کەنار هات، چەند تاوێرێکی مەزنی لە دوای کەشتییەکەیانەوە فڕێ دایە دەریاکەوەو ئیدی کەوتە جەرگەی ئەو گێژەنگوپێلو شەپۆلانەوە کە تاوێرەکان دروستیان کردو کەشتییەکە خەریك بوو، نقوم بێ.

*- مینیتس: هاوڕێی ئودیسیوسە... کاتێ ئەتینا چوو بۆماڵی ئودیسیوس تا تیلماخۆسی کوڕی دنە بدات، خۆی خستە هەیئەتو شێوەی ئەوەوە.

*- تیلماخۆس: کوڕە تاقانەی ئودیسیوس و پنلوپ بوو، کە بابی بۆ شەڕی تەروادە چوو، ئەو منداڵ بوو، ئەتینا هانی داو یارمەتیدا، ئەوسا ئەویش کەوتە تاقیبو سۆراخی ئودیسیوسی بابی. هەوڵجار چوو بۆ لای نەستور لە پیلوس، ئەوجا چوو بۆ ئەسپارتە بۆ لای مینیلاوس، ئیدی بۆی دەرکەوت کە بابی لە دوڕگەی کالیپسویە، کە تیلماخۆس چوو بوو بۆ سۆراخی بابی، خوازگارەکانی پنلوپ نەخشەیەکیان دانا بوو کە غافڵکوژی بکەن.

*- ئەتینا: کیژی زیوسە، یەکێکە لە خواوەندە مەزنەکانی ئۆڵەمپ، لەگەڵ زیوسدا، جڵەوداری گەرداوو باهۆزان بوو، خواوەندی جەنگو سەرکەوتن بوو.

*- فیمیوس:ئاشق و شایەری ماڵی ئودیسیوس بوو، لە بەردەم خوازگارەکانی پنلوپ دا گۆرانی گوت.

*- لایرتیس: پاشای ئیتاکایە، بابی ئودیسیوسە. لە هێرشی کەشتی ئارگۆدا بەشداری کردو لە ماوەی غیابی دوورو درێژی کوڕەکەیدا، بە هەژاریو گۆشەگیری لە گوندا دەژیاو ژنەکەی دولیوس خزمەتی دەکرد. لە کاتی گەڕانەوەی ئودیسیوسدا هێشتا مابوو. ئەتینا گەنجایەتی بۆ گەڕاندەوەو دژی کەسوکاری خوازگارەکانی پنلوپ، ئەوانەی کە ئودیسیوس کوشتنی، بەشداری شەڕی کرد.

*- پنلوپ: ژنی ئودیسیوس ودایکی تیلماخۆسە.

*- نەستور: پاشای پیلوسو بچووکترین کوڕی نیلیوسە، لە ناو ئەو دوانزە کەسەدا کە بە دەستی هەرقل کوژران تەنیا ئەو رزگاری بوو، یورودیکی خواستو حەوت کوڕو دوو کیژی لێی بوو. لە گەنجیدا جەنگاوەرو شەڕڤانێکی بەناوبانگ بوو.

*- مینیلاوس: برای ئاگامەمنونە. بوو بە پاشای ئەسپارتەو ژیانێکی خۆشی لەگەڵ هیلینی ژنی دا بەسەر دەبرد، تا پاریس هاتە میوانییان، مینیلاوس وەکو کەسێکی میوانپەروەرو خواردە پێشوازی کرد. ئەوە بوو پاریس نەك هەر هیلینی خەڵەتاندو رەدووی خست ،بەڵکو سەروەت و سامانێکی زۆری مینیلاوسیشی بە تالآن بردو بۆ تەروادە هەڵهات.

*- هیلاس: واتا ولآتی گریك.

*- دانانی یەکان: گریکەکان.

*- یوریکلیا :دایەن وکارەکەری ئودیسیوس بوو. وەختێ ئودیسیوس بە جل وبەرگی دەرۆزەکەرییەوە، دوای بیست ساڵ بێ سەروشوێنی، گەڕایەوە، یوریکلیا ناسییەوە.

## سروودی دووەم

**کورتەی سروودەکە:**

بۆ سبەینێ خەڵکی ئیتاك لەسەر داوای تیلماخۆس لە مەیدانی شاردا کۆبوونەوە. خوازگاران بەوە قاییل نەبوون کە بڕۆنو لە ماڵەکەی ئودیسیوس وەدەربکەون، وداواکەی تیلماخۆسیان، کە خوازیاری کەشتیودەریاوانان بوو، رەفز کرد. تیلماخۆس رووی کردە کەناری دەریاو داوای کۆمەکی لە ئەتینا کرد. ئەویش لە شێوەو هەیئەتی مینتوردا، کە کۆنە دۆستی ئودیسیوس بوو، دەرکەوتو بەڵێنی بە تیلماخۆس دا یارمەتی بدات. تیلماخۆس گەڕایەوە بۆ ماڵو فەرمانی دا کە تەدارەك وئەسبابی سەفەری بۆ ئامادەو فەراهەم بکەن. لەم کاتەدا ئەتینا کەشتیودەریاوانانی بۆ ئامادەکرد. کە شەو داهات تیلماخۆسی هان دا، ئازووقەو خواردەمەنیان بۆ ناو کەشتییەکە بردو دەگەڵ ئەتینادا کە لە شێوەو هەیئەتی مینتوردا دەرکەوتبوو، بەڕێکەوت.

***

## تیلماخۆس لە جێی بابی دادەنیشێت

هەرکە بەیان بە خۆو قامکە گوڵئاساکانیەوە لە کەل دەرکەوت، کوڕە ئازیزەکەی ئودیسیوس، لە جێ ڕابوو، جلەکانی لەبەرکرد. شمشێرە بڕندەکەی لە شان کرد، سەندەڵە جوانەکانی لە پێیە پرشنگدارەکانی کرد، وخواوەند ئاسا لە ژوورەکەی خۆی وەدەرکەوت. یەکسەر فەرمانی بە جارچییە دەنگ زوڵاڵەکان دا کە بانگەواز بۆ ئاخییایە قژ درێژەکان بکەن بێنە کۆبوونەوە. جارچیان جاڕیان دا، ئاخیاییەکان بەپەلە گردبوونەوە. کە تەواو کۆبوونەوە، تیلماخۆس بۆ شوێنی کۆبوونەوەکە وەڕێکەوت، ڕمێکی بڕونزی بە دەستەوە بوو– هەر بە تەنێ نەبوو، دوو کسۆکی بە دواوە بوون. ئەو جوانیەی ئەتینا پێی بەخشی بوو، لە ڕادەبەدەر بوو. کە هات، ئامادە بووان سەریان لێی سوڕما. تیلماخۆس لە شوێنەکەی بابی رۆنیشت،وپیران شوێنێکیان بۆ کردەوە.

## ئیجیپتیوس–ی خەمبار قسە دەکات

ئیجیپتیوس، کە لە پیری دا پشتی چەما بوو، ولە هەموویان دنیادیدەترو بە ئەزموونتر بوو یەکەم کەس بوو کە قسەی کرد.ئەنتیفوس–ی کوڕی کە جەنگاوەرێکی بەنێوبانگو ئازیزی بابی بوو، دەگەڵ گەلە کەشتییەکەی ئودیسیوس دا بۆ ئیلوس، وڵاتومەڵبەندی ئەسپێن ڕەسەن، رۆیی بوو. بەڵام سیکلوپانی هۆڤی دەرگای ئەشکەوتە گەورەکەیان لە خۆیو هاوڕێکانی داخستو کوشتیان،وکردیان بە دوا ژەمی خۆیان. سێ کوڕی تری مابوون، یەکێکیان (یورونوموس)ی ناو بوو، ویەکێك بوو لە پێڕێ خوازگاران،ودوانەکەی دی لە کێڵگەو مەزراکانی بابیان کاریان دەکرد. بەڵام پیرە باب ئەنتیفوسی لەبیر نەچوو بوو، کە قسەی بۆ ئاپۆڕاکە دەکرد خوڕخوڕ فرمێسکی بۆ دەڕشت،رووی تێکردنو گوتی:

"پیاوانی ئیتاکا گوێ لە من بگرن، گوێ بگرن بزانن چ دەڵێم. لەوەتای ئودیسیوسی مەزن، رۆییشتووە، هیچ کۆبوونەوەیەکمان نەکردووە. ئێستا کێ لێرەی کۆکردوینەتەوە؟ گەنجە، پیرە؟ بۆچی کۆی کردوینەتەوە؟ ئایا هەواڵی هێرشو پەلاماری لەشکرێکی پێیە،وگەرەکیە ئاگادارمان بکاتەوە؟ یان دەیەوێ باسی شتێکی گشتی بکات کە پەیوەندی بە هەمووانەوە هەیە؟ هەرکەسێك هەیە، پێم وایە پیاوێکی باشە ،خانەدانو ڕەسەنە. ئومێدەوارم زیوس، ئاواتەکانی دڵی بێنێتە دی، زیوس بە دڵی خۆی لەگەڵدا بکات".

## تیلماخۆس سکاڵای دڵی بۆ ئامادەبووان دەکات

تیلماخۆس،ئەو قسانەی لە گیان خۆش بوو. بە نوقڵانەیەکی باشی زانی. یەکسەر لە جێی خۆی هەستا، تامەزرۆی قسە بوو،لە ناوەندی ئاپۆراکەدا وەستا،(پیسینور)ی تەتەرو شیرەتکار گۆچانەکەی بۆ هێنا.ئەوجا لەپێشا رووی کردە ئیجیپتیوسی پیرو گوتی:

"ئەزبەنی ئەو کەسەی بۆ ئەم کۆبوونەوەیەی گازکردوون،لە جێیەکی دوور نیە، لێرەیە، منم، من بۆ ئەم کۆبوونەوەیەم بانگ کردوون. نە هەواڵی هێرشو پەلاماری لەشکرو سوپام پێیە، تا بۆتانی ئاشکرا بکەمو نە هیچ شتو مەسەلەیەکی گشتیش هەیە تا بۆتانی باس بکەم. من داخو کەسەرێکی شەخسیم هەیە، داخی من لە هی هەمووان گرانترە، بۆیە لێرەم کۆکردوونەتەوە تا داخی دووچەنانەی خۆمتان بۆ هەڵڕێژم.یەکەمیان ئەوەیە کە بابە مەزنەکەم لە دەست داوە، ئەو

کەسەی رۆژێ لە رۆژان، لێرەدا، پاشاوگەورەی هەمووتان بوو، وەکو بابی هەر یەکێکتان بوو. دووەمیان ئەوەیە،حاڵی حازر بەڵایەکی لەوە خراپتر، زۆر لەوە خراپتر بەرۆکی گرتووم،ماڵەکەم وێران دەکات، ژیانم لێ تاڵ دەکات، گەلێك لە پێشەواکان، دەوروخولی دایکم دەدەن و دەیانەوێ بە تۆبزیی و بێ مەیلی خۆی شوویان پێ بکات. ئەمانە کوڕی شەریفترین پیاوانی ئێرەن. زات ناکەن بچن بۆ لای پیکاریوسی بابی، لەوی داخوازی بکەن و ئەویش کامیانی بە پیاوتر زانی، مارەیی و جیازی کیژەکەی لێوەربگرێ و بیکات بە زاوای خۆی. لە بری ئەوە رۆژ بە رۆژ زیاتر بەسەر ماڵی ئێمەدا دادەبارن، گاو پەزو بزنانی قەڵەوو دابەستەمان دەکوژنەوەو ئاهەنگ و بەزم دەگێڕن، بە قەڕابە بادەو شەرابان دەخۆنەوەو سەروەت وسامانمان بە فیڕۆ دەدەن و... جا ئەم سەروەت و سامانە بنی لە ئاویش بێ، بەو شێوەیە، هەر وشك دەکات، نە ئودیسیوس لە ئاردایە رێ لەم ماڵوێرانیە بگرێت. نە منیش بە تەنێ دەرەقەتیان دێم. نەخێر، من هەرگیز بە ئودیسیوس نابم. چەندیش لاسایی بکەمەوە، چاو لەو بکەم، هەرگیز نە لە حیکمەت و بەردەباری دا، نە لە هێزو ئازایەتیدا بەو نابم، بەتۆزی پێی ئەودا ناگەم. بە هەرحاڵ، من هەقی خۆمە بەرگری لە خۆم بکەم، هەر چۆنێ بێ دەبێ بەرگری لە خۆم بکەم، چونکە ئەم بەرخوردورەفتارانە تەحەمول ناکرێ. ئەم ماڵوێرانیە تا سەر تەحەمول ناکرێ.. تکایە شەرم لە خۆ بکەن، هەقی جیرانەتی بفامن...لە قاروغەزەبی خواوەندان بترسن، با لێتان هەڵنەگەڕێنەوە، دەنا ئەم کردەوانەتان سەرتان دەخوات. بە زیوس، وبە تیمیس سوێندتان دەدەم، بگەڕێنەوە بۆ ماڵی خۆتان، براینۆ وازم لێ بێنن بابە داخ و کەسەری خۆمەوە بتلێمەوە.. ئاخر بابم، ئودیسیوسی مەزن، هیچ هەڵەیەکی دەرهەق بە ئاخییانی جەنگاوەر کردووە، وا دەتانەوێ، بە کۆمەك و هاندانی ئەم خوازگارانە تۆڵەم لێ بکەنەوە... خۆ ئەگەر قەراربێ، پەزو ماڵەکەم بخورێ، ئێوە خۆتان بیخۆن. ئەگەر ئێوە بیخۆن دوایی دەتوانم داواتان لێبکەمەوە، ماڵ بە ماڵی شارەکە بگەڕێم و داوای موڵك و ماڵەکەمتان لێ بکەمەوە، هەر هەموویتان لێ بسەنمەوە.. بەڵام ئێستا، ولە هەنبەر ئەم کارەساتانەی لە دڵمی بار دەکەن دەستەوەستانم، هیچم پێناکرێ.

## ئەنتینۆس فێڵەکەی پنلوپ بە رووی تیلماخۆس دا دەداتەوە

تیلماخۆس بە توندی ئەو قسانەی کرد، ئەوسا گۆچانەکەی فڕێدایە سەر عاردی، ودەستی بە گریان کرد. هەموو ئامادەبووان بەزەییان پێداهاتەوە. کڕوکپ لە جێی خۆ نەجولان، کەس زاتی نەکرد بە زبری وەڵامی تیلماخۆس بداتەوە، تەنیا ئەنتینۆس نەبێ کە هەڵیدایەو گوتی:

"ئەی تیلماخۆس، ئەی زماندرێژی فەخرفرۆش، ئەی گۆساخی رووقایم، ئەوە تۆ چ دەڵێی، بۆ بە خۆڕایی ئێمەی خوازگاری دایکت عەیبداردەکەی، لۆمەمان دەکەی! نەخێر، وا نیە، با پێت بڵێم،و چاك بزانە کە خوازگارانی ئاخییایی بە هیچ جۆرێ خەتابار نین، بەڵکو دایکی ئازیزت خەتابارە، چونکە ئافرەتێکی زیرەك وپڕ فێڵ ودەهۆیە، هیچ ئافرەتێکی دیکەی ناگاتێ، سێ دانە ساڵی خشتەو، وا خەریکە ساڵی چوارەمیش تێدەپەڕێ، گەمە بە ئەقڵی ئاخییایەکان دەکات، مژدە بە هەر یەکەمان دەدات و پەیام دەنێرێ، ولەولاشەوە، بیروخەیاڵێکی دیکەی لەسەر دایە. جا با فێڵێکی دیکەیت بۆ باس بکەم، کە چۆن کڵاوی لەسەر کردووین و پێی رابواردووین. لە ژوورەکەی

خۆیـدا کارگەیـەکی چـنینکاری گـەورەی بـەرپا کـردووە، بناغـەی چـنینی پارچـەیەکی گـەورەی دامەزرانـدووە، پارچـەکە لـە داوو رایـەڵی زۆر وردو جوانـە، و لیـبڕاوە پارچـەیەکی ناسـكودرێژ بچنیٚ، هەنگیٚ پێی گوتین: "کوڕینە، خوازگارانی من، ئەی شەیدایانی مـن، راسـتە ئێـوە پەرۆشـی خواستنی منن، پەلەتانە، بەڵام مادامێکی ئودیسیوسی مەزن بەڕاستی مردووە، سەبرم لێبکەن تا لـە چـنینی ئـەم پارچـەیە دەبمـەوە، کارێـك مەکـەن ئـەم پارچـەیەم لـیٚ خەسـار بـبیٚ، داوەکـانی هەڵوەشێتەوە. چونکە بۆ ئاغا لایرتیس-م داناوە، بۆ ئەوەم دانـاوە هـەر کـاتیٚ گیرۆدەی پەنجـەی شـومی خواوەنـدی مـەرگ بـوو، بکـریٚ بـە کفنی، کارێـك مەکـەن هـیچ ژنێکـی ئاخیـایی دڵـی لـەوە بڕەنجیٚ کە ئەم پیاوە دەوڵەمەندە، خودانی ئەم هەموو موڵكوماڵە زۆرە، دووگەز کفنی پیٚ نەبڕاو، بچێت لـەلای خـەڵکی لۆمـەی مـن بکـات." بـەو قسـەیە قەناعـەتی بـە هـەمووومان کـرد، پاشـان، بـە رۆژەوە خـەریکی چـنین دەبـوو،و هەرکـە شـەو دادەهـات، لەبـەر رۆشـنایی مەشـخەڵو مۆمـان هەڵیدەوەشـاندەوە، وبـەو جـۆرە تـوانی سـیٚ دانـە سـاڵ فێڵەکـەی خـۆی بشـارێتەوەو پیـاوانی ئاخیایی فریو بدات.بەڵام کە وەرز سوڕایەوەو ساڵی چوارەم هـات، یەکێك لەو کارەکەرانەی کە دەگەڵ خۆیدا بوو، ولە هەموو شتێك ئاگادار بوو، فێڵەکەی بۆ ئاشکرا کردین.کە تاقیبمان کرد، بە چاوی خۆمان دیتمان خەریکە ئەو کرە جوانە هەڵدەوەشێنێتەوە، بۆیـە تـەواوی بکـات یـان نـا، کاتەکە بەرەو تەواو بوون دەچێت. ئەمە وەڵامی خوازگارەکانە، تا راستی مەسەلەکە لە تۆش و لە ئاخیاییەکانیش ئاشکرا بێت. دایکت لە خۆت دوور بخەوە، دەری بکە، با بابی شـوویەکی بـۆ هەڵبـژێریٚ، شـوویەك کـە خـۆی (پنلـوپ) پێـی رازی بـیٚ. بـەڵام ئەگـەر بـە تەمایـە درێـژە بـەم فێـڵو تەڵەکەبازیە بداتوکوڕانی ئاخیایی توڕە بکاتو تەفرە بدات، بەوەی کە ئەتینا لە ژنانی دیکـە پـتر بـەهرەو توانـای پـیٚ بەخشـیوە، ولـە دڵـی خۆیـدا مـەغروور بـبیٚو بـەزانایی خـۆی لـە بـواری کـارێن جـوانو هونـەری دەسـتیەوە، لـە هۆشمەنـدیو هوشـیاریی فرەوە، لـە زیرەکـیو فێـڵو دەهـۆی بـیٚ وینەوە، بنازێت، کە لە کۆنەوە تا ئێستا هیچ یـەکێك لـە ژنـانی نێـوداری ئاخیـایی کـەزی جـوانی، وەکو تورۆ، ئەلکمینی، وموکینی، زرینگیو زیرەکیو فێڵبـازی پنلوپیـان نـەبووە، ئـەوا بـە هەڵـەدا چووەو ئـەمجارەیان بـۆی ناچێتە سـەر. چونکە تـا ئـەو پـیٚ لەسـەر ئـەو ئەندێشـانە دابگرێـت کـە خواوەندان لە دڵیان ناوە، خوازگاران نانودارایی تۆ دەخۆن، تەخشانو پەخشـانی دەکـەن. ئیـدی ئەو بەم کارە وەکو کەسێکی خواردەو خانەدان نێو بانگێکی فرە دەردەکاتو تۆ دەبیٚ باجەکـەی بدەیتو خەفەت بۆ سەروەتو سامانە زۆرەکەت بخوێت. بۆیە چاك بزانە، تا بە دڵـی خـۆی یـەکێك لە ئاخیاییەکان هەڵنەبژێریٚو شووی پێنەکات، ئێمـە نـە بـۆ وڵاتـی خـۆ دەگەڕێینـەوەو نـە بـۆ هـیچ شوێنێکی دیکە دەڕۆین.

## پابەندی تیلماخۆس بە دایکیەوە

تیلماخۆسی دووربین وەڵامی دایەوە: "ئەی ئەنتینوس، من بە هیچ جۆریٚ ناتوانم بە تـۆبزی ئـەو کەسەی منی هێناوەتە دنیاوە پەروەردەی کردووم، لە ماڵی بـابم دەربکـەم. بـابم لێـرە نیـە، نـازانین ئـاخۆ مـاوە یـان مـردووە. خـۆ ئەگـەر مـن هـەر سـووربم لەسـەر دەرکردنـی دایکـم، ئـەوا دەبـیٚ لـە قـەرەبووی ئەمـەدا پارەیـەکی مـۆڵ بـە ئیکـارۆس بـدەم، کـە لـە توانـام دا نیـە، ئەوسـا نـەك هـەر

ئیکارۆس غەزەبم لێدەگرێ، لەوەیە یەکێك لە خواوەندەکانیش سزام بدات و نەفرەتی ئاسمانم بەسەرا دابارێنێ. چونکە هەنگێ کە دایکم لە ماڵ وەدەردەکەوێ، لە خواوەندانی سامناکی تۆڵە دەپاڕێتەوە کە هەقی بکەن. ئەمە جگە لەوەی دەبم بە لۆمەکاری خەڵکی. بۆیە چاوەڕوانی شتی وا لە من مەکەن. قسەی وا لە زاری من دەرناچێت. جا ئێوەش ئەگەر ئەمەتان پێناخۆشە، لە ماڵو سەراکەی من وەدەرکەون، بۆ خۆتان لە کوێ بەزم دەگێڕن بیگێڕن، نانی خۆتان بخۆن، هەر جارەی لە ماڵی یەکێك لەخۆتان بەزم بگێڕن. خۆ ئەگەر هەر سوورن لەسەر ئەوەی ماڵی یەك کەس بە خۆڕایی بخۆن و وێران بکەن، ئەوا بەردەوام بن. ئەوسا منیش لە خواوەندانی نەمر دەپاڕێمەوە، بەڵکو ئەمە خوایە زیوس بە دەنگمەوە بێت و بە کردەوەی خۆتان دەگەڵ بکات و تۆڵەی منتان لێبسەنێ، بێگومان هەنگێ لە ماڵو سەراکەی مندا دەکوژرێن و خوێنی خۆتان لە ملی خۆتان.

## زیوس بە شێوازی تایبەتی خۆی پشتیوانی لە تیلماخۆس دەکات

کە تیلماخۆس ئەو قسانەی دەکرد، زیوسی بینا،چاوتیژ، لە لوتکەی چیایەکەوە، دوو هەڵۆی بەرزەفڕی نارد. شان بە شانی یەکدی وەکو با دەهاتن، تاوێك بە ئاسماندا سوڕانەوە، کە گەییشتنە سەر شاروچاویان بە ئاپۆڕای خەڵك و قەوغاکە کەوت، کەوتنە سوڕانەوە، بە توندی باڵیان لێك دەدا، بە غەزەبەوە دەیانڕوانیە ئاپۆڕاکەو مەرگ لە نیگایان دەباری. ئەوسا بەربوونە یەکدی، بە دەنووك وچنگ سەروگەردنی یەکتریان هەڵدڕی. ئەوسا بەسەر ئاپۆڕاو ماڵەکاندا بەرەو سەمتی راستی شار بوونەوە. خەڵکەکە کە چاویان بەو دوو باڵندەیە کەوت واقیان وڕما. ترسیان لێنیشت و لە دڵی خۆدا بیریان لە بویەرو قەوماوی خراپ دەکردەوە، هەنگێ هالیتێرسیس-ی پیرەمێرد، کوڕی ماستور، کە گەورەترین فاڵبین و ئامازەخوێن و بەخت گرەوەی سەردەمی خۆی بوو، هەستاو بەوپەڕی سادەیی و راستگۆیی رووی کردە حەشامەتەکەو گوتی:

"پیاوانی ئیتاکا، گوێ بگرن، گوێتان لە من بێ بزانن چیتان پێ دەڵێم لەم پێشبینییەدا زیاتر رووی دەمم لە خوازگارانە،بەڵایەکی گەورەتان بەسەر دێت.چونکە ئودیسیوس دەگەڕێتەوە بۆ نێو کەسوکاری، وئەوەندەی من بزانم، ئێستا لەم نزیکانەیە، دەگەڕێتەوەو قڕدەخاتە هەموو ئەوانە، بەڵێ قڕدەخاتە ئەوانەو، زۆری تری وەکو ئێمەی ئاکنجی ئیتاکا. جا با بۆ خۆ ئاقڵ بین، فریای خۆ بکەوین و سنوورێك بۆ ئەم پێشێلکاریەی خوازگاران دابنەین، وباشتر وایە بە خۆیان چاوپۆشی لەم کارەبکەن، وئەمە قازانجی خۆیانە. من لە خۆمەوە ئەم پێشبینییە ناکەم، بەڵکو شتەکەم وەکو رۆژی روناك لەبەرچاوە. سەبارەت بە ئودیسیوس هەرچییەکم پێشبینی کردبوو، وەکو خۆی هاتە دی، ئەوسای کە خەڵکی ئارگوس، سواری کەشتی بوون و بەرەو ئیلوس وەڕێ کەوتن و ئودیسیوسی بەردەبار بەگەڵیان کەوت، پێم گوت تووشی گێروگرفت و تەنگژەو تەنگانەی زۆر دەبێت، هەموو هاوڕێکانی لە دەست دەدات و دوای بیست دانە ساڵ بۆ وڵاتی خۆ دەگەڕێتەوەو کەس نایناسێتەوە. ئێستاش ئەوەتا وا هەموو ئەو پێشبینیانە دێنە دی."

## یورماخۆس بەرپەرچی دەداتەوە

هەنگینیٚ یوروماخۆس، کوڕی پولیبوس بەرسڤی دایەوەو گوتی: پیرەمێرد، هەستە بڕۆ بۆ ماڵی خۆت و پێشبینییەکانت بە منداڵەکانت بڵێ، با لە ئایندەدا تووشی هیچ کێشەوبەلایەك نەبن. لە مەسەلەی پێشگۆییدا من زۆر لە تۆ بەڵەدترم، ڕۆژی سەدان تەیرو باڵندە بە ژێر تیشکی هەتاودا دەفڕن، دێن‌ودەچن، ومەرج نیە نیشانەی نەحسی و شوومی بن. سەبارەت بە ئودیسیوس، لە غەریبیدا، لە دوورە ولاتا گیانی سپاردووە، سەد بریا تۆش دەگەڵ ئەودا دەمردی، و ئێستا ئەم هەموو پێشبینییەت نەدەکردو تیلماخۆست بەو ئومێدەی دیاریەکت بداتیٚ، بەم جۆرە دنەدەدا، جا من دەمەویٚ شتێکت پیٚ بڵێم کە دێتە دی: ئەگەر حیکمەت و ئەزموونی خۆت بخەیتە کارو کەسێکی لە خۆت منالتر فریو بدەیت و بە قسەکانی تۆ بخەڵەتیٚ و هەر گەوجێتیەك بکات، زەرەرێکی زۆر دەکات. ئەوا ئەم خوازگارانەی لێرە کۆبوونەتەوەو بە قسەی ئێمە دەکەن، ڕێگەی نادەن هیچ کارێك بکات.بەلام سەبارەت بە تۆ پیرەمێرد، ئەوا جەریمەیەکی وەهات دەخەینە سەر کە لە بنی دەرنەچیت، وهەتا ماوی بە داخیەوە بنالێنی. جا من لە بەردەم هەمووان‌دا ئامۆژگاری تیلماخۆس دەکەم کە دایکی وادار بکات بۆ ماڵی بابی بگەڕێتەوە، و بابی مێردێکی بۆ هەڵبژێریٚ کە بەدڵی خۆی بیٚ و بتوانیٚ دیاری زۆرو جیازی باشی بۆ بکات، وەکو چۆن هەر کیژێکی جوان خەونی پێوە دەبینیٚ. پێم وایە کوڕانی ئاخیایی بەمە نەبیٚ دەستبەردار نابن و سوورتردەبن لەسەر خوازگاری خۆیان. ئێمە لە کەس ناترسین، لە هیچ بارودۆخێکا لە کەس ناترسین، نە لە تیلماخۆس و لە قسەکانی، و نە لە تۆو ئەی پیرەمێرد نە لە پێشبینییەکانت، کە هیچیان نایەنە دی و.. بەو پێشبینیانە هێندەی دی دەبێزرێی. موڵك و ماڵی ئەم گەنجەش تاکو دایکی بە پیاوانی ئاخیایی رابوێریٚ و گاڵتە بە ئەقڵیان بکات و شوو بە یەکێکیان نەکات. بە خوت و خۆڕایی دەخوریٚ وکەسیش بۆی قەرەبوو ناکاتەوە. ئێمەش، کە لێرە چاوەڕوان دەکەین، ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر هەڤڕکی لەسەر دەکەین‌ولە خانمانی شایستەی دی ناگەڕێین تا بیخوازین.

## تیلماخۆس لە بابی دەگەڕیٚ

تیلماخۆسی فەرزانە وەلامی دایەوە: "ئەی یوروماخۆس، ئەی خوازگارانی ڕەسەن، چیتر بۆ ئەم مەسەلەیە رووتان لێنانەم، ولەوەی پتر قسانتان دەگەڵ ناکەم، چونکە ئیتر خواوەندان و هەموو ئاخاییان بە مەسەلەکەیان زانیوەو دەزانن دەبیٚ چ بکەن. بەلام داواتان لێدەکەم کە کەشتییەکی خێراو بیست کەسم بدەنیٚ کە لە چوون و هاتنەوەدا لەگەڵما بن، دەچم بۆ ئەسپارتەو پیلۆسی قومەلان تا تاقبێکی گەڕانەوەی بابم، کە لە مێژە ڕۆییوە، بکەم. لەوەیە بنیادەمێك هەواڵێکم پیٚ بڵیٚ یان گوێم لە بانگێکی زیوس بیٚ کە زۆرجار هەواڵ بۆ بەشەران دێنیٚ. خۆ ئەگەر بیستم بابم زندووەو بەرێوەیە بۆ ولات بگەڕێتەوە، هەنگیٚ قیروسیا لەوەی ماڵم وێران دەبیٚ و دەکریٚ، ساڵێکی دیکەش چاوەڕوان دەکەم. بەلام ئەگەر پێیان گوتم مردووەو براوەتەوە، بۆ ولاتە ئازیزەکەی خۆم دەگەڕێمەوەو گۆڕێکی بۆ هەڵدەبەستم و ڕێوڕەسمێکی شایستەی تازەیەباری بۆ سازدەکەم، وپاشان کارێکی وا دەکەم دایکم شوو بکاتەوە."

## مینتور هێرش دەکاتە سەر خوازگاران‌ومەجلیسەکە

ئـەو قسـانەی کـردو لـە جێـی خـۆی دانیشـتەوە. مینتـور کـە هـاوڕێی ئودیسـیوس بوو،وکـە ئۆدیسـیۆس بـە سـواری کەشـتی ڕۆیـی بوو،ئـەمی کردبـوو بـە وەکیلـی خـۆی، وسەرپەرشـتی ماڵەکەی ودەستوپێوەندەکەی بەم سپاردبوو،ودەبوایە پەیڕەوی فەرمانی ئەو پیرەمێردە بکەن،کە هەموو شتێکی بە دەقی خۆیەوە پاراستبوو. لە ناوەندی مەجلیسـەکەوە هەستاو ڕێكو ڕاستو ڕاستگۆیانە پێی گوتن:

"گویٚ بگرن پیاوانی ئیتاکا، گوێتان لە من بیٚ بزانن چیتان پیٚ دەڵێم. بۆ پاشایەك كە گۆچانی پاشایەتی بە دەستەوە بیٚ، چ پێویستە نەرمیو ڕووخۆشیو دادوەری خۆی بنوێنیٚ؟ باشتر وایە توندوتیژو سەختگیرو ڕەفتاری ستەمکارانە بێت،چونکە لە نێو ئەم خەڵكەدا کە ئەو پاشایان بوو و باوکانە ڕەفتاری دەگەڵ دەکردن، هیچ کەسێك لە بیری ئودیسیوسی ئاسمانی نەژادا نیە. جا من، ئەلهەقی گلەییم لە خوازگارانی خۆپەسند نیە ،کە بەد ڕەفتاری دەکەن،و فەرمانی ئەقڵی شەڕانی خۆ دەبەن، چونکە قومار بە گیانی خۆیان دەکەن، ماڵی ئودیسیوس دەماشنەوەو پێیان وایە ئیدی ناگەڕێتەوە. بەڵام ئەوەی تووڕەم دەکاتو جێگەی گلەییە، ڕەفتاری خەڵكەکەی ترە، لێرە دانیشتوونو فزەیان لە خۆ بڕیوەو سەرزەنشتی پێشێلکاری ئەم چەند خوازگارە ناکەن، و ڕەفتاری دزێویان مەحکوم ناکەن، خۆ بە ژمارەش بیٚ ژمارەی ئێوە لەوان زیاترە."

## لیوکریتوس بڵاوە بە مەجلیسەکە دەکات

لیوکریتوس، کوڕی یوینور وەڵامی دایەوە: "ئەی مینتوری گوساخو بیٚ ئەقڵ ئەم قسەیە چیە دەیکەی، تۆ چۆن خەڵكیمان لیٚ هان دەدەی؟ یانی خەڵكەکە هاندەدەی کە بمانگرن، دەست بە سەرمان بکەن؟ زۆر زەحمەتە بتوانی شەڕی خەڵكانێك بکەی کە سەرگەرمی بەزمی خۆیانن و ژمارەیان لە تۆ زیاترە. تەنانەت ئەگەر ئودیسیوسی ئیتاکی بە خۆیشی بەسەردا بهاتبایەو لێبڕابوایە ئەم خوازگارانەی کە لە ماڵەکەیدا بەزمیان بەرپا کردووە، وەدەربنیٚ، ژنەکەی، سەرباری ئەوەی زۆری تاسە دەکات، بە هاتنەوەی شاد نەدەبوو، وبە خۆیشی دەرەقەتی ئەم هەمووە نەدەهاتو خراپ دەکوژرا. بۆیە قسەیەکی دروستت نەکرد، قسەیەکی باشت نەکرد، دەی ئێستا خەڵكینە بڵاوەی لێبکەنو هەرکەسەو بڕواتەوە بۆ ماڵی خۆی، بگەڕێتەوە سەر کاری خۆی. سەبارەت بەم گەنجەش با مینتورو هالوتیرسیس، کە هاوڕێی بابی بوون، لەگەڵیا وەمێننو بەپەلە تەدارەك وئەسپابی سەفەری بۆ فەراهەم بکەن. هەرچەندە من پێم وایە ئەم سەفەرە ناکاتو تا ماوەیەکی زۆر لە ئیتاکا دەمێنێتەوە تا خەبەری بۆ دێنن".

بەو قسانە بڵاوەی بە خەڵكەکە کرد. هەر کەسە بۆ ماڵی خۆی گەڕایەوە، خوازگارەکانیش بۆ ماڵەکەی ئودیسیوسی ئاسمانی نەژاد گەڕانەوە.

## ئەتینا دوعای تیلماخۆس گیرا دەکات

تیلماخۆس بە تەنیا چوو بۆ کەناری دەریا، دەستی لە ئاوی شینباوی دەریا شتو کەوتە نوێژو پاڕانەوە لە ئەتینا: "خوداوەندا، ئەی ئەو کەسەی دوێنیٚ هاتیتە ماڵی ئێمەو فرمانت بە من دا کە لە ڕێگەی دەریای بە تەمتومانەوە بکەومە سۆراخی بابم، کە زۆر دەمێکە لێرە ڕۆییوەو

نەگەڕاوەتەوە. دوعام قەبوڵ بکە، بە هانامەوە بێ. خەڵکی ئاخیایی دژی ئەم بیرانەن، کۆسپن لەبەردەممم دا، بە تایبەتی خوازگارەکان، کە خەڵکێکی دڵڕەق وگۆساخ و دڕن."

لە کاتێکا بەو جۆرە دەپاڕایەوە، ئەتینا لێی نزیك بووەوەو بە سیماو بە دەنگ، لە شێوەو هەیئەتی مینتوردا خۆی نیشاندا وگوتی:

"تیماخۆس ئەگەر تۆ لە بەزری بابە ڕەسەنەکەت بی، ئەگەر شتێك لە خوێنی ئەو لە دەمارەکانتا بێ، ئەوا مەترسە، لە هیچت کەم نابێ، نە لە دلاوەریو نە لە بەردەباریت کەم نابێت، ئەو پیاوێك بوو پیاوانە، قسەو کردەوەی یەك بوو. ئەگەر وەکو ئەو بی، چووبیتەوە سەر ئەو، سەفەرەکەت بێهودە نابێتو چاوپۆشی لێمەکە. بەڵام ئەگەر کوڕی ئودیسیوسو پنلوپی نەبی، ئەوا هیچ ئومێدێکم پێت نیە کە بە ئاواتەکەت بگەی. ئەلهەقی کەم کوڕ دەچنەوە سەر بابیان، بە زۆری لە بابیان کەمترن، باشتر نین. بەڵام تۆ کە لە دلاوەریو ئەقڵمەندیدا لەو کەمتر نیت، شتێك لەبەردەباری ئەوت تێدایە، ئومێدی ئەوەت لێدەکرێ ئەم کارە بەریتە سەر. جا ئێستا گوێت لە قسەو خەیاڵو بەزموئاهەنگی خوازەگارەکان نەبێ، هیچ بیانویەکیان مەدە دەست، ئەوانە گەوج و کاڵفامن، نە خەڵکانێکی دوور بینن، نەدادپەروەرن، هیچ ئاگایەکیان لە مەرگو گۆڕی تاریك نیە، کە زۆر لێیانەوە نزیکەو،لە رۆژێکا هەر هەموویان دەپێچێتەوەو لە نێو دەبات. سەبارەت بە تۆش سەفەرەکەت زۆر دوا ناکەوێ. من لە دۆستە هەرە بە ئەمەکەکانی بابتم. بە خۆم کەشتییەکی خێرات بۆ ئامادە دەکەمو بە خۆیشم دەگەڵتا دێم. ئێستا تۆ بگەڕێوە بۆ ماڵی خۆت، بچۆ نێو خوازگارەکان، ئازووقەو توێشوی ڕێگە ئامادە بکە، ئازووقە لە هەمبانانو بادە لە گۆزەو قەڕابان بکە، ئارد، ئاردی جۆت لە بیر نەچێت، لە خەرارو هەمبانانی گەورەی بکە، چونکە ئارد لە کۆنو نوێدا ماکی ژیان بووە لە ئیتاکادا. بەڵام من، دەچمە ناو شار، بە پەلە کۆمەڵێك هاوڕێی خۆبەخشت بۆ پەیدا دەکەم. سەبارەت بە کەشتی، ئەوا خەمت نەبێ، ئیتاکای باوەشی دەریاو شەپۆلان پڕە لە کەشتی نوێوکۆن، هەرە باشەکەیانت بۆ هەڵدەبژێرم، بەپەلە ئامادەی دەکەینو خۆ دەدەینە دەم پیرە دەریاوە."

## ئەنتینوس قەشمەری بە تیلماخۆس دەکات

هەرکە ئەتینای کیژی زیوس لە قسەکانی بووەوە، تیلماخۆس، دوای ئەوەی گوێی لە دەنگی خواوەند ئەتینا بوو، بەپەلەو بە دڵی پڕ لە خەمەوە بۆ ماڵی خۆی گەڕایەوە. سەیری کرد خوازگارانی خۆپەرست بزنان کەوڵ دەکەنو لە هۆڵو سەراکەدا گۆشتی بەرازان دەبرژێنن. دوای تۆزێك ئەنتینوس بە پێکەنینەوە بۆ لای چوو، دەستی گرتو بە دەنگی بەرز گوتی: "ئەی تیلماك، ئەی سەرکێشی گۆساخ، ئەی بەرزە فڕی لە خۆبایی، بیری خراپو کاری خراپ لە مێشكو دڵی خۆ دەرکە بە قسەی بەدخواهان مەکە. وەرە بە گوێی من بکە، وەکو جاری جاران بخۆو بخۆوە. هەرچییەکت گەرەك بێ، لە کەشتیو دەریاوانان، ئاخاییان بۆتی فەراهەم دەکەن. تا بەپەلە بگەیتە پیلوسی موبارەكو لەوێندەر هەواڵێکی بابە ڕەسەنو ناودارەکەت، بزانی."

## تیلماخۆس هەڕەشە لە خوازگارەکان دەکا

هەنگێ تیلماخۆسی دووربین وەلامی دایەوە: "ئەی ئەنتینوس، خەیاڵ نەکەی من بەدڵێکی ساف و ئاسوودەوە دەگەڵ ئەم تاقمە گۆساخەی تۆدا لەسەر یەك خوان دانیشم و نان بخۆم و بە شادییەوە بەشداری ئەم بەزمە بکەم. یانی ئەوەندەتان بەس نیە، لە منداڵی منەوە تاکو ئەمڕۆ بە بیانووی خوازگارییەوە، ئەو هەموو دارایی و ماڵ و موڵکەی منتان لە نێو بردووە؟ بەلام ئێستا گەورە بووم، بووم بە پیاو، سوود لە ڕێنوێنی و ئامۆژگاری کەسانی تر دەبینم، دلاوەری و بوێری تێکەڵ بە خوێنم دەبێت، من هەوڵدەدەم ئەگەر سەفەری پیلوس بکەم یان لەم مەرزو بۆیەدا بم، ئەهریمەنانی شوومی مەرگتان تێ بەر بدەم، تالاوی مەرگتان پێ بنۆشم. ئەوا من دەڕۆم، سەفەر دەکەم، سەفەرەکەم بێ ئەنجام و بێهودەش نابێت. من وەکو نەفەر، نەك وەکو فەرمانده سەفەر دەکەم، چونکە من بە خۆم نە کەشتیم هەیەو نە دەریاوان، هەڵبەتە قازانجی ئێوە لەوەدا بووە کە ئەم سەفەرە وابێت."

## خوازگارەکان بەدەم نان و خوانەوە تەشەران لێدەدەن

تیلماخۆس ئەوەی گوت و بە توندی دەستی خۆی لە دەستی ئەنتینوس دەرهێنا. خوازگارەکان لە سەرانسەری سەراو هۆڵە گەورەکەدا مژولی نان و خوان و سازدانی بەزم بوون و لە قسەکانیان دا تەوس و تەشەریان لە تیلماخۆس دەدا. یەکێك لەو لاوە بێ شەرمانە گوتی:

"هەڵبەتە تیلماخۆس لە بیری کوشتنی ئێمەدایە، دەچێت لە پیلوسی قومەلان یان لە ئەسپارتەوە، خەڵکانێکمان بۆ دێنێ و سوورە لەسەر ئەوەی قڕمان تێبخات. یان لەوەیە بچێ بۆ ئیفری، خاکێ فەڕو پیت و بەرەکەت، تا ژەهرو دەرمانی کوشندە لەوێندەر بێنێ، لە بادەو شەرابەکانمانی بکات و هەر هەمووومان بە جارێ بکوژێت".

لاوێکی دیکەی بێ شەرم هەڵیدایەو گوتی: "کێ چوزانێ، لەوەیە ئەویش، بە خۆو کەشتیەکەیەوە لە ناوەندی دەریادا، دوور لە دۆست وکەسوکار، وەکو ئودیسیوس تیا بچێت. هەنگێ کێشەیەکی گەورەمان بەملدا دێ و دەبێ هەموو دارایی و سەروەت و سامانەکەی بەسەر خۆماندا دابەش بکەین، بەلام خانووەکە، ئەوا یەکسەر دەیدەین بە دایکی و بەو پیاوەی کە دەبێ بە هاوسەری."

## تیلماخۆس سەری کۆگاو عەمارەکانی بابی دەدا

کە ئەوان ئەو جۆرە قسانەیان دەکرد. تیلماخۆس خۆی بە عەمارە بەرزەکەی بابیدا کرد، ژوورێکی یەجگار گەورە بوو، بە بار زێڕو بڕونزی تیا هەڵدرا بووەوە، پڕ بوو لە سەندوقە جل و بەرگ لە ڕۆن زەیتی بۆنخۆش، پڕ بوو لە کوپەڵە شەرابی خەستی کۆن کە بەپاڵ یەکەوە لە بن دیوارەکەدا ریز کرابوون، وبۆ ئەو ڕۆژە دانرا بوون کە ئودیسیوس لە سەفەرە دژوارەکەی خۆی بگەڕێتەوە. دەرگا دوو تاکییەکەیان توند داخستبوو، وقفڵیان دابوو، ژنێك شەوو ڕۆژ سەرپەرشتی وپاسەوانی ئەوێندەری دەکرد، ژنێکی زۆر وریا بوو، ئەو ژنە یوریکلیای کیژی ئوپس، کوڕی پیسینور بوو. تیلماخۆس بۆ عەمارەکەی گازکردو گوتی: "یوریکلیا، هەندێ شەرابی زۆر باشم، لەو شەرابەی هەمانە، بۆ جیا بکەرەوە، لە باشیدا لە دوای ئەو شەرابە تایبەتیەوە بێت کە بۆ بابت داناوم، کە ئەگەر لە مەرگ دەرباز بوو، وبۆ ولات گەڕایەوە بیخواتەوە..

دوازده کوپەڵەم بۆ پڕبکە، باش سەرەکانیان بنەوە، هەروەها ئاردی جۆشم بۆ ئامادە بکە، بیست کێلەم بۆ لە خەراروهەمبانانی قایم بکە. هەموو ئەمانەم لەلایەکەوە بۆ دابنێ‌و با جگە لە خۆت کەس بەمە نەزانێت. کە ئێوارە داهات‌ودایکم بۆ ئیسراحەت چووە سەرەوە، هەنگێ دێم‌و دەیانبەم. من دەچم بۆ ئەسپارتەو پیلۆسی لمەلان، تاقیبی هەواڵی گەڕانەوەی بابی ئازیزم دەکەم، بەڵکو بزانم سۆراخێکم دەست دەکەوێ یان نا."

## یوریکلیا هەوڵدەدا تیلماخۆس ژێوان بکاتەوە

یوریکلیای دایەنی، کە گوێی لەو قسانە بوو، قریشکەیەکی دڵتەزێنی کردو بە دەم فرمێسک رشتنەوە، بەپەلە گوتی: "کوڕە ئازیزەکەم، ئەمە چ کەڵکەڵەیەکە، چۆن ئەمەت بە بیرا هات؟ دەتەوێ رووبکەیتە کوێ، تۆ تاقانەی ئازیزو خۆشەویستی ئێمەی؟ ئۆدیسیوسی زیوس زادە، لە غەریبی دا، دوور لە خاکی مەفتەنی خۆی تیا چوو، هەرکە بکەویتە رێ، ئەم خوازگارانە داوێکت بۆ دەنەوەو بە فێڵ‌ودەهۆیان لە نێوت دەبەن تا ئەم هەموو موڵك‌وماڵە بەسەر خۆیاندا دابەش بکەن. نا، مەڕۆ، لێرە وەمێنە، خاوەنداری وپاسداری سەروەت‌و سامانی خۆت بکە، پێویست بە ریسکان ناکات، خۆت ئەزیەت مەدەو خۆ بەدەم دەریای خرۆشاوەوە مەدە."

## دایکی تیلماخۆس پێی نازانێ

تیلماخۆسی دووربین وەڵامی دایەوە: "ئەی خاتوونێ، دایەنی ئازیزم، بێ خەم بە، ئەم نەخشەیەم بەبێ ئیزنی خوایی دانەناوە، سوێندم بۆ بخۆ، سۆزم بدەیە کە تا یازدە دوازدە رۆژی دی هیچ شتێك بە دایکم نەڵێی، چاوەڕوان بکە تا بە خۆی بیرم دەکات‌و هەنگێ دەزانێ کە سەفەرم کردووە، با گریان جوانیەکەی نەشێوێنێ."

دوای ئەو قسانە، پیرەژن لە کانگای دڵەوە سوێندی بە خواوەندان خوارد کە هیچ شتێك نەڵێت. دوای ئەوە کە لە سوێندخواردن بووەوە، بادەی بۆ لە گۆزەوقەڕابان کرد، ئاردی جۆی لە خەرارو هەمبانانی مکوم و قایم کرد، ئەوسا تیلماخۆس رۆیی بۆ لای خوازگارەکان.

## ئەتینا دەچێتە پێستی تیلماخۆسەوە

دوای ئەوە، خواوەند، ئەتینای چاوگەش بیرێکی تری کردەوە. خۆی خستە هەیئەتی تیلماخۆسەوە، لە شێوەی ئەودا بە ناو شار کەوت، دەگەییە هەر پیاوێك هانی دەدا، وئەمری پێدەکرد کە شەوێ، بە شێنەیی، بە هێمنی لەلای کەشتییە توندڕۆکە کۆببنەوە. هەروەها چوو رووی لە نویمون-ی کوڕی فرونیوسی بەناوبانگ، نا کە کەشتیەکی تیژڕۆی بداتێ‌و ئەویش بێ چەندوچون قاییل بوو. کە رۆژ ئاوا بوو، تاریکی باڵی بەسەر هەموو گەڕەك‌و رێگەو بانەکاندا کێشا، خواوەندی ناقبری پیرە کەشتی خستە دەریاوە، ئەوسا هەموو کەرەستەو ئەوزارو پێداویستییەکی کەشتییەکی باشی لێ بارکردو لەدەروازەی بەندەرەکەی بەستەوەو هەموو هاوڕێ رەسەنەکان لە دەوری خڕبوونەوە، خواوەند ئەتینا کەوتە هاندانی یەکە بە یەکەیان.

## ئەتینا دەچێتە پێستی مینتوریشەوە

دوای ئەوە، خواوەند، ئەتینای چاوگەش، بەرەو ماڵی ئودیسیوسی زیوس زادە رۆیی. لەوێ خەوێکی خۆشی بەسەر خوازگارەکاندا داباراند، کارێکی وای کرد کە بادەیان دەنۆشی مەستی مەست دەبوون، هۆشیان لەسەر دەفڕیو پیاڵەیان لە دەست دەکەوت. بۆیە هیچیان بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێ بە چاوی خەواڵووەوە، بۆ شار بڕۆنو بخەون. هەنگێ ئەتینای چاوگەش رووی کردە تیلماخۆس، لە سەرا گەورەکەی بانگ کردە دەرێو لە شێوەی مینتوردا خۆی نیشانداو بە دەنگی مینتور پێی گوت: "تیلماخۆس. هاوڕێکانتان حازرو ئامادە دەست بە سەوڵ لەسەر کەشتییەکە دانیشتوون، و چاوەڕوانی فەرمانی تۆن، خێراکە با بیانگەینێو بەرێبکەوین."

ئەتینا ئەو قسەیەی کردو بەپەلە کەوتە رێ. تیلماخۆس هەنگاو بە هەنگاو شوێن پێی ئەو کەوت. کە گەییشتنە لای کەشتیەکە، سەیریان کرد هاوڕێ قژنەکانیان لە کەناری دەریاکە وەستاون، تیلماخۆس بە جۆشوخرۆشەوە پێی گوتن:

"دەی کوڕینە، با بچین ئازووقەو توێشووەکان بێنین، هەر هەمووی لە ژوورەوە ئامادەیە، نە دایکم بەمە دەزانێو نە کارەکەرەکانی جگە لە یەکێکیان."

## تیلماخۆسو سەفەرە ئاڵۆزەکەی

هەرکە لە قسەکانی بووەوە، ملی رێگای گرتو دەریاوانەکان دووی کەوتن. ئازووقەکەیان هێناو، وەکو چۆن کوڕەکەی ئودیسیوس-ی ئازیز فەرمانی دابوو، لە کەشتییەکەیان بارکرد. تیلماخۆس سەرکەوتە سەر کەشتییەکە، ئەتینا لە پێش ئەوەوە رۆیی و چوو لە دوای کەشتییەکەوە دانیشت، (تیلماخۆس)ش لە تەنیشتیەوە دانیشت، دەریاوانەکان کندڕو حەبلەکانیان لە کەشتییەکە کردەوە، ئەوجا سەرکەوتنە سەر کەشتییەکەو لەسەر تەختەکان دانیشتن. هەنگێ ئەتینای چاوگەش بایەکی سازگار، شەماڵێکی توندی هەڵکرد کە بەسەر دەریای مەی ئاساوە دەی گڤاند. تیلماخۆس داوای لە دەریاوانەکان کرد کە گوریسی بادەوانەکان بکەنەوە، وبە قسەیان کرد. هەنگێ ساریەکەیان کە لە داری بی دروست کرابوو، بەرز کردەوەو لە شوێنەکەی خۆی چەقاندیانو توند بە پێشەوەی کەشتییەکەیانەوە بەستەوەو بادەوانێکی سپیان، بە کندڕی لە چەرمی گا دروستکراو پێوە هەڵواسی، با، بادەوانەکەی پڕ کرد، پیرە کەشتی بە نێو ئاوی قوڵا کەوتە رێ، وشەپۆلانی زەلام بە هاڕە هاڕو هاژە هاژ خۆیان بە هەردوو تەنیشتی پیرە کەشتیدا دەکێشاو، سات بە سات خێراتر بەسەر شەپۆلەکاندا دەچووە پێشێ. دوای ئەوەی کندڕەکانیان لە کەشتییە رەش بەست، جامیان لە بادە سەرڕێژ کردو بە یادی خواوەندانی جاویدانیو ئەزەلی، لە پێش هەموویانەوە بە یادی کیژەکەی زیوس، بە یادی ئەتینای چاوگەش، هەڵیاندا.. بە درێژایی ئەو شەوەو هەتا بەرەبەیان پیرە کەشتی هەر رێی کرد.

***

**پەراوێز:**

*- ئیلوس: تەروادە

*- ئیکارۆس: بابی پنلوپە

*- تیمیس: ڕەمزی یاساو نیزامو دادپەروەرییە، زیوس بۆ خۆیی خواستو لەلای خۆیەوە لە عەرەشەکەی خۆی دانا، تا سوود لە ڕاوێژەکانی ببینێ.

## سروودی سێیەم

### کورتەی سروودەکە:

ئەتیناو تیلماخۆس دەگەنە پیلوسو لەوێندەر پێشوازیەکی گەرم دەکرێن. تیلماخۆس مەبەستی سەفەرەکەی خۆی بە نەستور گوتو داوای لێکرد هەرچیەك لەمەڕ بابی دەزانێ، پێی بڵێ. نەستور باسی ئەو ڕەنجانەی بۆ دەکات کە لە هەنبەر تەروادە کێشا بوویانو هەروەها باسی گەڕانەوەی خەڵکی ئاخیایی بۆ دەکات. بەڵام هیچ شتێکی دەربارەی ئودیسیوس نەدەزانی. دەربارەی خوازگارەکانو ئومێدو هیوای تۆڵە ئەستاندنو گەڕانەوەی ئودیسیوس، گفتوگۆیان کرد. دوای پێشکەش کردنی قوربانی بە خوداوەندان، نەستور میوانەکانی خوڵك کرد کە شەوێ لە ماڵی ئەو بمێننەوە. بەڵام ئەتینا دەعوەتەکەی قەبوڵ نەکرد، هەر بەو شەوە لە شێوەی هەڵۆیەکدا لە شەقەی باڵی داو ڕۆیی. نەستوور ناسییەوەو لە دڵی خۆیدا قەولی دا نەزرێکی بۆ بکات. بۆ سبەینێ، قوربانیەکیان بۆ ئەتینا کرد، دوای بەرپا کردنی نانو خوانێکی ئاینی، تیلماخۆس بە هاوڕێتی پیستراتوس، کوڕی نەستور بەرەو ئەسپارتە وەرێکەوت.

**

# تیلماخۆس دەگاتە پیلۆس

هەرکە هەتاو لە دەریای پڕ شکۆوە دەرکەوت، ئاسۆی جوانی بە جێهێشت، خۆی گەیاندە تاقی ئاسمانی بڕونزی تا لەوێندەرەوە تیشکی خۆی بەسەر خواوەندانی جاویدانو ئادەمیزدانی سەر رووی زەمیندا، کە مەڵبەندی گەنمو دانەوێڵانە، پەخش بکاتەوە. ئەوان گەییشتنە پیلوس، قەڵا قایمەکەی نیلیوس. خەڵکی پیلوس، لە کەناری دەریاکەدا، گایانی رەشیان بۆ خواوەندی قژ رەش، بۆ پوسیدونی زەمین لەرزێن، گەورەی بومەلەرزان،دەکوشتەوەو دەکرد بە قوربانی. نۆ ریز جێگە دانرابوو، هەر ریزە پێنج سەد پیاوی لەسەر دانیشتبوو، وهەر ریزە نۆ دانە گای قوربانی لەبەردەمدا بوو. لەو کاتەدا کە لە خواردنی جەرگ‌وناوەکان بوو بوونەوەو خەریکی ئەوە بوون هەندێ لەئێسك‌و رانەکانیان بۆ خواوەندان دەبرژاند، لەو کاتەدا هاوڕێیان گەیینە کەناری پیرە دەریا. بادەوانی کەشتییە جوانەکەیان دادایەوە، لەنگەریان گرت،و کەشتیەکەیان بەستەوەو دابەزین. تیلماخۆس لە کەشتییەکە دابەزیو دوای ئەتینا، کە لە پێش ئەوەوە بوو، کەوت. ئەتینا، خواوەندی چاوگەش، هەوەڵجار رووی کردە ئەووگوتی: "ئەی تیلماخۆس، ئیدی پێویست بە شەرمو لە رودامان نیە، تۆ بۆیە ئەم سەفەرەت کردووە، و خۆت داوەتە دەم دەریاو شەپۆلانەوە تا سۆراخێکی بابت بکەی، و بزانیت لە کوێ نێژراوە، چۆن مردووە. دەیسا یەکسەر بڕۆ بۆ لای نەستور، رامکەری ئەسپان، با لێی بپرسینو بزانین چ هەواڵێکی لە دڵدا پەنهانە. داوای لێبکە راستیت پێ بڵێ. درۆت لەگەڵ ناکات، چونکە بەڕاستی پیاوێکی یەجگار بەردەبارو خانەدانە."

تیلماخۆس بەرسڤی دایەوە: "ئەی مینتور، چۆن بچم بۆ لای، چۆن سڵاوی لێبکەم؟ من هێشتا لە قسەکردنو تەڕ زمانیدا بێ ئەزموونم، ئاخر گەنجێکی تولەك شەرم دەکا قسە دەگەڵ پیرەمێرێکی گەورەدا بکات."

هەنگێ خواوەند، ئەتینای چاوگەش وەڵامی دایەوە: " تیلماخۆس خەمت نەبێ، تۆ بە خۆت هەندێ قسان دەزانی، ئاسمانیش هەندێکی دیت دەخاتە دڵەوە، چونکە من دڵنیام کە خواوەندان لەو رۆژەوە کە لە دایك بووی تا ئێستا لەگەڵتان."

## کوڕەکەی نەستور پێشوازی جووتە غەریب دەکا

ئەتینا ئەو قسانەی کردو بەپەلە کەوتە رێ. تیلماخۆس دوای کەوت. گەییشتنە ناو پیاوانی پیلوس، نەستور دەگەڵ کوڕەکانیا، لەوێندەر دانیشتبوون. دەستو پێوەندەکەشی خواردنیان ئامادە دەکرد. هەندێك گوشتیان دەبرژانو هەندێکی دی گۆشتیان لە شیش دەدا. هەرکە چاویان بە جووتە غەریب کەوت، لە دەوریان خڕ بوونەوە، خێرهاتنیان کردن، فەرموویان لێکردن کە دانیشتن. سەرەتا،پیسیستراتوس، کوڕی نەستور لێیان چووە پێشێ، دەستی هەردووکیانی گرت، بردیانیە سەر سفرەوخوان، لەسەر فەروەی تیسکنی نەرمی پەزان، کە لەسەر لمی کەناری دەریا راخرابوو، لە تەنیشت تراسومیدیس-ی برایو بابیەوە داینیشاندن. هەندێ جەرگ‌وناوی دانێ، بادەی بۆ لەجامی زێڕ کردن، ئەوجا بە خۆشیو سەلامەتی ئەوان خواردیەوە. دوای ئەوەی

خواردیانـــەوە، رووی کـــردە پـــالاس ئـــەتینای قـــەڵغان بـــە دەســـت، کیـــژی زیـــوس، وگـــوتی:
"ئەی غەریب، شوکری پوسیدون بکە، نوێـژی بۆ بکـە، داوای خۆتی لێبکە. ئەم جـەژن و بەزمەی کـە دەیبـینی بـەیادی ئـەوەو، بـۆ ئـەو بـەرپاکراوە. دوای ئـەوەی لـە نۆشـخواری و نوێـژ بوویتـەوە، قوربانی بادەت پێشکەش کرد، جامە بادەکە، کە شیرینە عەینی هـەنگوین، بدە بـە هاوڕێکـەت تـا ئـەویش چۆڕێك بـەیادی خواوەنـدان بڕێـژێ. پێموایـە ئـەویش نوێـژو نـزا بـۆ خواوەنـدان دەکـات، چونکە هەموو خەڵکی پێویستیان بە خواوەندانە. بەڵام ئەو لـە تـۆ گـەنجترە، لـە تەمـەنی منداییـە، بۆیە لە پێشا جامە زێڕینەکە پێشکەش بە تۆ دەکەم."

## ئەتینا نوێژ بۆ پوسیدون دەکات

کە لەو قسانە بووەوە، جامە بادە شیرینەکەی دایە دەستی، پالاس ئـەتینا بەحیکمـەت و ئـاقڵی و دادپـەروەری ئـەو خۆشـحاڵ بـوو، چـونکە لـە پێشـا جامـە زێڕینەکـەی دابـوو بـەو. دەمودەسـت، هەستاو کەوتە نوێژ بۆ خواوەند پوسیدون وگوتی:
"ئەی پوسیدون، ئەی ئەو کەسـەی زەویـت لـە دەسـتدایە، دوعامـان گیرابکـە، نیـازو مەرامـەکانمان بێنە دی، نوێژو نزامان قەبوڵ بکە. فەڕو نیعمەت وبەختـەوەری و نێوبانگ بە نەسـتورو کوڕەکـانی ببەخشە. ئەوسا هەموو خەڵکی پیلـۆس، کە ئەم قوربانیـە شـکۆدارەیان بـۆ تـۆ بـەرپا کـردووە، لـە رەحمەت و یاوەری خۆت بەرخوردار بکە. ئەوسا بە فـەزڵی خـۆت، ئـەو کارەمـان بـۆ ئاسـان بکـە کـە من و تیلماخۆس بە کەشتییە رەشە تیژرۆکەمان، لە پێناویدا بۆ ئێرە هاتووین."

## تیلماخۆسیش نوێژ دەکات

بـەو جـۆرە ئـەتینا نوێـژی خـوی کـرد. سـرووتەکانی دیکەشـی جێبـەجێ کـرد. ئـەوجا جامـە جوانەکـەی کـە دوو دەسـکی هـەبوو، دایـە تیلمـاخۆس، ئـەویش هەسـتاو بـە هـەمان شـێوەی ئـەو نوێژی کرد... کە گۆشتەکان برژان و دەستوپێوەند لە شیشـەکانیان داماڵی،دابەشـیان کـردو نـان و خـوانێکی بەلـەزەتیان پێشـکەش کـرد. کـە لـە خـواردن و خواردنـەوە بوونـەوە، هـەنگێ نەسـتوری خانەدان و سوارچاك هەستاوگوتی: "ئێستا کە میوانەکانمان نانیـان خـوارد، کـاتی ئـەوە هـاتووە لێیان بپرسین، ئێوە کێن، لە کوێوە هاتوون؟ بە کارێك هـاتوون، یـان هـەروا وێڵ و سـەرگەردان بـێ هیچ نیازو مەبەستێك بە نێو دەریا کـەوتوون؟ ئایـا وەکـو دوو دزی دەریـایی ریسـك بـە ژیـانی خـۆ دەکەن و،ئاسیو بە خەڵکی وڵاتانی دی دەگەیەنن؟

## تیلماخۆس وەڵامی پرسیارەکانی نەستور دەداتەوە

هەنگێ تیلماخۆسی دووربین، بە کاوەخۆ وەڵامی پرسیارەکانی دایەوە، چونکە ئـەتینا بـە خـۆی زاتی خستبووە بەر کە هەواڵی بابە گوم بووەکەی بپرسێت، بەڵکو لەنێو ئەو خەڵکەدا سـۆراخێکی دەسـت بکـەوێ، گـوتی: "ئـەی نەسـتور، ئـەی کـوڕی نیلیـوس، ئـەی مایـەی سـەربەرزی و شـانازی ئاخیاییـان، تـۆ دەپرسـیت لـە کوێـوە هـاتووین، بێگومـان وەڵامـت دەدەمـەوە. لـە ئیتاکـای پشـت نیونـەوە (Neion) هـاتووین،وبۆ کارێـك هـاتووم کـە پەیوەنـدی بـە منـەوە هەیـە، پەیوەنـدی بـە

هیچکەسێکی ترەوە نیە. من هاتوومو دوای نێوونێوبانگی بابم کە لە دنیادا مەنشورە، کەوتووم. هاتووم بزانم ئاخۆ هەواڵێکم لە ئودیسیوسی مەزنو شێرەپیاو، بە جەرگوشەڕڤان کە دەڵێن لەگەڵ تۆدا بەشداری جەنگی تەروادەی کردووەو بە نەخشەو پلانی ئەو تەروادە گیراوەو وێران کراوە؟ ئێمە زانیاریمان لەمەڕ هەموو ئەو شەڕڤانانە هەیە کە لە شەڕی تەروادەدا بەشداریان کردووە،چۆنیەتی مەرگو مردنی پڕ سوێی هەر یەکێکیان دەزانین. بەڵام دەربارەی ئەم دلاوەرە، دەربارەی ئودیسیوس، کە کوڕەکەی کرونوس، سەرەنجامو چارەنووسی ئەوی شاردووەتەوە، تەنانەت پێشی نەگوتووین کە مردووە. تا ئێستا کەس پێی نەگوتووین لە کوێ مردووە، ئاخۆ لە شەڕاو لە خاکی تەروادەدا کوژراوە، یان لە دەریادا شەپۆلانی ئەمفیتریتی (Amphitriete) قوتیان داوەو تیا چووە؟ جا من ئێستا بۆ ئەوە هاتوومە خزمەتی تۆ، لێت دەپاڕێمەوە، کە بە کەرەمی خۆتم لەگەڵ بکەیو هەواڵێکی کۆتاییە خەمناکەکەیم بدەیتێ. ئیدی ئەگەر خۆت بینی بێتت،یان لە خەڵکانی ترەوە، لەوانەی کە گەڕاونەتەوە شتێکت دەربارە بیستبێ. چونکە ئەو پیاوە بۆ خەموکولوکۆڤان دروست بووە. تکایە هیچ بەزەییەکت پێمدا نەیەتەوە، موجامەلەم مەکە،بێ ڕووبینی ڕاستیم پێ بڵێ، چۆنت دیتووە وەکو خۆی بۆم بگێڕەوە، تکایە ئەگەر بابم، ئودیسیوسی دلاوەر، لە خاکی تەروادەدا، کە پێکەوەو دەگەڵ هەموو ئاخییەکاندا گیرۆدە بوو بوون، قسەیەکی بۆ کردبی یان کارێکت لێی دی بێ، وەبەیرخۆتی بێنەوەو وەکو خۆی بۆمی بگێڕەوە تا دڵم ڕەحەتوئاسوودە ببێ."

## نەستور،یادگاری کارەساتەکانی جەنگی تەروادە وەبیردێنێتەوە

هەنگێ نەستوری دلاوەر، هاتە قسان وگوتی:

"هاوڕێ، تۆ بەڕاستی هەر هەموو ئەو دەردو عەزابەت وەبیر هێنامەوە کە ئێمە، کوڕانی ئاخیایی لەو وڵاتەدا چەشتمان. ئەوەت وەبیر هێنامەوە کە وەختێ بە سواری کەشتی، بە ناو دەریای پڕ تەمومژ کەوتبووینو لە دووی تالانیو دەستکەوت بووین، چ دەردوعەزابێکمان چەشت. کە شەڕەکانی دەوروبەری شارەکەی شا پریامی مەزنم، بە سەرکردایەتی ئەخیل بیر دەکەوێتەوە، دڵم پڕ لە خەم دەبێت. باشترین پیاوانی ئێمە، ئازاترین شەڕڤانی ئێمە لەوێدا کوژران، لەوانە ئاجاکسی جەنگاوەر، ئەخیلو پاتروکلوس کە لە ئەقڵمەندیو شیرەتکاریدا نیمچە خوایەك بوو بۆ خۆی، ئەنتیلوخۆسی کوڕی ئازیزی من، کە لە قۆچاغیوشەڕڤانیدا بێ وێنەوهاوتا بوو، هەر هەموو ئەوانە لە خاکی ئەوێندەرا نووستوون. جگە لەمانە زۆر بەڵاو مسیبەتی ترمان بەسەر هات، هیچ بەنی بەشەرێك ناتوانێ هەمووی بگێڕێتەوە. ئەگەر پێنج شەش ساڵ لێرە وەمێنیو لەو دەردو ڕەنجە بپرسیت کە خەڵکی دلاوەری ئاخیایی لەوێندەر کێشاویانە، هەر تەواو نابێتو ماندوو دەبیتو بەبێ تاقەتی بۆ مەفتەنو زاگەی خۆ دەگەڕێیتەوە. نۆ دانەساڵی تەواو، هەزاران نەخشەو پلانمان دانا کە وڵاتەکەیان بگرینو وێران بکەین، بەڵام زیوس، کوڕی کرونۆس دژمان بوو. جا لەو سەروبەندەدا کەس نەبوو شان لە شانی زیرەکیو لێزانی پیاوێك بدات، ئەویش ئودیسیوسی بابی تۆ بوو، ئەگەر بە ڕاستی تۆ کوڕی ئەوبی، کە تەمەشای تۆ دەکەم سەرم سوڕ دەمێنێ، چونکە پیاو هەق بڵێ قسەکانت ڕێك لە قسەکانی ئەو دەچێت، کەس تەسەور ناکات

گەنجێك بەم رادەیە لەوە بچێتو وەکو ئەو قسان بکات. جا بە درێـژایی ئـەو ماوەیـەی کـە پێکـەوە لەوێندەر بووین، هەرگیز قسـەیەکی جیاوازمـان نەکەوتـە نێـوان، هەمیشـە یـەك قسـەو یـەك رەئـیو بۆچـوون بـووین. بـە دوو قـۆڵی ئارگۆسـیەکانمان ئامۆژگـاری دەکـرد کـە دەبـێ چـی بکـەن، تـا سەرکەوتن بەدەست بێنن.

وەختێ کـە شـارەکەی (پریـام)مـان گـرتو وێرانمـان کـرد، سـواری کەشـتی بـووینو بادەوانمـان هـەڵکرد، یـەکێك لـە خواوەنـدەکان ئاخیاییـەکانی پەرتـەوازە کـرد، هـەنگێ زیـوس لـە دڵـی خۆیـدا بڕیاری دا ئارگوسیەکان لە گەڕانەوەدا بۆ وڵات، تووشـی زەحمـەتو رەنجێکـی زۆر بکـات. چـونکە هەموویان ژێروداپەروەر نەبوون، بۆیە زۆریان، لە ئەنجامی غەزەبی خواوەندی چاوگەش، پاڵاس ئەتینای کیژی زیوسی هەرە توانا، کە بووە مایەی هەڵگیرسانی شـەڕ لـە نێـوان هـەردوو کوڕەکـەی ئاتریوسدا، تووشی چارەنووسێکی شوومو خراپ بوون. هەنگێ هەردوو کوڕەکەی ئاتریوس، بـێ ئـەوەی یاسـای بـاو رەچاوبکەن، لـە دەمـی خـۆراوادا داوای کۆبوونـەوەی هـەموو ئاخیاییـەکانیان کرد، کوڕانی ئاخیایی هەموو لاڵوپاڵ، بـە مەسـتیو سەرخۆشـی کۆبوونـەوە، هـەردووکیان باسـی ئـەوەیان کـرد کـە بۆچـی لەشـکرەکەیان کۆکردووەتـەوە. دوای ئـەوە مینـیلاوس داوای لـە هـەموو ئاخیەکان کرد کە یەکسەر بە دەریادا بۆ وڵات بگەڕێنەوە، ئاگامەمنون ئەمەی بە دڵ نەبوو، حەزی دەکرد لەشکرەکە گل بداتەوە، تا نەزرو قوربانی پیرۆزی سەدینە (قوربانیەکـە سـەد سـەر گـای تیـا دەکوژرێتەوەو دەکرێ بە قوربانی) بکاتو پشمو غەزەبی ئەتینا دامرکێنێتەوە. بەڵام خەیاڵی خاو بـوو! ئـەو بـێ ئەقڵـە نەیـدەزانی کـە نـاتوانێ دڵـی نـەرم بکـات. چـونکە بیروبڕیـاری خواوەنـدانی جاویدان هەروا بە ئاسانی نایەتە گۆڕین. ئیدی بەو جۆرە جووتـە بـرا کەوتنـە شـەڕە قسـان. ئـەوە بـوو شـەڕڤانانی ئاخیـایی بـەدەم هـاوارەوە رابـوونو ویسـتی جووتـە بـرا دووبـەرەکی خسـتە نێـو ئەوانیش. شەومان بەسـەرا هـات، هـەر تاقمـە بیری لـەوە دەکـردەوە چۆن ئاسیو بـە تاقمەکـەی تـر بگەیەنێ. زیوس لێمان چوو بوو بە قیناو چارەنووسێکی شوومی بـۆ دانـابووین. کـە رۆژ بـووەوە، تاقمێکمان کەشتییەکانمان راکێشایە نێو دەریای پرشنگدارو کەلوپەلو ژنانی یەخسـیری پشـتێن شلوملیان لـە کەشـتیان بـارکرد، بـەڵام نیـوەی لەشـکرەکە دەگـەڵ ئاگامـەمنون، کـوڕی ئوتریـوس، رابـەری سـوپاو خـەڵکی مانـەوە.نیوەکـەی ترمـان سـواری کەشـتی بـووینو بـەدەم سـەوڵ لێدانـەوە دوور کەوتینـەوە، کەشـتیەکان زۆر خـۆش دەڕۆییشـتن، چـونکە خواوەنـدێك دەریـای بەگێـژەنگو شەپۆلی هێور کردبووەوە. کە گەییشتینە تینیـدوس، قوربانیمـان بـۆ خواوەنـدان کـرد، چـونکە تـا سەمەندی ئەوە بووین بگەینەوە ماڵی خۆ.بەڵام زیـوس هێشـتا نـەهاتبووە رەداو دڵـی نـەرم نـەبوو بوو، ئەو دڵڕەقە، جارێکی دی دووبەرەکیەکی توندی خستە نێوانمانەوە. ئەوە بوو تاقمێك بەسەر کردایەتی ئودیسیوسی داناو بەردەبار سەری پیرە کەشتیانیان بادایـەوەو بـەرەو لای ئاگامـەمنون ئوتریـوس زادە گەڕانـەوە تـا ئاشـتی بکەنـەوەودڵی بێننـەوە جـێ. بـەڵام مـن دەگـەڵ هـەموو ئـەو کەشتیانە کە دوام کەوتن، هەڵاتم، چونکە دەمزانی کە خواوەند نیـازی خراپـەو ئـوێنێکی لـە ژێـر سـەردایە. هـەروەها کوڕەکـەی (تیـدیوس)ش بـە خـۆو داروەسـتەو دەریاوانەکانیـەوە بەگـەڵ مـن کەوت. دوای ماوەیەك مینیلاوسی قژ زەردیش بە دوامانـدا هـاتو لـە لیسـبوس یـەکمان گرتـەوە.

لەویٚ کەوتینە راویٚژوتەگبیری ئەوەی کە ئایا بە دەریای خیوس-ی تووش و بە گیژەنگدا بەرەو دورگەی پسوریا بڕۆین و خیوس بخەینە دەستە چەپی خۆمان، یان بەرەو باشوور ببینەوەو بە (میماس)ی پڕگێژەلۆکەدا بڕۆین. ئەوسا پاڕاینەوە کە یەکێك لە خواوەندەکان نیشانەیەکمان پیشان بدەن، نیشانەمان درایەو فەرمانمان پێکرا بۆ ئەوەی بە زووترین کات رزگاربین، دەریا بەرەو یوبیا قەدبڕ بکەین، بایەکی نەرمی سازگار هەڵیکرد، کەشتییەکانمان هێندە بەخێرایی رێگەیان دەبڕی کە لەگەڵ ئێوارەدا گەییشتینە جیرایستوس، لەوێندەر دنیایەك ران و گۆشتی گامان بۆ پوسیدون کردە قوربانی کە بە سەلامەتی دەربازی کردبووین. دوای چوار رۆژ، دیومیدس-ی کوڕی تودیوس، رامکەری ئەسپان، بە خۆوجماعەتەکەیەوە لە ئارگوسدا لایان داو لەنگەریان گرت. بەڵام من نەوەستام، وبەرەو بیلوس بەردەوام بووم. بایەکە چۆن لە هەوەڵ رۆژەوە خواوەند هەڵیکردبوو، بە هەمان تین و تاوەوە بەردەوام بوو، وبۆ تاقە ساتێکیش نەی خست."

"بەڵێ، کوڕی ئازیزم، من بەو جۆرە هاتم، بێ ئەوەی ئاگام لە هیچ کەسێکی تر بێت، کێ لە ئاخیاییەکان رزگاری بوو، وکێیان مرد. بەڵام کە گەییشتمەوە مەفتەن، لێرە هەندێ هەواڵم بەر گوێ کەوتن، کە وەکو خۆی، بێ کەموزیاد، بۆتی دەگێڕمەوەو هیچ شتێکت لێناشارمەوە. دەڵێن (مورمیدون)انی ڕمباز، بەرابەرایەتی قارەمانی بە نێوبانگ، نیوبتولیموس، کوڕی ئەخیلی دلاوەرو جوامێر بە سەلامەتی گەییشت بوونەوە، هەروەها فیلوکتیتس-ی کوڕی پویاس-ش بەسەلامەتی گەیشتبووە، ئیدومینیوس-ش هەر هەموو هەڤاڵەکانی، ئەوانەی لە شەڕ دەرباز بوو بوون، بێ ئەوەی تاقە کەسێکیان لێ بکەوێتە دەریاوە، بەسەلامەتی گەیاندبووە کریت. سەبارەت بە ئاگامەمنونی کوڕی (ئوتریوس)ش هەڵبەتە بە خۆت، هەرچەندە لێرەوە دوور بووی، بیستووتە کە چۆن هاتووەتەوەو بە چ تەرنێك لەلایەن ئیجیستوسەوە کوژراوە، چۆن- ئیجیستوس بە سزای خۆی گەیەنرا. چەند خۆشە پیاو کوڕێکی لە پاش بەجێ بمێنێ و وەکو ئوریست-ی کوڕی ئاگامەمنون، بکوژەکەی بابی، ئیجیستوسی نامەرد بکوژێتەوە. جا هاوڕێم، هەرچەند سەیری بەژن و بالای بەرزو سەروسیمای جوانت دەکەم، پیاوێکی تەواوی، هیمەتی خۆت بنوێنە، پیاوێکی بوێرو پیاوانە بە، ناوی خۆت لە مێژوودا تۆمار بکەو با ناوت بکەوێتە سەر زاری نەوەکانی داهاتوو".

## کەڵکەڵەی تۆڵەئەستێنی تیلماخۆس لە خوازگارەکان

تیلماخۆسی دووربین بەرسڤی دایەوە: "ئەی نەستور، ئەی کوڕی نیلوس، ئەی مایەی سەربەرزی و شانازی گەورەی ئاخیان، بەڵێ، راستە ئەو کوڕە تۆڵەی بابی سەندەوە، ئاخییەکان نێوو نێوبانگی دەگەیەننە نەوەکانی دی. ئاخ خۆزگە خواوەندان هەمان هێزو تواناشیان بە من دەبەخشی تا بتوانم تۆڵەی ئەم هەموو گۆساخی وفزونکاری و ناڕەواییانەی کە خوازگارەکان دەرهەق بە من دەیکەن، بسەنم، بەڵام سەد حەیف ومەخابن خواوەندان ئەم بەخت وشانسەیان نە بە من و نە بە بابم نەداوە،بۆیە دەبێ سەبربکەین بزانین چ دەبێ."

## نەستور پشتیوانی تیلماخۆس دەکات

نەستور گوتی: "ئەی دۆستی من، باش بوو بەم قسەیە بیرت خستمەوە، بیستوومە کە گوایە خوازگـارانێکی زۆر، بـە بیـانووی خـوازبێنی دایکتـەوە، هـاتوونو بـە تـۆبزی لـە مـاڵی تـۆدا دایانکوتاوەو سوکایەتیت پێدەکەنو لێبڕاون ماڵت وێران بکەن. باشە تۆ بە خۆت ئەمەت قەبوڵ کردووە، یان خەڵکەکە بە فیتی خواوەندێك دژت وەستاون؟ کێ دەزانێ، بە چ مەعلوم ڕۆژێ لە ڕۆژان ئودیسیوس ناگەڕێتەوە،وبە تەنێو هەرخۆی، یان دەگەڵ هەموو ئاخییەکاندا تۆڵە لەم بەدخوایانە ناسەنێتەوە؟ بریا ئەتینا، خواوەندی چاوگەش، وەکو چۆن ئەو کاتانەی ئێمەی ئاخیایی، لە خاكو وڵاتی تەروادە، گیرۆدەی شەڕ بووین، پشتیوانی لە ئودیسیوسی سەرفراز دەکرد،بەو ئاوایەش بایەخی بە تۆ دەدا، هەرچەندە من تا ئەو کاتە نەمبینی بوو، هیچ خواوەندێك بەو ڕاشکاوییەی پالاس ئەتینا پشتیوانی ئەوی دەکرد، هیچ کەسێکیان خۆش ویستبێ. بریا بە هەمان شێوەش تۆی خۆشدەویستو بە دڵ بایەخی پێدەدای، هەنگێ دەتبینی ئەو خوازگارانە چۆن کونە مشکیان لێ دەبوو بە قەیسەریو داخوازییان لە بیر دەچووەوەو خوازگاری سەری دەخواردن.

## دڵبەندی تیلماخۆس بە قسەکانی خانەخوێیەکەی

تیلماخۆسی ژێر وەڵامی دایەوە: "پیرەباب، باوەڕ ناکەم ئەم قسانەی تۆ بەم زووانە بێنەدی. ئەم قسانە زۆر گەورەن، من سەرم لێیان سوڕ دەمێنێ، هەر بیریانیش لێناکەمەوە، تەنانەت ئەگەر خواوەندانیش مەبەستیان بێ، باوەڕ ناکەم بێنەدی، ئەوە بەختی من نیە."

## ئەتینا بیری تیلماخۆسی دەخاتەوە کە خواوەندان توانایان بەسەر هەموو شتێکدا هەیە

خواوەند، ئەتینای چاوگەش گوتی: "ئەی تیلماخۆس ئەم قسانە چین کە لە زاری تۆ دەرچوون؟ دەستی خواوەندان درێژە، هەر خواوەندێك لێبڕێ کەسێك ڕزگار بکات، دەتوانێ، چەندیش دوور بێ بە ئاسانیو بە سەلامەتی بۆ مەفتەنو زاگەی خۆیی بگەڕێنێتەوە. من بەش بە حاڵی خۆم ئەوەم پێ باشترە کە بەر لە گەڕانەوە بۆ ماڵی خۆم، لە ڕێگەدا تووشی هەزاران سەریەشەو کێشە ببم،نەك هەر بگەڕێمەوەو بکوژرێم، وەکو چۆن ئاگامەمنون بە پیلانودەسیسەی ئیجیستوسی نامەردو ژنە خیانەتکارەکەی، کلیتمنسترا کوژرا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مەرگ هەقە، یاسایەکی گشتییەو هەموو کەسێك دەگرێتەوە، تەنانەت خواوەندانیش ناتوانن هیچکەسێك، چەندیشیان خۆش گەرەك بێ،کە ئەجەلی هات، لە مەرگ ڕزگاربکەن."

## تیلماخۆس پرسیاری چۆنیەتی کوشتنی ئاگامەمنون لە خانەخوێیەکی دەکات

تیلماخۆسی دووربین وەڵامی دایەوە: "مینتور با واز لە باسی ئەم شتانە بێنین، خۆمان خەممان کەم نیە، من هیچ هیواو ئومێدێکم بە گەڕانەوەی نیە، خواوەندان پێشوەختە مەرگو گۆڕیان بۆ داناوە. بەڵام شتێکی تر هەیە، حەز دەکەم لە نەستووری بپرسم، چونکە ئەو لە هەمووان

دادپـەروەرترو زیـرەکترو دنیادیـدەترە، وەکـو دەڵـێن فـەرمانڕەوایی سـێ پشـتی کـردووە،و کـە تەمەشای دەکـەم لـە خواوەنـد دەچێت. ئـەی نەسـتور، ئـەی کوڕی نیلـوس، بـێ زەحمـەت راسـتو دۆغـری پـێم نـاڵێی کـە ئاگامـەمنونی پڕدەسـەڵات، کوڕەکـەی ئوتریـوس چـۆن لـەو وڵاتـە پـانو بەرینـەدا کوژرا؟ ئـەدی مینـیلاوس لـە کوێ بـوو؟ ئیجیستوسـی خوێڕیو خـاپینۆك، بـە چ فێڵێـك پیـاوێکی کوشـت کـە زۆر لـەو بـە تواناتـرو دەسـەڵاتتر بـوو؟ باشـە مینـیلاوس لـە ئارگوس، لـە نـاو ئاخیاکاندا نەبوو، یان لە شوێنێکی دیکەدا خەریکی گەشتو گەڕان بوو، کە ئیجیستوس ئەمـەی بە هەل زانیو ئاگامەمنونی بە نەهەق کوشت؟"

## نەستور بە درێژی وەڵامی میوانەکەی دەداتەوە

**نەستور، بەرسڤی دایەوەو گوتی:**

"جا کوڕی خـۆم مـادامێکی تـۆ پێت خۆشـە، مـن هـەموو راسـتیەکت پـێ دەڵـێمو ئیـدی بـۆ خـۆت دەتوانی تەسـەوری ئـەوە بکـەی کـە ئەگـەر مینیلاوسـی قژ زەرد، کـوڕی ئوتریـوس، لەگەڕانـەوەدا، ئیجیستوسی بە زیندویەتی لە ماڵی خۆیدا بیدیبایە چی رووی دەدا.

هەنگێ خەڵکی ئاخیایی نەك هەر جەنازەکەیان بە خاك نەدەسپارد، بەڵکو لـە دەشـتا، لـە دووری شـارا، فڕێیـان دەدایـە بـەر کسـۆکانو سیسـارەکە کەچـەڵەو داڵاشـانو هـیچ ژنێکـی ئاخیـایی بـۆی نەدەگریا، چونکە کارێکی یەجگار نامەردانەو بێ شـەرەفانەی کردبـوو. لـەو ماوەیـەدا کـە ئێمـە لـە تـەروادەدا لـە گەرمـەی شـەڕێکی بـێ رەزاو قـورس دا بـووین، ئیجیستوسـی نامـەردو نمـەك حـەرام خۆی بە گۆشـەیەکی چەپەکی ئارگۆسـدا، کـە قەدەخـەو پـاوانی ئەسـپان بـوو، کردبـوو. بـە زمـانی تەڕو لووس کەوتبووە تەفرەدانو لە خشتەبردنی ژنەکەی ئاگامەمنون. لە هەوەڵەوە کلیتمنسترای جوانوخشـکۆك ملـی بـۆ بـێ ئابڕوویی نـەدابوو. بـەڵام بـە تەبیعـەت کەسـێکی سادەودڵسـاف بـوو، هەروەها ئاشق و هۆنەرو شایەرێکی لەگەڵدا بوو، کە ئاگامـەمنون وەخـتێ بـۆ تـەروادە رۆیـی بـوو، بە دانسقە هەڵی بژاردبوو کە ئاگای لـە ژنەکـەی بـێ. بـەڵام کـە خواوەنـدان لێبڕان ئـەو ژنـە ریسـوا ببـێ، ئیجیسـتوس، شـایەرەکەی بـۆ دوڕگەیـەکی چـۆڵی بـێ ئـاوەدانی بـرد، تـا لەوێنـدەر ببـێ بـە خۆراکی قەلوداڵان. هەنگێ ژنـەی تـاینی لـە خشـتەبردو بـۆ ماڵـی خـۆی بـرد. ئیـدی ڕانـە گۆشـتی دنیـای لـە قوربانگـەی خواوەندانـدا کـردە بریـانو، دیاریـەکی زۆری لـە چنـراوو زێـڕان بـە دیـواری قوربانگەکانەوە هەڵواسـی، چـونکە کـارێکی گرینگـی ئـەوتۆی کردبـوو، کـە بـە خـەویش بـە تـەمای نەبوو.

لەو سەروبەندەدا منومینیلاوس، کە هاوڕێو دۆست بـووین، بـە کەشـتی لـە تـەروادەوە بـۆ وڵات دەگەڕاینەوە، کە گەییشتینە سونیون-ی دەروازەی شـاری ئـەتینا، لەوێنـدەر ئـەپولومان لـێ نـازڵ بوو، بەر ناسکەتیرانی داینو کەشتیڕانەکەی مینیلاوسی پێکاو لەو کاتـەدا کـە سـوکانی کەشـتییە خێراکەی بە دەستەوە بوو، کوشتی. ئەو کەشتیڕانە فرونتیس-ی کوڕی ئونیتـور بـوو، کـە کـەس نەبوو لە کەشتیڕانیدا، بە تایبەتی لە کاتی هەڵکردنی گەرداوو گێژەنگو گێژاواندا، شـان بـدات لـە شانی. ئیدی مینیلاوس، هەرچەندە پەلەی گەڕانـەوەی بـوو،لەوێنـدەر مایـەوە، تـا هاوسـەفەرەکەی کفنو دفن بکاتو ڕێوڕەسمو سرووتی جـەنازەی بـۆ جێبـەجێ بکـات. بـەڵام کـە بـە دەریـای مـەی

ئاسادا کەوتەوە ڕێو گەییشتە هەڵدێرەکانی مالیا (Malea)، زیوس داوێکی بۆ نایەوەو بایەکی بەترەف و تووشی لێهەڵکرد، ودەریا بە جۆرێ خرۆشاو کەوتە شەپۆلدان، هەر شەپۆلێکی بە قەد چیایەك. ئیدی کەشتیرانی بە تەواوەتی لێدڕژوار کرد. بۆیە ناچار کەشتییەکانی کرد بە دوو دەستەوەو بەشێکی بردن بۆ کریت، بۆ ئەو شوێنەی کە کودونیەکان، لە دەوروبەری یاردانوس دا دەژین و ئێستا لێژاییەکی زۆر لێژی لێیە، لە نزیکی مەرزی گورتیندا دەرژێتە دەریای بە تەم و مژەوە، کە بای باشور هەڵدەکات، ئیدی شەپۆل بە شەپۆل دەڵێ بەولاوە،وهارەو هاژەی دەریا دنیا هەڵدەگرێو تا نزیکی فایستوس گێژەنگ وگێژاو بەردەوام دەبێو لەوێ خۆی بە تاوێرە بەردێکا دەدات و هێور دەبێتەوە، هەندێ لە کەشتییەکانی مینیلاوس گەییشتنە ئەو شوێنە،و خەڵکەکە بەزەحمەتێکی زۆر خۆیان لە مردن ڕزگارکرد. بەڵام کەشتییەکان خۆیان بە تاوێرەکەدا کێشاو شکان. سەبارەت بەو پێنج کەشتییەی کە مانەوە، باو شەپۆلان بەرەو دەریاکانی میسریان ڕاپێچ کردن. ئیدی مینیلاوس لەوێندەر، لەنێو قەومێکی بێگانە، زمان جیاوازدا، وێڵو سەرگەردان بوو،سەروەت و سامان و زێڕێکی زۆری کۆکردەوە. ئیجیستوس، ڕێك لەو کاتەدا، لە وڵاتی خۆیدا زەفەری هێناو ئەو نامەردیەی کرد. دوای ئەوەی ئاگامەمنونی کوشت، حەوت دانە ساڵ حوکمی میسینا، میسینای کانگەی زێڕو سەروەت وسامان، کرد.وخەڵکەکەش لە ئەمرۆ ڕای ئەودا بوون. بەڵام لە ساڵی هەشتەمدا (ئوریستیس)ی حەلاڵزادە لە ئەتینا گەڕایەوە تا تۆڵە لە بکوژەکەی بابی، لە ئیجیستۆسی نامەرد، کە بابە ناودارەکەی کوشتبوو بسەنێتەوە. دوای ئەوەی کوشتی ڕێوڕەسمی جەنازەی بۆ دایکە قێزەونەکەیو ئیجیستوسی نمەك حەرام و نامەرد بەڕێوەبردو نان وخوانی بۆ ئارگوسیەکان سازکرد. ئا لەو ڕۆژەدا مینیلاوس، بە خۆو کەشتییە پڕ لە گەنج و گەنجینەکانیەوە بۆ وڵات و مەفتەن گەڕایەوە.جا برادەر تۆش زۆر لە وڵاتی خۆت دوور مەکەرەوە، سەروەت وسامانەکەت بۆ ئەو نامەردو بێ شەرمانە بەجێ مەهێڵە، چونکە دوورنیە لە غیابی تۆدا موڵك وماڵەکەت بخۆن و بەسەر خۆیانیا دابەش بکەن. هەنگێ سەفەرەکەت بە هیچ دەچێو تەنیا گەوجیەتیت بۆ دەمێنێتەوە.. بەڵام وێڕای ئەمەش ئامۆژگاریت دەکەم و پێت دەڵێم کە بڕۆ بۆ لای مینیلاوس، چونکە تازە لە نێو خەڵکانێکی شەڕانی گەڕاوەتەوە، کە بە خۆیشی هیچ ئومێدێکی بە گەڕانەوە نەبووە، یانی شتێکە لە زیادە ماوەو گەڕاوەتەوە. تۆفان لە دەریایەکی هێندە گەورەو سامناك دا وێڵو سەرگەردانی کردبوو، کە باڵدار بە باڵداری خۆی بە ساڵێك نایبڕێ. جا ئێستا خۆت وهاوڕێکانت سواری پیرە کەشتی ببن و بە دەریادا بەرەو لای ئەو بەڕێ بکەوە. یان ئەگەر بتەوێ بە ڕێگەی زەمینی دا بڕۆیت، من عەرەبانەو ئەسپانت بۆ ئامادە دەکەم، کوڕەکانیشم لە خزمەتتدان و تا لای سیدیمونی پیرۆز، نشیمەنی مینیلایوسی قژ زەرد دەگەڵت دێن. ئیدی ڕووی لێبنە کە هەموو ڕاستیەکت پێ بڵێ. دڵنیابە کە درۆت دەگەڵدا ناکات، چونکە پیاوێکی خانەدانەو تا حەزبکەی ڕاستگۆیە."

## ئەتینا داوای پێشکەشکردنی قوربانی دەکات

کە قسەکانی تەواوکرد، ڕۆژ ئاوا بوو بوو،وتاریکی باڵی بەسەر دنیادا کێشا. ئەتینا، خواوەندی بینای چاوتیژی چاوگەش ڕووی تێکردن وگوتی: "پیرەمێرد، ئەوەی گێڕاتەوە، هەموو ڕاست بوو

دەی ئێستا رابە زمانی قوربانیەکان ببڕەو بادەمان بۆ بگەڕەوە تا بە یادی پوسیدون و خواوەندەکانی دی بخۆینەوەو نۆشخواری بکەین، وئەوجا بیر لە خەوتن بکەینەوە، کاتی نووستن هاتووە. دنیا تاریك بووەو با بڕۆین، ناکرێ لەوەی پتر لە بەزمو ئاهەنگی ئاینی خواوەنداندا دانیشین، چونکە بەیانی زوو لە خەو رادەبین و دەکەوینە رێ."

## نەستور نایەڵێ میوانەکانی بڕۆن

هەرکە ئەتینا لە قسەکانی بووەوە، هەموو بە قسەیان کرد، پێشخزمەتان ئاویان بە دەستی میوانەکاندا کرد، خولامان جامەکانیان تەژی بادە کرد. دوای ئەوەی چەند دڵۆپێکیان وەکو نیشانەی قوربانی بە عاردیدا پرژاند، بەسەر ئامادەبووانیاندا دابەشکرد. ئەوجا زمانی حەیوانە قوربانیەکانیان خستە سەر ئاگر،وبادە پرژێنیان کرد. دوای ئەوەی تێرو پڕیان خواردەوە ئەتیناو تیلماخۆسی خواوەندئاسا هەستان بڕۆنەوە بۆ لای کەشتییە قوڵوگەورەکەیان. بەڵام نەستور پێشی لێگرتن وگوتی:

"نە زیوس و نە خواوەندانی دیکە، ئەوە قەبوڵ ناکەن ئێوە لێرە بڕۆن و بچن لە ناو کەشتیەکانت بخەون، وەکو ئەوەی من قەلەندەرێکی دەستکورتی هەژار بم و هیچ نوێن و پێخەفێکم نەبێ کە خۆم و میوانەکانم بە ئیسراحەت پێی بخەوین. نا، ماڵەکەم پڕە لە رایەخ و لێفەو نوێنی جوان، هەڵبەتە تا من لە دنیادا بم، مەحاڵە بێڵم کوڕی ئودیسیوسی هاوڕێی دلاوەرم، لەسەر تەختێکی رەق و تەقی کەشتی بنوێ، ئەگەر منیش نەمام کوڕەکانم پێشوازی هەر میوانێك دەکەن کە روو لە ماڵی من بکات."

## تیلماخۆس لە ماڵی نەستور دەنوێ

### هەنگێ ئەتینا،خواوەندی چاوگەش هەڵیدایەو گوتی:

"هاوڕێی پیر، قسەی تۆیە، هەقە تیلماخۆس بە گوێت بکات، چونکە وا باشترە. بۆیە هەر ئێستا لەگەڵ تۆدا دێ تا لە ماڵی ئێوە بخەوێ. بەڵام من بەرەو کەشتییە رەش دەڕۆم تا هاوڕێکانم دڵگەرم بکەم و هەموو شتێکیان بۆ باسبکەم و فەرمان و دەستووریان بدەمێ. من شانازی بەوە دەکەم کە لە هەموویان بە تەمەنترم، ئەوانی دی هەموو گەنجن و تەنیا لە رووی دۆستایەتیەوە بەگەڵم کەوتوون و بوون بە هاوڕێم. هەر هەموویان لە تەمەنی تیلماخۆسی دلاوادان، بۆیە دەبێ بچمەوە بۆ لای کەشتیەکەو لەوێندەر بنووم. چونکە دەبێ سارەزی بچم بۆ لای کوکانیەکان، قەرزێکی کۆن و زۆرم لەلای یەکێکە. بەڵام سەبارەت بەولاوە، کە میوانی تۆیە، وهاتووەتە ماڵەکەت، بە عەرەبانەیەك لەگەڵ یەکێك لە کوڕەکانت دا بۆ جێ مەبەستی بنێرە، هەڵبەتە مەمنونی تۆ دەبێ ئەگەر خۆشبەزترین و بەهێزترین ئەسپانی بدەیتێ."

## نەستور خواوەند ئەتینا دەناسێتەوە

کە خوابانو، ئەتینای چاوگەش لە قسەکانی بووەوە، لە شێوەی هەڵۆیەکدا لە شەقەی باڵیدا، هەموو ئەوانەی کە دیتیان حەپەسان، نەستوریش کە ئەمەی بینی سەری سوڕما، دەستی تیلماخۆسی گرت وگوتی: "برادەر من وای دەبینم کە رۆژێ لە رۆژان دەبی بە قارەمانێکی

گەورە، وهەرگیز کەسێکی ترسنۆك و زەبوون دەرناچێت، مادامێکی بەم گەنجێتییە خواوەندان تاقیب و ڕێنوێنیت دەکەن، جا کام خواوەندە! ئەوەی دیتمان گومانی تیا نیە جگە لە کیژە ڕەسەن نەژادەکەی زیوسی، خواوەندی هەر سەربەرزی ڕووباری تریتون، کەسی دی نەبوو، کە لە نێو هەموو ئارگوسیەکاندا هەمان هاوسۆزی دەگەڵ بابتدا، دەگەڵ ئودیسیوسی دلاوەرو خانەداندا هەبوو..." ئەوسا لەسەری ڕۆیی: "ئەی خواوەندی موبارەك بە کەرەمی خۆتمان دەگەڵ بکە، ناوو ناوبانگی چاك بە خۆم‌ومنداڵەکانم‌و ژنەکەم ببەخشە، منیش لە بری ئەوە گوێرەکەیەکی قەڵەوی یەکساڵ، نیوچەوان پان، کە بەنی بەشەر نەی خستبێتە ژێر نێر، قۆچەکانی لە زێڕ دەگرم، ئا لێرەدا، بۆت دەکەم بە نەزرو قوربانی."

## نەستوروکوڕەکانی نوێژ بۆ ئەتینا دەکەن

بەو جۆرە نوێژو نزای خۆی کرد، ئەتینا گوێی لێ بوو، دوعاو نزاکەی گیرا کرد. ئەوسا پیرەمێرد هەستا، بەرەو کۆشکە جوانەکەی، وەپێش کوڕو زاواکانی کەوت. کە گەییشتنە ئەوێندەر، هەرکەسەو لەسەر کورسیەك یان تەختێك دانیشت، پیرەمێرد، بادەیەکی گەوارای کۆنی یازدە ساڵەی، کە کارەکەرەکەی دروستی کردبوو وتازە سەرەکەی لابردبوو، لە گۆزەیەك دا شڵەقاندو ئەوسا ئەمری کرد بۆیان لە جام بکرێ، هەنگێ بە یادی ئەتیناوە چەند دڵۆپە شەرابێکی پرژاندە سەر زەوی،و بەدەم نۆشخواریەوە بە کوڵ‌ودڵ کەوتە نوێژ بۆ ئەتینای کیژی زیوس.

## میوان‌و خانەخوێ دەنوون.

دوای ئەوەی قوربانی شەرابیان پرژاندو تێروپڕیان خواردەوە،وهەر کەسە ڕۆیی لە جێی خۆی بخەوێ. نەستور، تەختێکی چەرمی مکومی لە ژوورێکی تایبەتیدا بۆ ئامادەکرد، ڕێك شان بەشانی پیسیستراتوس-ی سەرکردەی جەنگاوەران، کە تاقە کوڕی عازەبی بێ ژنی نەستور بوو، و هێشتا لە ماڵی بابی دەژیاو نێزەدارێکی لەزەبر بوو. بەڵام نەستور بە خۆی لە ژوورێکی ناوەوەی کۆشکە بەرزەکەیدا،و لەگەڵ ژنەکەیدا نووست.

## نەستور فەرمان دەدات

کە سپێدە بە قامکە گوڵئاساکانیەوە، لە ئاسۆوە بەیانی دا، نەستور لە جێگە وەدەرکەوت، چوو لەسەر بەردە سیقال کراوەکانی بەر دەرگاکانی کۆشکە بەرزەکەی دانیشت. بەردەکان هێندە سپی‌و لوس بوون دەبەریقانەوە. جاران نیلوس، کە لە ڕاوتەگبیردا نیمچە خوایەك بوو بۆ خۆی، لەو شوێنەدا، لەسەر ئەو بەردانە دادەنیشت. بەڵام ئێستا مەرگ بۆ خۆی بردبووەوەو چوو بوو بۆ خانەی هادیس. ئەمێستا نەستور لە شوێنەکەی ئەو دانیشتبوو، گۆچان بە دەست، خاوەنداری ئاخیاییەکانی دەکرد. کە کوڕەکانی لەخەو هەستان، هاتن لە دەوری خڕبوونەوە: ئەخیفرون ستراتیوس، بیرسیوس، ئاریتوس، و تراسیمیدس-ی خواوەندئاسا، وئەوسا کوڕی شەشەمی، بیسیستراتوس هات، ئەوجا تیلماخۆسی خواوەند ئاسایان بۆ لای نەستور هێناو لەگەڵ خۆیاندا دایان نیشاندو نەستور ڕووی تێکردن‌وگوتی:

"کوڕەکانم، خێراکەن چیتان پێ دەڵێم وا بکەن. وتا ئەتینام بەر لە هەموو خواوەندەکانی دی لێ رازی بێ، ئەو ئەتینایەی کە دوێنێ لە ئاهەنگوبەزمی بەشکۆی خواوەندان دا بەشداری کردو خۆی نیشاندام. دەیسا بەخۆ بکەون، با یەکێکتان بڕوات بۆ دەشتو بە گاوانەکە بڵێ گوێرەکەیەکی مێچکەم بۆ هەڵبژێریو خێرا بۆ ئێرەی بێنێ. یەکێکی تر بروا بۆ لای کەشتییە رەشەکەی تیلماخۆسی هێژاو هەموو دەریاوانەکانی بۆ ئێرە بێنێ، تەنیا دوانیان لەوێندەر بەدیار کەشتییەکەوە بمێننەوە. هەروەها یەکێك بچێت (لایرسیس)ی زەرنگەر بدۆزێتەوە، بۆ ئێرەی بێنێ تا قۆچی گوێرەکەکە زێرکفت بکات. با ئەوانی دی لێرە دەگەڵ ئێمەدا بمێننەوە، کارەکەرو قەرەواشەکان راسپێرن کە خواردنێکی بەلەزەتو پوختە دروست بکەن، تەختوکورسی ئامادە بکەن، چیلکەوداران لەمبەرو ئەوبەری قوربانگەکە کەڵەکە بکەن بۆ برژانو سوتانی قوربانیەکەو ئاوی سازگارو زوڵاڵیش لە کانی بێنن.

## نەستور گوێرەکەکە ئامادە دەکات

هەرکە نەستور لە قسەکانی بووەوە، هەرکەسەو بە پەلە چوو بەلای ئەو ئیشەوە کە پێی سپێردرا بوو. گوێرەکەی گۆرین لە دەشت هێنرایەوە، هاوڕێیانی تیلماخۆسی هەژی، لە کەشتییە تیژڕۆیەکەوە هاتن، کابرای زەرنگەر بە خۆو کەرەستەی زەڕنگەرییەوە، کە بریتی بوو لە چەکۆشو سندانو ماشەو گیرەوگاز، هات. هەروەها ئەتینا بە خۆیشی هات تا قوربانیەکە بدێنێو قەبوڵی بکات. دوای ئەوە نەستوری پیرەمێرد هات، زێڕەکەی دایە کابرای زەڕنگەر، ئەویش کارێکی زۆری لەسەر کردو ئەوسا قۆچی گوێرەکەکەی زێرکفت کرد. ئەتینا زۆری بە دڵ بوو. ستراتیوسو ئەخیفرونی هێژا گوێرەکەی گۆرینیان بە شاخ هێنا، ئاریتوس ئاوی پاکی هێنا کە دەستیان بشۆن، بە دەستێك ئافتاوەیەکی نەخشینی هەڵگرتبوو، وبە دەستەکەی تری زەمیلەیەك جۆی هەڵگرتبوو. تراسیمیدس-ی جەنگاوەریش بە خۆو تەورێکی تیژەوە وەستا بوو و ئامادە بوو لەملی گوێرەکەکە بداتو سەری ببڕێ. (پیرسیوس)ش سەتڵێکی بە دەستەوە گرتبوو کە خوێنەکەی تێبکات. دوای ئەوە نەستوری پیر، دەستی شۆردو ئاوی پاكو جۆیەکەی پرژاندو رێوڕەسمی قوربانیەکەی کردەوە،و بە دەم وێردو نزایەکی پڕ جۆشەوە بۆ ئەتینا، چەپکێ لە قژی خۆی خستە ئاگرەکەوە."

## کوڕەکەی نەستور گوێرەکەکە دەکوژێتەوە

دوای ئەوەی لە وێردو نزاونوێژو پرژاندنی دەنکە جۆیان بوونەوە، تراسیمیدس-ی دلاوەر لە قوربانیەکە چووە پێشێو تا هێزی تیا بوو تەورێکی لە ملی دا، پیرەتەور دەمارەکانی بڕیو گوێرەکەکە خاو بووەوەو کەوتە سەری عاردی. هەموو ئافرەتەکان، کیژانی نەستور، بووکەکانیو یوردیسی هاوسەری کە کیژە گەورەی کلومینوس بوو لە هەلهەلەی شادیان دا. ئەوسا پیاوەکان، سەری گوێرەکەکەیان لە عاردی بەرز کردەوەو پیسیستراتوس، گەورەی جەنگاوەران، سەرەکەی بڕی. کە خوێنە رەشەکەی لەبەر رۆییو گیانی دەرچوو، کەلەشەکەیان لەتوپەت کرد، زۆر بە جوانی پارچە رانەکانیان بڕی، لە هەردوو دیوەوە چەورییان لێناو چینێ گۆشتی خاویان نایە سەر. ئەوسا نەستوری پیر هاتە بەرەوەو لەسەر ئاگرەکەی، کە بە دار کرابووەوە، داناو بادەو

شەرابی ئاڵی بەسەردا پرژاند، گەنجەکان لە دەوری وەستا بوون، و سەرو شیشی پێنج لقەیان بەدەستەوە بوو. کە ڕانەکان برژان و پێگەیین و گۆشتەکەیان خوارد، پاشماوەکەیان کردە پارچەی بچووك بچووك وکردیان بە شیشەکانەوەو لەسەر ئاگرەکە برژانیان.

## کیژەکەی نەستور تیلماخۆس دەشتوات و....

لەو کاتەدا پولیکاستی نازدار، کە بچووکترین کیژی نەستوری کوڕی نیلوس بوو، حەمامی بە تیلماخۆس کردبوو، سەرولەشی بە زەیتی زەیتون چەور کرد، چاکەت و عەبایەکی جوانی لەبەر کرد، کە لە حەمام هاتە دەرێ دەتگوت خواوەندە، ڕۆیی و لە تەنیشت نەستوری میللەت پەروەرەوە دانیشت. کە گۆشتەکە برژا، لە شیشەکانیان داماڵی و لەسەر خوان دانیشتن، ساقیانی پایەبەرز هەستان و بادەیان بۆ لە جامی زێڕ کردن. کە تێرو پڕیان خوارد و خواردەوە، نەستوری شۆڕەسوار هەستا، ڕووی تێکردن وگوتی:

"کوڕەکانم، ڕابن، هەر ئێستا ئەسپە یاڵ جوانەکان بۆ تیلماخۆس بێنن و لە عەرەبانەکەیان ببەستن، تا یەکسەر بەڕێ بکەوێ!".

## نەستور گالیسکەو ئەسپ و ئازووقە بۆ میوانەکەی دابیندەکات

هەرکە لەو قسانە بووەوە، کوڕەکانی هەستان، ئەمرەکەیان بە جێ هێنا، یەکسەر ئەسپانی خۆشبەزیان هێناو لە گالیسکەیان بەست. کابانی ماڵ هات، نان و شەراب و گۆشتی باش، خواردنی میرو پاشایانی زیوس زادەی لە گالیسکەکە بارکرد، ئەوسا تیلماخۆس سواری گالیسکە جوانەکە بوو، پیسیستراتوس-ی کوڕی نەستور، سەرکردەی جەنگاوەران، لە تەنیشتییەوە سواربوو، جڵەوی ئەسپەکانی بە دەستەوەگرت. قامچیەکی بە ئەسپەکاندا کێشا، وەکو باڵدار دەرودەشتیان دەبڕی و قەڵا بەرزەکەی پیلوسیان بە جێهێشت. بە درێژایی ئەو ڕۆژە بە نیرو گالیسکەوە هەر ڕێیان کرد.

## تیلماخۆس لەگەڵ پیسیستراتوسدا سەفەردەکا

کە ڕۆژ ئاوا بوو،دنیا تاریك بوو، جووتە ڕێبوار گەییشتنە فیری، چوونە ماڵی دیوکلیس، کوڕی ئورتیلوخوس، نەوەی ئەلفیوس، شەویان لەوێ ڕابواردو دیوکلیس میوانداریيەکی شایستەی کردن.

کە سپێدە،وەکو منداڵێکی قامك گوڵین، لە ئاسۆوە دەرکەوت، ئەسپەکانیان لە گالیسکە بەست و جووتە کوڕ سواری گالیسکە جوانەکە بوون، لە دەرکەو دەروازەکان وەدەرکەوتن. پیسیستراتوس قامچیەکی بە ئەسپەکاندا کێشا، ئەسپ وەکو باڵدار بۆی دەرچوون، ڕێگە بەرگەی نەدەگرتن. گەیینە دەشتێکی بەرین، یەکپارچە گەنمەجاڕ بوو، لێرەدا بە فەزڵی ئەسپە خۆشبەزەکانیان گەیینە کۆتایی سەفەرەکەیان، ئیدی خۆرئاوا بوو وتاریکی شەو باڵی بەسەر هەموو لایەکدا کێشا.

***

پەراوێز:

*- پۆسیدون: خواوەندی دەریا

*- ئەمفیتریتی:هاوسەری پۆسیدون،واتە شابانۆی دەریا

*- پریام:پاشای تەروادە بوو لە کاتی شەڕی تەروادەدا.

*- ئەیاس:یەکێك بوو لە جەنگاوەرانی یونانی لە شەری تەروادەدا.

*- ئەخیل:یەکەمین قارەمانی شەری تەروادە بوو.کە منداڵ بوو دایکی لە اوی روباریستیکسی هەڵکێشا تا ببیٚ بە کەسێك چەك کاری تێنەکات و بریندار نەبێت،بەلاّم لەبەر ئەوەی هەردوو پاژنەی بە دەست دایکییەوە بوو لە کاتی لە ئاو هەڵکێشانەکەدا تەڕ نەبوون،وهەر لە پاژنەشییەوە بریندار بوو وپێی مرد.

*- پاترۆکلۆس:لەگەڵ ئەخیل دا گەورە بوو،ودۆستایەتییەکی گیانی بە گیانیان لە نێواندا چێبوو کە دەماودەم دەگێڕدرایەوە.

*- ئەنتیلۆخۆس:کوری نەستورە.لەشەری تەروادەدا ئازایەتییەکی زۆری نواند و ناوبانگێکی فرەی پەیداکرد.لە دۆستە خۆشەویستەکانی ئەخیل بوو،وئەو خەبەری مەرگی پاترۆکلۆسی پێڕاەیاند و بە دووقۆڵی زۆری بۆ گریان.

*- تۆدیۆس:پاشای کالودونە.

*- دیومیدیس:کوری تۆدیۆسە.سەرکردایەتی هەژدە کەشتی کرد دژی تەروادە.لەو شەرەدا ئازایەتییەکی ئەوتۆی نواند،هەڵبەتە بە پشتیوانی ئەتینا،کە لە دوای ئەخیل وەکو ئازاترین قارەمانی گریك ناوبانگی دەرکرد.

*- مورمیدون:ئەو جەنگاوەرانە بوون کە لە شەری تەروادەدا ،ئەخیل سەرکردایەتی دەکردن.

*- ئیدومینیوس:پاشای کریت بوو.یەکێك بوو لە قارەمانە نەبەزەکانی شەڕی تەروادە.

*- کلیتمنسترا:ژنی ئاگامەمنوون بوو.

*- ئەپۆلۆ: خواوەندی هەتاو.

*- ناسکە تیر:بە تیرەکانی ئەپۆلۆ دەوترا،گوایە ئەوانەی بەر تیری ئەو دەکەوتن،بە ئاسانی و بیٚ ئازار دەمردن.

*- هادیس:خواوەندی بەرپرسی جیهانی مردووانە،وهیچ بەزەییەکی بەرانبەر بە هیچ خەلقەندەیەك نییە.

## سروودی چوارەم

### کورتەی سروودەکە:

گەییشتنە لاسیدیمون، مینیلاوس پێشوازیەکی گەرمی لێکردن. کۆشك‌و سەرایەکی شاهانەی یەجگار بە شکۆی هەبوو. تیلماخۆس غەرقی تەمەشا بوو، بۆیە مینیلاوس بۆی گێڕایەوە کە ئەو دارایی‌و سەروەت‌و سامانەی لە کوێ بە دەست هێناوە. ئەوسا باسی کرد کە لە نێو هەموو هاوڕەزمەکانی خۆی دا داخی بۆ ئودیسیوس خواردووە. تیلماخۆس بەمەدا وا هەست دەکات کە بابی مردووە، بۆیە دەست بە گریان دەکات، ئیدی مینیلاوس‌و هیلین دەیناسن. ئیدی بیسیستراتوس مەبەست‌و نیازی سەفەرەکەیان ئاشکرا دەکات. داخ‌و کەسەرو خەفەت خواردنی مینیلاوس دڵی هەموو ئامادە بووان تەنگ دەکات،ودەیانخاتە گریان، بەڵام بیسیستراتوس دڵیان دەداتەوەو لەگریان دەکەون. هیلین‌ومینیلاوس یادی قارەمانیەتی‌و دلاوەریەکانی ئودیسیوسیان کردووەو زۆریان ستایش کرد... گوتیان ئودیسیوس ماوە، بەڵام کالیپسۆ، پەری دەریا لە دورگەکەی خۆیدا دەستبەسەری کردووە.. لەم بەینەدا خوازگارەکان لە سەفەرەکەی تیلماخۆس ئاگادار بوونەوەو رێککەوتن لە گەڕانەوەیدا داوێکی بۆ بنەنەوە. پنلوپ کە بە نیازو نەخشەکەی زانین، یەجگار نیگەران‌وپەریشان بوو. ئەتینا شەبەنگێکی لە شێوەی ئیفتیمی دا بۆ لا نارد تا دڵخۆشی بداتەوە. خوازگارەکان خۆیان لە بۆسەدا، بەڵکو تیلماخۆس بەگیر بێنن.

***

### تیلماخۆس دەگاتە ماڵی مینیلاوس

جووتەلاو گەییشتنە لاسیدیمون. لاسیدیمون لە دەشتانیەکی بەرینی پڕ دۆڵی تەنگدا بوو، بە ئەسپ و گایسکەوە بەرەو کۆشك وسەرا شاهانەکەی مینیلاوس هەڵگەڕان. سەیریان کرد دەگەڵ ئاپۆڕای خزم وکەسوکارا سەرگەرمی ئاهەنگی زەماوەندی کوڕەکەی و کیژە بە حەیاو حورمەت و داوێن پاکەکەیەتی. ئەم کیژەی بە بووکی بۆ کوڕەکەی ئەخیل، ئەخیلی شەڕڤانی سەفدڕ دەنارد. چونکە وەختیٚ لە تەروادە بوو، بەڵێنی بە ئەخیل دابوو ئەم کیژەی بدات بە کوڕەکەی ئەو، ئێستاش بە ئیرادەی خواوەندان ئەو زەماوەندە بەڕێوەدەچوو. ئیدی بەو جۆرە خەریك بوو بە ئەسپ و گالیسکان بۆ شاری مەرمیدونی دەنارد کە کوڕەکەی ئەخیل حوکمی دەکرد. سەبارەت بە کوڕەکەشی کە تازە پێدەگەیی،وناوی میگاپینتس بوو، کیژی (ئەلیکتۆر)ی بۆ مارە کردبوو، لە ئەسپارتەوە دەیانگواستەوە بۆ لاسیدیمون. میگاپینتس، کوڕێکی ئازا بوو، خۆشەویست و ئازیزی بابی بوو. ئەم کوڕەی لەکارەکەرێکی خۆی بوو بوو. چونکە خواوەندان کردبوویانە کارێك کە هیلین، دوای ئەوەی هیرمیونی، زێدەجوان و قژ زەردو ئافرۆدیێت ئاسایی بوو، لە سکوزا وەستا بووەوەو ئومێدی منداڵبوونی نەبوو. بەو جۆرە دەرودراوسیٚ و خزم و کەسوکاری مینیلاوسی سەرفرازوسەربەرز، لە هۆڵێکی گەورەو بەرزدا زەماوەندو ئاهەنگی خۆشییان دەگێڕا. هۆنەرو شایەرێکی موبارەك بە دەم گیتار لێدانەوە گۆرانی بۆ دەوتن و جووتێك پاڵەوان و ئاکرۆباتیش خۆ نوێنی ومەیدانداریان دەکرد.

## خزمەتکارەکەی مینیلاوس جووتە میوان دەبینیٚ

هەنگیٚ تیلماخۆسی دلاوەروکوڕە ناودارەکەی نەستور، بە خۆو ئەسپەکانیانەوە لەبەر دەرگای کۆشك و سەراکەدا وەستان. لەو کاتەدا (ئیتیونوس)ی خزمەتکاری چاپوك و چەلەنگی مینیلاوسی سەربەرز هاتە دەریٚ و دیتیانی، تەمەشایەکی کردن و بە هەشتاو چوو بۆ ژوورەوە تا ئاغای، مینیلاوسی گەلپەروەر لە هاتنی ئەوان ئاگادار بکاتەوە. لێی چووە پێشەوەوگوتی: "ئەی مینیلاوس، ئەی زیوس زادە، دوو پیاوی غەریب لەبەر دەرگان، بە سیمایاندا لە نەوەو نەتیرەی زیوس دەچن، چ بکەین؟ ئەسپەکانیان لیٚ وەرگرین ودایانکەین یان ئیزنیان بدەین بچن بۆ شوێنێکی ترو خانەخوێیەکی دی بۆ خۆ بدۆزنەوە؟".

## مینیلاوس پێشوازی میوانەکان دەکات

مینیلاوسی قژزەرد، زۆر تووڕە بوو، بە خزمەکارەکەیدا هەڵشاخی وگوتی: "ئیبتیونوس، ئەی کوڕی بویتوس تۆ جاران ئەوەندە بیٚ ئاوەز نەبووی. ئەم قسە منداڵانەیە چیە، هەڕە ئیبتیونوس، خێرا ئەسپەکانیان لێوەرگرە، لە عەرەبانەکەیان بکەوە، خۆشیان بۆ ئێرە بێنە با بەشداری شایی و ئاهەنگەکە بن. بەسەر رزقی خۆدا هاتوون. باشە من و تۆ بەر لەوەی بگەینەوە ئێرە کەممان نانی خەڵکانی میوانپەروەر خواردووە، کەم لە زیوس پاڕاوینەتەوە کە بە سەلامەتی و بیٚ خەم بگەینەوە جیٚ، وبتوانین چاکەو پیاوەتی خەڵکی بدەینەوە!".

## مینیلاوس خزمەتی زۆری میوانەکان دەکات

کە مینیلاوس ئەو قسانەی کرد، خزمەتکارەکەی بە پەلە لە هۆڵەکە وەدەرکەوت. ئەمری بە کۆمەڵە خزمەتکارێکی دی، کە سەرگەرمی کاری خۆیان بوون، کرد کە بە گەڵی بکەون. ئەسپەکانیان لە عەرەبانەکە کردەوە، لە ژێر نیریان دەرهێنان، لە تەویلەی ئەسپانیان بەستنەوە، چەودەروجۆسپیان کردنە بەر، گالیسکەکەیان لە پاڵ دیوارێکدا راگرت، میوانەکانیان بۆ ژوورەوە برد. هەردووکیان سەرسامو حەپەساو بە چاوی ستایشەوە دەیانڕوانیە کۆشكو سەراکەی مینیلاوسی زیوس زادە. ئیدی کۆشکی چی، چراخانێك بوو لەو گۆڕە، هێندە روناك بوو، دەتگوت هەتاو یان مانگ بە بن میچە بەرزەکەیەوە هەڵواسراوە. دوای ئەوەی تێر تەماشایان کرد، نیگای خۆیان بە دیمەنی جوانی ئەو کۆشكوسەرایە زاخاودا، چوونە گەرماوێکی زۆر روناکەوە تا خۆیان بشۆن. دوای ئەوەی قەرەواشو کارەکەران شۆردیانو زەیتی زەیتونیان تێ هەڵسوونو جلو عەبای خورییان لەبەرکردن، هاتنو لەسەر کورسیەکی نزیکی مینیلاوس، کوڕی ئوتریوس دانیشتن. کارەکەرێك لە مەسینەیەکی زێڕی جواندا ئاوی بۆ هێنانو لە تەشتێکی زیوی کرد تا دەستیان بشۆنو مێزێکی زۆر پاکی بریقەداری لە بەردەما دانان. ئەوجا گەورە کابانی ماڵێ نانی هێناو لە پێشی دانان. خواردنێکی فرەو هەمە جۆری بۆ دانان. ئەوجا خزمەکارێك بەسینی پڕ لە گۆشتەوە هات، هەموو جۆرە گۆشتێکی بۆ دانانو دوو پەرداخی زێڕی لە بەردەم دانان. ئەوسا مینیلاوسی قژ زەرد، خێر هاتنی جووتە میوانی کردوگوتی: "فەرموو، نانەکەتان بخۆن، نۆشی گیانت بێ! کە لە شیڤ بوونەوە، هەنگێ پێمان بڵێن کە کێن. وا دیارە خەڵکانێکی خانەدانو وەجاخزادەن، لە بنەماڵەی شاهانی سەوەڵەجانداری زیوس زادەن، چونکە رەشو رووتو مسکێنان رۆڵەی وەکو ئێوەیان لێناکەوێتەوە."

کە قسەکەی تەواوکرد، بە دەستی خۆی ئەو پشتە مەغزە چەورەی، کە وەکو بەشێکی شاهانە بۆ ئەویان دانا بوو، هەڵگرتو لە بەردەمی ئەوانی دانا. ئیدی جووتە میوان دەستیان بۆ خۆراکەکەی بەردەمیان برد. کە تێروپڕیان خواردو خواردەوە، تیلماخۆس تا خەڵکانی دی گوێیان لە قسەکانی نەبێ، سەری وەپەنا گوێی کوڕەکەی نەستور ناوگوتی: "بیسیستراتۆس-ی ئازیز، تۆ تەمەشا، بڕوانە بریقو باقی بڕونزی نێو ئەم هۆڵو ژوورانە، بزانە چۆن زێڕو زیوو عاج دەدرەوشێنەوە. هێندە پۆشتەو پەراخو رازاوەیە پێم وایە ماڵەکەی زیوسی ئۆلەمپیش هەر ئەم جۆرە شتانەی تیایە. بەڕاستی ئەم سەروەتو سامانە زۆرە لەوەسف نایەت، کە چاو دەگێڕمو تەمەشا دەکەم سەرم سوڕدەمێنێ."

## مینیلاوس باسی سەرچاوەکانی دەوڵەمەندی خۆی دەکات

مینیلاوسی قژزەرد، گوێی لە قسەکانیان بوو، رووی تێکردن وگوتی: "کوڕە ئازیزەکانم، کەس ناتوانێ کۆشكوسەرای خۆی دەگەڵ هی زیوس دا بەراورد بکات، کەس ناتوانێ هەڤڕکی ئەو بکات، چونکە موڵكوماڵی ئەو هەر هەمووی خوایانەو جاویدانە. بەڵام لە نێو تیرەی بەشەردا، بەشەری فانیدا رەنگە خەڵکانێك هەبن لە دەوڵەمەندیدا شان لە شانی من بدەن.. بەڵام من رەنجی زۆرم داوە، زۆر شوێنان چووم، نزیکەی هەشت دانە ساڵم پێچووە، ئەوجا توانیومە ئەم سەروەتوسامانە کۆبکەمەوە، لە کەشتیانی باربکەمو بۆ وڵات بگەڕێمەوە. لەم سەفەرانەدا بە

قوبرس‌و فینیقیادا ره‌ت بووم، میسر گه‌ڕاوم، بۆ وڵاتی ئه‌سیوپیه‌كان، سیدونیه‌كان، ئێریمبیه‌كان چووم، چوومه‌ته وڵاتی لیبیا، كه له‌وێنده‌ر به‌رخ هه‌ركه له دایك ده‌بێ قۆچی لێدێ، په‌ز له‌وێنده‌ر ساڵی سێ جار ده‌زێ، له‌و وڵاته‌دا نه‌خان‌و نه شوان هه‌رگیز له په‌نیروگۆشت‌و شیری شیرینیان كه‌م نیه، چونكه مه‌ڕو په‌زان به درێژایی ساڵ شیریان هه‌یه‌و دێنه دۆشین. له‌و سه‌روبه‌نده‌دا كه من به‌و جۆره ئه‌و وڵاتانه‌م ته‌ی ده‌كرد، تا دارایی‌وسه‌روه‌ت‌و سامانی زیاتر كۆبكه‌مه‌وه، یه‌كێك نامه‌ردانه‌و به فیت‌وده‌سیسه‌ی براژنه‌كه‌م، برایه‌كه‌می له ناغافڵدا كوشت. بۆیه دڵنیابن هیچ دڵم به‌م سه‌روه‌ت‌وسامانه خۆش نیه. هه‌ڵبه‌ته ده‌بێ ئه‌وه‌تان له بابی خۆتانه‌وه بیستبێ كه من چ ده‌ردو ئازارێكم چه‌شتووه، چ كۆشك‌وسه‌رایه‌كی به‌شكۆو پڕ له گه‌نج‌وگه‌نجینه‌ی گرانبه‌هام له ده‌ست چووه. ئه‌وجاش هه‌زار خۆزگه لهماڵی خۆم بام‌و سێیه‌كی ئه‌و سامانه‌م هه‌بوایه، به‌ڵام ئه‌و جه‌نگاوه‌رانه‌ی ئه‌و ده‌مه له ده‌شت‌وبیابانی به‌رینی ته‌رواده، دوور له ئارگۆس، مه‌ڵبه‌ندو پاوانی ئه‌سپان، گیانیان سپارد،به سه‌لامه‌تی ده‌رباز بوایه‌ن. باوه‌ڕبكه‌ن زۆر جار كه له‌م ماڵه‌ی خۆم داده‌نیشم بۆ هه‌موویان ده‌گریم، خه‌فه‌تیان بۆ ده‌خۆم. هه‌ندێجار به گریان كوڵی دڵی خۆم دامركاندووه‌ته‌وه، خه‌می خۆم ره‌واندووه‌ته‌وه، به‌ڵام دوایی واز دێنم، هه‌سته‌ده‌كه‌م گریانی به‌كوڵ، نه‌تره به بنیاده‌م به‌رده‌داو پیاو له گیانی خۆی بێزارده‌كات. ڕاسته من خه‌فه‌ت بۆ هه‌موویان ده‌خۆم، به‌ڵام خه‌فه‌تی هه‌موویان به‌لایه‌ك‌و هی تاقه یه‌كێكیان به‌لایه‌ك، كه بیری لێده‌كه‌مه‌وه خه‌وو‌خۆراكم لێ هه‌ڵده‌گیرێ. چونكه ئه‌و ده‌ردو مه‌ینه‌ته‌ی به‌سه‌ر ئودیسیوس دا هاتووه به‌سه‌ر هیچ ئاخییه‌كی تردا نه‌هاتووه. ئه‌م قاره‌مانه وا دیاره به‌شی ته‌نیا ده‌ردو مه‌ینه‌تی بووه، هه‌میشه خه‌می ئه‌وم له دڵدایه، هه‌رچی ده‌كه‌م له بیرم ناچێت. له مێژه رۆییشتووه، هیچی ده‌رباره نازانین، ئاخۆ ماوه، مردووه! بێگومان ئێستا بابه پیره‌كه‌ی، لایرتیس، وپنلوپی ئه‌مه‌كدارو تیلماخۆسی كوڕی كه به جێیهێشت، منداڵی ساوا بوو، بۆی ده‌گرین‌و خه‌فه‌تی بۆ ده‌خۆن."

## تیلماخۆس ده‌گری... و مینیلاوس نیگای ده‌كات

هه‌ركه مینیلاوس ئه‌و قسه‌یه‌ی كرد، وتیلماخۆس دڵی پڕ بوو، گریان ئه‌وكی گرت، كه گوێی له نێوی بابی بوو، فرمێسك به چاوانیا هاته خوارێ. به هه‌ردوو ده‌ست چمكێكی عه‌با ئه‌رخه‌وانیه‌كه‌ی به‌رزكرده‌وه‌و چاوی خۆی پێگرت. مینیلاوس كه ئه‌مه‌ی بینی، له‌دڵی خۆیدا بیری كرده‌وه كه چی بكات، ده‌رفه‌تی بدات به خۆی باسی بابی بكات، یان ئه‌و پرسیاری لێبكات تا هه‌موو شتێكی بۆ ده‌ربكه‌وێ؟

## ژنه‌كه‌ی مینیلاوس تیلماخۆس ده‌ناسێته‌وه

له كاتێكا مینیلاوس له سێ‌ودووی ئه‌و بیره‌دا بوو، هیلین له ژووره به‌رزه بۆنخۆشه‌كه‌ی خۆی وه‌ده‌ركه‌وت، هێنده جوان بوو، ده‌تگوت ئه‌رته‌میسه‌و به تیره زێڕینه‌كانیه‌وه ده‌نازێ. ئه‌دراستی كورسیه‌كی باشی بۆ هێناو داینا، ئه‌لكیسپی مافورێكی چكۆله‌ی سوف نه‌رمی بۆ هێنا، و (فیلو)ش ئه‌و سه‌به‌ته زیوینه‌ی بۆ هێنا كه ئالكاندری ژنی پولوبوس به دیاری دابویه. پولوبوس له تیبه‌ی وڵاتی میسردا كه به ده‌وڵه‌مه‌ندی به‌ناوبانگه ده‌ژیا. پولوبوس، دوو ته‌شتی زیوینی خۆ

شۆڕینو دوو مەنجەڵی سێ پێچکەو دە تالان زێڕی دابوو بە مینیلاوس (تالان پێوانەیەکی کۆنی یونانیە، دەکاتە نزیکەی ٢٦ کیلۆگرام). وژنەکەی پولوبوس-ش کۆمەڵێك دیاری جوانو نایابی پێشکەش بە هیلین کردبوو. لەوانە: تەشیەکی زێڕین، سەبەتەیەکی زیوینی لێوار زێڕینی پێچکەدار. جافیلوی کارەکەری ئەو سەبەتەیەی هێناو لەلایەوە داینا، پڕ بوو لە سوق ڕێسراوی ناسك، وتەشیە زێڕینەکەشی لە ناو بوو،کە خوریەکی وەنەوشەیی لەسەر هەڵکرا بوو. هیلین لەسەر کورسیەکە دانیشتو هەردوو پێی لەسەر تەپڵەکێکی بەردەمیا دانا و یەکسەر کەوتە پرسیار لە مێردەکەی:

" مینیلاوس، ئەی زیوس زادە، ئەرێ ئەم دوو غەریبەی کە تەشریفیان هێناوەتە ماڵەکەمان کێن؟، شتێکم لە دڵدایە نازانم بیڵێم یان نا؟ ئاخۆ مەزەندەکەم ڕاست دەردەچێ یان نا؟ دڵم دەڵێ بیڵێم، سەیرم لەوەدێ، لە عەمراتم نە پیاو نە ژنم نەدیوە ئەوەندە لە یەك بچن، هەرچەند ورد دەبمەوە ئەم پیاوە کوتومت لە کوڕەکەی ئودیسیوسی جوامێر دەچێت، هەبێو نەبێ تیلماخۆسە، ئەو منداڵەی کە ئودیسیوس، هەر بە ساوایی لە ماڵەوە بە جێی هێشتبوو، ئەو ساڵە بوو، ئێوە، ئاخاییان، لەسەر منی سەگ سیما، لەشکرتان کردە سەر تەروادەو دلێرانە شەڕتان دەکرد.

## مینیلاوس قسەی ژنەکەی دەسەلمێنێ

مینیلاوسی قژ زەرد بەرسڤی دایەوەوگوتی: "ژنەکە گیان، منیش هەست بەمە دەکەم، هەمان لێکچوون دەبینم کە تۆ دەیبینی، پێیەکانی، دەستەکانی، نیگاوپرشنگی چاوانی، سەروسیماو قژەکەی سەر هەنیەی! هەر هەمووی کوتومت لە ئودیسیوس دەچێت. ئەمە جگە لەوەی کە تۆزێ لەمەپێش باسی ئودیسیوسم دەکردو ئەوەم دەگێڕایەوە کە چەندی چاکە بەسەرمەوە هەبووەو چەند بەمنەوە ماندوو بووە، چەند زەحمەتی لە پێناو مندا کێشاوە، لە ژێرەوە چاوانی پڕ بوون لە فرمێسك، بە چمکی عەبا ئەرخەوانیەکەی چاوی خۆی گرت."

## پیسیستراتوس کەسایەتی تیلماخۆس ئاشکرا دەکات

پیسیستراتوس،کوڕی نەستور،گوتی: "ئەی مینیلاوس، ئەی کوڕی ئوتریوس، ئەی پەروەردەی زیوس، سەرداری لەشکران، بەڕاستی مەزەندەکەی تۆیە، ئەم لاوە کوڕی ئودیسیوسە. بەڵام لاوێکی هەندێ شەرمنە، پێی شەرمە لە حوزوری تۆدا، بە تایبەتی ئەمە یەکەم جارە گوێمان بەدەنگێکی خوایانەی وەکو دەنگی تۆ بزرنگێتەوە، قسان بکاتوباسی خۆی بکات. من کوڕی نەستوری سوارچاکم، بابم لەگەڵی ناردم کە بۆ ئێرە، بۆ خزمەتی تۆی بێنم. چونکە زۆری حەز دەکرد تۆ بدینێ، بەڵکو ئامۆژگاریەکی بکەی یان ڕێیەکی پێنیشان بدەی. بە خۆت دەزانی بێ بابی دەردێکی زۆر گرانە، یەجگار ناخۆشە باب بڕواتو ئەرکوخەمی ماڵ بەسەر کوڕێکی تاقانەی تەنیا باڵی بێ پشتوپشتیوان دا بەجێ بمێنێ. جا ئەمە وەزعو حاڵی تیلماخۆسە، بابی دیار نیەو هیچ کەسێکیش لە کەسوکارو ڕەعیەتەکەی پشتیوانی لێناکات تا ماڵوایرانو خانەخەراپ نەبێت."

## مینیلاوس خۆشەویستی خۆی دەنوێنێ

مینیلاوسی قژ زەرد وەڵامی دایەوە: "ئاوها! چۆن! رێکەوتنێکی سەیرە! کەواتە کوڕی برایەکی هەرە ئازیز، کوڕی پیاوێك کە زۆر بە منەوەماندوو بوو، تەشریفی هێناوەتە ماڵەکەم. من لە دڵی خۆمدا وام دانابوو کە ئەگەر زیوسی ئوڵەمپ نشین، دەنگ دلێری، سەدابەرز، مەرحەمەت بکات و هەردووکمان،بە سەلامەتی و بە کەشتییە تیژرۆکانم دەریا ببڕین و بۆ مەفتەن بپەڕینەوە، لە هەر ئارگۆسیەکی دیکە پتر رێزوحورمەتی بگرم وخزمەتی بکەم. دامنابوو لە ئەرگۆسدا شارێکی بدەمێ تیای دانیشێت،کۆشك و سەرایەکی بۆ دروست بکەم و بە ماڵ ومولك و کوڕەکەی و رەعیەتەکەیەوە لە ئیتاکاوە بیگوازمەوە بۆ ئێرە و شارێکی لەو شارانەی کە لە ژێر رکێف و دەسەڵاتی خۆمدایە بۆ چۆڵ بکەم. تا بە بەردەوامی یەکتر بدینین و هەتا هەتایە پێکەوە بژین و هیچ شتێك لێکمان نەکات تەنیا مردن نەبێت. بەڵام من باوەڕم وایە کە خواوەند، ئەو شادی و بەختەوەرییەی پێ ڕەوا نەبینین، نەیهێشت ئەو پیاوە، تەنیا ئەو پیاوە بەدبەخت و نەگبەتە بە سەلامەتی بۆ مەفتەن و وڵاتی خۆ بگەڕێتەوە."

## گریان بۆ مردوو شەرم نیە

بەو قسانە هەموو ئامادەبووان دڵیان پڕبوو، گریان ئەوکی گرتن.هیلینی ئارگۆسی، کیژی زیوس دەستی بە گریان کرد،هەروەها تیلماخۆس ومینیلاوس، کوڕی ئوتریوس-ش گریان. بیسیستراتوسی کوڕی نەستوری کوڕی ئوتریوس-ش ئەنتیلوخۆس-ی سەربەرزی بیرکەوتەوە کە چۆن کوڕە ناودارەکەی سپێدە (واتە کوڕی میمنونی پاشای ئەتیوپییەکان) کوشتبووی، دڵی پڕ بوو وفرمێسك لە چاوانی هاتنە خوارێ. کەمێك لە فکران ڕاچوو، ورووی کردە مینیلاوس و گوتی:

"ئەزبەنی، ئەی کوڕی ئوتریوس، کە نەستوری پیرەباب، لە ماڵەوە باسی تۆی بۆ دەکردم و هەر جارێك باس و ناوی تۆمان کردبا، دەیگوت پیاوێکی یەجگار بەردەباروفرەزان و دەگمەن و لە نێو بەشەراندا بێ هاوتاو بێ وێنەی. جا ئەگەر نەبێ بەبێ ئەدەبی لە رووتاندا، حەزدەکەم گوێم لێبگری. من حەز لە گریانی ئێواران ناکەم، شیوم بە دڵەوە نانووسێت.. بەیانیان بۆ گریان باشە، هاکا سپێدە بەیانی دا، ومن بەش بە حاڵی خۆم گریان بۆ مردووان بەشەرم نازانم،مەگەر هەر بەوە چاکەی ئەو بەستەزمانانە بدەینەوە،کە قژیان بۆ بڕنینەوە و فرمێسکیان بۆ بڕێژین. هەر ئەوەندەمان لە دەست دێ. منیش برایەکم لە تەروادە کوژراوە، ئەوەندەی من بزانم زۆر نەگبەت بووە. زۆری بۆ گریام. رەنگە تۆ باشتری بناسیت، ناوی ئەنتیلوخۆس بوو، من قەت نەمدی بوو. خەڵکی دەڵێن لە قۆچاخی وشەڕڤانی وئازایەتیدا، بێوێنە بووە."

## مینیلاوس داوا دەکات نەگرین

مینیلاوسی قژ زەرد وەڵامی دایەوەوگوتی: "هاوڕێ تۆ ئەقڵت لە تەمەنت گەورەترە، چونکە لەو بابە بوویت،دەبێ قسەکانت ماقوڵ و پڕمانا بێت. ناسینەوەی نەوەو نەتیرەی پیاوێك کە زیوسی

کوڕی کرونوس، بەختەوەری کردووەو ژن و منداڵی باشی داوەتێ، زۆر ئاسانە.خواوەند لە هەوەڵەوە تا کۆتایی بەختەوەری لە ناوچەوانی نەستور نووسیوە، تەمەنی درێژی پێ بەخشیوە تا بە ئاسوودەیی لە ماڵی خۆیدا بژیو بە چاوانی خۆی ببینێ کە کوڕەکانیشی ئاقڵو بەردەبارو رمبازو نێزەدارو شەڕڤانی بوێرو ئازان. بە قسەی تۆ دەکەین، واز لە گریان دێنین. دەی با لە خەمی شیودا بین، با بێن ئاومان بە دەستیدا بکەن. کە رۆژ بووەوە هەنگێ من و تیلماخۆس، قسان بۆ یەکتر دەکەین. کە مینیلاوس لە قسەکەی بووەوە، ئەسفالیون کە خزمەتکارێکی چاپوكو چەلەنگی مینیلاوسی سەربەرز بوو، هاتە پێشێوئاوی بە دەستا کردن. هەنگێ هەموو دەستیان بۆ خواردنەکەی بەردەمیان درێژکرد.

## هیلین قارەمانیەتیەکانی ئودیسیوس دەژمێرێ

دوای ئەوە هیلین، کیژی زیوس، شتێکی تری بە بیردا هات، یەکسەر هەستاو دەرمانێکی لەو شەرابە کرد کە دەیانخواردەوە، دەرمانێك کە هەموو دەردو ئازارو کینەیەکی دادەمرکاندەوەو گشت خەمێکی لە بیر دەبردەوە. هەرکەسێك لەو بادە تێکەڵەی خواردباوە، ئیدی بە درێژایی ئەو رۆژە، ئەگەر دایكوبابیشی بە بەرچاویەوە مردبان، یان براوکوڕی ئازیزی لە بەردەمیا کوژرابا، تاقە فرمێسکێکی لە چاو نەدەڕژا. کیژەکەی زیوس لەم گیادەرمانانەی زۆر بوو. پولیدامنای هاوسەری تون، دابویە. پولیدامنا خاتوونێکی میسری بوو، خاکی میسر جگە لە گەنم، گیای زۆری لێدەروا، هەندێکیان وەکو دەرمان بەکار دەهاتو هەندێکیان ژەهری کوشندە بوون. لەم وڵاتەدا، لە میسردا هەمووان سەریان لە پزیشکی دەردەچوو،باشترین پزیشکی دنیا بوون، چونکە لە نەژادو رەسەنی پایون بوون. کە دەرمانەکەی خۆی لە بادیە شەرابەکە کرد، ئەوسا فەرمانی بە ساقیەکە دا، بادە لە قەدەحان بکات. ئەوسا هیلین دەستی بە قسان کردەوەو گوتی:

"ئەی مینیلاوس، ئەی کوڕی ئوتریوس، ئێوە ئەی نەجیمزادانی خانەدان، وەکو دەزانن خێرو شەڕ بە دەستی زیوسە، ئەو دابەشی دەکات، حەزو ویستی ئەو رەتبوونەوەی نیەو بە گشت کارێك توانایە. ئێستا کە لەم کۆشكو تەلارە گەورەیەدان، بە ئارەزووی خۆتان بەزم بگێڕن، کەیف وشادی بکەن، گوێش لە من بگرن، حیکایەتێکتان بۆ دەکەم بە دڵی ئێوە، پڕ بە پێستی مەجلیسەکەتانە. هەڵبەتە من ناتوانم هەموو قارەمانیەتی وکارە شایستەکانی ئودیسیوسی سەربەرزوجوامێرو دلاوەرتان بۆ بژمێرمو بگێڕمەوە، بەڵام دەتوانم ئەو کارە گەورەیەتان بۆ باس بکەم کە ئەم پیاوە قارەمانە، لەخاکی تەروادەدا، کە ئێوەی ئاخیایی لەوێندەر شەکەتو شپرزە ئالابوونە شەڕێکی سەختوخوێناوییەوە، ئەنجامی دا.هەندێ برینی کردبووە خۆیو سیمای گۆڕی بوو،عەبایەکی شرۆڵەی بە شانیادا بوو، ولە شێوەی دەرۆزەکەرێکدا خۆی بە کوچەو کۆلانە زۆرو زەبەندەکانی شاری دژمندا کرد. هەڵبەتە لە نێو ئاخیاییەکانو کەشتیانی ئاخیاییەکاندا بەو جۆرە نەبوو. بەو سەروسیمایەوە خۆی بە شاری تەروادەدا کرد، من نەبێ کەسی تر نەیناسییەوە. لێی کەوتمە پرسیاران، بەڵام ئەو هەوڵیدەدا خۆی دووربگرێ... بەڵام دوای ئەوەی خوڵکم کرد، حەمامم بۆ کرد،وزەیتی زەیتوونم تێهەڵسوو، جلوبەرگی تازەم لەبەر کرد، سوێندێکی زۆرم بۆ خوارد کە تا نەگەڕێتەوە بۆ لای کەشتییە تیژڕۆکانو سەراپەردەکانی

خۆیان، له نێو تەروادەییەکان ئاشکرای نەکەم. هەنگێ هەموو نیازو نیەتێکی ئاخیاییەکانی بۆ ئاشکرا کردم. دوای ئەوەی بە شمشێرە درێژو تیژەکەی کوشتارێکی زۆری لە تەروادەییەکان کرد، بە کۆمەڵێك هەواڵو زانیاری زۆرەوە،گەڕایەوە بۆ ئۆردوی ئارگوسییەکان. ئەوسا هەموو ژنانی تەروادەیی کەوتنە شینوشەپۆر، بەڵام من شادومان بووم، چونکە بیری وڵاتی خۆم دەکرد، حەزم دەکرد بۆ کۆشكو تەلاری خۆ بگەڕێمەوە. پەشیمان بووم لەوەی کە ئەفرۆدیت خەڵەتاندبوومیو وڵاتە ئازیزەکەم، کیژەکەم، ژووری بوکێنییەکەمو مێردەکەم، کە نە لە بەردەباریوهۆشمەندیاو نە لە قۆزیوجوانیدا هیچی لە کەس کەمتر نەبوو، بەجێ هێشتبوو، و بۆ تەروادە هاتبوو."

## مینیلاوس شتی زیاتر دەگێڕێتەوە

ئەوسا مینیلاوسی قژزەرد بەرسڤی دایەوەوگوتی: "بەڵێ، ژنەکە، زۆر راست دەکەی، من زۆر شوێن گەڕاوم، هزرینونەخشەو پلانی قارەمانانم دیتووە، بەڵام هەرگیز پیاوی وەکو ئودیسیوسم نەدیتووە. تا حەزبکەی بەغیرەت، ورەبەرز، کۆڵنەدەر، جا گوێبگرن بزانن ئەو پیاوە بە باشارە، لە نێو ئەسپە دارینەکەدا تووشی چیبوو، وچی کرد؟! لە کاتێکا ئازاترین سەرانی ئارگۆسیان، چوو بووینە ناو ئەسپە دارینەکەوە، خۆمان لە بۆسە نابوو، تا قڕ بخەینە تەروادەییەکان. لەو کاتەدا تۆ لە ئەسپە دارینەکە نزیك کەوتیتەوە، هەڵبەتە دەبێ ئەمە ویستو ئیرادەی یەکێك لەو خواوەندانە بووبێ،کە سەرفرازی تەروادەییەکانی مەبەست بووە، (دایفوبوس)ی خواوەند ئاساشت لەگەڵ بوو. سێ کەرەت بە دەوری ئەسپەدارینەکەدا سوڕایتەوەو دەستت پێدا هێنا، سێ دانە جار بە دەنگی بەرزو بەناو گازی دلێرترین سەرانی داناییانت کرد، لاسایی دەنگی هاوسەرەکانیانت کردەوە، منوکوڕەکەی تیودیوسو ئودیسیوسی سەرفراز لە ناوەندیانا دانیشتبووین، گوێمان لە بانگەکەی تۆ بوو. منودیومیدس، هەردووکمان کێچمان کەوتە کەوڵ، دەمانویست یان لە ئەسپەکە بێینەدەرێ، یان لە ژوورەوە وەڵامی تۆ بدەینەوە، بەڵام ئودیسیوس رێگەی نەداین. هەموو کڕوکپ لە جێی خۆ دانیشتین، جگە لە ئەنتیکلۆس کە دەیویست وەڵامت بداتەوە. ئودیسیوس بە دەستە بەهێزەکانی توند زاری گرت، بەم کارە هەموو ئاخیاییەکانی رزگار کرد. ئیدی دەمی بەر نەدا تا پالاس ئەتینا هاتو تۆی لێ دوور خستینەوە."

## تیلماخۆس دەخوازێ بنوێ

تیلماخۆسی دووربین گوتی: "ئەی مینیلاوس، کوڕی ئوتریوس، ئەی زیوس زادە، سەردارو سالاری لەشکران، ئێستا خەمەکەی من گرانتر بوو، چونکە ئەو هەموو قارەمانیەتیە، ئەو هەموو بەغیرەتیو رەشیدیە دادی نەداو لە مەرگی رزگار نەکرد. ئازایەتیوبەجەرگی بە کەڵکی چی دێت؟ دەیسا جێیەکم پێنیشان بدەن، با تاوێ بە ئیسراحەت بخەوم."

هەنگێ هیلین-ی ئارگۆسی دەستووری بە کارەکەران دا کە جێگا لە ژێر تاقەکەدا رابخەن، مافوری ئەرخەوانی رابخەن، لێفەو چەرچەفیان لەسەر دابنەن، جلکی سوف خەو دابنەن تا میوانەکان لەبەری بکەن. کارەکەرەکان مەشخەڵ بەدەست، هاتن، جێگایان ئامادەکرد. ئەوجا پێشخزمەتێك هەردوو میوانەکەی بردن بۆ سەر جێگاکانیان. ئیدی تیلماخۆسو بیسیستراتوس،

کوڕی نەستوری سەرفراز لە هۆڵەکەی پێشەوە نووستن،و کوڕەکەی ئوتریوس لە ژوورێکی ناوەوەی کۆشکە بەرزەکەیدا، لەگەڵ هیلینی سەرتۆپی ژناندا کە گەلەبیەکی درێژی لەبەردا بوو، نووست.

## مینیلاوس لە نیازومەبەستی تیلماخۆس دەپرسێت

هەرکە سپێدە، لە ئاسۆوە بەیانی دا، مینیلاوسی دەنگ دلێری مەیدانی شەڕ، لە جێگە هاتەدەر، جلکی لەبەرکرد، شمشێرە تیژو بڕندەکەی لە شان کرد، سەندەڵە جوانەکانی لە پێیە ناسکەکانی بەست، میناکی خواوەندێك لە ژوورەکەی خۆی وەدەرکەوت. هات‌و لە تەنیشت تیلماخۆسەوە دانیشت، رووی دەمی تێکردوگوتی:

"ئەی تیلماخۆسی دلاوەر، تۆ عەودالّی چیت، بە چ مەبەستێك ئەو هەموو دەریایەت بڕیوەو بۆ ئێرە، بۆ لاسیدیمونی بەناوودەنگ هاتوویت؟ ئایا بۆ کارێکی گشتی هاتووی یان بە کارێکی تایبەتی خۆت؟ گرێی دڵی خۆتم بۆ بکەوەو هیچم لێمەشارەوە."

## تیلماخۆس لە بابی دەپرسێت

تیلماخۆس بەرسڤی دایەوەوگوتی: "ئەی مینیلاوس، ئەی کوڕی ئوتریوس، ئەی زیوسزادە، ئەی سالارو سەرداری لەشکران، من بەو ئومێدە هاتووم کە ئەگەر هەواڵێکی بابم دەزانی پێمی بڵێی... بەجارێ خورام، لە ماڵ‌و مەفتەنی خۆدا خواردوویانم، زەوی‌و زارە بەپیت‌و بڕشتەکەم لە بەین چوو، ماڵەکەم پڕبووە لە ناحەزانی پڕوپوچ، شانیان لێداداوەو زۆر بێڕەحمانە، پەیتا پەیتا پەزوگاوگۆتاڵم دەکوژنەوەو سەردەبڕن، گوایە هاتوونەتە خوازبێنی دایکم، بەڕاستی گۆساخی‌و بێ ئەدەبیان کردووە بە گەمەی منداڵان. جا بۆیە هانام بۆ تۆ هێناوە، لێت دەپاڕێمەوە، دەستەو دامێنت دەبم، مەمنونت دەبم ئەگەر بەوپەڕی ڕاشکاوی، بەوپەڕی میهرەبانی باسی چارەنووسی خەمناکی،باسی مردنە شوومەکەیم بۆ بکەیت، جا چ بە چاوی خۆت دیتبت، یان کەسێکی تر، باسی سەفەروسەرگەردانییەکانی ئەوی بۆ کردبێت. پێدەچێ ئەم پیاوە لە ئەزەڵەوە سیا چارە بووبێ، بۆ بەدبەختی‌و نەگبەتی، بۆ کێشەوگرفتان لە دایك بووبێ. جا بێ هیچ رووبینی‌و موجامەلەیەك، بێ هیچ سۆزو بەزەییەك، چیت بە چاوی خۆت دیتووە وەکو خۆی بۆم بگێڕەوە. جا لێت دەپاڕێمەوەو بە گۆڕی ئودیسیوسی بابم سوێندت دەدەم، کە ئەگەر بابم بە قسە یان بە کردەوە، لە خاکی تەروادەدا، لە هەڕەتی شەڕی ئاخیان‌وگەمارۆی تەروادەدا، چاکەودڵسۆزیەکی دەگەڵ کردبێ، ئەمڕۆکە وەبیر خۆتی بێنەوەو دەقاودەق‌و بە ڕاشکاوی بۆمی باسبکە.

## مینیلاوس توڕە دەبێت

مینیلاوسی قژزەرد کە گوێی لەو قسانە بوو، زۆر پەست‌و توڕە بوو،گوتی: "هەی قوڕ بەسەری ئەو ترسنۆکانەی کە گەرەکیانە شوێنی شێرە پیاو بگرنەوە، لە نوێنی ئەودا بنوون، ئەمانە ترسنۆکن، غیرەتیان نیە! ئەمانە ڕێك وەکو ئەوە ئاسکەن کە بێچوەکانی لەلانەی شێرێك دادەنێ‌و بە خۆی دەڕوات بۆ لێرەوارو دەشتودۆڵانی پڕ گیا تا بلەوەڕێ. کە شێرەکە دەگەڕێتەوە، هەموو

بێچووەکانی،شەق وپەق دەکات و دەخوات. دەبینی ئودیسیوس–ش هەموو ئەو خوازگارانە بە هەمان مەرەد دەبات وئابڕویان دەبات... تکام لە قاپی بابە زیوس وئەتینا و ئەپولو ئەوەیە، کە ئودیسیوس بە هەمان قوەتی پێشووەوە، وەکو چۆن جارێك لە لسیسبوسی جواندا، لە وەڵامی جنێوێکدا، لە پیلی فیلومیلیدس نەوی و تا توانی دای بە عاردیدا، و هەموو ئاخیاییەکانی شادو دڵخۆشکرد، بەو ئاوایە بگەڕێتەوەو رووبەڕووی ئەو خوازگارانە ببێتەوە، جا بزانە چۆن کونە مشکیان لێدەکات بە قەیسەری وشاییان لێدەکات بە شین و تاڵاوی مەرگیان پێدەنووشێت. سەبارەت بە پرسیارەکەت، لە ملم بدەی درۆت لەگەڵدا ناکەم، جگە لە حەقیقەت هیچی ترت پێ ناڵێم، دڵنیابە هەڵت ناخەڵەتێنم، بێ هیچ رووبینی وموجامەلەیەك، بێ کەم و زیاد، ئەوەت بۆ دەگێڕمەوە کە پیرەمێردی دەریا پێی گوتووم.

"لە هەوڵی ئەوەدا بووم بۆ ئێرە بێم، بەڵام خواوەندان لە میسردا گیرۆدەیان کردم، چونکە من نەزرو قوربانی سەد سەر گام بۆ نەکردبوون،خواوەندان سوورن لە سەر ئەوەی کە بەشەران هەمیشە پابەندی فەرمانانی ئەوان بن. بەهەرحاڵ لە بەرانبەر میسرا، لە نێو دەریادا، لە دووری رۆژە ڕێیەك بە کەشتییەکی خێرا،کە بایەکی سازگاری توندی لە پشتەوە بێ، دوڕگەیەك هەیە خەڵکی پێی دەڵێن فاروس، ئەم دوڕگەیە بەندەرێکی زۆر باشی هەیە، کە کەشتیان، دوای ئەوەی ئاوی پێویست لەگەڵ خۆدا هەڵدەگرن، لەوێندەرەوە بەناو دەریا دەکەون و بەڕێدەکەون. خواوەندان بیست دانە رۆژ لەوێندەر گلیان دامەوە، دەست بەسەریان کردم، بە درێژایی ئەو بیست رۆژە، نەیانهێشت تەنانەت شنە بایەکیش هەڵبکات، کە تۆزێك کەشتییەکەم پاڵ بدات. ئەگەر خواوەندێك دڵی پێم نەسووتاباو لە شێوەی ئیدوتیای کیژی پروتیوسی پیرەمێردی دەریادا فریام نەکەوتبا، ئازووقەمان لێدەبڕاو هەموو هاوڕێکانم تیا دەچوون. ئیدوتیا لە هەر خواوەندێکی دی پتر بەزەیی پێمدا هاتەوە. رۆژێ کە هاوڕێکانم، کە برسێتی زەیفی لێ سەندبوون و بە ئومێدی ئەوەی ماسیەك دووان ڕاوبکەن و برسێتی خۆیانی پێ دامرکێننەوە، بەناو دوڕگەی نێو براو کەوتبوون، من بە تەنیا بووم، ئیدوتیا کە دیاربوو زۆری خۆش دەویستم، هاتە لام وگوتی:

"ئەی غەریب، ئەرێ تۆ زۆر گەوج وکاڵفامی یان بە ئانقەست لێرە پاڵت لێداتەوەو لەزەت وخۆشی لە ئازاری خۆت دەبینی؟ ماوەیەکی زۆرە لەم دوڕگەیەدا گیرت خواردووەو هیچ هەوڵێك نادەی رێگەیەك بدۆزیتەوەوکۆتایی بەم حاڵە بینی، لە کاتێکا هاوڕێکانت رۆژ بە رۆژ پتر نەترە بەردەدەن."

کە لەو قسانە بووەوە وەڵامم دایەوە:

"تۆ لە نێو خواوەندانا لە هەر پلەو پایەیەکدای، وهەر کێیەك هەی ببە، من رێك و راست پێت دەڵێم کە من هەرگیز بە ئارەزووی خۆم لێرە نەماومەتەوە، وادیارە دەبێ گوناحێکم دەرهەق بە خواوەندانی جاویدان، خواوەندانی ئاسماننشین کردبێ. جا بە حوکمی ئەوەی خواوەندان هەموو شتێك دەزانن، تۆ دەتوانی وەکو خواوەندێك پێم بڵێی چ خواوەندێك منی لێرە کۆت و زنجیر،

گیرۆده کردووه، نایەڵێ ئەم سەفەرەی من دوایی بێت؟ پێم بڵێ چۆن بە تەنیاو نابەڵەد بە نێو دەریای پڕ پێل و گێژەنگان بکەوم وبۆ نیشتمان بگەڕێمەوە."

هەرکە لەو قسانەم بوومەوە، ئەو خواوەندە جوانە یەکسەر وەڵامی دامەوە:

"ئەی غەریب،کە مەسەلەکە ئاوابێ، من هەر هەموو شتێکت بۆ روون دەکەمەوە. پیرە خواوەندێك هەیە لە ژێر دەریاداو لەم دەوروبەرە دەژی، پیرەمێردێکی پاك ودوور لە هەر هەڵەوخەتایەکە، ناوی پروتیوسە،خەڵکی میسرە، بە پروتیوسی میسری بەنێوبانگە، ئەمە بست بە بستی قووڵایی دەریا شارەزایە، پێل وشەپۆلان دەناسێت. ئەمە خزمەتگوزارو گوێڕایەڵی پوسیدونە. خەڵکی دەڵێن گوایە بابی منە. من لەو بووم. ئەگەر بتوانی بۆسەیەکی بۆ بنەیتەوەو بیگری لەوەیە هەموو شتێکت دەربارەی سەفەرەکەت پێ بڵێ: رێگا، درێژی رێگا، چۆنیەتی گەڕانەوەت،وچۆن دەریای پڕ پێل وگێژەنگان ببڕیت وبڕۆی. خۆ ئەگەر، ئەی زیوسزادە، بە خۆت بتەوێ، باسی ئەوەشت بۆ دەکات، کاتێ تۆ بەم سەفەرە دوورو درێژو سامناکە لە ماڵ وەدەرکەوتی، چ شتێك لە خێروشەڕ لە ماڵی تۆدا روویداوە."

کە لە قسەکانی بووەوە،گوتم:

"باشە دەتوانی رێگەیەکم پێنیشان بدەی کە چۆن بۆسە بۆ ئەم پیرەمێرە پیرۆزە، بۆ ئەم ئاسمانی نەژادە بنەمەوەو بێ ئەوەی پێم بزانێ، بیگرم؟ چونکە بە خۆت دەزانی رامکردن و گرتنی خواوەندان، بۆ ئادەمیزادان کارێکی ئاسان نیە، زۆر دژوارە."

کە لەو قسانە بوومەوە،خواوەندی جوان یەکسەر وەڵامی دامەوەوگوتی:

"کەواتە، ئەی غەریب، بەوپەڕی راستی وەڵامت دەدەمەوە. کە هەتاو دەگاتە ناوەندی ئاسمان، هەنگێ پیرەمێردی دەریا، بە هۆی هەڵکردنی بای رۆژاوەوە، خۆی وەبن شەپۆلانی تاریك دەدات و لە دەریا وەدەردەکەوێت،ودەڕوات لە ئەشکەوتێکدا بخەوێ، گاکۆڵان (عجول البحر)، نەوەو نەتیرەی کیژی جوانی دەریاش لە ئاو دێنە دەرێ و کۆمەڵ کۆمەڵ لە دەوری دەخەون، و بۆدڕنیان سەعاتە رێیەك دەڕوات. کە سپێدە بەیانی دا، من دێم و بۆ ئەوێتان دەبەم،ولەوێدا بۆسە دەنەیتەوە، بۆیە دەبێ سێ کەسی زۆر ئازاو بوێر، لە هاوڕێکانت، لەوانەی کە لە کەشتییەکەتدان، بۆ ئەم کارە هەڵبژێری، وهەنگێ هەموو فەندوفێڵە ئەفسوناویەکانی ئەو پیرەمێرەت پێدەڵێم.

"یەکەم جار تەمەشایەکی گاکۆڵەکانی دەکات، دەیان ژمێرێ، دوای ئەوەی هەموویان دەبینێ و بە قامکەکانی خۆی دەیان ژمێرێ، دەچێت وەکو شوانی پەزان، لە ناوەڕاستیاندا دەخەوێ. هەرکە بینیتان خەوت، هەنگێ زات وەبەرخۆ بدەن، پەلاماری بدەن، بیگرن، هەرچیەکی کرد، چەندی پەلەقاژەی کرد بەری مەدەن. چونکە هەوڵدەدا خۆی رزگاربکات. خۆی بە شێوەی هەموو گیانەوەرێکی سەر رووی زەوی و ناوئاو دەگۆڕێ، خۆی بە ئاوو ئاگر دەگۆڕێ، بەڵام دەبێ توندتر بیگرن،بە هیچ جۆرێ خاومەبنەوە، تا خۆ بە خۆ دێتە قسان ودەگەڕێتەوە سەر هەمان ئەو دۆخ و شێوەیەی کە هەوەڵجار لە خەوا غافڵگیرت کردو لێت دەپرسێت چیت دەوێ. هەنگێ، ئەی قارەمان، دەستی لێ شل بکە، ئازادی بکە، لێی بپرسە کە چ خواوەندێك لێت چووە بە قینا، بۆچی غەزەبی لێگرتووی، وچۆن بەم دەریا پڕماسیەدا بگەیتەوە وڵاتی خۆت.

"کـه لـه قسـەکانی بـووەوە، ئـەو خـۆی وەبـن ئاووشـەپۆلانی دەریاکـەدا کـرد. منـیش بـەرەو کەشتییەکانم کە لە کەناری دەریاکەدا لەنگەریان گرتبوو، رۆییشتم. بە دەم ڕێوە بیرم لـە زۆر شت دەکردەوە. کە گەییشتمەوە کەشتییەکان، شیومان ئامادە کرد، شەو باڵی بەسەر دنیادا کێشا، لـە کەناری دەریاکە پاڵکەوتین کە بخەوین. هەرکە سپێدە بە قامکە گوڵ ئاساکانی، پەردەی تاریکی دڕی، یەکسەر بە کەناری پیرە دەریای هەزار ڕێیاندا کەوتمە ڕێ، لە کانگای دڵـەوە نوێـژو نـزام بـۆ ئاسمـان دەکـردو لێـی دەپاڕامـەوە، سـێ کەسـم، لەوانـەی کـە بەڕاسـتی کـوڕی تەنگانـەو باوەڕپێکراوی خۆم بوون، لەگەڵ خۆدا برد.

"لەو کاتەدا خواوەندی جوانکەلە، لە ژێر دەریاکەوە دەرکەوت، چوار کەوڵی تازە گوراوی چوار گـاکوڵی لەگـەڵ خۆیـدا هێنـا بـوو، نەخشـەیەکی مکومی دژی بـابی داڕشـتبوو. چـوار قوڵکـەی لـە لمەلانی قەراخ دەریاکە هەڵکەندبوو، وچاوەڕوانی ئێمە بوو. کە تەواو لێی نزیك بووینەوە، بـە ریـز لـە قوڵکەکانـدا پـاڵی خسـتین، وسـەرو کـەوڵی بەسـەردا داین. بەڕاسـتی کەمینگایـەکی ناڕەحـەت‌و ناخۆش بوو، بۆدڕنی گاکۆڵی پـەروەردەی خوێیـاوی دەریـا سـەرداری بـێ سـەر دەکرد، ئـاخر کـێ دەتوانێ لـە پـاڵ دڕندەیـەکی دەریاییدا بخـەوێ، تـا گوایـە یارمـەتیمان بدات؟ بەلام بـاش بـوو لـەو تەنگانەیشـی دەرکردین،عـەترێکی بۆنخۆشـی لەگـەڵ خـۆدا هێنابوو،وسـەروتۆزێ لێکـرد بـە کەپووماندا‌و بۆدڕنی ئەو گیانلەبەرانەی لـە کۆڵ کردینـەوە. بەدرێـژایی دانـی بەیانی، بە تاسـەوە چاوەڕوانمان دەکرد گاکۆڵ بڕکە بڕکە دەهاتن‌و لە کەنارەکەدا بە ریز خۆیان دەدایە هەتاو. تا لای نیـوەڕۆ پیرەمێـردی دەریـاش لـە دەریـا هاتـە دەرێ، کـە چـاوی بـە گاکوڵـە قەڵـەوەکان کـەوت، بەسەریانەوە گەڕاو ژماردنی، ئێمەی لە پێشی پێشەوە ژماردو هەر هەستیشی پێنەکردین، ئیدی کە لە سەرژمێریەکەی بووەوە، ئەویش لێی پاڵ کەوت‌وخەوت. هەنگێ یەکسەر کردمان بە قریوەو هـاوارو پـەلامارمان داو تونـد گرتمـان. بـەلام ئـەو فێـڵ‌و فەنـدەکانی خـۆی لـەبیر نـەکرد. هـەوەڵجار خۆی کرد بە شێرێکی یاڵ شۆڕ، ئەوجا خۆی کرد بە ئەژدیها، ئەوجا بە پڵنگ‌و پاشان خـۆی کـرد بە بەرازەکێوی، ئەوسا بوو بە ئاوێکی فیچقە کردوو، بـە درەختێکـی بـەرزی پـڕ لـق‌و پۆپ‌وچڕە گەلا، بەلام ئێمە توند توند گرتبوومان‌و دەستمان لـێ شـل نـەکرد، تـا تـەواو ماندوو بـوو، فەنـدو فێڵان دادی نەدا، هەنگێ رووی دەمی کردە من‌وپرسی:

"ئـەی کـوڕی ئوتریـوس، چ خواوەنـدەنێك ئـەم تـەگبیرەی بـۆ کـردی، کـە بـۆم بچـیتە کەمینـەوەو زەلیلگیرم بکەی؟ بڵێ بزانم چت دەوێ؟"

وەلامم دایەوەوگوتم: "پیرەمێرد، بۆچی گەرەکتە بەم پرسیارانە فریوم بدەی؟ بە خۆت دەزانـی مـن دەمێکـە لـەم دوڕگەیـەدا گیرم خـواردووە، نـازانم چـۆن دەربـاز ببم‌و چ ڕێگەیـەك بگرمـە بـەر، ئیـدی سەبرم سواوە، بەڵکو پێم دەڵێی، چونکە ئێوەی خواوەندان هـەموو شـتێك دەزانـن، کـام خواوەنـد منی لێـرە گیرۆدە کـردووە، پـێم بڵـێ چـۆن بـەم دەریـا پـڕ شـەپۆل‌و گێژەنگـەدا بـڕۆم تـا دەگەمـەوە مەفتـەنی خـۆم؟". یەکسـەر وەلامـی دامـەوەوگوتی: "دەبوایـە بـەر لـەوەی سـواری کەشـتی بـبن‌و بکەونە ڕێ نەزرو قوربانیت بـۆ زیوس‌وخواوەندانی تـر کردبایـە، ئەگـەر قوربانیـت کردبـا، هـەنگێ دەتتوانی زۆر بە خێرایی لـە ڕێگـەی دەریـای مـەی ئاسـاوە، بگەیتـەوە زێدومەفتـەنی خـۆت. تـۆ لـە

چارەت نووسراوە کە نە هاوڕێیانت بدینی،ونە بگەیتەوە کۆشكو تەلارە مکومەکەت، و نە بگەیتەوە زیدو مەفتەنی خۆت، تا نەچیتەوە سەر روباری ئیجوپتوسو قوربانی سەدینە بۆ خواوەندانی ئاسمان نشین پێشکەش نەکەیت، کە ئەو نەزرو قوربانیەت کرد، ئەوسا خواوەندان رێگەت دەدەن، بە مەرامی خۆت بگەیتوسەفەرەکەت سەردەگریٚ."

"کە گویٚم لەو قسەیە بوو دڵم داخورپا، دەبوایە جارێکی دیکە لە رێگەی دەریای بە تەمومژەوە بۆ ئیجوپتوس،بۆ وڵاتی میسر بگەڕێمەوە، کە رێگەیەکی دوورودرێژو سەفەرێکی بە درێژاو سامناك بوو. بە هەرحاڵ چارم ناچاربوو، وەڵامم دایەوەوگوتم:

"ئەی پیرەمێرد، من فەرمانی تۆ لە عاردی نادەم، هەر ئەمرێك بکەی، ئەنجامی دەدەم. بەڵام پێم بڵێ، رێكو رەوان پێم بڵێ ئاخۆ هەموو ئەو ئاخیاییانەی کە منو نەستور لە کاتی گەڕانەوەمان لە تەروادە، بە جێمان هێشتن، بەخۆو کەشتییەکانیانەوە بە سەلامەتی گەڕاونەتەوە؟ کەسیان لەسەر کەشتییەکەی یان لە باوەشی هاوڕێکانیا مردووە؟.. وەڵامی دامەوە: "ئەی کوڕی ئوتریوس، بۆچی ئەم پرسیارە لە من دەکەی؟ هیچ پێویست ناکات بەڕازی دڵی من بزانی،چونکە ئەگەر هەموو شتێکت پیٚ بڵێم، پەستوغەمگین دەبیت، دەگریت. ئەوانەی تۆ لێیان دەپرسیت زۆریان مردوونو بڕاوەتەوە،وزۆریشیان ماونو لە ژیاندان. تەنیا دوو کەس لە سەرانی جەنگاوەرانی سەرداری ئاخیاییان لە گەڕانەوەدا مردوون، سەبارەت بەو کەسانەش کە لە مەیدانی شەڕدا کوژران پێویست بەپرسیار ناکات، بەخۆت لەوێندەر بوویت. تەنیا یەك سەرداری ئاخیایی هێشتا ماوەو لە دەریای پانوبەریندا سەرگەردانو گیرۆدەیە. سەبارەت بە ئاجاکس، لە نێو کەشتیە سەوڵ درێژەکانی خۆیدا گیرۆدە بووە. هەوەڵجار پوسیدون بەرەو تاتە بەردە بەرزەکانی جیرای رەوانەی کردو لە گێژاووگێژەنگی دەریای دەرباز کردبوو،وسەرباری ئەوەی ئەتینا نەیدەحوباند، ئەگەر قسەی ناشیرینو رەقی نەکردبا، لەوە بوو لە مەرگ رزگار ببیٚ. لافوگەزافی ئەوەی لیٚ دابوو کە هیچ منەتێکی بە خواوەندان نیەو بە هێزی بازووی خۆی لە گێژاوو گێژەنگی قووڵو سامناکی دەریا دەرباز بووە. پوسیدون گوێی لەو قسە زبرانە دەبێت،ویەکسەر دەست دەداتە ڕمە سیٚ سوچەکەیو بە تاوێری جیرای دا کێشاو شەقی کردو بووو بە دوو لەتەوە، لەتێکی لەجێی خۆی مایەوەو لەتەکەی تری کە ئاجاکس لەسەری دانیشتبوو، کەوتە دەریاکەوەو ئاجاکسی لەگەڵ خۆیـــــــدا نقـــــــوم کردوخوێیــــــــاوی دەریـــــــای خـــــــواردەوەو خنکـــــــا."

"بەڵام براکەت بە خۆو کەشتییەکەیەوە لە مردن رزگار بوو. هیرای توانا پاراستبووی. بەڵام کە گەییە لوتکەی هەزار بە هەزاری مالیا، با هۆزێك هەڵیکردو توڕی دایەوە نێو دەریا بەگێژەنگو گێژاوەکەو ئیدی شەپۆل بردیو گەیاندیە وشکاییو ئەو شوێنەی کە جاران نشیمەنی تویستیس بوو، وئێستا ئیجیستوسی کوڕی تویستیس-ی لیٚ دادەنیشت. بە هەرحاڵ بەرەبەرە هیوای ئەوەی لاپەیدا بوو کە بە سەلامەتی دەگاتەوە جیٚ، کاتیٚ خواوەندان سەمتی باهۆزەکەیان گۆڕیو گەڕاندیانەوە جێگا کۆنەکەی خۆیو کۆنترۆڵیان کرد. ئاگامەمنون بەوپەڕی شادمانی پێی نایە خاکی وڵات، دانەویەوەو خۆڵەکەی ماچ کرد. کە خۆی لە وڵاتی خۆیدا بینییەوە لە خۆشیا، فرمێسکی گەرم خوڕخوڕ لە چاوانی رژا. بەڵام ئیجیستوسی بەدخوا، ئێشك گرێکی

هەمیشـەیی دانـا بوو،وبـەڵێنی دوو تـالان زێـڕی دابوویـە، ئـەم ئێشـکگرە بـە درێـژایی سـاڵ، لـە بوروجی دیدەوانییەوە ئێشکی دەگرت و بە سات غافڵ نەدەبوو، نەبادا ئاگامەمنون تێبپەڕێت و ئەو نەی بینێ. بۆیە ئەم پیاوە هەرکە ئاگامەمنونی بەدی کرد، بەپەلە چوو ئیجیستوسی ئاگادار کردەوە. ئیجیستوس یەکسەر نەخشەیەکی نامەردانەی دانا. بیست دانە زەلامی هەڵبـژاردەی یەکی یەکی جیا کردەوەو ئەمری پێکردن بۆی بچنە کەمینەوە، هەروەها فەرمانی دا لە لایەکی تری ماڵەکەوە ئاهەنگ وبەزمێکی گەورە بەرپابکەن. ئەوسا بە سواری ئەسپ وگالیسکە چوو بە شوێن ئاگامەمنوی سەردارو گەورەی خەڵکی داو بۆ ئاهەنگەکەی بانگهێشت کرد، بەڵام لە دڵی خۆیدا بیری لە نەخشە گڵاوەکەی دەکردەوە. بەو جۆرە بۆ ئەوێندەری هێنا، بێ ئەوەی خۆی یان هیچکەسێك گومان بکات کە چ مەترسیەکی لەسەرەو چ چارەنووسێك چاوەڕوانیەتی. کە لە نان خواردن بووەوە سووك وباریك کوشتی وەکو چۆن پیاو گایەك لە قەسابخانە دەکوژێتەوە. نە یەك کەس لە هاوڕێیانی کوڕی ئوتریوس و نە یەك کەس لە پیاوانی ئیجیستوس دەرباز نەبوون، هەر هەموویانی لە دالانەکانی کۆشکە گەورەکەدا کوشت.

هەرکە گوێم لەو قسەیە بوو، بە جارێ هەرەسم هێنا، لەسەر لمەلانەکە دانیشتم و ما بگری، ژیانم لەبەرچاوکەوت، حەزم نەدەکرد، لە دنیا بمێنم و تیشکی هەتاو ببینم، کە تێر گریام، پیرەمێردی شیرپاکی دەریا گوتی: "ئەی کوڕی ئوتریوس مەگری، وەختی خۆت بە گریان بە فیڕۆ مەدە، گریان داد نادات. فایدەی نیە، هیچ دەردێك دەرمان ناکات. هەوڵبدە بەزووترین کات، بگەیتەوە مەفتەنی خۆت، چونکە لەوەیە ئیجیستۆس هێشتا لە ژیانا بێ، یان ئوریستیس دەست پێشکەری کردبێ و لە پێش تۆدا کوشتبێتی، وهەنگێ فریا دەکەوی بەشداری نان و ڕێوڕەسمی تازیەکەی بکەوی.

پیرەمێرد بەو قسانە،سەرباری ئەو هەموو خەمەی هەمبوو، ورەی بە تەواوەتی بەرزکردمەوە، بە دەنگی بەرز پێم گوت: "ئاگام لەم دوانە، لە چارەنووسی ئەم دوو پیاوە هەیە. تۆ باسی سێیەمم بۆ بکە، ئەو دلاوەرە کێیە؟ ئایا هێشتا لە ژیاندایەو لە دەریای بەریندا گیری خواردووە؟ یان مردووە؟چونکە من سەرباری خەم و پەژارەی خۆم، پەرۆشی هەواڵی ئەوم."

یەکسەر وەڵامی دامەوە: "کوڕەی (لایرتیس)ـە، خەڵکی ئیتاکە. لە دوڕگەیەکدا دیتم کە وەکو بارانی بوهار فرمێسکی دەڕشت، پەری دەریایی، کالیپسو، لە کۆشك وماڵەکەی خۆیدا بە تۆبزی گلی داوەتەوە، ناتوانێ بۆ زێدومەفتەنی خۆی بگەڕێتەوە.چونکە نە کەشتیانی سەوڵداری هەیەو نە دەریاوان و هاوڕێیان تا لە ڕێگەی دەریاوە بگەڕێتەوە. بەڵام سەبارەت بە خۆت ئەی مینیلاوس، ئەی نەوەو نەتیرەی زیوس، خواوەندان لە چارەیان نەنووسیویت کە لە ئارگۆس، مەڵبەندی ئەسپانی ڕەسەندا بمریت، نا، خواوەندان دەتگەیەننە دەستی ئیلوزی کە ڕادامانتوسی قژ زەرد حوکمڕانی ئەوێندەر دەکات. کە ژیانی ئەوێندەر بۆ تیرەی بەشەر لە هەموو شوێنێکی دی خۆشترو ئاسانترە: نە بەفر دەبارێ، نە زستان هەیە، نە باران دەبارێ، هەمیشە شنەبایەکی سازگارو فێنك بەدەم بای ڕۆژاوەوە، لەسەر ئوقیانوسەوە دێت و خەڵکی فێنك دەکاتەوەو ژیان دەبوژێنێتەوە،جا تۆ ئەمەت دێتە ڕێ چونکە مێردی هیلین و زاوای زیوسی."

که لەو قسانەی بووەوە خۆی هەڵدایە دەریاکەوەو وەبن شەپۆلان کەوت. منیش دەگەڵ هاوڕێ دڵسۆزەکانمدا بۆ لای کەشتیەکان گەڕامەوە، لە ڕێگەدا بیرم لە هەزارو یەك شت دەکردەوە.کە گەییشتینەوە لای کەشتییەکانمان، شیومان ئامادە کردوخواردمان. شەوی سەرمەدی باڵی بەسەر دنیادا کێشا، لە کەناری پیرە دەریادا خەوتین. هەرکە سپێدە، لە جەرگەی تاریکییەوە بەیانی دا، وەکو گوڵ گەشایەوە، رابووین و کەشتییەکانمان خستە ناو دەریای پرشنگدار، صاری و بادەوانەکانمان لە کەشتییە جوانەکان بەست. ئەوسا زەلامەکان هەموو سواری کەشتی بوون و هەرکەس لە شوێنی خۆی دانیشت و سەوڵ بە دەست، ئامادەبوون بە نێو دەریای مەنگ و مەند بکەون. جارێکی دی بەرەو ئیجوپتوس روباری ئاسمانی گەڕاینەوە، لەوێندەر لەنگەرمان گرت،و قوربانی گەورە، قوربانی سەدینەم (سەد سەر گا) پێشکەش بە خواوەندان کرد. دوای ئەوەی خواوەندانم رازی کرد،و پشم و غەزەبم دامرکاندنەوە، مەزارێکم بە یادی ئاگامەمنونەوە دروست کرد، تا ناووناوبانگی لە بیر نەچێت و هەر بمێنێ. کە لەمە بوومەوە، خواوەندان بایەکی سازگارو لە باریان هەڵکردو بەپەلە بۆ زێدو نیشتمانی ئازیزیان گەڕاندمەوە. جا ئێستا کێ دە دوانزە رۆژێکی دی لێرە، لە ماڵی مندا بمێنەوە. ئەوسا بەڕێزو حورمەتەوە بەڕێت دەکەم، و دیارییەکی زۆر نایابت دەدەمێ، سێ ئەسپ وگالیسکەیەکی جوان، هەروەها جامێکی زۆر جوانت دەدەمێ، بۆ ئەوەی هەر رۆژێك بە یادی خواوەندانی نەمرو جاویدان بادە نۆشیت کرد، منت لە بیر بێت".

## تیلماخۆس دیاریەکان لە مینیلاوس قەبوڵ دەکات و دوعای خزمەت دەخوازێ

تیلماخۆسی دووربین وەڵامی دایەوە:

"ئەی کوڕی ئوتریوس، لەوەی پتر لێرەم گل مەدەوە. خۆ ئەگەر یەك دانە ساڵیش لە ماڵی تۆدا وەمێنم نە بێتاقەت دەبم و نە غەریبی ماڵ وکەسوکار دەکەم، بیروبۆچوون و حیکایەت و سەر بھوردەکانی تۆم یەجگار لە گیان خۆشە. بەڵام هاوڕێکانم لە پیلوس چاوەڕوانم دەکەن و بێتاقەت دەبن. لە مێژە تۆ لێرە، لە ماڵی خۆتت گل داومەتەوە. سەبارەت بەو دیاریانەی کە بە تەمای پێشکەشی منی بکەی، جامەکە (پەرداخ) قەبوڵ دەکەم، بەڵام ناتوانم ئەسپەکان بۆ ئیتاکا ببەم، بۆ خۆتیان بە جێدێڵم، هەر قابیلی تۆن، چونکە تۆ سەردارو گەورەی دەرودەشتێکی پان و بەرینی، زەوی و زارێکی زۆرت هەیە، پڕە لە گوڵ وگوڵزار، لە مێرگ و لە گەنم و جۆو چەودەرو وێنجەی گوڵ سپی و لەوەڕگە. بەڵام لە ئیتاکادا، نە ڕارەوان، نە ڕێگەوبانی بەرین، نە مێرگ و مێرگوزار نیە، خۆ ئەگەر لەوەڕگەش هەبێ زیاتر بۆ پەزو بزنانە، لەوەڕگەی ئەسپان نیە. تاقە دوڕگەیەکمان لە نێو دەریادا نیە کە بۆ بەخێوکردنی ئەسپان، وجریدبازی دەست بدات، خۆ ئیتاکا لە هەموو دوڕگەکانی دیکەش خراترە."

مینیلاوسی، دەنگ دلێری مەیدانی شەڕ، کە گوێی لەو قسەیە بوو، بزەیەکی کرد، دەستی بە شانی تیلماخۆس دا داوگوتی:

"ئەی فەرزەندی ئازیز، ئەلهەقی بە دەمو دووتا دیارە کە کەسێکی خانەدانو وەچاخزادەی. کەواتە من دیاریەکانم دەگۆڕم،لە جیاتی ئەو دیاریانە شتێکی دیکەت پێشکەش دەکەم: لە نێو هەموو ئەو دیاریانەدا کە لە سەرانسەری ماڵەکەمدان، لە عەمارو گەنجینەکانم دان، باشترینو جوانترینو بەنرخترینیان پێشکەش بە تۆ دەکەم: جامێکی شەرابخۆریت دەدەمێ، جامێکت دەدەمێ کە زیوی خالیسەیە، قەراخەکانی زێڕکفتە،دەستکردی هیفایستوسە، کە بەرەو ئێرە دەهاتمەوە، لە ڕێگەوە لامدایە ماڵی فایدیموسی پاشاو سەرداری سیدوم، میواندریەکی باشی کردمو ئەو جامەی بە دیاری دامێ. جا ئێستا لێبڕاوم پێشکەش بە تۆی بکەم."

ئەوان خەریکی ئەو قسانە بوون، کە میوانان بەرەو کۆشكوماڵی پاشا سەریان کرایەوە، هەموو بەرخو بادەیان لەگەڵ خۆ هێنا بوو، هاوسەرە سەرپۆش لە سەرەکانیان نانیان بۆ لە تویشەبەرە نابوون. بەو جۆرە نانوخوانیان لە دەربار‌دا چێدەکرد.

## خوازگاران بەسەفەرەکەی تیلماخۆس ناڕەحەت دەبن.

لەم کاتەدا خوازگاران، لەبەر کۆشکەکەی ئودیسیوسدا پێشبڕکێو گەمەیان دەکرد، دیسكو (قرص) ڕمانیان دەهاویشت، گۆساخانە رەفتاریان دەکردو خۆیان دەنواند. (ئەنتینوسو یورماخوس)ش کە دوو سەرداری دەستەی خوازگاران بوون، ولە دلێریو ئازایەتیدا زۆر لەوان زیاتر بوون، لەوێ دانیشتبوون. نویمون، کوری فرونیوس، لێیان نزیك بووەوەو رووی کردە ئەنتینوس وپرسی:

"ئەنتینوس، نازانی تیلماخۆس کەی لە پیلوسی لمەلان دەگەڕێتەوە؟ بە کەشتیەکی من سەفەری کردووە،وئێستا پێویستم پێیەتی، ودەمەوێ پێی بپەڕمەوە بۆ ئیلیسی پانو بەرین، لەوێ دوانزە ماینم هەن کە سەرو جوانووی بە قوەتی یەکساڵیان لەبەرە، بەڵام هێشتا رامنەکراون، دەمەوێ یەکێکیان بێنم بۆ ئێرەو رامی بکەم."

کە گوێیان لەو قسەیە بوو زۆریان سەرسوڕما. چونکە هەرگیز بە بیروخەیاڵیاندا نەهاتبوو کە تیلماخۆس سەفەری پیلوسی کردبێت، بەڵکو وایاندەزانی لەگەڵ مەڕو پەزاندا یان رەوە بەرازاندا چووە بۆ مەزرا دوورەکانی. بۆیە ئەنتینوسی کوڕی ئوپیتیس گوتی: "وەرە راستم پێ بڵێ کەی رۆییوە؟ لە گەنجەکان کێی لەگەڵ چوون؟ ئایا لە گەنجە هەڵبژاردەکانی ئیتاکان، یان لە بە کرێ گیراوو خولامو پێشخزمەتەکانی خۆین؟نەمرد ئەمەشی کرد؟ جا بۆ ئەوەی هەموو شتێك بە تەواوەتی بزانم، وەرە راستم پێ بڵێ، ئایا کەشتییە رەشەکەی بە تۆبزی بردوویت یان هەرکە رووی لێنایت، بە خوایشتی خۆت داتێ؟

نویمون،کوڕی فرونیوس وەڵامی دایەوە: "من بە خوایشتی خۆم دامێ. هەر کەسێکی دیکە لە جێی من بوایەو پیاوێکی وەکو ئەو بەو هەموو خەمباریە رووی لێنابوایە چیدەکرد؟ زۆر زەحمەت بوو دەست بە روویەوە بنێ. ئەوانەی لەگەڵی رۆییشتوون گەنجانی هەڵبژاردەن، لە دوای ئێمە، خانەدان ترین گەنجانی ئەم وڵاتەن. یەکێکم لە ناویاندا بینی کە رابەرایەتی کەشتییەکەی دەکرد، رێك لە مینتور دەچوو. یان خواوەندێك بوو وچوو بووە هەیئەتی مینتورەوە. بەڵام ئەوەی سەری لێدەرناکەم من دوێنێ بەیانی زوو مینتورم لێرە بینی، بە چاوی

خۆم بینیم، کەچی ئەوسا لەگەڵ تیلماخۆس دا سواری کەشتی بوو بوو وبەرەو پیلوس رۆیی."
دوای ئەو قسەیە یەکسەر بەرەو ماڵی بابی رۆیی. بەلاّم ئەو دووە لە دڵەوە لێی تورە بوون. داوایان لە خوازگارەکان کرد واز لە گەمەو کێبڕکێیەکە بێنن و بێن لەگەڵ ئەواندا دانیشن. کە خڕ بوونەوە ئەنتینۆسی کوڕی یوبیتیس بە تورەیی رووی تێکردن. دڵی یەکپارچە رق وغەزەبی رەش بوو،چاوەکانی ئاگریان لێدەبووەوە،گوتی:
"وا وەیلا بە حاڵی، بەڕاستی تیلماخۆس دەستی داوەتە لاساری، ئەمەی تیلماخۆس کردوویەتی بێ ئەدەبیەکی تەواوە. ئەم سەفەرەی! سەرباری ئەوەی ئێمە هەموومان دڵنیامان کرد کە هیچی لێ نادورێتەوە، هەر کرد. ئەم منداڵە، بێ ئەوەی هیچ حیسابێك بۆ ئێمە، هەموو ئەوانەی لێرەین بکات، هەستاوە رێك وراست کەشتی خستووەتە دەریا و دەستەیەك دەریاوانی هەڵبژاردەو کارامەی ئەم وڵاتەی بەگەڵ خۆی خستووە. دیارە ئەمە سەرەتایەکی زۆر خراپەو بەرە بەرە کێشەمان بۆ دروستدەکات، ئومێدەوارم بەر لەوەی پێبگات و بگاتە تەمەنی پیاوان، زیوس لە باڵی بدات! دەی خێراکەن، کەشتییەکی تیژرۆ وبیست دەریاوانم بۆ ئامادە بکەن تا بڕۆم لە تەنگەکەی نێوان ئیتاکاو سامۆسی بەردەوڵاندا کەمینێکی وای بۆ دابنەم، کە ئەو سەفەرەی بۆ سۆراخی بابی کردی،سەری بخوات."
کە لە قسەکانی بووەوە، هەموو پشتیوانیان لێکرد. هانیاندا هیچ ماتەڵ نەبێ، یەکسەر بڕوات. ئەوسا هەموو هەستان وچوونەوە بۆ ماڵەکەی ئودیسیوس.

## پنلوپی بە پیلانی خوازگارەکان دەزانێ

زۆری نەبرد کە پنلوپ بەو نەخشەو پیلانەی زانی کە خوازگارەکان لە دڵی خۆدا کێشابوویان، میدونی تەتەر هەموو شتێکی پێگوت. چونکە کە لە دەرێی ماڵەکە بوو، گوێی لێبوو بوو کە خوازگارەکان لە ژوورەوە چۆن نەخشەو پیلانی خۆیان دەکێشا. بە نیازو نیەتی زانی بوون. بۆیە کە لە ئاستانەی دەرگاکە تێپەڕی پنلوپ پێیگوت:
"میدون، خوازگارەکان بۆ چیان ناردووی؟ ئایا بۆ ئەوەیان ناردووی کە بە قەرەواش و کارەکەرەکانی ئودیسیوسی سەربەرز بڵێی دەست لە کاری خۆ هەڵگرن و نان بۆ ئەوان ئامادە بکەن و خوانی نان وبەزمیان بۆ برازێننەوە؟ بەڕاستی ناخۆشیان کردووە، دەبێ کۆتایی بەم وەزع و حاڵە بێنن، دەبێ ئەمڕۆ دوا خواردن لە ماڵی ئێمە بخۆن، بەسە، بە بیانووی خوازبێنییەوە، دنیایان داوە بە یەکا.. ئەدی ئێوە، نازانن ئەو هەموو خواردنەی بە فیڕۆی دەدەن، سەروەت وسامانی تیلماخۆسی بەردەبارە. باشە کە تۆ منداڵ بووی قەت باب وباپیرت بۆیان نەگێڕاویتەوە کە ئودیسیوس چۆن پیاوێك بووە، چەند بۆیان باش بووە؟وهەرگیز نە بە زمان و نە بە کردەوە، هیچ هەڵەو تاوانێکی دەرهەق هیچ کەسێکی ئەم وڵاتە نەکردووە، وەکو زۆربەی پاشایانی ئاسمانی نەژاد ئەمە دەکەن — یەکێك دەحوبێنن ویەکێك دەبوغزێنن. بەلاّم ئەو هەرگیز زوڵمی لە کەس نەکردووە، رەفتاری درێوی ئەوان ئەوە نیشاندەدات کە چەند سپڵەن، چەند نمەك حەرامن، چەند دڵڕەشن، چۆن هیچ چاکەیەکیان لە بەرچاو نیە."

## مەبەستی پیلانەکە کوشتنی تیلماخۆسە

میدون–ی دڵو دەروون پاك وەڵامی دایەوە: "ئەی شابانۆ، خۆزگە بەدبەختیو بەڵایەکەت هەر ئەمە بوایە! خوازگارەکان شتی زۆر لەمە خراتروناخۆشتریان بە دەستەوەیە. ئومێدەوارم، زیوس رەوای نەبینیو ریسەکەیان بکاتەوە بە خوری! لێبڕاون لەگەڕانەوەدا رێگە بە تیلماخۆس بگرن،و بەزەبری شمشێران بیکوژن. چونکە چووە بۆ پیلوسی جوانو لاسیدیمونی شکۆدار تا سۆراخێکی بابی بکات."

پنلوپ کە گوێی لەو هەواڵە بوو، لاقی سست بوون، دڵی خاو بووەوە، ماوەیەکی زۆر دەمی چووە کلیلە، فرمێسك زاییە چاوانیودەنگی گیرا. ئەنجام هاتە قسەوگوتی: "باشە کوڕەکەم بۆچی رۆییووە؟ هیچ پێویستی نە دەکرد سواری ئەم کەشتییە تیژرۆیانە بێ، کە دەڵێی ئەسپی دەریایینو پیاو بە ناو دەریادا هەڵدەگرن. یانی دەیەوێ بێ هیچ ناونیشانێك بمرێتو کەسێك لە پاش خۆی بە جێ نەیەڵێ کە ناوی هەڵگرێ؟".

هەنگێ میدونی بەردەباروداڵوا وەڵامی دایەوە: "من نازانم، خانمەکەم، کە ئاخۆ خواوەندێك بۆ ئەم کارەی هانداوە یان هەر لە خۆیەوە بڕیاری داوە بچێت بۆ پیلوس تا سۆراخێکی بابی بکاتو بزانێت لە گەڕانەوەدا چی بەسەر هاتووە،ماوە یان مردووە."

## پنلوپی لۆمەی کارەکەرکانی دەکات

دوای ئەو قسانە بە پلیکانەکاندا دابەزیو رۆیی. پنلوپ بە تاقی تەنیاو بە دڵی پڕ لە خەمو پەژارەوە مایەوە. لە پەرێشانیدا جێگەی بەخۆ نەدەگرت، ژوورەکەی پڕ بوو لە کورسی، بەڵام لەسەر هیچیان ئۆقرەی نە دەگرت. هێزی لەبەر بڕابوو، لە ئاستانەی ژووره جوانەکەیدا دانیشت، بە دەم ئاهوناڵەوە دەگریا. ئیدی کارەکەرەکانیشی، هەموو ئەوانەی لە ماڵەوە بوون، لە پیرو جوان، بە گریانو شیوەن دەوریان دا، پنلوپ بە دەم گریانەوە گوتی:

"کچینە گوێبگرن، بزانن زیوس چ خەمێکی بەسەرا داوم، چ غەزەبێکی لێگرتووم. ئەو بەڵایەی بەسەر منیا داوە، لە هی هەموو ئەو ژنانە زیاترە کە لەگەڵ منا لە دایك بوونو لە رۆژگارو لە وڵاتی منا ژیاون. مێردێکم لە دەست دا، تا حەزبکەی رەسەن، خانەدان، ئازاو شێردڵ، کە پیاوێك بوو لە نێو داناییەکاندا بێ نەزیرو بێ هاوتا، پاڵەوانێك بوو لە سەرانسەری هیلاسو تا ئەو بەری ئارگوس بە نێوونێوبانگ. ئێستاش نۆرەی کوڕە ئازیزەکەم هاتووە! خۆی داوەتە بەر رەحمەتی باو شەپۆلان، لە ماڵ وەدەرکەوتووە، بێ ئەوەی من پێی بزانم. هەی دڵڕەقینە، بێ رەحمینە! کەستان بیرتان لەوە نەکردەوە بێ لە خەوم هەستێنێ، کە هەموو زۆرچاك دەتانزانی کەنگێ سواری کەشتییە رەش بوو ورۆیی؟ ئەگەر دەمزانی بە نیازی ئەم سەفەرەیە، هەرگیز رێم نەدەدا، یا دەبوایە نەڕوات، یان بەسەر جەنازەکەمدا بپەڕیباوە ئەوجا بڕویشتایە. دەی خێراکەن بچن بە دوای دولیوسدا، ئەو خزمەکارە پیرەی کە بابم بە بۆنەی شووکردنمەوە دایمیو باخەوانی باخە چڕە دارستانەکەمە، تا بە زووترین کات بڕوات بۆ لای لایرتیسو هەموو شتێکی پێ بڵێ. لەوەیە لایرتیس بتوانێ بە بەردەباری خۆی، تەگبیرێکی ئەوتۆ بکات کە دڵی ئەو خەڵکە نەرم بکات کە بە نیازن نەژادی ئەوونەژادی ئودیسیوسی خوا ئاسا لە ریشە دەربێنن،و تۆویان بڕنەوە!

## یوریلکیا دان بە تاوانی خۆیدا دەنێ

یوریکلیای دایەنی میهرەبانو دڵسۆز وەڵامی دایەوەو گوتی: "خانمە ئازیزەکەم، دەمکوژی، دەمبڕی، دەرم دەکەی، هەرچیەکم لێدەکەی هەقت بە دەستە. بەڵام هەرگیز هیچت لێناشارمەوە. من هەموو شتێکم دەزانی، هەر ئەمرێکی کرد بۆم جیٚ بەجێکرد، توێشووی سەفەرم، لە نانو لە بادە بۆ پێچایەوە، بەڵام سوێندی دام، سوێندی گەورەی دام کە بەلای کەمەوە تا دوانزە رۆژ هیچ شتێکت پیٚ نەڵێم، مەگەر خۆت بیری بکەیو داوای دیتنی بکەی، یان خۆبەخۆ بە سەفەرەکەی بزانیت.چونکە دەترسا سەر بکەیتە گریانو بەفرمێسکوگریان جوانیو ناسکی سیمات بشێوێنیٚ. ئێستاش هیچ نەبووە، هەستە پاك خۆت بشۆ، جلکی خاوێن لەبەر بکە، دەگەڵ کارەکەرو هاودەمەکانتدا بچۆ قاتی سەرەوە، نوێژ بۆ ئەتینای کیژی زیوسی سپەردار بکە، کە دەتوانیٚ ئەگەر لە قوڕگی مەرگیشدا بیٚ رزگاری بکات. باری لایرتیس-ی پیری زورهانوخەمبار هێندەی قورس مەکە. پێموانیە خواوەندانی موبارەك هیچ کەربوکینەیەکیان لە نەژادی کوڕانی ئارسیسیوس بێتو هەرچۆنێك بووە یەکێك دەهێڵنەوە کە خاوەنداریەتی ئەم کۆشكو تەلارە بەرزو ئەم مەزرا بەپیتو بەرەکەتانە بکات".

## پنلوپ نوێژونزا دەکات

بەو قسانە خەمی دڵی پنلوپی رەواندەوە. فرمێسکی چاوانی وشك کردەوە. هەستا، خۆی شت، جلکی خاوێنی لەبەرکرد، دەگەڵ هاودەموکارەکەرەکانیا چووە قاتی سەرەوە، دوای ئەوەی هەندیٚ جۆی کوتراوی لە سەبەتەیەك کرد بەمجۆرە کەوتە پاڕانەوە لە ئەتینا:

"ئەی کیژی زیوس، ئەی خاوەن سپەر، تکاو نزام گیرا بکە، ئەی ئەو کەسەی ماندویەتی پێت ناوێریٚ، ماندویەتی نازانی، بیکە بە خاتری ئەو قوربانیە زۆرانەی، کە ئودیسیوس لە ماڵی خۆیدا، چ لە گوێرەکەو چ لەمەڕی قەڵەوی دابەستە، پێشکەشی کردوویت، لێت دەپاڕێمەوە فریای کوڕە ئازیزەکەم بکەوە، لە شەڕوپیلانی ئەم خوازگارە بیٚ شەرمانەی لا بدە".

بەو جۆرە تا هێز لە گەروویدا بوو، ناڵانی، پاڕایەوە. خواوەند گوێی لێبوو، خوازگارەکانیش لە سەرانسەری کۆشكوسەراکەدا کردبوویان بە گەڕەلاوژەیەك ئەوسەری دیار نەبێت. یەکێك لە گەنجە گۆساخو بیٚ شەرمەکان گوتی: "خوا ئەو خوایەیە ئەو شابانۆیەی کە ئەو هەموو مەراییەی بۆ دەکریٚ، خۆی ئامادە دەکات کە شوو بە یەکێك لە ئێمە بکات، غافڵە لەوەی کە ئێمە داوی مەرگمان بۆ کوڕەکەی ناوەتەوە."

هەندێکیان بەو جۆرە قسانیان دەکرد، بەڵام غافڵ بوون لەوەی کار بەرەو کویٚ دەڕوات. ئەنتینوس رووی تێکردنوگوتی:

"کوڕینە بەسە، ئەم قسە زلانە ببڕنەوە، بەس ئەم قسانە بڵێنوبڵێنەوە، نەبا یەکێك گوێی لێبیٚو بچێت بیگێڕێتەوە. ڕابن، با بە بێدەنگی نەخشەکەمان، کە هەموومان لە کانگەی دڵەوە پێمان خۆشە، جێبەجیٚ بکەین".

## خوازگاران کەشتی ئامادە دەکەن،وپنلوپی پەستوغەمگین لە ژووری خۆیەتی

کە لە قسەکانی بووەوە، بیست زەلامی هەڵبژاردەی لە نێویاندا هەڵبژاردو بەرەو کەناری دەریا، کە کەشتیە تیژڕۆکە لەوێندەر بوو، بەڕێکەوتن. هەوەڵجار کەشتییەکەیان بردە قوڵایی دەریا، بورج و ئەستون و بادەوانیان لە کەشتییە رەش بەست، سەوڵەکانیان بە کندڕی سیرمە، و بە شێوەیەکی زۆر جوان، لە کەشتیەکە بەست، بادەوانی سپییان هەڵکرد. ئەوسا خزمەتکارە دڵسۆزەکانیان چەك‌وئەسلەحەکانیان بۆ هێنان. ئەوسا کەشتییەکەیان لە لەنگەرگاکەدا بەستەوەو جارێکی دی بۆ نانی خواردنی ئێوارە هاتنە سەر کەنارەکەو چاوەڕوانیان کرد تا دنیا تاریکی کرد.

بەڵام لەم کاتەدا پنلۆپی داوێنپاك لە سەرەوە، لە ژوورەکەی خۆیدا، بێ ئەوەی دەم بۆ زەواد بەرێ، هیچ شتێك بخوات‌وبخواتەوە، پاڵ کەوتبوو، هەموو هۆش‌وحەواسی لەلای کوڕەکەی بوو، ئایا کوڕەکەی لە مەرگ دەخەلەسێ یان خوازگارانی ملهوڕ زەفەری پێ دەبەن‌ودەیکوژن. وەکو چۆن شێرێك بکەوێتە داوەوەو کۆمەڵێك راوچی کارامەو لێزان دەوری بگرن‌و سات بە سات زیاتر ئابلۆقەی بدەن‌و تەنگەتاوی بکەن‌و ئەویش لە ترسا شپرزە ببێ، پنلۆپیش بەو ئاوایە هەراسان‌و نیگەران‌وشپرزە بیر بوو، تا خەو زۆری بۆ هێنا، بە پشتا راکشاو هەر چوار پەلی خاو بووەوەو لە جوڵە کەوت.

## ئەتینا لە شێوەی تارماییەکدا سەردانی پنلوپی دەکات

دوای ئەوە، خوابانو، ئەتینای چاوگەش، نەخشەیەکی تازەی دانا. تاپۆیەکی لە شێوەی ژنێکدا دروستکرد، رێك دەتگوت ئیفتیمی کیژی ئیکارۆسی جوامێرە، کە ژنی یومیلوسی سەرداری فیرای بوو. ئەوسا تاپۆیەکەی بۆ کۆشك‌و تەلارەکەی ئودیسیوس نارد تا بە پنلۆپ بێژێت واز لە گریەو زاری، لە فرمێسك رشتن بێنێ. تاپۆکە لە کونی کلیلی دەرگاوە وەژوورکەوت، بە دیار سەری پنلوپەوە وەستاوگوتی:

"ئەی پنلوپ، چیە، بە خەفەتەوە نووستووی؟ نا، خەمت نەبێ، خواوەندانی نەمر، نایانەوێ بگری، نایەنەوێ خەفەت بخۆی... چونکە کوڕەکەت بە سەلامەتی دەگەڕێتەوە، بە بێوەی دەگەڕێتەوە، هیچ خەتایەکی دەرهەق بە خواوەندان نەکردووە."

## پنلوپی ترسی خۆی بۆ تاپۆکە دەردەبڕێ

هەنگێ پنلوپی بەردەبار کە لە شیرینی خەودا بوو، بەدەم خەوەوە وەڵامی دایەوە: "خوشکم بۆچی هاتوویت؟ خۆ تۆ تا ئێستا،چونکە لێرەوە دووری، نەهاتوویتە ماڵی ئێمە. تۆ پێم دەڵێی نەگریم، خەفەت نەخۆم، ئەو هەموو پەژارەیەی سەرودڵی گرتووم وەلاوە بنەم. بەخۆت دەزانی چەند لە مێژە مێردێکی خانەدان، شێرەپیاو، شامێری نێو مێرانی دانایی، وناوداری بێ هەڤڕکی سەرانسەری هیلاس‌وئارگوس–م لە دەست چووە. ئەمێستاش کوڕە تاقانەکەم، کوڕە ئازیزەکەم بە سواری کەشتییەکی گەورە رۆییشتووە، ئاخر هێشتا منداڵە، ئەزموونی سەفەری نیە، ئاگای لەوە نیە ئەم خوازگارانە چ داوێکیان بۆ ناوەتەوە. بۆیە ئەوەندەی لە خەمی ئەمدام لە خەمی ئەویترمدا نیم، کە بیری لێدەکەمەوە لەرزم لێدێ، دەترسم لە نێو ئەو خەڵکەدا کە چووە بۆ لایان

یان له نێو دەریادا بەڵایەکی بەسەربێت. چونکە ناحەزانێکی زۆری هەن و داویان بۆ ناوەتەوەو خوا خوایانە بەر لەوەی بگاتەوە وڵات، بێکەس کوژی بکەن."

## تاپۆکە دڵخۆشی دەداتەوەو دەڕوات

تاپۆکە وەڵامی دایەوە: "ورەت بەرز بێ، خەمت نەبێ، ترست لە هیچ شتێك نەبێ، چونکە هاوڕێیەکی زۆر بە توانای لەگەڵدایە، کە هەرچی پیاوی دنیایە خواخوایانە ئاوڕێکیان لێ بداتەوە، ئەو هاوڕێ بە توانایە، پالاس ئەتینایە. ئەتینا هاوخەم و هاوسۆزی تۆیە، ئەو ناردومی کە ئەم مژدەیەت بدەمێ وئەم هەواڵەت پێبگەیەنم."

**پنلوپی *ژیروئەقڵمەند* گوتی:**

"ئەگەر بەڕاستی تۆ خواوەندی یان پەیامبەری خواوەند، وەرە هەواڵێکی ئەو کلۆڵەی ترم پێ بڵێ. ئایا هێشتا زندووەو بەسەر دنیای روناکەوەیە، یان مردووەو لە هادیس دایە؟"

تاپۆ رەشەکە گوتی: "نەخێر، من هیچت دەربارەی ئەو پێ ناڵێم: نە دەڵێم زندووە نەدەڵێم مردووە، چونکە گوناحە قسەی خۆم بە بادا بدەم".

تاپۆکە دوای ئەو قسەیە لە کونی دەرگاکەوە وەدەرکەوت و لە چاو ون بوو. کیژی ئیکارۆس (پنلوپ) سەر سووك ودڵڕەحەت لە خەو ڕابوو. چونکە ئەو خەونی بەرەبەیانەی کە دیتبووی زۆر روون و ئاشکرا، ومایەی دڵخۆشی بوو.

## خوازگاران بۆ تیلماخۆس خۆمەڵاس دەدەن

خوازگاران، سواری کەشتی بوون، وبەنیازی کوشتنی تیلماخۆس بەڕێکەوتن. لە دوڕگەیەکی بەردەڵانی ناوەندی دەریادا، لە نێوان ئیتاکاوساموسی هەزار بە هەزاردا کەمینیان بۆ دانا. ئەم دوڕگەیە،دوڕگەی ئیستیریس-ـە، دوڕگەیەکی بچووکە، بەندەرێکی هەیە کە لە هەردوو دیوییەوە لەنگەرگەی، بۆ لەنگەرگرتنی کەشتیان هەیە. ئاخاییەکان لەوێدا خۆیان مەڵاس داو کەمینیان بۆ تیلماخۆس دانا.

***

## <u>پەراوێز:</u>

ئەفرودیت: خواوەندی خۆشەویستی و جوانی

ئارتیمیس: خواوەندی راووشکار

میمنون: سەرداری ئەسیوپیەکان.

دایفوبوس: یەکێك بوو لە سەرکردەکانی تەروادە، لە دۆستەکانی هیکتۆر بوو. لە دوای مردنی پاریس هیلینی خواست، بەڵام کە تەروادە روخا، هیلین خیانەتی لێکردو مینیلاوسی بۆ ژوورەکەی برد،کە دایفوبوسی کوشت.

پروتیوس: پیاوێکی بە تەمەنی پیاوانی دەریایە، خولام و شوانی گاکۆڵەکانی پوسیدونە، بەهرەی نجومگەری وخۆگۆڕینی هەیە، تەنانەت دەتوانێ خۆی بە شێوەی ئاوو ئاگریش بگۆڕێ.

رادامانتوس: کوڕی زیوس‌وبرای مینوسه، به دادپه‌روه‌ری به‌ناوبانگه، له دوای مردنی ده‌بێ به قازی له هادیس دا.
هیفایستوس: یه‌کێکه له خواوه‌نده ئوڵه‌مپ نشینه گه‌وره‌کان، خواوه‌ندی ئاگره، کوڕی زیوس‌و هیرایه.

## سروودی پێنجه‌م

### کورته‌ی سرووده‌که:

ئه‌نجوومه‌نی خواوه‌ندان کۆبووه‌نه‌وه‌یه‌ك ده‌که‌ن‌و له‌سه‌ر داواو پێشنیازی ئه‌تینا بڕیاری گه‌ڕانه‌وه‌ی ئودیسیوس ده‌ده‌ن. هیرمیس فه‌رمانی خودای خواوه‌ندان، زیوس بۆ کالیپسۆ ده‌بات‌و پێی ده‌ڵێ ڕێگه‌ی ئه‌و پیاوه گێرۆده‌یه، ئودیسیوس بدات که بڕوات. په‌ری ده‌ریا، کالیسپو، یه‌کسه‌ر فه‌رمانی خودای خواوه‌ندان جێ به‌جێده‌کات‌و خه‌به‌ر به ئودیسیوس ده‌دات که ئازاده،سه‌رپشکه له‌وه‌ی که بڕوات یان بمێنێ.زۆری هه‌وڵ له‌گه‌ڵدا دا که لای ئه‌و وه‌مێنێ، به‌ڵام فایده‌ی نه‌بوو، هه‌نگێ داوای لێکرد مادامێکی نیازی رۆییشتنی هه‌یه، که‌ڵه‌کێك بۆ خۆی دروست بکات، تا پێی بگه‌ڕێته‌وه بۆ وڵات. ئودیسیوس له زه‌رق چوار رۆژدا که‌ڵه‌که‌که‌ی دروست کرد،رۆژی پێنجه‌م به‌ناو ده‌ریا که‌وت‌و رۆژی هه‌ژده‌یه‌م گه‌ییشته وڵاتی فیاسیه‌کان. پوسیدون ده‌یبینێ، زۆر توڕه ده‌بێت، زریان‌و تۆفانێکی به‌تره‌ف هه‌ڵده‌ستێنێ، پیره که‌ڵه‌ك وه‌رده‌گێڕێ‌و ئودیسیوس به گێره‌گێڕ له مردن ده‌خه‌له‌سێ. خواوه‌ندێك ته‌لسمێکی دابوویه، که که‌ڵه‌که‌که‌ی شکا به مه‌له‌و به پشتیوانی ئه‌تینا گه‌ییه دوڕگه‌ی سخیریا. به زه‌حمه‌تێکی زۆر گه‌ییه سه‌رچاوه‌ی رووبارێك، له بێشه‌یه‌کدا گیرسایه‌وه‌و هێنده ماندوو وشه‌که‌ت بوو یه‌کسه‌ر خه‌وی لێکه‌وت.

***

### زیوس‌و خواوه‌ندان راوێژده‌که‌ن

هه‌رکه خواوه‌ندی سپێده که له پاڵ تیتونوسی مێردیدا خه‌وت بوو، له خه‌و ڕابوو، تا تیشك بخاته سه‌ر خواوه‌ندان‌و به‌شه‌ران. خواوه‌ندان به سه‌رۆکایه‌تی زیوسی به‌تواناو خودای خواوه‌ندان کۆبوونه‌وه. ئه‌تینا که‌وته گێڕانه‌وه‌ی ئه‌و ده‌ردومه‌ینه‌تانه‌ی ئودیسیوس پێوه‌ی

دەناڵین، و یەك یەك بۆی دەژماردن و زۆری بەزەیی پێدا دەهاتەوەو بەڕەوای نەدەزانی کە ئەو هەموو ماوەیە لەلای کالیپسوی پەری دەریا دەست بەسەر بوو. گوتی:

"ئەی زیوسی بابی هەمووان، ئەی خواوەندانی موبارەك وجاویدان و هەمیشە بەختەوەر، ئاگادار بن لە ئێستا بە دواوە، یەك زەرە بەزەیی وسۆز نەخەنە دڵی پاشایانی خودان سەوڵەجانان، نەکەن زەرەیەك دادپەروەریان بخەنە دڵ ودەروون. با هەموو دڵڕەق و بێ بەزەیی بن، ستەمکارو زاڵم بن. با بە مەرەدی ئودیسیوس نەچن. ئەوەتا لە نێو گەل و رەعیەتەکەی ئودیسیوسدا، کە باوکانە فەرمانڕەوایی دەکردن، تاقە کەسێك نیە یادی ئەو پیاوە بکاتەوەو سۆراخێکی بکات و بیەوێ چاکەی بداتەوە. ئەمێستا لە دورگەیەکی دوورا، لە کۆشك وسەراکەی کالیپسۆی پەری دەریادا گیرۆدە بووە، حاڵی زۆر ناخۆشە، کالیپسۆ بەزۆر گلی داوەتەوە. بەڵێ لەوێندەر گیرۆدە بووەوە ناتوانێ بۆ زێدومەفتەنی خۆی بگەڕێتەوە، چونکە نە کەشتی هەیەو نە کەشتیوان و نە هاوڕێ تا بە دەریادا بۆ وڵاتی خۆی بگەڕێتەوە. سەرباری ئەوەش بەدخوایانی رەعیەتەکەی لێبڕاون کوڕە تاقانە ئازیزەکەی ئەو، لە گەڕانەوەدا بکوژن. چونکە چووە بۆ پیلوسی مبارەك و لاسیدیمونی بەشکۆ، تا سۆراخێکی بابی بکات و هەواڵی بزانێت."

زیوسی هەورەوان وەڵامی دایەوە، "کچەکەم، ئەم قسانە چیە تۆ دەیکەی؟ باشە تۆ بەخۆت ئەم نەخشەیەت دانەنابوو، کە ئودیسیوس بگەڕێتەوەو تۆڵە لەو کەسانە بسەنێ؟ سەبارەت بە تیلماخۆس، دەتوانی بە حیکمەتی خۆت رێنوێنی بکەیت و بە سەلامەتی بگاتەوە مەفتەنی خۆی، و خوازگارەکان بە ناکامی بگەڕێنەوەو ریسەکەیان ببێتەوە بە خوری."

دوای ئەو قسانە،رووی کردە کوڕە ئازیزەکەی خۆی،هیرمیس وگوتی:

"هیرمیس، تۆ پەیك و پەیامبەری هەمووماني، هەر ئێستا بڕۆ بۆ لای پەری کەزیە جوان و قەرارو بڕیارە بێ چەندوچوونەکەی ئێمەی پێ بڵێ،کە بریتییە لە گەڕانەوەی ئودیسیوسی بە توانا، نابێ هیچ خواوەند یان بەنی بەشەرێك یارمەتی بدات، بەڵکو دەبێ بە سواری کەڵەکێکی روختەو قایم، بە زەحمەت و مەینەتێکی فرە، دوای بیست دانە رۆژ ئەوسا بگاتە سخیریای پڕ پیت و بەرەکەت، خاك و مەڵبەندی فیاسیان. کە بە خزمایەتی، دەگەنەوە خواوەندان، جا ئەوانە وەکو خواوەندێك، وەکو یەکێك بێ لە ئێمە، پێشوازی و میوانداری دەکەن. وئەوسا بە کەشتییەکی پڕ لە زێڕوبڕۆنزو جلك وبەرگان بۆ وڵاتە ئازیزەکەی خۆی رەوان دەکەنەوە. واتە بە دەست و دیاری و دەسکەوتێکی زۆر زیاتر لەوەی کە لە تەروادە هێنابووی، ئەگەر بەبێ وەی گەیاندبوایەوە ماڵێ. بەڵێ بەو جۆرەمان بڕیارداوە کە بە دیداری دۆستانی شادبێتەوە. بگاتەوە کۆشك و تەلارە بەرزەکەی، بگاتەوە وڵاتەکەی."

## هیرمیس بەرەو لای کالیپسو دەفڕێ

هەرکە لە قسەکەی بووەوە، ئەرجایفونتیس (هیرمیس)، پەیکی گوێڕایەڵ، دەم ودەست سەندەڵە جوانەکانی لە پێ بەست، ئەم سەندەڵانە سەندەڵی خوایی بوون، لە زێڕی خالیسە بوون، دەیتوانی پێیانەوە، لە با خێراتر بەسەر دەریاو سەر زەمین و وڵاتانی بەریندا بفڕێ. ئەوسا دارعاسایەکی ئەفسوناوی هەڵگرت، دەیتوانی هەرکەسێکی بوێ بە زەبری ئەو دارعاسایە بیکاتە

خەو یان لە خەوی هەستێنێ، ئەرجایفونتیس–ی بە قوەت، ئەو دارعاسایەی هەڵگرت، لە شەقەی باڵی دا، کە بەسەر پیریادا تێپەڕی، لە تاقی ئەسمانەوە داکشاو خۆی بەدەریادا دا، هەردەتگوت واشەیەکی دەریاییەو خۆی بەدەم شەپۆلانی توندەوە دەدات و هەرچی پەڕوپۆی چڕی هەیە لە پرژی شەپۆلانی سوێرو زەلامدا تەڕی تەڕ بووەو بە تاسەوە لە ماسییەك دەگەڕێ راوی بکات... هیرمیس لەو شێوەو هەیئەتەدا، خۆی دایە دەم شەپۆلانەوە، کە گەییە دوڕگە دوورە دەستەکە، لە دەریای وەنەوەشەیی وەدەرکەوت و هاتە سەر زەوی، کەوتە رێ تا گەییە ئەشکەوتێکی گەورە، کە نیشمەن ومەزڵی پەری کەزی جوان بوو. سەیری کرد لە ژوورەوەیە، ئاگرێکی گەورە لە ژوورەوە نێڵە نێڵ لە کوانوودا دەسووتا. لە دووری دوورەوە بۆنی سوتانی داری سەرووسەندەڵ و عەرعەر دەهات. پەری، بەخۆیشی لە ژوورەوە بەدەم گۆرانی و ئاوازێکی خۆشەوە دەهات ودەچوو، مژولی کاری چنین بوو،مەکۆ زێڕینەکەی بەڕاست وبە چەپدا بەنێو رایەڵەکانی سەر دەزگاکەیدا دێناو دەبرد. بێشەیەکی چڕەدارستان دەوری ئەشکەوتەکەی دابوو، پڕبوو لە دارو درەختی سەروو سنۆبەروسورەبی وسەندەڵ و حورو عەرعەرو هەرچی تەیروتوی وەکو کوند، باز، و واشەی دەریایی هەبوو، هێلانەیان لە ژێر لق و پۆپەکانیان کردبوو. دار مێوێك خۆی بە دیواری ئەشکەوتەکەوە هەڵواسی بوو. تەرزو لقی هاویشتبوو وهێشووی دنیای پێدا هاتبووە خوارێ. چوار فوارە ئاوی زوڵاڵی جوانی نزیك لە یەکتر دەڕژانە خوارەوەو بە جۆگەلانی یەکتربڕدا دەسوڕانەوەو باخچەیەکی جوانی پڕ لە گوڵ و وەنەشەو چنوروگیای بۆنخۆشیان ئاو دەدا. تەنانەت خواوەندیش بەو دیمەنە جوانە سەرسام ودڵخۆش بوو. بەو جۆرە هیرمیس بەسەرسامی لە جێی خۆی وەستاو غەرقی تەمەشا بوو.دوای ئەوەی تێر تەماشای کرد، خۆی بەنێو ئەشکەوتە گەورەکەدا کرد. کالیپسۆ کە بینی، یەکسەر ناسییەوە. چونکە خواوەندان چەند لە یەکتریش دووربن، یەکدی دەناسنەوە. بەڵام هیرمیس، ئودیسیوسی دڵپاکی لە ژوورەوە نەبینی. لە کەناری دەریاکە دانیشتبوو، وەکو هەمیشە داخی دڵی خۆی بە روندك وگریەو زاری هەڵدەڕشت. دەیڕوانییە دەریای پڕگێژەنگ و پێلان و فرمێسکی هەڵدەڕشت. کالیپسو، خواوەندی جوان ونازەنین، کورسیەکی پرشنگداری بۆ هیرمیس دانا، هەرکە دانیشت لێی پرسی:

"ئەی هیرمیس، ئەی سەوڵەجان زێڕین، ئەی میوانی خانەدانی ئازیز، خێرە هاتووی بۆ ئێرە؟ تۆ هەرگیز بۆ ئێرە نەهاتووی. هەرچیەکت دەوێ بیڵێ، هەربکرێ ولە توانای مندا بێ دەیخەمە سەرچاو.بەڵام جارێ فەرموو بچینە ژوورەوە با شتێکی خۆشت دەرخوارد بدەم."

## کالیپسو میوانداری هیرمیس دەکات

کە خواوەند لە قسەکەی بووەوە، خێرا مێزێکی هێنایە بەردەمی، لە هەموو جۆرە تەعام و خواردن و خواردنەوەو نۆشخواریەکی لەسەر بوو. ئیدی ئەرجایفونتیس–ی پەیامئاوەر پاش ئەوەی تێری خواردو خواردەوە، بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"ئەی خواوەند تۆ لە منی خواوەند دەپرسیت کە بۆچی هاتووم بۆ ئێرە، جا من رێك وراست و لەسەر داوای خۆت هەموو راستیەکت پێدەڵێم. من بە خوایشتی خۆم نەهاتووم. زیوس ئەمری پێکردوم کە بۆ ئێرە بێم. دەنا کێ هەیە بە مەیل و ئارەزووی خۆی ئەم هەموو رێگا دوورودرێژە،

به ناو دەریای سوێرو پڕگێژەنگ‌وگێژاوی لەوەسف نەهاتوو بپڕێت؟ بە تایبەتی کە هیچ شارو ئاوەدانیەکی بەشەری لێ نیە، تا بەشەران نەزرونیازوقوربانی گەورە پێشکەش بە خواوەندان بکەن. بەڵام بە هەرحاڵ من ناچار بووم بێم. چونکە هیچ خواوەندێك ناتوانێ فەرمانی زیوس لە عاردی بدات، وسەرپێچی لێبکات. زیوسی سپەردار دەڵێت تۆ لێرە، لای خۆت، پیاوێکی یەجگار کڵۆڵ‌و نەگبەتت گلداوەتەوە، کڵۆڵتر لە هەر هەموو ئەو جەنگاوەرانەی کە نۆ دانە ساڵ لە تەروادەدا، لە دەروی شارەکەی شا پریام دا شەڕیان کرد، ولە ساڵی دەیەمدا کە شاریان بە تەواوەتی وێرانکرد، تالانیان کردو بە دەریادا بەرەو وڵاتی خۆ بەڕێکەوتن، لە ڕێگەدا هەڵەیان دەرهەق بە ئەتینا کردبوو، ئەویش لێیان چووبوو بە قینا، گەرداووگێژەنگ‌و باوباهۆزی بەگژدا کردبوون. هەموو هاوڕێ دلاوەرەکانی تیاچوو بوون‌و باو باهۆز ئەوی هەڵگرتبوو وبۆ ئێرەی هێنا بوو. جا زیوس ئەمرت پێدەکات کە ڕێی بدەی بە زووترین کات بڕوات،چونکە لە چارەی نەنووسراوە لێرەو دوور لە کەسوکاری بمرێت. چارەنووسی ئەوەیە کە جارێکی دی هاوڕێکانی ببینێ، بگاتەوە ماڵ‌وکۆشك‌و تەلارە بەرزەکەی. بگەڕێتەوە وڵاتی خۆی‌و ناو کەسوکارەکەی."

## کالیپسو عەیبی خواوەندان دەژمێرێ

کالیپسو،خواوەندی جوان‌و نازەنین، هەرکە گوێی لەو قسەیە بوو،لە توڕەیی دا لەرزی، هاواری کرد،ئەوسا بەپەلە گوتی: "تەحا کە ئێوەی خواوەند دڵڕەقن، کە حەسودو بەغیلن، غیرە لەو خوا بانۆیە دەکەن کە پیاوێکی بەشەری خۆش بوێ، پەیوەندی دەگەڵ بکات، پێی ڕەوا نابینن، قینی لێهەڵدەگرن، بە هیچ خوابانۆیەکی ڕەوا نابینن کە جێگاکەی بۆ کەسێکی دڵخوازو خۆشەویستی خۆی بکاتەوە. ئەوە بوو کە خوابانۆی سپێدە، سەرپەنجە ناسك‌وگوڵ ئاسا، حەزی لە ئوریون کردو شووی پێکرد، ئێوە، ئێوەی گەلی خواوەندان، کە لەوپەڕی خۆشی‌وشادیدا دەژین، لێی چوون بەقینا، وازتان نەهێنا تا ئارتەمیس، خاوەنی تەخت‌وعەرشی زێڕین، ڕۆیی، لە ئورتوجیادا ئوریونی بەر ناسکە تیران داو کوشتی. هەروەها کاتێ کە دیمیتری زێڕین کەزی،دوای حەزی دڵ کەوتوو، ودەگەڵ ئیاسیوندا، لە کێڵگەیەکی سێ گاسنەدا جووت بوو، هەرکە زیوس پێی زانی ئیاسیونی بەر بروسکەداو کوشتی. ئێستاش ئێوەی گەلی خواوەندان، بەغیلی بە من دەبەن، و لەسەر ئەوە لێتان هەڵپێچاوم کە پیاوێکم، ئادەمیزادێکم لەلایە، من ئەم پیاوەم لە مردن ڕزگار کرد. زیوس بروسکەیەکی لە کەشتییەکەی دابوو، لە ناوەندی دەریای تاریك‌وترسناك‌و مەی ئاسادا تێك‌وپێکی شکاندبوو. هەر هەموو هاوڕێ دلێرو ئازاکانی تیاچوون،وباو شەپۆلان بە تاقی تەنیا ئەویان هەڵگرتبوو وبۆ ئێرە، بۆ ئەم دوڕگەیەی منیان هێنابوو. منیش گرتمەوە، حەزم لێکرد، نانم دایە، لێبڕام کە نەمری بکەم، وهەرگیز پیر نەبێ‌وپیری بە خۆیەوە نەبینێ... بەڵام چونکە هیچ خواوەندێك ناتوانێت فەرمانی زیوس لە عاردی بدات و سەرپێچی لە خواستی ئەو بکات.. مادامێکی فەرمان فەرمانی زیوسە، با ئەم پیاوە بۆ خۆی لە ڕێگەی دەریای بە پێل‌و شەپۆلانەوە بڕوات.. ئیدی حوکم حوکمی زیوسە.. بەڵام من ناتوانم بەخۆم لەگەڵی بڕۆم بیبەم، یان بینێرم، چونکە نە کەشتی سەوڵدارو نە دەریاوانانم نین، کە بەدەریادا بیبەن. بەڵام بە دڵ

ڕێنوێنی دەکەمو هیچ شتێکی لێناشارمەوە، تا بتوانیٚ بەسەلامەتیو بەبیٚ وەی بگاتەوە مەفتەنو ولآتی خۆی."

هەنگیٚ ئەرجایفونتیس، لێی دووپات کردەوە: "کەواتە بەپەلەو هەر ئێستا ڤڕێی بکە، خۆت لە پشمو غەزەبی زیوس بپارێزە، زیوس لە خۆت مەوڕوژێنە، با رقت لێهەڵنەگرێتو پاشان پێتی بڕێژیٚ."

## کالیپسو ئودیسیوس ڕەها دەکات

ئەرجایفونتیس کە لە قسەکەی بووەوە، یەکسەر ڕۆیی. پەری دەریا، کالیپسو، کە پەیامەکەی زیوسی وەرگرتبوو، کەوتە گەڕان بە دووی ئودیسیوسی دڵپاکدا. سەیری کرد ئودیسیوسی دلاوەر، لە کەناری دەریاکە دانیشتووەو وەکو بارانی بوهار فرمێسك دەبارێنیٚ. یەجگار پەرۆشی گەڕانەوە بوو،غەریبی کەسوکارو ولآتی دەکرد، ژیانی شیرینی لە لا تالٚ بوو بوو. چونکە جوانی پەری دەریایی، کالیپسو، شەیداو ئەفسوونی نەدەکرد، چاوانی تێر نەدەکرد. ناچاربوو شەوان لە ئەشکەوتە گەورەکەدا دەگەڵی بخەویٚ. شەوی بەوجۆرە ڕۆژدەکردەوە، بە ڕۆژیش دەچوو لەسەر تاوێری ڕەخی دەریا دادەنیشتو خەمی دڵی بە گریانو فرمێسکان هەڵدەڕشت.چاوی دەبڕیە دەریای جەنجالٚو بەداخ وکەسەرەوە رونکی دەڕشت. خوابانۆی ناسكو نازەنین لێی نزیك بووەوەو گوتی:

"ئەی نەگبەت، بەسە، چیتر لێرە مەگری، تکایە لەوەی پتر ژیانی خۆت بەدەم گریانەوە مەدە. من هاتووم پێت بڵێم کە ڕێگەت دەدەم بەرێی خۆتا بڕۆی. هەستە بڕۆ بە تەوران، داری درێژ ببڕەوەو کەڵەکێکی پان بۆ خۆت دروست بکە، راستو چەپ داری لیٚ داکوتە، بەڵکو سواری دەبیو بە سەلامەتی لە دەریای قولٚو مەنگ دەپەڕیتەوە. منیش هێندەت نانوئاوو شەرابی ئالٚ بۆ دەپێچمەوەو دادەنەم کە ترسی برسیەتیت نەبێت. هەروەها جلكوبەرگت دەدەمیٚ، و بایەکی سازگارو لە بارت لە پشتەوە بۆ هەڵدەکەم، تا بە سەلامەتی بگەیتەوە ولآتی خۆت، ئەگەر خواوەندانی ئاسماننشین، ڕەزایان لەسەر بیٚ، چونکە ئەوان لەو کارانەو لە ئەنجامدانی ئەو کارانە لە من بە تواناترن".

## ئودیسیوس.. بە گومانە.

ئودیسیوس کە بە ئەزموونێکی دژواردا تێپەڕی بوو، مەینەتیەکی زۆری دیتبوو، کە گوێی لەو قسانە بوو لە ناخەوە راچڵەکیو بە دەنگی بەرز گوتی: "ئەی خوابانۆ، بێگومان تۆ نیازێکی ترت لە دڵدایە، نەك گەڕانەوەی من.دەنا ئەم دەریا قولٚوسامناکە، ئەم دەریا بە گێژەنگوشەپۆلە هی ئەوەیە بە کەڵەك لێی بدەی! هێندە سامناکە کە تەنانەت کەشتیو بەلەمانی توندو تۆلٚو تیژڕۆش، ئەگەر زیوسیش بای سازگاری دوو بخات ناتوانیٚ بیبڕیٚ. بۆیە من ناتوانم ئەم ریسکە بکەم،ودوو پێم نانەمە سەر کەڵەك، مەگەر سوێندی گەورەم بۆ بخۆیت، کە هیچ نیازێکی خراپت بەرانبەرم نیە."

## کالیپسۆ دڵنیای دەکات

کالیسپۆ،خوابانۆی نازدار،کە گوێی لەو قسانە بوو، بزەیەکی کردو دەستێکی بەسەریا هێناو گوتی:

"بەڕاستی تۆ نیهادپیسی،راستە زۆرزانی، ئەم قسەیەت لە زۆرزانییە، بەڵام لەم رووەوە بە هەڵەدا چووی! جا قەسەم بە زەوی، قەسەم بەو ئاسمانە بەرینەی بەسەر سەرمانەوەیە، قەسەم بە روباری ستیکس کە بە ژێرماندا دەڕوات، کە ئەمە گەورەترین‌وسامناکترین سوێندە بۆ خواوەندانی موبارەك، من هیچ نیازێکی خراپم دەربارەی تۆ نیە، نەخێر شتی وام لە بیروخەیاڵد نیە، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئامۆژگاری دڵسۆزانەت دەکەم، ئامۆژگاریەك کە ئەگەر خۆیشم لە شوێنی تۆ بوومایە، دووچاری هەمان گرفتاری تۆ بومایە، هەر ئەوەم دەکرد. من لە بیری هیچ خراپەیەك دانیم‌و دڵم لە بەرد نیەو، لە خەمی تۆدام."

## رازونیازی نێوان جووتە دۆست

خوابانۆی بەشکۆ کە لە قسەکانی بووەوە، ئودیسیوسی پاڵەوانی وەدووی خۆی داو بە هەشتاو کەوتە ڕێ، گەییشتنە ئەشکەوتە گەورەکە. ئودیسیوس لەسەر ئەو کورسیە دانیشت کە تازە هیرمیس بەجێی هێشتبوو. پەری دەریا هەموو جۆرە خواردن‌وخواردنەوەیەکی بۆ دانا، هەرچییەك کە ئادەمیزاد بیخۆن. لێ کالیپسۆ، بە خۆی لە بەرانبەر ئودیسیوسی خواوەند ئاسا دانیشت. قەرەواش‌وکارەکەران خواردن‌وبادەی بەهەشتییان بۆ هێنا. هەردووکیان دەستیان بۆ ئەو خۆراکە بەلەزەتەی کە لە بەردەمیان دانرابوو برد. پاش ئەوەی تێروپڕیان خواردو خواردەوە، کالیپسۆ، خوابانۆی بەشکۆ هەڵیدایەو گوتی:

"ئەی کوڕی لایرتیس، ئەی زیوسی نەژاد، ئەی ئودیسیوسی بەردەبار، ئایا بەڕاستی گەرەکتە بۆ ماڵی خۆت، بۆ مەفتەن‌و زێدی ئازیزی باوانت بڕۆیتەوە؟ بە هەرحاڵ هەر بڕیارێکت داوە خوا یارویاوەرت بێ! بەڵام ئەگەر لە دڵی خۆتا دەتزانی، بەر لەوەی بگەیتەوە وڵاتی خۆ، چارەنووس چ دەردو بەڵایەکت بەسەر دێنێ، لێرە، لەم ئەشکەوتەدا دەگەڵ مندا دەمایتەوەو نەمرم دەکردیت...کەڵکەڵەو تاسەی دیداری ژنەکەت، کە بە درێژایی رۆژ ئاهی بۆ هەڵدەکێشی، وەلادەنا. دڵنیابە کە من لە جوانی‌و بەژن‌و باڵادا هیچم لەو کەمتر نیە، هەرچەندە رەوا نیە جوانی‌و بەژن‌و باڵای بەشەرانی فانی دەگەڵ خودایاندا بەراوردبکرێ."

هەنگێ ئودیسیوسی بەردەبارو فرەزان بەرسڤی دایەوەوگوتی:

"ئەی خواوەندی بەتوانا، لەسەر ئەمە لێم توڕە مەبە، من زۆر چاك دەزانم هەرکەسێك پنلوپی فرەزان ببینێ، تێدەگات کە نە لە جوانی‌و نە لە بەژن‌و باڵادا هاوتای تۆ نیە، ئەو بەشەرێکی فانییەو تۆ خوابانۆیەکی نە دەمریت‌و نە پیردەبیت. بەڵام وێڕای ئەمەش یەجگار بیری ماڵ‌وحاڵ خۆم دەکەم. خەریکە سوێم دەبێتەوە بۆ گەڕانەوە. خۆ ئەگەر قەراربێ، خواوەندێك کەشتییەکەم لە ناوەندی دەریای قوڵ‌وەمەی ئاسادا غەرق بکات، بەدڵ‌و بە گیان قەبوڵی دەکەم، هەموو دەردو مەینەتییەك تەحەمول دەکەم. من تا ئێستا چ لە دەریایان‌و چ لە مەیدانانی شەڕدا، زۆرم دەردو مەینەتی کێشاوە! چش با ئەمەشی بێتەسەر!"

کە لەو قسانە بووەوە، رۆژئاوابوو، تاریکی باڵی بەسەر دنیادا کێشا. بە جووتە چوونە ئەوسەری ئەشکەوتە قوڵەکە، ئالکاوی یەکتر بوون،کامی دڵیان لە یەکدی شکاندو پێکەوە خەوتن.

## نەخشەی سەفەری ئودیسیوس

هەرکە سپێدە، بە قامکە گوڵئاساکانی درِی بە تاریکیدا، ئودیسیوس کراس وکەوای لەبەر کرد، پەری دەریاش خۆی لە شاڵێکی دەڵبی سپی میناکی زیو نایاب ودڵگیر پێچایەوە. کەمەربەندێکی جوانی زێرینی لە ناو قەدی بەست وسەرپۆشێکی دا بە سەریا. دوای ئەوە کەوتە بیری ئەوەی کە نەخشەی سەفەری ئودیسیوس دابڕێژێ. تەورێکی گەورەی برونزی دوو دەمی تیژی، خۆش دەستی دایە،کە دەسکێکی لە بارو مەحکەمی دار زەیتونی پێوە بوو. ئەوسا تەشویەکی تیژی بریقەداری دایە. ئودیسیوسی دووی خۆی خست و بەرەو ئاقارو توخوبی دورگەکە کەوتە رێ، کە دارو درەختی زۆر بەرزی وەك سورەبی، سەندەڵ وکاژو سنۆبەری لێبوو و سەریان لە تاقی ئاسمان دەسوو. قەدەکانیان وشکی وشك بوو وبە ئاسانی دەکەوتنە سەر ئاو. کە کالیپسۆ، خوابانۆی شکۆدار دارستانەکەی نیشاندا بەرەو ماڵەکەی خۆی گەڕایەوە. ئودیسیوس یەکسەرو بە جدی کەوتە داربڕینەوە، لە ماوەیەکی کەمدا بیست داری بڕی، بە تەورو تەشو پەرچی کردن، لوس وپاکی کردن، وبەپێی پێویست بڕینییەوە، وەکو دارتاشێکی کارامە ساف و لوسی کردن. ئەوسا کالیپسو، خوابانۆی نازدار، ئەسکەنەودرێلی بۆ هێنا، ئەویش هەموو دارەکانی کونکرد، بە پواز لە یەکی دان و بە چەکوش دای کوتینەوەو بە تەواوەتی جووتی کردن. وەکو چۆن دارتاشێکی کارامە، بەدیقەت ئەندازەی بۆدی کەشتیەکی گەورەی بارهەڵگر رەچاودەکات، ئودیسیوس–ش بە هەمان شێوە کەڵەکێکی گەورەی بۆ خۆی چێکرد. ئەوجا بە تەختە سەرانسەری سەری کەڵەکەکەی داپۆشی و بەپەلە لەدروستکردنی کەڵەکەکەی بووەوە. ئەوجا هات دەعامی بۆ دروستکرد،بورجێکی قایمی بۆ دانا، سەوڵێکی زۆر باشی بۆ خۆی دروستکرد، ئەوسا بە هەر چواردەوریا تەیمانێکی بۆ دروستکرد تا لە شەپۆلانی بپارێزێت، ناوەکەی جوان بە هەژگ و گەڵا داپۆشی. ئەوسا کالیپسو، خوابانۆی جوان و نازدار، کوتاڵێکی سفت چنراوی بۆ هێنا تا بادەوانی لێدروست بکات. ئودیسیوس، وەستایانە،و وەکو شتەکانی دیکە خێرا بادەوانیشی چێکرد. ئیدی کەڵەکەکەی بە پەت وگوریسان توند شەتەکدا، وبە هۆی پوازەناوەوە خستیە ناو دەریای پرشنگدارەوە.

## دیسان ئودیسیوس ودەریا

ئودیسیوس رۆژی چوارەم هەموو کارەکانی تەواو کرد. لە رۆژی پێنجەم کالیپسوی شکۆدار، سەرولەشی ئودیسیوسی پاك شت، جلێکی بۆنخۆشی لەبەر کردو رێگەی دا کە لە دورگەکەوە بەرێبکەوێ.خوابانۆ یەك قەرابە بادەی ئاڵ وجەوەندەیەك ئاوی خواردنەوەو هەمبانەیەکی پڕ لە زەوادوخواردەمەنی جۆراو جۆری بۆ لە کەڵەکەکە بارکرد. ئەوسا بایەکی سازگاری نەرم و فێنکی لە دوایەوە هەڵکرد.ئودیسیوسی بەردەباروجوامێر، بەوپەڕی شادمانی بادەوانەکانی هەڵکرد و دایە بەر بایە سازگارەکە، بە خۆیشی دانیشت و بەوپەڕی لێهاتووی کەوتە سەوڵ لێدان و خەو نەدەچووە چاوانی، بەڵکو چاوانی بڕی بوونە ئەستێرانی پلایادیس،وبوتیس کە درەنگ ئاوا

دەبێت،کە ورچ وگالیسکەشی پێدەڵێن‌و هەمیشە لە جێی خۆی دەسوڕێتەوەو رووی لە بورجی ئوریونە، وتاقە ئەستێرەیە کە لە ئوقیانوسدا ئاوا نابێت. کالیپسو، خوابانۆی نازدارونازەنین ئودیسیوسی راسپاردبوو،کە هەمیشە ئەو ئەستێرەیە بخاتە شانی چەپی خۆی‌و لەسەفەرەکەیدا دەستە چەپ بگرێت. حەڤدە دانە رۆژی تەواو لە پەستاوبێبڕانەوە دەریای بڕی. لە هەژدەمین رۆژا چیا سەختەکانی وڵاتی فیاسیانی لێدەرکەوت! ئودیسیوس کە تەواو لەو وڵاتە نزیك بووەوە، لە نێو دەریای بەرینی بە تەم‌ومژەوە، ئەو چیایانەی وەکو سپەرومەتاڵێك هاتە بەرچاو.

## پوسیدۆن شەپۆلانی بەگژدا دەکات

پوسیدۆنی بە توانا، هەژێنەری زەوی، کە لەلای ئەسیوبیەکان دەهاتەوە، لە دوورەوە، لەسەر کۆجاڕی سولیمییەوە، ئودیسیوسی بینی. سەیری کرد لە ناوەندی دەریادا خەریکی دەریاوانی‌و کەڵەکڕانیە. یەکجار کەللەیی وتوڕە بوو، سەرێکی باداو لە دڵی خۆیدا گوتی:

"تۆ سەیری ئەو نەگبەتیە، دیارە کاتێ کە من لەلای ئەسیوبیەکان بووم، خواوەندان بەدزی منەوە رای خۆیان لەمەڕ ئودیسیوس گۆڕیوە؟ سەیرە، تەواو لە وڵاتی فیاسیان نزیك بووەتەوە، ئەمە نیشانەی ئەوەیە لەو داوی بەدبەختییەی کە تێی کەوتووە رزگاردەبێت. حەیفت نەکرد، مەحاڵە بێڵم بەبێ ئارەقە دەربچێت،وای لێدەکەم ئەو دنیا بەچاو بدینێ!".

ئەو قسەیەی کردو هەورانی کۆکردەوە، دەستی دایە ڕمە سێ سەرەکەی‌و دەریای پێ ژێرو ژوور کرد، شڵەقاندی ئەمما شڵەقان. لە هەموو لایەکەوە باوباهۆز هەڵیکرد، هەور زەمین‌ودەریای داپۆشی، لەشکری شەو لە ئاسمانەوە هاتە خوارێ. بای توڕە لە باشوورو باکوورو رۆژاواوە هەڵیکرد،ودەریا کەوتە شەپۆل دانێکی ئەوتۆ کە هەترەشی زەلامی دەبرد. ئودیسیوس کە چاوی بەو وەزعە کەوت،دڵی ترساو ئەژنۆکانی سست بوون، بە نائومێدی بەخۆی گوت:

"تەحا کە کابرایەکی نەگبەت‌وبەدبەختم! تووشی چی بووم؟ دەترسم قسەکانی کالیپسو راست دەربچن. وتی لە دەریادا بەر لەوەی بگەمەوە مەفتەن‌و زێدی خۆم مەینەتی دنیام بەسەردێ. سەیرە،هەموو پێشبینییەکانی وا دێنە دی!. زیوس دەستی خۆی وەشان. بزانە چۆن بە هەوران بەری ئاسمانی گرتووە. بزانە چۆن دەریای خرۆشاندووە. لە هەموو لایەکەوە تۆف‌و زریانی بەگژا کردووم. تەواو ئیتر دوا دوایمە، چار نیە دەبێ بمرم. لە شەڕی تەروادە رزگار بووم تا لێرەدا، لە دەریادا بمرم. هەزار خۆزگەم بەو داناییانەی کە لە تەروادەدا، لە رای کوڕانی ئوتریوس دا کوژران. هەزار خۆزگەم بەوان. بریا منیش لەگەڵ ئەواندا دەکوژرام. خۆزگە ئەو رۆژەی دەمردم کە تیروڕمی شەڕڤانانی تەروادەیی وەکو ڕێژنەی باران بەسەرمدا دادەباری‌و بەرگریم لە جەنازەکەی ئەخیلی کوڕی پیلوس دەکرد... ئاخر بۆ ئەو رۆژە نەمردم! ئەگەر ئەو رۆژە مردبام بۆ خۆ سەرفراز دەبووم، ئاخاییان ناووناوبانگیان دەگەیاندمە هەرچوار نکالی دنیا. بەڵام ئێستا وا دیارە ئەم مەرگە خەمناکەم لە چارەنووسراوە."

## کەڵەکەکەی ئودیسیوس تێکدەشکێ

کاتێ کە لە دڵی خۆیدا ئەو قسانەی دەکرد، شەپۆلێکی زەلامی توڕەی هاڕوژاو زۆر بە توندی خۆی پێدا کێشا.کەڵەکەکەی بە جۆرێ خولایەوە، کە لەسەری کەوتە خوارەوە. سەوڵەکەی لە

دەست کەوت. بایەکە ئەستونی بادەوانەکەی کردە دوو لەتەوە، بادەوان و گوریس و کەندڕان هەموو کەوتنە دەریاوە. ئودیسیوس تا ماوەیەك هەر لە ژێر ئاودا مایەوە. نەیتوانی دەمودەست لە ژێر چنگی شەپۆلە توندەکە دەرباز بێت. ئەو جلکانەی کالیپسوی شکۆدار دابویە لە ئاوەکەدا قورس بوو بوون و نەیاندەهێشت بە ئاسانی سەر بکەوێتەوە سەر ئاوەکە. ئەنجام سەری لە ژێر ئاوەکەوە دەرهێنا. ئاوە ناخۆش و سوێرەکەی لە دەمییەوە دەتفاندەوە. ئەو ئاوەی بە خوڕ لە تەپڵی سەریەوە بە ئازایدا دەڕژا. بەو حاڵەشەوە، هەر بیری لەلای کەڵەکەکەی بوو. بە باسکە مەلەو بەنێو شەپۆلاندا دوای کەوت، گرتیەوەو خۆی هەڵدایە سەری و لە ناوەندیا دانیشت. هەوڵی دەدا خۆی لە مەرگ رزگاربکات. ئیدی شەپۆلان پاس پاسێنیان پێدەکرد، ئەم شەپۆل بەو شەپۆلی دەسپارد، وەکو چۆن گەردەلوولی پایزان هەژگ و قەڵنشاك لە دەشتان رادەماڵێ و تۆپەڵی دەکات و گیژی دەداو لوولی دەداو بەملاو بەولایدا دەبات، بەو ئاوایە گەرداو ئەوو کەڵەکەکەیان بەملاو بەولادا دەبرد و جارێ بای باشوور، بە بای باکوری دەسپاردو دەیبرد، جارێ بای رۆژهەلات، دووبارە ڕادەستی بای رۆژاوای دەکرد تا بە ئارەزووی خۆی بۆ کوێی بوێ هەڵیدا. ئیدی بەو جۆرە لێیان دەکرد بە دوو سەرەو سێ سەرە.

## ئودیسیوس بە سەرپۆشێك رزگاردەبێ

بەلام کە (ئینو)ی پاژنە جوانی کیژی کادمۆس، کە جاران بەشەرێکی فانی بوو وبە زمانی بەشەران دەدوا، ولیوکوتیای ناوبوو، وئەمێستا چوو بووە قولایی دەریاو سۆزی خواوەندی بەدەست هێنا بوو، وکردبوویان بە پەری دەریایی، کە ئودیسیوسی لەو تەنگانەیەدا بینی، و سەیری کرد حاڵی بەدەست شەپۆلانەوە شڕە، زۆری بەزەیی پێدا هاتەوە، لە شێوەی نەورەسێکی دەریایی لە دەریا هاتە دەرێ و چوو لەسەر کەڵەکەکە دانیشت و گوتی: "ئەی بەدبەخت، ئەی نەگبەت، بۆچی پۆسیدونی زەمین لەرزێن، بەو شێوەیە لێت چووە بە قینا، غەزەبی لێگرتوویت و ئەم هەموو کێشەو بەلایەت بەسەر دێنێ؟ بەلام خەمت نەبێ، سەد هێندەی تریش تووڕە بێ، ناتوانێ لە نێوت بەرێت.. باش گوێبگرە، پێناچێت پیاوێکی گەوج و کاڵفام بی، چیت پێدەڵێم وا بکە. ئەم جلانە دابکەنە. واز لە کەڵەکەکەت بێنە با با بیبات، بە باسکە مەلە بەناو گێژەنگ وشەپۆلان بکەوە. مەوەستە تا دەگەیتە مەفتەنی فیاسییان، کە بگەیتە ئەوێ ئیتر رزگارت دەبێ. هانێ ئەم سەرپۆشە لە سینگ و بەرۆکی خۆت وەپێچە، ئەمە سەرپۆشێکی خواییە، ئەم سەرپۆشەت پێبێ ئیدی خەمی هیچت نەبێ. نە هیچت لێدەقەومێ و نە دەستی مردنت دەگاتێ، بەلام هەرکە گەییشتییە کەنار، لە خۆتی بکەوەو تووڕی بدە دەریای مەی ئاساوە، تا دەست دەگرێ دووری هەڵدەو بە خۆت پشت بکە ئەو شوێنەی کە سەرپۆشەکەی تێفڕێ دەدەی و بڕۆ."

کە لە قسەکانی بووەوە، سەرپۆشەکەی دایە. ئەوسا بە خۆی، لە شێوەو هەیئەتی نەورەسێکی دەریاییدا خۆی هەڵدایە دەریاکەوەو بە نێو رەشە شەپۆلان کەوت و لە چاو ون بوو. ئودیسیوسی ناودار، کە دەردو مەینەتیەکی یەجگار زۆری دیتبوو، بە هەموو بەردەباریەکی خۆیەوە تیامابوو، نەیدەزانی چیبکات، بەوپەڕی نا ئومێدی سێ و دووی دڵی خۆی دەکردودەیگوت:

"های قوڕیٚ! تۆ بڵێی ئەمەش خواوەندێکی دی نەبیٚو داوێکی تازەی بۆ نەنابمەوە؟ ئەگینا چۆن داوام لێدەکات دەستبەرداری کەڵەکەکە بم! نا، نەخێر، جاریٚ بە قسەی ناکەم، چونکە ئەو شوێنەی ئەو دەیڵێیت، گوایە بگەمە ئەوێندەر ئیدی رزگار بووم، یەجگار دوورە. من وای بە چاکتردەزانم، تا کەڵەکەکە، بە تەواوەتی نەشکیٚو پارچە پارچە نەبێت، هەر بەکاری دێنم. هەرچییەکیشم بێتە ریٚ تەحەمولی دەکەم. کەی شەپۆلان پارچە پارچەیان کرد، هەنگیٚ بە مەلە دەڕۆم، هیچ رێگەیەکی لەوە باشتر شك نابەم."

## پوسیدون دەستبەردارنابێت

لە کاتێکا لە دڵی خۆیدا ئەو بیرانەی دەکردەوە، پوسیدون، هەژێنەری زەوی، شەپۆلێکی زەلامی ترسناکی هەستاند،شەپۆل بەسەر سەریەوە چووە تاقی ئاسمانو لەوێندەرەوە کەوت بەسەریا. پیرە شەپۆل، وەکو چۆن رەشەبایەکی توند لە خەرمانێکی پوش دەداتو هەر پوشکەیەکی بەلایەکدا دەبات، پیرە شەپۆلیش بەو ئاوایە کەڵەکەکەی داغان کرد. هەر دەستەكو تەختەیەکی بەلایەکدا برد. بەڵام ئودیسیوس خۆی گەیاندە سەر یەکێك لە تەختەکانو وەکو چۆن سواری ئەسپێکی رەهوان بییٚ، بەو ئاوایە سواری تەختەکە بوو. ئەو جلکانەی لەبەر داکەند کالیپسۆی شکۆدار دابویە. یەکسەر سەرپۆشەکەی لە سینگوبەرۆکی خۆی پێچاو خۆی هەڵدایە دەریاکەوەو باسکی بۆ مەلە، کردنەوە. هەژێنەری بەتوانای زەوی بینی، سەرێکی لەقاندو لە دڵی خۆیدا گوتی:

"هەڵی تەکێنە بارت سەنگینە! بڕۆ، وێڵو سەرگەردان ئامبازی شەپۆلان ببەوە. بڕۆ تا دەگەیە نێو بەشەران، دەردێکم پێدایت، باوەڕناکەم هەرگیز لە بیرت بچێتەوە."

ئەوسا قامچییەکی لە ئەسپە یالٚ شۆڕەکانی داو گەییشتەوە ئیجە. کە لەوێندەر کۆشکێکی شایستەوبەناوبانگی هەبوو.

## ئەتینا فریای دەکەویٚ

بەڵام ئەتینا،کیژی زیوس، نەخشەیەکی دیکەی داڕشت. هەموو بایەکانی لە جوڵە خست. فەرمانی پێکردن، کە چیتر هەڵنەکەن،وبڕۆن بخەون. ئەوسا فەرمانی بە بای باکوردا خێرا هەڵکات. هەموو شەپۆلەکانی پێش ئودیسیوسی،نەوەو نەتیرەی زیوسی، نیشاندەوە تا بتوانیٚ بگاتە نێو خەڵکی فیاسی، کە بە دەریاوانیوسەوڵەوانی بەنێوبانگن، ولە مەرگومەینەتی رزگار بییٚ.

ئودیسیوس دوو شەوو دوو رۆژ بەسەر شەپۆلانی زەلامو ترسناکەوە رۆیی.مردنی بە چاوی خۆی بینی. بەڵام هەرکە خواوەندی سپێدەی کەزیە جوان،مژدەی هەڵاتنی رۆژی سێیەمی دا، بایەکەی خست.دەریا ئارام بووەوە. ئودیسیوس سەیری کرد زۆر لە وشکایی نزیك بووەتەوە. لەسەر شەپۆلێکی بەرزەوە بە تاسەوە روانیە وشکاییەکە.. وەکو چۆن منداڵان کە دەبینن، بابە نەخۆشو دەردەدارو پەژمردەو لە جێگە کەوتووەکەیان، کە لە مێژە خواوەندێك لێی چووە بە قیناو، بەدەم ئازارەوە لە جێدا دەتلێتەوە، وخواوەند لەبەر خاتری مناڵەکان شیفای بۆ دەنێریٚو لە مەینەت رەهای دەکات، دەکەونە خۆشیو شادیو دڵیان خۆش دەبیٚ، ئودیسیوس-ش بەو

ئاوایه به دیتنی زەوی‌و وشکایی شادودڵخۆش بوو. به تاسەوە مەلەی دەکرد تا زووتر بگاتە وشکایی. بەڵام کە بەو ئەندازەیە نزیك بووەوە کە هاواری بگاتە وشکایی. گوێی لە هەنگامەی دەریاو هاڕەوهاژەی شەپۆلانی زەلام‌و ترسناك بوو کە سەریان بە تاوێرانی ناو دەریاکەدا دەکێشاو تێك دەشکان، شەپۆلانی زەلام، بە دەنگ‌وسەدای ترسناك خۆیان بە کەناری وشك‌و برینگدا دەکێشاو کەف دەریا هەموو شتێکی داپۆشی بوو. هیچ بەندەرێك نەبوو کەشتیانی لێ بوەستێ. هیچ لەنگەرگایەك نەبوو پەنای بۆ ببرێ. دەترِوانیە هەر لایەك تاوێری دیوار ئاساو تەختە بەردی زەلام‌ولوس بوو. ئودیسیوس لە ناخی خۆیدا ترسا، هەستیکرد لاقی سست بوون، لە دڵی خۆیدا گوتی:

"وا وەیلا بە حاڵم، هاوار بە ماڵم، چەند نەگبەت‌و بەدبەختم! کە زیوس رەحمی پێکردم‌و دوای ئەوەی هیچ ئومێدێکم بە ژیان نەما بوو، پێی رەوا دیتم کە بگەمەوە سەر زەوی‌و وشکایی.. و بە مەلە ئەم هەموو دەریاو شەپۆلانەم بڕی، ئێستا هیچ رێگەیەك نابینم تا لەم دەریا قووڵ‌و مەنگە دەرباز ببم‌و بگەمە سەر زەوی. بەردەمم یەکپارچە تەختە تاوێری سەخت‌و تیژە، شەپۆلان لە هەر چوارلاوە دەوری داوە، تاوێرە بەرد، وەکو دیوار چووە بە ئاسمانا. هەرچوار دەوری دەریا قوڵە، شوێنێك نیە پێی بخەیتە سەرو لە مردن رزگار ببی. ئەگەر هەوڵبدەم لێرە دەرباز بم، دەترسم لەو کاتەدا شەپۆلێکی بە قوەت هەڵمبگرێت‌و بە تاوێرێکی سەختمدا بکێشێت! وهەموو هەوڵ‌و تەقەلاکەم بە فیڕۆبڕوات. ئەگەر بە مەلە لێرە دوور بکەمەوەو بچم لە کەنارێکی نزم بگەڕێم، دەترسم تۆفان‌و زریانێکی تووش بمگرێ‌و هەرچەند هاوار بکەم‌وبناڵێنم، بەرەو قوڵایی دەریای پڕماسیم ببات‌ودوورم بخاتەوە. یان خواوەندێك، دڕندەوشێرێکی دەریاییم، لەو دڕندانەی کە ئامفیتریت-ی سەربەرزو بەنێوبانگ بە کۆمەڵ پەروەردەیان دەکات، بۆ بنێرێت‌و... من دەزانم کە هەژێنەری سەربەرزی زەوی چەند لە من پڕوتوڕەیە."

## ئودیسیوس خۆی بەتاوێرکەوە هەڵدواسێ

ئودیسیوس کە لە سێ‌ودووی ئەو بیرانەدا بوو، لە پڕ شەپۆلێکی زەلام هەڵیگرت‌و بە تاوێرێکی کەنارەکەیدا کێشا. ئەگەر ئەتینای چاوگەش فریای نەکەوتباو لە دڵی نەنابا کە خۆی بە تاوێرەکەوە بگرێ، ئێسك‌و پروسکی وردوخاش دەبوو. بەدەم ئازاروهاوارەوە خۆی گەیاندە تاوێرەکەو، توند بە هەردوو دەست گرتی،شەپۆلەکە گەڕایەوەو ئەمجارەش نەجاتی بوو.. بەڵام پاشماوەی شەپۆلەکە گەڕایەوەو لەگەڵ خۆیدا بەرەو قوڵایی دەریا ڕایماڵی‌و دووری خستەوە.

وەکو چۆن ئەختەبوتێك لە کونی خۆی رادەکێشیتە دەرێ‌و زیخ‌و چەوی دنیا بە چنگەکانیەوە دەلکێ، بەو ئاوایە پێستی دەستی ئودیسیوس داماڵراو، شەپۆلەکە ئودیسیوسی لەگەڵ خۆیدا راماڵی. ولەوە بوو فەوت‌وفەنای بکات، ئەگەر ئەتینای چاوگەش ئەم تەگبیرەی بۆ نەکردبوایە. کە لە ژێر شەپۆلەکە دەرچوو، بە باسکە مەلە کەنارەوکەنار رۆیی. بەدەم مەلەوە دەیڕوانی تا بەندەرێك یان نزمایيەك بەدی بکات. بەدەم مەلەوە گەییە رێژاوی روبارێکی ئارام‌ومەند. هەستی کرد ئەمە شوێنێکی زۆر لە باروباشە. چونکە هەم تاوێری لێنەبوو وهەم پەنابا بوو. ئودیسیوس، لە دڵی خۆیدا بەمجۆرە کەوتە نزاوپاڕانەوە لە رووبارەکە:

"ئەی سەروەر، تۆ هەر کێیەك هەی، من هانام بۆ هێناوی، دوعام گیرا بکە، منی هەڵاتوو لە دەریاو هەڕەشەو گوڕەشەی پوسیدون، هانا بۆ تۆ دێنم، لێت دەپاڕێمەوە، نوێژت بۆ دەکەم، پیاوی لێقەوماووسەرگەردان لای خواوەندانیش مایەی ڕێزو بەزەییە، هاتووم بۆ لای تۆ، زینهار، دەستم بە دامێنێت، پێیەکانت ماچ دەکەم، دوای ئەم هەموو بەڵاومەینەتیە، ئەی سەروەر! بەزەییەکت پێمدا بێتەوە، لێت دەپاڕێمەوە،تکات لێدەکەم."

## دەریا هێور دەبێتەوە

هەرکە ئودیسیوس ئەو قسانەی کرد، ڕووبارەکە لە ڕەوتوڕۆینی خۆی کەوت. شەپۆلەکانی ڕاگرت. ڕێگەی بۆ خۆشکردوگەیاندیە ڕێژاڤەکەی خۆیو لە مەرگی ڕزگار کرد. ئەنجام ئودیسیوس. گەییە سەر زەوی، بە چۆکا هات، هەردوو دەستە بە هێزەکەی سست بوونو کەوت. شەپۆلی دەریا شنگوهێزی لەبەر بڕی بوو، هەموو لەشی ئاوسا بوو. ئاوی سوێری دەریا لە زارو هەردوو کونە کەپویەوە دەهاتە دەرێ. بێئەوەی ورتەیەکی لێوەبێ، شەکەتوماندوو، نیوە گیان لەو گۆڕە کەوتبوو.جوڵەی لەبەر بڕا بوو، ئازای لەشی کوترا بوو. لە هۆش خۆی چوو بوو.بەڵام کە هەناسەی هاتەوە بەرو کەمێك بوژایەوە، یەکسەر سەرپۆشەکەی خواوەندی لە سینگو بەرۆکی کردەوە، تا دەستی گرتی توڕی دایە ناو ئەو ڕوبارەوە کە دەڕژایە دەریاکەوە، شەپۆلێکی زەلام بەرەو دەریاکەی ڕاڕفاند. یەکسەر ئینو سەرپۆشەکەی لێوەرگرت. ئەوسا ئودیسیوس لە ڕوبارەکە دوور کەوتەوە، دوای ئەوەی خاکی گەنمەجاڕەکەی ماچ کردو لە نێو نەیجەزارەکەدا خۆی بە عاردیدا دا، بە دەم ئاهوناڵینەوە بە خۆی گوت:

"نەگبەت خۆم! ئاخۆ چیترم بەسەر بێت؟ ئاکامو ئاقیبەتم چۆن دەبێت؟ ئەگەر ئەم شەوە سەختە لێرە، لە قەراخ ئەم ڕوبارە بگوزەرێنم، دەترسم بەم ماندوویەتیوبێتاقەتییە بەرگەی شەقنەمو سیخوار نەگرمو ڕەق ببمەوە، بە تایبەتی کە بەرەبەیان شنەیەکی زۆر سارد لە دەریاوە هەڵدەکات. ئەگەر بەم قەد پاڵەدا هەڵگەڕێمو خۆم بە لێرە چڕوچوغوردەکەدا بکەمو لە شوێنێکی چڕە درەختدا پاڵ بکەوم، باشە کە سەرماکەم لە لەش دەرچوو وماندوویەتیم حەسایەوە،و خەوێکی قووڵ بردمیەوە، ئاخۆ هەنگێ نابم بە توێشووخۆراکی دێوودڕندان؟"

## ئودیسیوس پاڵ دەکەوێ تا ئیسراحەت بکات

بەو جۆرە ئودیسیوس دوودڵو نیگەران بیری لە باشترین چارە دەکردەوە. بەرەو لێرەوار بەڕێ کەوت، لە نزیکی ئاوێك لێرەواری دۆزییەوە. لێرەوارەکە زۆر لە بەرزی بوو. هەرچوار دەوری دیار بوو، لەوێدا خۆی وەژێر دارێکی دوو لقەدا کرد، کە هەردوو لقەکە لەیەك قەدەوە دەرهاتبوون، لقێکیان دارزەیتونێکی خۆڕسك بوو ولقەکەی تریان ڕۆێنرا بوو. هێندە چڕە گەڵاو بە جۆرێ بە نێویەکدا چووبوون، نە کزەبای سارد دەیانگەییشتێو نە تیشکی گەرمی هەتاو دەی بڕینو نە باران دزەی لێوەدەکرد. ئودیسیوسی ناودار لایدایە ژێر ئەو جووتە درەختە، یەکسەر باوەشێك گەڵای خڕکردەوەوجێگەیەکی فەریحی بۆ خۆی ڕاخست. هێندەی گەڵای ڕژاو لێبوو، لە چلەی زستاندا، لە هەڕەتی تۆفوسەرمادا، بەشی دوو سێ زەلامی دەکرد کە لەسەری بخەونو بە خۆیانیا بدەن. ئودیسیوسی ناوداری بەردەبار، کە ئەو هەموو کارەساتومەینەتیەی دیتبوو و

جەڕباندوو، وەختێ ئەو هەموو گەلایەی بینی زۆر دڵی خۆش بوو. لە ناوەڕاستی گەلاکاندا پاڵ کەوت، وبەگەلای تر خۆی داپۆشی. وەکو چۆن یەکێك لە ئاقاری کێڵگەو مەزرایەکی دوورە دەستوچەپەکدا، کە هیچ دەرودراوسێیەکی لێوە نزیك نەبێت، چەند پشکۆیەك وەبن خۆڵەکەوە دەدات،بۆ تەنگانەی هەڵدەگرێت، تا هەم ناچار نەبێت لە کاتی پێویستدا بچێت لە شوێنانی دی ئاگر بێنێ، و هەم کێڵگەکەش لە مەترسی ئاگرکەوتنەوەو سووتان بە دووربێ، بەو ئاوایە ئودیسیوس خۆی وەبن گەلایان دا. ئەتیناش خەوی بەسەرا باراندو یەکسەر خەوبردیەوەو شەکەتی و ماندوویەتی لەبیرچووەوە...

## پەراوێز:

*- تیتونوس: کوڕی پاشای تەروادەیە، گەنجێکی زۆر جوان بوو، خوابانۆی سپێدە حەزی لێکردو دوو کوڕی لێی بوو.

*- ئەرجایفونتیس: نازناوی هیرمیسی پەیکی خواوەندانە.

*- ئوریون: زەبەلاحێکی زۆر بەهێزو راوچییەکی زۆر جوانە. گوایە لە باببیەوە فێر بووە کە بەحران ببڕێ.

*- ناسکەتیر: مەبەست ئەوەیە کە مردن بەو جۆرە تیرە،مردنێکی بێ ئازارە.

*- دیمیتر: خواوەندی دانەوێڵەومێوەو کشتوکاڵە. جا چونکە کشتوکاڵ بەسەرچاوەی مەدەنیەتو شارستانیەت دادەنرێ، بۆیە لە هەمان کاتدا خواوەندی یاساو رێساو هاوسەرگیریشە.

*- ئەیاسیون: کوڕی زیوسە، دیمیتر حەزی لێکرد، پلوتوسی لێی بوو، بۆیە زیوس بە بروسکەیەك کوشتی.

*- ستیکس: روبارێکی سەرەکی هادیسە، ناوی ئەم روبارە لەلای خواوەندەکانیش موبارەك بووە، بۆیە سوێندیان پێدەخوارد.

*- پلایادیس: کیژانی ئەتڵەس، ژمارەیان حەوتە. ئەمانە لە هەموو راووشکارێك دا هاوڕێی خوابانۆی راو بوون. زیوس کردنی بە کۆترە باریکەو لە بەینی ستێراندا داینان.

*- ئینۆ: کیژی کادموسو هارمونیای خەڵکی تیبەیە. هیرای ژنی زیوسی گەورەی خواوەندانی لە خۆی هاڕوژاندو توڕەکرد.

*- کادموس: کە زیوس یوروپای هەڵگرت. بابی یوروپا، کادموسی برای یوروپای بە شوێنا نارد تا بیدۆزێتەوە، ئەمری پێکرد بەبێ خوشکەکەی نەگەڕێتەوە. کە ماوەیەکی زۆر بە بێهودە گەڕا، پەنای وەبەر فالبین برد، فاڵبین پێی گوت تووشی چێڵێك دەبێتو دوای ئەو چێڵە بکەوێو لە هەر شوێنێ وەستا لەوێندەر شارێك دروست بکات. کادموس زۆر زوو تووشی چێڵی ناڤبری بوو، و بۆ بیوتیا دوای کەوت، کە لێبڕا چێڵەکە بکاتە قوربانی، پیاوەکانی نارد بۆ سەر کانیەکی ئەو نزیکانە، شتاقیان نەگەڕانەوە. بەخۆی رۆیی تا بزانێ چ باسە. سەیری کرد ئەژدیهایەکی گەورە هەموو پیاوەکانی کوشتووە. هەڵبەتە نەیدەزانی ئەم ئەژدیهایە لە نەسلی خواوەندانە، بۆیە دوای

**شەڕێکی دژوار، بە کۆمەکی خوابانۆ ئەتینا، ئەژدیهایەکەی کوشت. ئەوسا بە راوێژو تەگبیری ئەتینا ددانی ئەژدیهایەکەی رواند، یەکسەر کۆمەڵێك زەلامی چەکدار رووان و بەربوونە گیانی یەك و جگە لە پێنج کەسیان کە یارمەتی کادموسیان دا لە بونیاتنانی کادمیای قەڵای قایم و تازەی تیبە، هەر هەموو ئەوانی دی کوژران.**

***- لیوکوتیا: ناوی ئینویە دوای ئەوەی بوو بە پەری دەریاو خوابانۆ، یەکێك لە کارەکانی ئەوەیە لە کاتی تەنگانەدا یارمەتی ئەو ڕێبوارانە دەدات کە لە دەریادا لێیان دەقەومێ. کاتێ ئودیسیوس خەریك بوو لە دەریادا تیابچێت، سەرپۆشێکی دایە تا لە سینگ و بەرۆکی خۆی ببەستێ و بۆ ئەوەی ئەگەر کەشتییەکەشی تێك وپێك شکا، هەر ژێر ئاو نەکەوێ و نەخنکێ.**

***- ئەمفیتریتی: ژنی پۆسیدونە، واتا شابانۆی دەریایە.دەڵێن لە ئاشقێنی پوسیدون بێزار بووەو هەڵاتووە.بەڵام پوسیدون شێرێکی دەریایی (دولفین) بە دوادا ناردووە تا بیهێنێتەوەو وەکو هاوسەر لە گەڵیا بژی.**

## سروودی شەشەم

### کورتەی سروودەکە:

ئەتینا دەچێتە خەوی نوسیکا، کیژی ئالسینوس، پاشای فیاسیان،وداوای لێدەکات بچێتە کوڵوکانی،وخۆی بۆ شوو ئامادە بکات. نوسیکا چەند هێستروگالیسکەیەك لە بابی وەردەگرێتو دەگەڵ هاودەموکارەکەرەکانیا دەچێت بۆ سەر کانیوروبار. کیژەکان دوای ئەوەی لە جل شۆردن دەبنەوەو سەرولەشی خۆ دەشۆن، دەکەونە تۆپانیّو ئودیسیوس لە دەنگە دەنگی وان خەبەری دەبێتەوە. داوای کۆمەكویارمەتی لە نوسیکا دەکات. نوسیکافەرمان بە کارەکەرو هاونشینەکانی خۆی دەدات کە خۆراكو پۆشاکی بدەنیّ.ئودیسیوس تانزیکی شار دەگەڵ ئەو کژە گەنجەدا دەڕوات. لەویّ، لە نزیکی شاردا، لە بێشەیەکدا، کە تایبەتە بە ئەتینا، لا دەداتو نوێژ بۆ ئەتینا دەکاتو لەبەری دەپاڕێتەوە.

***

### ئەتینا دەچێتە خەوی نزیکا

لەو کاتەدا کە ئودیسیوس، هیلاكوماندوو لە غوڕابی خەودا بوو، ئەتینا بەرەو وڵاتو شاری فیاسیەکان رۆیی. ئەم فیاسیانە لە سەرەتاوە لە دەڤەری پانوبەرینی هیپریادا ئاکنجی بوون. دراوسێی سیکلۆپانی ملهوڕونەزانو خۆپەسند بوون. ئەم سیکلۆپانە کە لە فیاسیەکان بەهێزتر بوون بەردەوام پەلاماری فیاسیەکانیان دەدا. ئازاریان دەدانو تاڵانیان دەکردن. ئەوە بوو نووسیتوسی سەردارو پاشایان، کە سیمایەکی یەزدانی هەبوو،بۆ دەڤەری سخیریای گواستنەوە، دوور لەو دراوسیّ هۆڤیانە، حەسارێکی لە دەوری شار راکێشا بوو. ماڵوخانووی دروست کردبوو. پەرستگەی بۆ خواوەندان چێکردبوو، و زەویو زاری بەسەر رەعیەتەکەیدا دابەشکردبوو. بەڵام زوو مرد بوو و ئێستا لەو دنیا، لە هادیس بوو. ئیدی دوای ئەو ئالسینوییوس، کە راوێژ لە خواوەندانەوە وەردەگرێت، حوکمی گەلو وڵاتی گرتە دەست. جا خوابانۆی چاوگەش، ئەتینا، بۆ ئەو ماڵە چوو، تا تەگبیری گەڕانەوەی ئودیسیوسی جوامێر بکات. خۆ بە ژوورێکدا کرد کە زۆر بەجوانی تەختە پۆش کرا بوو. لەم ژوورەدا کیژێکی پاکیزەی گەنج کە لە بەژنو باڵادا هیچی لە خواوەندان کەمتر نەبوو، نووستبوو. ئەو پاکیزەیە نوسیکای

کیـژی ئالیسنویوسـی دلاوەر بـوو. دوو کارەکـەری جوان‌وخشـیك لـە نزیکـی ئـەوەوە، لـەم بـەرو لەوبەری دەرگاکەی دۆتمیرەوە نووستبوون.دەرگا ساف‌ولوسەکان خڕ داخرا بوون. خوابانۆ بەبێ خشپە وەکو شنەی با، خۆی بە ژووری نووستنەکەی کیژێدا کرد. بە دیار سەریەوە وەستا، لە شێوەی کیژەکەی دوماسی کەشتیوان‌ودەریاوانی بەناوبانگدا خۆی بە ژوورەکەیدا کرد. ئەم کیژە هاونشین‌و هاوتەمەن‌وخۆشەویست‌و ئازیزی نوسیکا بوو. ئەتینای چاوگەش دوای ئەوەی چووە پێستی ئەو کیژەوە، رووی دەمی تێکردوگوتی:

"نوسیکا، ئـەوە چیتە، دەك لـە بـاری دایکـت چووبای، بۆچـی ئەوەنـدە خەمسـاردو بێموبالاتی؟ هەموو جلـە جوانـەکانت لێرەو لـەوێ کـەوتوون‌و فەرامۆشـت کـردوون، و ئـاخر تـۆ بـەو زووانـە بـە بووکی دەڕۆیت، بۆیە نەك پێویستە هەر خۆت بڕازێنیتەوەو جلکی جوان لەبەربکەی، بەڵکو دەبێ کارەکەرو هاونشینەکانیشت بڕازێنیتەوەو جلکی جوانیان لەبەر بکەی. چونکە ئـەم شتانە لـە نێو خەڵکیدا دەنگ دەدەنەوە،.دڵـی دایـك‌و بابـە هێژاکـەت خـۆش دەکـەن. دەی کیـژێ، خـۆت سـازبدە، لەگەڵ گەردی بەیاندا ڕادەبین‌و دەچینە کوڵوکانی، دەبێ بڕۆی جلەکانت بشۆی، منـیش دەگـەڵت دێم‌و یارمـەتیت دەدەم تـا زوو لێبێتـەوەو خـۆت ئامـادە بکـەی. چـونکە زۆرت نـەماوە بـە بـووکی بڕۆی. خۆ هەتا هەتایە بە کیژی نامێنیتەوە. ماوەیەکە خانەدانترین کوڕانی فیاسی، ئەم وڵاتـە کـە وڵاتی بنەماڵەی تۆیە، خوا خوای ئاوڕێکی تۆن، چاویان بڕیوەتە تۆ. دەی ئـەم بەیانیـە، زوو بابـت لە خەو هەستێنە با گالیسکەو هێسترانت بۆ ئامادە بکات، تا کەمەربەند، شاڵ‌وچەرچەفو هـەموو جلك‌و بەرگەکانتی لێ باربکەی‌و، بیانبەین بۆ شۆردن. بە گالیسـکە بـڕۆین باشـترە، چـونکە حـەوز کانیەکان زۆر لەشارەوە دورن".

ئـەتینای چـاوگەش کـە لـە قسـەکانی بـووەوە، یەکسـەر لێـی دا بـەرەو ئولـەمپ، مەڵبەنـدی هەمیشـەیی‌و جێگیرو هـەتا هـەتایی خواوەنـدان گەڕایـەوە. ئـەو مەڵبەنـدەی نـە بـا دەیهـەژێنێ، نـە باران تەڕی دەکـات، نـە بـەفری لێدەبارێت. بـەڵام هەمیشـە هەوایـەکی خۆش‌وسازگارو بـێ هـەورو هـەڵای هەیـەو سـەراپا سـپی دەچێتەوە. خواوەنـدانی موبـارەك هـەموو رۆژانـی خۆیـان لەوێنـدەر بەسەردەبەن. جا خوابانۆی چاوگەش دوای ئەوەی ئەو قسانەی بۆ کیژەی گەنج‌و جەوان کرد، بۆ ئەوێندەر زڤڕییەوە.

## نوسیکا بە گوێی ئەتینا دەکات

هەرکە سپێدە لە عەرشە جوانەکەیەوە، بەیانی دا، نوسیکای بە خۆو سەرپۆشە ناسکەکەیەوە لە خەو هەستاند. یەکسەر خەونە سەیرەکەی بیرکەوتـەوە. خـۆی بـە نێـو کۆشـك تەلارەکـەدا کـرد، تـا بـاب‌و داکـی لـە خەونەکـەی ئاگاداربکاتـەوە. هـەردووکیان لـە ماڵـەوە بـوون. دایکـی لـە نزیکـی کوانگەکـە، دەگـەڵ کارەکەروکوڵفـەت‌و هاونشـینەکانی دا دانیشـتبوو. دەستپێچـکە خوریـەکی ئەرخەوانی بە تەشی دەڕست. هەروەها لەبەر دەرگادا بابی بینی کە خەریك بوو بۆ کۆبوونەوەیەك دەچوو کە پیاوماقولانی فیاسی دەعوەتیان کردبوو. لێی نزیك بووەوەوگوتی: "باوکە گیان، ئەرێ ئـەمر نافـەرمووی گالیسـکەیەکی روختـەی، پێچـکە بـەرزم بـۆ ئامـادە بکـەن، تـا هـەموو جلـە چڵکنەکانمان بەرم بۆ سەر روبارو بیان شۆرم؟ تۆ کە سەردارو پاشای ئەم دەڤەرەی، پێویستە لە

کۆڕەو کۆبوونەوەی میراندا جلوبەرگی خاوێنت لەبەربیَ. هەروەها تۆ پێنج کورت هەن، دوانیان ژندارن، وسیانیان سەڵتن، پێویستە ئەمانە کە دەچنە بەزموداوەتان جلکی خاوێنو تازە شۆراویان لەبەردابیَ. ئیدی لەسەر منە کەخەمی ئەم کارانە بخۆم."
نوسیکا لەوە زیاتری نەوت. رووی نەهات باسی زەماوەندوخۆشیو بەختەوەری شووکردن بکات. بەڵام بابی لە هەموو شتێك حاڵی بوو. وەڵامی دایەوە: "کیژەکەم، من نەهێستران و نە گالیسکەو نە هیچم بۆ تۆ لە چاو نیە، بڕۆ، نۆکەروخولامەکان، گالیسکەیەکی روختەی پێچکە بەرزو، سەندوق لەسەرت بۆ ئامادە بکەن".

## نوسیکا دەگەڵ کارەکەرەکاندا جل دەشوات

دوای ئەو قسەیە، دەستووری بە خولامان دا، خولامان بە پەلە بە دەنگیەوە هاتن. خێرا لە کۆشکەکە وەدەرکەوتن. گالیسکەیەکی روختەو بەرزیان هێنا، هێسترانی رەهوانیان ئامادە کرد، لە گالیسکەکەیان بەستن. کیژیَ جلە جوانەکانی لە ژوورەکەی خۆیەوە هێناو خستییە نێو گالیسەکە جوانەکەوە. دایکیشی بەتامترین خۆراك توێشووی بۆ لە سەبەتەیەك نا. جەوەندەیەکی لە پێستە بزنی بۆ پڕ لە شەراب کرد. هەنگیَ نوسیکا سواری گالیسکەکە بوو. دایکی تونگەیەکی زێڕینی پڕ لە زەیتی زەیتوونی خالیسەی دایە کە کیژەکەیو کارەکەرەکانی لە دوای خۆشۆردن لە شیانی پیَ چەوربکەن، نوسیکا جڵەوە تابانەکانو قامچی گرتە دەست. قامچییەکی بە پشتی هێسترەکاندا کێشا، هێستر بەلەز بۆی دەرچوون.سەدای سمی قاتران سەعاتە ڕێیەك دەڕۆیی. بیَ وچانو بیَ ئەوەی ماندووبن، گالیسکەکەیان بە نوسیکاو جلەکانیەوە، لەگەڵ کارەکەرەکانیا بەرەو سەر روبار بۆ کولَوکانی دەبرد.

کە گەییشتنە سەرچاوەی روبارە جوانەکە، سەیریان کرد ئەستێڵەکان پڕ بوون لە ئاوی سافو رۆشن. ئاوەکە هێندە زۆر بوو تێری شۆردنی پیسترین جلکانی دەکرد. قاترەکانیان لە گالیسکەکە کردەوە. بە کەناری روبارەکەیاندا بردن تا لەو مێرگوزارانەی کە لە هەنگوین شیرینتر بوون بە کامی دلَ بلەوەڕن. بە باوەش جلەکانیان لە گالیسکەکە داگرت، خستیاننە حەوزەکانەوە، ئیدی فڕان فڕان هەرکەسەو دەیویست لەوی تر زووتر لێببێتەوە.بە پێوە دەچوونە سەر جلەکانو لە حەوزەکاندا دەیان شێلان. پاش ئەوەی جلەکانیان شتو هەموو لەکەوچڵكو پەڵەکانیان لێکردنەوە، بە ریز لە قەراخی رووبارەکە لەسەر ئەو زیخو چەوەی کە شەپۆلی روبارەکە شۆردبوونیەوەو لە خاوێنیدا دەبریسکانەوە، هەڵیان خستن. پاشان خۆیان شت. رۆن زەیتیان لە خۆ هەڵسوو، چوون لە جێیەکی بەرزی کەنار رووبارەکە نانیان خوارد. چاوەڕوان بوون تا جلەکانیان لەبەر تیشکی هەتاو هیشك ببنەوە. پاش ئەوەی دۆتیمروهاونشینو کارەکەرەکانی لە نان خواردن بوونەوە، سەرپۆشەکانیان فڕێداو کەوتنە تۆپانیَ نوسیکای باسك سپی، سەر قافڵەی گۆرانیو هەڵپەرکێیان بوو، بە دەم گەمەوە گۆرانیان دەگوت. وەکو چۆن ئارتەمیسی تیرئەنداز دەچێتە کۆساران، بە لوتکەو زناری بەرزی تاوجیتوسو ئیرومانتوس دا، شادو خۆشحالَ، لەزو چالاكوچەڵەنگ، گورجو گۆلَ، دەکەوێتە ڕاوی بەرازە کێویو کەڵی قۆچاغ، و

پەرییانی دەشتو کیژانی زیوسی مەتاڵدار لەو شکارو گەشتەدا لەگەڵیانو بە دوویەوەن، و لیتۆ لە دڵی خۆیدا زۆر بەو دیمەنە شادە، چونکە ئارتەمیسی کیژی، لە هەموو ئەو پەریانە باڵا بەرزترەو لە ناو هەموویاندا دیارە. هەرچەندە ئەو پەریانە هەموویان هەر جوانن، بەڵام ئارتەمیس بە ئاسانی لە ناویاندا دەناسرێتەوە. بەڵێ نوسیکاش، ئەو پاکیزەیەی کە هێشتا شووی نەکردبوو، و ڕامی پیاوان نەبووو بوو، بەو ئاوایە لە نێوان هەڤنشینو کارەکەرەکانیا دیار بوو، و پرشنگی دەدا.

## ئودیسیوس لە هەراوزەنای کارەکەرەکان خەبەری دەبێتەوە

کات درەنگ بوو، وەختی گەڕانەوە بوو. قاتران لە گالیسکە بەستران. جلە خاوێنەکان قەدکران، ڕێك لەو کاتەدا، خوابانۆ، ئەتینای چاوگەش، بیری لەوە کردەوە کە کارێك بکات ئودیسیوس خەبەری ببێتەوەو ئەو کیژە ڕەزاسووکە ببینێ تا لەگەڵ خۆیدا بۆ شاری فیاسیەکانی بەرێتەوە. ئەوە بوو دۆتمیر تۆپەکەی بۆ یەکێك لە هاوڕێکانی هاویشت، تۆپەکە نەگەییە دەستی، کەوتە گێژەنگێکی قووڵی ڕووبارەکەوە. هەموو کیژەکان بە دەنگی بەرز هاواریان کرد، ئودیسیوس لە خەو ڕاپەڕی، لەسەر جێگاکەی خۆی دانیشت. زۆری سەر لەم هەڕاوزەنایە سوڕما. لەدڵی خۆیدا گوتی: "واوەیلا بە حاڵم، نەگبەت خۆم! کەوتوومەتە نێو چ خەڵکانێکەوە؟ ئاخۆ دڕودڕندەو دڵڕەقو ستەمکارن یان میهرەبانو دڵنەرمو غەریب دۆست، وله ناخا لە خوا ترسن؟ چ بوو، گوێم بە دەنگی هاوارێکی ناسك زرینگایەوە. لە دەنگی کچۆڵان دەچوو! لەوەیە فریشتەو پەرییان بن کە لە سەر لوتکە بەرزەکان یان لەسەر کانیو ڕووبارەکان، یان لەنێو مێرگو مێرگوزارەکاندا خەریکی گەشتو ڕاوبن. دەنا ماقولە من لە ئاوەدانیو بەشەران نزیك بووبمەوە؟ فایدەی نیە، هەر ئێستا دەڕۆمو سۆراخێکی ئەمە دەکەم."

## یەکەم ئاخاوتنی ئودیسیوس دەگەڵ نوسیکادا

هەرکە ئودیسیوسی دلاوەر ئەو قسانەی بە خۆی گوت، لە ژێر جووتە دارەکە وەدەرکەوت. بە نێو بێشەکە کەوت. بە دەستە بەهێزەکانی لقە دارێکی چڕە گەڵای شکاند، تا لەشو عەورەتی خۆی پێ بشارێتەوەوداپۆشێت. وەکو چۆن شێرێکی چیایی، بە پشتیوانی هێزو توانای خۆی، بێباكو بێپەروا، بە نێو باوبۆراندا، بە چاوانی سوری گڕ گرتووەوە، دوی گاگەلو پەزان، دووی کەڵە کێویان دەکەوێ، وبرسێتی واداری دەکات مل بە پەرژینو تەیمانانی سفتو ئاغەڵانەوە بنێو پەلامار بداتو سکی خۆی تێر بکات، (ئودیسیوس)ش بەو ئاوایە بەسەری کۆتو پێی پەتی،ناچاریوپێویستی واداری دەکرد لە کۆڕی ئەو کیژۆڵە گێسو جوانانە بچێتە پێشێ. کە کیژەکان سەیریان کرد سەراپای لە شۆراودایە، زۆری لێترسان. هەر یەکەیان بەلایەکدا هەڵات، و بە کەناری ڕووبارەکەدا بڵاوبوونەوە. تەنیا کیژەکەی ئالسینویوس لە جێی خۆی وەستاو نەڕەڤی. چونکە ئەتینا زاتی نابووە بەرو ترسی لێرەواندبووەوە، نەك هەر نەڕەڤی بەڵکو ڕێك لە هەنبەریدا وەستا. ئودیسیوس حایرمابوو چ بکات! ئایا بچێت بەسەر دەستوپێی ئەو کیژە چاو جوانەدا بکەوێتو پێیەکانی ماچ بکاتو لێی بپاڕێتەوەو بلاڵێتەوە، یان هەر لەو دوورەوە بە دەمو زاری خۆش داوای لێبکات ڕێگەی شاری نیشان بداتو جلێکی بداتێ لەبەری بکات. ئودیسیوس،

دوای کەمێك ڕامان، هەستی کرد ئەگەر لە کیژە بچێتە پێشیْ و بەسەر دەستوپێیدا بکەویْ، لەوەیە کیژیْ بترسێت و بڕەڤیْ. ئەم هەلەی لەدەست بچێت. بۆیە هەر لەوێندەرەوە، لە دوورەوە، ڕووی تێکردو بە زمانێکی ناسكولوس و ڕەوان گوتی:

"ئەی دۆتمیر، من پێویستم بە یارمەتی تۆ هەیە، هانام بۆ تۆ هێناوە، تکایە پێم بڵیْ تۆ چیت، خواوەندیت، پەریت، یا ئادەمیت؟ ئەگەر یەکێك بی لە خوابانوانی ئاسماننشین، بە مەزەندەی من، ئارتەمیسی، کیژی زیوسی مەزنیت. جوانیت، قەدوبالاَت و هەڵسوکەوتی نەرم و نیانت زۆر لەو دەچێت. خۆ ئەگەر لە ئادەمیزادانی سەر ڕووی زەمینی، ئەوا لە جیاتی جاریْ سەدجار خەنی لە بابت، لە دایکە سەلاروسەنگینەکەت، لە براکانت کە پێم وایە هەمیشە بە تۆ سەربەرزن، کە کیژۆڵەیەکی جوانی وەکو تۆ دەبینن دەچیتە کۆڕی گۆرانی و هەڵپەرکیْ یەجگار دڵخۆش و شاد دەبن. هەڵبەتە لەوان بەختەوەرتر ئەو کەسەیە کە بتوانیْ دڵی تۆ بەدەست بێنیْ.دیاریەکت پێشکەش بکات مایەی ڕەزامەندی تۆ بێت و بۆ ماڵەکەی خۆیت ببات. من، چاوانی من تا ئێستا نە لە ژن و نە لە پیاو، جوانی وەکو تۆیان نەدیتووە. هەرچەند سەیرت دەکەم سەرم لە جوانیت سوڕ دەمێنیْ. لە عەمراتم جوانی وام نەدیتووە، تەنیا جارێك لە دیلوس دا شتێکی لەم جۆرەم دیتووە، خەڵفی بنە خورمایەکم بینی لە پەنا پەرستگەکەی ئەپولو ڕوا بوو، یەجگار جوان بوو، من لەگەڵْ خەڵکێکی زۆردا بۆ ئەوێندەر چووبووم، ئەمە ئەو سەفەرەم بوو، کە سەرچاوەی هەموو بەلاَو نسیبەت وکێشەکانم بوو. هەرچییەکم بەسەر هات، لەو سەفەرەوە لە چارەم نووسرا. کە ئەو خەڵفە نەمامەم بینی، ماوەیەکی زۆر لە ناخی خۆدا حەپەسام، چونکە هەرگیز خەڵفی وا جوانم لەسەر ڕووی زەویدا نەبینی بوو. جا خانمۆڵیْ، ئێستاش بە دیتنی تۆ تووشی هەمان حاڵەت بووم. زۆر دەترسم خۆم بەسەر دەستوپێتدا بدەم، لاقت ماچ بکەم، پێت ماچ بکەم. من کەسێکی گەلەك کەسەردارم. دوێنیْ دوای بیست دانە ڕۆژ، توانیم لە دەریای قووڵْ و سامناك، دەریای مەی ئاسا ڕزگاربم. بە درێژایی ئەو ماوەیە شەپۆل و زریان وگەرداوی تیژڕۆ لە دوڕگەی ئوجیجیاوە، هێناومیان، دساو دەسیان پێکردوم، و ئێستا قەدەروچارەنووس منی هەڵداوەتە سەر ئەم کەنارەو خۆشم نازانم چ مەینەتی و ئازارێکی ترم لە پێشە. چونکە پێم وایە نەگبەتی و بەدبەختی هێشتا بەرۆکی بەر نەداوم و بەو ئاسانیە لێم نابێتەوەو خواوەندان مەگەر هەر خۆیان بزانن داوی چ بەلاَو نسیبەتێکی تریان بۆ ناومەتەوە.جا خانمی بەڕێز، بەزەییەکت پێمدا بێتەوە، دوای ئەم هەموو ڕەنج و زەحمەتە، من ڕوو لە تۆ دەنەم، تۆ یەکەم کەسیت کە دەتبینم، وهیچ کەسێك لەم شارەدا ناناسم، نازانم گەورەو سەرداری ئەم مەرزو بوم و مەزراو ولاَتە کێن. تکایە ڕێگەی شارم پێنیشان بدە. ئەگەر جلە شڕێك، کراسە کۆنێك، یا پارچەیەکی شڕۆڵە شك دەبەی بمدەیە با لەبەری بکەم، بە خۆمیا بدەم، پارچەیەك لەو پارچانەی کە هاتووی بۆ ئێرەو جلەکانت تێکردووە. دوعای خێرت بۆ دەکەم. لە خواوەندان دەپاڕێمەوە، بە دڵی خۆتت لەگەڵْ بکەن. شوویەکی باش و کۆشك و سەرایەکی جوانت بە نسیب بکەن. تەبایی و یەکێتی بخەنە ناو خانەوادەکەتەوە، کە تەبایی نیعمەتێکی پڕ بەهایە! هیچ شتێك لەوە باشترو جوانتروخۆشتر نیە کە ژن و مێرد، لە ماڵەوە کۆك و تەبا، هاودڵْ و هاوبیربن، بە خۆشی وخۆشەویستی بژین. ئەم تەباییە بۆ ناحەزان

مایــەی خــەمو پەژارەیــە، بــۆ دۆســتان مایــەی شــادمانیە، و بــۆ ژن‌ومێردەکــەش ئەوپــەڕی شادومانییە.".

## نوسیکا بەزەیی بە ئودیسیوسدا دێتەوە

نوسیکای باسك سپی وەڵامی دایەوە: "ئەی غەریب! تۆ نە لە پیاو خراپو بەدکاران دەچیت، نە لـە کـەودەن‌و بێئـەقڵان. بـەخت‌و یـەغباڵ بـە دەسـتی زیوسـی ئولـەمپ نشـینە. هـەر ئـەوە بـەخت‌و یەغباڵ بەسـەر هـەموو تیرەی بەشـەردا، چ بـاش بـن وچ خـراپ، دابـەش دەکـات. کـەیفی خۆیـەتی، یەکێك بەختەوەر یەکێك بەدبەخت. دیارە ئەم یەغباڵەی بـە تـۆ داوە، هەڵبـەتـە ویسـتویەتی تـۆ بـەو ڕەنج‌و مەینەتیانە تاقی بکاتەوە، بە بەخت‌و قەدەرو چارەنووسی خۆت قاییل بـە. مل بـۆ ئیرادەی زیوس بدە! بەڵام ئێستا کە رووت کردووەتە شارەکەی ئێمـە، بـۆ وڵاتـی ئێمـە هـاتووی، وەکـو هـەر لێقەوماوێك رووی تێکردبێ‌و روومان تێ بکـات، لـە هـیچ داوایـەك، نـە لـە جل‌وبـەرگ‌و نـە لـە هـیچ پێویستییەکی تر، بێ بەش نابێت. سـەبارەت بـە شـارەکەش هـەر ئێسـتا ڕێگـەی شـارت پیێنیشـان دەدەم‌و نـاوی خەڵکەکەشـیت پێـدەڵێم. ئـەم شـارو دەڤـەرە هـی فیاسـیەکانەو، منـیش کیـژی ئالسینویوسی جوامێرم، کە سەردارو گەورەی فیاسیانە.".

نوسیکا دوای ئەو قسانە هاواری لە کارەکەرە گێسـو جوانـەکانی کـرد: "کچینە، تکاتـان لێدەکـەم بوەستن! ئـاخر بـۆ کـوێ، هـەر لەبـەر ئـەم پیـاوە دەڕەڤن؟ ئایـا پێتـان وایـە دژمنـە؟ نـەخێر، خـەڵکی فیاسی هێندە لەنك خواوەنـدان بـەڕێزو خۆشەویسـتن، کـە هـیچ زی روحێك‌و هـیچ بـەنی بەشـەرێك نەبووەو نابێ، کە بێتە وڵاتەکەیان‌ودژمنایەتیان بکات، مەرگیان بۆ بێنێ.ئێمە دوور لە خەڵکی، لە کـەناری دەریایـەکی چـڕە گێژەنگ‌وشـەپۆلاندا، لـەو پـەڕی دنیـادا، دەژیـن. کـەس پەیوەنـدی بـە ئێمەوە نیە. کەسیش نایەت شەڕ بە ئێمە بفرۆشێت‌و دژمنایەتیمان بکات. سەبارەت بەم پیاوەش کابرایەکی بەدبەخت‌و بەلەنگازە، قەدەرو چارەنووس گەیاندویەتیە ئێرە. پێویسـتە بـە هانایـەوە بچین‌و یارمەتی بدەین.چونکە ڕێبواران‌و لێقەوماوان ئازیزی زیوسن، و نابێ دەست بە روویانـەوە بنـرێ. هـەر یارمەتیـەکیان بـدەی، چـەند کـەمیش بـێ، مەمنون‌وشـوکرانە بـژێرن. کەواتـە کچینـە، تۆزێ خواردن‌و خواردنەوە بدەن بەم پیاوە غەریبەو،ئەوجا لـە روبارەکـەدا، لـە پەنایـەکی بانـەگردا پاك بیشۆن.

## ئودیسیوس بە فەرمانی نوسیکا خۆی دەشوات

دوای ئـەو قسـانەی نوسـیکا، کارەکـەرەکان لـە ڕاکـردن وەسـتان. یـەکتریان بـانگ کـردەوە. وەکـو چۆن نوسیکای کیژی ئالسینویوسی جوامێر، فەرمانی پێدابوون، ئودیسیوسیان بـردە شـوێنێکی پەناباوە، کراس‌وعەبایەکیان لـە تەنیشـتەوە دانـا، تـا دوایـی لەبـەری بکـات، لـە تونگەیـەکی زێـڕدا زەیتی زەیتونی خالیسەیان دایە، وداوایان لێکرد خۆی لە ئاوی رەوانی روبارەکـەدا بشـوات.بـەڵام ئودیسیوسی مەردورەند پێیگوتن:

"کچینە، تۆزێ لە من دوور بکەونەوە، تا بە تەنێ بمو لەشم لە رووبارەکەدا بشۆم‌و ئـەو شـۆراوەی لە شان‌و ملم نیشتووە پاك بکەمەوەو زەیتی زەیتون لە لەشم هەڵسـووم. بەڕاسـتی دەمێکـە زەیـتی

زەیتـوونم بـەر لـەش نەکـەوتووە. مـن نـاتوانم بـە بەرچـاوی ئێـوەوە خـۆم بشـۆم، شـەرم دەکـەم لـە بەرانبەر کچۆڵانی کەزیەجوانی وەکو ئێوەدا خۆم رووت بکەمەوە."

کارەکەرەکان دوورکەوتنەوە، وچوون قسەکانی ئودیسیوسیان بۆ گێڕایەوە. هەنگێ ئودیسیوسـی بەردەبار لە روبارەکەدا خۆی شت. ئەو خوێواوکەی بە پشت‌وشان‌و گەردنییـەوە نووسابوو پاك کردەوە.قژی لە کەفی دەریای نەسرەوت پاککردەوە.کە تەواو سەرولەشی شت، زەیتی زەیتونی لە خۆی داو ئەو جلانەی لەبەر کرد کە نوسیکا دابویە. هـەنگێ پاکیزەی جوان‌وسرك، ئەتینای کیـژی زیوس،کردیـە کارێك کـە جوانتروبـە نمودترو خـۆش هەیکـەل تـر بنـوێنێ‌و قژەکـەی وەکـو گـوڵی سـونبلان بـە شـان‌وملیا شـۆڕ ببێتـەوە. وەکـو چـۆن شـاگردانی لێهـاتووی بەردەسـتی هیفایسـتوس، وئەوانـەی ئـەتینا هـەموو جـۆرە هونـەرو سـنعەتێکی فێـر کردوون،وزیـوو زێڕکفـت دەکەن، زیو لە ئاوی زێڕ دەگرن‌و کارەکەیان زۆر جوان‌وشایستەو دڵگیرە، خوابانۆش بـە هـەمان شـێوە جـوانی‌و هەیبـەتێکی سـەیری بەسـەر سـەرو سـیماو شـان‌وملی ئودیسیوسـدا هەڵڕشـت. ئەوسا ئودیسیوس رۆیی، لە گۆشەیەکی کەناری روبارەکەدا رۆنیشت، یەکپارچە جوانی‌و قۆزی لێـدەباری. نوسـیکا بـە سەرسـامی سـەیری دەکـرد، رووی کـردە هـاوڕێ زوڵـف شـۆڕو کەزیـە جوانەکانی وگوتی:

"کچانی باسك سپی گوێبگرن بزانن چی دەڵێم، ئەم پیاوە ، بەبێ ویست‌و ئیرادەی خواوەندانی ئوڵەمپنشین رێی نەکەوتووەتە نێو فیاسیانی خواوەند ئاساوە. تۆزێ لەمە پێش لـە کەسـێکی رووتەی هـەژار دەچوو، کەچی ئێستا لـە خواوەندانی ئاکنجی ئاسمانی بەرین دەچێت. خۆزگە شووم بە پیاوێکی وەکو ئەمە دەکرد، ولێرە جێگیر دەبوو، ولە ولاتی ئێمە دەمایەوە.. دەی کچینە خێرا خواردن‌وخواردنەوە بەم غەریبە بدەن."

کارەکـەرەکان، یەکسـەر فەرمانەکـەیان جێبـەجێکردو خـواردن‌و خواردنـەوەیان بـۆ ئودیسـیوس دانا. ئودیسیوسـی بـەردەبار، کـە دەمـێ بـوو، تـامی زەوادی نـەکردبوو، زۆر بـە تاسـەو ئیشـتیاوە کەوتە خواردن‌وخواردنەوە.

## نوسیکا رێنوێنی ئودیسیوس دەکات

بەڵام نوسیکای باسك سپی، لەو کاتەدا بیری لە کارێکی دی دەکردەوە، جلـەکانی قـەدکردن‌و لـە گالیسـکە جوانەکـەی نـان. هێسـترە بەقوەتـەکانی لـە گالیسـکەکە بەسـت، بـە تـاقی تـەنیا سـواری گالیسـکەکە بـوو. ئەوسـا ئـاوڕی لـە ئودیسـیوس دایـەوە، سـڵاوێکی لێکـردو بـانگی کردوگـوتی: "دەی رابە غەریبۆ، تا بۆ شار برۆین،ومالّو کۆشك‌وسەراکەی بابـە زاناکـەمت پێنیشـان بـدەم. جا با ئەو مژدەیەشت بـدەمێ کە لەوێنـدەر هـەموو پیاوماقولانی فیاسـی دەبینی‌ودەناسـیت. جا من هەر چیەکت پێدەڵێم، بە گوێم بکە. لەوەش ناچێت کەسێکی بێگوێ‌و بێئـاوەز بیـت: کاتێ کـە بـە مەزراوکێڵگەکانـدا تێدەپەڕین، تۆش دەگەڵ کارەکەرەکانـدا، بـە دووی گالیسـکەو هێسـترەکاندا رێ بکەو من لە پێشەوە دەڕۆم‌و رێگەکەت پێنیشـان دەدەم. کـە دەگەینـە نزیکـی شـار، تـۆ پـێ قـورس بکـە، لـە ئێمـە دوابکـەوە، دەبینـی شورەوحەسـارێکی بـەرز دەوری شـاری داوە. رێگەیـەکی تـەنگ بەناوەنـدی بەنـدەرێکی زۆر جوانـدا دەچێتە نـاو شـار. دەبینـی کەشـتیانی جـوان راکێشـراونەتە

کەناری ڕێگاکە، هەر کەشتییەك وێستگەو گەراجی تایبەتی خۆی هەیە. ئەویٚ مەیدانی گشتی شارە. لە چەقی مەیدانەکەدا پەرستگەیەکی جوان هەیە. پەرستگەی پوسیدونە. مەیدانەکە بە بەردی گەورەو زەلام سەلبەندو سەنگفەرش کراوە. خەڵکی لەوێدا سەرگەرمی کارن کەرەستەو ئەوزارو ئەشیای کەشتیان، گوریس وکندرو بادەوان دروست دەکەن. سەوڵی ناسك وجوان دروست دەکەن. چونکە خەڵکی فیاسی شەڕڤان نین، لە بیری تیروکەوان و رمو رمبازیدا نین. بەڵکو هەمیشە لە خەمی بادەوان و سەوڵو کەشتی زۆر روختەو قوت و قایم و مکومدان کە بە شانازییەوە، دەریایانی قوڵومەنگی پێدەبڕن. جا من هەمیشە لە زمانی ئەو خەڵکە دەترسم، خۆمیان لێدەپارێزم تا لە پاشملە قسەم دوو نەخەن، بەڕاستی خەڵکێکی بیٚ مروەتن، ئامانیان نیە. ئەوەندە بەسە بودەڵەیەکی خوێری بمانبینیٚو ئیدی زاری دەکرێتەوە: "ئەم غەریبە بالاٚ بەرزوقۆزە کێیە لەگەلٚ نوسیکادا؟ نۆسیکا لە کوێی دۆزیوەتەوە؟ بێگومان شووی پێدەکات. هەڵبەتە بابایەکی ئاوارەو سەرگەردانە، لەوەیە دەریاوانێکی سەرگەردان بیٚو نوسیکا لە کەشتییەکی بێگانەی گرتبێتەوە، دیارە لە دوورەوە هاتووە، چونکە ئێمە دراوسێمان نیە.. یان لەوەیە خواوەندێك بیٚو نوسیکا نەزرو نیازێکی بۆ خواوەندان کردبێت، خواوەندێك دوعاو نزاکەی گیرا کردبیٚو ئەمەی لە ئاسمانەوە بۆ ناردبیٚ. وئیدی ئەم کیژە هەموو ژیانی بە هاوسەری ئەو دەباتە سەر. هەق وابوو بە خۆی بڕۆیشتایە بۆ ولاٚتێکی دوور وشووی بە پیاوێکی بێگانە بکردایە، رەدووی بێگانەیەك کەوتبوایە، چونکە پیاوانی ئێرە، کوڕانی فیاسی بەکەم وسووك دەزانیٚ، دەنا خانەدانترین خوازگارانی هەبوو!" ئیدی ئەو قسەو قسەلۆکانەم دوا دەخەن و ئەمەش بۆ من عەیبەیەکی گەورەیەو زۆرم پێناخۆشە. چونکە من بە خۆم بەر لە هەر کەسێك سەرزەنشتی هەرکیژێك دەکەم کە ئەو رەفتارە بکات. بە بەرچاوی ئازیزانیەوە، بە بەرچاوی دایك و باوکیەوە، بەر لە شووکردنی فەرمی پەیوەندیوەهەڵس و کەوتی دەگەلٚ پیاواندا هەبێت. جا ئەی غەریب، ئەگەر دەتەویٚ بابم یارمەتیت بدات و زەلام و رێنوێنت بەگەلٚ بخات تا بە زووترین کات بۆ ولاٚتی خۆت بگەڕێیتەوە، ئەوا گویٚ لە من بگرەو چیت پێدەڵێم ئەوە بکە، لە کەناری رێگاکەدا تووشی بێشەی ئەتینا دەبیت. بێشەیەکی جوانی پڕ لە سپیدارە، کانی و سەرچاوەیەکی رەوانی تیایە، هەرچوار دەوری مێرگوزارە. باخ و رەزێکی خۆشی پڕ بەری لێیە ئەوە هی باوکمە. لە شارەوە دوور نیە. کەسێك لەوێوە هاواربکات بە ئاسانی دەنگی دەگاتە شار. یانی لە بانگڕەسی شاردایە. بۆ خۆت لەوێندەر دانیشە، و تا بە مەزەندە ئێمە دەگەینەوە ناو شارو دەچینەوە مالٚ. کە هەستت کرد ئێمە گەییشتوینەتەوە مالٚ، هەنگیٚ هەستەو بەرەو شاری فیاسیان نشێو ببەوەو لە کۆشك و تەلارەکەی بابم، ئالسینویوسی جوامێر بپرسە. دۆزینەوەی زۆر ئاسانە. لە هەر منداڵێك بپرسیت پێت نیشان دەدات. چونکە لەسەرانسەری شاردا کۆشکی لەوە جوانتروگەورەتر نیە. هەرکە لە دەروازەکانی دەرەوە وەژوورکەوتی، دەستەڕاست بگرەو خێرا هۆڵە گەورەکە ببڕە تا دەگەیتە دایکم. لە نزیکی کوانووەکەوە لەبەر تیشکی ئاگرەکە دانیشتووە، پشتی بە پایەیەکەوە داوەو کارەکەرەکانی لە پشتییەوە ریزبوون، وگلۆڵە خوریەکی ئەرخەوانی یەجگار جوانی لە بەردەستدایەو خەریکە بە تەشی دەیرێسێت. هەر لە نزیکی ئەو

شـوێنەدا كورسـيەك دانـراوە كـە بـابم، لـە كـاتی بـادە خواردنـەوەدا، خواوەنـد ئاسـا لەسـەر دادەنیشێت. یەكسەر بە بەر كورسیەكەی بابمدا تێپەڕە، خۆت بگەیەنە دایكم، ئەگەر دەتەوێ بە خۆشیو زوو بە زوو بگەیتەوە ولاتی خۆت، با زۆریش دوور كەوتبیتەوە، ئەوا دەست بخە سەر ئـەژنۆی، ئـەژنۆی مـاچ بكـە. ئەگـەر بتـوانی دڵـی نـەرم بكـەی، سـۆزی ببـزوێنی، بـەلای خۆتیـا راكێشـیت، هـەنگێ ئومێدت بـە گەڕانـەوە هـەبێ. ئومێدت بـەوە هـەبێ كـە ئـازیزانو كەسـوكارت ببینییەوە، بگەڕێیتەوە ناو كۆشكوسەرا مكومەكەتو بچیتەوە باوەشی ولاتی خۆت.

## ئۆدیسیوس نوێژ بۆ ئەتینا دەكات

نوسیكا دوای ئـەو قسـانە، قامچییەكی بـە پشـتی هێسـترەكاندا كێشـا. هێسـترەكان خێـرا بـۆی دەرچوونو روبارەكەیان بە جێهێشت. هێستری چاكو رەهـوان بـوون، خێـرا دەڕۆیشـتن، نوسیكا جڵـەوی راكێشـان تـا كارەكـەرەكانو ئۆدیسـیوس كـە بـە دوایـەوە بـوون، مانـدوو نـەبنو بتـوانن بیگەنێ. قامچییەكەی بـە هێواشی دەوەشـاند. دەگـەڵ خۆرئـاوادا گەییشـتنە بێشـە موبارەكەكـەی ئەتینا. ئۆدیسیوسی ناودار لەوێندەر لایدا. یەكسەر كەوتە پاڕانەوە لە كیژەكەی زیویسـی مـەزن: "ئـەی كیـژی زیوسـی پۆلاسـپەر، گـوێم لێبگـرە، لێـت دەپاڕێمـەوە، دوعـاونزام گیرابكـە، ئـاواتو خۆزیام بێنە دی. بەلای كەمەوە ئێستا دوعام گیرابكە. چونكە ئەوسا كـە گرفتـاری پشـموغەزەبی پوسـیدونی نـاودار، هەژێنـەری زەوی بـووم، بـە هـیچ جـۆرێ گوێـت بـە بانگو هـاوارم نـەدا، بـەلای كەمەوە ئەوەم لەگەڵدا بكە كە خەڵكی فیاسی دۆستانە پێشوازیم بكەنو دڵیان پێم بسووتێ."

ئۆدیسـیوس، بـەو جـۆرە نوێـژی بـۆ پـالاس ئـەتینا كـرد. لەبـەری پاڕایـەوە. ئـەتینا گـوێی لـە نـزاو نوێژەكەی بوو لێی قەبوڵ كرد. بەڵام بە زەقی خۆی نیشان نەدا. دەترسا پوسیدونی مامی كە زۆر لە ئۆدیسیوسی خواوەند ئاسا پڕبوو، تـوڕە بێـتو نەیـەڵێت بـە سـەلامەتیو بـە ئاسـانی بگاتـەوە ولاتی بابوباپیرانی خۆی.

**<u>پەراوێز:</u>**

*- فیاسـی: گـەلێكی ئەفسـانەییە، ئـاكنجی دورگـەی سـخیریان، كـە سـكلوپەكان راویـان نـان، لـە هیپیریـاوە بـۆ فیاسـی كۆچیان كـرد. گـەلێكی ئاشـتیخوازو بێـوەی بـوون، خـاوەنی خێـرو چاكەن، دوور لـە شـەڕو جـەنگ بـە خۆشـی وشـادی دەژیـن. ئـەم گەلـە خۆشـەویستی خواوەندان بـوون، بـە دەریـاوانیو كەشـتیڕانی بـەناوبانگ بـوون. كەشـتیەكانیان وەكـو باڵـدار دەریایـان دەبـڕیو بـەبێ كەشـتیوان دەگەییشـتنە مـەنزڵو شـوێنی مەبەسـت. كـە دەریاوانـان، لـە دەریـادا لێیـان قـەومابا هاواریان بۆ ئەوان دەبرد. ئالسینویوسی پاشایان زۆر دۆستانەو پیاوانە پێشوازی ئۆدیسیوسی كـرد. هـەروەها ئـارتیتی هاوسـەریو نوسـیكای كچیشـی بـە گـەرمی پێشـوازیان كـرد. كـە باسـی واریقاتو سەربهوردی خۆی بۆ گێڕانەوە، كەشتییەكیان دایە كە بە سەلامەتی گەیاندیەوە ئیتاك.

*- ناوسـیتوس: كـوڕی پوسـیدونە. ئەمـە پاشـای فیاسـیەكانە كـە لـە هوپیریـاوە بـۆ سـخیریا پێشڕەوی كردن. باوكی ئالسینویوس بوو.

*- نوسیکا: کیژێکی جوانی ئالسینویوسی پاشای فیاسیانە. یەکەم کەس بوو کە ئودیسیوسی، دوای ئەوەی کەڵەکەکەی داغان بوو، لە کەنارەکانی فیاسی دا بینی. دەگەڵ کارەکەرەکانیا چوو بوو بۆ گوێی روبار، بۆ کوڵوکانی و جل شۆردن، سەرگەرمی گۆرانی و رەقسین و تۆپ تۆپێن بوو دەگەڵ کارەکەرەکانیا کە لە پڕ ئودیسیوسیان لە بێشەیەکەوە لێ بەدیار کەوت. هەر هەموو پەشۆکان و هەڵاتن تەنیا نوسیکا نەبێ کە گوێی لە پاڕانەوەو کۆمەکخوازی ئودیسیوس بوو. کارەکەرەکانی بانگ کردەوەو فەرمانی دانێ کە نان و ئاوو خواردن و خواردنەوەو جل و بەرگی بدەنێ. ئەوجا بۆ شاری بردەوەو تەگبیری بۆ کرد کە بە خۆی بچێت بۆ کۆشکەکەی بابی. چونکە ماقول نیە کیژە عازەبێکی وەکو ئەو پیاوێکی غەریب و بێگانە دەگەڵ خۆیدا بۆ ماڵ بەرێتەوە.

*- دوماس: پاشای فروجیایە، بابی ئەسیوس و هیکوپایە.

*- لیتو: دایکی ئەپولو وئارتەمیسە لە زیوس.

## سروودی حەوتەم

### کورتەی سروودەکە:

پاش ئەوەی نوسیکا دەگاتەوە کۆشك‌وسەراکەی خۆیان، (ئودیسیوس)ش دەگەڵ ئەتینا‌داو لە ژێر پەڵە هەورێکدا، تا کەس نەی بینێ، دەگاتە شار. واقیعی شارەکە بەگشتی وکۆشك‌و باخەکانی ئالسینویوسی زۆر بەدڵ دەبێت. میرانی فیاسیان دەبینێ کە لە کۆشەکەکەدا کۆڕو کۆبوونەوەیان سازداوە. بە دیتنی ئەو واقیان وڕدەمێنێ. لێ هیچ ناڵێن، ئالسینویوس لەسەر پێشنیازی ئیخینیوس-ی پیر، پێشوازی دەکات‌وبەڵێنی دەداتێ کە بۆ وڵاتەکەی خۆی دەنێرێتەوە. کە میوانەکان دەڕۆن، ئاریتی شابانۆ لە کابرای بێگانەو غەوارە دەپرسێت کە چۆنە ئەم جلکانەی لەبەرە. ئودیسیوس راستی مەسەلەکەی پێدەڵێت‌و ئیدی سەربهوردو هەموو واریقات‌و سەربوردەو مەینەتیەکانی خۆی لە رۆژی دەرچوونییەوە لە ئوجیجی، دەگێڕێتەوە. دوای ئەم چیرۆك‌و بەسەرهاتە، ئالسینویوس دووبارە دڵنیای دەکاتەوە کە خەڵکی فیاسی بۆ وڵاتی خۆی دەبەنەوە.

***

### نوسیکا دەگاتەوە ماڵێ

لەو کاتەدا، کە ئودیسیوسی ناودار، کە رەنج‌ومەینەتی‌و ئەزموونێکی فرەو تاڵی دیتبوو، بەدەم چاوەڕوانیەوە، توێژو نزای دەکرد، جووتە هێستری بە قوەت کیژۆڵەی جەوانیان بەرەو شار دەبرد. کە گەییشتە کۆشکە شکۆدارەکەی بابی، بەپەلە لەبەر دەروازەی کۆشکەکەدا رایگرتن. براکانی کە لە تۆ وایە خواوەندن، لە دەوری خڕ بوونەوە. قاترەکانیان لە گالیسکەکە کردەوە. جلەکانیان بردە ژوورەوە. نوسیکا بۆ ژوورەکەی خۆی رۆیی. یورومیدوسای کلفەتی، ئاگری بۆ کردەوە. یورمیدوسا، پیرەژنێکی ئاپایری بوو، کەشتیرانانی فیاسی کاتی خۆی لە وڵاتی ئاپایرییەوە هێنابوویان، و وەکو دیاری‌ودەستکەوتی شەرەف‌و تایبەتی بۆ خزمەتی ئالسینویوس-یان دانا بوو، چونکە ئالسینویوس پاشاو گەورەی هەموو فیاسیان بوو، و جەماوەری خەڵك وەکو خواوەندێك رێزیان دەگرت‌و لە ئەمرۆ ڕایدابوون. ئەو لەو کۆشکەدا

نوسیکای باسك سپی شیر دابوو وبەخێوی  کردبوو. لە ژوورەکەی خۆیا ئاگری بۆ کردبووەوەو شیوی بۆ ئامادە دەکرد.

## ئودیسیوس لە نێو هەورا

ڕێك لەو کاتەدا ئودیسیوس هەستا کە بۆ شار بڕوات. ئەتینا لە رووی دڵسۆزییەوە،و لە ترسی ئەوەی نەبادا فیاسیەکی کەللە شەق و نەزان بیدینیٚ و قسەیەکی ناشیرینی پێبڵیٚ، یان گاڵتەی پیٚ بکات و یان لە ناوی بپرسێت، چڕە مژوهەورێکی توندی لە دەور هاڵاند. لەو کاتەدا کە خەریك بوو دەگەییە ناو شاری جوان وغوربەتڕەوێن وغەریبدۆست، ئەتینا، خواوەندی چاوگەش، لە شێوەو هەیئەتی کیژۆڵەیەکی گۆزە بەشان لەبەردەمیا قوت بووەوە، ئودیسیوسی نیودار لێی پرسی:

"فرزەندم، بێزەحمەت دەتوانی ماڵی ئالسینویوس-م پێنیشان بدەی، کە دەڵێن سەردارو پاشای ئەم خەڵکەی ئێرەیە؟ من بابایەکی غەوارەوغەریبم، هەزارو یەك نەگبەتی و بەدبەختیم بەسەر هاتووە، لە ڕێگایەکی زۆر دوورەوە هاتووم.تاحەزبکەی شەکەت وکەنەفت و ماندووم. بۆیە هیچ کەسێکی ئەم خەڵك و شارە ناناسم."

هەنگیٚ خوابانۆ، ئەتینای چاوگەش وەڵامی دایەوە: "بەڵیٚ، بابی غەریب، من ئەو ماڵەت پیٚ نیشان دەدەم کە دەتەویٚ. زۆر لە ماڵی بابی سەربەرزی منەوە نزیکە. من پێشت دەکەوم، تۆش ڕێك بە دووی مندا وەرە. بەڵام نە ئاوڕ لە کەس بدەوە، نە پرسیاریش لە کەس بکە. چونکە خەڵکی ئێرە حەز لە غەریبان ناکەن، پێشوازی کەسێك ناکەن لە وڵاتێکی ترەوە هاتبیٚ. ئەمانە خەڵکێکی دەریاوانن، شانازی بەوەوە دەکەن کە بە کەشتییە تیژڕۆکانیان گەرداوانی گەورە دەبڕن: ئیدی هەژێنەری زەوی پوسیدون ئەو بەهرەیەی داونەتیٚ. کەشتیەکانیان هێندە تیژڕۆن، لە تۆ وایە باڵدارن، یان بیرۆکەیەکن و لە پڕ بە مێشك وخەیاڵدا دێن و دەڕۆن."

پالاس ئەتینا،دوای ئەو قسانە بەپەلە کەوتە ریٚ، ئودیسیوس هەنگاو بە هەنگاو دووی کەوت. لە کاتێکا ئودیسیوس بە ناوجەرگەی شاردا دەڕۆیی، هیچ یەکێك لە قارەمانانی فیاسی کە بە کەشتیڕانی و دەریاوانی بەناوبانگن، نەیان بینی. چونکە ئەتینای کەزی شۆڕ، خوابانۆی جوان، لە چڕە مژوهەورێکی ئەوتۆی گرتبوو کە کەس نەیدەبینی. چونکە لە ناخی دڵەوە هاوسۆزی دەگەڵ دەکرد. ئودیسیوس، نەیدەزانی سەیری چی بکات، بەندەری گەورە، کەشتیانی روختەو جوان، مەیدانی خڕبوونەوەی قارەمانان، دیوارو شورەی بەرزو درێژ، پەرژینی سەیری سەر دیواران، نەیدەزانی سەیری چی بکات. کە گەییشتنە کۆشکە بەنێو بانگەکەی پاشا، ئەتینا، خوابانۆی چاو جوان، پێیگوت:

"ئەزبەنی، ئەمە ئەو ماڵەیە کە بۆی دەگەڕایت. کە وەژوور دەکەوی، دەبینی کۆمەڵێك پاشاو پیاو ماقول، لە نەسل و نەوەی زیوس، لە دەوری خوانێك دانیشتوون و نان دەخۆن، بەڵام تۆ وەژوور بکەوە، سڵ مەکەوە، چونکە هەر پیاوی ئازاو نەترس، با غەریب وغەوارەش بیٚ، گرەو دەباتەوەو بە ئامانجی خۆی دەگات... هەوەڵجار بڕۆ شابانۆ لە تەلارە گەورەکەدا بدۆزەوە. نێوی ئاریتییە، لە هەمان رەسەن و خانەدانی مێردەکەی ،شا ئالسینویوسە. و هەردووکیان لە نەسل و نەوەی

پۆسیدونی زەوی هەژێنن. پوسیدون بابی نوسیتوسە لە پیریبویا. ئەم پیریبویایە ئافرەتێکی یەجگار خشیك و بچووکترین کیژی یوروميدون بوو. یورمیدونی جوامێر، کاتی خۆی پاشای خەڵکانێکی دێوئاسای هێڕو گوێ نەبیست و خوانەناس بوو. بووە مایەی تیاچوونی قەومە خوانەناسەکەی و بە خۆیشی تیاچوو. جا پوسیدون دەگەڵ پیریبویادا جووت بوو، وکوڕێکی لێی بوو، بە نێوی نوسیتوس، کە حوکمڕانی فیاسیەکانی دەکرد. نوسیتوس، دوو کوڕی لێکەوتەوە بەناوانی ریکسینورو ئالسینویوس. ئەپولۆی زیوین کەوان، ریکسینوری، کە هێشتا تازە زاوا بوو، کوشت. ریکسینور، کوڕی نەبوو، تاقە کیژێکی لە پاش بەجێما، ئەویش ئاریتی بوو. ئالسینویوس، ئاریتی خواست، ئیدی زۆری حورمەت و ڕێزی ئاریتی دەگرت. هیچ ئافرەتێکی سەر رووی زەوی هێندەی ئەو ڕێزوحورمەت نەدەگیرا، ئیدی گەورەو سەرفراز، مایەی ڕێزو حورمەتی، منداڵەکانی و ئالسینویوسی مێردیشی بوو. ئێستاش هەمان حورمەت و پایەی هەیە. کە بۆ ناو شار دەڕوات، خەڵکەکە وەکو خوابانۆیەك تەماشای دەکەن، لەبەری هەڵدەستن، سلاوی لێدەکەن. هەموو ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە ئەم ژنە، ژنێکی بە ئاوەزومیهرەبان و خەمخۆرە، کێشەی خەڵکی، بەتایبەتی کێشەی نێوان ژنان ومێردان بە ئاقڵی چارەسەر دەکات. جا ئەگەر بتوانی دڵی ئەو نەرم بکەیت و بچیتە دڵییەوە، ئەوا زۆر نزیکە جارێکی دی کەسوکارو دۆست و ئاشنایانت بدینیتەوە، بچیتەوە کۆشك و تەلارە بەرزەکەت، بگەڕێیتەوە مەفتەن و زێدی خۆت."

## ئۆدیسیوس لەبەر کۆشکە بەرزەکەی پاشادا

ئەتینا، خوابانۆی چاوگەش، دوای ئەو قسانە بە دەریای نەسرەوتی پڕ گێژەنگدا بەڕێکەوت. سخیریای میهرپەروەری بەجێهێشت و چوو بۆ ماراتون و بە نێو شەقامە پانەکانی شاری ئەتینا کەوت و خۆی بە ماڵە مکومەکەی ئێریختیوسدا کرد. لەم کاتەدا ئودیسیوس بەرەو کۆشکە بەرزەکەی ئالسینویوس ڕۆیی.. بەر لەوەی بگاتە ئاستانەی بڕونزی کۆشکەکە، هەڵوەستەیەکی کرد. سەری سوڕما بوو، نەیدەزانی سەیری چی بکات. تیشکێکی وەکو تیشکی خۆرو تریفەی مانگ لە کۆشکە بەرزەکەی ئالسینویوسی جوامێرەوە پرشنگی دەدا. ئەو دیوارانەی ئەم بەرو ئەوبەری ئاستانەکە لە برونز بوون ولای سەرەوەیان بە مینایەکی شینباو میناکاری کرابوون. دەرگاکان لە زێڕ بوون و بەلاشیپانەی زیوەوە قایم کرابوون. هەروەها چوارچێوەی پەنجەرەکان لە زیو بوون. دەسك و کێلۆنی پەنجەرەو دەرگاکان لە زێڕو زیو بوون. هیفایستوس، بە شێوەیەکی زۆر هونەرمەندانە جووتێ سەگی لە زێڕو زیو دروست کردبوو، تا پاسی کۆشکەکەی ئالسینویوسی جوامێر بکەن. ئەم سەگانە نەمر بوون، بە درێژایی تەمەنیان پیر نەدەبوون. بەڵام لە ژوورەوە، لەبەر دەرگاوە تا ئەوسەری هۆڵەکەی ژوورەوە، کورسی بە پاڵی دیوارەکەوە ریزکرابوون، پەردەی زۆر ناسکی دەسکردی ژنانی بەسەردا درابوو. سەرانی خەڵکی فیاسی لە کاتی خواردن و خواردنەوەدا لەسەر ئەو کورسیانە دادەنیشتن و ئەم کۆڕانە بە زۆری دووبارە دەبوونەوە. چەندین پەیکەری زێڕ، مەشخەڵ بەدەست، لە هۆڵەکەدا، لەسەر پایەی مکوم دانرا بوون، تا شەوانە هۆڵەکە بۆ میوانان روناك بکەنەوە. پەنجا دانە کەنیزو کارەکەرو قەرەواش و کلفەت لە کۆشکەکەدا بوون. هەندێکیان گەنمەشامییان بە دەستاڕ دەهاڕی. هەندێکیان خەریکی

چـنینی و رسـتن بـوون و تەشـێکانی دەسـتیان کـە دەسـووڕانەوە لـە گـەڵای سـورەبی دەچـوون. پارچـەکانیان هێنـدە سفت بـوو کـە زەیـتی زەیتـوونی دانـەدەدا. وەکـو چۆن پیـاوانی فیاسـی لـە کەشـتیرانی و دەریاوانیـدا زۆر مەعلان وبـەنێوبانگ بـوون، بـەو ئاوایـە ژنەکانیشـیان لـە چـنین و رستنکاریدا مەعلان و بەناوبانگ بوون، وسەرتۆپی هەموو ژنان بوون، چونکە ئـەتینا هـەموو جۆرە هونەرێکی دەستی فێرکردبوون و دڵی پڕ لە میهرو سۆزکردبوون. لە دەرێی کۆشکەکەو لـە نزیکـی دەروازەکەدا باخێکی گەورە هـەبوو کـە رووبەرەکـەی چل دۆنم دەبـوو، شـورەیەکی بە چـوار دەورا کێشـرابوو، پـڕ بـوو لـە دارو درەخـتی بـەرداری گـەورەو زەلام: داری هـەرمێ، هـەنار، سـێوی بەلـەزەت و ئیشـتیا بـزوێن، هـەنجیری شـیرینی موتوربـەکراو، زەیتـونی زۆر رەسـەن و چـاك. بـەرو میـوەی ئـەم دارو درەختانـە، هـەرگیز نـە بـە زسـتان و نـە بـە هـاوین نەدەبڕایـەوەو، سەرانسـەری ساڵەکە بەریان دەدا. ئاوو هەواکەی خۆش بوو، بەری کۆن و تازە یەکیان دەگرتەوە. ئیدی هـەرمێ لە دوای هەرمێ، سێو لە دوای سێو، تـرێ لـە دوای تـرێ، وهـەنجیر لـە دوای هـەنجیر دەهاتـە بـەرو دەگـەیی. تـۆزێ لـەولاترەوە رەزێکـی یـەجگار پـڕ بـەرو چاك هـەبوو. بەشێکیان بۆ مشـتاخ نانـەوە تەرخان کردبـوو ولەوێنـدەر ترێیـان لەبـەر هـەتاو هیشـك دەکـردەوەو دەبـوو بـە مێـوژ، لـە بەشـێکی تـردا پیـاوان ترێـی گـەییویان دەڕنـی و لـە کوپەڵـەی شـەرابان دەکـران، بـەپێوە دەچـوونە سـەری و دەیانشـێلاو دەیانگوشـی. لـە هـەوەڵی رەزەکـەوە، چـەند بنـە مێوێـك هـەبوون بـە بـار بەرسـیلەیان گرتبوو،وهەندێکی دی تازە ئاڵ و بۆڵ بوو بوون. لەولاترەوە، لە دوا ریـزدا، لـە کـەناری باخـەکەدا، چـەندین دێـراوی گـوڵی هەمـە جـۆر هـەبوون، کـە بـە درێـژایی سـاڵ و هەمیشـە گوڵیـان دەداو نەدەوەرین. دوو سەرچاوە لـە باخـەکەدا هـەبوون، یـەکێکیان بـە سەرانسـەری باخـەکەدا دەڕۆیـی و دارو درەختـەکانی ئـاو دەدا. دووەمیـان کارێزئاسـا بـە ژێـر زەویـدا، لـە ئاسـتانەی دەرگـای کۆشـکەکەوە دەچـووە ژوورەوەو خـەڵکی شـار دەهـاتن لـەوێ ئاویـان دەبـرد. ئەمـە ئـەو دیـاری و نیعمەتانە بوو کە خواوەندان بە کۆشك وسەراکەی ئالسینویوسیان بەخشی بوو.

ئودیسیوسـی بـەردەبار، کـە ئـەزموونێکی تـاڵی گوزەرانـد بـوو، لەوێنـدەر وەسـتا، بـەواقی وڕەوە دەیڕوانییە ئەم بەهەشتە سەیرە. بەڵام کە تێر روانی و تەمەشای کرد، بە هەشتاو لـە ئاستانەی دەرگـاوە خـۆی بـەنێو کۆشـکەکەدا کـرد. بـینی سەران وشـیرەتکارانی فیاسـی، بـە یـادی ئەرجایفونتیس–ی چاوتیژ نۆشخواری بادەپرژێنی دەکـەن، وعادەتیـان وابـوو دوا پێك بـە یـادی ئەو هەڵبدەن و ئەوسا بڕۆن بخەون.

## ئودیسیوس لە هاوسەرەکەی ئالسینویوس دەپاڕێتەوە

ئودیسیوسـی ناودارو رەنجدیدە، بە هەمان مژوهـەورەوە کە ئەتینا تێوەی ئالاند بـوو، خـۆی بـە هۆڵەکـەدا کـرد، نەوەسـتایەوە تـا گەییشـتە بـەردەم ئـاریتی و ئالسـینویوس شـا. خێـرا دەسـتەو دامێنی ئاریتی بوو. دەستەکانی خستنە سەر ئەژنۆی، یەکسەر مژوهەورەکـەی دەوری رەوییـەوە. دەرکـەوت و کەوتـە بەرچـاوان، هـەموو ئەوانـەی لەوێنـدەر بوون،کـە چـاویان بـەو پیـاوە کـەوت، حەپەسان، زمانیان بەسترا، ورتەیان لێوە نەهات. بەڵام ئودیسیوس خێرا کەوتە پاڕانەوە:

"ئەی ئاریتی، ئەی کیژی ریکسینوری خواوەند ئاسا، من بابایەکی لێقەوماوم، دەردوتالاوێکی زۆرم چەشتووە، ئێستا هانام بۆ مێردەکەت هێناوە، دەستەو دامێنی تۆ کەوتووم، هانام بۆ میوانەکانت هێناوە. لە خودام داوایە هەر هەموویان لە ژیاندا بەختەوەربکات، هیوادارم کە سەروەت و سامان و سەربەرزی بۆ منداڵەکانیان بەجێبێڵن. تکات لێدەکەم، لێت دەپاڕێمەوە، بە پەلە بۆ وڵاتی خۆمم رەوان بکەرەوە، زۆر لە مێژە، دوور لە خزم‌وخوێش، دوور لە کەس‌وکار، لە بەڵاو مەینەتیدام."

## ئیخینوس خێرهاتنی ئودیسیوس دەکات

ئودیسیوس،دوای ئەو قسانە، لە نزیکی ئاگردانەکەوە، بەرانبەر ئاگرەکەو، لەسەر خۆڵەکەوەکە دانیشت. هەموو لە جێی خۆ حەپەسان. دوای ماوەیەکی زۆر، ئیخینوسی قارەمانی پیر هاتە قسان. ئیخینوس لە هەموو فیاسیەکان بە تەمەنتر بوو، لە هەموویان قسەزانترو تەڕزمانتر بوو،و لە بۆتەی رۆژگاردا قاڵ بووبووەوە. هەستاو بە نیازو نیەتێکی پاك، رووی کردە مەجلیسەکەو گوتی:

"ئەی ئالسینویوس، لە تۆ ناوەشێتەوە، میوان بێت و لە عاردی و لە نزیکی ئاگردانەکەتاو لە نێو مشکی دابنیشێت. ئەم خەڵکە بۆیە خامۆش‌وبێدەنگن، چاوەڕوانی قسەی تۆ دەکەن. بە هەرحاڵ پێی بڵێ با هەستێت و لەسەر کورسیەکی زیونیشان دانیشێت. فەرمان بە دەستوپێوەندان بدە با شەراب ئامادە بکەن، وبە یادی زیوسی بروسکەوان بخۆینەوە. فەرمانی زیوسەو لەسەرمانە رێزو حورمەتی غەریبان بگرین. ئەمر بکە کە خوانسالار شیڤ بۆ میوانەکەمان ئامادە بکات."

## رێوڕەسمی خێرهانینی ئودیسیوس

کە ئالسینوسی دلاوەر گوێی لەو قسانە بوو، هەستا دەستی ئودیسیوسی دووربین و بەردەباری گرت و لە پاڵ ئاگردانەکەی هەستاندو لەسەر کورسیەکەی جوانی پرشنگداری دانیشاند، ئەمری بە (لاداماس)ی کوڕیکرد، کە زۆری خۆشدەویست، لەسەر کورسیەکە هەستێ و میوانەکە لە جێی ئەو دانیشێت. پاشان کارەکەرێك بە تونگەیەکی زێڕی تەژی ئاوەوەهات تا دەستی بشوات، ئاوەکەی لە دەست شۆرێکی زیوکرد، ئەوسا مێزێکی خاوێنی گەورەی لە بەردەمیا دانا. ئەوجا کەیبانۆی ماڵ هات. نانی لە بەردەم دانا،وخواردنێکی زۆرو هەمە جۆرو بەلەزەتی بۆ دانا. هەنگێ ئودیسیوسی بەردەبارومەینەتدیدە، دەستی بە خواردن‌وخواردنەوە کرد.

پاشان ئالسینویوسی ناودار بە یەکێك لە خزمەتچیەکانی گوت:

"پونتونوس، بادە تێبکەو بەسەر هەموو ئامادەبووانیا بگێڕە. با هەمووما بە یادی زیوسی بروسکەوان بخۆینەوە، چونکە هەر خۆی دەلیلی داماوانە، وغەریب و لێقەوماوان ئازیزی ئەون،و لەسەرمانە رێزوحورمەتیان بگرین."

کە ئالسینویوس لە قسەکانی بووەوە، پونتونوس، شەرابێکی هێنا، رێك بۆنی هەنگوینی لێدەهات. لە پێشا بۆ تەبەڕوك چەند دڵۆپێکی رشتە ناو پەرداخان، پاش ئەوەی رەسم‌وعادەتی بادە پرژێنیان ئەنجام دا، بە کەیفی دڵی خۆیان ملیان بە خواردنەوەوە نا، کە هەموو تێرو پڕیان خواردەوە، ئالسینویوس رووی کردە کۆڕی بادەنۆشان و گوتی:

"ئەی فەرماندەو شیرەتکارانی فیاسی، گوێبگرن، با قسەی دڵی خۆمتان بۆ بکەم. ئێستا کە لە کۆڕی بەزم‌ونۆشخواری بوونەتەوە، بڕۆنەوە بۆ ماڵی خۆتان‌و ئیسراحەتی خۆ بکەن.. سبەینێ ژمارەیەکی زیاتر لە پیران‌وپیاوماقولانی قەوم بۆ کۆبوونەوە بانگ دەکەین، لە هۆڵێکی گەورەدا پێشوازی میوانەکەمان دەکەین. قوربانی گەورەو بە شکۆ بۆ خواوەندان دەکەین. پاشان بیر دەکەینەوە کە چۆن بۆ مەفتەن‌و وڵاتی خۆیی بنێرینەوە. تا بتوانێ بە یارمەتی ئێمە، بێ هیچ کۆسپ‌و تەگەرەیەك، بێ هیچ گێچەڵ‌و سەریەشەیەك، بەپەلەو بەخۆشی بگاتەوە خاکی نیشتمانی خۆی، ئیدی وڵاتەکەی چەندیش دوور بێ، گرینگ ئەوەیە بە درێژایی ئەم سەفەرە، بەر لەوەی بگاتەوە خاکی نیشتمانی خۆی، تووشی هیچ ئاسیویێك نەبێت‌و هیچ کۆسپ‌و تەگەرەیەکی نەیەتە ڕێگا. کە گەیشتەوە وڵاتی خۆی، ئیدی خۆی‌و بەختی، وەکو هەموو خەڵکی. چارەنووس‌و تەشی ڕێسانی ترسناك، لە ڕۆژی لە دایك بوونیەوە، لەو ڕۆژەوە کە کەوتووەتە سکی دایکییەوە، هەرچیەکیان بۆ ڕست بێ، و لەسەر تەشییەکەیان هەڵکردبێ،هەر ئەوەی بەسەر دێت‌و دێتە ڕێ. خۆ ئەگەر ئەم غەریبە، خواوەندێك بێت‌و لە ئاسمانەوە هاتبێتە خوارێ، ئەمەیان شتێکی تازەیە، چونکە خواوەندان، جاران هەر کاتێ قوربانی گەورەو فرەمان پێشکەش دەکردن، بە ئاشکرا دەهاتنە دەعوەتمان، بەشداری کۆڕو مەجلیسی بەزمیان دەکردین، لە ناو ئێمەو لەگەڵ ئێمەدا دادەنیشتن، تەنانەت ئەگەر بە ڕێبوارییش تووشی یەکێك لە ئێمەمانان بوایەن، خۆیان لێنەدەشاردینەوە، چونکە یەجگار لێیانەوە نزیکین، وەکو نزیکی سیکلوپان لە دێوانی دڕندەو هۆڤی.

## ئودیسیوس دەردەسەرییەکانی خۆی دەگێڕێتەوە

ئەوسا ئودیسیوسی دووربین‌وبەردەبار هەڵیدایەو گوتی: "ئەی ئالسینویوس، ئەم بیرە لە مێشکی خۆت دەربکە. من نە لە بەژن‌و باڵادا، نە لە هۆش‌و بیرو ڕەفتاردا لە نەمرانی ئاسمان نشین ناچم، من وەکو هەر ئادەمیزادێکی سادەوئاساییم، کێ لەم دنیایەدا زۆر نەگبەت و بەدبەخت‌و چارەرەشە،ئەگەر من هەموو ئەو مەینەتی‌و بەڵایانەی کە بە خواستی خواوەندان بەسەرم هاتوون، بگێڕمەوە، هەنگێ تێدەگەن کە لە چاو مندا هیچی بەسەر نەهاتووەو زۆر لە من باشترە. بە هەرحاڵ، با نانێ بخۆم، ورگ حەقی بەسەر خەم‌وخەفەتی تۆوە نیە، شتێکی حەیا بەرەیە، هەرکە برسی بوو دەیکا بەهاوار، لە قاوت دەداو ناچاری مشوری بخۆی. جا من سەرباری ئەوەی گەلێك کەسەردارم، ناچارم خەم‌وخەفەتی خۆ لەبیربکەم،وبە فەرمانی ورگم بکەم‌و تێر بەسکی خۆم نان بخۆم. سەبارەت بە ئێوەش، بەڵکو سبەینێ زوو، تەگبیرێکی گەڕانەوەی منی نەگبەت‌وبەدبەخت دەکەن، ودوای ئەو هەموو دەردومەینەتیەی بەسەرم هاتووە، دەگەمەوە خاکی نیشتمانی خۆم. هەر تاقە یەکجاری دی موڵك‌وماڵەکەم، کەسوکارەکەم، خوڵام‌و نۆکەرەکانم، کۆشك‌و تەلارە بەرزەکەم بدینمەوە، ئیدی مردن هەقە، بابێ، بەخێربێ."

## گفتوگۆی شابانۆ دەگەڵ ئودیسیوسدا

کە لە قسەکانی بووەوە، هەموو هەر ستایشی قسەکانیان کرد،ورازی بوون لەسەر ئەوەی ئەو پیاوە غەریب‌و غەوارەیە بەڕێبکەنەوە، چونکە قسەکانی ئاقڵانەو بە نەزاکەت بوون. دوای بادە

پـرژێنی، تێـرو پڕیـان خـواردەوە، خـەو زۆری بـۆ هێنـان، هەسـتانو هەرکەسـە بـۆ مـاڵی خـۆی ڕۆییشتەوە. ئودیسیوسـی جـوامێر بـە تـەنێ دەگـەڵ شـا ئالسینویوسـی خواوەنـد ئاسـاو ئـاریتی هاوسـەریدا، مایـەوە. کارەکـەرو کەنیزەکـەکان خـەریك بـوون، خـوانو سـفرەکانیان پـاكو کـۆ دەکردەوە. یەکەم کەس کە هاتە قسان، ئاریتی باسك سپی بوو. هەرکە چاوی بە ئودیسیوس کەوت، جلو بەرگە جوانەکەی بەری ناسیەوە، هەمان ئەو جلو بەرگانە بوو، کە بە خۆی دەگەڵ هاونشینەکانیدا دروستی کردبوون. ڕووی کردە ئودیسیوسو ئەم قسە بە توێکلآنەی کرد:

"ئەی میوان، تۆ کێی؟ خەڵکی کوێی؟ کێ ئەم جلانەی بە تۆ داوە؟ ئەدی بەخۆت ناڵێی، وێڵو سەرگەردان بە دەریادا گەییویتە ئێرە؟".

ئودیسیوسـی دووربینوبـەردەبار بەرسـڤی دایـەوەوگوتی: "ئـەی شـابانۆ، زۆر زەحمەتـە هـەموو سەربهوردوبەسـەرهاتە خەماویـەکانی خۆمـت بـۆ بگێڕمـەوە. بەسـەرهاتی مـن زۆر دوورودرێـژە، چونکە خواوەندانی ئاسماننشین خەمو مەینەتیەکی یەجگار زۆریان بەسەرا داوم. بەڵام سەبارەت بە پرسیارەکەت، وەڵامت دەدەمەوەو هەرچیەکت بوێ پێتی دەڵێم: دوڕگەیەکی زۆر دوور هەیە لـە دەریـادا بـەنێوی ئوجیجیـا، خوابانۆییـەکی زۆر کارامـەو لێـزانو بـەهێز، لەوێنـدەر دەژی. کیـژی ئەتلەسە، نێوی کالیپسۆیە. یـەجگار بەفەنـدوفێڵو ترسناکە! بـە تـاقی تـەنیا، دوور لـە بەشـەرانو خواوەندان لەو دوڕگەیەدا دەژی. ئیدی یـەکێك لـە خواوەنـدەکان، منی بەلـەنگازو چارە رەشـی بـە تاقی تەنیا گەیاندە ماڵەکەی ئەو، چونکە زیوس، بە بروسکەیەك کەشتیە تیژڕۆکەمی لە ناوەندی دەریای سامناكو مەی ئاسادا، داغان کرد، تێكو پێکـی شـکاند. هـەر هـەموو هـاوڕێ دلاوەرەکـانم بە جارێ تیاچوون. من خۆم بە پارچەیەکی هەیڤۆك ئاسای کەشتییەکەمدا هەڵواسی، نۆ دانـە ڕۆژ بەسـەر دەریـاوە هاتوچـووم، لـە شـەوی دەیەمـدا، کـە شـەوێکی یـەجگار تاریـكو نوتـەك بـوو، خواوەنـدان هەڵیاندامـە سـەر دوڕگـەی ئوجیجیـا، کـە ژینگـەو نشـیمەنی خوابـانۆی بەهەیبـەتو شامدار، کالیپسـۆی کـەزی شۆڕوگێسـو جوانـە! زۆر بـە گـەرمی پێشـوازی کـردم، وزۆری ڕێزگـرتم، خواردنی دامێ، بوو بە دڵدارو ئەویندارى من، دەیویست وەکو خواوەنـدان نـەمرم بکـات، هـەرگیز پیر نەبمو لە پیریم بپارێزێت، بەڵام نەیتوانی قەناعەتم پێبکاتوبمهێنێتە ڕەدا. حەوت دانـە سـاڵی تەواو لەوێندەر مامەوە. نەمدەتوانی بە هیچ لایەکدا بڕۆم. ڕۆژ تـا ئێـوارێ دەگریـام، هەمیشـە ئـەو جلکە خواییانەی کە کالیپسۆ پێی دابوومو لەبەرم کردبوون، لە فرمێسـکی منـدا تـەڕ بـوون. بـەڵام کە ڕەوڕەوی ڕۆژگار وەرچەرخاو ساڵی هەشتەمی لەگەڵ خۆیدا هێنا، فەرمانی دامێ کە بـۆ وڵاتـی خۆم بڕۆمەوە، ئیدی نازانم ئەمە پەیامی زیوس بوو وپێی گەیی بوو، یـان هـەر خـۆی لـە نـاخو دڵا گۆڕابـوو! خسـتیمە سـەر کەڵـەکێکی روختـەی تونـدو تـۆڵو مکـوم، ئازوقەیـەکی زۆری لـە نـانو شـەرابی ئـاڵ بـۆ پێچامەوە، جلێکـی خوایانـەی لەبـەرکردم، بایـەکی نـەرمی سازگاری لـە دوامـەوە هەڵکرد کە بمبـاتو هـیچ ئاسیوێکم پێنـەگات. هەڤدە دانـە ڕۆژ مـن لـە دەریـاداو بـەنێو گێـژەنگو شەپۆلاندا هاتم. لە ڕۆژی هەژدەیەمدا، لە دوورەوە چیا سەر بە تەمەکانی وڵاتـی ئێـوەم لـێ بـەدیار کەوت، و زۆر دڵم خۆش بوو... غـافڵ بـووم لـەوەی کـە هێشـتا نەگبـەتیو بەدبەختییـەکی زۆرم لـە پێشە، غافڵ بووم لەوەی کە پوسیدون، هەژێنەری زەوی هێشتا لە دوومـەو دەسـتبەردارم نـەبووە.

ئەوە بوو هەڵیکردە گێژەلۆکەو زریان، هەموو ڕێیەکی لیٚ بەستمەوە. دەریا هاروژا، ئاهونالەو هاوارو فیغانم دەگەییە کەشکەلاٚنی فەلەك. شەپۆلی زەلام رایان مالیم، کەڵەکەکەم داغان بوو، تێك‌وپێك شكا. هەر پارچەیەکی بەلایەکدا ڕۆیی. ناچار خۆم دایە دەم گەرداو وشەپۆلانەوە، بەدەم مەلەوە هاتم، باو شەپۆلان هەڵیانگرتمو گەیاندمیانە ئێرە. هەولم دا خۆم بگەیەنمە کەنارو وشکایی، بەلاٚم شەپۆل‌وگەرداو لێم نەگەڕا، کێشامیان بە تاوێرو گابەردانداو، هیچ بوارێکم دەست نەکەوت، ناچار بە مەلە بەرەو دوا گەڕامەوە. گەییمە روبارێك کە بە مەزەندەی ئەقڵی خۆم باشترین شوێن بوو کە لێی بپەڕمەوە سەر زەوی. چونکە جگە لەوەی بەردەلاٚن نەبوو، با پەناش بوو... بە هەرحالٚ هیلاك‌وماندوو گەییمە سەر زەوی. هەناسەم تەواو سوار بوو بوو، کەوتمو ئاگام لە هیچ نەما، کاتیٚ بە هۆش هاتمەوە دنیا تاریك بوو، لە رووبارەکە، کە سەرچاوەکەی لە دەستی زیوسدا بوو، دوورکەوتمەوە، رۆییشتم، خۆم بە بێشەیەکدا کرد، رایەخ‌و پێخەفم لە گەلاٚی درەختان بۆ خۆ دروستکرد. پالٚ کەوتم، خواوەندێك خەوێکی قولی بەسەرا داباراندم، بەدڵێکی پڕ لە خەمەوە هەموو شەوەکە تا بەیانی، تا نیوەڕۆ، تا زەردەپەری ئێواریٚ خەوتم. کە لە خەو رابووم، سەیرم کرد هاودەمان‌وکارەکەرەکانی کیژەکەت لە کەناری روبارەکەدا سەرقالی گەمەو یارین،وکیژەکەت لە ناوەندیاندا دەڵێی خوابانۆیە. ئیدی لێی پاڕامەوە کە یارمەتیم بدات، ئەلهەقی وێلٚو ماریفەتێکی زۆری نواند، قەت باوەڕم نەدەکرد، کیژێکی گەنجی وەکو ئەو، ئەوەندە بە ئاوەزو میهرەبان بیٚ. چونکە ئینسانی گەنج هەمیشە هەندیٚ بێباك‌و لەسەروبادی هەوایە. نان‌و شەرابێکی ئالی زۆری دامیٚ، فەرمانی دا کە لە رووبارەکەدا سەرو لەشم بشۆن،و ئەم جلانەش کە لەبەری مندایە، ئەو پێی دام. ئەمە حەقیقەتی مەسەلەکەیە".

## بەشداریکردنی ئالسینویوس لە گفتوگۆکەدا

**ئالسینویوس هەڵیدایەو گوتی:**

"ئەی میوان، کیژەکەم هەڵەیەکی کردووە کە نەدەبوایە بیکات، ئەویش ئەوەیە دەبوایە دەگەلٚ هاودەمان‌و کارەکەرەکانیا، تۆی بۆ ماڵەوە بهێناباوە، چونکە ئەو یەکەم کەس بووە کە تۆ هانات بۆ بردووە."

ئۆدیسیوسی دووربین‌وبەردەبار، بەرسڤی دایەوە:

"میران، تکایە لۆمەی کیژە پاکیزەکەت مەکە. چونکە بەڕاستی پێیگوتم دەگەلٚ کەنیزەکانیا دوای بکەوم، بەلاٚم من لە ترسی ئەوەی نەبادا تۆ بە دیتنی من لەگەلٚ کیژەکەتدا، زویروتوڕە بیت، بە گوێم نەکرد. چونکە ئێمەی بەشەری سەر رووی زەوی، بە تەبیعەت بەدگومانین..وهەندێجار غیرە دەکەین."

ئالسینویوس، ئەمجارەش وەلاٚمی دایەوە:

"ئەی میوان، من لەو کەسانە نیم، کە بە خۆڕاییی‌و بیٚ هیچ هۆیەك توڕە دەبن، بە هەرحالٚ میانەڕەوی لە هەموو کارێکدا باشە. بەڵیٚ، من زیوسی بابم، ئەتیناو ئەپولو بە شایەد دەگرم، کە ئارەزووی من ئەوەیە کە تۆ بەم شایستەیی‌و هەستەتەوە، کە زۆر لە من دەچیت، کە کیژەکەم شوو بە تۆ بکات‌و ببی بە زاوای من‌و لێرە بمێنیتەوە. خۆ ئەگەر پێت خۆش بیٚ لێرە بمێنییەوە،

ئەوا خانوو ودارایيشت دەدەمێ. بەڵام ئەگەر بە خۆت نەتەوێ بمێنييەوە، ئەوا هيچ فياسيەك ناتوانێ بە تۆبزی گلت بداتەوەو بابە زيوس-ش ئەمە قەبوڵ ناكات! جا سەبارەت بە ناردنەوەت بۆ وڵاتی خۆت، بۆ ئەوەی نيگەران نەبيت ودڵنيا بيت، سبەينێ كۆبوونەوەيەك دەگەڵ دەم سپيانی شاردا دەكەم و سەفەرەكەت دەخەينە سبەينێ. تۆ بۆ خۆت بێخەم لێی بنووە،و كوڕانی فياسی، بە دەم سەوڵ لێدان و كەشتيرانييەوە بە دەريای مەنگ و ئارامدا دەتبەن تا دەگەيتەوە وڵات ومالی خۆت يان بۆ هەر شوێنێكت دەوێ، خوای دەكرد لەولای (يوبويا)شەوە دەبوو، كە هەندێ لە قەوم و خزمانی ئێمە كاتێ كە (رادامانتوس)ی قژ زەرديان، بۆ سەردانی تيتيوسی كوڕی جيا بردبوو، ديتويانەو دەڵێن دوورترين وڵاتە. جا ئەوانە زۆر بە ئاسانی و بێ هيچ ماندوو بوون و كۆسپ و تەگەرەيەك سەفەرەكەيان بۆ ئەوێندەر كردبووو هەر هەمان رۆژيش گەڕابوونەوە. جا كەسێ نەمرێ بە چاوی خۆت دەيبينی كە كەشيتييەكانی من باشترين كەشتين و، پياوانی من لە سەوڵەوانی و كەشتيرانی و دەرياوانی دا يەجگار كارامەو زەبەردەست و مەعلان و وەستان."

ئوديسيوسی دووربين و بەردەبار بەو قسانە يەجگار شادوخۆشحاڵ بوو. بە دەنگی بەرز كەوتە نوێژو نزا: "ئەی زيوس، زيوسا، بابی بابان! لە زاری ئالسينويوس بڕوانە، ئەو قسانەی بێنە دی.سايەوسەرفرازی ئەو لەسەر زەوی، لە مەڵبەندی زادودانەوێڵە كەم مەكە، ومنيش بگەيەنەوە زێدو وڵاتی خۆم."

## هەمووان دەنوون

ئەو گفتوگۆيەيان كرد. ئەوسا ئاريتی باسك سپی، بە كارەكەرەكانی گوت، جێگەيەك لە ژێر دالانەكەدا ئامادە بكەن،پێخەف حەريری جوان و ئەرخەوانی بۆ دابنەن و ئەوجا رۆبی خوری ئەستوری بۆ دابنەن تا لەبەری بكات. كەنيزەكان مەشخەڵ بەدەست لە ژوورەكە وەدەركەتن. كە جێگايەكی زۆر نايابيان ئامادە كرد، هاتن بە شوێن ئوديسيوسداو گوتيان: "ئەی ميوان، وەرە بنوو، جێگاكەت ئامادەيە."

واديار بوو، زۆری حەز لە خەوە. بەو جۆرە ئوديسيوس چووە سەر جێگاكەی خۆی و لە ژێر تاقەكەدا خەوت. (ئالسينويوس)ش چوو لە ژوورەوە بنوێت: شابانۆ جێگەی ئامادە كردبوو، و پێكەوە نووستن.

***

**پەراوێز:**

*- ئاريتی: ژنی ئالسينويوس و دايكی نوسيكايە. دەگەڵ مێردەكەيدا، ميوانداری و پێشوازی ئوديسيوسيان كردو بەڵێنيان دايە يارمەتی بدەن كە بۆ نيشتمانی خۆی بزڤڕێتەوە.

*- رادامانتوس: كوڕی زيوسە، وەكو دامەزرێنەری ياساو جێبەجێكەری بڕيارێن ياسايی، و وەكو قازيەكی دادپەروەر دانراوە.

*- جيا: زەوی ودايكی ئاسمان و دەريايە

*- سيلكوپ: ئەمانە كوڕی ئورانوس (ئاسمان)وزەوين. ئەمانە سيان بوون، زەبەلاح ودێو ئاسا بوون. يەكی يەك چاويان هەبوو، يەجگار بەهێز بوون، تواناي‌ەكی خوايی گەورەيان هەبوو.

## سروودی هەشتەم

### کورتەی سروودەکە:

بۆ سبەینیٚ،بەیانی زوو کۆڕێکیان بەست. ئالسینویوس دەستوری دا کە تەدارەکی ڤڕێکردنی میوانەکەیان بدینن. لەوکاتەدا کە کەشتیان ئامادە دەکرد، لە کۆشکی پاشادا ئاهەنگو بەزم سازکرا. دمودوکسی ئاشق وشایەری گۆرانیبێژی خۆوێژی هۆنەر، هەندیٚ لە بەسەرهاتو واریقاتەکانی جەنگی تەروادەی بە دەنگوئاوازەوە گێڕایەوە. و زۆری کار لە ئودیسیوس کرد. شا هەستی بەمە کردودەستووری بە ئامادەبووان دا کە بچنە مەیدانی شاروتەمەشاو بەشداری وازیو پێشبڕکێیان بکەن. دوای ئەوەی چەند جارێك داوای زۆرەبانی لە ئودیسیوس دەکەن، سەرەنجام ریشخەنی ئوریال واداری دەکات مل بداتو بێتە مەیدان.. لە قورس هەڵدان دا سەر دەکەویٚو لە هەر وەرزشێکی دیکەدا بەرانبەر بە فیاسیەکان مەیداخوازی دەکات. ئالسینویوس خەڵکەکە کە لە دڵی خۆدا توڕەدەبن، هێور دەکاتەوە. شایەرەکەی بانگ کرد، دمودوکس ڤیانو ئاشقێنی ئارسوئافرودیت، بە دەنگوئاوازەوە دەڵێتو هەڵپەرکیٚ ودیلان، ئودیسیوسیان هێنایە جۆش.. ئالسینویوس میروشازادەکان هان دەدات کە دیاری پێشکەش بە میوانەکە بکەنو (ئوریال)ی دەگەڵ ئاشت کردەوە. کە بوو بە چێشتەنگاووکاتی تاشت هات، بۆ کۆشکەکە گەڕانەوە. نوسیکا لە ڕێگەدا دوا خوا حافیزی لە ئودیسیوس دەکات... لە کۆتایی ئاهەنگو بەزمەکەدا دمودکسی، چیرۆکی ئەسپەدارینەکە دەڵێت.میوانەکە چاوی خۆی دادەپۆشێتو دەگریٚ. هەنگیٚ ئالسینویوس لە ناوی ولە هۆی گریانەکەی دەپرسێت.

### ئالسینویوس قسە بۆ جەماوەری فیاسیان دەکات

کە سپێدەی پەنجە نەرمی گوڵئاسا،لە ئاسۆوە بەیانیدا، ئالسینویوسی قارەمانو دلاوەر لە جێگە هاتەدەر. هەروەها ئودیسیوسی نەوەو نەتیرەی زیوس، وێرانکەری شاران–ش لە خەو رابوو. ئالسینویوسی دلاوەر، میوانەکەی بۆ مەیدانی کۆبوونەوەی فیاسیەکان برد کە لە نزیکی کەشتییەکانیان ڕێکیان خستبوو.. کە گەییشتنە ئەوێندەر، لە نزیکی یەکەوەو لەسەر دوو بەردی

سیقالدراوەوە دانیشتن. لەم کاتەدا پالاس ئەتینا، لە شێوەی پەیكوجارچی ئالسینویوسی دوور بیندا، بە ناو شار کەوتبوو، ومشوری گەڕانەوەی ئودیسیوسی دلاوەری دەخوارد. دەگەییە هەر یەکێك لە دەمسپیانی قەوم پێیدەگوت:

"ئەی دەمسپیان وشیرەتکارانی فیاسی، خێرا بڕۆن بۆ مەیدانی کۆبوونەوەکە، تا هەواڵی ئەو میوانە بزانن کە دوێنێ، پاش ئەوەی ماوەیەکی زۆر لە دەریادا وێڵو سەرگەردان بووە، گەییوەتە ماڵی ئالسینویوسی دووربین.لە سەروسیمادا، هەر لە خواوەندان دەچێت."

ئەتینا بەو جۆرە لاپرەسەنی وکونجکاوی خەڵکەکەی دەبزواندو هانی دەدان کە بو مەیدانی کۆبوونەوەکە بچن. لە ماوەیەکی کەمدا مەیدانەکە پڕ بوو لە خەڵکی، و وەك دەڵێن دەرزیت هەڵدابا نەدەکەوتە سەر زەوی. زۆربەی خەڵکەکە بەسەرسامی دەیانڕوانیە کوڕە دووربینەکەی لایرتیس.ئەتینا جوانی وهەیبەتێکی یەجگار سەیری بەسەروسیماو شانو شەوکەتی بەخشی بوو. لە خەڵکی ئاسایی بەسامو هەیبەت تر دەهاتە بەرچاو. تا فیاسیەکان بکەونە ژێر کاریگەرییەوەو زیاتر ڕێزوحورمەتی بگرن، وئەگەر فیاسیەکان تاقیبکەنەوە سەرکەوتنو سەرفرازی گەورە بەدەست بێنێ.. دوای ئەوەی خەڵکەکە هەموو خڕ بوونەوەو جێ نەما ،ئالسینویوس هەستاو رووی دەمی کردە جەماوەری خەڵکەکەوگوتی:

"ئەی فەرماندەوشیرەتکارانی فیاسی، گوێبگرن، با من قسەی دڵی خۆمتان بۆ بکەم. ئەم پیاوە غەریبە، کە من نازانم کێیە. خەڵکی رۆژ هەلاتە یان رۆژاوا، وێڵوسەرگەردان بە دەریادا هاتووەو ڕێی کەوتووەتە ماڵەکەی من. داوا دەکات بۆ ولاتی خۆیی بنێرینەوەو تکا دەکات وەعدو بەڵێنێکی بدەینێوبە نیگەرانی نەمێنێتەوە. جا ئێمە وەکو لە کۆنی کۆنەوە داوای هیچ لێقەوماوێکمان رەت نەکردووەتەوە با پەلە بکەینو بینێرینەوە بۆ ولاتی خۆی. قەت ڕێنەکەوتووە یەکێك،جا هەر کێیەك بووبێ، رووی کردبێتە ماڵی منوماوەیەکی زۆر پاڕابێتەوەو داخو خەفەتی خواردبێ ئەوجا بەڕێ کرابێ. جا با کەشتییەکی رەش باوی نەفتو نوێ، بخەینە دەریای موبارەکەوە، کەشتییەك کە یەکەم جاری بێ خرا بێتە دەریاوە، وپەنجاو دوو دەریاوانی لاوی گوڵبژێری بۆ هەڵبژێرینودوای ئەوەی هەر کەسەو سەوڵی خۆی لە جێی خۆی قایم دەکات، دابەزنو بە پەلە وەرن بۆ کۆشکەکەی من، بەزمو ئاهەنگ دەگێڕین.و نانو خوانوبەزمێکی گەورەتان بۆ سازدەکەم. ئەم فەرمانە تەنیا بۆ گەنجەکانە. بەلام ئێوە، ئەی میرانو ئەی شاهانی خودان سەوڵەجان، تەشریف بێنن بۆ کۆشکەکەم، تا لە هۆڵە گەورەکەدا لەسەر شەرەفی میوانەکەمان، نانێکی دۆستانە، بخۆین،ونابێ کەس لەم دەعوەتە دوا بکەوێ. هەروەها شایەرە موبارەکەکەش، دیمودوکوس-ی بەهرەمەندو خۆشەویستی خواوەندانیش بانگ بکەن، کە خواوەندان دەنگو ئاوازێکی ئەوتۆیان داوەتێ، لە هەرکەسێکی دی پتر دڵو دەروونان ئەفسون دەکات،بانگی بکەن با بە هونەروگۆرانیان ئەو خەڵکە بێنێتە جۆش."

ئالسینویوس کە لەو قسانە بووەوە، بەرەو ماڵ نشێو بووەوەو میرو شاهانی گۆچان بەدەست دووی کەوتن. یەکێك لە تەتەروجارچییەکان چوو بە دوای شایەرە موبارەکەکەدا. ئەو پەنجاو دوو کەسەش کە بۆ دەریاوانی هەڵبژێردرا بوون، وەکو چۆن ئالسینویوس فەرمانی دابوو بەرەو

کەناری دەریای نەسرەوت وەڕێکەوتن. کەشتییە رەشباوەکەیان خستە قولایی ئاوی دەریاکە، چوونە سەر کەشتییەکە، بورجەکەیان لە کەشتیەکە قایم کرد، بادەوانیان لێ بەست، سەوڵەکانیان بە پەتی چەرموسیرمە لە شوێنی خۆ قایم کرد،هەموو شتێکیان ئامادەکرد، بادەوانی سپییان هەڵکرد، وکەشتییەکەیان لە لەنگەرگادا راگرت. ئەوسا بەرەو کۆشکەکەی ئالسینویوسی دووربین بە رێکەوتن. هەر هەموو دالانو راڕەوو ژوورو هۆڵەکان پڕبوون لە خەڵکی، دەستە دەستە، جەوانو پیر خڕ بوو بوونەوە. ئالسینویوس رای سپاردبوو دوانزە بەرخە نێرو هەشت بەرازی کێوی شفرە چەرموو، ودووگای دابەستەی قەڵەو بە عاردیدا بدەنو بیکەنە قوربانی. هەر هەموو ئەو قوربانیانە کوژرانەوەو کەوڵ کرانو ئامادەکران کە لە دەعوەتو ئاهەنگو بەزمەکەدا پێشکەش بکرێن.

## دیمودوکوسی شایەر دێت...

ئەوسا تەتەرەکە، گەڕایەوەو دیمودۆکۆسی شایەری موبارەکی لەگەڵ خۆیدا هێنا. ئەم شایەرە، خۆشەویستو میهرپەروەردەی خواوەندی هونەرو شیعر بوو. بەلام خێروشەڕی پێکەوە دابویە، لەلایەکەوە لە بینایی بێبەش کردبوو، ولەلایەکی ترەوە بەهرەی ئاوازو دەنگخۆشی پێبەخشی بوو. (پونتونوس)ی تەتەر، کورسیەکی زیونیشانی لە پاڵ پایەیەکی بەرزدا، لە ناوەندی میوانەکاندا بۆ دانا. چەنگە خۆشاوازەکەی، بە دیار سەریەوە، بە سنگێکەوە بۆ هەڵواسیو فێری کرد چۆن لە کاتی پێویستدا دەست بەریۆ دای بگرێت. ئەوسا مێزێکی جوانی لە بەردەمیا دانا. سەبەتە نانێكوجامێ بادەی ئالی بۆ لەسەر دانا، تا هەر کاتێ ئارەزووی کرد لێی بخواتەوە. بەو جۆرە میوانەکان دەستیان بۆ ئەو خۆراکە بەلەزەتەی لەبەردەمیاندا دانرا بوو، راکێشا. کە لە خواردنوخواردنەوە بوونەوە، خواوەندی شیعر، سەرۆئیلهامی خستە دڵی (دیمودوکوس)ەوە کە داستانی شەڕە بەنێوبانگەکەی نێوان ئودیسیوسو ئەخیلی کوڕی پیلیوس بڵێت. ئەو شەڕەی کە کاتی خۆی بوو بوو بە داستانی سەر زارانو ناوبانگی گەیی بووە کەشکەلانی فەلەك. چۆن ئەو دوو قارەمانە جارێك لە ئاهەنگو بەزمی خواوەندانندا لێیان بوو بوو بەدەم بۆڵەو قسەی زبریان بە یەکتر گوتبوو. چۆن ئاگامەمنونی سوپاسالار، کە بیستبووی باشترین فەرماندەی ئاخیان لێیان بووە بە قەرقەشە، لە دڵی خۆیدا زۆری پێخۆش بووە. چونکە ئەمە هەمان ئەو پێشبینییە بوو کە ئەپولو، لە پوتودا بە زمانی فاڵبینێکەوە بۆی کردبوو. واتە ئەمە نیشانەی ئەو شەڕو بەلایە بوو کە بە ویستی زیوس بەسەر خەڵکی تەروادەو داناییان دا دەهات.

## ئودیسیوس کە گوێی لە دیمودوکوس بوو گریا

شایەری موبارەك بە دەنگو ئاوازەوە ئەو داستانەی چڕی. هەنگێ ئودیسیوس چمکی عەبا نایابە ئەرخەوانیەکەی بە هەردوو دەستە بەهێزەکانی گرتو سەرو رووی خۆی پێداپۆشی، چونکە شەرمی دەکرد بە بەرچاوی فیاسیەکانەوە بگریو فرمێسکان برێژێ. بەلام هەرکە شایەرە ئاسمانی نەژادەکە هەڵوەستەیەکی دەکرد، ئودیسیوس، چمکی عەباکەی لەسەر سەروچاوی لادەبردو فرمێسکەکانی دەسڕی، ئەوجا جامە دوودەسکییەکەی خۆی هەڵدەگرتو بە یادی

خواوەندان بادە پرژێنیونوشخواری دەکرد. بەڵام میرانی فیاسی کە ئەفسونی چامەکانی بوو بوون، داوایان لە دیمودوکوس دەکرد بەردەوام بێ. کە هەڵیدەکردەوە گۆرانی، ئودیسیوس دیسان سەری خۆی دادەپۆشییەوە گریەوزاری دەکرد. نەیدەهێشت کەس پێی بحەسێو فرمێسکەکانی بدینێ. ئەوە بوو کەس پێی نەحەسیا، تەنیا ئالسینویوس نەبێ، چونکە لە نزیکییەوە دانیشتبوو، گوێی لێبوو کە بە کوڵ زاری دەکرد. ئەوە بوو هەستا، رووی کردە فیاسیانی ئاشقە سەوڵوکەشتیودەریاوانیو گوتی:

"ئەی سەرانو شیرەتکارانی فیاسی، گوێبگرن، ئێستا هەموومان لە نانوخوانو بەزمو ئاهەنگو گۆرانی تێر بووین. جا با بچینە دەرێ، ئیتر نۆرەی وەرزشو پێشبڕکێیانی دیکەیە، با لەوەشدا خۆمان تاقی بکەینەوە، تا کە میوانەکەمان گەییشتەوە وڵاتی خۆی، بۆ دۆستانو کەسو کاری خۆی بگێڕێتەوە، کە تا چ رادەیەك لە بۆکسبازیو زۆرەبانیوپازپازێنو ڕاکردندا لە خەڵکانی دی زیاترین."

## بانگهێشتی قارەمانان بۆ پێشبڕکێ

ئالسینویوس، دوای ئەو قسانە لە هۆڵەکە وەدەرکەوتو کەوتە رێ. ئەوانی دیکە دوای کەوتن. تەتەرەکە چەنگە خۆش ئاوازەکەی بە سنگێکەوە هەڵواسی، دەستی دیمودوکۆسی گرتو لە هۆڵەکە وەدەرکەوتن،وبەدوو قۆڵی هەمان رێگەیان گرتەبەر کە سەرانی فیاسیان گرتبوویانە بەرو دەچوون بۆ تەمەشای گەمەو پێشبڕکێیەکان. حەشاماتێکی هێندە زۆریان بە دواوە بوو کە لە ژمارە نەدەهاتن.گەنجانێکی زۆر، لە پاڵەوانانی مەیدان بە هەڵەداوان هاتبوونوکێبەرکێیان بوو لەسەر خەڵات، لەوانە: ئەکرونیوس، ئوکیالوس، ئیلاتریوس، نوتیوس، پریمنیوس، ئەنخیالوس، ئیرتیمیوس، پونتیوس، پروریوس، توون، ئەنابیسینیوس، ئەمفیالوس، کوڕی پولونیوس، کوڕی تیکتون، حازروئامادە وەستا بوون.(ئوریال)ی کوڕی (نوبولوس)ش کە لە مەعلانیدا هاوتای ئەریسی خواوەندی جەنگ بوو، وەستا بوو، کە لە قۆزیو بەژنو باڵادا، جگە لە لایوداماسی بێنەزیز، سەر تۆپی هەموو فیاسیان بوو. هەروەها هەر سێ کوڕەکەی ئالسینویوسی جوامێرو خانەدانیش بەشداری کێبەرکێیەکەیان کرد، واتە: لایوداماس، هالیوس، وکلوتونیوسی خواوەندا ئاسا.

ئەمانە یەکەمجار لە پێشبڕکێی ماراتوندا هەڤرکی یەکتریان کرد. ئەم سەروئەوسەری مەیدانی ماراتۆنەکەیان بۆ دیاری کرا. لەم سەری مەیدانەکەدا، ئەستونێکیان وەکو نیشانەی دەستپێك چەقاند. هەموو بەپەلە پێیان وەغارێوە نا، گەردەلوولی تۆزیان لە دوای خۆوە هەستان. باشترین ماراتۆنکاریان کلوتونیوسی خانەدان بوو. یەك هۆگانە جووتی هێستر، لە پێش هەموو هەڤرکەکانیەوە گەییشتەوە ناو ئاپۆڕای خەڵکەکە. ئەوسا هاتنە سەر پێشبڕکێی سەختو دژواری زۆرەبانی، لەم پێشبڕکێیەیاندا، ئوریال گرێوی لە هەمووان بردەوەو بە یەکەم دەرچوو. لە پازداندا ئامفیالوس گرێوی لە هەمووان بردەوەو یەکەم بوو. لە قورس هەڵدان دا، ئیلاتریوس سەر ئامەدی هەمووان بوو،وگرێوی بردەوە. بەڵام لە بۆکسێندا لایوداماسی کوڕی ئالسینویوس-ی دلاوەر سەرتۆپی هەمووان دەرچوو. دوای ئەوەی هەموو ئامادە بووان، بە دیتنی

پێشبڕکێیەکان شادوخۆشحاڵ بوون، لایوداماسی کوڕی ئالسینویوس رووی کردە هەموانو گوتی:

"برادەرینە با لە میوانەکەشمان بپرسین کە چ یاریەك لەم یاریانە دەزانیو تیایدا کارامەیە. پێ دەچێت پیاوێکی تۆکمەو بتەو بێت. بە بەژنو باڵاولاقو لەتەر، بە دەستو بازووانو، بە شانو ملا بێ زۆر بەهێزەو هەموو گوڕو تینو تاوێکی گەنجایەتی تیایە. بەڵام چەپۆكوبەڵای رۆژگار ماندووی کردووە،وبە راشکاوی دەیڵێم کە هیچ شتێك وەکو دەریا مرۆڤ، چەند بەهێزیش بێ، ناپوکێنێتەوە."

ئوریال (ئوریالوس) لە وەڵامی ئەودا گوتی:

"لایوداماس ئەلهەقی قسەکەت بەجێیە.جا ئێستا بە خۆت بچۆ بۆ لایوپێشنیازەکەتی پێبڵێ."

لایوداماس کە گوێی لەو وەڵامە بوو، بە نێو ئاپۆڕاکەدا هاتو رووی دەمی کردە ئودیسیوسو گوتی: "قوربان، ئەزبەنی، ئەگەر تاقەتت هەیەو دەیزانی، خۆت لە یەکێك لەم پێشبڕکێیانەدا تاقی بکەوە. چونکە لە ژیانا هیچ شتێك لەوە خۆشتر نیە، پیاو بە شانوبازووی خۆی سەرکەوتن بە دەست بێنیو گرێوان بباتەوە.وەرە خۆت تاقی بکەوەو خەم لە دڵی خۆت دەربکە.گەڕانەوەت زۆر نزیکە، هەر لە ئێستاوە کەشتیان بۆ لە دەریا خستوویتو دەریاوانەکان حازروئامادەن."

هەنگێ ئودیسیوسی دووربینوبەردەبار بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"ئەی لایوداماس،بۆچی گاڵتەم پێدەکەی، بۆ بە تەوسەوە داوام لێدەکەی بەشداری پێشبڕکێ بکەم؟ من بیروخەیاڵم لای شتێکی ترە نەك لای گەمەوسەرگەرمی.من مەینەتی دنیام دیتووە، گیروگرفتی زۆرم بەسەر هاتووە، ژیانو رۆژگار زۆریان ماندوو کردووم، ئێستاش کە لەم کۆڕەی ئێوەدا دانیشتووم، دڵم هەر لەلای گەڕانەوەیە، بۆ وڵاتی خۆم. لە پاشایەکەتان،ولە هەموو خەڵکی فیاسی دەپاڕێمەوە کە فریام بکەنو بۆ وڵاتەکەمم رەوانە بکەنەوە.

هەنگێ یوریالیوس، رووبەڕووی خۆی، بە تەسەوە وەڵامی دایەوەوگوتی: "نا، ئەی غەریب، لەوە ناچێت تۆ هیچ جۆرە وەرزشێك، لەو وەرزشانەی کە خەڵکی پێیان خۆشە بزانێت.تۆ زیاتر بازرگانە تەماعکارانە دەچێت. کە بە کەشتی بەناو دەریا دەکەون،وبیر لە هیچ ناکەنەوە تەنیا ئەوە نەبێ کە بە باری رەنگینو سەنگینەوە بۆ ماڵی خۆ بگەڕێنەوە. هیچ نیشانەیەکی وەرزشدۆستیو پاڵەوانیو وەرزشەوانی لە تۆدا نابینم."

## ئودیسیوس بەشداری پێشبڕکێ دەکات

ئودیسیوسی دووربینوبەردەبار، برۆکانی وێکهێنانەوەو مۆڕەیەکی لێکردوگوتی: "ئەی خانەخوێی من، قسەیەکی باشت نەکرد، بەلای منەوە لە شێت دەچیت. هەڵبەتە خواوەندان بەهرەو توانا، بە شێوەیەکی یەکسان بەسەر هەموو خەڵکیدا دابەشناکەن، نایەن بە ژنوباڵاو، ئەقڵو ئاوەز،وتەڕزمانیو قسەزانی بە جارێ بەیەك کەس بدەن. جاری وایە یەکێك دەبینی بە رواڵەت زۆر بێ نمودو کەم جورمە، بەڵام خواوەند دەمو زمانێکی هێندە جوانو شیرینی داوەتێ، هەموو کەس بە عەزرەتەوەن گوێی لێبگرن. لە هەر مەجلیسێکدا قسان بکات، هێندە بە رەوانیو خاکیانە دەدوێ، هەموو دەکەونە ملەقوتێ کە گوێیان لێی ببێ. کە بە شارا دەڕوات، زۆر

بەڕێزەوە، وەکو ئەوەی خواوەندێك بێ، تەمەشای دەکەن. جاری واش هەیە یەکێك دەبینی لە هەیئەت و جوانیدا دەڵێی خواوەندە، بەڵام زۆر قسە تاڵ و قسەنەزانە. جا تۆ لەو کەسانەیت. تا حەز بکەی قۆزو جوانی، هیچ خواوەندێك ناتوانێ خەڵکی لە تۆ جوانترو قۆزتر دروست بکات، بەڵام وەکو کەندوی بەتاڵ وایت، ئەقڵت لە کەلەدا نیە. بە قسە نابەجێیەکەت روحت ئازار دام، ناخت بریندار کردم، زۆرت تووڕە کردم. جا لە واری گەمەو وەرزش دا، ئەوەندەش بێ تواناو بێ دەسەڵات نیم وەکو تۆ تەسەور دەکەی. بە تایبەتی لە گەنجیمدا، کە هێشتا کوڕ بووم بە بانانەوە، هەمیشە لە گەمەو پێشبڕکێیەکاندا براوەو یەکەم بووم. بەڵام دەڵێی چی، ئیتر ئەوە رۆژگارە، کارو خەمو کارەسات ومەینەتی و شەڕی مەیدان و شەڕگان، وسەرگەردانی ناو بەحران و بەگژاچوونی کێژەنگ و گێژاوو شەپۆل و پێلان، واکەنەفتیان کردوموبڕستیان لێ بڕیوم، ئێی پیرە دنیا! بەڵام وێڕای هەموو ئەو دەردو مەینەتیانەش، لە داخی قسە ساردەکانی تۆ بەشداری پێشبڕکێیەکە دەکەمو خۆم تاقی دەکەمەوە."

## ئۆدیسیوس لە قورس هەڵداندا براوە دەبێ

ئۆدیسیوس کە لە قسەکەی بووەوە، لە جێی خۆی راپەڕی. بێ ئەوەی عەباکەی دابکەنێ، دەستی دایە قورسترین و گەورەترین قورس، کە زۆر گرانتر بوو لەو قورسانەی کە فیاسیەکان، لە نێو خۆیاندا، توانای خۆیان پێ تاقی دەکردەوە.ئەو قورسەی هەڵگرت. تۆزێکی لە نێو دەستیا هەڵسوڕاند. ئەوسا تا هێز لە قۆڵ و بازووی دا بوو، هەڵیدا. پیرە قورس بە ئاسمانا و بەسەرسەری ئاپۆڕاکەدا، بە گڤەگڤ رۆیی. فیاسیەکان کە بە سەوڵی درێژو کەشتیرانی و دەریاوانی بەنێوبانگن، لە ژێر پەروازی قورسەکەدا خۆیان بە عاریدا داو سەریان دانەواند. قورسەکە لە هەر هەموو ئەو نیشانانەی کە قورس ئەندازەکانی دی تۆماریان کردبوو، تێپەڕی. چونکە ئۆدیسیوس زۆر بە توندی هەڵی دابوو. ئەتینا لە شێوەی پیاوێکدا هات و نیشانەیەکی لە شوێنی کەوتنەوەی قورسەکەی ئۆدیسیوس دانا، و پێی گوت: "ئەی غەریب، تەنانەت کوێریش، بە لەپە کوتێ، دەتوانێ نیشانەکەی تۆ بناسێتەوە، چونکە لە نیشانەکانی تر جیایە، تێکەڵی نیشانەکانی تر نابێت. نیشانەکەی تۆ زۆر لە نیشانەکانی دی هێوەترە. جا دڵنیابە کە براوە دەبێ، چونکە قورسی هیچ فیاسیەك نەك ئەوەی تۆ ڕەت ناکات، بەڵکو ناشیگاتێ."

ئۆدیسیوسی دووربین وبەردەبار، بەو قسانەی ئەتینا زۆر شادوکەیف خۆشبوو. دڵی خۆش بوو کە لە نێو ئەو ئاپۆڕایەدا دۆستێکی وا دڵسۆزو گیانی بە گیانی هەیە، بۆیە بە دڵێکی کراوەترەوە، رووی کردە فیاسیەکان وگوتی:

"دەی کوڕینە، کێ دەتوانێ قورسەکەی خۆی بگەیەنێتە ئەو نیشانەیەی من، ئەوە ئەرزو ئەوە گەز، مەیدان مشك نەیخواردووە. ئەوسا قورسێکی گرانتر هەڵدەدەم، دەیگەیەنمە ئەوێندەرو دوورتریش. جا ئەگەر یەکێك هەیەو دڵی پێوەیە هەڤرکی من بکات، با بێتە مەیدان و خۆی تاقی بکاتەوە، چونکە زۆرتان تووڕە کردم. بۆ هەموو یاریەکان، بۆ بۆکسێن، زۆرەبانی، ماراتۆن ئامادەمو هەر فیاسیەك لە خۆی رادەبینێ بابێتە مەیدان جگە لە لایوداماس، چونکە خانەخوێمە، کێ هەیە بەگژ خانەخوێی خۆیدا بچێت؟ دەبێ کەسێکی بێئاوەز، سپڵەو پێنەزان و خوێڕی بێ

ئەوسا بتوانیٚ بچیٚ بە گڕ خانەخوێیەکەیدا، کە لە ولاٚتی غەریبی دا پەنای داوە، میوانداری کردووە. ئەمە لەقە لە بەختی خۆی دەدا. بەلاٚم سەبارەت بە وانی دی، کیٚ دیٚتە مەیدان بابیٚ. من کەس بە بچووك و کەم نازانم، دەمەویٚ هەر پالەوانیٚك لە نزیکەوە بناسم و رووبەڕوو خۆمی لەگەلدا تاقی بکەمەوە. لە هیچ یاریەکی خەلك پەسندا دەسەوسان نیم. لە کەوانکیٚشی و تیرەندازی دا عەیبم نیە، کیٚم بویٚ لە نیٚو ئاپۆرای دژمن دا، با تیرەندازانیٚکی زۆریش لەگەلٚ مندا خەریکی تیرەندازی بن، من بەر لە هەرکەسیٚك دەی پیٚکم. کە ئیٚمەی ئاخایی لە ولاٚتی تەروادەدا شەڕمان دەکرد، کەس لە کەوانکیٚشی و تیرەندازیدا هاوتای منی نەدەکردەوە. تەنیا فیلوکتیتیس نەبیت کە لە من باشتر بوو. جا لیٚرەدا رایدەگەیەنم کە هیچ ئادەمیزادیٚکی سەر رووی زەمین، هیچ نان خۆریٚك نیە لەو بوارەدا بەبای قولانم دا بگات. هەلٚبەتە مەبەستم قارەمانانی کۆنی وەکو هەرقل و یوروتوس–ی ئوکالی نیە، نا، من هاوتای ئەوان نیم. ئەوان هەڤرکی خواوەندانیانیش دەکرد، هەر لەبەر ئەو پڕکیٚشی وسەرکیٚشییەش بوو کە (یورتوس)ی مەزن، زوو بە زوو، وبە گەنجی مرد. ئەپولو لیٚی چوو بەقینا و بە گەنجی کوشتی. چونکە لە کەوانکیٚشی و تیرەندازیدا تەحەدای کردبوو. سەبارەت بە نیٚزەش، نەك هیچ رمبازیٚك نامگاتیٚ، بەلٚکو تیری هیچ تیرەندازیٚکیش نامگاتیٚ... تەنیا لە غارغاریٚنەکەدا بڕیٚك دەترسم کە فیاسیەکم لیٚ هەلٚبەکەویٚ و پیٚشم بداتەوە. چونکە ماوەیەکی زۆر لە دەریادا مامەوەو بە گڕ شەپۆلاندا چووم و ئازووقەو خواردنم تەواو بوو، و هیٚشتا لاقولەتەرانم سستن."

## ئالسینویوس داوا لە سەمەکاران دەکات بڕەقسن

ئودیسیوس ئەو قسانەی کردو ئەوانی دی هەموو مات و بیٚدەنگ بوون. تەنیا ئالسینویوس هەلٚیدایەوگوتی:

"ئەی میوانی ئازیز، ئیٚمە لەو قسانەی کە تۆ کردتن، زویروتوڕە نابین. چووکە تۆ گەرەکتە توانا و بەهرەی خۆت بنویٚنی. ناهەقت نیە. لەوە توڕەیت کە ئەم پیاوەی ئیٚمە هاتووەو دەیەویٚ تۆ بشکیٚنیٚ. دیارە ئەگەر کەسیٚکی بە ئاوەزو قسەزان بوایە، ئەو رەفتارەی نەدەکرد. بە هەرحالٚ با لە دوای چووان نەچین. ئیٚستا گویٚ لە من بگرە، تا بتوانی ئەوەی بۆتی دەگیٚڕمەوەو پیٚتی دەلٚیٚم، تا وەختایەك کە لە مالٚی خۆتدا،لە نیٚو ژن و مندالەکانتدا، ئاهەنگ وخوانیٚك ساز دەکەیت و یادیکی ئیٚمە دەکەیتەوە، بۆ قارەمانیٚکی تری بگیٚڕیتەوە کە زیوس لە زەمانی باب و باپیرانمانەوە تا ئەمڕۆ، چ بەهرەیەکی پیٚداوین و لە چیداو بەچی بەنیٚوبانگین. ئیٚمە لە بۆکسبازی و زۆرەبانیدا زۆر مەعلان و بەنیٚوبانگ نین. بەلاٚم لە غارغاریٚندا، لە ماراتۆندا زۆر تیژڕۆین. لە دەریاوانیدا یەکەمی هەموو دنیاین. هەمیشە ئاشقی خوان وبەزم و ئاهەنگ و چەنگ لیٚدان، گەڕەلاواژەو گۆرانی و رەقس و هەلٚپەڕکیٚ، جلی تازەو گەرماوی گەرم و جیٚگەو نووستنین. دەیسا کوڕانی فیاسی تیپی سەماکارانی بیٚویٚنە رابن، نمایشیٚکی هەلٚپەرکیٚمان بۆ بکەن، هونەری خۆتان بنویٚنن، تا کە میوانەکەمان بۆ ولاٚتی خۆی گەڕایەوە، بتوانیٚ بۆ کەسوکارودۆستانی خۆی بگیٚڕیٚتەوە، چۆن لە هونەریٚن دەریاوانی، وکەشتیٚرانی و غارغاریٚن و سەماو هەلٚپەڕکیٚ و گۆرانی و

شیعردا، سەرتۆپی هەموو دنیایین. دەی یەکێك بەپەلە بچیّ بۆ ماڵی ئێمەو ئەو چەنگە بۆ دیمودۆکوس، کە لەویّ بەجێیهێشتووە، بێنیّ."

## هەڵپەڕکیّ لەسەر نەزمی چەنگ

هەرکە ئالسینویوسی خواوەندئاسا لە قسەکەی بووەوە، یەکێك لە خولاّمەکان بە هەشتاو رۆیی تا چەنگەکە لە ماڵی پاشا بێنیّ. ئەوسا نۆ چاودێری دەستەبژێری هەڵبژاردە کە کاریان سەرپەرشتی و رێکخستنی میهرەجان وکەرنەڤاڵە وەرزشوانیەکە بوو، ولەو بوارەدا کارامەو بە ئەزموون بوون، لە نێو خەڵکەکەوە هەستان، شوێنێکی باش و لەبارو جوان و فەرِیحیان بۆ هەڵپەڕکێیەکە تەخت و هەموار کرد. کابرای خولاّم بە پەلە بە چەنگە خۆشئاواکەوە گەڕایەوە. دایە دەستی دیمودوکۆس. کاکی شایەر هاتە ناوەندی مەیدانەکە. کۆمەڵە خەڵکێك لە تاف و هەڕەتی گەنجیدا بوون، و لە رەقس و هەڵپەڕکێدا، زۆر گورج و کارامە بوون، دەوریاندا، ودەستیان بە هەڵپەڕکیّ کرد. بەلاّم هەڵپەڕکیّ نەك گاڵتە! هەر چەندە پێیان بە عاردیدا دەکوتا هەر حەزت دەکرد تەماشایان بکەی. ئودیسیوس تەمەشای جوڵەی هونەریانەی قاچ و لەشی دەکردن و لە ناخی دڵەوە ئافەرینی دەکردن.

بەلاّم دیمودۆکوس–ی بەهرەمەند،کەوتە چەنگ لێدان و زەمینەو پێشەکی بۆ ئاوازەکەی خۆی خۆشدەکرد. گۆرانیەکەی بریتی بوو لە گێڕانەوەی چیرۆکی ئاشقێنی و ئەڤینداری نێوان ئەریسی خواوەندی جەنگ و ئەفرۆدێتی تاج بەسەری خوابانۆی ڤیان وجوانی. چۆن ئەم دووە بۆ یەکەمجار بە نهێنی لە جێگاکەی هیفایستوسدا، پێکەوە جووت بوون. چۆن ئەریس بەزەبری دیاری زۆر لە خشتەی بردبوو،وخەوتنگەی هاوسەریی هیفایستوسی بە توانای لەوتاندبوو. بەلاّم هیلیوس کە لە هەمێزی یەکتراو دەست لەملان دیتبوونی، خێراو یەکسەر هەواڵەکەی بە هیفایستوس گەیاندبوو. کە هیفایستوس ئەم هەواڵە ناخۆش و ترسناکەی بیست، زۆر تورە بوو. یەکسەر چوو بۆ کارگەی ئاسنگەریەکەی، سندانە گەورەکەی دەرهێناو لە جێگاکەی خۆی داینا. بە چەکوش کەوتە دروستکردنی زنجیرێکی یەکجار مکومی لە پچڕان نەهاتوو. تا ئەو جووتە دلْدارەی لەجێگادا توند پیّ ببەستێتەوە. دوای ئەوەی ئەو تۆڕەی دروستکرد، چوو بۆ ژووری نووستنەکەی خۆی کە تەختە خەوەکەی تیا بوو. تۆڕە ئاسنینەکەی بە هەرچوار دەوری تەختە خەوەکەدا بلاّوکردەوە،وبەشێکی زۆریشی بە بن میچەکەوە هەڵواسی بوو، وهێندە باریك بوو دەتگوت جۆلاّتەنەیە.وهێندە هونەرمەندانەو وەستایانە دروستی کردبوو، نەك هیچ کەسێك بەڵکو خواوەندانیش نەیاندەتوانی ببینن. پاش ئەوەی داووتۆڕەکەی بەتەواوەتی بە هەموو لایەکی تەختە خەوەکەدا بلاّوکردەوە، واخۆی نواند کە بەرەو دەڤەری لیمنوس، کە لە هەموو شوێنێکی تری بەلاوە ئازیزتر بوو، دەڕوات. ئەریس، کە دوورونزیك چاودێری هیفایستوسی دەکرد، هەر کە ئەو هونەرمەندو وەستا مەزنەی بینی، لە کۆشك وسەراکەی خۆی دووردەکەوتەوە، بەپەلە بەرەو ماڵەکەی هیفایستوسی بەنێوبانگ وەڕێکەوت، چونکە ئاگری ڤیان وهاوهەمێزی ئافرودێت هەڵّی گرتبوو. ئافرودێت، تازە لە ماڵی بابی، لە ماڵی کوڕەکەی کرونوس هاتبووەوەو گەیی بووە ژوورەوەو دانیشتبوو. ئەریس بەپەلە وەژوورکەوت، دەستی گرت وپێیگوت:

"هەستە گیانەکەم، وەرە با بچینە سەر تەختە خەوەکە، با لەوێ، بە کامی دڵ رابوێرین، لەزەتی هاوهەمێزیی بچێژین. هیفایستوس لە ئولەمپ نیە، پێم وایە تۆزێ لەمە پێش چوو بۆ لیمنوس، بۆ ناو سینتییە هۆڤیو زمان خوارەکان".

ئەریس ئەو قسانەی کرد، ئافرودێتش لە دڵەوە حەزی دەکرد لەگەڵی بخەوێ. هەردووکیان چوونە سەر جێگاکەو پێکەوە پاڵکەوتن، کەوتنە تۆڕەکەی هیفایستوسی هونەرمەندەوە،و نەیاندەتوانی بەهیچ کلۆجێ بجولێنو خۆیان دەرباز بکەن. سەرەنجام زانیان کە کەوتوونەتە داوێکی ئەوتۆوە کە رزگار بوونیان نیە. یەکسەر هیفایستوسی بەنێوبانگ هاتەوە، پێش ئەوەی بگاتە دورگەی لیمنوس، گەڕابووەوە. چونکە هیلیوس بۆیان چوو بووە کەمینەوەو هەموو شتێکی بۆ گێڕابووەوە.. بۆیە بە دڵێکی غەمگینەوە بۆ ماڵ گەڕابووەوە. لەبەر دەرگا وەستا بوو. یەجگار توڕە بوو. هاوارێکی ترسناکی کردبوو وهەموو خواوەندەکانی بانگ کردبوو، گوتبووی:

"ئەی زیوسی بابی هەمووما‌ن، ئەی خواوەندانی بەختەوەرو نەمر! وەرن، وەرن بۆ ئێرە تا بە چاوی خۆتان شتێکی پێکەنیناویو پڕ شەرمەزاری بدینن. بڕوانن، چۆن ئەفرۆدیتی، کیژی زیوس، لەبەر ئەوەی من لەنگم، خیانەتم لێدەکات. دەستی دەگەڵ ئەریسی وێرانکەردا تێکەڵ کردووە، چونکە ئەو جوانە، لاقی راستن،ومن شەلو ناتەواوم. بەلاّم من چی بکەم، ئەمە گوناحی من نیە، گوناحی دایكو بابمە کە بریا نەیان دەهێنامە ژیانەوە. وەرن تەمەشا بکەن بزانن چۆن ئەو دووە چوون لە جێگاکەی مندا پێکەوە بخەون. بەڕاستی ئەم دیمەنە ئازارم دەدات. پەستو خەمبارم دەکات. بەلاّم پێموایە ئێستا ناتوانن حاشا بکەن. درۆ بکەن. باوەڕ ناکەم، چەندیش تامەزرۆی یەکترین،حەز بکەن لەوەی زیاتر پێکەوە بنوون.. بەلاّم چاریان نیە، کەوتوونەتە تۆڕو داوەکەی منەوە،وهەر لەو تۆڕو داوەدا دەمێننەوە، تا بابی ئافرۆدێت، هەر هەموو ئەو جیازیو دیاریانەم دەداتەوە کە من لە پێناوی کیژە بێ حەیاکەیدا داومەتێ. راستە کیژەکەی جوانە، بەلاّم ژنێکی داوێن تەڕو بێشەرمە."

هەموو خواوەندەکان بە هاواری هیفایستوسەوە هاتن. لەبەر دەرگا بڕونزیەکەی خڕبوونەوە. پوسیدونی زەوی بە کوڵ، هرمیسی سوودبەخش، و ئەپۆلۆی نەگبەتی رەوێن، هەموو هاتن. بەلاّم خوابانۆکان لە شەرماو بۆ ئەوەی ئەو دیمەنە نەبینن، لە بارەگای خۆدا مانەوەو کەسیان نەهاتن. خواوەندانی موبارەك لەبەر دەرگاو دالانەکەدا وەستان. کە داوەکەی هیفایستوسی هونەرمەندیان بینی لە قاقای پێکەنینیان دا. پێکەنینێکی لە پەستاو وبێ بڕانەوە. هەریەکەو تەمەشای ئەوەی تەنیشت خۆی دەکردولە بەینی خۆدا دەیانگوت:

"نا، کاری نابەجێوخراپ بێ فایدەیە! لاواز بەهێز گیرۆدە دەکات. بڕوانە هیفایستوس، هەر چەند لەنگو بێ جورمو ناتەواوە، کەچی ئەریس، بەهێزترینو قۆچاغترین خواوەندی ئۆلەمپی، بەگیرهێناوە. بۆیە دەبێ ئەریس سزای خەتاو بێ ئەدەبی خۆی بدات."

لە کاتێکا خواوەندەکان بەو جۆرە قسانیان دەگەڵ یەکدی دا دەکرد، ئەپولۆی بە توانا، کوڕی زیوس، رووی کردە هیرمیسوگوتی:

"ئەی هیرمیس، ئەی کوڕی زیوس، ئەی پەیك و پەیامبەر، بەخشندەی خێروچاکە، تۆ ئەو خوایە حەزت نەدەکرد، بە دوو قۆڵی، لە یەك جێگەدا، دەگەڵ ئافرۆدێتی کڵاوزەڕدا بنوویت و رابوێری، ئەگەر کوت و زنجیریش بکرابای؟"

هیرمیسی پەیامبەر وەڵامی دایەوە: "ئەی ئەپولوی بەتوانا، ئەی تیرەندازی بێ وێنەو هاوتا، جا کوا ئەو بەخت و شانسەم هەبوایە! خۆزگە، ئێوەی خواوەندان و خوابانوان، جارێك منتان لە هەمێزی ئەفرۆدێتی کڵاوزەڕدا دیتبا، جا با بە کۆت و زنجیرێکی سێ قەدوسێ لۆ، بەسترا بامەوە!".

کە خواوەندەکان گوێیان لەو قسەیەی ئەپولۆ بوو، لە قاقای پێکەنینیان دا. بەڵام پوسیدون پێنەدەکەنی،ولێکدا لێکدا داوای لە هیفایستوسی هونەرمەندی نێودار دەکرد کە ئەریس لەو بەندە رەها بکات... بە دەنگی بەرز دەیگوت: "تۆ بەرەڵڵای بکە، ئازادی بکە، من بەڵێنت دەدەمێ، کە هەر زەرەرێکت کردووە، بەدڵی خۆت، لەسەر دەستی خواوەندانی نەمر بۆتی ببژێرێتەوە."

هەنگێ خواوەندی بەنێوبانگ، دەست رەنگین و مەچەك بەکار، بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"ئەی پوسیدون، ئەی زەوی بەشان، تۆ داوایەکی زۆر قورس لە من دەکەی. جارێ دەبێ دڵنیابین کە ئاخۆ ئەو بەد نیهادە پەشیمانە یان نا، چونکە بەدنیهادان بێبارن. باشە ئەگەر ئەریس ئازاد بوو، وزەرەرەکەی نەبژاردمەوەو رەڤی، من چۆن دەتوانم لە نێو خواوەندانی نەمردا، تۆ کۆت و زنجیر بکەم؟"

پوسیدون، هەژێنەری زەوی وەڵامی دایەوە:

"هیفایستوس، ئەگەر ئەریس زەرەرەکەی نەبژاردیتەوەو هەڵات، من زەرەرەکانت بۆ دەبژێرمەوە."

خواوەندی بەنێوبانگ، باسك و مەچەك قەوی بەرسڤی دایەوە: "ئەگەر وابێ، ناتوانم قسەی تۆ بشکێنم، چونکە گومان لە بەڵێن و پەیمانی تۆ ناکرێ".

هیفایستوسی بە توانا هەرکە لەو قسانە بووەوە، کۆت و زنجیرەکانی کردەوە. جووتە دڵدار هەر کە لە کۆت وزنجیرەکان کە تەواو شپرزەی کردبوون، خەلەسین، بە جووتە دەرپەڕین. ئەریس بۆ تراکیا هەڵات. ئافرۆدێتی جوان و دەم بەخەندەش بەرەو قوبرس، بۆ پافۆس، هەڵات. کە پەرستگەو قوربانگەی ئەوی لێبوو. کە بۆنی بوغوردی سەعاتە رێیەك دەڕۆیی. ئیدی لەوێ خوابانوانی جوانی بە پیریەوە هاتن. شۆردیان. زەیتی زەیتونی خواییان، لەو زەیتەی کە بەسەر لەشی خواوەندانی نەمرو جاویدانەوە دەچریسکێتەوە، تێهەڵسوو، ئەوجا جلی زۆر جوانیان لەبەر کرد، کە چاو لە دیتنی تێر نەدەبوو.

هۆنەروشایەری بەنێوبانگ، دیمودوکوس، بەو ئاوازوگۆرانییە، ئودیسیوس و هەموو فیاسیانی ئاشقە دەریاوانی وکەشتیرانی، ئەفسوون کرد.

## سەمای دوو قوڵی

دوای ئەوە ئالسینویوس، داوای لە هالیوس ولایوداماس کرد کە هەر هەردووکیان بڕەقسن. چونکە کەس نەبوو، هاوتایان بکاتەوە. ئەوسا تۆپێکی جوانی سووریان بە دەستەوە گرت، کە

پولوبوسی ژێرودانا بۆی دروست کردبوون. یەکێکیان خۆی بە پشتا شکاندەوەو تۆپەکەی بەرەو قولایی ئاسمان هەڵدا. ئەوی تریان خۆی هەڵدەداو لە ئاسماندا تۆپەکەی دەقۆزتەوە.. دوای ئەوەی لە بواری هەڵدان وگرتنەوەی تۆپەکەدا هونەرولێزانی خۆیان نواند، بە دوو قۆڵی کەوتنە رەقسین و هەڵپەڕکێ.. ئەوان پێیان بە زەوی دا،بەسەرچاوەی رزق و رۆزی دا دەکوتاو ئەو گەنجانەی کە لە دەوریان وەستا بوون، پێ بە پێی هەڵپەڕینەکەی ئەوان چەپڵەیان لێدەداو کردبوویانە هەراو هەنگامەیەك ئەوسەری دیار نەبوو.ئەوسا ئودیسیوسی بەردەبار رووی کردە ئالسینویوس وگوتی:

"ئەزبەنی، ئەی ئالسینویوسی بە توانا! ئەی ناوداری ناوداران! تۆ خۆت بەوەوە بادەدا کە ئێوە سەرتۆپی سەماکارانی دنیان، بەڕاستی هەقی خۆت بوو. چونکە کوڕەکانت سەلماندیان کە سەرتۆپی سەماکارانن. کە تەماشای جوانی رەقسەکەیان دەکەم، لە خۆشیا مەستی مەست دەبم".

## ئالسینویوس رێزی ئودیسیوس دەگرێت

ئالسینویوسی دلاوەرو بە توانا، بەو قسانەی ئودیسیوس کەیفخۆش بوو. رووی کردە فیاسیانی ئاشقە دەریاوانی وکەشتیرانی وگوتی:

"سەران و شیرەتکارانی فیاسی گوێبگرن، بزانن چ دەڵێم. بە مەزەندەی ئەقڵی من، میوانەکەمان پیاوێکی یەجگار بە ئاوەزوتەڕفامە. جا ئێمە دەبێ میوانپەروەری خۆمانی بۆ بسەلمێنین. دیاریوسەوقاتیەکی شایستەی پێشکەش بکەین. لەم ولاتەی ئێمەدا دوانزە سەرداری ناودارمان هەیە، ئەگەر خۆشیمان دەگەڵ حەساو بکەین، بە منەوە دەبین بە سیانزە. جا هەر یەکەو سەرو دەستە جلکی زۆر پاك وخاوێن و لەگەڵ یەك تالانت زێڕی گرانبەهادا بێنێ و، هەر هەمووی لێرە کۆبکەینەوە،وبە جارێ بیدەینێ، تا بەسەرودڵی خۆش شیوەکەی بخوات. سەبارەت بە (ئوریالوس)ش دەبێ هەم عوزرخوایی بۆ بێنێتەوەو هەم دیاریشی بداتێ. چونکە قسەی تاڵ و رەقی بەرانبەری کردووە".

هەر هەمووان قسەو پێشنیازەکەیان بەگەن کردو،خولامیان نارد کە دیاریەکانیان بۆ بێنێ. ئوریالوسش هەڵیدایەوگوتی: "ئەی ئالسینوسی بە توانا، ئەی ناوداری ناوداران، منیش فەرمانەکەی تۆ دەخەمە سەر سەرو ئەم میوانە ئاشت دەکەمەوە. ئەم شمشێرەی بە دیاری دەدەمێ، لە برونزی خالیسە دروستکراوە، دەسکەکەی زیوە، کێلانەکەشی لە عاجەو تازە دروست کراوە، ئەمە بۆ کەسێکی وەکو ئەو دیاریەکی نایاب و پڕبەهایە."

## ئودیسیوس دیارییەکی زۆر وەردەگرێت

هەرکە لە قسەکانی بووەوە، شمشێرەکەی پێشکەش بە ئودیسیوسی مەزن کرد. و رووی تێکردو گوتی: "سلاوت لێ بێ ئەزبەنی، داوای بوردن دەکەم. هیوادارم قسە تاڵ و رەقەکانم لە دڵ نەگریت. ئومێدەوارم لەگەڵ بادا بڕۆن و شوێنەواریان لە دڵت دا نەمێنێ. ئومێدەوارم خواوەندان یارو یاوەرت بن و بە سەلامەتی بگەیتەوە لای هاوسەرەکەت وبگەڕێیتەوە ولاتی خۆت. چونکە لە مێژە دەردی دووری کەس وکار دەچێژیت."

ئوديسيوسى بەردەبار وەڵامى دايەوە:
"لە ناخى دڵەوە سلاووردرود لە تۆش ئەى دۆست. بەختەوەرى تۆم لە خواوەندان داوايە. هيوادارم ئەم شمشێرەت، كە لەبرى قسە تاڵەكانت،داومەتىّ، لە دڵەوە دەرچووبىّ!".
كە لە قسەكەى بووەوە، شمشێرە زيوينشانەكەى كردە شانى. ئەوسا خۆر ئاوا بوو. هەموو ديارية گرانبەهاكانى بۆ گەيەنرانە ئەوێندەر. ئيدى خولاّمو نۆكەران لەوێندەرەوە بۆ كۆشكەكەى ئالسينويوس-يان گواستەوە. كوڕەكانى ئالسينويوس-ى بێوێنە، دياريية جوانەكانيان وەرگرتو برديان لەبەردەم دايكە بەڕێزو سەلارەكەيان دايان نان. ئالسينويوسى دلاوەرو بە توانا بەرەو ماڵەوە پێش جەماوەرى خەڵكەكە كەوت. هەر گەييشتنە نزيكى ئەو لەسەر كورسيانى بەرز دانيشتن، ئالسينويوسى دلاوەر بە ئاريتى گوت:
"ئافرەت، راسپێرە باشترينوگەورەترين سەندووق بێننە ئێرەو بە دەستى خۆت خاوێنترين دەستەجلكى تێبخە، پاشان مەنجەڵێك ئاو بنەنە سەر ئاگرو با بكوڵىّو ميوانەكەمان خۆى بشوات، تا پاش سەرو لەش شتنو وەرگرتنى هەموو ئەو ديارييانەى جەماوەرى ئابڕومەندى فياسى بۆ ئێرەيان بۆ هێناوە، تا بە دڵخۆشى شيڤەكەى بخواتو لەزەت لەو بەزمو گۆرانيانە وەربگرىّ كە لەسەر شەرەفى ئەو سازكراوە. منيش لەلاى خۆمەوە گەرەكمە ئەم جامە زێڕينە جوانەى بدەمىّ، تا هەر جارىّ لە كۆشكو تەلارە گەورەكەى خۆيدا قوربانى شەرابى پێشكەش بەزيوسوخواوەندانى ديكە كردو نۆشخوارى كرد، يادى من بكاتەوە.

## ئوديسيوس دياريييەكان دەخاتە سەندووقێكى مكومەوە

هەركە ئالسينويوسى دلاوەر لە قسەكانى بووەوە، ئاريتى ئەمرى بە كەنيزو قەرەواشەكانى كرد كە بەپەلە مەنجەڵێكى گەورە بنەنە سەر ئاگر. كارەكەرەكان دەست بەجىّ سێكوچكەيەكيان هێنا، ئاگريان كردەوە. مەنجەڵيان خستەسەر، ئاويان تێكرد،وچيلكەو داريان ژێردا، ئاگر بە نێڵە نێڵ بە هەرچوار دەورى مەنجەڵەكەدا بەرز دەبووەوە،و ئاوەكە دەهاتە كوڵ. لەو ماوەيەدا ئاريتى سەندووقێكى يەكجار جوانى لە ژوورەكەى خۆى، بۆ ميوانەكە هێنا. دياريية جوانەكانى، ئەو جلو بەرگو زێڕو زێوەرانەى خەڵكى فياسى پێيان دابوو، لە سەندووقەكە نان،ولەلايەنى خۆشيەوە دەستىّ جلكى جوانوتازەى بۆ تێنا،وبە دەنگى بەرز پێيگوت:
"وەرە بە خۆت سەرى سەندووقەكە قايم بكە، بەپەلە بە گوريسێك توند شەتەكى بدە. نەبا لەسەر كەشتيية بۆر خەو بتباتەوەو لە رێگە لێتى بدزن."
ئوديسيوسى مەزنو بەردەبار كە گوێى لەو قسانە بوو، بەلەز هەستاو سەرى سەندووقەكەى توندكرد. بە پەلە پەتێكى لە دەورى پێچا،وگرێيەكى وەستايانەى لێدا. ئەو جۆرە گرىّ لێدانە لە كيركى موبارەكەوە فێر بووبوو. ئەوسا كەيبانۆى ماڵ، پێيگوت كە گەرماو ئامادەيەو بچێت خۆى بشوات. كە چاوى بە حەمامى گەرم كەوت زۆر دڵى خۆش بوو. چونكە لەو ساوە كە لە ماڵى كاليپسوى كەزيە جوان وەدەركەوتبوو، شتى واى بە خۆيەوە نەبينى بوو. بەلاّم تا ئەو رۆژەى لە ماڵى كاليپسۆ بوو، كاليسپو هەميشە وەكو خواوەندێك پێى رادەگەيىوخزمەتى دەكرد.

## نوسيكا خواحافيزى لە ئوديسيوس دەكات

پاش ئەوەی کەنیزوقەرەواشان شتیانوزەیتی زەیتونیان لە بەدەنی هەڵسو،ودەستێ جلکی جوانیان لەبەر کرد، لە گەرماوەکە هاتە دەرێو یەکرێ بەرەو مەجلیسوکۆڕی بادەنۆشان رۆیی. نوسیکا، کە لە جوانیوخشیکیدا گرەوی لە خواوەندان دەبردەوە، هات لە پاڵ دەرگای ژوورەکەدا راوەستا. کە چاوی بە ئودیسیوس کەوت، زۆری چووە دڵەوە. ئەوجا بە دەنگی بەرز گوتی:

"بە دوعا غەریبۆ، هیوادارم کە گەیشتییەوە وڵاتی خۆت، من لە بیر نەکەی. چونکە تۆ بە روح قەرزارباری منی، من یەکەم کەس بووم کە فریات کەوتم."

ئودیسیوسی بەردەبارو دووربین بەرسڤی دایەوەوگوتی:

"نوسیکا، ئەی کیژی ئالسینویوسی جوامێر، ئەگەر زیوسی بروسکەوان، مێردی هیرا، ئەوەم لەگەڵ بکاتو بگەمەوە ماڵو وڵاتی خۆم، رۆژی گەڕانەوە بە چاوی خۆم بدینم، لەوێ هەموو رۆژێك، وەکو چۆن نوێژ بۆ خواوەندێك دەکەم، بەو ئاوایە نوێژو نزا بۆ تۆ دەکەم. چونکە ئەی کیژی لاو، من بە روح قەرزارباری تۆم، تۆ ژیانت کڕیمەوە."

## ئودیسیوس هاوسۆزی دەگەڵ شایەرەکەدا دەکات

ئودیسیوس،دوای ئەو قسانە، چوو لە نزیکی ئالسینویوس شا، لەسەر کورسییەك دانیشت. ئەوسا خولامو پێشخزمەتان چێشتوگۆشتیان دانا. بادەو شەرابیان تێکرد. یەکێك لە دەستوپێوەندان، هاتو هۆنەرو شایەری وەفادار، دیمودۆکۆسی، کە مایەی رێزو حورمەتی خەڵکەکە بوو،دەگەڵ خۆدا هێنا،لە ناوەڕاستی میوانەکاندا دای نیشاندو پشتی دا بە پایەیەکی بەرزەوە. هەنگێ ئودیسیوسی دووربینوبەردەبار، پارچەیەك پشتە مەغزەی چەوری، لە بڕبڕەی پشتی بەرازە کێویەکی شفرە سپی کردەوەو دایە پێشخزمەتەکەو پێی گوت: "ئەی پەیامبەر، ئەم پشتە مەغزەیە بدە بە دیمودۆکۆس با بیخوات. هەرچەندە زۆر پەستو غەمگینم، قەسیدەو گۆرانیەکانی زۆریان خەمبار کردم، بەڵام من رێزوسلاوم بۆی هەیە. شایەرانوهۆنەران لەلای هەموو خەڵکی سەر رووی زەوی شایستەی رێزوحورمەتن،.چونکە خواوەندی شیعر بەسەری کردوونەتەوە وفێری گۆرانیو ئاوازی کردوونوتیرەی شایەران وئاوازخوانانی خۆش دەوێ."

کە لە قسەکەی بووەوە، کابرای پەیامبەر گرتکە گۆشتەکەی لێوەرگرتو دایە دەست دیمودۆکۆسی خودائاسا. دیمودۆکۆس بەوپەڕی شادیەوە وەریگرت. میوانەکان دەستیان بۆ خواردنەکانی بەردەمیان برد. کە لە خواردنوخواردنەوە بوونەوە، ئەوسا ئودیسیوسی دووربینو بەردەبار رووی کردە دیمودۆکۆسوگوتی: "ئەی دیمودۆکۆس، من رێزی زۆرم بۆ تۆ هەیە، هیچ کەسێك لە دنیادا هێندەی تۆ ئەفسوونودڵبەندی نەکردوم، ئەوەی تۆی فێری ئەم گۆرانیانە کردووە، یان دەبێ خوابانۆی شیعر، کیژەکەی زیوس بێ یان ئەپولۆ بێ. چونکە هێندە وردو دروست،راستو رەوان سەربورو بەسەرهاتو نەگبەتیو بەدبەختی ئاخاییەکان دەگێڕیتەوە، وەکو ئەوەی تۆ بە خۆت لەگەڵیان بووبی، یان یەکێك لەوانەی لەگەڵیان بووە، بۆی گێڕابیتەوە. جا ئێستا ئاوازەکەت بگۆڕە، بەیتێکی ترمان بۆ بڵێ. بەیتی ئەسپەدارینەکە بڵێ، کە ئیپیوس بە هاوکاریو یارمەتی ئەتینا دروستی کرد. ئەو ئەسپەی کە ئودیسیوس، پڕی کرد لەو شەڕڤانانەی کە ئیلوسیان وێرانو تالان کردو، بە فێڵ بردییە ناو قەڵای شارەوە. ئەگەر ئەم بەیتە

بە هەموو وردودرشتەکانیەوە وەکو خۆی بێ کەمو زیاد بڵێی، ئەوا من لە بەردەم هەموو ئەم پیاوانەدا ئیعتراف دەکەم کە یەکێك لە خواوەندەکان بە لوتفی خۆی بەهرەو ئیلهامی ئەم ئاوازە یەزدانیەی بە تۆ بەخشیوە."

## ئودیسیوس داوای بەیتی ئەسپە دارینە دەکات

کە ئودیسیوس لە قسەکانی بووەوە، دیمودۆکۆسی ئاشقوشایەرو هۆنەر، بە ئیلهامی یەکێك لە خواوەندەکان، هەڵیکردە گۆرانی. لەو دەمەوە هێنای کە ئارگۆسییەکان، دوای ئەوەی خەرگەو سەراپەردەکانیان سوتاندبوو وسواری کەشتییە قوڵو بتەوەکانیان بوو بوون ودەڕۆییشتن. ئەوانی دی لەگەڵ ئودیسیوسی ناوداردا، چوو بوونە ناو ئەسپەکەوەو دەرگایان لە خۆ داخستبوو، و گەیی بوونە ناو قەڵای تەروادەییەکان. چونکە تەروادەییەکان بە خۆیان ئەسپەکەیان بردبووە ناو قەڵاکە. ئەسپەکە لەو بەرزییە وەستا بوو، تەروادەییەکان دەوریان دابوو.گەنگەشەو راوێژی ئەوەیان بوو، بێئەوەی بگەنە بڕیارێکی بنجڕ، کە چی لەم ئەسپە بکەن. سێ بۆچوونی جیاوازو هەڤدژ هەبوو: یان ئەم تەختە ناو بۆشە بە نێزەی بڕونزی دیواودەر کون بکەنو شەقو پەقی بکەن، یان بیبەنە سەری سەرەوەو لەوێندەرەوە هەڵیدێرن، یان وەکو دەسکەوتورەمزێکی رزگاریی وسەرکەوتن لەلایەن خواوەندانەوە، دەستی لێنەدەنو هەر لەو شوێنەدا بیهێڵنەوە.لە ئەنجامدا سێیەمین بۆچوونیان بەگەنکردو قرێریان لێدا.. هەر دەبوایە وابێ.چونکە قەدەرو چارەنووسی شار ئەوە بوو. هەرکە ئەو ئەسپەدارینە بچێتە ناو شارەوە، وێران ببێ. چونکە ئازاترین شەرڤانانی ئارگوسی خۆیان تیادا لە بۆسە دابوو. ومەرگو وێرانیان بۆ تەروادەییانو شاری تەروادە پێبوو. ئەوسا دیمودۆگۆس بە دەنگو ئاوازی دڵگیر ئەوەی گێڕایەوە کە چۆن کوڕانی ئاخیایی، لە ئەسپەدارینەکەوە دەرپەڕینو شاریان وێرانو کاول کرد. ئەوەی گێڕایەوە کە چۆن شەرڤانانی ئاخیایی بەناو شار کەوتن. لە هیچ شتێك نەدەپرینگانەوە، شەلم کوێرم هیچ نابوێرم، شاریان کاولو تاڵانیان دەکرد. بەڵام سەبارەت بە ئودیسیوس، ئەوەی گێڕایەوە کە چۆن وەکو ئەریس، دەگەڵ مینیلاوسی خواوەند ئاسادا، یەکڕاست بۆ ماڵی دایفوپوس رۆیی بوو، وچۆن لەوێ تووشی دژوارترینوترسناکترین شەڕ بوو بوو، ولە ئەنجامدا بە یارمەتی ئەتینای مەزن، سەرکەوتبوو.

## گریانی ئودیسیوس، ئالسینویوس دەخاتە گومانەوە

ئاشق وشایەری ناودار ئەو گۆرانیەی گوت. کاری لە ناخی دڵی ئودیسیوس کرد. دڵی پڕ بوو، فرمێسك خوڕ خوڕ بە چاویا دەهاتە خواریو سەر گۆناکانی تەڕ دەکرد. وەکو چۆن ژنێك، بەسەر تەرمی نیوەگیانی خڵتانی خوێنی مێردەکەیدا، دابنەوێتەوەو بگریوخۆی بڕنێ، مێردێك کە لە پێناوی بەرگری لە خاكوخەڵکی وڵاتو شارەکەیدا نیوە گیان کەوتووەو لە ئاوزینگو ئاویلکەو سەرە مەرگدایەو ژنەی تاین باوەشی پێدا کردبێ، وشینو شەپۆری بۆ بکاتو دژمن لە دواوە بەر سەر نێزەو رمانی دەدەنو بە کۆیلەیەتی دەیبەن، تا دەردو تاڵاوی رۆژرەشی بچێژێت، رومەتو گۆناکانی لە داخو کەسەراندا بژاکێنوسیس هەڵگەرێن، (ئودیسیوس)ش بەو ئاوایە فرمێسکی چاوانی دەباراند. بەڵام کەس هەستی بە فرمێسکەکانی نەکرد تەنیا ئالسینویوس نەبێ، کە لە

نزیکی ئەوەوە دانیشتبوو، هەستی پێکردبوو وگوێی لە هەنسكو ناڵەی بوو بوو. یەکسەر رووی کـــردە ئـــاپۆڕای فیاســـیانی ئـــەهلی سەوڵوکەشـــتیرانیو دەریـــاوانیو گـــوتی: "ئەی سەرانو شیرەتکارانی فیاسی، گوێبگرن، بە دیمودۆکۆس بڵێن، با ئەم گۆرانیە رابگرێ. چونکە خەڵکێك هەیە زۆری لە دڵ گرانە. لەوساوە کە دەستمان بە شیڤ خواردن کردووەو، هۆنەرو شایەرەکەمان کەوتووەتە گۆرانی، ئەم میوانەمان لە یەکبینە دەگری.پێموایە خەمێکی یەجگار گەورەی لە دڵدایە. بۆیە با شایەرەکەمان بوەستێ.تا هەموومان خانەخوێو میوان وەکو یەكو پێکەوە خۆشی لەم ئاهەنگوبەزمە بدینین. بۆ هەموومان وا باشترە. چونکە هەرچیەکمان کردووە، لە ئاهەنگو بەزم، لە ناردنی خەڵك لەگەڵیا، لە دیاریوسەوقاتی، هەر هەموویمان لەسەر شەرەفو لەبەرخاتری میوانە ئازیزەکەمان کردووە. ئەمەش هیچ منەتێکی تیا نیە، هەرکەسێك بە ئاستەم شعوری هەبێ ئەوە دەزانێ کە دەبێ وەکو برا،وبرایانە رەفتار دەگەڵ میوانوغەریب دا بکات... جا تۆش لەلای خۆتەوە، رێكوراست، بێ پێچو پەنا، بێ ترسو دوو دڵی وەڵامی ئەو پرسیارانەم بدەوە کە لێتی دەکەم. بۆ تۆش واخۆشترە بەڕاشکاوی وەڵام بدەیتەوە. ناوت چیە؟ لە وڵاتی خۆتا، خەڵکی بەچی بانگیان دەکردیت، دایكو بابت، کەسوکارت، دەرودراوسێ، خەڵکی شارەکەت، خەڵکی دەوروبەر بەچ ناوێك بانگیان دەکردیت؟ لای ئەوان ناوت چی بوو؟ چونکە هیچ بەشەرێك، چ خانەدانو چ هەژارو رووتە بەبێ ناو نابێ. چونکە دایكو باب کە منداڵ دەخەنەوە ناوێکی لێدەنەن. هەروەها ناوی وڵاتەکەت، میللەتەکەتو شارەکەتم پێ بڵێ، تا بتوانین، بە کەشتییەکانمان، کە هۆشیان هەیە، بۆ ئەوێندەرت بنێرینەوە.کەشتییەکانی ئێمە میناکی کەشـتییانی تـر کاپتنوسـەوڵو سـوکانیان نیـە، بـە خۆیـان بیرونیـازو مەبەسـتی خـەڵکی دەخوێننەوەو حاڵی دەبن. هەموو شارومەزراو کێڵگە بەپیتو بەرەکەتەکانی دنیا دەزانن. هەموو گەلو نەتەوەیەکی دنیا دەناسن. زۆر بە خێرایی گێژاوو گەرداوو پێلانی دەریایان، هەرچەندە تەمو مژیش دای گرتبێ، دەبڕن. هەرگیز ترسی غەرق بوونو شکانو داغان بوونیان نیە. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمەشدا، لە بیرمە بابم، ناوسیتوس، کاتی خۆی زۆرجار دەیگوت، پوسیدون، بەغیلی ئەوەمان پێدەبات کە هەموو جارێ بە ئاسانیو بە سەلامەتی خەڵکی بەڕێدەکەینو بە دەریادا رەوانی دەکەین. دەیگوت رۆژێ دێ، کە کەشتییەکی فیاسیان لە بەڕێکردنی بێگانەیەك دەگەڕێتەوە، پۆسیدون تێکی دەشکێنێو شارەکەمان، لە دەریا دادەبڕێو دەخاتە ناو بازنەی کۆسارێکی بەرزەوە. ئەو پیرەمێردە ئەو قسەیەی دەکرد. جا ئەمەش وەستاوەتە سەر ئارەزووی خودا خۆی، کە ئەم پێشبینییە بهێنێتە دی یان نا. دەی ئێستا بە راشکاویو بێ پەردە پێم بڵێ تا کوێ لە دەریادا وێڵو سەرگەردان بووی، چ وڵاتانێکت دیتوون، باسی خەڵکی ئەو وڵاتانە، باسی شارەکانیان بکە. کێیان هۆڤیودڵڕەقو ستەمکارن. کێیان غەریبدۆستو میوانپەروەرو خوانـاسو لـە خـوا ترسـن؟ پـێم بڵـێ بۆچـی کـە گوێـت لـە لاوكوبەسـەرهاتی بەدبـەختیو نەگبەتیـەکانی داناییـانو ئارگۆسـیانو ئیلـۆس دەبێـت، بەدزییـەوەو لـە دڵـی خۆتـدا دەگـریو دەناڵێت؟ ئەمە کاری خواوەندانە، بۆیە مەرگو ماڵوێرانیان بەسەر ئەم خەڵکەدا هێناوە، تا نەوەکانی داهاتوو، بە بەیتوداستانان، بە ئاوازوگۆرانی بیگێڕنەوە. باشە هیچ خزمێکی نزیکت

له تەروادەدا تیاچووە. بۆ نموونە زاوایەکت یان خەزورت، ئاخر ئەوانە پاش پەیوەندی خوێن، بە خزمی نزیك دادەنرێن.. یان هاوڕێیەکی دلاوەری ئازاو خۆشەویستو دڵسۆزت لەوێندەر تیا چووە؟ چونکە هاوڕێی باشودڵسۆز بۆ بنیادەم لە برا عەزیزترە."

***

## پەراوێز:

*- ئەریس: یەکێکە لە خواوەندەکانی ئوڵەمپ، کوڕی زیوسو هیرایە. خواوەندی جەنگە، زۆری کەیف بە هەراو هەنگامەی کوشتار دێت. بەدیتنی خوێنوکوشتو کوشتار گەشکە دەکات.

*- کیرکی: جادوبازێکی ئاکنجی دوڕگەی (ئیایا)یە. کە ئودیسیوس ڕێی دەکەوێتە ئەوێندەر.

## سروودی نۆیەم

### کورتەیەکی سروودەکە:

ئودیسیوس پاش ئەوەی ستایشێکی فرەی گۆرانیەکەی دیمودۆکۆسی هۆنەرو شایەر دەکات، ناوی خۆی ئاشکرا دەکاتودەست بە گێڕانەوەی واریقاتو بەسەرهاتەکانی خۆی لەو رۆژەوە کە لە شاری تەروادە دەگەڕێتەوە، دەکات.. ئەم داستانو بەسەرهاتە چوار سروود دەگرێتەوە کە تەوەرەو کۆڵەکەی ئەم بەیتە پێك دێنێت. هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دەورە گرینگەی ئەم دەریاوانە زەبەردەستە لەو بەیتەدا هەیەتی... دەگاتە کەنارەکانی تراکیا، شاری ئیسمارۆس تالان دەکات، کە لە گەڕانەوەدا سیکۆنەکان پەلاماری دەدەن، ناچار بە سواری کەشتی هەڵدێت.لەو کاتەدا کە ئودیسیوسو هاوڕێکانی دەیانەوێ بە دەوری دەماغەولوتکەی مالی دا بسووڕێنەوە، گەرداوێکی ناسازگار هەڵدەکاتودەیبات. دوای نۆ رۆژ دەریاوانیی سەختو دژوار، لەلای لوتسخۆرەکان دەگیرسێنەوە.هەرکەسێك لەم لوتسە بخوات، ئیدی ئارەزووی گەڕانەوەی لەلا نامێنێ،و خاكوخەڵکی وڵاتی لە بیر دەچێتەوە. بۆیە دەیەوێ بەپەلە لەم دەڤەرە لە بیرکراوە بڕوات. دەگاتە دوورگەیەك کە رێك بەرانبەر بە دەڤەرومەڵبەندی سیکلۆپانە. یازدە کەشتی لە کەشتیەکانی لەوێ دادەنێت. بە کەشتییەکەی خۆیو دوانزە کەس لە هاوڕێکانیەوە دەڕواتو دەگاتە ئەشکەوتو دەخمەکەی پولیفوموسی دێو، کە غەوارەو غەریبان دەخواتو لە ماوەی دوو رۆژدا شەش کەس لە هاوڕێیانی ئودیسیوس دەخوات.. بەڵام لە شەوی دووەمدا ئودیسیوس بە زیرەکیو لێزانی خۆی دەتوانێ مەستی بکاتو تاقە چاوەکەی دەردێنێ. بۆ سبەینێ دەگەڵ باقی هاوڕێکانیا سواری کەشتییەکەی دەبێتو هەڵدێنو دێوەی کوێرو کۆڵەوار لە ناوەندی دەریادا بە تاقی تەنێ بەجێدێڵنو دێوە چەند هەوڵدەدات بە تاشەبەردان کەشتییەکەیان تێك بشکێنێ، ناتوانێ. بۆیە هاوار بۆ پۆسیدونی بابی دەکات کە قاروغەزەب لە ئودیسیوس بگرێت.

***

### ئودیسیوس بەسەرهاتوریسکەکانی خۆی دەگێڕێتەوە

**هەنگێ ئودیسیوسی بەردەبارو زانا وەڵامی دایەوەو گوتی:**

"ئەی ئالسینویوسی بە توانا، ئەی ناودارترین ناوداران، زۆرم پێخۆشە کە گوێ لە هۆنەرو شایەرێکی گەورەی دەنگخۆشی دەنگ خوایی وەکو ئەم شایەرە دەگرم. لەوەش خۆشتر ئەمەیە کە دەبینم ئەم هەموو خەڵکە، ئەم هەموو میوانە، لێرەدا، لەم کۆشکە گەورەیەدا، کۆبوونەوەتەوە ،بەوپەڕی خۆشی وشادی گوێ لە گۆرانی دەگرن. بە ریز دانیشتوون و خوانی رازاوەو ئاوەدان بەنان و گۆشت لە بەردەمیاندا دانراوە. ساقی بە قەرابەوە بە سەریاندا دەگەڕێ و بادەیان بۆ لە جامان دەکات. ئەمەم بەلاوە جوانترین دیمەنە. دیمەنێکە کە لە بیر ناچێتەوە. جا کە تۆ مەیلت لێیە، باسی بەسەر هات و مەینەتیەکانی خۆمت بۆ بگێرمەوە، هەرچەندە بەمە زامی کۆن و نوێم دەکولێنەوەو کونی فرمێسك و گریانم بەر دەبێت. نازانم ئەم بەیت وچیرۆکە لە کوێوە دەست پێ بکەمو لە کویێ کۆتایی پێبێنم؟ چونکە خواوەندانی ئاسماننشین مەگەر هەر خۆیان بزانن، چ بەڵاو مەینەتیەکیان بەسەرا داوم. جاریێ با نێوی خۆمت پێ بڵێم، تا تۆش بیزانی، وتا ئەگەر رۆژێ لە رۆژان لە بەڵاومەینەتان قوتار بووم،و تەمەن مەودای دام، وەکو دۆستێکی دڵسۆز بێمە میوانیت، با لە ولات ودەڤەرێکی دووری ئێوەش بژیم. من ئودیسیوس، کوڕی (لایرتیس)م، بە دووربینی و بەردەباری وخۆشڕەفتاری بە نێوبانگم، شکۆوسەرفرازیم گەییوەتە ئاسمان. لە ئیتاکادا دەژیم. چیایەکی لێیە بە نێوی نیریتون، چیایەکی چڕە دارستانی بەرزە. کە با، لق و پۆپی درەختەکانی دەهەژێنێ، لە دوورەوەو لە نێو دەریاوە سەمای ترۆپکی درەختەکان دەبینرێ. کۆمەڵە دوڕگەیەکی زۆر لێکدی نزیك، دەوریان داوە، لەوانە: دولیخیوم، سامی، و زاسینتوس کە لێرەوارێکی چوغورد دای پۆشیوە. جا ئیتاکا لەو بەینەدا، کەوتووەتە نزماییەوە، نزمترین دوڕگەیە لە دەریاداو لە هەموو دوورگەکان دوورترەو روو لە خۆرئاوایە. بەڵام دوڕگەکانی دی لێکدی دوورن و روو لە رۆژهەلاتن. ئیتاکا دوڕگەیەکی بەردەلانی پڕ گاشەیە، بەڵام مەڵبەندێکی لاو پەروەری یەجگار باش ولە بارە.

سەبارەت بە من، هیچ شوێنێکم پێ لەو ولاتە، لە ئیتاکا جوانتروخۆشتر نیە. چونکە کالیپسو، خوابانۆی ناودار، زۆری هەوڵدا لای خۆی، لە ئەشکەوتە گەورەکەی خۆیدا گلم بداتەوە، شووم پێبکات، هەروەها (کیرکی) جادوکەریش، خانمو گەورەی ئیایا، دەیویست لەلای خۆیم گل بداتەوە، زۆری حەز دەکرد مێردم پێبکات، بەڵام نەیانتوانی قەناعەتم پێبکەن. چونکە هیچ شتێك لەلای مرۆڤ، لە نیشتمان ولە داك و باب خۆشەویست ترو ئازیز تر نیە. تەنانەت ئەگەر ئەو مرۆڤە، لە دووری ئەوان، لە ولاتێکی بێگانەدا، لە ماڵێکی زۆر دەوڵەمەندو ئاواو ئاوەدانیشدا بژی، هەر ولاتی خۆی پێخۆشترە. بە هەرحاڵ، با واز لەمە بێنین، من ئێستا بەسەرهاتی گەڕانەوەی خۆمت لە تەروادە بۆ دەگێڕمەوەو باسی ئەوەت بۆ دەکەم کە چۆن بە ئیرادەی زیوس لەو رۆژەوە کە لە تەروادە بەڕێکەوتم، هەزارویەك بەڵاو مەینەتیم بەسەردا هات.

## شەڕی ئودیسیوس وسیکونەکان

کە لە ئیلوس دەرچووم، ئیدی گەرداوو زریان هەڵیگرتم، بردمی و لە نزیکی سیکونەکانی ئیسمارۆس گیرسامەوە. لەوێ شارمان وێران و تالانکرد. پیاوانی شارمان کوشت. ژنانمان هەڵگرت. هەموو سامان و داراییەکی شارمان بردو بە جۆرێ بەسەر خۆماناندا دابەشکرد کە

هیچ کەس گلەیی نەبێت. ئەوسا من ئامۆژگاری هاوڕێکانم کرد، کە واچاکە تا زووە، باروبنە بپێچینەوەو هەڵێین. بەڵام پیاوەکانم لەبەر کەودەنیوکاڵفامی خۆیان، بە گوێیان نەکردم. لەوێ مانەوەو دەستیان بە خواردنەوەیەکی بێ ئەندازە کردو ئیدی لە سەرانسەری کەنارەکەدا کەوتنە کوشتنەوەی بەرخە نێرو گای دابەستەو قەڵەو. جا لەم بەینەدا سیکۆنەکان، دادی لێقەومانی خۆیان بردبووە لای سیکۆنانی دیکەی دەرودراوسێیان، ئیدی ژمارەیەکی یەکجار زۆرو ئازامان بۆ هاتن. لە شەڕوشەڕڤانیدا کارامەو لێزان بوون. دەیانتوانی بە گوێرەی وەزع و حاڵ هەم لەسەر گالیسکانەوە شەڕبکەن و هەم بە پیادە. ئیدی بەیانیەکی زوو لە شکرێکی زۆریان، وەکو گەڵاو گوڵی درەختان لە بەهارا، هێرشیان بۆ هێنایین. لەولاشەوە زیوس لێمان چوو بوو بە قیناو بەڵاو نەگبەتیەکی ترسناکی بەسەردا نازڵ کردین. سیکۆنەکان، زۆر بە ڕێک و پێکی و زاکونی، لە نزیکی کەشتییە تیژ رۆکانمانەوە دەستیان بەشەڕ کرد. ئیدی هەردوولا کەوتینە شەڕە نێزان. تا رۆژ بوو، ودنیا رووناك بوو، وێرای ئەوەی کە ژمارەیان لە ئێمە زیاتر بوو، بەرەنگاریان دەبوینەوەو بەرپەرچی هێرشەکەمان دەدانەوەو راویشمان دەنان. بەڵام کە لەشکری رۆژ بەرەبەرە مەیدانی بۆ لەشکری شەو چۆڵ دەکرد، ئێمە دامانەوە کەندێ و سیکۆنەکان بە سەرماندا زاڵ بوون. ئاخاییەکانیان شکاند.ولە هەر کەشتییەکدا شەش کەسیان لە هاوڕێ شەڕڤانە هەرە ئازاکانی من کوشت. ئێمەش هەڵاتین،و بە گوێ پچڕ گوێ پچڕ خۆمان لە مردن رزگار کرد.

## شەڕی ئودیسیوس دەگەڵ شەپۆل و زریاندا

بەپەلە بەناو دەریا کەوتین. لەلایەکەوە خەمباری لە دەستدانی هاوڕێکانمان بووین و لەلایەکەوە بەوە دڵخۆش بووین کە لە مەرگ خەلەسیوین. بەڵام لەو ناوە دوور نەکەوتینەوە تا سێ جاران بانگی هەر یەکێك لە هاوڕێ کڵۆڵەکانمان نەکرد کە سیکۆنەکان، لە کەناری دەریاکەدا کوشتبوویانن. ئەوسا زیوس، زیوسی هەورەوان، سێڵاووزریانێکی بەترەڤ کرد بەگژ کەشتییەکانماندا. بەڕو بەحر بەجارێ لە تەمومژدا نقوم بوو، بوو بە تاریکستانێك چاو چاوی نەدەبینی. شەو لە ئاسمانەوە هەڵدەقولا. کەشتییەکانمان دایە دەم باوە، زریان و بایەکی هێندە بە قوەت بوو، بادەوانەکان، پارچە پارچە بوون. لە ترسا، بادەوانەکانمان کردەوەو بردمان لە نێو کەشتییەکان تەقەتمان کردن. ئەوجا بەرەو وشکایی کەوتینە سەوڵ لێدان. دوو شەو ودوو رۆژی تەواو، هیلاك و ماندوو،ودڵ پڕ لە خەم لەوێ ماینەوە. بەڵام هەرکە سپێدەی کەزی جوان، مژدەی لە دایکبوونی رۆژی سێیەمی راگەیاند، بورجەکانمان دانایەوە، بادەوانی سپیمان هەڵکرد،و هەر کەسەو جێی خۆمان لەسەر کەشتییەکان گرت، وکەشتییەکانمان بە کەشتیوانەکان و بایەکە سپاردو بڕۆ. لەوە بوو زۆر بە سەلامەتی بگەمەوە مەفتەن و وەڵاتی خۆم، کە لە پڕ شەپۆل و گەرداوو زریان وبای باکور، لەودەمەدا کە بەدەوری دەماغەی مالیدا دەسوڕامەوە، هێرشیان بۆ هێنام و گومڕایان کردم و لەو دیوی دورگەی ستیریادا وێڵ وسەرگەردان خۆم بینییەوە.

## ئودیسیوس لە وڵاتی لوتس خۆران دا

ئیدی نۆ دانە رۆژی تەواو، گێژاو وزریان بەناوجەرگەی دەریای کەفچەڕینی پڕ ماسیدا بردینی. رۆژی دەیەم گەییشتینە وڵاتی لوتس خۆران. ئەمانە خواردنیان روەك وگوڵانە. لەوێ لەنگەرمان

گرت، ئاوی سازگارمان خواردەوە. هاوڕێکانمان لە کەنارەکەداو لە نزیکی کەشتیەکانەوە نانیان خوارد. پاش ئەوەی نان‌وئاومان خواردو خواردەوە، دوو کەسم لە هاوڕێکانم هەڵبژارد کە بڕۆن تاقیب بکەن بزانن چ قەومێکی نانخۆر لەوێندەر دەژین. دوایی پەیك‌و پەیامبەرێکیشم بەگەڵ خستن‌و بوون بە سێ کەس... یەکسەر ڕۆیشتن‌و تووشیان بوو بە تووشی خێڵی لوتس خۆرانەوە. ئەو لوتس خۆرانە هیچ هەوڵێکی کوشتنی هاوڕێکانیان نەدابووم، بەڵکو گوڵی لوتس–یان دابوونێ کە بیخۆن. ئەم گوڵە زۆر بە لەزەت بوو، شیرین بوو بە وێنەی هەنگوین. هەر کەسێك بیخواردایە ئیدی ئارەزووی گەڕانەوەی لەلا نەدەماو خەمی ئەوەی نەدەبوو هیچ هەواڵێك بۆ هاوڕێکانی بەرێتەوە. بەڵکو حەزی دەکرد لەوێندەر، لە نێو خێڵی لوتس خۆراندا بمێنێتەوەو بە هیچ جۆرێ وڵات‌و گەڕانەوە بۆ وڵاتی لە بیر نەدەما. بۆیە کە بەتۆبزی بۆ ناو کەشتییەکانم هێنانەوە، کوڵی گریانیان لە جۆش نەدەکەوت. رامکێشان‌و خستنمە کەشتییەکەوەو لە ژێر کورسیەکاندا بەستمنەوە، ئەوسا فەرمانم بە هاوڕێکانی ترم دا کە بە پەلە سەرکەون‌و بڕۆین، تاکەسی تریان لوتس نەخوات‌وگەڕانەوە بۆ وڵات فەرامۆش بکات. یەکسەر سوار بوون‌و جێگەی خۆیان گرت، کە تەواو ئامادە بوون، کەوتنە سەوڵ لێدان بەناو دەریای کەفچەڕینی شین‌ومەنگدا.

## ئودیسیوس دەگاتە وڵاتی سیکلوپان

بە دڵێکی پڕ لە خەم‌و پەژارەوە لەوێندەر بەرێکەوتین. گەیینە مەڵبەندی سیکلوپان. ئەمانە قەومێکی هێڕو گوێ نەبیست‌و دێو ئاسان. و پابەندی هیچ داب‌و نەریت‌و یاساو رێسایەك نین، و تەوەکەل بە خواوەندانی جاویدان دەژین. هیچ کارێك ناکەن. نە رووەك‌و دانەوێڵە دەڕوێنن‌و نە زەوی‌و مەزرایان دەکێڵن. ژیان‌وگوزەرانیان لەسەر روەك‌ودانەوێڵەی خۆڕسکە. لە وڵاتی ئەواندا، هەموو شتێك خۆبەخۆ دەڕوێت: گەنم، جۆ، مێو... مێوە کێوییەکانیان بەرێکی زۆر دەگرێ، و لەبەر هەتاووبارانی فرەی زیوس دا دەگات‌ودەبێ بەشەرابی ئاڵ‌ودەیخۆنەوە. ئەمانە نە ئەنجوومەنێکی راوێژوراوێژکاریان هەیەو نە یاسایەك. لە لوتکەو زناری کۆسارا‌ندا، ولە نێو شکەفتێن گەورەو قوڵدا ئاکنجین، هەر یەکە ئاغاو گەورەو پاشای ماڵ‌ومنداڵی خۆیەتی‌و، یاسای خۆی بەسەر ماڵ‌و منداڵیدا دەسەپێنێ، وکەسیان دەفتەری کەسیان ناخوێننەوە.

دوڕگەیەکی لێیە یەکپارچە چڵ‌ودڕکەزارە بە درێژایی میناکە درێژ بووەتەوە، کە لە مەڵبەندو دەڤەری سیکلۆپەکانەوە نە دوورە نە نزیکە. ئیدی ئەو دوڕگەیە بێشەیەکی چڕە دارستانە،و بزنەکێویەکی بێشوماری تیادا دەژی. هیچ کەسێك هەقی نیە بەسەریانەوەو راویان نانێت. هیچ راوچییەك خۆی ماندوو ناکات ئەو بێشەودارستانە چوغوردە ببڕێ‌و بە چیا بەرزەکاندا هەڵگەڕێ. چونکە لەم دوڕگەیەدا نە کشتوکاڵ کردن هەیەو نە زەوی کێڵان، بە درێژایی ساڵ هەر بەیارە. خەڵك‌وئاوەدانی تیا نیە. تەنیا بزنەکێوی تیایە، کە بە ئارەزووی خۆ دەبارێنن. خەڵکانی دی بە کەشتی‌و لە رێگەی دەریاو دەریاوانیەوە هاتوچۆی یەکتر دەکەن، بەڵام سیکلۆپەکان، نە کەشتی تەوێڵ فرمزیان هەیەو نە وەستای کارامەو دەست رەنگینیان هەیە کە کەشتی مکوم وروختەی ئەوتۆیان بۆ دروست بکات، کە بە کەڵکی سەفەران بێت‌و بەرەو شارانی ئاواو ئاوەدانیان بەرێت‌و ئەگەر کەشتیان هەبوایە دەیانتوانی پەی بە بایەخ‌وگرینگی ئەم دوڕگەیە بەرن کە کەوتبووە

شوێنێکی یەجگار باش و لە بارەوە. زەویەکەی بێ پێت وبێبڕشت نیە، ئەگەر خزمەت بکرێ بە گوێرەی وەرز، هەموو جۆرە بەروبومێك دەدات. بەڵێ ئەگەر ئەو سیکلوپانە کەشتیان هەبووایە دەیانتوانی ئەم دوڕگەیە ئاوەدان بکەنەوە. بە درێژایی کەناری دەریای قوڵ وەمەنگ، هەر مێرگوزاری گەش و پاراوو دەشت و تەختانی و نەرمە خاکە. کە دەکرێت رەزو باخی ئەوتۆی لێ بروێنرێ کە هەر کۆتایی نەیەت. زەوی وزارێکی تەختانی و هەمواری زۆری هەیە. خۆش گاسنە،و گەر بکێڵرێ و تۆو بدرێت، لە وەختی دورێنەدا بەروبوومێکی فرە دەدات. ئەم دوڕگەیە بەندەرێکی زۆر باشی لێیە، بۆ لەنگەر گرتنی کەشتیان، بێ ئەوەی پێویست بەوە بکات کەشتییەکان ببەسترێنەوە، یان بەردی قورسیان بخرێتە پشتەوە. پیاو دەتوانێ کەشتییەکەی لە کەنارەکەدا رابگرێ و چاوەڕوان بکات تا بایەکی هەموار هەڵدەکات و دەریاوانەکان سوار دەبن و بەناو دەریا دەکەون و بۆی دەردەچن. لە کەناری بەندەرەکەدا، ئاوێکی روون و زوڵاڵ لە کانیەکی ناو ئەشکەوتێکەوە هەڵدەقوڵێ ودێتە دەرێ،و چواردەوری یەکپارچە سپیدارە. خۆمان بەو شوێنەدا کرد.دیارە خواوەندێك رێ نوێنمان بوو، دەنا تاریکە شەوێك بوو چاوچاوی نەدەبینی. تەم و مژێکی خەست لە کەشتییەکەمان ئالا بوو،مانگ کەوتبووە پشت گەواڵە هەورێکی توندەوە، بۆیە نە دوڕگەکەمان دەبینی، نە ئەو شەپۆلە بەرزانەمان دەبینی کە خۆیان بە کەنارەکەدا دەکێشا. کاتێکمان بە خۆ زانی لە کەنارەکەداین. کەشتییە قوڵ و روختەکانمان راگرت. ئەوسا هەموو بادەوانەکانمان دادایەوە.دابەزینە سەر کەناری دەریاکەو بەدەم چاوەڕوانی هەڵاتنی رۆژو سپێدەوە لێی خەوتین.هەرکە سپێدە بە قامکە گوڵ ئاساکانیەوە بەیانی دا، بە پەلە گەشتێکمان بەنێو دوڕگەکەدا کرد. زۆرمان بەلاوە خۆش وجوان بوو. پەریانی دەریایی، کیژانی زیوسی سپەرپۆلایین، بزنە کێوییانیان لەلان هەستاند، کە خۆراك و توێشوویەکی یەجگار باش بوون بۆ هاوڕێکانی من. بۆیە خێرا چووین نێزەو تیروکەوانەکانمان لە کەشتییەکان هێنا و بووین بە سێ دەستەوە، وکەوتینە تیرەندازی: دوای تۆزێك خواوەندێك بەفریامان کەوت و راووشکارێکی فرەی، زیاتر لەوەی کە خۆمان چاوەڕوانمان دەکرد، بە نسیب کردین. دوانزە کەشتیم دەگەڵدا بوو. هەر کەشییەك نۆ بزنە کێوی بەرکەوت و دە دانە بزنیش بە تەینا بەر من کەوت. ئیدی لەو ساتە بەدواوە رۆژەکەمان تا ئێوارێ بەخۆشی وبەزم بردە سەر. گۆشتێکی زۆر زۆرمان خوارد. بادەی ئاڵ وەەنگوین ئاساش ئەوە هەر باسی مەکە، گەلەك مشە بوو. چونکە دوای گرتنی قەڵا قایمەکەی سیکۆنەکان، هەرکەسەو چەندین تونگە بادەی ئاڵی لەگەڵ خۆدا هێنا بوو، وهێشتا زۆری مابوو.بەدەم ئاهەنگی خواردن وخواردنەوەوە چاومان بڕی بووە ولاتی سیکلۆپەکان، لێمانەوە نزیك بوون، دوو کەڵی ئاگردانەکانیان دیار بوو. دەنگی خۆیان و باعەو بارەی پەزەکانیانمان دەبیست. کە رۆژ ئاوا بوو وتاریکی شەو باڵی بەسەر دنیادا کێشا،لە کەناری دەریاکەدا لێی خەوتین... هەرکە سپێدە بەیانی دا، هاوڕێکانم کۆکردەوەو لە ناویاندا وەستام و گوتم: "هاوڕێیان ئێوە لێرە چاوەڕوان بن، با من بەکەشتییەکەم و دەگەڵ برادەران و هاوڕێیانم دا بڕۆم وبزانین ئەم خەڵکە کێن، نا مەردو ناپیاووستەمکارو هۆڤی و زاڵمن، یان غەریبدۆست و خوانـــــــــــــاس و لـــــــــــــــە خـــــــــــــــوا ترســـــــــــــــن."

دوای ئـەو قسـانە سـەرکەوتمە سـەر کەشـتییەکەو داوام لـە هاوڕێکـانم کـرد کـە ئـەوانیش سـەر بکەون‌و،گوریسـی پاشـی کەشـتییەکە بکەنـەوە. ئـەوانیش یەکسـەر سـەرکەوتن. لـە جێگـای خـۆ دانیشتن. پاش ئەوەی جوان‌و بە ریز دانیشتن، کەوتنە سەوڵ لێدان. کە گەییشتینە شوێنەکە، لە دەریاکەوە زۆر نزیك بوو. لەلای ئەو سەرییەوە، وبە بەرزییەوە ئەشکەوتێکمان بەرچاوکەوت. کە کەرکوژو ژاڵە دای پۆشی بوو. مەڕومالاتێکی یەجگار زۆرمان لەوێندەر بینی کە لە مۆڵگەیەکدا مۆڵیان خورادبوو. شورەیەکی بەرز بە دەوری ئەشکەوتەکەدا کێشرابوو. بە بەردو دارکاژی بەرزو دار بەڕوی گەورە دروستکرابوو. کابرایەکی زەلامی کەتەی دێوئاسا لەوێ بوو کە بە تاقی تەنیاو دوور لـە هـەموو خـەڵکی پـەزەکانی دەلەوەڕانـد. ئەمـە لەگـەڵ کەسـدا تێکـەڵ نـەدەبوو وبـە تـەنیاو دووره پـەرێز دەژیـاو هـیچ یاسـاو رێسـایەکی لـەلا نـەبوو. خەڵقەندەیـەکی ترسـناك بوو،لـە بەشـەر نەدەچوو.دەتگوت کەرتە کێوێکی بەرزی چڕە دارستانەو لە نێو کۆجاڕێکی بەرزدا بەتاقی تەنیا قوت بووەتەوەو سەرەتاتکێ دەگەڵ تەمەشاڤاندا دەکات. ئەوسا داوام لە هاوڕێ دڵسۆزەکانم کرد لەوێندەر لەلای کەشتییەکە بمێننەوەو چاویان لێی بێت. دوانزە کەسی هەڵبـژاردەم لـە هاوڕێکانم هەڵبـژاردو بەرێکـەوتم. جەوەندەیـەکی گـەورەم لـە شـەرابی خەسـت‌وئاڵ پڕکـرد. مـارونی کـوڕی یـوانتس–ی کـاهینی پەرسـتگەی ئـەپولو، خواوەنـدی شـەفیعی خـەڵك‌وخاکی ئیسـماروس پێـی دابووم. چونکە ئێمە کە ئیسماروسمان تالان‌و وێـران کـرد، خۆی‌و ژنەکەی‌و منداڵەکەیمان ئازار نەداو لە مردنمان پاراستن. ئەمە لە پەرستگەیەکی ناو بێشەیەکدا کە بۆ فوبوس ئەپولو تەرخان کرابوو دەژیا. ئیـدی لـە هـەقی ئـەو چاکەیەدا کۆمـەڵێك دیـاری بـەنرخی دابوومـێ، لەوانـە: حـەوت تـالان زێـڕی چـاك، جـامێکی زیـوی خالیسـە، لەگـەڵ دوانـزە تونگـەی دوو دەسـکی تـەژی بـادەی خەسـتی ئـاڵی تێـك نـەدراوی بەتامـدا. هـیچ کەسـێك لـە خولامـوکارەکـەرەکانی بـە شـوێنی ئـەم شـەرابەیان نـەدەزانی، جگـە لـە خـۆی‌و ژنەکـەی‌و یـەکێك لـە ژنـە خوانسـالارو کـەیبانووەکان. کـە دەیانویست لەو بادە ئاڵە، کە تامی لە تامی هەنگوین خۆشتر بوو، بخۆنەوە، هەر پەرداخێکیان دەکـردە بیسـت پـەرداخ ئـاوەوەو ئـەوجاش بـۆنێکی خـوایی هێنـدە خۆشـی لـێ هەڵدەسـتا کـوڕم دەویست خۆی لەبەر بگرێ‌و نەیخواتەوە. یەك قەرابەی گەورەم لەو شەرابە دەگەڵ خۆدا بردبوو. هـەروەها یـەك هەنبانـە ئازوقەشـم لەگـەڵ خۆدا بردبوو. وەك بڵێـی دڵـم خەبـەری دابوو کـە لەگینـە تووشی خەڵکانێکی هۆڤی زۆر بەهێز ببین‌و نە هەق بناسن‌و نە پابەندی هیچ یاساو رێسایەك بن.

## ئودیسیوس‌وئەشکەوتەکەی پولوفیموس

زوو گەیشـتینە ئەشـکەوتەکە. ئـەو لـەوێ نـەبوو. پـەزە قەڵـەوەکانی بردبوو بۆ مێرگ‌و لەوەڕگـە. ئەوسا خۆمان بە شکەفتەکەدا کرد. بە ناویا گەڕاین، چاومان بە هەموو شتەکانیدا گێڕا. سەبەتەو قەرتاڵەکانی پڕبوون لە پەنیر. ئاغەڵەکان لـە بەرخ‌وکاردا جمـەیان دەهـات. بەرخەلـەکان بەگوێرەی تەمەن جیا کرابوونـەوە: گـەورە، نـاوەنجی، بەرخێن ساوا. بە جیا تـەیمان‌و پـەرژینیان لـە بەینـدا دروستکرا بوو. ئامانی تازە لێوان لێو بوون لـە شیر. مەنجەڵ‌وتەشـتی یـەکجار باشـی لـێ بـوو بـۆ مەڕ دۆشین. کە ئەو شتانەمان بینی، هاوڕێکانم داوایان لێکردم کە رێیـان بدەم لـە پێشـا هەنـدێ پەنیر بدزن‌و ئەوسا کاروبەرخەکان لە کۆز دەربێنن‌و بۆ ناو کەشـتییەکەیان بـەرن‌و بەپەلـە بـە نێـو

دەریاو شەپۆلاندا بکەوینە ڕێ‌و لەوێندەر بڕۆین. بەڵام من بە گوێم نەکردن، هەڵبەتە ئەگەر بە گوێم کردبان زۆر باشتر بوو. من تەماحی ئەوەم هەبوو یارۆ بدینم‌و بە تەما بووم وەکو خانەخوێیەك کۆمەڵێك دیاری‌وسەوقاتیم بداتێ. بەڵام کە پاشان دیتمان، بوو بە بەلای گیانی هاوڕێکانم، دوای ئەوە ئاگرێکمان کردەوە، قوربانی پەنیرمان پێشکەش کرد. پەنیرمان خواردو ئەوسا لە ژوورەوە چاوەڕوانی یارۆی سیکلۆپمان دەکرد. بە خۆو رانەکەیەوە پەیدا بوو. کۆڵێك چیلکەو داری وشکی دەگەڵ خۆدا هێنا بوو، تا ئاگری پێ بکاتەوەو شیڤی پێ دروستبکات. هاتە نێو ئەشکەوتەکەو کۆڵەدارەکەی گرم دا بە عاردیدا. لە ترسا بە پەلە خۆمان گەیاندە بنەبانی ئەشکەوتەکە. ئیدی پەزە قەڵەوە دۆشەنیەکانی کرد بەناو ئەشکەوتەکەدا، و بەران‌وسابرێنەکانی لە دەرەوەی ئەشکەوتەکەداو لە ئاغەڵە بەرینەکەدا بەجێ هێشتن. ئەوسا تاوێرێکی گەورەی هەڵگرت‌و نای بە دەرکی ئەشکەوتەکەوە. تاوێری چی! هێندە گەورە بوو کە بە بیست‌ودوو ئەسپ‌و گالیسکەی چوار پێچکە نەیان دەتوانی لە جێی خۆی بیجوڵێنن. ئەوسا دانیشت‌و کەوتە دۆشینی مەڕوبزنەکانی. پاش هەموو ئەم کارانە، هەر بەرخ‌وکارێکی خستە بەر دایکی خۆی. هەر ئەو کاتە نیوەی شیرەکەی مەیاندوکردی بە ماست‌و لە سەلەشیری نان‌و لەلایەکەوە داینان‌و نیوەکەی تریشی لە ئامانان کرد تا دەگەڵ شیڤدا بیخواتەوە. کە لە کارەکانی بووەوە، ئاگرێکی هەڵایساند،ئێمەی بینی‌وگوتی:

"ئەی نێگانان ئێوە کێن؟ لە کوێوە هاتوون؟ ئایا بازرگان‌وماملەچین، یان وەکو دزانی دەریایی کە هەم رێسك بە گیانی خۆ دەکەن‌و هەم خەڵکی وڵاتانی دی بەدبەخت دەکەن، وێڵ‌و سەرگەردان بەناوو دەریاکەوتوون؟

## دەمەقاڵەی نێوان سیکلۆپەکەوئودیسیوس

کە گوێمان لە دەنگە ترسناکەکەی بوو وچاومان بە کەلەشی دێوئاسای کەوت خەریك بوو لە ترسا زراومان دەتۆقی. بەڵام وێڕای ئەوەش وەڵامم دایەوە:

"ئێمە ئاخییاین‌ولە تەروادەوە دێین. باوباهۆزان رێیان پێگوم کردووین‌و بەدەم گێژەنگ‌و گێژاوو شەپۆلانی دەریاوە وێڵ بووین. دەمانویست بۆ مەفتەن‌و وڵاتی خۆ بگەڕێینەوە، رێگەمان لێگوم بوو، وبەنابەڵەی رێمان کەوتە ئێرە. بێگومان ئەمە ویست‌و ئیرادەی زیوس بووە. ئێمە شانازی بەوەوە دەکەین، کە کەسوکارو قەوم‌و قیلەی ئاگامەمنونی کوڕی (ئوتریوس)ین، کە ناوو ناوبانگی گەییوەتە کەشکەڵانی فەلەك. چونکە شارێکی یەجگار گەورەو مکوم‌و ئاواو ئاوەدانی وێران کردو خەڵکانێکی یەکجار زۆری قڕ کرد.بەڵام ئێمە کە رێمان کەوتووەتە ئێرە، هانامان بۆ هێناوی، دەستەودامێنت دەبین، لاقت ماچ دەکەین، ئومێدەوارین کە بە میوانی ڕامان بگریت، و لە ماڵەکەتدا جێمان بکەیتەوەو دیاری‌و سەوقاتیمان بدەیتێ. چونکە ئاوایە رەسمی میوانداری. دەی پاڵەوان، ئێمە هاتووینە بەردەرگات، هانامان بۆ هێناوی، لێت دەپاڕێینەوە، تۆش بیکە بە خاتری خواوەندان‌و داڵدەمان بدە. زیوس پشت‌و پەنای لێقەوماوان‌و غەریبانە. زیوس خوای غەریبانەودەلیل‌وخەمخۆری داماوانە،دوعا و نزایان گیرادەکات.

هەرکە لە قسەکانم بوومەوە، زۆر بەڕەقیوزبری بەرسڤی دامەوەوگوتی: "ئەی غەریب تۆ یان بێ ئاوەزی، یان لە شوێنێکی دوورەوە هاتوویتو شارەزای ئەم مەرزوبووە نیت. دەنا قەت داوات لێ نەدەکردم لە خواوەندان بترسم یان خۆ لە پشموغەزەبیان بپارێزم! سیکلۆپان نەترسیان لە زیوسی سپەردارەو نە لە خواوەندانی بەختەوەری دی. چونکە گومانی تێدا نیە ئێمە لەوان بەهێزترین، لەوان بالآترین. بۆیە دڵنیابە ئەگەر چاوپۆشی لە تۆوهاوڕێکانت بکەمو نەتانکوژم، لەبەر فرمانی دڵی خۆم دەیکەم نەك لە ترسی زیوس. بەڵام تۆ جارێ پێم بڵێ کە هاتیت بۆ ئێرە کەشتییە روختەکەت لە کوێ راگرتووە، لە کوێ لەنگەرت گرتووە؟ ئایا لەو سەری دوڕگەکەیە یان لێرەوە نزیکە؟ دەمەوێ ئەوە بزانم."

دەیویست بەو قسانە من تاقیبکاتەوە، بەڵام من پەیم بە نیازو مەبەستی برد، ودەمزانی چی گەڕەکە،بۆیە خێرا درۆیەکم بۆ رێکخستوگوتم:

"پوسیدونی زەوی هەژێن، کەشتییەکەی کێشام بە تاوێرەکانی ئەوپەڕی تخوبی ئەم وڵاتەی تۆداو پارچە پارچەی کرد. کە لە دوڕگەکە نزیك بوومەوە، باو زریان هەر پارچەیەکی بەلایەکدا برد. ئیدی منو ئەم پیاوانە بە گوێپچڕ گوێپچڕ لە مەرگ دەربازبووین."

## سیکلۆپەکە دووان لە پیاوەکانی ئودیسیوس دەخوات

مۆرەیەکی لێکردمو هیچ وەڵامێکی نەدامەوە. هەر هەستاو پەلاماری هاوڕێکانی دام. دووانی لێگرتنو وەکو دوو توتەڵە سەگ کوتانی بە عاردی داو مێشکی پژاندنوعاردەکە لە خوێنی ئەواندا سوور بوو. ئەوسا پارچە پارچەی کردنو شیڤی خۆی لێدروست کردن. وەکو شێری کێوان بە ورگو ریخۆڵەو هەناووگۆشتو ئێسقانەوە حەپەلوشی کردنو هیچی لێ نەهێشتنەوە. کە چاومان بەو کردەوە دڕندانەیەی کەوت، بە جارێ زیڕەمان کرد. بە دەم گریانەوە کەوتینە پاڕانەوە لە زیوس. تیامابووین کە چی بکەین. ئەقڵمان بە هیچ کوێ ڕانەدەگەیی. پاشان دوای ئەوەی یارۆ ورگە زلەکەی لە گۆشتی بەشەر پڕکردو شیرێکی باشی بەسەردا کرد، چوو لەوسەری ئەشکەوتەکە لە نێو پەزەکاندا وەکو تەڕاح درێژاودرێژ لێی پاڵکەوتو خەوت. لە دڵی خۆدا بیرم لەوە کردەوە، بە پێدزکە خۆم بگەیەنمە دیار سەریو هەڵکێشمە شیرە بڕندەکەمو بیکەم بە سینگیاو جەرگودڵی ببڕم.. بەڵام لە پڕ بیرێکی ترم بە مێشکدا هات: کە ئەگەر ئەو کارە بکەم ئێمەش هەموو دەمرین. چونکە نەمان دەتوانی ئەو گابەردەی کە نابووی بە دەرکی شکەفتەکەوە لابەرینو وەدەربکەوین.. بۆیە بەدەم گریانەوە چاوەڕوانی ئەنگاوتنی بەیانو سپێدەمان کرد.

## سیکلۆپەکە دوو پیاوی دیکەش دەخوات

هەرکە سپێدە، بە قامکە گوڵ ئاساکانیەوە بەیانی دا، یارۆی سیکلۆپ لە خەو رابوو. ئاگری کردەوە. پەزە جوانەکانی یەك یەك دۆشین، وکارو بەرخەکانی کردنە بەردایکیان. کە لەو کارانەی بووەوە، پەلاماری داو دوو پیاوی تری لێگرتین، وکردنی بە تاشتوخواردنی. پاش ئەوەی لە قاوەڵتی بووەوە، زۆر بە ئاسانی گا بەردەکەی لەبەر دەرکی ئەشکەوتەکە لابرد. پەزە قەڵەوەکانی یەك یەك لە شکەفتەکە وەدەرنا. ئەوسا بە هەمان ئاسانی بەردەکەی بە دەرکەکەوە نایەوە. وەکو ئەوەی سەری تیردانێك بنێتەوە. بە فیكوهۆڕی بەرز ڕانەکەی بەرەو کۆساران ڕادا. من لەوێ، لە

ئەشكەوتەكەدا مامەوە. لەدڵی خۆمدا بیرم لە چارە رەشی و نەگبەتی خۆم دەكردەوە،و بیرم لەوە دەكردەوە چۆن و بە چ ڕێگەیەك بتوانم تۆڵەی هاوڕێكانم لەو دێوە بێ ڕەزایە بسەنمەوە. پڕ بە دڵ خۆزیای ئەوەم دەخواست كە ئەتینا ئەم سەربەرزیەم پێ ڕەوا بدینێ.

## پلانی ئۆدیسیوس بۆ لە نێوبردنی سیكلۆپەكە

لەم كاتەدا ئەم بیرەم بەمێشكدا هات. لە هەر بیرێكی ترم باشتر هاتە بەرچاو. یارۆی سیكلۆپ دارێكی زۆر زەلامی بڕی بووەوە. بە پەرژینی یەكێك لە ئاغەڵەكانیەوە هەڵپەساردبوو. دار زەیتونێكی تەڕ بوو. دای نابوو تا وشك ببێتەوەو وەكو داردەست بەكاری بێنێ. كە چاومان بەو دارەكەوت،وامانزانی ساریەی كەشتییەكی بۆری بیست سەوڵییە. كەشتییەكی باربەری پان و گەورە،كە دەریای پان وبەرین دەبرێت.دارێكی زۆر درێژو ئەستورو ناهەموار بوو، لێی نزیك بوومەوە، بە ئەندازەی باڵا زەلامێكم لێی بڕی. دام بە هاوڕێكانم و وادارم كردن كە سپی ولوسی بكەن، ئەوان پاكیان كردو منیش سەرەكەیم تاشی و تیژم كرد. ئەوسا دامە ئاگروجوان وشكم كردەوە. ئەوسا چووم لە ژێر ئەو زڕوزبڵ و پشقلەی كە لایەكی ئەشكەوتەكەی گرتبوو، جوان تاقەتم كردو شاردمەوە. ئەوسا بە هاوڕێكانم گوت لە بەینی خۆیاندا تیروپشك بكەن، تا ئەو كەسانە دیاری بكەن كە گیان بخەنە سەردەستیان و ئەو دارە دەگەڵ مندا هەڵبگرن ودێوەكە لە خەوا بگرین و دارەكەی بە چاودا بكەین. پشكەكە بەر ئەو كەسانە كەوت كە من لە دڵی خۆمدا حەزم دەكرد ئەوان هەڵبژێرم. چواركەس بوون، بەمنەوە دەبووین بە پێنج كەس. ئێواریێ ڕانەكەی هێنایەوە، هەموو پەزە قەڵەووتیسكنەكانی وەژوور خست. تاقە یەكێكیانی لە دەرەوەی ئەشكەوتەكە نەهێشتەوە. ئیدی یان خەیاڵێكی لە مێشكدا بوو، یان خواوەندێك ئەوەی لە دڵ نابوو. ئەوسا گا بەردەكەی هەڵگرت ونای بە دەركی ئەشكەوتەكەوە. بە چینچكانەوە دانیشت و پەزەكانی كە دەیانباڕاند، یەك بە یەك دۆشین و كارو بەرخەكانی بەردانە بەر دایكیان. پاش ئەوەی هەموو كارەكانی تەواو كرد، دیسان دوو زەلامی گرتین وكردنی بە تێشووی ئێوارە. دوای ئەوە من بە گۆزەیەك شەرابی خەستەوە لێی نزیك كەوتمەوەو گوتم:

"ئەی سیكلوپ، وەرە، پاش ئەو گۆشت بەشەرەی كە خواردت، ئەم شەرابە بخۆرەوە تا بزانی چ شەرابێكی باشمان لە كەشتییەكەماندا پێبوو. من ئەم شەرابەم بۆیە بۆ هێناوی تا بەزەییت پێمدا بێتەوەو ڕێگەم بدەی بۆ وڵاتی خۆم بگەڕێمەوە. بەڵام شێتایەتی تۆ لە ئەندازە دەرچووە، تەحەمول ناكرێت. ئاخر هەی سەر شتێت، كە تۆ حیساب بۆ هیچ یاسایەك ناكەیت، وئەمە ڕەفتارتە،لە ئێستا بە دواوە كێ زات دەكات لە تۆ نزیك بێتەوەو بێتە سەردانت؟

## ئۆدیسیوس سیكلۆپەكە مەست دەكات

كە ئەو قسانەم كرد، گۆزەكەی لێوەرگرتم و یەكسەر هەڵیدا. كە شەرابەكەی خواردەوە، زۆری پێ خۆش بوو، زەوق گرتی و داوای شەرابی تری كرد، گوتی:

"پیاوی چاك بەو هەندێكی ترم بدەیە. ناوی خۆتم پێ بڵێ، تا بتوانم دیاریەكی ئەوتۆت بدەمێ كە دڵی پێ خۆش بكەی. ئێمە لە وڵاتی خۆماندا بادەوشەرابمان هەیە،چونكە خاكی سیكلۆپان، مەڵبەندی دانەوێڵەوگەنم، ترێی ئاوداریش بەرهەمدێنێ. هەتاو دەیگەیەنێ، وبارانی زیوس دەی

ئاوسێنیٚ. بەڵام وەکو ئەمە نیە. ئەمە لە نۆشدارو وبادەی بەهەشت دەچێت." هەرکە ئەو قسـەیەی کـرد، جـارێکی دی بـادەی ئـاڵی ئـاگرینم بـۆ تێکـرد. سـیٚ جـار پەیمانەکـەم بـۆ پڕکـرد، و هەرسـیٚ جارەکە، بیٚ هیچ هەڵوەستەیەك، یەکسەری هەڵیدا. پـاش ئـەوەی دیـتم سـەری گـەرم بـووە، زۆر بـە نەرمی وبە نەزاکەتەوە گوتم:

"ئەی سیکلۆپ، تۆ لـێم دەپرسیت، نـاوی بـاوی مـن چیە، جا مـن ئێستا نـاوی خـۆمت پێدەڵێم، تـۆش وەکـو بـەڵێنت دا، دیـاریی میوانـداریم بدەیـە. مـن نـاوم "هیچکەسـە"، بـاوك‌ودایکم‌و هاوڕێکانیشم بەو ناوەم گازدەکەن".

بەڵام یەکسەرو زۆر بە رەقی،بەرسڤی دامەوە:

"ئەی هیچکەس، من تۆ لە دوای هەموو هاوڕێکانت دەخۆم. بەڵیٚ گشتیان لـە پـێش تـۆدا دەخـۆم، ئەمە دیاریی میوانداری من دەبێت بۆ تۆ."

## شەرابەکە کار لە سیکلۆپ دەکات

هەرکـە ئـەو قسـەیەی کـرد، لەسـەر گـازەرای پشـت کـەوت. ورگـی روو لـە ئاسمـان بـوو، گەردنـە ئەستوورەکەی خوار بووەوە. خەو، کە هیچ کەسێك خۆی لەبەر ناگرێت، بردییـەوە. بـە دەم خـەوو مەسـتییەوە گینگڵـی دەدا، هێڵنجێکـی داو شـەراب وپلـە گۆشـتی ئـادەمی هەڵهێنایـەوە. هەسـتام، سەرە تیژەکەی دارەکەم خستە ژێر ژیلەمۆو پشکۆکانەوە، تا تـەواو گـەرم بێـت، هاوڕێکـانم هانـدا کە کەسیان نەترسن. کە دار زەیتونەکە، کە هێشتا تەڕبوو، سوور بووەوەو خەریك بـوو دەسـووتا، لـە ئاگرەکـەم دەرهێنـا. هاوڕێکـانم لـە دەورم خڕبوونـەوە. خواوەنـدێك زات‌وغیرەتـی لـەدڵ نـابوون. هەرکە من دارەکەم هـەڵگرت، یەکسـەر نووکـە تیژەکەیان کـرد بـە چـاویا، منـیش هـەموو قورسـایی خۆم دا بەسەر سـەرەکەی تـری دا، ودەسـتم کـرد بـە بـادانی، وەکـو چـۆن بـەدرێل داری کەشـتییەك کـون دەکـەن‌و یـەکێك لـە سـەرەوە دەیگـریٚ‌و چـەند کەسـێك لـە خـوارەوە لـە دوو لاوە بـە پـەت رایدەکێشن تا بجوڵێت‌و هەنگیٚ درێلەکە لـە شـوێنی خـۆی دەسوڕێتەوە، بەو ئاوایـە سنگەکەمان کە لە ئاگردا سوور بوو بووەوە، گرتبـوو ودەمـان سوڕاند،وبە هـەر چواردەوری نووکـە تیژەکەیـدا خـوێن فیچقەی دەکردو هـەر هـەموو برۆوبـرژانگ‌و بیلبیلـەی چـاوی بـە چـزوهۆر دەسـووتان‌و لـە رەگ‌و ریشەوە دەرچوون. وەکو چۆن ئاسنگەر پاچێك یان قازمەیـەك لـە کـورە دەردێـنیٚ‌و بـە چـزو هۆڕ دەیخاتە ئاوی ساردەوە، ئاوی دەدا تا قایمتر بیٚ، بەو ئاوایـە چـاوی پیـرە سیکلۆپ، بـە چـوار دەوری نووکی سنگەکەدا چزەچزی لیٚ هەڵدەستا. هەنگیٚ پڕ بەزاری هاوارێکی ترسناکی کرد، لە سەرانسـەری کۆسـارەکەدا دەنگـی دایـەوە. لـە ترسـا خۆمـان خزانـدە پەنایەکـەوە، سـنگە خوێناوییەکەی لـە چـاوی دەرهێنـا، بـە دەم ئـازارو وڕینـەوە تـوڕی دا. ئەوسـا کەوتـە هات‌وهـاوار، بـانگی سـیکلۆپەکانی دەوروبـەری دەکـرد. ئەوانـەی لـە ئەشـکەوتە باگرەکـانی سـەر کۆسـارە بەرزەکانی دەوروبەریا دەژیان. کە گوێیان لە هاواری بوو لە هەر چوارنکالەوە بە هانایـەوە هـاتن. لە دەوری ئەشکەوتەکە گردبوونەوەو لێیان پرسی:

"پولوفیموس، چیە، چیت لێ قەوماوە، چ دەردێکتە وا بەم شەوە هاوارت لێهەستاوەو خەوت لە ئێمە حەرام کردووە؟ ئایا هیچ بەشەرێك هاتۆتە سەرت و بیەوێ بە تۆبزی پەزەکانت بدزێت، کەس هاتۆتە سەرت کە بە تەڕن یان بە هێزی بازوو بتکوژێت؟"

پولوفیموسی بە توانا لە بنەبانی ئەشکەوتەکەوە بەرسڤی دانەوە:

"هاوڕێیان، کێ بە تەڕن من دەکوژێت؟ "هیچکەس". هیچ هێزو زۆرێك لە ئارادا نیە"

هەموو وەڵامیان دایەوە: "جا ئەگەر هیچکەس نەهاتووەتە سەرت وغەدری لێنەکردوویت و بە تاقی تەنیای، مانای وایە زیوس جۆرە نەخۆشیەکی بۆ ناردوویت و ناتوانی خۆتی لێ بدزیتەوە. کەواتە دەبێ هانا بۆ پۆسیدونی بابمان بەریت. نوێژو نزا بۆ ئەو بکەیت ولەو بپاڕێیتەوە!"

دوای ئەو قسانە، بڵاوەیان لێکردو رۆییشتن. من لە دڵی خۆمدا دەستم بە پێکەنین کرد. بیرم لەوە دەکردەوە چۆن ناوەکەم ((هیچکەس))ونەخشە زیرەکانەکەم فریوی دابوون! بەڵام پیرە سیکلۆپ بەدەم ژان و ئازارەوە، بە لەپەکوتێ خۆی گەیاندە بەردەرکی ئەشکەوتەکە. تاوێرەکەی لادا، بەخۆی لە ناو دەرکەکەدا دانیشت. هەردوو بازووی بەم لاو بەو لای دەرکەکەدا بڵاوکردەوە، تا ئەگەر هەر یەکێك لە ئێمە بیەوێ دەگەڵ پەزەکاندا بچێتە دەرێ، بیگرێت.هەڵبەتە زیاتر منی مەبەست بوو، لە دڵی خۆیدا وایدەزانی من تا ئەم رادەیە بێ ئاوەزم! من بیرم لەوە دەکردەوە کە چۆن خۆم و هاوڕێکانم لە مەرگ رزگاربکەم، مێشکم خستە کار، بیرم لە هەرجۆرە نەخشەیەك دەکردەوە. چونکە مەسەلەکە مەسەلەی ژیان ومەرگ بوو، مەترسیەکی زۆر گەورەمان لە پێش بوو. ئەنجام ئەم نەخشەیەم بە بیردا هات، کە لە هەر نەخشەیەکی ترم پێ پەسندترو باشتر بوو: سەیرم کرد بەرانەکان زۆر قەڵەووگەورەن، نەبڕاونەتەوەو خوریەکانیان قات قات، وەکو هەور، نیشتووەتە سەریەك. بەکاوەخۆو بەبێ دەنگی هێنامن و سێ سێ بەو لەبانە بادراوانەی کە دێوەی هۆڤی و کەللە شەق و بێ ویژدان و یاسانەناس، لەسەری دەخەوت، پێکەوەم بەستن. واتە سێ بەرانم بە ریزی یەکەوە، پێکەوە دەبەست و زەلامێکم دەخستە ژێر سکی بەرانەکەی ناوەڕاست، کە لە دەرکەی ئەشکەوتەکە وەدەردەکەوتن، دێوە هەستی بەوەی ناوەڕاست نەدەکردو بەو جۆرە بە سێ بەران زەلامێکیان رزگاردەکرد. سەبارەت بە خۆمیش بەرانێك هەبوو لە هەر هەموو ئەوانی تر گەورەترو باڵابەرزتر بوو، باشترین بەرانی ناو رانەکە بوو. خۆم بە ژێر سکی دا هەڵواسی و بێ هیچ ترس و دوودڵییەك چنگم لە خوریە جوان و سەیرەکەی گیرکرد.

بەو جۆرە هەموو بەدەم گریانەوە چاوەڕوانی سپێدە بووین.

## دەرباز بوونی ئودیسیوس و هاوڕێکانی

هەرکە سپێدە، بە قامکانی گوڵئاسایەوە بەیانی دا، بەران و نێرییەکان وەدەرکەوتن تا بچنە لەوەڕگەو مێرگان. بەڵام مەڕو بزنە دۆشەنیەکان، لە پەرژینەکانی خۆیاندا بەدیار ئامانەکانەوە دەیان باڕانداو گوانیان بە شیرەوە جەڕی بوو، وداوای دۆشینیان دەکرد. خاوەنەکەیان بەدەم ئێش و ئازارێکی کوشندەوە دەستی بە پشتی هەر هەموو ئەو پەزانەدا دێنا کە بە بەردەمیادا رەت دەبوون. بەڵام ئەو بێ ئاوەزە پەی بە فێڵەکەی ئێمە نەبرد. هەستی بەو کەسانە نەکرد کە بە بن سکی پەزەکانەوە بەسترابوون.ئەو بەرانەی کە من خۆم بە ژێر سکییەوە هەڵواسی بوو، کەوتە

دوای دواوه، ناهەقی نەبوو لەبەر قورسی منوخوریە زۆرەکەی دوا کەوتبوو. کە چووە پێشەوە تا دەربچێت، پولوفیموس-ی تەژە دەستێکی بە پشتیا هێناوگوتی:

"ئەی بەرانی میهرەبان، بۆچی بەم خاوییە لە ئەشکەوتەکە وەدەردەکەوی؟ تۆ هەمیشە هەر پێشەنگوسەرامەد بوویت، قەت دوا نەدەکەوتی. خێرە وا ئەمجارە بوویت بە قرەی هەمووان؟! خۆ هەر تۆ بووی بەر لە هەمووان دەگەییشتییە مێرگانوناسکە گیات دەخوارد. هەر تۆ بووی لە پێش هەموانەوە دەگەییشتییە سەراوودەراوی سازگارو ئێوارانیش لە پێشی پێشەوە دەگەڕایتەوە بۆ نێو ئاغەلەکان. کەچی ئێستا وا قرەی هەمووانی... ئایا خەفەت بۆ چاوی خاوەنەکەت دەخۆی؟ کە کابرایەکی تاوانبار، دوای ئەوەی بەخۆیو هاوڕێکانی بادەیان دەرخواردم داو سەرخۆشیان کردم، دەری هێنا. کە ناوی "هیچکەس" بوو. دڵنیات دەکەم کە ئەمەی بە سەرەوە ناچێت. خۆزگە هۆشوزمانت هەبوایە، تا پێم بڵێی لە ترسی پشموغەزەبی من لە کوێندەر خۆی شاردووەتەوە! ئەوسا دەتبینی چۆن بە عاردیم دا دەداومێشکیم دەپژاندو تۆوی ناو ئەوشکەوتەکەم دەکرد. وەهەنگیٚ سوکناییەکم بە دڵدا دەهاتو ئەم هەموو دەردو ئازارەم، کە ئەو "هیچکەسە" خوێڕیە بەسەری هێناوم، فەرامۆش دەکردو کەمێك ئاسوودە دەبووم!"

دوای ئەو قسانە بەرانەکەی بەرەڵڵا کرد. هەرکە تۆزیٚ لە ئەشکەوت وئاغەڵەکە دوورکەوتینەوە، من یەکەم کەس بووم کە خۆم لە بەرانەکە کردەوە، ئەوسا هاوڕێکانم کردەوەو ئازادم کردن. ئیدی بە پەلە پەزە لۆق درێژو قەڵەوەکانمان بە پێچو پەنایاندا دایە پێشو نەوەستاینەوە تا گەییشتینە کەشییەکە. هاوڕیٚ ئازیزەکانمان کە چاویان بە ئێمە کەوت کە لە مەرگ رزگار بووین لە خۆشیا کردیان بە چ هاواریٚ!، بەڵام زۆریش بۆ ئەوانە گریان کە سیکلۆپەکە کوشتبوونی! بەڵام من بە ئاماژەی چاووبرۆ تێم گەیاندن کە بێدەنگ بنو کەس فزەی لێوە نەیەت. خێراکەن تا دەتوانن پەزی قەڵەووتیسکن لە کەشتییەکە باربکەن. بەڵکو بە پەلە بەناو دەریای سوێر دەکەوینو دەڕۆین. ئیدی بە پەلە سەرکەوتنە سەر کەشتییەکە، هەرکەسەو لە جێی خۆیو لەبەردەم سەوڵی خۆیدا دانیشتو ئەوسا بە سەوڵ لێدان کەوتینە ریٚ. کە بە ئەندازەی تیر هاوێژێك دوورکەوتینەوە، لەوێندەرەوە کەوتمە تەوسوتوانج لە پیرە سیکلۆپوگوتم:

"ئەی سیکلۆپ، وا دیارە ئەو پیاوەی کە تۆ گەرەکت بوو بە غەدر هاوڕێکانی لە نێو ئەشکەوتەکەی خۆتدا بخۆی، زۆریش بێدەسەڵاتو ترسنۆك نەبوو! بێگومان کردەوە درندانەکانت رووی خۆتی گرتەوە، بەسەر خۆتا شکایەوە، هەی کەللەشەقی لە خوا نەترس، خەڵکی چۆن لە ماڵی خۆیا دەستی دەچێتە میوانودەیان خوات.ئاخر بۆیە زیوس وخواوەندانی دی تۆڵەیان لیٚ سەندیتەوە!"

## سیکلۆپەکە تاوێرێکی گەورە دەسرەوێنێتە ئودیسیوس

کە ئەو قسانەم کرد، زۆر توڕە بوو. تاوێرێکی لە لوتکەی کێوێك هەڵکەندو تێی سرەواندین. رێك لەبەردەم کەشتیەکەماندا کەوتەوە. چیوای نەما بوو بەر پێشی کەشتییەکە بکەویٚ. کە تاوێرەکە کەوتە ناو دەریاکەوە، پیرە دەریا خرۆشاو کەوتە شەپۆل دان، ئیدی شەپۆلەکە هێندە

توند بوو، کەشتییەکەی لەگەڵ خۆدا بردو خەریك بوو بمان کێشێت بە کەنارەکەدا. بەڵام خێرا فریاکەوتمو دەستەکێکم بە هەردوو دەست هەڵگرت و کەشتییەکەم لە کەنارەکە دوور خستەوە. ئەوسا بە ئاماژە هاوڕێکانم تێ گەیاند خێرا بکەونە سەوڵ لێدان تا لەو مەینەتیە رزگار بین، خێرا کەوتنە سەوڵ لێدان، کە گەییشتینە قوڵایی دەریا و دوو ئەوەندەی جاری پێشوو لە کەنارەکە دوور کەوتینەوە، ویستم جارێکی دی هاوار لە سیکلۆپەکە بکەم، بەڵام هاوڕێکانم تکایان لێکردم کە کاری وا نەکەم، بە قسەی خۆش گوتیان:

"ئاخر نەگبەت، هەی سەر شێت بۆ دەتەوێ ئەم دڕندەیە، ئەم جانەوەرە بێ رەزایە بوروژێنی، بۆ بە خۆڕایی تورەی دەکەی؟ خەریك بوو بە تاوێرێك کەشتییەکەمان هەڵبداتە سەر زەوی، هەموو وامانزانی بەڕاستی تیا چووین، خۆ ئەگەر گوێی لە هەر دەنگێکی تر بێ دەتوانێ خۆمانو کەشتییەکەمان بە تاوێرێکی ناقۆڵا لەناو بەرێ. چونکە هێشتا لە مەودای بەردهاوێژی ئەوداین."

هەرچیان کرد، نەیانتوانی من بێننە رەدا. ئیدی جڵەوم بۆ ئەو رق‌وکینەیە بەردا کە لە ناخەوە دنەی دەدامو، پڕ بەزار هاوارم کرد:

"ئەی سیکلۆپ، ئەگەر رۆژێ لە رۆژان بەنی بەشەرێکی فانی لێی پرسیت کێ ئەم شەرمەزاریەی بەسەر هێنای و چاوی کوێر کردیت، پێی بڵێ ئۆدیسیوسی وێرانکەری شاران، کوڕی لایرتیس، و خەڵکی ئیتاکا، ئەم داغمەیەی پێوە ناوم."

کە من ئەو قسەیەم کرد. ئاهێکی قوڵو پڕ کەسەری هەڵکێشاو گوتی: "سەد حەیف‌ومەخابن، هاوار بە ماڵم. کەواتە پێشبینییەکەی کابرای فاڵبین هاتە دی! کاتی خۆی فاڵبینێك لێرە هەبوو، پیاوێکی خانەدان‌و نەجیب و پاك بوو، تیلیموسی کوڕی پورومـوس-یان پێدەگوت. لە پێشبینی و پێشگۆییدا وێنەی نەبوو. تا رۆژگاری پیرییش هەر فاڵبینی وپێشگۆیی بۆ خێڵی سکلۆپان دەکرد. کاتی خۆی لە هەموو ئەم رووداوانەی کە ئێستا بەسەرم هاتوون، ئاگاداری کردبووم. پێی گوتم کە بە دەستی ئۆدیسیوس، لەم تاقە چاوەم مەحروم ونابینا دەبم. بەڵام من هەمیشە بە تەما بووم کەسێکی باڵا بەرزی قۆزی زۆر تۆکمەو زەلامو بە قوەت بێتە سەرمو چاوم کوێر بکات، کەچی ئێستا کەسێکی خوێریلەی، بێ نموود، وبودەڵەی کورتە باڵاولاوازو بێهێز هاتووەتە سەرمو بەشەراب سەرخۆشی کردوومو چاوی دەرهێناوم. بەڵام ئۆدیسیوس، تۆ وەرە بۆ ئێرە، تا دیاریی میوانداریت بدەمێ‌و داوا لە هەژێنەری بەنێوبانگی زەوی بکەم کە رێنوێنیت بکات و بەسەلامەتی و بەبێوەی بتگەیەنێتەوە وڵات‌ومەفتەنی خۆت! چونکە من کوڕی ئەوم. ئەو شانازی بەوەوە دەکات کە بابی منە. تەنیا ئەو، ئەگەر بیەوێ، چاکم دەکاتەوە، جگە لەو کەسی تر، نە لە خواوەندانی جاویدان‌و نە لە بەشەرانی فانی، ناتوانێ دەردی من دەرمان بکات و شیفام بدات.

کە سیکلۆپەکە لە قسەکانی بووەوە، بەرسڤم دایەوەوگوتم:

"بریا دەمکوشتیت و روحم هەواڵەی هادیس دەکرێت. بۆ ئەوەی کەس، تەنانەت پوسیدونی هەژێنەری زەویش،نەیتوانیبا چاوت چاك بکاتەوە."

دوای ئەو قسانەی من، یەکسەر دەستی بۆ ئاسمانی پڕ ستێران بەرزکردەوە. بەدەم نوێژونزاوە گوتی: "ئەی پوسیدون، ئەی ئەو کەسەی زەوی بەسەر شانی تۆوەیە. ئەی خواوەندی قژ بۆر، داوام گیرا بکە.ئەگەر راستە من کوڕی تۆم‌و، تۆ شانازی بەوە دەکەی کە بابی منی، ئەو ئاواتەم بێنە دی کە ئەم ئودیسیوسە، وێرانکەری شاران، کوڕی لایرتیس، وخەڵکی ئیتاکا، هەرگیز نەگاتەوە زێدو وڵاتی خۆی، خۆ ئەگەر لە چارەشی نووسراوە کە کەسوکاری بدینێتەوەو بگاتەوە کۆشك‌و تەلارە بەرزەکەی، بگاتەوە نیشتمانی باب‌وباپیرانی، ئەوا زۆری دوا بخە. تووشی حاڵەتێکی وای بکە خەڵکی بەزەییان بە حاڵیا بێتەوە. کەس خۆزیای پێنەخوازێ، ودوای لەناوچوونی هەموو هاوڕێکانی، بە تاقی تەنیاو بە کەشتی پیاوێکی بێگانەو بەوپەڕی نەگبەتی بگاتەوە ماڵی خۆی‌و لە ماڵیشەوە تووشی گرفت‌وخەم‌و پەژارە ببێت!"

بەو جۆرە پاڕایەوە.خواوەندی قژ بۆر گوێی لە نوێژونزاکەی بوو، ودوعاکەی گیرا کرد.. بەڵام ئەو تاوێرێکی گەورەتری هەڵگرت‌و بای داو بەگوڕێکی یەجگار سەیرو کەم وێنەوە هاویشتی. کەمێك لە پشتی کەشتییەکە کەوتەوە. تۆزێکی مابوو بەر سوکانی کەشتیەکە بکەوێ. دەریا لە ژێر گوشاری کەوتنەوەی تاوێرەکەدا هاڕوژا. کەوتە شەپۆلدان، شەپۆلی چی، هەر یەك بە ئەندازەی باڵا زەلامێك، پیرە کەشتیان دایە بەرو چیوای نەما بوو بمانکێشێت بە کەنارەکەدا. ئەنجام کە گەییشتینە ئەو دورگەیەی کەشتییەکانی ترمان لێی راگرتبوو، سەیرمان کرد هاوڕێکانمان لە دەوری کەشتییەکان دانیشتوون‌و بەدەم گریانەوە چاوەڕوانی گەڕانەوەی ئێمەن. کە گەییشتینەوە ئەوێندەر کەشتییەکەمان گەیاندە سەر لمەڵانی کەنارەکەو رامانگرت. ئەوسا لە کەشتییەکە دابەزین. پەزە تاڵانیەکانی یارۆی سیکلۆپمان لە کەشتییەکە داگرت. بە یەکەسانی بەسەر خۆمانا دابەشمان کردن. بۆ ئەوەی کەس گلەیم لێنەکات کە بەشەکەی کەمە. بەڵام سەبارەت بە بەرانە گەورەکە، کە لە نێو پەزەکاندا جوانترین‌و گەورەترین بەش بوو، هاوڕێ دڵسۆزەکانم وەك دیاریەکی تایبەتی بۆ منیان دانا. هەر لەوێندەرو لە کەناری دەریاکەدا کوشتمەوەو کردم بە نەزرو قوربانی بۆ زیوس، کوڕی کرونوس، خواوەندی هەورانی توندو تاریك،وگەورەی هەمووان. رانەکانیم بۆ زیوس برژاند. بەڵام ئەو نەزرو قوربانیەکەمی بە هەند وەرنەگرت، وهەر بیری لای ئەوە بوو کە چۆن هەموو کەشتییە روختەو مکومەکانم تێکبشکێنیّ‌و هاوڕیّ ئازیزو ئەمەکدارەکانم لە نێو بەرێت.

ئەوسا بە درێژایی رۆژەکە لە بەیانییەوە تا ئێواریّ. کردمان بە جەژن‌و بە کەیفی دڵی خۆ گۆشتی برژاوو بادەی غەلیزو ئاڵی نایابمان خواردو خواردەوە. پاش ئەوەی خۆر ئاوابوو، وتاریکی باڵی بەسەر دنیادا کێشا، لە کەناری دەریاکەدا لێی خەوتین. هەرکە سپێدە، بە قامکە گوڵئاساکانیەوە، بەیانی دا، هاوڕێکانم لە خەو هەستاندو داوام لێکردن کە سەرکەونە سەر کەشتییەکان، کندڕو گوریسەکان بکەنەوە. بە پەلە سەرکەوتن، لە جێی خۆ دانیشتن. پاش ئەوەی بەریز لە شوێنەکانی خۆیان دانیشتن، ئیدی بەناو دەریای کەفاویدا کەوتنە سەوڵ لێدان.. ئیدی لەوێندەر بەڕێ کەوتین. لە لایەکەوە دڵتەنگ‌وخەمباری ئەو هاوڕێیانە بووین کە لە دەستمان دابوون، لەلایەکەوە دڵخۆش بووین کە لە مردن دەربازبووین.

***

**پەراوێز:**

*- سیکۆنەکان: خەڵکی شاری ئیسماروس‌و دەوروبەری بوون. ئەمانە چوون بەگژ ئودیسیوس‌و هاوڕێکانیا، چونکە ئودیسیوس وهاوڕێکانی تاڵانیان کردبوون‌و شارەکەیان وێران کردبوون. ئەوانیش بۆ تۆڵەی خۆیان پەلاماریان دابوون‌و لە هەر کەشتییەك شەشیان لێکوشتبوون. ئودیسیوس لەوێ شەرابی تالاَن کردبوو، ولەو شەرابەی دەرخواردی سیکلۆپ پولوفیموس دابوو، وچاوی لە میل دابوو.

## سروودی دەیەم

### کورتەی سروودەکە:

کە ئودیسیوس‌و هاوڕێکانی دەگەنە دوڕگەی ئیول، ئیولیوسی پاسەوانی بایان زۆر بە گەرمی پێشوازیان دەکات‌و ڕێگەی گەڕانەوەیان پیشاندەدات. بەڵام کاتێ دەریاوانەکان لە رووی لاپرەسەنی‌وکونجکاوییەوە مەشکەی دژە بایەکە دەکەنەوە، رەشەباو زریانێك هەڵدەکات‌و کەشتییەکان دەگەڕێنەوە بۆ لای ئیولوس، کە لەوە دوا هیچ یارمەتیەکیان نادات. سەرەنجام ڕێیان دەکەوێتە لای لایستریونیسەکان، کە خێڵێکی بنیادەمخۆرن. لەوێندەر یازدە کەشتی بە خۆو بە سەر نشینەکانیانەوە تیا دەچن. پاشان کەشتییەکەی ئودیسیوس دەگاتە دوڕگەی ئایلیا کە بارەگاونشیمەنی کیرکییە. بەرەبەیانی رۆژی چوارەم، ئودیسیوس، بە سەرپەشتی‌و فەرماندەی ئوریلوشوس، چەند کەسێك لە هاوڕێکانی دەنێرێ تا تاقیبێك بکەن‌و خەبەرێکی بۆ بێننەوە. ئیدی ژنەی ئەفسونگەر جۆشانەیەکی گیاییان دەرخوارد دەدات‌و هەر هەموویان، جگە لە ئوریلوشوس، دەبن بە بەراز. ئوریلوشوس دەگەڕێتەوەو واریقاتەکە بۆ ئودیسیوس دەگێڕێتەوە. ئودیسیوس، بە یارمەتی هیرمیس کە ئەفسونەکانی کیرکی بە تاڵ دەکاتەوە، دەتوانێ هاوڕێکانی بگەڕێنێتەوە دۆخی بەشەری خۆیان‌و تەنانەت دڵی ژنە ئەفسونگەرەکەش دەرفێنێ. دەریاوانەکان خوازیاری گەڕانەوە دەبن. بەڵام ژنە جادوگەرەکە، ئودیسیوس تێ دەگەیەنێ کە دەبێ لە پێشا بچێت بۆ هادیس‌و راوێژ بە تیریسیاس بکات، ئەوسا فێری کرد چۆن داوای یارمەتی لە مردووان بکات. لە دوا شەودا، واتە شەوی بەر لە گەڕانەوە، (ئالپینور)ی کەشتیوانیی ئودیسیوس، لەسەربانی کۆشکەکەوە خۆی هەڵدەدێرێ‌و خۆی دەکوژێت.

***

## ئودیسیوس دەبێتە میوانی پاسەوانی با

گەییشتینە دورگەی ئیول، کە ئیولوشی کوڕی هیپوتاسی، خۆشەویستی خواوەندان لەویّ دەژیا. دورگەیەکە لە ناوەندی ئاودا. شورەیەکی بەرزی برونزی بە چواردەورا کێشراوە، هێندە مکومو قایمە لە روخان نایەت. شاخێکی بەرزو قووچو لوسو رکی تیایە رێك چووە بە ئاسمانا. ئیولوس دوانزە فەرزەندی هەبوون کە لە ماڵەکەدا،ولەگەلّ خۆیدا دەژیان. شەش کوڕی عازەبو شەش کیژ. کیژەکانی بە هاوسەری دابوو بە کوڕەکانی. ئەمانە هەمیشە دەگەلّ بابە خۆشەویستو دایکە بەڕێزەکەیاندا، دەژیان. رۆژگاریان بە کەیفو سەفاو بەزم دەبردە سەرو خۆشترینو زۆرتریان خواردنیان پێشکەش دەکردن. یانی هەر خەریکی خواردنوخواردنەوەو خەوتنو رابواردن بوون. بۆنی گۆشتی برژاو ماڵەکەی پڕکردبوو. بە رۆژەوە سەدای دەنگوبەزم لە سەرانسەری ماڵەکەدا دەنگی دەدایەوەو دەگەییە حەوشە گەورەکەش. بە شەوانیش هەمووان لەگەلّ هاوسەرە داوێن پاکەکانیاندا، لەسەر تەختەخەوی چاكو نوێنی نەرم دەخەوتن.

جا ئێمە رێمان کەوتبووە ئەم خاكو خەڵکە. روومان کردە کۆشکە جوانەکەیان. ئیولوس پێشوازییەکی گەرمی کردین. یەك مانگی تەواو خزمەتی کردین. دەربارەی هەمووشتێك پرسیاری لێکردم: دەربارەی ئیلوس، کەشتی ئارگۆسییەکان، وگەڕانەوەی ئاخیاییەکان پرسیاری کرد. منیش لە سیر تا پیازی مەسەلەکانم بە ریز بۆ گێڕایەوە. کە داوام لێکرد بە نیازم بڕۆمو حەز دەکەم روانەم بکات، نەك هیچ کۆسپێکی نەخستە رێگام، بەڵکو یارمەتیشی دام. بەڵکو گاوسی گایەکی نۆ سالاّنی دامیّ. گایەکەی کوشتبووەوە، پێستەکەی گروبوو، وکردبووی بە گاوس،و هەموو دژە باکانی لەو گاوسە پەستاوت بوو. چونکە کوڕی کرونوس (زیوس) ئەوی کردبوو بە بەرپرسو پاسەوانی بایان. بۆی هەبوو بە ئارەزووی خۆی هەر بایەك هەڵبکات یان رای بگرێت. دەمی گاوسەی لە نێو کەشتییە گەورەکەی مندا، بە داوێکی زیوی درەخشان، بە جۆریّ بەست، کە هیچ  جۆرە دژەبا یان بایەکی ناساز چەند کەمیش بیّ، نەتوانیّ بێتە دەریّ. هەر بۆ یارمەتی من شنەیەکی سازگاری بای رۆژاوای هەڵکرد تا خۆمانو کەشتییەکانمان بەرەو پێش بەریّ. هەڵبەتە تەنیا بای رۆژاوا لە قازانجی ئێمە بوو.دیارە تەقدیر لەگەلّ تەگبیردا تێکی نەکردەوە،و بەبیّ ئەقڵی خۆمان ریسەکەمان لەخۆ کردەوە بە خوری.

## ئۆدیسیوس لە ولاّت نزیك دەبێتەوە

نۆ شەوو نۆ رۆژی تەواو، بێوچان، کەشتیرانیمان کرد. لە رۆژی دەیەمدا کێڵگەو مەزرایانی خاکی بابو باپیرانمان لیّ بە دیارکەوت. ئەوەندە نزیك بوو بووینەوە کە تروسکەی ئاگری شوانانمان بە روونی دەبینی. بەلاّم هێندە شەکەتوماندوو بووم خەوێکی قولّ بردمییەوە، چونکە لەوەتای بەڕیّ کەوتبووین، پەتی بادەوانەکان هەر بە دەستی خۆمەوە بوون. هێندەم پەلە بوو کە بگەینەوە خاکی نیشتمان، کە نۆرەم دەگەلّ هیچ یەکێك لە هاوڕێکانمدا نەکردبوو. لەو بەینەدا هاوڕێکانم لە نێوان خۆیاندا کەوتبوونە فسکە فسكو وایانزانی بوو ئیولوسی کوڕی هیپوتاس زێڕو زیوێکی یەکجار زۆری بە دیاری بۆ لە گاوسەکە ناوم. ئیدی یەکێکیان تەمەشایەکی ئەوەی تەنیشتی دەکاتودەڵێت:

## دەریاوانەکانی ئودیسیوس دەمی گاوسکە دەکەنەوە

"تۆ بڕوانە چۆن ئەم پیاوە ڕوودەکاتە هەر شارو وڵاتێك، خەڵکی ڕێزی دەگرنو دەبن بە دۆستو برادەری! یەك دنیا دەسکەوتی جەنگی لە تەروادەوە دەگەڵ خۆ هێناوە. کەچی ئێمە کە هەمان ڕێگای دوورودرێژی ئەومان بڕیوە، بە دەستی بەتاڵو وەك دەڵێن دەست لە گونان شۆڕتر بۆ ماڵی خۆ دەگەڕێینەوە. سەرباری ئەمەش تەمەشا ئیولوس، لە ڕووی دۆستایەتیەوە ئەم هەموو دیارییەی داوەتێ. دەی کوڕینە خێراکەن با بزانین ئەم گاوسە چی تیایە، چەندی زێڕو زێو تیایە."

بەو جۆرە شەیتان چووە بن کلێشەیانەوەو لەخشتەی بردن. دەمی گاوسەکەیان کردەوە، هەموو بایەکان بەر بوونو فرتەیان کردە دەرەوە. ئیدی زریانێکی تووش هەڵیکردو بەرەو ناوەندی دەریا لە زێدو مەفتەنی خۆ دووری خستنەوە. لە خەو ڕابووم، وبێ هیچ سەرزەنشتێك لە دڵی خۆمدا دەمگوت: نازانم، خۆم بخەمە دەریاکەوەو تیا بچمو بڕێتەووە، یان بەبێ دەنگی مل بۆ ئەم ئەمری واقیعە بدەمو قیرسیا چ دەبێ با ببێ؟ بە هەرحاڵ خۆم گرت. شتێکم بە خۆدا داو لە عەماری کەشتییەکەدا پاڵکەوتم... ئیدی زریانی نەفرەتی کەشتییەکانی هەڵگرتو بە دەم گریانو ناڵینی دەریاوانەکانەوە، بۆ دوڕگەی ئیولوسی پشتەو شارکردنەوە.

## ئیولوس پێشوازی ئودیسیوس ناکاتەوە

کە گەییشتینەوە ئەوێندەر، لە کەناری دەریاکە دابەزین. بە پەلە ئاوی خواردنەوەمان خواردەوەو پڕکرد. هاوڕێکانم لە نزیکی کەشتییە تیژڕۆکانماندا نانیان خوارد. دوای ئەوەی نانو ئاومان خواردوخواردەوە، پەیکێكو یەکێك لە هاوڕێکانم دەگەڵ خۆدا بردو بەرەو کۆشکە بەرزەکەی ئیولوس ڕۆییشتین. سەیرم کرد دەگەڵ ژنو منداڵەکانیدا ڕۆنیشتووەو مژولی سورو بەزمن. کە چووینە ناو کۆشکەکەوە، لەبەر دەرگاکە دانیشتین. سەریان لە گەڕانەوەی ئێمە سوڕما،و لێیان پرسیم:

"ئودیسیوس خێرە! چۆن بوو بۆ ئێرە گەڕایتەوە؟! کام خواوەندی بەدخوا لێت چووە بە قینا؟ خۆ ئێمە هەرچیمان لە توانادا بوو بۆمان کردیت کە بە زووترین کات بگەیتەوە نیشتمانو ماڵی خۆت، یان هەرشوێنێکی دیکە کە خۆت بتەوێ.

کە لەو قسانە بوونەوە، بە دڵێکی کەسەردارەوە وەڵامم دانەوەو گوتم: "هاوڕێکانم هەڵەیەکی کوشندەیان دەرهەق کردم. ئەمە جگە لە خەوی نەفرەتی،خەوم لێکەوت.. بۆیە دەڵێن خەو برای مەرگە. بەڵام ئێوە ئەی دۆستان، فریای بکەونو چارەیەکم بکەن. مەگەر هەر ئێوە بتوانن ئەم کێشەیەم بۆ چارەسەربکەن."

## ئودیسیوس دەگاتە وڵاتی لایستروگونەکان

من بەو شێوەیە قسەم دەکردو دەمویست بە قسەی نەرمو سۆزبزوێن دڵیان نەرم بکەم. کەچی ئەوان هیچ قسەیەکیان نەکرد. ئەنجام بابیان گوتی: "ئەی نەگریس ترین بەشەر، لەم دوڕگەیە بڕۆ، تا زووە لێرە بڕۆ، ئەی نەگریسی بەدکردەوە! من هەرگیز ناتوانم دەستی یارمەتی بۆ کەسێك

درێژ بکەم کە خواوەندان نایانەوێو لێی بە قینن. لێرە بڕۆ، دەی لێرە مەوەستە، تا نەگبەتی تۆ ئێمەشی نەگرتووەتەوە!"

بەو قسانە لە ماڵەکەی خۆی وەدەری نام. خەریك بوو لە داخا شەقم دەبرد.ئیدی لەوێوە دڵتەنگو خەمبار، جارێکی دی بە کەشتیان بە نێو دەریاو شەپۆلان کەوتین. ماندوویەتیو سەوڵ لێدان هێزوشنگی لەبەر زەلامەکان بڕی بوو. ئەمە باجی کەرێتی خۆمان بوو،ودەبووایە بیدەین. هیچ بایەکی نەدەهات تا کەشتییەکان بداتە بەرو بڕۆینە پێش. شەش رۆژو شەش شەوی تەواو بێهودە کەشتیمان ئاژۆت. رۆژی حەوتەم گەییشتینە قەڵای بەرزی لاموس لە تیلیپولوسی خاكو نیشتمانی لایستریگونان، کە شوێنێکە وەختێك ئەم شوانە رانەکەی بۆ دەشتو لەوەڕ رادەدا، دەگەڵ ئەویتردا کە رانەکەی بۆ دۆشین بۆ ماڵ دێنێتەوە، هەمیشە تووشی یەکتر دەبنو سڵاوی یەکتر دەسەننەوە، واتە مەودای بەینی شەوو رۆژ زۆر کورتە. خۆ ئەگەر یەکێك چاوپۆشی لە خەو بکات، دەتوانێ مزوشەرتێکی دوو چەنانە وەربگرێت. مزوشەرتێکی لە بری بردنی چێڵوماڵات بۆ لەوەڕومزو شەرتێکی دی لە بری هێنانەوەی پەزان لەدەشتولەوەڕ. چونکە سوڕانەوەی شەوو رۆژ زۆر لێکترەوە نزیکن. گەییشتنە بەندەرێکی مەزن، کە لە هەرلایەکیەوە تاشە بەردێکی ڕکی بەرز،میناکی دیوار چوو بوو بە ئاسماندا، دووکەناری بەردەڵانی سەخت، بەرانبەر بە یەکدی، چوونەتە پێشیٚوتەنیا رێگەیەکی تەنگ بۆ چوونە ناو بەندەرەکە ماوەتەوە. هەموو هاوڕێکانم کەشتییەکانیان بردە ناو بەندەرەکە، هەموو کەشتییەکانیان لە نێو بەندەرە گەورەکەدا،لە پاڵ یەکەوە بەستەوە.شوێنێکی زۆر کپو مەنگ، ئارامو بێ شەپۆل بوو، کپیوکڕی باڵی بەسەر دەوروبەردا کێشابوو. بەڵام من کەشتییەکەی خۆمم، لە دەرێی بەندەرەکەداو لە پاڵ کەنارەکەدا راگرتو بە گوریسێك بە تاوێرێکمەوە بەست. ئەوسا بە قەدپاڵێکی ڕكو رژدا هەڵگەرامو لەسەر ترۆپکی گابەردێك وەستامو بە هەر چواردەوردا هەڵمڕوانی، هیچ شوێنەوارێکی ئینسان یان حەیوانم بەدی نەکرد. تەنیا دووکەڵێکم بەدی کرد لە عاردیەوە بەرز دەبووەوە. هەنگێ پەیکێكو دوو کەسم لە هاوڕێکانم نارد کە بچن سۆراخێك بکەنوبزانن ئەو خەڵکە نانخۆرەی کە لەو مەرزو بووە دەژین کێن. برادەرانی ئێمە بە کەناری دەریاکەدا، رێگەیەکی تەختو هەمواریان گرتەبەر، رێگەیەك بوو گالیسکانی پێدا دەڕۆیی،وچیلکەو داریان لە شاخە بەرزەکانەوە بۆ شار دەبردەوە. پێش ئەوەی بگەنە شار، تووشی ئافرەتێکی قەڵەوی دێوئاسا بوون. ئەمە کیژی ئەنتیفاتیسی لایستروگۆنی بوو، هاتبوو بۆ سەرکانیو سەرچاوەی ئەرتاکیا، ئەمە کانیوسەرچاوەیەکی سازگارو جوان بوو، کیژان لێرەوە ئاویان بۆ شار دەبردەوە. کە پیاوەکانی من تووشی بوو بوون لە پاشای شارو رەعیەتەکەیان پرسی بوو. کێ پاشایەوفەرمانڕەوایی چ خێڵورەعیەتێك دەکات؟ ئەویش یەکسەر کۆشکە بەرزەکەی بابی پێنیشان دابوون. کە خۆیان بە کۆشکە بەرزەکەدا کردبوو! ژنێکیان بینی بوو بە قەد کەرتە شاخێك، هەر بە جارێ هەترەشیان چووبوو. ئیدی یەکسەر ئەنتیفاتسی مێردی لە مەیدانی شار بانگ دەکاتەوە. ئەنتیفاتس نیازی بەرانبەر بە هاوڕێکانی من خراپ دەبێت، هەر لە رێوە یەکێکیانی گرتوخواردی. دوانەکەی دی هەڵاتنو بەگوێپچڕ گوێپچڕ خۆیان گەیاندەوە کەشتییەکان. پاش ئەوە لە سەرانسەری شاردا جاڕی شەڕی

دا. هەرکە لایستریگۆنانی دلاوەرو شەڕڤان گوێیان لە بانگەوازی شەڕبوو، لە هەموو لایەکەوە بە هەشتاو هاتن.هێندە زۆر بوون لە ژمارە نەدەهاتن. زیاتر لە دێوودرنج دەچوون تا لە بەشەر. لە چیاو قەد پاڵەکانەوە تاوێری ئەوتۆیان تێ دەسرەواندین،کە هیچ تاوێرێکیان بە زەلامێك هەڵندەگیرا. لە شوێنی کەشتییەکانەوە دەنگی هاواروهەنگامەیەکی ترسناك بەرز بووەوە: دەنگی پێکادان و تێکشکانی کەشتییەکان و هاوارو فریادی مەرگی کەشتیوانەکان تێکەڵ بووبوو. لایستریگونەکان، بە تیرو ڕمان بەربوونە کەشتیوانەکانی ئێمەو میناکی ماسی ڕاویان دەکردن و بۆ ماڵیان دەبردنەوە تا بیانکەن بە خۆراکی خۆیان. لە کاتێکدا لایستریگۆنەکان، لە بەندەرەکەدا کەشتیوانەکانیان قەتڵوعام دەکرد، من هەڵم کێشایە شمشێرو پەتوگوریسەکانی کەشتییەکەی خۆمم بڕی. یەکسەر دەستورم بە هاوڕێکانم دا کە بە پەلە بکەونە سەوڵ لێدان، تا بتوانین خۆمان لە مەرگ رزگاربکەین! ئیدی دەموودەست لە ترسی مەرگ، بە پەلە کەوتنە سەوڵ لێدان. لەلایەکەوە بەوە خۆشحاڵ بووم کە دەمبینی کەشتییەکەم لە تاوێرە رژدوڕکەکان دوور دەکەوێتەوەو لە بەرد هاوێژی لایستریگۆنەکان دەرباز دەبێت، ولە لایەکی ترەوە خەمبارو دڵتەنگی ئەوە بووم کە هەموو کەشتییەکانی دیکەو هاوڕێکانم لە بەندەرەکەدا تیاچوون و شتاقیان دەرنەچوون.

## ئۆدیسیوس دەکەوێتە داوی کیرکییەوە

بە دڵێکی پڕ لە خەم و پەژارەوە لەوێندەر بەرێ کەوتین، هەرچەندە هەموو هاوڕێ ئازیزەکانمان لە دەست دابوو،بەڵام دڵخۆش بووین بەوەی کە لە مەرگ دەرباز بووین.گەییشتینە دورگەی (ئایایا)، ئەم دورگەیە بارەگاونشیمەنی کیرکی زوڵف شۆڕ بوو، ئەمە خوابانۆیەکی یەجگار ترسناك بوو، زمانی، زمانی بەشەران بوو، خوشکی (ئایتیس)ی دڵرەق و بەدخوا بوو، هەردووکیان کیژی هیلوسی خواوەندی هەتاو بوون لە پیرسی، (پیرسی)ش کیژی ئۆقیانوس بوو. واتە کیژی هیلوس بوون لە پیرسی. ئیدی کە گەیشتینە ئەوێندەر، بەبێ دەنگی لە بەندەرەکەی ئەوێندەر لەنگەرمان گرت. وادیاربوو خواوەندێك پشتوپەنامان بوو.دابەزین، لامان دایە سەر کەنارەکە، دوو شەوو دوو رۆژ لەوێندەر نووستین. وماندوویەتی خۆمان دەکرد. بەڵام خەمێکی قورس نیشتبووە سەر روح و دڵمان.کە سپێدەی زوڵف شۆڕی کەزی جوان، مژدەی لە دایکبوونی رۆژی سێیەمی دا، هەنگێ نێزەوشمشێرە تیژەکەم هەڵگرت و بە هەشتاو لە کەشتییەکە وەدەرکەوتم،ورۆییشتم تا سۆراخێك بکەم و بزانم هیچ شوێنەوارێکی بەشەری نادۆزمەوە. هیچ دەنگ وسەدایەکم گوێ لێ نابێت. بە هەورازێکی یەجگار رك ورژدو سەختدا هەڵگەڕام. لەو سەرەوە وەستام و هەڵمڕانییە دەوروبەر، لە دوورەوە دووکەڵێکم بینی کە لە کۆشکەکەی کیرکییەوە، لە دەڤەرێکی پڕ لە ڕێگەوبانی پان وبەرین، لە نێو لێرەوارێکی چڕە دارستانی پڕ لە داربەڕووەوە هەڵدەستا. ئیدی تیا مابووم چی بکەم و چی نەکەم. بە خۆم بڕۆم بۆ لای دووکەڵەکەو بزانم چییە؟! ماوەیەك بیرم کردەوەوئەوسا هاتمە سەر ئەو قەناعەتەی کە باشتر وایە بگەڕێمەوە بۆ لای کەشتییەکەم و نانێك دەرخواردی هاوڕێکانم بدەم وپاشان هەندێکیان بنێرم بۆ تاقیب وشناسایی. بەڕێکەوتم، لە کەشتییەکە نزیك بوو بوومەوە، وادیارە یەکێك لە

خواوەندەکان بەزەیی بە تەنیایی وسەرگەردانی مندا هاتبووەوە، کەڵە ئاسکێکی قۆچ درێژی پێچاو پێچی، ڕێك هێنایە سەر ڕێگاکەم. وادیاربوو گەرمی هەتاو تەنگەتاوی کردبوو، ولە جەنگەڵەکانەوە داگەڕابوو، وهاتبووە خواریێ کە لە رووبارەکە ئاوبخواتەوە. لەو کاتەدا کە لە جەنگەڵەکە دەرکەوت، نێزەیەکم سرەواندە بڕبڕەی پشتی، نێزە بڕونزیەکەم ڕێك، لە پشتی چەقی، یەکسەر بارەی لێهەستاو کەوتە سەر زەوی،تۆزێك لەقە فرتێی کردو گیانی دەرچوو. چووم پێم خستە سەر کەلەشەکەی ونێزەکەم لە زامەکەی دەرهێنا، ولەوێ لەسەر عاردەکە بەجێم هێشت.ئیدی هەندێ لە بان و زەل وتەرکەی بیم خرکردەوەو کندرێکی درێژو قایمم لێدروست کردو هەرچوار پەلی کەڵەکەم پێبەست، ئەوجا دام بە کۆڵماو بەرەو کەشتییەکە ڕۆییشتم. نێزەکەم وەکو دارعاسا بەدەستەوە گرتبوو، ولە ڕێکردندا خۆم بەسەریا دەدا، کەڵەکە یەجگار گەورە بوو، وانەبوایە نەمدەتوانی. کە گەیشتمە بەردەم کەشتییەکە، پیرە کەڵم لێ بە عاردیدا داو ئیدی هاوڕێکانم گاز کردو یەك یەك ورەم بەرز دەکردنەوەو قسەی خۆشم بۆ دەکردن ودەمگوت:

" برادەرینە، هەرچەندە وەزع وحاڵمان زۆر خراپە. بەڵام تا ئەجەلمان نەیەت، نامرین و ناچینە هادیس.کەواتە تا ئەجەلمان نەهاتووەو تا خواردن و خواردنەوەمان پێیە، وەرن خەمێکی خواردن بخۆین، با برسێتی بڕستمان لێنەبڕێت." هەرکە ئەو قسانەم کرد،خێرا بە گوێیان کردم، سەریان قوتکردەوەو رووی خۆیان دەرخست،وبە کەناری دەریاکەدا ڕۆییشتن سەیری کەڵە کێویەکە بکەن، زۆریان سەرسوڕما، چونکە بەڕاستی گیانلەبەرێکی زۆر زەلام بوو. دوای ئەوەی تێر سەیریان کرد،دەستیان شۆردوبەزم وخوان وخواردنێکی ڕەنگینیان سازکرد.ئیدی ئەو ڕۆژە تا ئێواریێ لەسەر خوان دانیشتنین وگۆشتمان خواردو بادەی بەلەزەت و بە تاممان خواردەوەو پاشان کە ڕۆژ ئاوا بوو،تاریکی باڵی بەسەر دنیادا کێشا، هەموو لە کەناری دەریاکە لێی پاڵکەوتین و خەوتین.کە سپێدە، بە قامکە گوڵینەکانیەوە بەیانی دا، هاوڕێکانم کۆکردنەوەو پێمگوتن:

"برادەرینە، گوێبگرن، گومانی تیا نییە کە لە تەنگانەو ئاستەنگێکی گەورەو دژواردایین، نازانین ڕۆژهەڵات کەوتووەتە کوێندەر وڕۆژاوا کەوتووەتە کوێندەریێ. نازانین ڕۆژ لە کوێوە هەڵدێ و لە کوێوە ئاوا دەبێت. جا وەرن با بە تەگبیرو ڕاوێژ بیرێك لە حاڵی خۆمان بکەینەوە،بزانین چ چارەیەکمان پێدەکرێت؟ من بەش بە حاڵی خۆم پێموایە هیچ چارەسەرێك نیە،چونکە ئەم بەیانییە چوومە سەر بەرزترین شوێنی ئەم ناوەو تا چاوهەتەر دەکات هەڵمڕوانی. ئێمە لە نێو دوورگەیەکداین کە دەریای بێ سنوور زۆر بە جوانی دەوری داوە. دوورگەکە لە نزمی دایەو، و بە چاوی خۆم دووکەڵێکم بینی کە لە ناوەندی بێشەیەکی چڕە دارستانەوە بە ئاسمانا دەچوو.

بەو قسانەی من، بە جاریێ نەترەیان بەردا. کە بیریان کەوتەوە ئانتیفاتیسی لایستریگۆنی چی پێکردین، بیریان کەوتەوە،کە یارۆی سیکلۆپی دڕودڕندە، ئەو بنیادەمخۆرە چی پێکردین، هەموو ترسیان لێنیشت، هاواریان پێکەوت. بە دەنگی بەرز کەوتنە گریان و ڕوندکیان وەکو باران لە چاو باری،بەڵام گریەوزاری هیچ دادێکی نەدا.

## هاوڕێیانی ئۆدیسیوس دەبن بە بەراز

ئیدی هاوڕێ جەنگاوەرەکانم ژماردن. دابەشم کردن بەسەر دوو دەستەدا، وبەخۆم سەرکردایەتی وسەرپەرشتی دەستەیەکیانم لە عۆدەگرت، وسەرکردایەتی وسەرپەرشتی دەستەکەی دیکەشم بە ئوریلوشوس-ی خواوەند ئاسا، سپارد. ئەوسا پشکمان خستە کڵاو خودێکەوە، پشکەکە بەناوی ئوریلوشوس-ی دلاوەروجوامێرەوە دەرچوو. دەگەڵ بیستودوو هاوڕێدا، کە هەموویان دەگریان، بەڕێکەوت. کە لێکدی جیا بووینەوە هەم ئەوان گریانو هەم ئێمەش. ماڵەکەی کیرکی-یان کە لە بەردی تاشراووڕەخشان، لە ناو دۆڵێکولە شوێنێکی تەختانی وکراوەدا دروستکرابوو،دۆزییەوە: کۆمەڵێك گورگی کێویو شێر بە دەوری کۆشكو سەراکەوە بوون، کە کیرکی بەداودەرمانو جۆشانە ئەفسوونی کردبوونوخستبوونیە ژێر رکێفو فەرمانی خۆیەوە. ئەو گیانلەبەرانە پەلاماری پیاوەکانیان نەدام، بەڵکو دەوریان دانو بە کلکە لەقێ پێشوازیان کردن.وەکو چۆن کسۆکالن،کاتێ خاوەنەکەیان لە زیافەت ودەعوەتان دێتەوە،دەچنە پێشوازیو کلکەسوتێی بۆ دەکەن، چونکە دەزانن، شتێکیان لەگەڵ خۆدا بۆ دێنێ، بەو ئاوایە گورگەکانوشێرەکان لە پیاوەکانی من دەچوونە پێشیو پێشوازیان دەکردن. بەڵام پیاوەکانی من بە دیتنی ئەو گیانلەبەرە غەریبانە، ترسیان لێنیشت. بەپەلە خۆیان گەیاندە بەردالانی کۆشکەکەی کیرکی، خوابانۆی کەزی شۆڕو، لەوێندەر وەستان. گوێیان لێ بوو، کیرکی لە ژوورەوە، بە دەنگوئاوازێکی خۆش گۆرانی دەوتو کاری لەسەر دەزگای چنینەکەی دەکرد. پارچەیەکی جوانی ناسکی رەنگاورەنگی رەخشانی دەچنی، لە ناسکی ودڵگیریو رەخشانیدا هەر لە کاری خوابانوان دەچوو. لێرەدا پولیتس، کە پێشەنگی جەنگاوەران بوو، وئازیزترین هاوڕێو دڵسۆزترین برادەری من بوو، روویان تێدەکاتودەڵێت:

"برادەران کەسێك لە ژوورەوەیەو بەدیار دەزگایەکی گەورەوەیەو حەریرودیبا دەچنێ، و گۆرانیو سترانێکی هێندەخۆش دەچڕێ، کە لە هەموو دەڤەرەکەدا دەنگ دەداتەوە. ئیدی یا خوابانۆیەکە یا خانمێکی خانەدانە، با بە پەلە بانگی بکەین".

هەرکە لە قسەکەی بووەوە، ئەوانی دی بانگیان لێکرد. یەکسەر دەرگا پرشنگدارەکان کرانەوە، خوابانۆ،کیرکی هاتەدەرێ، خوڵکی کردن کە بچنە ژوورەوە. هەر هەموویان جگە لە یوریلوشوس، شێتانە دوای کەوتن، یوریلوشوس هەستی بە فێڵودەهۆیەك کردبوو، ونەچوو بووە ژوورەوە. کیرکی بردنیە ژوورەوە، لەسەر کورسیو تەختان داینیشاندن. ئەوسا پەنیرو ئاردی جۆو هەنگوینی سەوزی لە بادەی پرامنوسدا تێکەڵ کرد،ودەرمانی خراپی بۆ لە جامی شەرابەکانیان کرد، تا بە تەواوەتی هەر جۆرە یادێکی وڵاتو نیشتمانی بابوباپیرانیان لە هەستومێشكو ویژدان بسڕێتەوە. کە شەرابەکەی دانیو هەموو خواردیانەوە، گۆچانێکی جادوویی پێدا کێشانو یەکسەر بوون بە بەرازوبردنی، لە ئاغەڵی بەرازەکانی خۆی پەستان. سەروسیمایان، دەنگیان، قژو مووی لەشیان، شێوەو هەیئەتیان هەر هەمووی گۆڕاو بوو بەهی بەراز. بەڵام ئەقڵو ئاوەزیان، وەکو جاری جاران، بێ هیچ گۆڕانێك مابووەوە. بەو جۆرە لەو ئاغەڵەدا، لەو زندانەدا دەگریان.کیرکی، بەڕو، زریسكو ئاردی، کە خۆراکی ئاسایی بەرازانە، دەکردنە بەر تا بیخۆن.

## ئودیسیوس گوێ لە مەینەتی هاوڕێکانی دەگرێ

یوریلوشوس، بە پەلە بۆ لای کەشتییە رەش دەگەڕێتەوە تا هەواڵ‌وچارەنووسی خەمناکی هاوڕێکانیمان پێبگەیەنێ. لە داخا زمانی بەسترابوو ونەیدەتوانی تاقە قسەیەك بکات. چاوانی تەژی رونداک بوون‌ولە گریان زیاتر هیچی لە دەست نەدەهات. بەڵام کە بەسەرسامی داوامان لێکرد واریقاتەکەمان بۆ بگێڕێتەوە، هەنگێ دەستی بە گێڕانەوەی بەسەرهاتی هاوڕێکانی کردو گوتی:

"ئەی ئودیسیوسی خانەدان، وەکو چۆن تۆ فەرموو بووت، بەو شێوەیە بەنێو بێشەی دار بەڕووەکاندا چووینە پێشێ. لە قوڵایی دۆڵەکەدا، لە شوێنێکی هەمواروکراوەدا، کۆشك‌و سەرایەکی زۆر جوانمان بینی کە لە بەردی تاشراوی ڕەخشان دروست کرابوو،کەسێك لە نێو کۆشکەکەدا، نازانم خوابانۆ بوو یان ژن، بە دیار کارگەیەکەوە (دەزگا) خەریکی دیباچنین بوو، و بە دەنگێکی ناسك‌وخۆش گۆرانی دەچڕی. هاوڕێکانم بە دەنگی بەرز بانگیان لێکرد، یەکسەر هاتە دەرێ، دەرگایەکی پرشنگداری کردەوەو خوڵکی کردین بچینە ژوورەوە. هەنگێ هەمووان شێت ئاسا، بێبیرکردنەوەو سڵەمینەوە دوای کەوتن‌وچوونە ژوورەوە. بەڵام من کە هەستم بە فەندو فێڵێك کردبوو. لە جێی خۆم نەجولاّم‌و نەچوومە ژوورەوە. هەنگێ هەموو برادەران ون بوون، شتاقیان نەگەڕانەوە.ماوەیەکی زۆر لەوێندەر مامەوەو بێهودە چاوەڕوانم کردن.

## ئودیسیوس لێدەبڕێ بچێتە هیمدادی هاوڕێکانی

کە گوێم لەو قسانەی بوو، شمشێرە زیونیشانەکەم کردە شانم. شمشێرێکی برونزی گەورە بوو، ئەوسا کەوانەکەشم لە شانم کرد. داوام لە یوریلوشوس کرد کە لەگەڵمدا بگەڕێتەوەو رێگەم پێ نیشان بدات. دەستەودامێنم کەوت، لە بەرم پاڕایەوە، بەدەم گریانەوە گوتی:

"ئەی زیوسزادە، تکایە بۆ ئەوێندەرم مەبەرەوە. دڵنیام نە خۆت بە سەلامەتی دەگەڕێیتەوەو نە هیچ یەکێك لە هاوڕێکانت دێنیتەوە. باشترین کار ئەوەیە لەگەڵ ئەم چەند کەسەدا کە ماونەتەوە، بەلەز هەڵێین، رەنگە بتوانین خۆ لە چنگی شوومی مەرگ رزگاربکەین."

کە لە قسەکانی بووەوە، بەرسڤم دایەوەوگوتم:

"ئەی ئوریلوشوس، تۆ لێرە وەمێنە. بۆ خۆت لە ناو کەشتییەکەدا دانیشەو بخۆو بخۆرەوە.. بەڵام من دەبێ بڕۆم بۆ ئەوێندەر، ئەرکی سەرشانمە کە بچمە سۆراخیان."

## هیرمیس هاوکاری ئودیسیوس دەکات

ئەوجا لە کەشتییەکە دابەزیم، بە نێو بێشەو دۆڵە ئەفسوناویەکان کەوتم. زۆرم نەما بوو بگەمە ماڵە گەورەکەی کیرکی، کە خاوەنی هەزاران داودەرمان‌وجۆشانەی ئەفسوناوییە. من بەڕێوە بووم کە لە پڕ هیرمیسی زێڕین گۆچان هاتە سەر رێگام. چووبووە کڵێشەی گەنجێکی جوانەوە کە تازە خەتی دابێ، ئیدی ژیانی لێهەڵدەقولا، دەستی گرتم‌وگوتی:

"ئەی بێنەوا، ئەی کلۆڵ، بۆ کوێ دەڕۆی، بۆچی بە تاقی تەنیاو بەنابەڵەدی بە نێو ئەم هەورازو نشێوانە کەوتووی؟ بە داخەوەم کە هاوڕێکانت لە ماڵی کیرکی دا، لە شێوەی بەرازدا، وەکو بەرازە کێوانی دی لە ئاغەڵان توند کراون. گەرەکتە بچی رزگاریان بکەی؟ من دڵنیات دەکەم کە ناگەڕێتەوە، تۆش لە هەمان شوێنی ئەوانی دیدا دەمێنیتەوە. بەڵام خەمت نەبێ، من فریات

دەکەوم‌و لە هەر ئاستەنگ‌وتەنگانەیەکت دەربازدەکەم. بەر لەوەی بچی بۆ ماڵی کیرکی، ئەم چڵە گیایە لەگەڵ خۆتدا بەرە، کە لە هەموو شەڕوبەڵایەکت دەخەلەسێنێ. جا گوێبگرە با هەموو ئاین‌و ئۆینە ئەفسوناوی‌و زیانبارەکانی کیرکی–ت پێ بڵێم. لە پێشا شەرابێکت بۆ دێنێ، دەرمانێکی تێکەڵ دەکات‌وبۆت لە جام دەکات، بەڵام بەو حاڵەشەوە ناتوانێ ئەفسوونت بکات، چونکە ئەو چڵە گیایەی کە دەتدەمێ سیحرەکەی بەتاڵ دەکاتەوە. خەمت نەبێ هەموو کارەکانیت موو بە موو پێدەڵێم: کە کیرکی بەداردەستە درێژەکەی خۆی لە تۆ دەدات، تۆ بێ سێ‌و دوو شمشێرە تیژەکەت هەڵکێشەو بەجۆرێ پەلاماری بدەو وەکو ئەوەی بتەوێ بیکوژیت. هەنگێ لێت دەسڵەمێتەوەو داوات لێدەکات لەگەڵیا بخەوی.بە هەرحاڵ تۆ بەر لەوەی لەگەڵیا بخەوی خۆت گران بگرەو داوای لێبکە هاوڕێکانت ئازاد بکات‌و زەمینەی گەڕانەوەش بۆ تۆ خۆش بکات.. و ئەوسا واداری بکە سوێندی گەورە بە خواوەندانی موبارەك‌وجاویدان بخوات‌وبەڵێنت بداتێ کە هیچ ئۆینێکی لە ژێر سەردا نیەو کە رووتت دەکاتەوە،لە نێراتی‌وپیاوەتیت نەخات.

ئەرجایفونیتس (هیرمیس) ئەو قسانەی کردو ئەو گیایەی دامێ کە لە ئەرزەکەی هەڵکەندبوو، خەسڵەت‌وکارایيەکانی پێگوتم. رەگ‌وریشەکەی سپی بوو،بەڵام گوڵەکەی سپی وێنەی چۆڕی شیربوو. ئەمە خوداوەندان (مۆلی) پێدەڵێن، ودژە ئەفسوونە.هەڵکەندنی بۆ بەشەرانی فانی دژوارو ئەستەمە، بەڵام خواوەندان توانایان بەسەر هەموو کارێکدا دەشکێت.

دوای ئەوە هیرمیس، بەنێو دورگە چڕەدارستانەکەدا تێپەڕی‌و بەرەو ئولەمپی مەزن‌و موبارەك رۆیی. منیش رێگەی ماڵی (کیرکی)م گرتەبەر، وبە دەم رێگەوە هەزارو یەك بیروخەیاڵم بە مێشك‌و دەروندا دەهات. لە ژێر داڵانی کۆشك‌وسەراکەی خوابانۆی زولف شۆڕدا وەستام. هەر لە جێی خۆمەوە بانگم کرد. خوابانۆ گوێی لە دەنگم بوو، دەست بەجێ هاتە دەرێ. دەرگایەکی بریقەداری کردەوەوخولکی کردم کە وەژووربکەوم. بە دڵێکی خەمناکەوە شوێنی کەوتم. بردمیە ژوورەوە لەسەر کورسیەکی زیونیشان دای نیشاندم. کورسیەکی فرە جوان بوو، چوارپایەیەکی نزمیشی لەبەردەم دانا تا پێی لەسەر دابنەم. شەرابێکی بۆ لە جامێکی زێڕینندا ئامادە کردم‌و دەرمانێکیشی تێکرد. نیازی خراپ بوو. بەڵام کە لێم وەرگرت‌و دواچۆڕیم هەڵدا، ئەفسوونی نەکردم، ئەوسا دارێکی پێداکێشام‌وگوتی: "دەی بڕۆ بۆ ئاغەڵی بەرازەکان‌و دەگەڵ هاوڕێکانی ترت دا پاڵی لێبدەوە".

## ئۆدیسیوس بۆڕ بە کیرکی دەدا

هەرکە ئەو قسەیەی کرد، یەکسەر هەڵم کێشایە شمشێرو وەك ئەوەی بمەوێ بیکوژم، پەلامارم دا. پڕ بە زار هاواری کردو خۆی خستە سەر دەست‌وپێیانم، وبە دەم پاڕانەوەو گریانەوە گوتی: "تۆ کێی؟ خەڵکی کوێی؟ لە کوێوە دێی؟ خەڵکی کام شاریت، داك‌و بابت لە کوێن؟ زۆرم پێ سەیرە کە چۆن ئەو دەرمانەی خواردتەوە ئەفسوونی نەکردیت، هەر مرۆڤێك خواردبێتیەوە، هەر ئەوەندە چوو بێتە زارییەوە، ئیدی نەیتوانیوە خۆی لەبەری بگرێت. دیارە دەبێ دژە جادویەکت لە رووح‌و دەرووندا هەبێ‌و ئەفسوون‌و جادوو کارت تێنەکات. دیارە دەبێ تۆ ئەو ئودیسیوسە بەردەبارە بیت کە زۆر جار هیرمیسی زێڕین گۆچان بۆی باس کردوم کە کاتێ لە تەروادەوە بە

کەشتییە رەشباوە تیژڕۆکەی خۆی بەرەو وڵاتی خۆی دەگەڕێتەوە، رێی دەکەوێتە ئێرە. بە هەر حاڵ ئێستا شمشێرەکەت بخەرەوە کێلان، با بچینە سەر تەختە خەوەکە-ی من، تا لەوێندەر تێك بئاڵێین وجووت ببین، بۆ ئەوەی لە ئێستا بەدواوە متمانە بە یەکتر بکەین ولێکدی نەترسین."
کە لە قسەکەی بووەوە، وەڵامم دایەوەوگوتم:
"ئەی کیرکی، ئاخر من چۆن باوەڕ بە تۆ بکەم. چۆن دەتوانم ببم بە دۆستی تۆ لە کاتێکا تۆ هاوڕێکانت لە ماڵەکەی خۆتا کردووم بە بەراز؟ کە مینشت لێرە گل داوەتەوەو دەتەوێ بمبەیتە ژوورەکەی خۆت وداوای هەفخەویم لێدەکەی دیارە ئۆینێکت لە ژێر سەردایە.دەتەوێ هەرکە چەکت کردمو لە بەر دەستتدا رووت بوومەوە، هەنگێ لاوازو بێدەسەڵات لە پیاوەتی ونێراتیم بخەیت. نەخێر ئەی خوابانۆ، دڵنیابە من لەگەڵتدا نایەمە ناو جێگەوە تا سوێندی گەورەم بۆ نەخۆیت و بەڵێنی تەواوم نەدەیتێ کە هیچ خراپەیەکم دەرهەقە ناکەیت، هیچ داوێکی تازەم بۆ نانەیتەوە."

## کیرکی بەڵێن بە ئودیسیوس دەدات

کە لە قسەکەم بوومەوە، کیرکی دەستبەجێ وەکو چۆنم دەویست بەو ئاوایە سوێندی بۆ خواردم کە هیچ زیانێکم پێ ناگەیەنێت. کە بەڵێنی دامێ و لە سوێندەکەی بووەوە، چوومە سەر تەختە خەوە بەشکۆو جوانەکەی.
لەو کاتەدا کارەکەرەکانی لە ماڵەکەدا سەرگەرمی کاری خۆ بوون. چوار کارەکەر کاروباری ماڵەکەیان ئەنجام دەدا: ئەمانە کچانی سەرچاوان، بێشەزاران،و روبارانی موبارەك بوون کە دەڕژانە دەریاوە. یەکێکیان پەردەی جوانی ئاوریشمی ئەرخەوانی بەسەر کورسیەکاندا دەدا،و گلیمی کەتانی لە ژێردا راخستن. دووەمیان مێزی زیوینی هێناو لە بەردەم کورسیەکاندا دانان و سەلەوسەبەتەی زێڕینی لەسەر دانان. سێیەمیان بادەی بەتامی دەگەڵ هەنگوینی بۆنخۆشدا تێکەڵ دەکردو لە تاسێکی زیویندا تێکەڵی دەکردو جامی زێڕینی لەسەر مێزەکان دادەنا. چوارەمیان ئاوی هێنا، لە مەنجەڵێکی گەورەی کرد، خستییە سەر سێکوچکەیەك و ئاگری نایە ژێری و ئاوەکە وردە وردە دەهاتە کوڵ. دوای ئەوەی ئاوەکە لە مەنجەڵە برونزینە بریقەدارەکەدا هاتە جۆش وکوڵ، بردمیە حەمامەوە. ئاوەکەی ساردو گەرم کرد.سەروشان و ملی بەو ئاوە شتم، تاماندوویەتیم بە تەواوەتی دەرچوو. دوای ئەوەی پاك شتمی و بە زەیتی زەیتون شێلامی و چەوری کردم، رۆبێکی بەسەر کراسێکی جواندا لەبەر کردمو بۆ هۆڵێکی گەورەی بردمو لەسەر کورسیەکی زیونیشان، کە زۆر وەستایانەو هونەرمەندانە کەندەکاری کرابوو، دانیشاندمو چوارپایەکی نایە ژێر پێم. ئەوسا ژنێکی کارەکەر لە ئافتاوەیەکی زێڕدا ئاوی هێناو تەشتێکی زیوین-ی لە ژێر دەستمدا داناو، ئاوەکەی بە دەستمدا کرد. مێزێکی زۆر خاوێنی لە بەردەمم دانا. کەیبانۆیەکی سەلاروسەنگین، نانی هێناو لەسەر مێزەکەی دانا،ئەوسا هەرچی جۆرە خواردنێکی هەبوو، لەسەر مێزەکە بۆی ریز کردم. کیرکی خوڵکی کردم کە نان بخۆم، بەڵام دڵم نەی دەبرد. بیروهۆشم لەلای شتێکی تربوو. بەگومان بووم. دوا رۆژێکی شووم وتاریکم لە بەردەم خۆدا دەبینی.

وەختی کیرکی بینی کە دەست بۆ خواردنو خواردنەوەکە نابەمو خەمێکی گەورەم لە دڵ بارە،و نیگەرانییەکی فرە نیشتووەتە سەرسیمام، هاتە لامەوەو بە پەلە گوتی:
"ئەی ئودیسیوس، بۆچی کڕوکپ دانیشتوویتو دەست بۆ خواردنو خواردنەوە نابەیتو روحی خۆت ئازار دەدەی؟ چیە لە فێڵودەهۆیەکی نوێ دەترسیت؟ لە من بە گومانی؟ پێویست بە هیچ ترسو نیگەرانیەك ناکات، چونکە من سوێندی گەورەم خواردووە، پەیمانم داوە کە ئازارت نەدەم، هیچ ئاسیوێکت پێنەگەیەنم."
وەڵامم دایەوەوگوتم: "ئەی کیرکی، چ پیاوێکی ئەقڵمەند، هاوڕێکانی لە زینداندا بن، دڵی خواردنو خواردنەوە دەبات؟ ئەدی نابێ ئازادیان بکاتو بە چاوی خۆی بیان بینێ؟ ئەگەر راستەو نیازت پاکە، فەرموو هاوڕێ وەفادارەکانم ئازاد بکە، با بە چاوی خۆم بیاندینم، ئەوسا بۆ خورادنو خواردنەوەم خوڵك بکە."

## بەرازەکان دەبنەوە بە بەشەر

هەرکە لە قسەکەم بوومەوە، کیرکی بە خۆو داروەدستەکەیەوە بە هۆڵە گەورەکەدا رۆیی. دەرگای ئاغەڵەکەی کردەوە، بەرازەکانی هێنایە دەرێ. هێندە قەڵەو بوون لە تۆ وایە بەرازی نۆ ساڵەن. ئیدی لە شێوەی بەرازدا بە ریز لە بەردەمیا وەستان، بەسەریاندا گەڕاو، دەرمانێکی ئەفسووناوی دیکەی لە هەر یەکێکیان دا. ئەو تووكو کوڵکەی کە بە زەبری دەرمانە شوومەکەی کیرکی، لە لەشیان روا بوو، هەموو هەڵوەری. دووبارە بوونەوە بە بەشەرانی گەنجتروجوانترو باڵا بەرزتر لە جاران. هاوڕێکانم ناسیانمەوەو یەك یەك تەوقەیان دەگەڵ کردمو لە خۆشیاندا دەستیان بە گریان کرد. ئیدی سەڵای گریان لە کۆشکەکەدا دەنگی دایەوە، تەنانەت خوابانۆش دڵی پێیان سووتاو بەزەیی پێیاندا هاتەوە. هەنگێ خوابانۆی ناسكو نازدار هاتە لامەوەوە گوتی:
"ئەی زیوسزادە، ئەی ئودیسیوسی دووربینو بەردەبار، ئەی کوڕی لایرتیس، هەر ئێستا بڕۆرەوە بۆ لای کەشتییە تیژرۆکەت، بڕۆرەوە بۆ کەناری دەریا، بەر لە هەر شتێك کەشتییەکەت راکێشە سەر زەوی. هەرچیت هەیە، لە کەرەستەو پێویستیانو گوریسو کندرو بادەوان لە ئەشکەوتەکانی ئەو ناوەی تەقەت بکە. ئەوسا بێرەوە بۆ ئێرە، هاوڕێ دڵسۆزو وەفادارەکانیشت لەگەڵ خۆدا بێنە."

## ئودیسیوسو هاوڕێکانی دەچنە لای کیرکی

ئەقڵم پێشنیازەکەی کیرکی بڕی.دڵەی سەرکێشم نەرم بوو. بەرەو کەشتییە تیژڕۆکەمو کەناری دەریا وەرێکەوتم. سەیرم کرد هاوڕێکانم لە دەوری کەشتییەکەنو بەکوڵ دەگرینو وەکو بارانی بوهار فرمێسکان دەڕێژن. وەکو چۆن گاگەلێك لە دەشتو لە لەوەڕ دێنەوەو گوێرەکەی نێو ئاغەڵ، لەخۆشیاندا پەرژینو تەیمانان دەبەزێننو بە دەوری دایکیانا دەکەونە هەڵبەزودابەزو بە بۆرە بۆڕ دەوروخولی دایکیان دەدەن، بەو ئاوایە، هاوڕێکانی منیش هەرکە چاویان پێم کەوت، بە گریان دەوریان دامو هێندە دڵیان خۆش بوو، کە دەتگوت گەییونەتەوە زێدی خۆیان، شاری

ئیتاکای سەختو عاسی، ئەو شارەی کە تیایدا لە دایك بووبوون. کە تیایدا پەروەردەو گەورە بوو بوون. بەدەم هەنسكوگریانەوە، بە تاسەوە گوتیان: "ئەی زیوس زادە، گەڕانەوەی تۆمان هێندە پێخۆشە، دەڵێی گەیشتووینەتەوە مەفتەنی خۆمان، ئیتاکای ئازیز. باسی بەسەرهاتو چارەنووسی هاوڕێکانی ترمان بۆ بکە."

بە قسەی خۆش وەڵامم دانەوە: "با جاریّ کەشتییەکە لە ئاو دەربێنینو رای بکێشینە سەر عاردی. هەموو کەرەستەو پێویستییەکانی ترمان لە ئەشکەوتاندا بشارینەوە، ئەوسا بە پەلە شوێنم بکەون تا بڕۆین بۆ ماڵە موبارەکەکەی کیرکیو لەوێندەر بە چاوی خۆ هاوڕێکانمان ببینن کە چۆن سەرگەرمی خواردنوخواردنەوەنو هەرچیەکیان بویّ لەبەر دەستیانەو لە هیچیان کەم نییە."

هەرکە ئەو قسانەم کرد، هەموو، یەکسەر بەگوێیان کردم، تەنیا یوریلوشوس نەبێت کە دەیویست پەشیمانیان بکاتەوەو،بە دەنگی بەرز پێی گوتن: "ئەی نەگبەتینە، دەتانەویّ بۆ کویّ بچن، بۆ ئەوەندە ئاشقە مەینەتن؟ دەتانەویّ بەپێی خۆتان بچن بۆ ماڵی کیرکی تا بتان کات بە بەراز، یان گورگ، یان شێرو بە زۆر ناچارتان بکات پاسەوانی ماڵەکەی بکەن؟ لە بیرتان چووەوە کە یارۆی سیکلوپ، وەختیّ هاوڕێکانمان بەگەڵ ئودیسیوسی سەرکێش کەوتنو چوونە ئاغەڵی پەزەکانییەوە، چی پێکردن. هەر هەموویان بوون بە قوربانی خۆسەریو ریسکی ئەم پیاوەو تیا چوون.

کە گوێم لەو قسانەی بوو زۆرم لەبەر گران بوو. تیا مابووم چی بکەم. لە سیّودووی ئەوەدا بووم، هەرچەندە لە سکەوە خزمی نزیكو یاری وەفادارم بوو، هەڵ بکێشمە شمشێرو لە ملی بدەمو سەری بپەڕێنمو هەواڵەی دۆزەخی بکەم. بەڵام هاوڕێکانم یەك یەك کەوتنە بەینەوەو بە قسەی خۆش هێوریان کردمەوەوگوتیان:

"ئەی زیوسزادە، ئەگەر خاتری ئێمەت دەویّ، با ئەم پیاوە لێرە بەجیّ بێڵێنو پاسەوانی کەشتییەکە بکات،وئێمە هەمووومان لەگەڵتا دێین بۆ ماڵی کیرکی". ئەوسا یەکسەر لە کەشتییەکە وەدەرکەوتنو چوونە کەناری دەریاکە. (ئوریلوشوس)ش نەمایەوە، بەڵکو ئەویش بەگەڵمان کەوت، چونکە لە گلەییەکانی من زۆر ترسا.

لەم ماوەیەدا کیرکی لە ماڵەکەی خۆیدا خزمەتێکی زۆری هاوڕێکانی دیکەی کردبووم. میوانداری باشی کردبوون. رای سپاردبوو، سەرولەشیان بشۆنو زەیتی زەیتونیان لیّ هەڵسوونو جلو بەرگو کراسی خوریو پاڵتۆیان لەبەربکەن. ئێمە هەموو هاوڕێکانی خۆمان بینی کە لە هۆڵە گەورەکەدا مەجلیسی بەزمو سووریان گەرم کردبوو. کە یەکتریان بینی رووبەڕووی یەکتر بوونەوە، هەموو لە سەلای گریانیان داو، دەنگی گریان هەموو ماڵەکەی پڕ کرد، هەنگیّ خوابانۆی سەرفراز هاتە لامەوەو گوتی:

"ئەی زیوس زادە، ئەی کوڕی لایرتیس، ئەی ئودیسیوسی چارەساز، ئەی دووربینی بەردەبارە، بە هاوڕێکانت بڵیّ واز لەم شینوگریانە بێنن. من دەزانم لە دەریای پڕ ماسیدا چ دەردو مەینەتیەکتان بەسەر هاتووە،و خەڵکی ستەمکار لەسەر زەوی چ دەردێکتان پیّ داون. هەموو

ئەمانە دەزانم. بەڵام ئەوەی چووچوو، ئێستا پێویستیان بە خواردن‌و خواردنەوەیە، تا تۆزێك ببوژێنەوەو،گوڕێکتان تێبگەڕێ‌و روحێکتان بکەوێتەوە بەر. وەکو ئەوساتان لێبێتەوە کە لە وڵاتی خۆتانەوە، لە ئیتاکای بەردەڵانی پڕگاشەوە بەڕێکەوتن. ئەمڕۆکە هێزوشنگتان لەبەر بڕاوە،هەمیشە بیرتان لەلای سەفەرە دژوارەکانتانە، خەیاڵتان لەلای دەردو مەینەتیەکانتانە، چونکە تاڵییەکی زۆرتان چەشتووەو ناخۆشییەکی زۆرتان جەڕباندووە. تروسکەی شادی لەدڵتاندا بەدی ناکرێت".

## کیرکی بە سەفەری ئودیسیوس قاییل دەبێت

بەو قسانەی کیرکی زۆر دڵخۆش بووین. یەك دانە ساڵی تەواو لەوێندەر ماینەوە، بە درێژایی ئەو ساڵە، هەموو رۆژێکمان هەر بەزم‌وسوور بوو. خواردنمان گۆشتی زۆرو خواردنەوەمان شەرابی بەتام‌و لەزەت بوو. بەڵام کە ساڵێك بوری، وەرزان گۆڕان، مانگ‌و رۆژانی درێژ تێپەڕین. هاوڕێ دڵسۆزەکانم بردیانمە پەنایەکەوەو گوتیان: "ئەی بەدبەخت، ئەی بەلەنگاز، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە بیرێك لە زێدو نیشتمان بکەیتەوە. ئەگەر قەدەر رزگاری لە چارە نووسیبیت‌و پێی رەوا بینیبیت بە سەلامەتی بچیتەوە ناو کۆشکە بەرزەکەت‌و خاکی باب‌وباپیرانت".
سەیرم کرد قسەکەیان زۆر بەجێیە، دڵم نەرم بوو. ئیدی ئەو رۆژە، تاکو خۆرئاوا هەر خەریکی بەزم‌و سوور بووین. تا توانیمان گۆشتی برژاوو شەرابی بەتام‌و لەزەتمان خواردو خواردەوە. کە خۆرئاوا بوو، تاریکی باڵی بەسەر دنیادا کێشا، هاوڕێکانم چوون لەداڵانە زۆرو زەبەندەکانی کۆشکەکەدا بخەون. بەڵام من دوای ئەوەی خۆم بەجێگا نەرم‌و شکۆدارەکەی کیرکی دا کردو لەگەڵیا خەوتم، کڕنۆشم بۆ برد. لاقم ماچ کرد. لەبەری پاڕامەوە، ئەویش دڵی نەرم بوو، گوێی لێ گرتم. بە دەنگی بەرز پێم گوت: "دەی کیرکی، خۆ تۆ بەڵێنت دا کە یارمەتیم بدەی، بۆ وڵاتی خۆمم بنێریتەوە، دەی بەڵێنەکەت ببە سەرو با بڕۆمەوە بۆ ماڵی خۆم. بۆ نیشتمان‌و زێدی خۆم. روحم تامەزرۆی گەڕانەوەیە. هەروەها روحی هاوڕێکانم تاسەمەندی گەڕانەوەیە. کە تۆ دیار نابی هەموو دەورم دەدەن، دەیکەن بە شین‌وگریانێك، نەك دڵی من، دڵی بەردیش بۆیان دەبێ بە ئاو...

## ئودیسیوس دەچێت بۆ هادیس

هەرکە لە قسەکەم بوومەوە، خوابانۆی ناسك‌ونازدار، یەکسەر وەڵامی دایەوەو گوتی:
"ئەی زیوسزادە، ئەی کوڕی لایرتیس، ئەی ئودیسیوسی چارەسازو بەردەبار، ئەگەر خۆت نەتەوێ، کەس بە زۆر تۆ لە ماڵی مندا گل ناداتەوە. بەڵام پێش ئەوەی سەفەری گەڕانەوە بۆ نیشتمان دەست پێبکەی، دەبێ سەفەرێکی دی بکەی، دەبێ بچیت بۆ ماڵی هادیس‌و پیرسیفۆنی ترسناك. لەوێندەر پرسیاری ئایندە لە روحی تیریسیاسی فاڵبینی خەڵکی شاری تیبە، لەو فاڵبینە نابینایە بکەیت،چونکە تەنیا ئەو بە هەمان هۆش‌وگۆشی خۆی ماوەتەوەو پیرسیفونی، تەنیا رێگەی ئەوی داوە، لە دوای مردنیشی هەمان هۆش‌وگۆشی جارانی بمێنێ. بەڵام مردووەکانی دی تەنیا تاپۆو شەبەنگی بێ ناوەڕۆکن‌و بێهودە دێن‌ودەچن.
کە گوێم لەو قسەیە بوو، بە جارێ نەترەم بەردا. لە نائومێدیدا دەمم بوو بە تەڵەی تەقیو. لەسەر جێگاکە دانیشتم‌و دەستم بە گریان کرد ئەمما گریان. ژیانم بە جۆرێ لەبەر چاوکەوت حەزم

نەدەکرد جارێکی دی هەتاو بدینم.مەرگم بە ئاوات دەخوات. دوای ئەوەی بە کامی دڵ گریام، و کوڵی گریانم نیشتەوە، بەرسڤی (کیرکی)م دایەوەو گوتم: "باشە کیرکی، کێ لەم سەفەرەدا ڕێنوێنیم دەکات کەشتییەکەم بۆ داژوێ؟ چونکە تا ئێستا هیچ کەسێك بە سواری کەشتی نەگەییوەتە هادیس."

هەرکە لە قسەکەم بوومەوە، خوابانۆی جوان، یەکسەر بەرسڤی دامەوەو گوتی: "ئەی کوڕی لایرتیس، ئەی زیوس زادە، ئەی ئودیسیوسی چارەسازوبەردەبار، تۆ هیچ خەمت نەبێ، بیر لە کەشتیران مەکەوە، ساریەکەت لە جێی خۆی بچەقێنە، وبادەوانە سپیەکانت هەڵکەو لەسەر تەختەکەی خۆت بێخەم لێیدانیشە، و بای باکور بەخۆی کەشتییەکەت بۆ دەداتە پێش، پاش ئەوەی قولایی ئۆقیانوس دەبڕیت، دەگەیتە کەنارێکی هەموارو لێڕوبێشە موبارەکەکانی پیرسیفونی دەبینی: کە یەکپارچە سپیداری بەرزو سوورە بییە، لەوێندەر، لە قەراخی ئۆقیانوسی بە گێژەنگو شەپۆل دا، لەنگەر بگرە،وکەشتییەکەت راکێشە وشکایی. بەخۆت بڕۆ بۆ ماڵە شێدارەکەی هادیس. ماڵەکەی لە نزیکی ئەو شوێنەدایە کە هەردوو روباری پیریفلجیتونو کوکوتوس (دوو لقی روباری ستیکس)ن، دەڕژێنە(ئەخیرون)ەوە. ئەوسا تاوێرێکت دێتە رێ کە هەردوو روباری ناڤبری لەوێدا یەکانگیر دەبنو بەهارە هاڕو هاژە هاژ دادەڕژێن. جا ئەی قارەمان چۆنت پێدەڵێم بەو ئاوایە لەو شوێنە نزیك ببەوە، چاڵێك بە قووڵیو بە درێژیو بە پانی باڵێك هەڵکەنە، هەنگێ بە یادی هەموو مردووەکانەوە نۆشابە پرژێنی بکە، یەکەمجار شیروهەنگوین پرژێنی بکە، دووەمجار بادەپرژێنی بکە، سێیەمجار ئاوپرژێنی بکە. دوای ئەم سێیە ئاردی جۆ سپی بەسەردا بپرژێنە. ئەوسا دەبێ نوێژو نزا بۆ مردووە بێدەسەڵاتەکان بکەی، و قەولیان بدەیتێ کە بۆ ئیتاکا گەڕایتەوە نەزرو قوربانیان بۆ بکەی. باشترین نۆنگینی ناو گاگەلەکەتیان بۆ بکوژیتەوە، ولەسەر شەرەڤ ئەوان، سفرەو خوانێکی زۆر ئاواو ئاوەدان،بە هەموو جۆرە خواردنێکی بەلەزەت برازێنیتەوە. قەولێکی تایبەتیش بە تیریسیاس بدە کە مەڕێکی رەشی بێ نیشانی، کە سەر تۆپی رانەکەت بێ، بۆ بکوژیتەوەو بکەیتە قوربانی. دوای ئەوەی نوێژونزات بۆ خێڵی مردووان کردو لێیان پاڕایتەوە، بەرانێكومەڕێکی رەشیان بۆ بکوژەوەو بیکە بە قوربانی. سەریان بکە ئێریبوس، بەڵام خۆت پشتیان تێ بکەو رووبکە ئاوەڕۆی روبارەکە. هەنگێ روحانەتی مردووان پۆل پۆل دێن،دوای ئەوە فەرمان بەهاوڕێکانت بدە، کە قوربانیەکان کەوڵ بکەنو بیانخەنە سەر ئاگرو بەدەم نوێژو نزاوە بیکەن بە نەزرو بۆ خواوەندان، هادیسی بە تواناو پیرسیفونی ترسناكوبە هەیبەت. بەڵام تۆ شمشێرە تیژەکەت هەڵکێشەو لەوێندەر بمێنەو مەیەڵە سەری مردووە بێ گیانەکان لەو خوێنە نزیك ببنەوە کە لەبەر پێی تیریسیاس دا رژاوە. ئیدی تیریسیاس، سەرکردەی بەشەران، ئەو فاڵبینە گەورەیە یەکسەر بەدەنگتەوە دێت، رێگاکەو درێژی رێگاکەت پێدەڵێت. هەروەها پێت دەڵێت چۆن بە نێو دەریای بەگێژەنگو شەپۆلاندا، بۆ وڵاتی خۆت بگەڕێیتەوە."

کە لە قسەکانی بووەوە، یەکسەر سپێدەی زێڕین عەرش، دەرکەوت. خوابانۆ کراسو چاکەتێکی لەبەر من کرد. بە خۆیشی جلێکی هاودامانی سپی، زۆر جوانودڵنەوازی لەبەر کرد،

کەمەربەندێکی زێڕینی لە نێو قەدی بەستو، ڕوپۆشێکی درێژی بەسەریا دا. ئیدی بەناو ماڵەکە کەوتم، بە قسەی خۆش‌و زمانی شیرین هاوڕێکانم بێدار کردنەوەو یەك یەك پێم گوتن: "ڕابن، چیتر مەخەون، درەنگە، با لەزەتی خەو فریوتان نەدات. ڕابن، با بکەوینە ڕێ. ئەمە ئامۆژگاری کیرکی پایە بەرزە، کیرکی هەموو شتێکی پێگوتووم!".

## ئیلپینور دەگەڵ کیرکی دا دەمێنێتەوە

هەموو بە گوێیان کردم. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەمتوانی هاوڕێکانم بە دڵخۆشی لەوێندەر، لە ماڵەکەی کیرکی ببەمە دەرێ. (ئیلپینور)مان لەگەڵ بوو، ئەمە لە هەر هەموومان گەنج تربوو، نە بە ئازایەتی‌و نە بە ئەقڵمەندی بەناوبانگ نەبوو. ئەمە لە ماڵە موبارەکەکەی کیرکی دا، لەبەر مەستی دەچێت،دوور لە هاوڕێکانی، لە شوێنێکی فێنکدا دەخەوێ. کە گوێی لە دەنگە دەنگ‌و هاتوچۆی هاوڕێکانی دەبێت، بەلەز لە خەو رادەبێت، دەپەشۆکێت‌و لە جیاتی ئەوەی لە پلیکانەکانەوە دابەزێت، ڕێك لەسەربانەوە، بەسەرا دەکەوێ‌و ئەستۆی شکاو ڕوحی بۆ هادیس فڕی.

کە هاوڕێکانم وەڕێکەوتن، پێم گوتن: "ئەنگۆ وا دەزانن بەڕاستی بۆ مەفتەن‌و وڵاتی ئازیزی خۆ، بۆ خاکی باب‌و باپیرانمان دەگەڕێینەوە، بەڵام کیرکی پێی گوتووم دەبێ لە پێشدا سەفەرێکی دی بکەین. بچین بۆ ماڵی هادیس‌و پیرسیفونی سامناك تاراوێژو پرس بە ڕوحی تیریسیاسی خەڵکی شاری تیبە بکەین."

کە ئەم هەواڵەم دانێ، بە جارێ ورەیان بەردا، ڕوحیان پێ نەما. خۆیان بە عاردیدا داو کەوتنە قژ ڕنینەوە. بەڵام گریان‌و زاری دادی نەدان‌و هیچ سوودێکی نەبوو. لە کاتێکدا کە ئێمە بە دڵی غەمگین‌و چاوانی تەژی ڕوندکەوە بەرەو کەشتییە تیژڕەوەکەو کەناری دەریا دەڕۆییشتین، کیرکی خۆی گەیاند بووە کەشتییەکەو بەرانێك‌و مەڕێکی ڕەشی لەوێندەر بەستبووەوە. زۆر ئاسایی پێش ئێمە کەوتبوو. بە ناو ئێمەدا تێپەڕی بوو بێئەوەی بیدینین یان هەستی پێبکەین. کێ دەتوانێ هاتوچۆی خواوەندان بە چاو ببینێ، ئەگەر ئەو خواوەندە بە خۆی نەیەوێ تەجەلی بکات!.

### پەراوێز:

*- ئیولوس: شای بایان

*- پیرسیفونی:هاوسەری خواوەندی دۆزەخە

*- ئەخیرون: ڕوباری ئازارانە لەجیهانی ژێریندا (هادیس).

## سروودی یازدەیەم

**کورتەی سروودەکە:**

ئودیسـیوس کـە گەیشـتە خـاکی سـیمیریان‌ودەروازەی جیهـانی ژێـر زەمـینی، قوربانیـەکانی کوشتوەو خوێنەکانی کردنە ئەو چاڵەوە کە هەڵی کەند بوو. یەکەمجار روحی ئیلپینور ئامادە بوو وداوای کرد گۆڕێکی بۆ دروست بکەن. ئودیسیوس دایکی لە خۆ دوورخستەوەو گوێی بۆ تیریسیاس رادێرا کە باسی ئەو کێشەو ئاستەنگو ئەزموونانەی بۆ کرد کە دەبێ بێنە ڕێی. ئەوسا گوێی لە دایکی گرت کە هەواڵو باسی ئیتاکای پێگەیاند. دوای ئەو ژنانی دلاوەرو قارەمانیش هاتنە مەیدان. ئودیسیوس دەگەڵ ئاریتی، ئاکنیوس‌و ئالسینویوس گفتوگۆ دەکات. داوای لێدەکەن پەلە نەکات‌و پاشماوەی چیرۆك‌و بەسەر هاتەکەی خۆی بگێڕێتەوە. سەربورو چیرۆکی گفتوگۆی خۆی دەگەڵ ئاگامەمنون وئاخیلوس‌و قسە نەکردنی ئاجاکس کە رقی لە ئودیسیوسە،دەگێڕێتەوە. دوای ئەوە باسێکی دۆزەخ، مینوس، ئوریون، تیتوس، تانتال، سیزیف،وهیراکلیس دێتە ئارا. سەرەنجام، ئودیسیوس کە لە زۆری ژمارەی مردووەکان بێ تاقەت دەبێت‌ودەترسێت، دەگەڕێتەوە بۆ سەر کەشتییەکەی خۆی‌و بە روباری ئۆقیانوسدا نشێو دەبێتەوە.

***

## گەیشتنی ئۆدیسیۆس بە ئۆقانووس

کە گەییشتینە کەناری دەریا، کەشتییەکەمان راکێشایە ناو دەریای پرشنگدار. ساریەو بادەوانەکانمان لە کەشتییە بۆر قایم کرد. حەیوانەکانمان سەرخست،و ئەوسا خۆمان، خەمین‌و دڵتەنگ، چاو بە گریان سەرکەوتین. هەنگێ بایەکی سازگار لە پشتمانەوە هەڵیکردو کەشتییە بۆری دایە پێش‌و بادەوانەکانی پڕ لە با کردین. بەڕاستی یارو یاوەرێکی یەجگار چاك بوو کە کیرکی گێسو جوان، ئەو خوابانۆ بە شکۆیە کە بەزمانی بەشەران دەدوا، بۆی ناردبووین. دوای ئەوەی هەموو کەرەستەو شتەکانم بە جوانی‌و لە جێی خۆ دانا. لە جێی خۆمان دانیشتین‌و باو کەشتیوانەکە، ڕێك بەرەو مەزڵو شوێنی بەمەستیان بردین. بە درێژایی رۆژەکە، بادەوانەکانی

کەشتییەکە، کە دەریای قووڵ و مەنگی دەبڕی، کراوە بوون. کە خۆ ئاوا بوو، وتاریکی باڵی بەسەر دنیادا کێشا، کەشتییەکەمان گەییە کۆتایی روباری ئۆقیانوس، کە هاوسنوری مەڵبەندو شاری سیمیریان بوو. ئەم شارە لە تەم‌ومژو هەوردا نقوم بوو بوو. هیچ کاتێك تیشکی خۆر لێی نادات، نە لە کاتی رۆژ هەڵاتندا، ونە کاتێ کە بەرەو ئاسمانی پڕ ئەستێران هەڵدەکشێ، و نە ئەو کاتەش کە لە ئاسمانەوە دادەکشێت‌و بەرەو ئاوابوون دەچێت. ئیدی شەوێکی درێژی ئەبەدی باڵی بەسەر ئەو خەڵکە کلۆڵەی ئەوێندەرا کێشاوە. کە گەییشتینە ئەوێندەر کەشتییەکەمان راگرت، لەنگەرمان گرت. حەیوانەکانمان داگرت. بە کەناری ئاوەڕۆی ئۆقیانوسدا کەوتینە رێ‌و، گەییشتینە ئەو شوێنەی کە کیریکی بۆی باس کردبووم.

## ئودیسیوس قوربانی بۆ مردووەکان دەکات

لەوێندەر، پیریمیدس‌و یوریلوشوس، قوربانیەکانیان گرت، منیش بە شمشێرە تیژەکەم چاڵێکم بە قوڵی‌و بە پانی‌و بە درێژیی باڵێك هەڵکەندو بە یادی هەموو مردووەکان بادە پرژێنم کرد، لە پێشا شیروهەنگوین پرژێنم کرد، ئەوجا شەراب پرژێنم کردو پاشان ئاوپرژێنم کرد. دوای ئەوە ئاردی جۆسپیێم بەسەردا پرژاند. بە کوڵ‌و بە دڵ کەوتمە نوێژونزا بۆ مردووەکان، ونەزرم لە خۆ گرت‌و بەڵێنم دانێ کە بگەمەوە ئیتاکا، نوێنگینێکیان بۆ بکەم بە نەزرو قوربانی، نوێنگێنێ کە سەر تۆپی گایەلەکەم بێ، وکوانووەکەم پڕدەکەم لە نەزری بەنرخ‌وزیافەت وبەزم‌وسوورێك سازدەکەم بە داستان بگێڕدرێتەوە.هەروەها بەرانێکی رەشی بێنیشان، بۆ خودی تیریسیاس، بە تەنیاو بە تایبەتی دەکەم بە قوربانی، بە مەرجێ باشترین بەرانی نێو رانەکەم بێت. دوای ئەوەی نوێژم بۆ مردووەکان کرد،لێیان پاڕامەوەو نەزرو نیازم لە خۆ گرت، حەیوانەکانم گرت‌و لەسەر چاڵەکە کوشتمنەوەو خوێنەکەیان رژایە چاڵەکەوە. ئیدی روحی مردووان لە (ئێریبوس)ەوە پۆل پۆل هاتن‌ولە دەورم خڕبوونەوە: تازە بووك، کوڕانی عازەب، پیرەمێردانی رەنج دیدەو ماندووی دەستی رۆژگار، کیژۆڵانی کوشتەی ئەشق‌وئەڤینداری، هەروەها ژمارەیەکی زۆر لەو جەنگاوەرانەی کە لە مەیدانی شەڕدا بە پەیکانی برونزین پێکرا بوون، بە خۆوچەك‌و تفاقی خوێناویانەوە هاتبوون! ئەوانە دەستە دەستە لە هەموو لایەکەوە دەهاتنە دیار چاڵەکە،و هاوارێکی غەریبیان دەکرد. پیاو راست بڵێ زۆر ترسام، رەنگم زەرد هەڵگەڕا. بۆیە خێرا هاوڕێکانم گاز کردن‌و فرمانم پێکردن کە حەیوانەکان کەوڵ بکەن‌و بیان برژێنن‌و نوێژ بۆ هادیسی تواناو پیرسیفونی ترسناك بکەن. منیش بە شمشێری رووتەوە لەوێندەر دانیشتبووم‌و رێگەم نەدەدا مردووەکان، بەر لەوەی من پرسیارەکانم لە پیریسیاس بکەم، لە چاڵە خوێنەکە نزیك ببنەوە.

## ئودیسیوس روحیانەتی ئیلپینور دەبینێ

یەکەمین روح کە هات، روحی ئیلپینوری هاوڕێم بوو.هێشتا لە مەڵبەندی ژێر زەمینی فرە رێیاندا، نەیان ناشتبوو وگۆڕێکیان بۆ فەراهەم نەکردبوو. ئێمە جەنازەکەیمان لە ماڵی کیرکیدا، بێئەوەی بۆی بگرین‌و بە خاکی بسپێرین، بەجێ هێشتبوو.چونکە کارێکی پەلەترمان لە ئەستۆ بوو، ودەبوایە بەلەز بڕۆین.کە چاوم پێیکەوت فرمێسك زاییە چاوانم‌و زۆرم بەزەیی پێیدا هاتەوە.

هاوارم کردو زۆر بە گەرمی گوتم: "ئەی ئیلپینۆر،چۆن بەم تەمو مژە تاریکە بۆ ئێرە هاتوویت؟ من بە کەشتییە بۆ هاتووم،کەچی تۆ بە پێیان لە من زووتر گەییویتە ئێرە!".

بەدەم ئاهو ناڵەوە وەڵامی دامەوەوگوتی:

"ئەی توخموتۆمی زیوس، ئەی کوڕی لایرتیس، ئەی ئودیسیوسی چارەساز، ئەی دووربینی بەردەبار، ئەوەی منی فەوتان بەختی شوومی خۆمو ئەو بادە زۆرە بوو کە خواردمەوە. کە لەسەربانی تەلارە گەورەکەی کیرکی خەوتبووم، بیرم نەبوو لە پلیکانەکانەوە دابەزم. ئیدی لەو دیووەوە، لەسەر بانەکەوە کەوتمە خواریۆ ئەستۆم شکاو روحم دەرچوو وگەییە خانەی هادیس.جا ئێستا تکات لێدەکەم، سوێندت دەدەم بەگیانی ئەوانەی لە دوای خۆت بەجێت هێشتوون،ولێرە نین، بەگیانی هاوسەرەکەتوباوکت، کە منداڵێکی ساوا بوویتو پەروەردەو بەخێوی کردیت، بەگیانی تیلماخۆسی کوڕە تاقانەت، کە تاقە هیوای ماڵەکەتە، هەرچیت لێ داوا دەکەم، بۆمی جێبەجێ بکە.چونکە دەزانم کە لێرە، لە ماڵی هادیس دەربچیت، بە سواری کەشتییە مکومو روختەکەت لە کەناری دورگەی ئایایا لا دەدەیتو لەنگەر دەگریت.جا تکات لێدەکەم، ئەی سەروەر! لێت دەپاڕێمەوە کە لەوێندەر، لەو دورگەیەدا منت لە بیربێتو فەرامۆشم مەکە. نەکەی، تا لە سەرم نەگریوبەخاکم نەسپێریێ، لەوێندەر بڕۆیت. دەنا لەگینە خوای من بتگریۆ بەڵایەکت بەسەر بێت.پاشماوەی لاشەکەم بە چەكوتفاقە جەنگییەکانمەوە بسووتێنە، لە کەناری دەریای کەوەیی دا،گۆڕێکم بۆ هەڵبەستە، تا خەڵکانی ئایندە شتێك دەربارەی منی نەگبەت بزانن و یادێکی بەخێرم بکەنەوە. تکایە ئەم داوایەم جێبەجێ بکە.سەوڵەکەشم، ئەو سەوڵەی کە تا لە ژیایان بووم، لە نێو هاوڕێکانما بووم، سەوڵم پێ لێدەدا، لەسەر گۆڕەکەم بچەقێنە". وەڵامم دایەوە: "خەمت نەبێ، ئەی نەگبەتی کلۆڵ، هەموو داواکانت جێبەجێ دەکەم."

بەوجۆرە، هەردووکمان بەدوو قوڵی بەرانبەر بە یەکتری بەدەم دەردە دڵەوە دانیشتین. من لەم بەر چاڵەکەوەو شمشێرەکەم بە دەستمەوە خوێنی لێ دەچۆڕا،وتاپۆو شەبەنگی هاوڕێکەشم لەوبەری چاڵەکەوە دەردە دڵی بۆ دەکردم.

## ئودیسیوس بەدیار روحی دایکیەوە دەگری

دوای ئەوە تاپۆی دایکم، ئەنتیکلیای، کیژی ئوتولوکوس-ی جوامێر، کە من بەرەو ئیلۆسی موبارەك وەڕێکەوتم، ئەو ساغوسەلامەت بوو، نەمرد بوو. کە دیتم زۆرم بەزەیی پێدا هاتەوە. چاوانم پڕ بوون لە فرمێسك. بەڵام سەرباری هەموو سۆزو بەزەییەکم ڕێگەم نەدا لە خوێنەکە نزیك ببێتەوە،چونکە دەمویست لە پێشا پرسیار لە تیریسیاس بکەم.

## ئودیسیوس تاپۆی تیرسیاس دەبینێ

ئەوسا شەبەنگوتاپۆی تیریسیاسی خەڵکی تیبە پەیدا بوو.کە سەوڵەجانێکی زێڕی بەدەستەوە بوو. یەکسەر ناسیمیەوەو گوتی: "ئەی توخمو تۆمی زیوس، ئەی کوڕی لایرتیس، ئەی ئودیسیوسی چارەساز، ئەی دووربینی بەردەبار، ئەی کلۆڵی داماو، خێرە وادنیای روناکت بەجێهێشتووەو هاتوویت بۆ ئەم تاریکستانە خەمناکەو سەردانی مردووان دەکەی؟ ئا دەی لە چاڵەکە دوورکەوەو شمشێرەکەت لابەرە تا لەو خوێنە بخۆمەوەو وەڵامی پرسیارەکانت بدەمەوەو

حەقیقەتت پێ بڵێم. ئیدی لاکەوتموشمشێرە زیونیشانەکەم لە کێلان نایەوەو پاش ئەوەی فاڵبینونجومگەری بەهرەدارو بێوێنە خوێنەکەی خواردەوە، رووی کردە منوگوتی:

## تیریسیاس پێشبینییەکانی خۆی بە ئودیسیوس دەڵێ

ئەی ئودیسیوسی سەرفرازو شکۆدار، تۆ دەتەوێ بزانی لە گەڕانەوەدا چیت دێتە رێ، چیت بەسەر دێت! تۆ لە خەمی گەڕانەوەیەکی شیرین دایت، شیرین وەکو هەنگوین، بەڵام یەکێك لە خواوەندەکان کۆسپوتەگەرەی زۆر دەخاتە رێگات. پێموایە لە تۆڕوداوی پوسیدون، هەژێنەری زەوی ناخەلەسیت.چونکە زۆرت لێ تورەیە. لەسەر ئەوە لێت تورەیە کە کورە ئازیزەکەیت کوێر کردووە. بەڵام وێڕای هەموو پشموغەزەبێکی ئەو، دەتوانی دوای زەحمەتوئاستەنگێکی زۆر بگەیتەوە ولاتی خۆت، ئەگەر بتوانی جڵەوی خۆتوجڵەوی هاوڕێکانت بگریتو، کە لە ئاسیوی دەریای کەوەیی رزگارت بوو، وبە کەشتییەکەت گەییشتییە دوڕگەی تریناکیا، کە لەوێندەر تووشی گاگەلو رانەکانی هیلیوس، کە هەموو شتێك دەبینیودەبیستی، دەبیت تەماح نەتگریو دەستیان بۆ نەبەیتو ئازاریان نەدەیت، ئەوا بە هەر مەینەتیەك بێ دەگەیتەوە ئیتاکا. بەڵام ئەگەر تەماح بتگریو دەستیان بۆ بەریتو ئازاریان بدەیت، ئەوا دڵنیات دەکەم کە کەشتییەکەتو هاوڕێکانت لە دەست دەدەیت.سەبارەت بە خۆتیش ئەگەر لە مردنیش رزگاربیت، ئەوا پاش ئەوەی هاوڕێکانت لە دەستدا، زۆر درەنگ وبە وەزعو حاڵێکی خەمناکو بەکەشتی کابرایەکی بێگانە دەگەیتەوە ولاتومالی خۆت،ولە ماڵەکەی خۆتدا کێشەو سەریەشەی زۆر دەبینی، ماڵەکەت پڕە لە پیاوانی ملهوڕو لە خۆبایی، لە پیاوانی خۆپەسند، بە بیانووی خوازبێنی ژنە خانەدانەکەت، لەوێندەر دایانکوتاوەو بە کەیفی خۆ سەروەتومالت دەخۆنو پەخشانو تەخشانی دەکەنو کۆ لە هیچ ناکەنەوە. دوای ئەوەی دەگەیتەوە مالی خۆتو هەموو خوازگارەکان بەسزای گۆساخیو بەدرەفتاری خۆیان دەگەیەنیو هەر هەموویان یان بە تەڕن یان بە ئاشکراو بە زەبری شمشێری برونزین دەکوژیت، هەنگێ سەوڵێکی روختەو مکوم هەڵگرەو بڕۆ تا دەگەیتە ناو قەومێك هیچ شتێك دەربارەی دەریا نازانن،خوێ ناکەنە خواردنەوە، ئەوانە هیچ شتێك لەمەڕ کەشتیانی گۆنا سوور نازانن،و هیچیان لەمەڕ سەوڵ، کە بە باڵی کەشتی دەژمێردرێ، نەبیستووە. جا لێرە نیشانەیەکی زۆر ئاشکرات پێ دەڵێم کە نابێ لە بیری بکەی. کە رێبوارێکی دیکەت دەگاتێ پێت دەڵێت بۆچی ئەو شەنەیەت بە شانیدا داوە، هەنگێ راست سەوڵە روختەکەت لە شان داگرەو لە عاردی بچەقێنە، قوربانیەکی جوانو گەورە پێشکەش بە پوسیدون بکە: بەرانێك،جوانەگایەك، ویەکانەیەکی فەحلی بۆ بکوژەوە. ئەوسا بۆ مالی خۆت بڕۆرەوەو سەد قوربانی بۆ هەموو خواوەندانی ئاسماننشین، بێ ئەوەی شتاقیان لە بیربکەی، بکوژەوە. سەبارەت بە مەرگی تۆ، لە دەرێی دەریا دەبێتو،مەرگێکی فرە ئاسانوخۆش دەبێت: دوای ئەوەی پیروخەڕۆ دەبێت، قەومو قیلەت دەکەونە خۆشیەوە، ولاتت گەشە دەکات، هەنگێ سووكو باریك، بێ هیچ ئەزیەتێك دەمریت. ئەمە پێشبینی منە بۆ تۆ."

کە لە قسەکانی بووەوە، پێم گوت: "ئەی تیریسیاس، خواوەندان بە کەیفی دلی خۆیان، چۆنیان ویستووە، بەو ئاوایە ئەم چارەنووسەیان، تەنیوەو چنیوە. کەس لە چارەنووسی دەرباز نابێت.

بەلاّم من داوایەکم هەیە، ڕێك و ڕەوان، بێ پەردە وەلاّمم بدەوە، من تاپۆی دایکی ڕەحمەتیم دەبینم، کە مات و خامۆش بەدیار چاڵە خوێنەکەوە دانیشتووە، وناتوانێ ڕووبەڕوو بڕوانێتە کوڕەکەی وقسەی دەگەڵ بکات. ئەی سەروەرو گەورە پێم بڵێ چۆن دەتوانێ من بناسێتەوەو بزانێت کوڕی ئەوم؟ یەکسەر بەرسڤی دامەوە:

"ئەمە زۆر ئاسانە، من قسەیەکت پێدەڵێم هەندی نەختێك. تۆش وەکو ئاڵقە لە گوێی بکە: هەر یەکێك لەو مردووانە، ئەگەر ڕێی بدەی لەو خوێنە بخواتەوە، ئەوا وەکو کەسێکی زندوو وئاقڵ، هەموو ڕاستیەکت پێدەڵێت، وئەگەر ڕێی نەدەی لە خوێنەکە بخواتەوە، بێگومان دەتۆرێ و دەڕوات".

## ئودیسیوس دەگەڵ ڕوحی دایکی دا قسان دەکات

تیریسیاسی سەروەر، دوای ئەوەی ئەو فرمانانەی خواوەندانی پێ ڕاگەیاندم، ڕوحی بۆ ماڵەکەی هادیس گەڕایەوە. بەلاّم من هەر لەوێندەر مامەوە، لە جێی خۆم نەجولاّم، تا دایکم هات و لە خوێنەکەی خواردەوە، یەکسەری ناسیمیەوە، بەدەم ئاهوناڵەوە گوتی:

"کوڕەکەم، چۆن تۆی زندوو ڕێت کەوتووەتە ئەم تاریکستانە؟ ئاخر زۆر زەحمەتە خەڵکانی زندوو، ئەم دنیایە ببینن.چونکە ڕوبارانی گەورەو سامناکیان لە نێوان دایە. یەکەمیان ڕوباری ئۆقیانووسە، کە هیچ بەنی بە شەرێك ناتوانێ بە پێیان لێی بپەڕێتەوە، مەگەر بە کەشتی ڕوختەو مکوم. یانی تۆ لەو ساوە کە لە تەروادە دەرچوویت، بە خۆت و کەشتی و هاوڕێکانتەوە وێڵ و سەرگەردان تازە گەیشتوویتە ئێرە؟ یانی هێشتا نەگەییوتەوە ئیتاکا؟ ماڵەکەی خۆت نەدیوە، ژنەکەت نەدیوە؟! وەلاّمم دایەوە: "دایکە گیان، ناچار بووم بێم بۆ ماڵی هادیس، تا پرسیاری ئایندەم لە ڕوحی تیریسیاسی تیبەیی بکەم. نا، نەخێر، تا ئێستا نەگەییومەتە نزیکی کەنارەکانی ئاخیا،وپێم نەناوەتەوە خاکی ولاّتی خۆمان. بەڵکو لەو ڕۆژەوە کە دەگەڵ ئاگامەمنونی جوامێرو بەناوبانگدا بە نیازی شەڕی تەروادەییان، بەرەو ئیلۆسی مەڵبەندی ئەسپانی ڕەسەن، وەڕێکەوتووم، تا ئێستا هەر وێڵ وسەرگەردان بوومو بۆ ساتێ لە دەست مەینەت ڕەهانە بووم. دەیسا پێم بڵێ، ڕێکو ڕاست و بێپەردە پێم بڵێ، تۆ چۆن مردیت؟ ئایا بە نەخۆشی دووروردرێژو پڕ ئازار مردویت؟ یان ئارتەمیسی کەوانکێش بەر ناسکەتیری داویت و کوشتوتی؟ باسی باوکم، باسی تاقە کوڕەکەم بۆ بکە، ئایا هێشتا لە دەوڵەت و سەروەت و سامانی من بەرخوردارن. یان یەکێکی دی دەستی بەسەرا گرتووەو پێی وایە ناگەڕێمەوەو لێی ناسەنمەوە؟ ئەدی دەنگ وباسی ژنەکەم، بەنیازی چیە؟ ئایا هێشتا بە دیار کوڕەکەیەوە دانیشتووەو ولاّتەکەم بە باشی بەڕێوە دەبات، یان شووی بە ئاخاییەکی خانەدان کردووە؟"

کە لە پرسیارەکانم بوومەوە، دایکی بەڕێزم بەرسڤی دامەوەو گوتی:

"ژنەکەت، بە دڵێکی نەگۆڕوباوەڕێکی بتەوەوە، هێشتا بەسەر ماڵەکەتەوەیە، ژیانی زۆر تاڵە، شەو بە دەم ناڵینەوە ڕۆژ دەکاتەوەو ڕۆژ بە گریان و فرمێسك ڕشتن دەگوزەرێنێ. تا ئێستا هیچ کەسێك دەستی بەسەر ماڵ وموڵك و سەروەت و سامانی شاهانەتدا نەگرتووە. تیلماخۆس، زۆر پیاوانەو بێ هیچ نیگەرانی و دوو دڵییەك، کاروباری قەڵەمڕەوەکەت بەڕێوە دەبات، وەکو هەر

شازادەیەکی دادپەروەر، بە گوێرەی سەنگو پایەی هەر کەسێك، مامەڵە دەگەڵ خەڵکیدا دەکات، بەزمو سووریان بۆ ساز دەکات، میواندارییان دەکات، ودەچێتە میوانی خەڵکی.سەبارەت بە بابت، هەر لە شوێنی خۆیەتی، لە گوندی دەژی. هاتوچۆی شار ناکات. بۆ خەوتن، جێگەی نەرمو نیان، چەرچەف،وبالیفی نەرم بەکار نایەنێ، بگرە زستانان لە ماڵەوە، دەگەڵ خزمەتکارو رەنجبەرەکاندا، لە عاردیو لە پاڵ ئاگردانەکەدا دەخەوێ. جلکی شڕوشەپڕێو لەبەر دەکات. کە هاوینو پایز دێن، ئیدی لە ناو رەزەکەدا، بە گەڵای رژاوی دارودرەختان جێگەیەك بۆ خۆی ساز دەکات، لەوێندەر، ماتوبێدەنگ بەسەر خەمەکانی دڵیدا کڕدەکەوێت، وهەرچاوی لە رێگەیە کە تۆ بگەڕێیتەوە. پیرییش رۆژ بە رۆژ پتر کە نەفتی دەکاتو بڕستی لەبەر دەبڕێ. منیش، لە سوێی دووری تۆ مردم. دەنا، نە ئەو کەوانکێشە زەبەردەستە، بە نەرمە تیران کوشتمی، ونە نەخۆشی بە درێژاو گرانوپڕ ئازار پوکانمییەوەو کوشتمی. نەخێر، ئەی ئودیسیوسی پاکزاد، سوێی دووری تۆ، ژیانی شیرینی لێحەرام کردمو کوشتمی."

## ئودیسیوس ناتوانێ دایکی لە هەمێز بگرێت

دوای قسەکانی دایکم، لە دڵی خۆدا بیرم لەوە دەکردەوە چۆن روحی دایکی رەحمەتیم لە هەمێز بگرم. سێ جار تەکانم دایە خۆ کە بیگرم، بەڵام هەر سێ جارە کە، وەکو تاپۆیەك، میناکی خەونێك، لە دەستم دەرفرتا. زۆرم لە دڵ گران بوو، رووم تێکردو بە دەنگی بەرز هاوارم کرد:"دا یکە، بۆچی لێم هەڵدێی، بۆ نایەڵی لە باوەشت بگرم؟ هێندە تامەزرۆی دیدارتم، حەزدەکەم ئەگەر لە ماڵی (هادیس)شدا بووە، دەست لە ملی یەکتری بکەینو بە کامی دڵ بەسەر یەکتردا بگرین. ئایا پیرسیفونی پایەبەرز دەیەوێت بەم سەرابە تەفرەم بداتوهێندەی دی دەردم گران بکات، زیاترم بگرێنێ؟

دوای ئەو قسانە، دایکی گرانقەدرم، یەکسەر هەڵیدایەوگوتی: "واوەیلا بە حاڵی من کوڕەکەم، ئەی کڵۆڵترین بەشەری سەر رووی زەمین، پیرسیفونی، کیژی زیوس هەرگیز تۆ فریو نادات، ئیدی ئەمە یاساو رێسای مەملەکەتی مردووانە، کە بەشەر دەمرێت، ئەو رەگو ریشەیەی جاران نامێنێ کە گۆشتوئێسکان پێکەوە بەند بکات، هەر کە ژیان لەبەر ئێسقانی سپی بڕا، وروح وەکو خەونێك فڕی، گڕی بە قوەتی ئاگر، ئێسكو پروسکان دەسوتێنێ،وروح وەکو خەون لە شەقەی باڵ دەداتودەڕوات. جا تا زووە بەرەو روناکی بلەزینە، هەموو ئەم شتانە بە یاد بسپێرە، تا بتوانی دوایی بۆ ژنەکەتی بگێڕیتەوە.

## ئودیسیوس روحانی دی دەبینێ

دوای ئەو قسانەمان، پیرسیفونی پایەبەرز، دنیایەك ئافرەتی تری نارد، هەر هەموویان خانەدانو لە بنەماڵەی شاهان بوون. ئەمانە دەستە دەستە لە دەوری خوێنەکە خڕبوونەوە، بیرم کردەوە چۆن بتوانم پرسیار لە یەکە بە یەکەیان بکەم. هاتمە سەر ئەو قەناعەتەی کە باشترین رێگە ئەوەیە هەڵکێشمە شمشێرو نەیەڵم هەموویان بە جارێ لە خوێنەکە بخۆنەوە. بەو جۆرە یەك یەك هاتنە پێشەوەو ئەسڵو فەسڵو رەسەنی خۆیان پێگوتمو منیش توانیم پرسیار لە هەموویان بکەم.

## روحی تێرو قسه بۆ ئودیسیوس دەکات

یەکەم ئافرەت کە بینیم تیروی خانەدانو رەسەن نەژاد بوو. گوتی کە کیژی سالمونیوسی جوامێر، وهاوسەری کریتیوسی کوڕی ئیولوسه. ئەم ژنە دەکەوێتە داوی ئەشقو ڤیانی روباری ئینیپوسی موبارەکەوه، کە بێگومان جوانترین روباری سەر رووی زەمینه. بۆیە جارجارێك دەهاتە دیار رووباری ناڤبری‌وتەمەشای ئاوە جوانەکەی دەکرد. جارێك پوسیدونی زەوی بە شانو زەوی لەرزێن خۆی لێ گۆڕی وچووە کلێشەی روباری ناڤبرییەوەو لە رێژاوی پڕگێژاوو گێژەنگی روبارەکەدا دەگەڵیا خەوت. ئیدی شەپۆلێکی تاریك، بە بەرزی کێوێك هاتو گومەزئاسا هەردووکیانی داپۆشی.خواوەندی ناڤبری، دۆخینی ئەو کیژەی کردەوەو خەوی لێخست. دوای ئەوەی خواوەندی ناڤبری کاری خۆی کردو رەحت بوو، دەستی گرتو پێیگوت:

"خەنی لە خۆت تیرۆ، هەڤخەوی خواوەندان، بێ بەرو بەرهەم نابێت، لە زەرڤ یەك ساڵدا، جمکانەیەکی یەجگار جوانت دەبێت. ئەو مندالانە پەروەردە بکەو شیری خۆتیان بدەیە. ئێستا بڕۆرەوە بۆ ماڵی خۆت. ئەم رازە لای کەس مەدرکێنەو نێوی من مەبە. من پۆسیدۆنی زەوی لەرزێنم."

دوای ئەو قسانە، خۆی هەڵدایە نێو شەپۆلەکانەوەو رۆیی. بەلام تیرۆ سکی پڕبوو، و پیلپاسو نیلیوس-ی بوون، کە بوون بە دوو خزمەتگوزاری بەهێزو توانای زیوس. پیلپاس کە ئاکنجی ئیولکوس بوو، مەڕدارێکی گەورە بوو،وبراکەی لە پیلوسی لمەلاندا گیرسایەوەو ئاکنجی بوو. ئەم ژنە کۆمەڵێ مندالی دیکەشی لە کریتیوس بوون کە بریتی بوون لە: ئیسون، فیریس، ئەمیتایون کە لەسەر گالیسکانەوە شەڕی دەکرد.

## دیداری ئودیسیوسو ئانیتوپی

لە دوای تیرۆ، ئەنتیوپی، کیژی ئەسپوس-م بینی کە بەوەوە دەنازی دەگەڵ خودی زیوسدا جووت بووەو دوو کورشی لێی بوون: ئامفیون، وزیتوس، کە ئەوان یەکەم کەس بوون شاری تیبەی حەوت دەروازەیان دروستکردو شورەو حەسارێکی بەرزیان لە دەوری دروست کرد. چونکە بە هەموو هێزوتوانایەکەوە کە هەیان بوو،نەیاندەتوانی بەبێ ئەم شورەو قوللەو قەلاتانە، فەرمانڕەوایی تیبەی پانوبەرین بکەن.

## ئودیسیوس ئەلکمینی‌ومیگاراو ژنانی دی دەبینێ

دوای ئەو، ئەلکمینی هاوسەری ئامفیتریون-م بینی کە هیراکلسی بێباك‌ونەترس‌وشێردڵی لە زیوسی مەزن بوو بوو. هەروەها میگارای کیژی کریونی نەفسبەرز، وهاوسەری کوڕە جەنگاوەرو بێ پەرواو سەرکێشەکەی ئامفیتریون-م بینی.

هەروەها دایکی ئودیبوس، ئیپیکاستی جوانم بینی، کە بێ ئەوەی بزانێت کارێکی ترسناكو ناشایستەی کردبوو: شووی بە کوڕەکەی کردبوو، ئودیپوس پاش ئەوەی بابی کوشتبوو، دایکی خۆی خواستبوو. بەلام خواوەندان یەکسەر ئەم رازوسڕەیان بۆ خەڵکی هەڵماڵی. ئودیپوس، لە شاری تیبەی جواندا، فەرمانڕەوایی کادیمیەکانی دەکرد، بەلام بە خواستی خواوەندان هەر

بەشـی دەردو مەینـەتان بـوو. بـەڵام ئیپیکاسـتی، ئـەو شـابانۆیە چـووبوو بـۆ مـاڵی هـادیس، کـە دەرگاکانی توند داخراوە،چونکە ئەم ژنە کە تووشی عەزابی ویژدان بووبوو، پەتێکی بە بن میچی کۆشـکە بڵندەکەیـەوە بـە سـتا بـوو، وخـۆی پێیـا هەڵواسـی بـوو، وخـۆی خنکانـد بـوو، ودەردو مەینەتی دنیای بە میرات بۆ کوڕەکەی بەجێ هێشـتبوو. ئـەرینیان، خوابانۆیـانی تۆڵـە، بـەو جـۆرە تۆڵەی دایکەیان لە کوڕەکەی دەسەندەوە.

ئەوسا کلوریس–م بینی، کلوریس جوانێکی بێهاوتا بوو. نیلیوس کاتی خۆی لەبەر جوانیەکەی، دوای ئـەوەی جیازیـەکی بـێ شـومارودیاریەکی یـەجگار فرەی پێشـکەش کردبـوو، خواسـتبووی. کلوریس بچووکترین کیژی ئامفیونی، کوڕی ئیاسۆس بـوو، کـە کـاتی خـۆی سـەردارو پاشـای بـە زەبرو زەنگی ئورخومینوس–ی مینیان بوو. ئـەم ژنـە بـوو بـە شـابانۆی پیلوس‌وکۆمـەڵێك منـداڵی بەناوبانگی خستەوە کە بریتی بوون لە: نەستور، کرومیوس،وپیریکلیمنوسی جـەنگاوەری بـوێرو دلێـر. دوای ئـەوان (پـیرۆ)ی رەسـەنی بـوو، کـە سـەرتۆپی هـەموو تـیرەی بەشـەران بـوو. هەرچـی خەڵك‌وشـازادەێن دەوروبـەر هـەبوون، لـە هـەوڵی ئـەوەدا بـوون بیخـوازن، بـەڵام نیلیـوس بـە هـەموو کەسـێکی نـەدەدا، مـەرجی ئـەوە بـوو هەرکـەس بتـوانێ بچێت بـۆ فیلاکـی و چێڵ‌و مانگـا قەڵـەوو تەوێڵ پانەکانی ئیغیکلیسی بـە زەبرو زەنـگ، بـە تـاڵانی بـۆ ئێـرە بێنـێ، کـە ئەمـە کـارێکی ئاسـان نەبوو، کیژەکەی دەداتێ. تاقە پیاوێك کە چووە ژێربارو بەڵێنی دا کە مانگاکان بدزێ‌و بیانهێنێ، فالبینێکی یەجگار بە توانا بوو، بەڵام قەزاوقـەدەرێکی خـەمناك‌و شـوومی خواوەنـدان، خسـتییە داوی گاوانەکانەوەو گرتیان‌و لە زندانیان پەستاوت. پـاش ئـەوەی رۆژان هـاتن‌و چـوون، بـوون بـە مـانگ، وهـەیڤان بـوون بـە سـاڵ، ویـەك سـاڵی خشـت تێپـەڕی، ئیغیکلـیس–ی بـە توانـا، کـابرای بەنـدی، دوای ئـەوەی پێشـبینی هـەموو شـتەکانی بـۆ کردبـوو، ئـازاد کـرد. بـەو جـۆرە خواسـتی زیوس هاتە دی.

هەروەها (لیدا)ی هاوسـەری (تینـداروس)م بینی، کـە دوو کـوڕی زۆر شـێردڵ‌و بـوێرو بێبـاکی لـێ هەبوو: کاستوری رامکەری ئەسپان، پولوکۆسی بۆکسەوانی دلاوەر: هەردووکیان، بەزندوویـەتی، خـاکی بـە پیت‌وبەرەکـەت قـووتی دان، جـا ئەمانـە تەنانـەت لـە جیهـانی ژێرینشـدا،لە هـادیس دا، مایەی رێزوحورمەتی زیوسن، ورۆژێك زنـدوون، و رۆژێـك مـردوون، وەکـو خواوەنـدان بـەرزو بـاڵاو سەرفرازن.

لـە دوای ئـەو (ئیفیمیـدیا)ی هاوسـەری (ئـەلویوس)م بـینی کـە شـانازی بـەوەوە دەکـرد دەگـەڵ پوسیدوندا خەوتووەو جووت بووە. ئەم ژنە دوو کوڕی دەبن، بەڵام تەمەنیان کورت بوو: ئوتوسی خواوەنـد ئاسـا، وئیفـالتیس–ی کـە زۆر بـەناوبانگ بـوو. ئـەم دوو منداڵـە، لـە دوای ئوریـون–ی نـاودار گـەورەترین‌وجوانترین خـەڵکانێك بـوون کـە زەوی بـە خـۆوەی دیتبـوون. لـە تەمـەنی نـۆ ساڵیدا، زۆر لە هاو تەمەنانی خۆ پـان‌و پـۆڕترو بـاڵا بـەرزتر بـوون، دەفـەی سینگ‌و بـەرۆکیان نـۆ کورتـە گـەزو بـەژنیان نـۆ بـاڵا زەلام بـووە. ئەمانـە لێـدەبڕێن جـەنگ لـە دژی خواوەنـدانی نـەمری ئولەمپانشـین بەرپابکـەن، دەیانویسـت ئوسـا بخەنـە سـەر ئولـەمپ، وپیلـونی چـڕە دارسـتان‌و چـوغوورد بخەنـە سـەر ئوسـا، تـا لـەو بەرزیـەوە پـەلاماری ئاسمـان بـدەن.خـۆ ئەگـەر خواوەنـدان

دەوامی عەمریان دابانو گەورە بوایەن، ئەو کارەیان دەکرد. بەڵام کوڕەکەی زیوس، کە لە (لیتو)ی گێسو جوان بوو، بەر لەوەی خەت بدەنو ریشیان بێت، کوشتنیو لە نێوی بردن. هەروەها فایدرا، پروکریس، و ئاریادنی خشیکم دیتن، ئاردیانی کیژی مینۆسی بەدخواو دڵڕەش کە کاتی خۆی تیسیوس لە کریتەوە بۆ تەپەی ئاتینی موبارەکی هەڵگرتبوو، بەڵام هیچ خۆشی سوودێکی لەم هەڵگرتنو رەدووخستنە نەبینی بوو، چونکە پێش ئەوەی ئەوەی فریابکەویٚ، دیونیوس پەردەی لەسەر ئەو رازە هەڵماڵی بوو، ئارتەمپس لە دورگەی دیادا، تیرێکی لێدابوو (لە ئاردیانی)وکوشتبووی. هەروەها مایرا، کلومینی، و ئیریفولی قێزەوەریشم بینی کە ژیانی مێردەکەی خۆی بە زێڕ فرۆشت. هەڵبەتە باسی هاوسەرانو کیژانی پاڵەوانان، ئەو هاوسەرو کیژانەی کە دیتمن شەوێکی تەواوی دەویٚ. ئێستاش وەختی خەوە، یا دەبیٚ بچم بۆ لای کەشتییە تیژڕۆکەمو دەگەڵ هاوڕێکانم دا بخەوم، یان لێرە بمێنمەوە. مەسەلەی گەڕانەوەشم بۆ وڵات، بە دەستی خواوەندانوئێوەیە."

## ئاریتی ستایشی ئودیسیوس دەکات

کە ئودیسیوس لە قسەکانی بووەوە، هەموو بە جاریٚ سەرسام بوون. لەسایەی هۆڵە گەورەکەدا، کڕوکپ بوون، چونکە کاریگەریی قسەکانی ئودیسیوس بە تەواوی ئەفسوونی کردبوون. ئەوسا ئاریتی باسك سپی، لە نێویاندا هەستاوگوتی:

"ئەی فیاسیان، ئەم پیاوەتان چۆن دێتە بەرچاو، لە رووی قۆزیوبەژنو بالاوە، لە رووی زیرەکیو سەلاریو سەنگینییەوە؟ راستە میوانی تایبەتی منە، بەڵام هەر یەکێك لە ئێوەش لەم سەرفرازیەدا شەریکن. پەلە مەکەن لە ناردنەوەی بۆ وڵاتی خۆی. هەر یارمەتیەکی دەویٚ دریٚغی لیٚ مەکەن. چونکە کۆشكوسەراکانتان پڕن لە نیعمەتی خواوەندان،وخواوەندان بە زیادەوە تۆڵەتان بۆ دەکەنەوە."

هەنگیٚ ئیکینوس، کە بە تەمەنترین خەڵکی ناو فیاسیان بوو، هەڵیدایەوگوتی: "برایانی ئازیز، قسەکانی شابانۆی دانامان، زۆر بەجێن. پڕ بە پێستی وەزعوحاڵی ئێمەن، بە گوێی بکەن، و فەرمانی ئەو لە عاردی مەدەن. بەڵام دوا بڕیاری جێبەجێکردنی، وەستاوەتە سەر ئالسینوس شا، کە بە خۆی لێرەیەو لەناوماندایە."

## گفتوگۆی دۆستانەی نێوان ئالسینوسو ئودیسیوس

ئالسینوس بەرسڤی دایەوەوگوتی: "ئەگەر من بمێنمو پاشای فیاسیانی ئاشقە دەریاو دەریاوانی بم، ئەوا پێشنیازەکانی شابانۆ دێنە جێبەجێکردن.بەڵام میوانەکەمان، هەرچەندە پەرۆشی گەڕانەوەیە، تا سبەینیٚ سەبربکاتو لەلای ئێمە بمێنێتەوە، بەڵکو فریای ئەوە دەکەوم هەموو دیاریوسەوقاتیەکانی بۆ کۆ بکەمەوەو هەموو پێویستییەکانی بۆ جێبەجیٚ بکەم. دیارە خەمی گەڕانەوەشی بۆ وڵاتی خۆی، خەمی هەموومانە، بە تایبەتی من. چونکە پاشاو سەرداری ئەم مەرزوبۆیەم."

هەنگیٚ ئودیسیوس دووربینوچارەسازو بەردەبار بەرسڤی دایەوە گوتی:

"ئەی ئالسینوسی بە توانا، ئەی بەنێو بانگترین ناودار، من گوێ بە فەرمانی تۆم، ئەمر ئەمری تۆیە نەك تا سبەینێ، بەڵکو ئەگەر ئەمر بفەرمووی تایەك ساڵی دیکەش لێرە بمێنمەوەو بەڵێنم بدەیتێ کە دیاریو سەوقاتیەکی باشوشایستەم بەگەڵ بخەیت، ئامادەم بمێنمەوە.چونکە قازانجی من لەوەدایە بەدەستی پڕ بۆ زێدونیشتمانی ئازیزم بگەڕێمەوە. هەنگێ قەدروحورمەتم لەلای هەموو ئەوانەی کە دەبینن بە دەستی پڕ بۆ ئیتاکا گەڕاومەتەوە، زیاتردەبێت."

ئالسینوس هەمدیس هەڵیدایەوگوتی:

"ئەی ئودیسیوس، هەرچەند سەیری تۆ دەکەین، پێناچێت یەکێك بیت لەو دەغەلبازانە، لەو خاپینۆکە زۆروزەبەندانەی، لێرەولەوێ دەسوڕێنەوە. درۆی وەها بەجێو ڕێ دەکەن کەس هەستی پێنەکاتو پەی پێ نەبات. بەڵام قسەکانی تۆ، زمانە شیرینەکەت، ڕاستگۆییو ڕەسەنایەتی پێوە دیارە. زۆر وەستایانەو هونەرمەندانە، وەکو شایەرانو داستابێژانی زۆر کارامەو لێهاتوو، ئەو سەربوروکارەساتومەینەتیانەت بۆ گێڕاینەوە کە بەسەر ئارگوسیانو بەسەر خۆت دا هاتوون. جا ئێستا وەرە ڕێکوراست، بە ڕاشکاویو بێ ئەوەی هیچمان لێ بشاریتەوە،پێمان بڵێ کێت لە هاوڕێ نیمچە خواکانت، لەوانەی دەگەڵ تۆدا هاتبوونە شەڕی تەروادە، ولەوێندەر کوژران، بینی؟ شەوێکی دووورودرێژمان لەبەردەمە، هێشتا لێرە کاتی خەوتن نییە،تکات لێدەکەم باسی ڕەفتاری خوایانەی ئەوانم بۆ بکە. ئامادەم تاکو بەیانی بە دیارتەوە دانیشم وگوێ لەسەربوروبەسەرهاتە پڕمەینەتیەکانت بگرم."

ئودیسیوسی چارەسازوبەردەبار بەرسڤی دایەوەوگوتی: "ئەی ئالسینوسی بە توانا، ئەی بەناوبانگترین ناودار، کات زۆرە،بەشی قسەش دەکاتو بەشی خەویش. جا ئەگەر تۆ بە ڕاستی حەزت لێیە گوێت لە قسەی من بێ، من قسەو باسی زۆرم لایە، قسەو باسی دڵتەزێن تر، پڕ کارەسات ترم لایە،چیرۆكو بەسەرهاتی خەمناکی ئەو هاوڕێیانەمت بۆ دەگێڕمەوە، کە لە شەڕی تووشو خوێناوی تەروادەو تەروادەییان ڕزگاربوون. بەڵام لە گەڕانەوەدا بە خواستی ژنێکی نابەکارو زاڵم مردنوتیاچوون."

## ئودیسیوس روحی ئاگامەمنون دەبینێ

کە پیرسیفونی موبارەك،بڵاوەی بە تاپۆو روحی ئافرەتەکان کرد، روحی ئاگامەمنون، کوڕی ئوتریوس، بەوپەڕی خەمباری هات. تاپۆو روحی هەموو ئەو کەسانەی کە لەگەڵیا، ولە ماڵی ئیجیستوسدا کوژرابوون، دەوریان دابوو. هەرکە لە خوێنە خەستەکەی خواردەوە یەکسەر ناسیمیەوە،لە سەڵای گریانێکی بەکوڵودڵتەزێنی دا، وەکو بارانی بوهار فرمێسك لە چاوانی داباریىن. هەردوو باڵی کردەوە کە لە هەمێزم بگرێت، بەڵام ئەو هێزو توانایەی جارانی نەبوو، کە بتوانێ ئەم کارە بکات. کە بەو حاڵەوەم بینی گریان ئەوکی گرتم، و ڕوندك بە چاوانمدا هاتنە خوارێ. زۆرم دڵ بە حاڵی سووتا،بە دەنگی بەرز پێمگوت: "ئەی ئاگامەمنون، ئەی کوڕی ئوتریوسی شکۆداروسەرفراز،ئەی سەرداری جەنگاوەران، ئەی گەورەی بەشەران، پێم بڵێ کام دێوی دڵڕەشی مەرگ تۆی گەیاندە ئێرە؟ ئایا پۆسیدون، لە دەریادا، فرسەتی لێهێنایت، زریانو گژەباو گێژەلۆکەی بەگژ کەشتییەکانتدا کردو لە ناوی بردیت؟ یان خەڵکانێکی هێڕوخۆسەرو

سەرکێش، لە کاتێکا کە تۆ پەزوگاوگۆتاڵت بە تالان دەبردن، لێت هاتنە دەست و کوشتیانیت؟ یان خەڵکانێك بەدەم بەرگری لە شاروناموس وژنانی خۆوە، بەرەنگارت بوونەوەو لە نێویان بردیت؟

هەرکە لە قسەکەم بوومەوە، یەکسەر وەڵامی دامەوەوگوتی:

"ئەی توخم وتۆوی زیوس، ئەی کوڕی لایرتیس! ئەی ئودیسیوسی فەرزانەوبەردەبار، نە پوسیدون زریان و گژەبای بەگژ خۆم وکەشتییەکانمدا کرد، ونە خەڵکانی هێڕوخۆسەرو سەرکێش لە پەناو پارسارێکدا لێم هاتوونە دەست وکوشتویانم.بەڵکو ئیجیستوس بە هاودەستی ژنە ناچیزەکەم کوشتوومی: دەعوەتی کردم بۆ ماڵەکەی خۆی ،وەکو چۆن جوانەگایەك لە ئاغەڵدا دەکوژنەوە بەو ئاوایە بە مەرگێکی پڕ ئازارو سوێ مردم. و هەموو هاوڕێکانی بە چواردەورمدا یەك بە یەك سەربڕین، وەکو چۆن بەرازانی شفرە سپی لە شایی و زەماوەندا، یان لە دەعوەت و زیافەتدا، یان لە بەزم وسووری بادەنۆشیدا،لە ماڵە گەورەیەکی بە توانا ودەوڵەمەندا دەکوژنەوە، بەو ئاوایە دوا بەیەکیانی سەربڕی.. هەڵبەتە تۆ تائێستا زۆر کەست دیتوون کە لە شەڕی تەن بە تەن، یان لە ناوجەرگەی هەراوهەنگامەی شەڕی خوێناوی و لە شەڕگەدا کوژراون.. بەڵام ئەگەر ئەم دیمەنەت دیتبا، هەرگیز لە دڵت دەرنەدەچوو: هەموو لاڵ و پاڵ، بێ روح و گیان، لە هۆڵێکی گەورەدا، بە دەوری جامی پڕومێزی رازاوە بە هەموو جۆرە خواردن وخواردنەوەیەك کەوتبووین،و خوێن بەناو هۆڵەکەدا جۆگەلەی بەستبوو.گوێم لە هاواری دڵتەزێنی کاساندرای کیژی پریام بوو، لەو کاتەدا کە دەیویست بە هانای منەوە بێت، کلیتمنسترای بێویژدان لە پاڵ مندا کوشتی. لەو کاتەدا کە لە سەرە مەرگ وئاوزینگ دابووم و ئازای لەشم زامداری شمشێر بوو، ویستم دەست بەرز بکەمەوەو ئەو دێڵە بکوژم، نەمتوانی. دەستەکانم خاوبوونەوەو کەوتنە سەر عاردی. ئیدی ئەو بێ حەیایە، لەو کاتەدا کە بەرەو هادیس دەڕۆیشتم، پشتی تێکردم، و بێئەوەی بەزەیی و سۆزی بجوڵێت و بێت بە دەستی خۆی پێڵۆی چاوانم لێك بنێ، یان زارم لێك بنێت، لێیدا رۆیی. هەڵبەتە لە دنیادا هیچ زوڵمێك، هیچ ئابڕوچوونێك لەوە گەورەتر نیە، ژنێك بێت ئەو تاوانە گەورەیە دەرهەق بە مێردی حەڵاڵی خۆی، مێردی یاسایی خۆی بکات. من لە دڵی خۆمدا خۆشی خۆشی ئەوەم بوو کە دەگەڕێمەوە بۆ ماڵ،کەسوکارو ماڵ و منداڵ، ودەستوپێوەندانم پێشوازی گەرمم لێدەکەن. بەڵام ئەو ناچیزە، ئەو دایکی ئۆینانە، بەو تاوانە دزێوە، ریسوایی و شەرمەزارییەکی ئەوتۆی بەسەر خۆیی و بەسەر ژنانی ئایندەو تەنانەت ژنانی سەلارو ئابڕومەندیشدا هێنا، کە بە داستان بگێڕدرێتەوە."

لێرەدا وەڵامم دایەوەوگوتم:

"ئاخ! هەزار حەیف ومەخابن بۆ تۆ، مەسەلەکە ئەوەیە کە زیوسی دەنگ دلێر، هەر لە هەوەڵەوە، رقێکی سەیری لە ماڵبات وخانەدانی ئوتریوس بوو، بۆ ئەو مەبەستەش هەمیشە ژن و ئۆین و مەکری ژنانی بەکار هێناوە، لە رێگەی ژنانەوە رقی خۆی بەم ماڵبات وخانەدانە رشتووە. دنیایەك خەڵکمان لە پێناوی هیلیندا تیاچوون. ئەمەش کلیتمنسترا، بزانە لە پشتی تۆوە چ پیلان و کەتنێکی گێڕاوە".

هەرکە لە قسەکەم بوومەوە، بەلەز هەڵیدایەوگوتی:

"کەواتە تۆش ئاگات لە خۆت بێ، خۆشباوەڕ مەبە. زۆر نەرمو بە لوتف مەبە، تەنانەت دەگەڵ هاوسەرەکەشتدا زۆر میهرەبانونەرم مەبە. هەموو رازێکی دڵی خۆتی پێ مەڵێ، کە شتێکت پێ گوت، دوو شتی لێ بشارەوە. بەڵام ئەی ئودیسیوس، ئەمە بەو مانایە نیە کە ژنەکەی تۆش تاوانبارێکە وەکو کلیتمنسترا، نا، تۆ هەرگیز بە دەستی ژنەکەت، یان بە پیلانی ژنەکەت ناکوژرێی. چونکە پنلوپی فەرزانە، کیژی ئیکارۆس، ژنێکی یەجگار بەویژدانوبە ئینسافە، یەجگار ئاقڵو بە ئاوەزە. کە ئێمە رۆییشتین بۆ شەڕی تەروادە، ئەو هێشتا تازە بووك بوو، نۆبەرەیەکی ساوای بە بەرەوە بوو. رەنگە ئەو منداڵە ئێستا گەورە بووبێو پیاوی ناو مەجلیسان بێت.خەنی لە خۆی، خۆشی لە خۆی کە بابی بۆ وڵات دەگەڕێتەوە، دەی بینێو ئەویش بە گەرمی پێشوازی بابی دەکاتو دەستی لە مل دەکات. بەڵام ژنەکەی من، نەیهێشت چاوم بە دیداری کوڕەکەم روون ببێتەوە. بەر لەوەی بیدینم، کوشتمیو ئەو ئاواتەی پێ بردمە گۆڕەوە. حەزدەکەم ئامۆژگاریەکی دیکەشت بکەم، ئەم ئامۆژگاریە بکە بە ئاڵقەو لە گوێی بکە: کە بە کەشتییەکەت بەرەو ئیتاکا دەڕۆی مەیەڵە کەس پێت بزانێ، بەدزییەوە برۆ، چونکە لە ئێستا بە دواوە پشت بە ژنان نابەسترێ، متمانەیان پێناکرێت. ئەرێ پرسیارێکم هەیە، تکایە بە راشکاویو بێ پەردە وەڵامم بدەوە: هیچ شتێکت لەمەڕ ئوریستوسی کوڕم بیستووە؟ ئایا لە ئورخومینوسە، یان لە پولوسی لمەڵان، یان لەگەڵ منیلاوسەو لە ئەسپارتەیە؟ چونکە ئوریستوسی ناودار، کوڕەکەم، نەمردووەو هێشتا لەسەر رووی زەوییە."

وەڵامم دایەوەوگوتم:

"ئەی کوڕی ئوتریوس، بۆچی ئەم پرسیارە لە من دەکەی؟ چونکە من بە هیچ جۆرێ نازانم کە کوڕی تۆ زندووە یان مردووە، خۆ ناشکرێ درۆیانت بۆ هەڵڕێژمو...

## ئەخیل قسە دەگەڵ ئودیسیوس دەکات

لەو کاتەدا کە ئێمە بەو جۆرە بەرانبەر بە یەکتر وەستا بووین، ودەردە دڵمان دەکردو فرمێسکمان هەڵدەڕشت، روحی ئەخیلی کوڕی پیلیوس، وروحو تاپۆی پاتروکلوسو ئەنتیلوخۆسی بێ نەزیر، وئەجاکسی هەرە قۆزو جوانی ناو داناییان لە پاش کوڕی پیلیوس، هاتن. روحی نەوەکەی ئەیاکۆس، واتە ئەخیلی قۆچاغ ناسیمیەوەو بە دەم ئاهوناڵینەوە گوتی:

"ئەی کوڕی لایرتیس، ئەی توخموتۆوی زیوس، ئەی ئودیسیوسی چارەساز، ئەی دووربینی بەردەبار ئەی سەرکێشی نەترسوبێباك، چ کارێکی لەمە گەورەتر، قارەمانانەترت بە دەستەوەیە؟ چۆن زاتی ئەوەت کردووە بێی بۆ ماڵی هادیس، بۆ ناو ئێمەی مردووانی بێ گیان، بێدەسەڵاتو هیچ لە دەست نەهاتوو، بۆ ناو شەبەنگوتاپۆی خەڵکانێك کە رەنجی زۆریان کێشاوەو لێرە گیرساونەتەوە؟"

وەڵامم دایەوەوگوتم:

"ئەی ئەخیل، کوڕی پیلیوس، ئەی دلاوەرترین پیاوی ناو ئاخاییان، ئەی سەرتۆپی هەموو ئاخاییان،هاتووم راوێژ بە تیریسیاس بکەم، بەڵکو رێیەکم پێ نیشان بدات، تەگبیرێکم بۆ بکات

تا بۆ ئیتاکای بەردەڵانی پڕگاشە بگەڕێمەوە.چونکە تا ئێستا نەمتوانیوە لە ئاخایا نزیك ببمەوە، تا نەو پێم نەناوەتە ئاخی وڵاتەکەم،وکێشەو ئاستەنگو مەینەتی بەرۆکی گرتووم و لێم نابێتەوەو نابێتەوە. ئەی ئەخیل جاران، لە رابردوودا کەس لەتۆ بەختەوەرتر نەبوو، ولە ئایندەشدا کەس لە تۆ بەختەوەر تر نابێت. کە تۆ زندوو بوویت،ولە ژیانا بووی، ئێمە، ئارگۆسیان ڕێزی خواوەندانمان لێدەنایت. ئێستاش کە لێرەیت، بێگومان فەرمانڕەوای مردووەکانی. بۆیە ئەی ئەخیل، هیچ خەفەت مەخۆ کە مردوویت."

کە ئەو قسەیەم کرد،بەتوندی وەڵامی دامەوەوگوتی:

"ئەی ئودیسیوسی سەرفراز، تکایە مەرگم لاشیرین مەکە، سەد بریا لە دنیاداو رەنجبەری پیاوێکی هەژاری گومناوی کەسنەناس بوایەم، نەك لیرە فەرمانڕەوای هەموو مردووان بوایەم، مردوانی بێ گیانو بێدەسەڵات، کە ناکەنە هیچو لە هیچ حیسابێکدا نین! بە هەرحاڵ تۆ باسی کوڕە ناودارەکەمم بۆ بکە، ئاخۆ چووە بۆ شەڕ تا ببێ بە جەنگاوەرێکی شایستەو لە ریزی پێشەوەی لەشکردا بجەنگێ، یان پەیوەندی بە لەشکرەوە نەکردووە؟ ئەدی پیلیوسی خانەدان لە چیدایە، گەر شتێکت دەربارەی بیستووە بۆمی باس بکە. ئایا هێشتا لە نێو میرمیدونەکاندا بەرێزو حورمەتە یان لە سەرانسەری هیلاس وفیتادا، ئەو حیسابەی جارانی بۆ ناکرێ. چونکە پیری لە دەستو پێی خستووە؟ خۆزگا، لە ژیانا دەبووم و تیشکی هەتاو لێی دەدامو لە دنیای روناك دا دەبووم و وەکو ئەوسا دەبووم کە لە دەڤەرو خاکی تەروادەدا، لە پێناوی ئارگۆسیاندا، ئازاترین شەرڤانم دەکوشتن، بۆ ئەوەی فریای پیلیوس بکەوتمایە، بریا ئەگەر بۆ تاقە یەك سەعاتیش بوایە، بە هەمان تینوتاوو گوڕوجۆشی ئەوساوە بۆ ماڵی بابم چووبامەوە، بۆ ئەوەی بە هێزی بازوان، هەموو ئەو کەسانەم تەمبێ بکردنایە کە ئازاری دەدەنودەیانەوێ لێی بخەنو شوێنی بگرنەوە!".

دوای ئەو قسانە بەرسڤم دایەوە:

"راستت دەوێ، هیچم دەربارەی پیلیوسی خانەدانو رەسەن زادە نەبیستووە. بەڵام سەبارەت بە کوڕە ئازیزەکەت، نیوپتولیموس، ڕێكوراست، بێ پێچو پەنا پێت دەڵێم. کە من بە خۆم بە کەشتییە گەورەو جوانەکەی خۆم لە (سکورس)ەوە بردم تا پەیوەندی بە لەشکری شەڕڤانانی ئەخاییەوە بکات. کە لە چواردەوری شاری تەروادەدا، بۆ راوێژوتەگبیران کۆ دەبووینەوە، ئەو هەمیشە لە پێش هەموانەوە قسەی دەکرد، رەئی خۆی دەدا،وهەمیشە ڕاو بۆچوونەکانی دروستوبەجێ دەردەچوون. تەنیا منونەستووری پێشگۆو فاڵبین لە راوێژدا لەو زیاتر بووین. کە لە دەشتی تەروادەدا، شمشێر بەدەست دەکەوتینە شەڕەوە، هەرگیز لە ناو ئاپۆڕای لەشکرو شەرڤانەکانیا نەدەمایەوە، بەڵکو دەچووە ریزی هەرە پێشەوە. لەسەر کێشیو بوێریو پەلاماردا، کەس نەیدەگەییشتێو لەو شەڕە سەختوخوێناوییەدا زۆر کەسی کوشت. جا من ناتوانم لێرەدا هەموو ئەو کەسانە بژمێرمو ناویان بەرم کە نیوپتولیموس لە پێناوی ئارگۆسیاندا، بە مەبەستی بەرگری لە ئارگۆسیان کوشتنی. تەنیا یەك نموونە دێنمەوە، ئەویش جەنگاوەری دلێرو ئازا یورپولوسی کوڕی تیلیفوس بوو کە بە شمشێری نیوپتولیموس کوژرا! هەروەها ژمارەیەك لە

هاوڕێ سیتاییەکانیشی بەدەوریا کوژران. هەر هەموو ئەمانە بوونە قوربانی کۆمەڵێك دیاریو بەرتیل کە بە ژنێك درابوون. [*دیاریو بەرتیل: ئاماژەیە بۆ ئەو زێڕو زێوەرەی کە پڕیام بە دیاری دابووی بە ژنەکەی تیلیفوس، ئەو دیارییەی بووە هۆی ئەوەی کە ئەو ژنە، یوریپلیوسی کوڕی بنێری بۆ یارمەتی تەروادەییەکانو لەوێ کوژرا..وەرگێڕ*] بەڵێ. من، جگە لە میمون، هیچ پیاوێکی لەو قۆزترم نەبینی بوو. جارێکی دیکەش، کاتێ کە دەبوو هەڵبژاردەترین ئازایانی ئارگۆسی بچنە ئەو ئەسپەدارینەوە کە ئیپیوس دروستی کرد بوو، وسەرپەرشتیوسەرۆکایەتی ئەسپەکە، کردنەوەوداخستنی دەرگاکەیان بە من سپارد بوو، هەر هەموو فەرماندەو راوێژکارە داناییەکانم بینی کە دەگریانو لاقیان دەلەرزی، کەچی بۆ تاقە جارێکیش ئەوم نەبینی کە رەنگی روخساری جوانی بگۆڕێ.یان تاقە فرمێسکێك لە چاوانی بێت، بە پەرۆشەوە داوای لێکردم کە رێگەیان بدەم لە ئەسپەکە دابەزن، وشمشێرو نێزە قورسەکەی رادەوەشاندو لێوی لە تەروادەییان دەکرۆشت. دوای ئەوەی خۆمان بە شاروقەڵاکەی پریام دا کرد، شاری تەروادەمان گرتو تالانمان کرد، کوڕەکەت بە دەسکەوتێکی زۆرەوە، کە پاداشتی سەرکەوتنی خۆی بوو، بە سەلامەتی، بێ هیچ برین وئاسیوێك، بێ ئەوەی بە دوورە تیرو نێزان بریندار بووبێ، یان لە شەڕی رووبەڕوو، و دەستەو یەخەدا بریندار بووبێ، کە زۆرجار ئەم شتە لە شەڕدا روو دەدا، چونکە کە ئەریس تورە دەبێ، دۆودۆشاو تێکەڵ دەکات. بەڵێ کوڕەکەت بە سەلامەتی بە دەستی پڕوتاڵانیو دەسکەوتی شەڕەوە، گەڕایەوە نێو کەشتییەکە.
هەرکە ئەو قسەیەم کرد، روحی نەوەکەی ئەیاکوس، بە هەشتاو بە نێو مێرگوزارانی پڕ لە بنجە مێخەکدا، رۆییو زۆر شاد بوو بەوە کە پێم گوتبوو کوڕەکەی سەرامەدوپێشەنگی هەمووانە.

## روحی مردووان پرسیاری ئازیزانیان لە ئودیسیوس دەکەن

روحانیەتی مردووانی دیکە،هەموو ماتوخەمین لەوێندەر وەستا بوونو هەر یەکەیان سەربوری خەمناکی خۆی بۆ دەگێڕامەوەو پرسیاری ئازیزانی خۆیان لێدەکردم. لە نێو هەموویاندا، روحانیەتی ئەجاکسی کوڕی تیلامون، بە تەنیاو لە دوور وەستا بوو. هێشتا لێم تورە بوو، چونکە کاتی خۆی لەسەر داوای دایکی بەڕێزی ئەخیل، پێشبڕکێیەکی کەشتێرانی لە نێوان منو ئەودا (ئەجاکس) لەسەر سپەروچەكو ئەسڵەحەکەی ئەخیل کرا، تیتسی دایکی ئەخیل، سپەرو چەكو ئەسڵەحەکەی کردبوو بە دیاری بۆ ئەوەی سەردەکەوێ. داوەرانی ئەو پێشبڕکێو هەڤڕکیەش، زندانیانی تەروادەییو پالاس ئەتینا بوون، ئیدی من گرەوەکەم بردەوە، خۆزگە سەد خۆزگە ئەو پێشبڕکێو گرێوەم نەبردایەتەوە، چونکە بە هۆی ئەو چەكوئەسلەحانەوە بوو، کە ئەجاکسی خانەدان، کە جگە لە ئەخیلی بێ نەزیری کوڕی پیلیوس، لە هەر هەموو داناییەکان قۆزتروجوانتروئازاتروجەنگاوەرترو قارەمانتر بوو، تیاچوو وکەوتە ژێر گڵ. بۆیە کە دیتم، هەوڵمدا ئاشتی بکەمەوە، دڵی بدەمەوە، پێم گوت:
"ئەی ئەجاکس، ئەی کوڕە بێ وێنەکەی تیلامون. یانی بە مردویەتیش هەر لەگەڵم ئاشت نابیتەوە، رقی ئەو چەكو ئەسڵەحە نەفرەتیەت لە دڵ دەرناچێت؟ راستت دەوێ خواوەندان ئەو چەکانەیان کرد بە مایەی نەگبەتی ئارگوسیان: بە نەمانی تۆ قەڵایەکی یەجگار گەورەو بەهێزمان

لە دەست دا. ئێمەی ئاخیایی تا ئێستاش هەر خەمین‌وخەمباری تۆین. وەکو چۆن خەمین‌و خەمباری ئەخیلی کوڕی (پیلیوس)ین. بەڵام گوناحی ئەوە لە گەردنی زیوسە، کە رقی زۆری لە لەشکرو شەڕڤانانی نێزەوانی داناییان بوو،وبە تۆی رشت‌و ئەجەلی هێنایت. دەیسا شازادە، دڵت نەرم بێ،جڵەوی رق‌وکینەت بگرە، وەرە بۆ ئێرە با گوێت لە قسەوداستانی من بێت."

هیچ وەڵامێکی نەدامەوە، بەڵکو بەرەو ئێریبوس بۆ ناو خێڵی مردووان، ملی رێگەی گرت. چەندم حەزدەکرد سەرباری توڕەییەکەی قسەی لەگەڵم بکردایە. یان من بچوومایەو قسەم لەگەڵی کردبا. بەڵام مردووانی تر لەوێ بوون‌و حەزم دەکرد بیان بینم."

ئەوسا مینوس، کوڕە ناودارەکەی (زیوس)م بینی کە لەسەر سەکۆی دادگایی مردووان، بەخۆو گۆچانە زێڕینەکەی دەستیەوە دانیشتبوو،ئاپۆڕای روح وتاپۆی مردووان چ بە پێوەو چ بە دانیشتنەوە، لە ماڵی فرە دەروازەی هادیس دا، دەوریان دابوو،وچاوەڕوانی حوکم وداوەری ئەو بوون.

دوای ئەو، ئوریونی دێو ئاسام بینی، کە بە نێو سرێشەجارێکی پڕ لە بنچکەسرێشان، کەوتبوو، و روحی ئەو دڕندانەی ڕاودەکرد، کە کاتی خۆی، بە خۆی لە چیاو چۆڵان ڕاوی کردبوون: گورزێکی گرانی برونزی بە دەستەوە بوو کە هەرگیز لە شکان نەدەهات.

دوای ئەوە تیتوسی سەرفرازی کوڕی جیا (زەوی)م بینی کە بێ روح‌و گیان لە عاردی کەتبوو، و نۆ گاوەخان زەوی گرتبووەوە، دوو دالاش-م بینی لەسەری نیشتبووونەوەو سەریان ژەندبووە هەناوی‌و جەرگیان پارچە پارچە دەکردو ئەویش نەیدەتوانی بە دەست لە خۆی دووریان بخاتەوە. ئەمە سزای ئەوە بوو کە لیتوی هاوسەری سەرفرازی زیوس، دەیویست لە پانوپیوسی مەڵبەندی شایەرانی خۆشئاوازەوە بۆ پوتو بڕوات، دەست درێژی کردبووە سەری‌و بەدرەفتاری دەگەڵ کردبوو.

هەروەها (تانتالوس)م لە وەزع‌و حاڵێکی زۆر ناخۆش‌وخەمناکدا بینی، لە نێو دەریاچەیەکدا وەستا بوو کە ئاو دەگەییە چەناگەی، کەچی عەزرەتی ئاو بوو، ونەیدەتوانی لەو ئاوە زۆرە بخواتەوەو تینویەتی خۆی بشکێنێ. ئەو پیرەمێرە بەلەنگازە هەرکە دادەنەوییەوە تا ئاو بخواتەوەو تینویەتی خۆی بشکێنێ، ئاوەکە وشکی دەکردو دەبوو بە هەڵم. ئەرزێکی وشك‌و برینگ لەبەر پێیدا دەردەکەوت. هەڵبەتە خواوەندێك دەستی لەم کارەدا هەبوو.هەروەها باخێکی پڕ لە درەختی میوەی هەمە جۆری وەك هەرمێ، هەنار، سێو، هەنجیری شیرین‌و زەیتونی پڕشکۆفە. بەڵام هەرکاتێ ئەو پیرەمێرە بەستەزمانە دەستی بۆ میوەیەك ببردایە بایەکی هەڵدەکردو لق‌و پۆپەکانی دەگەیاندە بنی هەوران.

هەروەها(سیزیف)م لە وەزع‌و حاڵێکی یەجگار خەمناك‌و ناخۆشدا بینی. لە عەزابێکی بێ کۆتایی دا بوو. ملی بە گا بەردێکەوە نابوو، بەرەو لوتکەی شاخێکی پاڵ دەنا، هەرکە دەیگەیاندە لوتکەکە، جارێکی دی لەبەر قورسی خۆی بەرەو بنارو پێدەشتەکە غل دەبووەوە. جارێکی دی هێزی وەبەر خۆی دەدایەوەو گا بەردەکەی بەرەو لوتکە پاڵ دەدایەوە،و ئارەقەی شین‌ومۆر لە ئازای دەچۆڕا و تەپوتۆز لە پشتییەوە هەڵدەستا.

## ئودیسیوس هەرقل دەبینێ و قسەی دەگەڵ دەکات

لە دوای ئەو(هیراکلیس)م بینی، یان بە گوتەیەکی تر تاپۆو شەبەنگی هیراکلیسم بینی. چونکە هەرقل، هەمیشە هاوبەزمو هاوسفرەی خواوەندانی جاویدان بوو. هیبەی پاژنە جوان ژنی بوو. هیبە، کیژی زیوسی مەزن و هیرای سەندەڵ زێڕ بوو. تاپۆی مردووان، وەکو چۆن مەلانی ترساو بە قاوقیژ بە هەموو لایەکدا دەفڕن، بەو ئاوایە، کردبوویان بە هەراو زەناو هەراسان وشپرزە بە دەوریدا دەسوڕانەوە. لە شەوی تاریك دەچوو، کەوانەکەی بە رووتی بە دەستەوە گرتبوو، تیرێکی خستبووە سەر ژێیەکەی و لەسەر پێ بوو. چاوی بە هەموو لایەکدا دەگێڕا. نیگای زۆر ترسناك بوو. وادەهاتە بەرچاو لە ئان و ساتدا تیرەکەی بهاوێ. سینەپۆش ونیتاقێکی زێڕی یەجگار سەیری لەبەر کردبوو، وێنەو نیگاری سەیری لەسەر نەخشێنرا بوو: ورچ، بەرازێن هۆڤی و سڵ و سلۆك، شێرانی چاوئاگرین، شەڕوشەڕگە، کوشتارو خوێنڕێژی. بەڕاستی شتێکی سەیر بوو. تەنانەت ئەو وەستاو هونەرمەندەی کە دروستیشی کرد بوو، نەیدەتوانی شاکارێکی دیکەی وەها دروست بکاتەوە. هەرقل هەرکە چاوی بە من کەوت یەکسەر ناسیمیەوە، ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی:

"ئەی توخم وتۆوی زیوس، ئەی کوڕی لایرتیس، ئەی ئودیسیوسی چارەسازو دووربین و بەردەبار. ئەی نەگبەتی بێ نەوا! ئایا تۆش هەمان باری گرانی چارەنووس دەکێشێت، کە من تا لە دنیادا بووم، لە ژێر پرشنگی هەتاودا بووم، هەرگیز بۆ ساتێکیش دام نەنا؟! ئەگرچی من کوڕی زیوسیی کوڕی کرونوس بووم، بەڵام نەگبەتی و بەدبەختی من بێ سنوورو بوو. چونکە بوو بووم بە کۆیلەو ئەڵقە لە گوێی پیاوێکی ناکەس و کاری یەجگار قورس و دژواری بەسەردا دەدام. جارێکیان بۆ ئێرەی ناردم تا سەگی هادیسی بۆ بەرم. بە خەیاڵی خۆی هیچ کارێك لەوە قورس ترو دژوارتر نەبوو. کارێك بوو لە کێشی کەسدا نەبوو. وێڕای ئەوەش سەگەکەم لە هادیسەوە بۆ برد: ئاخر هیرمیس و ئەتینای چاوگەش ڕێپیشاندەرو پشتیوانم بوون."

هەرقل،دوای ئەو قسانە یەکڕێ بۆ ماڵی هادیس گەڕایەوە. بەڵام من هەر لەوێندەر مامەوە، لەجێی خۆم نەجولام. بە ئومێد بووم روحی کۆمەڵە قارەمانێکی دی، ئەوانەی لە مێژ بوو مردبوون و حەزم دەکرد بیان بینم بێن، وەك تیسیوس و پایرتیوس، کوڕانی ناوداری خواوەندانی سەرفراز. بەڵام بێئەوەی ئەو دەرفەتەم بۆ بڕەخسێ تاپۆو شەبەنگی ملیۆنان مردوو، بە هەراو زەنایەکی سەیرەوە لێم خڕ بوونەوە. پیاو راست بڵێ ترسم لێنیشت، تۆ بڵێی پیرسیفونی گرانقەدر. بە تەما نەبێ لە ماڵی هادیسەوە سەری گۆرگۆنی ترسناك، میدۆزام بۆ بنێری؟

## ئودیسیوس جیهانی ژێرین بەجێ دێڵێ

دوای ئەوە یەکسەر بۆ لای کەشتییەکە گەڕامەوە. فەرمانم بە هاوڕێکانم دا سواری کەشتییەکە بن. بە پەلە گوریس و کندرەکان بکەنەوە. یەکسەر هەموو سواری کەشتییەکە بوون، لە شوێنی خۆ دانیشتن. شەپۆلی ئاو بردینییە ناو روباری ئوقیانوسەوە، هەوەڵجار بە سەوڵ لێدان ڕۆییشتین و پاشان شنەیەکی سازگار هەڵیکردو وەپێشی داین.

***

**پەراوێز:**

*- سیمیریان: گەلێکی خورافین لەوپەڕی ڕۆژاوادا لە پاڵ ئۆقیانوسدا، لە وڵاتێکا دەژین، یەکپارچە تەمومژو هەورو هەڵایەو نە بەیانانو نە ئێواران ڕۆژ لێی نادات.

*- ئێریبوس: ڕەمزی تاریکییە، بە تایبەتی تاریکی ژێر زەوی. وەکو ئاماژە بۆ (جیهانی ژێرین) بەکار دێت.

*- تیریسیاس: یەکێکە لە فاڵبین و نجومگەرە ئەفسانەییە هەرە بەناوبانگەکانی یونان. کوڕی حۆری‌وپەری یەك بوو بەناوی خاریکلو. بەشیوەیەکی زۆر سەیر فێری هونەری فاڵبینی و نجومگەری بوو. ڕۆژێ لە چیای کیتاروندا، دوو ماری ئاشقەوماشقە دەبینێ کە لە حاڵی جووت بووندا دەبن. بە گۆپاڵەکەی تێیان بەربوو. مارەکان دیار نەمان، و ئەویش گۆڕاو بوو بەژن. دوای حەوت ساڵان. هەمان ماری دیتنەوەو لە حاڵی جووتگیریدا بوون، یەکسەر گۆڕاو بووەوە بە پیاوەکەی جاران. بە حوکمی ئەوەی لە ژیاندا،هەم نێراتی و هەم مێیاتی تاقی کردبووەو دیتبوو، لە گەنگەشەیەکی نێوان زیوس و هیرادا لەمەڕ ڤیان‌وئەشق، دەکرێ بە داوەر. بەڵام چونکە داوەرییەکەی بە قازانجی هیرانابێت، نابیناوکوێری دەکات. زیوس لە تۆڵەی ئەوەدا تەمەنی حەوت جاران لە تەمەنی ئاسایی درێژ تر دەکات و تواناو بەهرەی فاڵبینی پێدەبەخشێت. و بەڵێنی دەداتێ کە لەو دنیاش، لە هادیس، ئەو بەهرەی فاڵبینی و نجومگەرییەی لێ نەسەنێتەوە.

*- ئەرتەمیس: کیژی زیوس‌ولیتۆیە. خوشکی جمکانەی ئەپولۆ، خواوەندی هەتاوە. پایەیەکی زۆر بەرزی لەنك خواوەندانی ئۆڵەمپنشین هەیە. بە خواوەندی ڕاووشکار ناسراوە.

*- پیرسیفونی: هاوسەری پلوتو، خواوەندی دۆزەخە.

*- ئەریادنی: کیژی شا مینۆسی شای کریتە. حەزی لە تیمیوس کردبوو.

*- دیونیسوس: خواوەندی بادەوشەراب و ڕەزانە.

*- کلومینی: کیژی ئۆقیانوس‌وتیتوسە، دایکی ئەتڵەسە.

*- ئیجیستوس: کاتی خۆی دایکی فرێی دەدات. بەڵام شوانکاران دەیدۆزنەوە، پاشان وەکو کوڕی ئوتریوس گەورە دەبێت و بە نەزانستە دایکی خۆی دەخوازێ. لە ماوەی چوونی ئاگامەمنون بۆ شەڕی تەروادە، ئیجیستوس حەز لە کلیتمنسترای ژنی ئاگامەمنون دەکات. کە ئاگامەمنون دەگەڕێتەوە، بە دوو قۆڵی دەیکوژن. پاشان ئیجیستوس حەوت دانە ساڵ فەرمانڕەوایی موکینای کرد تا کوڕەکەی ئاگامەمنون کوشتی.

*- دیاری‌و بەرتیل: ئاماژەیە بۆ ئەو مێوە زێڕینەی کە پریام بە دیاری دای بەژنەکەی تیلیفوس، و ئەویش یوریپیلوسی کوڕی بۆ یارمەتی تەروادەییەکان نارد.

*- میمنون: پاشای ئیتیوپیا بوو، براکەی عەرشەکەی لێ داگیرکرد. بەڵام هەرقل بۆی گێڕایەوە. دوای مردی هیکتۆر چووە هیمدادی پریام.

*- تیلامون: پاشای دوڕگەی سلامیس بوو.

*- تیتوس: بە کوڕی زیوس‌وئیلارا بە ناوبانگە. گوایە کاتی خۆی زیوس لە ترسی ڕق و کینەی هیرا، ئیلارا لە ژێر زەوی دا دەشارێتەوە، وبەر لەوەی تیتوس لە دایك بێ دەمرێت، ئیدی تیتوس

له جیا (زەوی)یەوە لە دایك دەبێت. تیتوس زەلامێکی زەبەلاحی دێو ئاسا دەبێت، و تەماحی دەچێتە لیتۆ، بە زۆر ئیلاقەی دەکات. لیتوش ماشقەی زیوس دەبێت. بۆیە زیوس بە بروسکە تیتۆس دەکوژێت.

*- تانتالوس: پاشای لیدیایە. خاوەنی هێزو سەروەت وسامانێکی زۆرو بەختێکی گەورە دەبێت، وبۆ کۆڕودەعوەت و مەجلیسی خواوەندان دەعوەت دەکرێ. رۆژگار دەیسەلمێنێ کە سەروەت وسامانی لە پێویست زیاتر بووە. بۆیە لە ئەنجامدا سەری خواردووەو لێکەوتووە،

*- سیزیف: لە هەندێ چیرۆکاندا وەکو بابی شەرعی ئودیسیوس ناو دەبرێ. وپاشای کورنتە بووەو کوڕەکەی فەرزانەترین بەشەر دەبێت.

*- هیبە: خوابانۆی گەنجان و کیژی زیوس و هیرایە. لە بارەگای خواوەندانی ئۆڵەمپدا کاری دەکرد. گالیسکەکەی هیرای سەرپەرشتی دەکرد. زامەکانی ئەریسی تیمار دەکرد، ساقی (مەی گێڕ)خواوەندان بوو بەر لەوەی جانومیدیس ببێ بە ساقیان.

*- هیرا: هاوسەری زیوسی گەورەی خواوەندانە.

*- گۆرگۆن: گۆرگۆنەکان سێ خوشك بوون بە ناوانی: ستنۆ، ئوریال، ومیدوزا. ئەمانە کیژی فورسیسی-ن کوڕی پونتوس وستوی کیژی ئوسیبان بوون. گۆرگانەکان لە خوابانوانی هەوەڵین بوون. لە شوێنێکی نادیاری نزیکی مەملەکەتی شەبەنگ وتاپۆیان دەژیان. رواڵەتیان یەجگار دزێوو سامناك بوو. سەریان زۆر گەورە، گێسویان هەژدیهاو دانیان وەکو شفرەی بەراز بوو. گۆرگۆنان، باڵی زێڕینیان هەبوو، بە ئاسماندا دەفڕین، هەرکەسێك بە چاوی زۆر کراوەوە تەمەشای کردبان دەبوو بە بەرد. بەناوبانگترینیان میدۆزا بوو، گیانلەبەرێکی فانی بوو، و بە دەستی پرسی کوژرا.

## سروودی دوانزەیەم

### کورتەی سروودەکە:

ئودیسیوس، کە دەگاتەوە دورگەی ئایایا، رێو رەسمی پرسەو بەخاك سپاردن بۆ ئیلپنور ئەنجامدەدات. کیرکی ئاگاداری دەکاتەوە کە لە گەڕانەوەدا، تووشی چ مەترسیو گیروگرفتێکی دی دەبێت. هەوەڵجار بە خۆو کەشتییەکەیەوە بە سەلامەتی دەرباز دەبێت. کە دەگەنە دەڤەرو مەڵبەندی سیرینەکان، ئودیسیوس دوای ئەوەی گوێی هاوڕێکانی دەئاخنێ، داوایان لێدەکات، کە خۆی بە بورجی کەشتییەکەوە ببەستنەوە، ئیدی گوێی لە ئاوازو گۆرانی دژمنانەی سیرینەکان دەبێتو ناشتوانێ هیچیان لێبکات یان تۆڵەیان لێبسەنێ. کە دەگەنە گەلییەکی تەنگی نێوان دوو تاوێری گەورە، ئودیسیوس بە گوێرەی ئامۆژگاریەکەی کیرکی، بۆ ئەوەی دووچاری خاریبد نەبێت، دەستی لای سیلا دەگرێت، بە سەلامەتیو بەبێوەی لە گەلیەکە دەرباز دەبێت. بەڵام سیلا شەش کەس لە هاوڕێکانی دەبات. ئەوسا دەگاتە دورگەی هەتاو،وپێشبینی و ئامۆژگاریەکانی تیریسیاس وەبیر دێنێتەوە، ولە ئەنجامی گوشارو پێداگریەکانی ئوریلوشوس لەوێ لا دەدات.لە بەندەری میسین دا گژەباو گێژەنگوگێژاوانی ناسازگار، بۆ ماوەی یەك مانگی خشت خۆیانوکەشتییەکەیان بەگیر دێنێو دەکەونە تەنگانەیەکی قورسەوە. توێشوو ئازووقەیان دێتە تەواوبوون. ئیدی رۆژێك کە ئودیسیوس لە خەودا دەبێت، هاوڕێکانی چێڵەکانی هیلیوس دەکوژنەوەو گۆشتەکەی دەخۆن. زیوس لە سزای ئەوەدا، زریانو گژە بایان بەگژا دەکاتو کەشتییەکەیان بەر هەورە تریشقەو برووسکە دەخاتو تەفروتونای دەکات. تەنیا ئودیسیوس لە خنکان قوتار دەبێتوبۆ خاریبدو سیلا دێتەوەو لە گەلیەکە دەرباز دەبێتو نۆ دانە رۆژ وێڵو سەرگەردان دەبێتو بای باشور بەرەو ئوجیجای دەباتو کالیپسو لەوێندەر پێشوازی دەکات.

***

### ئودیسیوس جەنازەکەی ئیلپینور دەنێژێ

پاش ئەوەی کەشتییەکەمان رووباری ئوقیانوسی بڕی، گەییە ناو جەرگەی شەپۆلی دەریای بەرینو ئەوجا گەییشتە دورگەی ئایایا، کە مەڵبەندی سپێدەو هەلاتنو ئاوابوونی رۆژە. کە گەییشتنە ئەو دورگەیە، لاماندا، کەشتییەکەمان راکێشایە سەر لمەلانی کەنارەکە، وبە خۆمان دا بەزینە سەر کەناری دەریاکەو بەدەم چاوەڕوانی سپێدەوە لێی خەوتین.

که سپێده به قامکه گوڵئاساکانیه‌وه به‌یانی دا، هاوڕێکانم بۆ کۆشك‌و سه‌راکه‌ی کیرکی نارد تا جه‌نازه‌که‌ی ئیلپینور بێنن. دارو چڵ‌وچێومان بڕی، له به‌رزترین شوێنی ده‌ماغه‌که‌دا، که‌ڵه‌که‌مان کرد، ئاگرمان تێ به‌ردا، به خه‌م‌و په‌ژاره‌یه‌کی زۆره‌وه، به‌ده‌م فرمێسك ڕشتن‌وگریانه‌وه، جه‌نازه‌که‌مان ده‌گه‌ڵ تفاق‌و که‌ره‌سته جه‌نگییه‌کانیدا سووتاندو بوو به خۆڵه‌مێش. ئه‌وسا کۆته‌ڵێکمان بۆ هه‌ڵبه‌ست‌و کێلێکمان له سه‌ری داچه‌قاندو سه‌وڵه جوانه‌که‌یمان له‌سه‌ر گۆڕه‌که‌ی چه‌قاند.به‌و جۆره هه‌موو ڕێوڕه‌سمێکی پرسه‌مان ئه‌نجامدا. کیرکی زانی بووی که له هادیس گه‌ڕاوینه‌ته‌وه، بۆیه به په‌له خۆی ڕازاندبووه‌وه‌و بۆ لامان هاتبوو. هه‌موو هاوده‌م‌و کاره‌که‌ره‌کانی ده‌گه‌ڵ بوون، نان‌وگۆشتێکی زۆر، باده‌ی ئاڵی ئاگر ئاسایان بۆ هێنابووین، خوابانۆی به‌ناوبانگ له ناوه‌ندمان دا وه‌ستاو گوتی "ئه‌ی بێنه‌وایان، پیاوانی سه‌رکێش، ئێوه که به زندوویه‌تی چوونه‌ته خانه‌ی هادیس، وه‌ك ئه‌وه‌یه دووجار بمرن، له کاتێکا خه‌ڵکی دی ته‌نیا جارێك ده‌مرن! ده‌ی ئێستا، بیکه‌ن به ئاهه‌نگ‌و ئه‌مڕۆ تا ئێواره‌ێ لێره بخۆن‌و باده بخۆنه‌وه.چونکه که سپێده به‌یانی دا ده‌بێ دیسان ڕێگه‌ی ده‌ریا بگرنه‌به‌ر، خه‌متان نه‌بێت ڕێگه‌تان پێنیشان ده‌ده‌م‌و له هه‌موو شتێکتان ئاگادارده‌که‌م، تا نه له ده‌ریاو نه له وشکیدا تووشی هیچ گیروگرفت‌و زیانێك نه‌بن.

## ئۆدیسیوس باسی سه‌فه‌ره‌که‌ی بۆ کیرکی ده‌گێڕێته‌وه

به گوێی خوابانۆمان کرد. ئیدی سه‌رانسه‌ری ڕۆژه‌که‌مان تا خۆرئاوا به گۆشت خواردن‌و باده‌خۆری به‌سه‌ر برد. که خۆرئاوا بوو، تاریکی باڵی به‌سه‌ر دنیادا کێشا، هاوڕێکانم هه‌موو چوون له که‌ناری ده‌ریاکه‌و به‌لای کندڕوگوریسه مکومه‌کانی که‌شتییه‌که‌وه خه‌وتن. به‌ڵام کیرکی ده‌ستی منی گرت‌و له شوێنێکی دوور له هاوڕێکانم دامنیشاندم. به خۆیشی له پاڵمدا ڕاکشاو داوای لێکردم به وردی باسی سه‌فه‌ره‌که‌مانی بۆ بگێڕمه‌وه. ئیدی له سیر تا پیازی سه‌فه‌ره‌که‌م بۆ گێڕایه‌وه، هه‌نگێ کیرکی موباره‌ك گوتی:

"زۆر باشه، ئه‌م تاقیکردنه‌وه‌یه‌ت بڕی‌و ته‌واو! جا ئێستا گوێت له من بێ بزانه چیت پێده‌ڵێم. هێڤیدارم یه‌کێك له خواوه‌ندان بیرتی بخاته‌وه. له پێشا ده‌گه‌یته مه‌ڵبه‌ندی سیرینه‌کان، ئه‌مانه دوو ژنی زۆر ده‌نگخۆش‌و شیرین ئاوازن. هه‌ر پیاوێك گوێی له ده‌نگ‌و ئاوازیان بێت دڵبه‌ندیان ده‌بێت.جا ئه‌گه‌ر که‌سێك له نه‌زانسته لێیان نزیك ببێته‌وه‌و گوێی له ده‌نگ‌وئاوازیان بێت، ئه‌فسوون ده‌بێت‌وهه‌رگیز ژن‌و منداڵ‌و که‌سوکاری خۆی نابینێته‌وه‌و بۆ وڵات ناگه‌ڕێته‌وه. ئه‌مانه له سه‌وزارێکی خۆشدا ده‌ژین. ده‌وروبه‌ریان، به درێژایی که‌ناری ده‌ریا هه‌ر ئێسك‌و پروسك‌و ئێسکه‌په‌یکه‌ری مردووانه، که پێستیان به سه‌ر ئێسکیانه‌وه هیشك بووه. جا تۆ له‌سه‌رته زۆر به خێرایی به‌لایاندا تێپه‌ڕیت، وگوێی هاوڕێکانت به مۆمێکی تایبه‌تی بئاخنه، تا گوێیان له هیچ نه‌بێت. به‌ڵام سه‌باره‌ت به خۆت، ئه‌گه‌ر حه‌زده‌که‌ی گوێ بگری قه‌یدی نیه، به مه‌رجێ له‌سه‌ر که‌شتییه‌که، ده‌ست‌و پێیانت توند ببه‌ستنه‌وه‌و به باده‌وه‌و بایه‌وانی که‌شتییه‌که‌ت ببه‌ستنه‌وه، تا بتوانی گوێت له ده‌نگ‌و ئاوازی سیرینه‌کان ببێ‌و له‌زه‌تی لێوه‌ربگری. هه‌روه‌ها هاوڕێکانت تێ بگه‌یه‌نه که ئه‌گه‌ر داوات کرد ده‌ست‌و پێت بکه‌نه‌وه، نه‌ك هه‌ر نه‌یکه‌نه‌وه به‌ڵکو توندتری

ببەستنەوە. کە لە سیرینەکان تێدەپەڕن دوو ڕێگەت دێتە پێش، هەڵبەتە من پێت ناڵێم کە کام ڕێگەیان بگریت، دەبێ بیخەیتە بەر مەزەندەی ئەقڵی خۆت کە کام ڕێگەیان بگری. بەڵام هەردوو ڕێگاکەت پێدەڵێم. لە ڕێگەیەکیانەوە تاوێرە بەردی گەورەی ڕکی دیوارئاسا چووە بە ئاسماندا، شەپۆلانی کێوئاسای ئەمفیتریتی چاوڕەش، سەری خۆیانی پێدا دەکێشن، خواوەندانی پیرۆزو مبارەك بەو تاوێرانە دەڵێن پلانکتای. هێندە بەرزە هیچ تەیرێك ناتوانێ توخنی بکەوێ. تەنانەت ئەو کۆترە ترسناکانەی کە نۆشداڕوش (عەنبەری بەهەشتی) بۆ زیوس دەبەن. ئەم تاوێرە لوس‌و ڕکە هەمیشە یەکێکیان دەگرێت، وخواوەندی گەورە، زیوسی باب، ناچارە یەکێکی دی بنێرێت، تا ژمارەکە تەواو ببێت. تا ئێستا رووی نەداوە کەشتی هیچ بەنی بەشەرێك بەوێندەردا تێپەڕی بێت‌و بە سەلامەتی دەرباز بووبێ. یەکسەر شەپۆلی دەریاو گەردەلوی ئاگرین کەشتی‌و جەنازەی دەریاوانەکانیان ڕاماڵیوەو بردویانە. تاقە کەشتییەك کە گەییوەتە ئەوێندەرو بە سەلامەتی‌و بەبێ وەی تێپەڕیوە کەشتی (ئارگۆ) بووە، کە بەناوبانگترن کەشتی بووە، ولە ڕێگەی دووری (ئایتیس)ەوە هاتووەو بە بەینی هەردوو تاوێڕەکەدا بە سەلامەتی ڕەت بووە، و بووە بە داستانی سەرزاری شایەران‌و پێیاندا هەڵگوتووە. ئەم کەشتییەش بۆیە دەرباز بووە، چونکە هیرا لەبەر خاترو خۆشەویستی جاسۆن فریای کەوتووە، دەنا شەپۆلی دەریا ئەویشی بە تەختە تاوێرەکەدا دەکێشاو داغانی دەکرد. ڕێگەی دووەم دەکەوێتە نێوان دوو تاوێرە شاخی زۆر بەرزەوە، یەکێکیان هێندە بەرزە سەر لە ئاسمان دەسوێ، لوتکەکەی هەمیشە لە چڕە تەم‌و هەوری ڕەشدایە. هەورو تەم لوتکەی ئەو شاخە بەرنادات. لوتکەکەی نە لە هاویندا‌و نە لە پایزدا دەرناکەوێت. هیچ بەنی بەشەرێك، تەنانەت ئەگەر بیست دەست‌و بیست پێشی هەبێت، ناتوانێ پێیدا هەڵگەڕێ‌و بگاتە ترۆپکی. چونکە ڕێك‌وئەستوونی چووە بە ئاسمانداو هێندە لوسە دەڵێی بە ڕەندەیان تاشیووە. لە ناو قەدی ئەو تیشە شاخەدا شکەفتێکی تاریکی تاریك روو لە رۆژئاوا، بە ئالی ئێریبوسدا زاری کردووەتەوە. جا ئەی ئودیسیوسی نێودار، دەبێ کەشتییە گەورەکەت بەو ڕێگەیەدا باژۆی. بەڵام شکەفتەکە زۆر بەرزە،تیری هیچ تیرەندازێکی،چەند بەهێزش بێت ناگاتێ. جاسکیلا لەو ئەشکەوتەدا دەژی، دەنگی هەر لە دەنگی توتەڵە سەگی تازەزاو دەچێت، بەڵام بە خۆی دڕندەیەکی بێ ڕەزایە. نەك بەشەر، بەڵکو خواوەندیش بە دیتنی قەڵس دەبێت. دوانزە پێی ناقۆڵاو نا هەمواری هەیە، شەش گەردنی درێژی هەیە، هەر یەکەیان سەرێکی سامناکی پێوەیە، سێ ریز دانی گەورەی ڕەشی سفتی هەیە. تا نیوەی بەدەنی لە ناو ئەشکەوتە بەرینەکەدایە، سەرەکانی لە زارکی شکەفتەکەوە دێنێتە دەرێ‌و بە هەرچوار نکالی تیشە شاخەکەدا دەڕوانێت، لە دۆلفین‌و سەگلاویان، یا هەر حەیوانێکی دی لەو هەزاران حەیوانانەی ئەمفیتریتی دەیانکات بە توێشوی خۆی، دەگەڕێ تا راویان بکات‌و بیانخوات. تا ئێستا هیچ دەریاوانێك نەیتوانیوە لاڤ ئەوە لێبدات کە بەوێندەرا تێپەڕیوەو بە سەلامەتی دەرچووە. هەر کەشتییەك بەوێدا تێبپەڕێ، نیوەی دەریاوانەکانی لە دەست دەدا، چونکە سکیلا بە هەر سەرێکی دەریاوانێك دەگرێ‌ودەیبات.

ئەی ئودیسیوس، بەچاوی خۆت دەی بینی کە تیشە شاخەکەی دی نزمترە، لە یەکەوە نزیکن، هەر تیرهاوێژێکیان بەینە. دار هەنجیرێکی خۆڕسکی بە لق وپۆی پڕگەڵا، لە سەر ئەم تاوێرەیە. خاریبدوس-ی موبارەك لە بن ئەم تاوێرەدایەو ئاوی رەش هەڵدەمژێ. رۆژی سێ جاران ئاوەکە هەڵدەلوشێت و سێ جاران هەڵیدێنێتەوە. هەوڵبدە لە کاتی هەڵ لوشینی ئاوەکەدا لەوێندەر نەبیت، چونکە لەو کاتەدا هیچ کەسێك، تەنانەت پوسیدونی زەوی هەژێنیش ناتوانێ فریات بکەوێ و لە فەوتانت رزگار بکات. تا دەتوانی زیاتر دەستی تیشە شاخی سکیلا بگرەو بەلەز بە بەردەمیا تێبپەڕە، چونکە زەرەر لە نیوەشی بگەڕێتەوە قازانجە. سوێی شەش کەس لە دەریاوانەکانت بخوێ باشترە تا سوێی هەموویانت بچێتە دڵەوەو لە دەستیان بدەیت.

## ئامۆژگاری کیرکی بۆ ئودیسیوس

کە لە قسەکانی بووەوە،گوتم: "ئەی خوابانو! رێك و راست، بێ پەردە، بێ پێچ وپەنا پێم بڵێ: ئەگەر خۆم و بەختم لە شەڕی خاریبدوس خەلەسیم، ئایا کاتێ ئەوی دی پەلاماری دەریاوانەکانم دەدات، ناتوانم بەگژیا بچم و بەشەڕ خۆ رزگاربکەم؟"

خوابانۆی بەنێوبانگ بەرسڤی دامەوە: "ئەی بەلەنگاز! یانی تۆ هیچ سەودایەکی ترت لەسەردا نیە تەنیا شەڕ نەبێ؟! تۆ تەنانەت مل بۆ خواوەندانیش نادەیت. سکیلا، بەشەری فانی نیە، بەڵایەکی نەمرە. دێوێکە ترسناك، بێرەزا، ولە شکست نایەت. کەس باری نابات، باشترین کار ئەوەیە لێی هەڵێی. خۆ ئەگەر تۆ لە دەوری تاوێرەکەی ئەودا کاتی خۆت بە فیڕۆ بدەیت وچەك و ئەسلەحە لە خۆ بدەیت،دەترسم، وەکو کەڕەتی پێشوو پەلامارت بدات و هەر شەش سەرەکەیت بۆ بنێرێت و خۆت و باقی دەریاوانەکانت بگرێ. بۆیە تا دەتوانی خێراتر بە بەردەمیا تێبپەڕە. هاوار بۆ کراتایس،دایکی سکیلا بکە. چونکە ئەو ئەم بەڵایەی بۆ بەشەران خستووەتەوەو هەر ئەویش دەتوانێ رێگەی لێبگرێت و نایەڵێ بۆ جاری دووەم پەلامارتان بدات.

## ئودیسیوس وپەزەکانی هیلیوس

سەرەنجام دەگەیتە دورگەی تریناکیا. ئەم دورگەیە مەڵبەندولەوەڕگەی ڕان و کاگەلەکانی هیلیوسە. شەش گاگەل وشەش رانە مەڕن، هەر گاڕان و رانێك بریتین لە پەنجا سەر رەشە وڵاخ و پەنجا سەر مەڕ. ئەم چێڵ و پەزانە نە سك و زا دەکەن و نە دەمرن. هەردوو خوابانۆ، فیتوزاو لامپیتی گێسوجوان، شوانی ئەو مێگەلانەن. ئەم پەریانە کیژی هیلیوسی کوڕی هوپیرونن دایکیان نیرایە. یانی کیژی هیلیوسن لە نیرا. دایکی بەڕێزو سەربەرزیان پاش ئەوەی هێنانینە دنیاو پەروەردەی کردن، ناردنی بۆ دوڕگەی تریناکیا، تا لەوێندەر بژین وسەرپەرشتی و ئاگاداری مەڕوماڵاتە جوان و قەڵەوو بە رەونەقەکانی بابیان بکەن. ئەگەر تۆ هیچ ئاسیوێك بەو پەزو ماڵاتە نەگەیەنی و تەنیا بیرت لای ئەوەبێ کە گەڕایتەوە قوربانی گەورە (قوربانی سەدینە) پێشکەش بە خواوەندان بکەی، ئەوا دەگەیتەوە ئیتاکا. هەرچەندە گەڕانەوەکەت ئاسان و بێ رەنج و زەحمەت نابێت. بەڵام ئەگەر تەماحیان تێبکەیت و بە نیازی خراپ دەستیان بۆ بەری، ئەوا پێشبینی ئەوە دەکەم کە کەشتی و دەریاوانەکانت لە دەست دەچن. خۆ ئەگەر بەخۆت لە مەرگ-ش دەرباز ببی،

ئەوا زۆر درەنگبە دەردو مەینەتیەکی یەجگار زۆر، دوای ئەوەی گشت هاوڕێکانت لە دەست دەدەی، ئەوسا بە حاڵێکی بێحاڵ دەگەیتەوە ئیتاکا.

دوای ئەو قسانە سپێدەی زێڕین عەرش بەیانی دا، .خوابانۆی سەرفراز خۆی بە دوڕگەکەدا کردو ڕۆیی. منیش بۆ لای کەشتییەکەم گەڕامەوە. هاوڕێکانم هەستاند تا سواری کەشتییەکە ببن وکندڕوگوریسەکانی بکەنەوە. خێرا سەرکەوتنە سەر کەشتییەکە، هەرکەسە جێی خۆی گرت، و لەسەر سەوڵی خۆی دانیشت.هەنگێ کەوتنە سەوڵ لێدان. لەو دیوی کەشتییەکەمانەوە، هاو سەفەرێکی باش، بایەکی سازگارولەبار، کە کیرکی کەزیە جوان، ئەو خوابانوە سامناکەی کە بە زمانی بەشەران داخافت، ناردبووی، هەڵیکردو بادەوانەکانی پف دەدایـن. دوای ئەوەی هەموو شتێکمان ئامادەکردو سازو تەیار لەسەر کەشتییە بۆر دانیشتین ئیدی کەشتییە بۆرمان بە بایەکەوسەوڵەوانەکان سپاردو بە ناوجەرگەی دەریادا بەڕێکەوتین.

## ئودیسیوس هاوڕێکانی لە مەترسیان ئاگادار دەکاتەوە

ئەوسا بە دڵێکی خەمینەوە بە هاوڕێکانم گوت: برادەرینە! بۆ ئەوەی هەر هەمووتان ئاگاداری پێشبینییەکانی کیرکی، خوابانۆی ناوداری نێو خوابانوان بن، حەزدەکەم هەموو ئەو پێشبینیانەتان بۆ بگێڕمەوە کە بۆ منی باس کردووە. بۆ ئەوەی بزانین چ شتێك فەوتو فەنامان دەکات،وچ شتێك دەکارێت لە مردنو فەوتانمان رزگار بکات. یەکەم شت داوای ئەوەمان لێدەکات خۆمان لە سیرینە ئەفسوونکارەکانو دەنگوئاوازو سەوزەزارە پڕگوڵو گوڵوکەکانیان بپارێزین. تەنیا من بۆم هەیە گوێ لە دەنگو ئاوازیان بگرم، ئەویش بە مەرجێ دەستولاقانمان توند ببەستنەوەو بە ساریەکەوەم ببەستن. وچەندم هاوار کردو لێتان پاڕامەوە دەستولاقم بکەنەوە، نەك هەر مەیکەنەوە بەڵکو توندتری بکەن.

## ئودیسیوس دەگاتە دوڕگەی سیرنەکان

بەو جۆرە بەر لەوەی بگەینە دوڕگەی سیرینەکان، هەموو شتێکم بۆ هاوڕێکانم گێڕایەوە، لە هەموو شتێکم ئاگادارکردن. ئیدی کەشتییە بۆر، چونکە بایەکی سازگارولەبار، بێ هیچ کۆسپو زەحمەتێك دەپێشی دەدا، زوو گەییە دوڕگەی سیرینەکان. ئەوسا بایەکەی خست، کپیوئارامی باڵی بەسەراکێشاین، یەکێك لە خواوەندەکان، شەپۆلەکانی هێورکردەوە. هاوڕێکانم بادەوانەکانیان پێچایەوە،ولە ناو کەشتییەکەیان دانا، وهەر کەسەو چووە سەر سەوڵی خۆی. بە سەوڵی دارکاژی سیقالدراو کەفیان لە پیرە دەریا هەستاند. هەستام، بە شمشێرە تیژەکەم پارچە مۆمێکم بڕی، کردم بە چەند پارچەیەکی بچووکەوە، بە دەستە بەهێزەکانم هەڵم شێلا، دوای ماوەیەکی کەم مۆمەکە لە ژێر گوشاری دەستمولەبەر تیشکی هیلیوسی (هەتاو) خواوەندی کوڕی هوپیروندا خۆشەونەرم بووەوە. ئەوسا گوێی یەکە بە یەکەی هاوڕێکانم پێ ئاخنی. ئەوانیش بە کۆمەڵ،دەستولاقیان لەسەر کەشتییەکە بەستموچوومە ژێر ساریەکەو رەق راوەستام، وتوند بە ساریەکەوە بەستیانم. ئەوسا لە جێی خۆ دانیشتنوکەوتنە سەوڵ لێدانو بە شڵپو هۆڕ بەنێو پیرە دەریادا کەوتینە رێ. کە گەییشتینە نزیکی دووڕگەکەو هەر بە ئەندازەی بانگرەسێکمان مابوو بیگەینێ، گوڕوتینمان دایەخۆ.دەمانویست زوو تێپەڕینو سیرینەکان نەمان بینن، بەڵام کە

کەشتییەکە بە خێرایی بە نێو شەپۆلاندا دەڕۆیی، سیرینەکان دیتیان، چونکە زۆر لەوانەوە نزیك بوو،ئیدی ئەو جووتە ژنە بە دوو قوڵی هەڵیانکردە سترانێکی یەجگار خۆش‌ودڵگیر:

"دەیسا ئەی ئودیسیوسی ناودار، ئەی مایەی ڕێزوسەرفرازی‌و شکۆی ئاخیایان، روو لێرە بکە، کەشتییەکەت ڕاگرە، تا گوێ لە دەنگ‌و ئاوازی خۆشی ئێمە بگریت. تا ئێستا رووی نەداوە هیچ کەسێك بە کەشتی بێرەدا ڕەت بووبێ ودڵبەندی دەنگ‌و ئاوازی ئێمە نەبووبێ؟ هەرکەسێك گوێی لە دەنگ‌و ئاوازی ئێمە بێ، نەك هەر بە دڵی خۆشەوە درێژە بە ڕێگای خۆی دەدات، بەڵکو شارەزاتریش دەبێت.چونکە ئێمە ئاگامان لە هەر هەموو ئەو بەسەرهات‌ودەردو مەینەتیانە هەیە کە بە خواستی خوداوەندان، لە خاکی بەرینی تەروادەدا، بەسەر ئارگۆسیان‌و تەروادەییاندا هاتووە،وەهەروەها هەموو ئەو شتانەش دەزانین کە لەمەو دوا لە دنیادا ڕوودەدەن.

کە ئەو قسانەیان بە دەنگە نەرم‌وناسکەکەیان چڕی، زۆر تامەزرۆوتاسەمەندی دەنگیان بووم، بە ئیشارەی برۆو گۆشەی چاو داوام لە هاوڕێکانم کرد کە دەست‌ولاقانم بکەنەوە. بەڵام ئەوان بە قسەمان نەکردم، زیاتر کەوتنە سەولْ لێدان‌وپیریمیدس‌و ئوریلیوشوس بە پەلە هەستان‌وحەبل‌و کندرەکانیان پتر لە دەست‌و لاقانم توند کرد. دوای ئەوەی لە قەڵەمڕەوی سیرینەکان ڕەت بووین، ودوورکەوتینەوەو دەنگ‌و ئاوازیان نەدەگەییە ئێمە، هاوڕێ ئەمەکدارەکانم هەستان، مۆمە تواوەکەیان لە گوێی خۆ دەرهێناو لاق‌و دەستی منیشیان کردەوە.

هەرکە لە دوڕگەکە تێپەڕین، یەکسەر شەپۆلێکی زەلامم بینی کە تەمی لێ هەڵدەستا،وگوێم لە هەراو هەنگامەیەکی ترسناك بوو. دەریاوانەکانم بە ئەندازەیەك ترسان کە سەوڵەکان لە دەستیان بەربوون‌و شڵپە لە دەریاکە هەستا. کەشتییەکە لە جێی خۆی وەستا، چونکە دەستیان سەوڵە نوك تیژەکانی نە دەگرت. من کەوتمە گەڕان بەسەر هاوڕێکانمدا، لەم سەری کەشتییەکەوە بۆ ئەوسەری دەڕۆییشتم‌و لە ئاستی هەر یەکێکیاندا دەوەستام‌و بە قسەی خۆش‌و نەرم ورەم بەرزدەکردنەوەو پێم دەگوتن:

"براینۆ، ئێمە خەڵکانێك نین ساردی‌وگەرمی ڕۆژگارمان نەچەشتبێ. لە خەتەرو مەترسیاندا قاڵ نەبووبینەوە، ئەم خەتەرو مەترسیەی کە ئێستا ڕووبەڕووی بووینەتەوە، هەرگیز لەوەی ئەو ڕۆژگارە خەتەرترو ترسناکتر نیە کە سیکلۆپەکە، لە شکەفتە بەرینەکەی خۆیدا بەگیری هێنابووین‌وبە تۆبزی لە ئەشکەوتەکەی خۆی پەستاوتبووینی‌و گابەردەکەی بەزارکیەوە نابوو. بەڵام بەهۆی دلاوەری من‌ودووربینی‌و چارەسازی‌وبەردەباری‌و زیرەکیمەوە لەو تەنگانەو دژواریە ڕزگار بووین. پێموایە هەمووتان ئەوەتان لە یادە. جا براینۆ بەری تەنگانە کورتە، ئەم مەترسیەش تەواو دەبێت‌و ڕۆژێ لە ڕۆژان وەکو یادگاری یادی دەکەینەوە. جا ئێستا گوێتان لە من بێ، ورە بەرمەدەن. با هەموو لە زیوس بپاڕێینەوەو نوێژی بۆ بکەین. هەرکەس بچێتە سەر سەوڵی خۆی‌و لە شوێنی خۆی دابنیشێت. دەریا بەر سەولاْن بدەن، تا دەتوانن سەوڵەکانتان بەرنە قولاْیی، با بزانین بەڵکو زیوس بەزەیی پێماندا بێتەوەو لەم مەترسی‌و مەرگەمان ڕزگار بکات. تۆش ئەی کەشتیوان، تۆش گوێ بگرە، ئەم قسەیەم بکە بە ئاڵقەو لە گوێی بکە، سوکان‌و ئاراستەی کەشتییە بۆر بە دەستی تۆیە، کەشتییەکە لەم مژولەم‌وگێژەنگ‌و گەرداوە دوور بخەوە،

دەستی تاوێرەکەی دی بگرە، ئاگادار بە نەوەك، بەبێ ئەوەی بزانی کەشتییەکە لە خەتی خۆی دەربچێت و خۆی بەو تاوێرەدا بکێشی وهەمووومان تیابچین.
چۆنم پێگوتن وایان کرد. کەس لە فەرمانم دەرنەچوو، بەڵام باسی سکیلام نەکرد. چونکە لەگێن بوو هاوڕێکانم بترسن و دەستبەرداری سەوڵ لێدان بن و خۆیان لە نێو کەشتییە بۆردا وەشێرن. بەڵام ئەوی راستی بێ من ئامۆژگاری و رێنوێنییە بنجبڕەکانی (کیرکی)م، کە داوای لێکرد بووم بە هیچ جۆرێ پەنا بۆ چەك نەبەم، پشت گوێ خست. جۆشەن و زرێکەم پۆشی ودوو نێزەی درێژم بە دەستەوە گرت، وچووم لە پێشی پێشەوەی کەشتییەکە راوەستام، وام وێنا دەکرد ئەگەر ئەم سکیلایە لە تاوێرەکەوە پەلاماری هاوڕێکانم بدات، دەی بینم. بەڵام لە هیچ شوێنێك نەمبینی، چاوەکانم ماندووبوون هێندە بڕوانمە تاوێرە مژ گرتووەکە.
بە دەم ترس وگریانەوە راست خۆمان بەو تەنگەیەدا کرد. سکیلا لە بەرێکیدا ئاکنجی بوو، و خاریبدوس–ش لە بەرەکەی تریا،بە هەراوهوریایەکی ترسناك ئاوی سوێری دەریا هەڵدەلوشێ. کە ئاوەکە هەڵدێنێتەوە، سەراپای دەریاکە دەخرۆشێت، وەکو چۆن مەنجەڵێك نرابێتە سەر ئاگرێکی گەورەو بکوڵێ، قوڵپی بگاتە ئاسمان، بەو ئاوایە قوڵپی ئاوی سوێری دەریا دەگەییە حەلحەلەی ئاسمان ولەوێندەرەوە بەسەر لوتکەی هەردوو تاوێرەکەدا دادەبارییەوە. هەرجارێ کە خۆی وەژێر ئاوی سوێری دەریادا دەکردەوەو ئاوەکەی هەڵدەلوشی، لەبنکی دەریادا دەبینراو تاوێرەکەی دەوری دەنگێکی ترسناکی لێهەڵدەستا. زەوییەکی لمەڵانی خیزەڵانی رەش دەردەکەوت، هاوڕێکانم هەترەشیان دەچوو، بە جارێ زیڕەیان دەکردو لەترسا رەنگیان لە رووا نەدەما. لەو کاتەدا کە ئێمە بە ترس و لەرزەوە تەمەشای (خاریبدوس)مان دەکردو دەستمان لە ژیان شت بوو، وپێشبینی مەرگی خۆمان دەکرد، رێك لەو ساتەدا، سکیلا پەلاماری داین وشەش کەسی هەرە ئازای لە هاوڕێکانم برد بە ئاسمانا،کە تەمەشای کەشتییەکەو هاوڕێکانم کرد، سەیرم کرد بە حەواوە لە قەفرتێیانەو نیگەران و خەمبار، پڕ بە زار هاواریان دەکرد، وبۆ دواجار ناویان دێنام: ئودیسیوس هاوار، منیش دەستم بە یەکدا دەداو هیچم لە دەست نەدەهات. وەکو چۆن کەسێکی ماسیگر، لە بەرزاییەك دادەنیشت و چەشە بەسەری قولاپەکەیەوە دەکات و ئەوسا شاخە گایەکی ناو بۆشی لێدەبەستێت و توڕی دەداتە دەریاوە، هەنگێ کە ماسیەکی پێوە دەبێت، رایدەکێشێت و بەدەم ئازارەوە هەڵدەپلێ، بەو ئاوایە سکیلا هاوڕێکانی ڕاو کردم. بە دەم لەقەفرتێوە بۆ سەر تاوێرەکانی راکێشان،و لەبەر زارکی شکەفتەکەیدا دانی بە ئەرزاو، یەك یەك قووتی دەدان و بە دەم ئازاری مەرگەوە، هاواری جەرگبڕیان دەکردو نائومێدانە دەستیان بۆ من رادەکێشا. ئەمە ترسناکترین دیمەن بوو، کە لە سەرانسەری سەفەری ناچاری و پڕ ریسکی ناو گێژەنگ وزریانی دەریادا،دیتبووم.

## ئودیسیوس و دوڕگەی پەزانی قەدەخە

دوای ئەوەی لە تیشە شاخەکان ولە خاریبدوسی ترسناك وسکیلا دەرباز بووین، گەییشتینە دوڕگە جوانەکەی خواوەندی هەتاو. ئەم دوڕگەیە تایبەت بوو بە چێڵە جوان و تەوێڵ پانەکان و رانە زۆرو زەبەندو پەزە قەڵەوەکانی هیلیوس هوپیریون. هێشتا لە دەریادا بووین، لەسەر

کەشتییە بۆر دانیشتبووم،کە گوێم لە بۆڕەی ڕەشە وڵاخەکانو باڕەی پەزەکان بوو، لەوە دەچوو بۆ ناو ئاغەڵەکانیان بگەڕێنەوە. یەکسەر پێشبینییەکانی تریسیاسی تیبەیی، فاڵبینی نابینام بیر کەوتنەوە. هەروەها قسەو ئامۆژگارییەکانی کیرکی ئیایایم بیرکەوتنەوە، کە ئاگاداریان کردبوومەوە خۆ لە دوڕگەی هیلیوس، کە دوڕگەیەکی ئەفسووناوی بەشەرخەڵەتێنە، دوور بگرمو توخنی نەکەوم. ئیدی بەدڵوەدەروونێکی خەمین ونیگەرانەوە بەسەر هاوڕێکانمدا گەڕامو پێم گوتن:

"یاران، من دەزانم زۆر خەمبارومەینەتبارن، بەڵام چارنییە، گوێبگرن، با پێشبینییەکانی تیریسیاسو ئامۆژگارییەکانی کیرکی خەڵکی خەڵکی (ئیایا)تان پێبڵێم، ڕێكو ڕاست رایان سپاردبووم کە خۆ لە دوڕگەی بەشەر خەڵەتێنی هیلیوس نەدەم. چونکە لەوێ تووشی کارەساتی زۆر گەورەو ترسناك دەبین. بۆیە کەشتییە بۆر بۆ ئەوێندەر لێمەخوڕن. خێرا سەوڵ لێدەنو لەوێندەر لا مەدەن.

قسەکانی منیان لەبەر گران بوو، ئوریلوشوس، یەکسەر هەستاو بە توڕەیی گوتی:

"ئەی ئودیسیوس،تۆ پیاوێکی دڵڕەقی! هێزو توانای تۆ جیایە لە هی هاوڕێکانت، دەستولاقی تۆ لە ماندوو بوون نایەن،دەڵێی لە ئاسن دروست بوویت، بۆ خۆت ماندوونیت، کەچی، بە هاوڕێکانتی ڕەوا نابینی، کە لە شەکەتیوهیلاکیو بێخەویدا خۆ بە پێوە ناگرن. لەم دوڕگەیەدا، کە هەرچوارنکالی دەریایە، لابدەن،وبۆ خۆمان شیوێکی پوختەو بەلەزەت دروست بکەینو ئاهێکمان تێبگەڕێ، بەڵکو ئەمرمان پێدەکەیت کە بەم درەنگ وەختە هەر بڕۆینو لەم دوڕگەیە دوور بکەوینەوەو لە نێو تەمومژو شەپۆلی دەریادا وێڵو سەرگەردان ببینو شەومان بەسەردا بێت. ئاخر شەو خەتەرە، سەرچاوەی گژەباوگێژەلۆکەو زریانی کەشتی شکێنە. ئاخر ئەگەر لە پڕ بای باشور، یان بای ڕۆژئاوا هەڵیکرد، کە هیچ کەشتییەك خۆی لە بەریان ناگرێت، چۆن خۆمان رزگار بکەین. پیاوی چاك بە ئەمجارە وازمان لێبێنە با خۆ بە شەوی تاریك بسپێرینو لەپاڵ کەشتییە بۆردا دانیشینوشیوێك ئامادە بکەینوبیخۆین. سبەی بەیانی سواری کەشتییە بۆر دەبینو بەناو دەریای بەرین دەکەوینوبڕۆ.

یوریلوشوس ئەو قسانەی کردو هاوڕێکانی دیکەشم بۆیان سەلماند. هەنگێ دڵنیا بووم کە دەبێ خواوەندێك داوێکی بۆ نابینەوەو بەڵایەکمان بەسەرا بێت. بۆیە بە دەنگی بەرز گوتم:

"ئەی یوریلوشوس، با قسەی ئێوە بێ، چبکەم، چارم نیە، ئێوە زۆرنومن بە تەنیام. بەڵام مادامێکی وای لێهات، وەرن سوێندی گەورە بخۆنو شەرتم دەگەڵ بکەن بە شەرتی پیاوان کە ئەگەر بە ڕێکەوت گاران یان مێگەلە پەزمان بینی، کەس خۆی بێ ئەقڵ نەکات بچێت چێڵێك یان پەزێك بکوژێتەوە. دوای نەوس مەکەونو لەو توێشووە بخۆن کە کیرکی جاویدان بۆی پێچاوینەتەوە.

## هاوڕێکانی ئودیسیوس سوێندی بۆ دەخۆن

کە لە قسەکەم بوومەوە، هەموو سوێندیان بۆ خواردم کە بە گوێم بکەنو قسەم نەشکێننو توخنی پەزو چێڵە موبارەكو جاویدانەکان نەکەون. دوای سوێند خواردن، کەشتییە روختەکەمان

لـە بەنـدەرێکی نزیکـی کانیـاوێکی سـازگاری شـیریندا ڕاگـرتو لەنگـەرمان گـرت. هاوڕێکـانم دابەزینودەمو دەست شیویان ئامادەکرد. پـاش ئـەوەی تێروپڕیـان خـواردو خـواردەوە، هـەنگێ هاوڕێکانیـان بیرکەوتـەوە کـە چۆن سکیلاکە لـە نێـو کەشـتییەکەوە هـەڵیگرتنو خـواردنی، ئیـدی کەوتنە شینوگریانێکی ئەوتۆ کە بەردی دەتواندەوە. تا خەو بەلایا بردنییەوە هەر گریاون.

سێ بەتڵی شەو بوری بوو وستێران بەرەو ئاوابوون دادەکشان، کـە زیوسـی هـەورەوان، هـەڵیکردە زریـانو گێژەلۆکەیـەکی ئـەوتۆ هەرمەپرسە. زەویودەریـای لـە هـەورو هـەڵادا نقـوم کـرد، شـەو لـە ئاسمانەوە بەسەر دنیادا دادەڕژا.

پاش ئـەوەی سپێدە بـە قامکانی گوڵئاساوە بەیانی دا، کەشتییەکەمان ڕاکێشایە لاوەو لەبەر ئەشـکەوتێکا، کـە جێگـەی کۆبوونـەوەو رەقسوسـترانی پـەریانی دەریـایی بـوو، بەسـتەوە، هاوڕێکانم کۆکردنەوەو پێمگوتن:

"براینۆ، کەشتییە تیژڕۆکەمان، خۆراکوخواردنـەوەی تیایـە، جا بۆ ئـەوەی تووشـی هـیچ بـەڵاو نەهامەتیـەك نەیـەین، نـابێ دەسـت بـۆ ئـەو مەڕوماڵاتـە بـەرین. چـونکە هـی هیلیوسـن، هیلیـوس خواوەندێکی زۆر بەزەبروسەختیگرە، هەموو شتێك دەبینێوهەموو شتێك دەبیستێ."

هەموو بەڵێنیان دامێ کە بە گوێم دەکەنوفەرمانم لـە عاردی نادەن. یـەك دانـە هـەیڤی تـەواو، هـەر گـژەباو بـای باشـور بـوو. جگـە لـە بـای باشـوورو بـای رۆژهـەڵات هـیچ بایـەکی دی نـەدەهات. هاوڕێکانم تا ئەو کاتەی خۆراکوبادەی ئاڵیان هەبوو، لەسەر شەرتی خۆ مانـەوەو نەچوون بـەلای ماڵاتو پەزانەوە،.چونکە لە خەمی ئەوەدابوون گیانی خۆ رزگاربکـەنو تیا نەچن. بـەڵام کـە هـیچ خۆراکوتوێشوو ئازووقەیەك لە کەشتییە بۆردا نـەما، ناچار کەوتنـە گـەڕان بـە دوای ڕاووشکارا، ماسی، تەیروتو، وهەرچیەکیان بەردەست کەوتبا، بە داووقولاپ ڕاویان دەکرد. چونکە برسێتی زۆری بۆ هێنابوون. رۆژێ بە تەنێ بەناو دوڕگەکە کەوتم، تا لـە پەنایەکـەوە بکەومـە نوێـژو نـزا بـۆ خواوەندان، بەڵکو یەکێکیان بێتە فریاموەدەرویەکم لێ ڤەبێو رێگەی گەڕانەوەم پـێ نیشـان بـدات. ورده ورده لە هاوڕێکانم دوورکەوتمەوە. لە شوێنێکی پەنا بادا دەستم شت،وکەوتمە نوێـژو نـزاو پاڕانـەوە لـە هـەموو خواوەنـدانی ئۆڵەمپنشـین. ئیـدی بـەدەم نوێـژونزاوە خواوەنـدان خـەوێکی خۆشیان لێخستم.لەو بەینەدا یوریلوشوس، چوو بووە بنکڵێشـەی هاوڕێکانیـەوەو لـە خشـتەی بردبوون: "کوڕینە، دەزانم حاڵتان چ حاڵە، نامەوێ دەردتان زیاد بکـەم، بـەڵام گـوێبگرن، بـزانن چ دەڵێم. هەموو جۆرە مردنێك بەلای بەشـەرەوە ناخۆشـە، بـەڵام ناخۆشترین مـردن، ئەوەیـە پیـاو لـە برسا بمرێت. ئەگـەر بـە گـوێی مـن دەکـەن، وەرن بـا گـەورەترین گـای هیلیـوس بدەینـە پـێشو بـۆ خواوەندانی ئوڵـەمپ نشـینی بکـەین بـە نـەزروقوربانی. ئەگـەر نـەردی بـەخت وای هـانی بگەینـەوە ئیتاکـای خـاکی بابوباپیرانمـان، ئـەوا یەکسـەر پەرسـتگەیەکی یـەجگار بەشـکۆ بـۆ هیلیـوس هۆپیریـون دروسـتدەکەینو پـڕی دەکـەین لـە پەیکـەرو دیـاری گرانبـەهاوجوان. خـۆ ئەگـەر ئـەم خواوەندەش لەسەر چێڵکە شاخ درێژو تیر ئاساکەی، لێمان چوو بـە قینـاو لێبڕا بـە رەزامەنـدی خواوەنـدەکانی دی، غـەوری غـەزەبمان بکاتوکەشـتییەکەمان نقـوم بکـات، ئـەوا مـردن مردنـەو

لەقەفرتێی ناویێ، من پێم خۆشە یەك كەڕەت شەپۆلی دەریا قووتم بدات وبیڕێتەوە، نەك بەدەم ئازاری برسێتییەوە، لە دورگەیەكی چۆڵ وهۆڵدا، بەرە بەرە كەسیرە ببم وئەوسا بمرم".
یوریلوشوس بەو قسانە ئەوانی دیكەشی هێنایە رەدا. دەستبەجێ باشترین وجوانترین چێڵی (هیلیوس)یان،كە زۆر لێیانەوە نزیك بوو دایە پێش. چونكە گاڕانەكە لە نزیكی كەشتییەكە دەلەوەڕا،جا چێڵ وگای جوان و قەڵەو، تەوێڵ پان و قۆچ درێژ. دەوری چێڵەكەیان دا، چونكە جۆ سپییان پێ نەما بوو، گەڵای ئاسكیان لە دار بەڕوویەكی زەلام بۆ كردەوەو دەرخواردیان دا. بە دەوریا كەوتنە نوێژونزا بۆ خواوەندان، كە لە نوێژو پاڕانەوە بوونەوە، ئەو حەیوانە بەستەزمانانەیان سەر بڕی وكەوڵ كرد. ئێسكی رانەكانیان بڕی، لە دوو لاوە دووچین چەورییان لەسەر نا، ئەوسا گۆشتی تازەی خاویان خستە سەرو لە سەر ئاگریان نا. چونكە بادەیان پێ نەما بوو،وەكو عادەتی قوربانی كردن، گۆشتەكە بادە بڕژێن بكەن، ئاوپرژێنیان كرد. هەموو جەرگ و ناوەكەیان برژاند. دوای ئەوەی رانەكان برژان و ئەوان جەرگ و ناوەكەیان خوارد، گۆشتەكەی تریان جنی ولە شیشیان دا، لە پڕ خەبەرم بووەوە. بە هەشتاو بەرەو كەشتییەكە گەڕامەوە كە لە كەشتی وكەنارەكە نزیك بوومەوە، بۆنی گۆشتی برژاوم بەسەردا هات. یەكسەر هاوارم كرد، لە هۆڕژنی گریانم دا، بەدەم گریانەوە كەوتمە پاڕانەوە لە خواوەندان: "زیوسا! ئەی بابە زیوس، ئەی خواوەندانی موبارەكی نەمر، ئەی ئەوانەی لە نیعمەتی ئەبدیەت و هەرمانیدا دەژین. ئەم خەوە چی بوو بەسەر منتاندا دا! ئەمە چ نەگبەتی و بەڵایەكی گەورە بوو لە منتان بار كرد. تەمەشا، هاوڕێكانم بەبێ من، لە دووری من چ كارێكی دڕندانەو دزێویان كردووە".

## خواوەندی هەتاو رقی خۆی بە ئودیسیوس دەڕێژێ

هەنگێ لامپتی بەخۆو سەرپۆشە درێژەكەیەوە، بە هەشتاو خۆی گەیاندە هیلیوس هوپیریون و خەبەری دایێ كە ئێمە چێڵەكانیمان كوشتوتەوە. هیلیوس، تورە دەبێت. خۆی دەگەیەنێتە كۆڕو ئەنجومەنی خواوەندان وپێیان دەڵێت:

"ئەی بابە زیوس، ئێوە ئەی خواوەندانی نەمرو جاویدان، هاوڕێكانی ئودیسیوسی كوڕی لایرتیس، سوكایەتیان پێكردووم، گایەكانیان كوشتووم. من تۆڵەی كوشتاری گایەكانم لە ئێوە دەویێ. دەبێ تۆڵەم لە هاوڕێكانی ئودیسیوس بسەنن. زۆر گۆساخانە ئەو گیانلەبەرانەیان كوشتووەتەوە كە مایەی شادی وخۆشی من بوون چ لەو كاتانەدا كە بەرەو ئاسمانی پڕ ستێران هاتووم و چ لەو كاتانەدا بۆ سەر زەوی گەڕاومەتەوە. ئەگەر تۆڵەیەكی بەجێ وپەسند لەو خۆ سەرانە نەسەننەوەو نەكرێن بە عیبرەت وپەند، ئەوا دەچم بۆ هادیس و لەوێندەرو لە نێو مردووواندا هەڵدێم.

## زیوس هەڕەشە دەكات...

هەنگێ زیوسی هەورەوان، وەڵامی دایەوەوگوتی: "ئەی هیلیوس، دڵ لە دڵ مەدە، بەردەوام بە لەسەر كاری خۆت. بەسەر خواوەندان، وبەشەرانی فانی سەر زەوی، سەرچاوەی بژێوی و ژیاندا، هەڵبێ.سەبارەت بەو پیاوانەش، بە زووترین كات بروسكەو هەورە تریشقەیەكیان بۆ نازڵ دەكەم،

خۆیان و کەشتییە تیژڕەوەکەیان لە ناوجەرگەی دەریای مەی ئاسادا، پارچە پارچەوتەفرو تونا دەکەمو بە ئاسمانیاندا دەبەم."

من ئەمەم، دوایی لە زمانی کالیپسوی کەزی شۆڕەوە ژنەوت. کالیپسو دەیگوت، کە هیرمیسی تەتەرو پەیاماوەر ئەو قسانەی پێ گوتبوو.

کە گەییشتمەوە ناوکەشتییە تیژڕەوەکەودەریا، کەوتمە سەرزەنشتی یەك بە یەکی هاوڕێکانم. بەڵام بێهودە، کار لە کار ترازابوو. چونکە گایەکان کوژرابوونەوە. ئیدی خواوەندان کەوتنە نواندنو نیشاندانی پەرجۆوموجیزات. پێستی گایەکان جوڵەیان تێکەوتو ڕێیان دەکرد. گۆشتەکان، چ برژاو وچ خاو بە شیشەکانەوە دەیان بۆڕاند، وەکو گاوگۆلی زندوو دەیان بۆڕاند.

بەو جۆرە هاوڕێ دڵسۆزەکانم بە درێژایی شەش دانە ڕۆژ، خۆیان لە گۆشت مرکرد. باشترین گاوگۆلی (هیلیوس)یان دزی بوو. بەڵام کاتێ زیوسی کوڕی کرونوس، ڕۆژی حەوتەمی ئاشکرا کرد، زریان وگەرداوەکە نیشتەوە. بە پەلەو دوای ئەوەی ساریەکەمان لە جێی خۆی چەقاندو بادەوانی سپیمان هەڵکرد، وکەشتییە بۆرمان بەناو دەریای بەرین خستوباژۆ. هەرکە لە دوڕگەکە دوورکەوتینەوە، ئیدی هیچ وشکاییەکی ترمان لێ دیار نەما. هەتا چاو هەتەردەکات هەر ئاسمانو دەریا بوو. هەنگێ کوڕەکەی کرونوس هەورێکی ڕەش وتاریکی هێناو ڕێك لەسەر کەشتییەکە رایگرت. دەریاکە نقومی تاریکییەکی خەست بوو. کەشتییەکە بەرە بەرە لە جوڵە کەوت، نەیتوانی یەك بست بچێتە پێشێ. چونکە بای ڕۆژئاوا، بە گڤ وهوڕ خۆی پێدا داین و میناکی گێژەلۆکەیەکی بەترەف کەوتە خولانەوە بە دەوری خۆیدا. هێندە بە قوەت بوو، هەموو دەعامیەکانی ساریەکەی پێشەوەی شکاند. ساریەکەش بە پشتا کەوتو هەموو پارچەکانی بە نێو کەشتییەکەدا بلاوبووەوە. ساریەکە کەوت بەسەر سەری کاپتنی کەشتییەکەداو کاسەی سەری وردو خاش کرد. وەکو چۆن مەلەوانێکی زەبەردەست خۆی هەڵدەداتە ئاوەوە، بەو ئاوایە لە کەشتییەکەوە کەوتە ئاوەکەوەوگیانی پیرۆزی دەرچوو. ئەوسا زیوس گرماندی و بروسکەیەکی لە کەشتییەکە دا. کەشتییەکە بە دەوری خۆیدا سوڕایەوەو لە دوکەڵێکی خەستدا نقوم بوو. وهاوڕێکانم لە کەشتییەکە بەربوونەوەو شەپۆلی دەریا وەکو نەورەسانی دەریایی، بە دەوری کەشتییەکەدا ڕایماڵین وبردنی، وخواوەند لە لەزەتی گەڕانەوە بۆ وڵات، بێبەش و مەحرومی کردن. من بەسەر کەشتییەکەوە دەهاتم ودەچووم، لە پڕ گەرداوێك لە دەریاکەوە هەستاو بۆدێ کەشتییەکەی تەفروتونا کرد، تەنیا داربەستەکەی ژێری مابوو، شەپۆل وگەرداو بە ئارەزووی خۆی دەیبرد. ساریەکەی لە بنەوە دەرهێنا. دای بە قەراخی کەشتییەکەداو وردو خاشی کرد. بەڵام قایشی بادەوانەکان هەر بە ساریەکەوە مابوو، ئیدی بەو قایشە دوو تەختەم بە یەکەوە بەستو لەسەری دانیشتمو گژەبا بردمی.

لە پڕ گژەباکەی خست، بای ڕۆژاوا نیشتەوە. بەڵام لە هەمان کاتدا بای باشوورهەڵیکرد. زۆرم لە دڵ گران بوو.دەبوایە جارێکی دی بە گێژەنگ وگێژاوی گیانکێشی خاریبدوسدا تێبپەڕم. بە درێژایی شەوەکە زریان وبا بردمی. لەگەڵ گزنگی هەتاودا گەییمە تیشە شاخی سکیلاو گێژاوو گێژەنگی ترسناکی خاریبدوس. بەوەی باش بوو خاریبدوس لەو کاتەدا ئاوی دەریاکەی

هەڵلوشی،ومن تا هێزم تیا بوو، خۆم بۆ سەرێ هەڵداو، وەکو شەڤشەڤۆك خۆم بە دار هەنجیرە بەرزەکەوە هەڵواسی. بەڵام هیچ دەرفەتێکم نەبوو، لاقم لە شوێنێك گیربکەمو پێم بگەیەنمە عاردی، یان بە درەختەکەدا هەڵزنێمو سەربکەومە سەرەوە. چونکە بنوریشەی دارەکە زۆر لە خوار بوو ونەی دەگەییشتمێ، و لقوپۆکەشی زۆر بەرزو ئەستور بوو، ولە دەسرەسی مندا نەبوو، ورێك بەسەر سەری خاریبدوسەوە بوو. بەو دەقەوە بە هەڵواسراوی بە دار هەنجیرەکەوە مامەوە تا لە پڕێکا گەرداوەکە دوو پارچە تەختەکەی هەڵدایەوە سەرێ، وکە چاوم پێیکەوت زۆر خۆشحاڵ بووم. وەکو چۆن قازییەك ماوەیەکی زۆر بە سکاڵاو داوای دادخوازاندا ڕادەگاتو ماندوو دەبێت،دەست لە کار بەردەداتو بۆ نانخواردن دەڕوات، منیش بەو ئاوایە کە کەڵەکە گۆڕینی خۆم بینی لە گێژەنگی خاریبدوسەوە وەدەرکەوت، دەستولاقم لە دارهەنجیرەکە بەرداو شڵپ بۆ ناو تەنگەکەو لە نزیکی داربەستەکە (تەختەکە) کەوتمەوەو بە هەشتاو خۆم گەیاندێو لە سەری دانیشتمو دەستەکانم کردن بەسەوڵوکەوتمە سەوڵ لێدانو بڕۆ. گیانم بەوە بوو، بابی خواوەندانو بەشەران، زیوس فریام کەوتو نەیهێشت سکیلا بمدێنێ، دەنا نەجاتم نەدەبوو لە دەستی.

## گەڕانەوەی ئودیسیوس بۆ لای کالیپسو

ئیدی نۆ دانە رۆژی تەواو، من بەسەر دەریاوە بوومو شەپۆلان دەیان بردم. شەوی دەیەم خواوەندان گەیاندمیانە نزیکی دوڕگەی ئوجیجیا. ئەم دوڕگەیە مەڵبەندو قەڵەمڕەوی کالیپسوی گێسو جوان بوو. ئەم خوابانۆ بەسامە زمانی بەشەرانی دەزانی. پەزێڕاییەکی گەرمی لێکردم. پەرستاریو تیماری کردم. دلۆڤانیەکی فرەی دەرهەق کردم. پێویست ناکا لەوەی پتر بە تانیا بچم، چونکە دوێنێ، لەماڵەکەی خۆتدا، ئەم چیرۆکەم بۆ خۆتو هاوسەرە شیرپاکەکەت گێڕایەوە. حەزناکەم هەمان چیرۆك دووبارە بکەمەوە."

***

**پەراوێز:**

*- سیرینان: ئەمانە دوو یان سێ خوشکی ئەفسانەیین، لە شوێنێکی خەتەرناکی ناوەندی دەریادا دەژین. دەنگیان یەجگار خۆشودڵگیرە.هەر دەریاوانوکەشتیڕانو ڕێبوارێك گوێی لە دەنگو ئاوازیان بێت، ئەفسوون دەبێتو خۆ بەخۆ بەرەو لای ئەوان دەچێتو ئیدی لە نێوی دەبەنو هەرگیز ناگەڕێتەوە.

*- ئارگۆ: کەشتییەکە کە لەلایەن (ئارگوس)ەوە دروستکراوەو بە ناوی ئەوەوە ناوی (ئارگو)ی لێنراوە. کەشتیوانانی ئەم کەشتییە بە سەرکردایەتی چاسون دەڕۆنو لە کەوڵی زێڕین دەگەڕێن.

*- هیرا: هاوسەری زیوسی،گەورەی خواوەندانە.

*- چاسون: کوڕی ئیسونی پاشای ئیولکوس لە دەڤەری تسالیا، پلیاسی مامی چاسۆن، بابی چاسونی لە پاشایەتی خستو بە خۆی چووە شوێنی. چاسون کەوتە لای خیرون. کە گەورە بوو بەرەو ئیولکوس کەوتە ڕێ تا مەملەکەتەکەی بابی وەربگرێتەوە. لە ڕێگەدا یارمەتی پیرەژنێکی دا، تومەز ئەمە هیرای هاوسەری زیوس بووەو چووەتە قیافەتو هەیئەتی پیرەژنەوە. ئەم پیرەژنە

دەخوازێ لە ئاوەڕۆیەکی خوڕ بپەڕێتەوە. کە چاسۆن یارمەتی دەدات‌ودەی پەڕێنێتەوە، تاکێ لە پێڵاوەکانی چاسون ون دەبێت‌وئاو دەیبات. کە دەگاتە ئیولکوس دەچێتە حوزوری پیلیاس‌و داواکەی خۆی عەرز دەکات. کە پیلیاس دەبینێ ئەم میوانە ناوەختە تەنیا تاکێ پێڵاوی لە پێدایە، پێشبینی ئەو فاڵبینەی بیردەکەوێتەوە کە پێی گوتبوو بە دەستی کابرایەك دەچێت کە یەك تاك پێڵاوی لە پێدا دەبێت. بۆیە مەرجی دەگەڵ دەکات کە ئەگەر بچێت بۆ مەملەکەتی ئاییتیس لە دەڤەری کولخیس، ئەوا داواکەی جێبەجێ دەکات. چاسون کە بۆ خۆی کەسێکی سەرکێش‌و خۆ سەردەبێت مەرجەکە قەبوڵ دەکات. ئیدی کۆمەڵێك لە ناودارترین قارەمانانی گریگ کۆ دەکاتەوەو سواری کەشتی ئارگۆ دەبن، وبە چاودێری‌وسەرپەرشتی هیراو بە کۆمەکی ئەتینا بەڕێدەکەون. کە دەگەنە لیمنوس، کە ژنان زۆربەی پیاوانیان کوشتووە، سەرنشینانی کەشتی ئارگۆ وەکو مێرد پێشوازی دەکرێن‌و شابانۆیەکەیان دوو کوڕی لە چاسون دەبێت.

*- خاریبدیس: کیژی پۆسیدون‌و جیبیایە. لە ژێر گابەردێکدا دەژی بە هەمان ناوەوە، دەکەوێتە قوڵی سەقلیای ئەو تەنگانەی نێوان سەقلیاو ئیتاڵیاوە بەرانبەر بە سکیلایە. زیوس بە بروسکەیەك خستیە ژێر ئەو گابەردەوە. چونکە هەندێ ڕەشە ولاخی هەرقلی دزی بوو. هێندە چاو نۆك بوو، کە ڕۆژی سێ جاران ئاوی دەریای هەڵ دەلوشی‌و دوایی دەیهێنایەوە. بەمەش گێژاوو گێژەنگی ترسناکی بۆ کەشتیوانان دروستدەکرد. کە کەشتییەکەی ئودیسیوس داغان بوو، قووتی دا. بەڵام ئودیسیوس خۆی بەو دارهەنجیرەوە هەڵواسی کە ڕێك لە دیاری ڕووا بوو. بەو هەڵواسراوییەوە مایەوە، تا هەڵی هێنایەوەو هەنگێ خۆی هەڵدایە سەر ئەو تەختەیەی کە کردبووی بە کەڵەك، وبە سەلامەتی دەربازبوو.

*- سکیلا: ئەمە لە ئەسڵدا پەرییەکی یەجگار جوان بوو. گلاوکۆسی خواوەندی دەریا شیفتەو دڵبەندی بوو. هەرچی دەکردودەکۆشا ئەم پەرییەی بۆ نە دەهاتە ڕەدا. ناچار پەنای وەبەر کیرکی ئەفسوونکار برد تا ڕێیەکی پێنیشان بدات کە بتوانێ عەشق‌و ڤیانی پەری بەدەست بێنێ. بەڵام کیرکی بە خۆی ئاشقی گلاوکۆس دەبێت، چونکە زۆری ڕق لە هەڤڕکەکەی خۆی (سکیلا) بوو، شەرابی ڤیان‌وخۆشەویستی نەدایە، بەڵکو هەندێ گیای ژەهراوی لەو ئاوەکرد کە سکیلا خۆی تیا دەشت. ئیدی گۆڕاو بوو بە دێوێکی یەجگار موزیرِوترسناك. ئەم دێوە بە لەش ئافرەت، بەلاق هەژدیهاو بە کلك ماسی بوو،شەش ملی درێژی هەبوو. شەش سەریان بەسەرەوە بوو، هەر سەرێك سێ ریز ددانی ترسناکی پێوە بوو. لە ئەشکەوتێکی تەنگەیەکی نێوان ئیتالیاوسەقلیادا دەژیا،.لەوێندەر خۆی مەڵاس دەداو چاوەڕوانی دەکرد تا کەشتییەك بەوێدا ڕەت بێ،وپەلاماری بدات‌و کەشتیوانەکان بڕفێنێ‌و بیانخوات. کە ئودیسیوس بەو ڕێگەیەدا دەڕوات، پەلاماری دەدات‌و شەش کەس لە کەشتیوانەکانی دەڕفێنێ ودەیانخوات. لە بەرانبەر سکیلادا، خاریبدیس هەبوو، ئەمە گێژەنگێکی زۆر ترسناکەو کەشتیان قووت دەدات. دەریاوانی لەو بەینەداو دەرباز بوون بە سەلامەتی،کارێکی یەجگار ئەستەم بوو.

## سروودی سیازدەیەم

### کورتەی سروودەکە:

گۆهداران سەریان لە بەسەرهاتوسەربورەکەی ئودیسیوس سوڕ دەمێنێ. بۆیە ئالسینوس، میرو شازادەکان واداردەکات کە بە ناوی میوانداری‌ومیوانپەروەریەوە دیاری‌وسەوقاتی دیکەی بدەنێ (بە ئودیسیوس). ئودیسیوس، بۆ سبەینێ، هەر شەوەکی مۆڵەتی رۆییشتن وەردەگرێت. بە نووستووی دەگەیەنرێتەوە ئیتاکا. کە گەییشتە دوڕگەی ئیتاکا، دەریاوانەکان لە بەندەری فورسیس لەنگەردەگرن‌و میوانەکەیان (ئودیسیوس) بە هەموو دیاری‌وسەوقاتیەکانیەوە لە کەناری دەریاکەدا دادەگرن.لە گەڕانەوەدا، لە نزیکی بەندەری ناڤبریدا، پوسیدون لە رقی ئەوەی کە فیاسیەکان یارمەتی میوانەکەیان (ئودیسیوس) داوە، کەشتییەکەیان دەگۆڕێت‌و دەیکات بە تاشە بەردێك. ئودیسیوس کە لە خەو رادەبێت، لاتەکەی خۆی ناناسێتەوەو وادەزانێ کە دەسخەڕۆیان کردووە. تومەز ئەتینا بە ئانقەست‌و بە مەبەست لە پەڵە هەورێکییەوە پێچاوە. لە هەیئەت‌و شێوەی شوانکارەیەکی گەنجدا خۆی لە ئودیسیوس ئاشکرا دەکات، (ئودیسیوس)ش لە رووی گومان‌و ترس‌و ودوودڵییەوە، وادەنوێنێ کە بابایەکی کریتی لێقەوماوەو پەنای بۆ ئەوێندەر هێناوە. هەنگێ خوابانۆ (ئەتینا) دەچێتەوە دۆخی راستەقینەی خۆی، وخۆی بە ئودیسیوس دەناسێنێ، هەورەکە دەڕەوێنێتەوەو ئودیسیوس سلاوات لە دیداری ولاتەکەی دەدات ودرودی بۆ دەنێرێ. ئەتینا واداری دەکات کە یەکەمجار لە شێوەو قیافەتی گەداو دەرۆزەکاراندا بۆ لای یومایوسی بەرازەوانی بچێت، کە هەر بە وەفاداری مابووەوە. هەنگێ ئەتینا بەرەو لاسیدیمون دەڕوات، تا تیلیماخۆس لەوێندەر بێنێتەوە.

***

### ئالسینیویوس رێز لە ئودیسیوس دەنێت

کە ئودیسیوس ئەو بەسەرهاتانەی گێڕایەوە، هەموو لەسەرساميدا حەپەسان. لە نێو هۆڵە گەورەکەدا کڕوکپ، ئەفسوون زەدە کەس لە جێی خۆی نەدەجولا. بەلام ئالسینیویوس، هەڵیدایەو گوتی:

"ئەی ئودیسیوس، تۆ کەڕێت کەوتووەتە کۆشکە بەرزو ئاستانە برونزینەکەی من، پێم وا نیە، هەرچەندە دەردومەینەتێکی زۆرت بەسەر هاتووە، لە گەڕانەوەدا، کۆسپ‌وتەگەرەت بێتە رێ.

ئێوەش ئەی ئامادەبووانی بەڕێز، ئەی ئەو کەسانەی لە وەخت‌ولە ناوەختدا خۆ بە دیوەخانەکەی مندا دەکەن‌و بادەی ئاڵی سەرفرازی دەخۆنەوە، گوێ لـە دەنگ‌وئاوازی شایەرو چامە سـەراکەی من دەگرن. جا من پێشنیازێکم هەیەو حەزدەکەم پێتانی ڕابگەیەنم: میوانەکەمان لەسـەر سـەفەرە، هـەر هـەموو ئـەو جل‌وبـەرگ‌ودیاری‌و پێشکەشـی‌و توحفانـەی کـە شـیرەتکاران‌و پیاوماقولانی فیاسی بەڕەزامەندی خۆیان بۆیان هێناوە، لەو باوڵە زێڕە بە بریسک‌و باسکەی ناوەو ئامادەی سەفەرە، پێشنیازی من ئەمەیە با هەریەکێك لە ئێمە سێ پایەك‌ومەنجەڵێکی گەورەشی بدەینێ، پاشان بەهاکەیان لە میللەت کۆ دەکەینەوە. چونکە ئەم دیاریە گەورەیە لە توانای یەك کەسدا نییە".

هەر هەموو ئامادە بووان پێشنیازەکەی (ئالسینیویوس)یان بە دڵ بوو. ئەوسا کردیان بە شەو، بڵاوەیان لێکردو هەرکەسە رۆییشتەوە بۆ ماڵی خۆی تا بخەوێ. ئەوسا دەگەڵ گەردی بەیانیدا، بەخۆو بە مەنجەڵەوە بە هەشتاو بەرەو کەشتییەکە پەل بوونەوە. ئالسینویوسی جوامێرو دلاوەر بە خۆی چووە سەر کەشتییەکە، هەموو دیاریەکانی بە جۆرێ لە ژێر تەختەکان داناو تەقەت کرد.کە رێگە لە سەوڵێدانی هیچ یەکێك لە دەریاوانەکان نەگرێت.

## ئودیسیوس بەوپەڕی مەمنونی دوعاخوازی لە ئالسینویوس دەکات

ئەوسا بۆ فراڤین بۆ ماڵی ئالسینویوس چوون. ئالسینویوسی دلێروجوامێر، لە ڕاهی زیوسی کوڕی کرونوس، خواوەندی هەوران‌و فەرمانڕەوای هەموو شتان‌و گشت بەشەران، گایەکی بۆ کردنە قوربانی. رانەکانیان برژاند، نان‌وخوانێکی تێرو تەسەلیان ئامادەکرد وزیافەت و سوروبەزمێکی زۆر خۆشیان گێڕاو دیمودوکۆسی موبارەك‌وشایەرو هۆنەری خۆشەویستی خەڵك، بەدەم گیتار لێدانەوە گۆرانی بۆ چڕین‌و دڵی خۆشکردن. بەڵام ئودیسیوس. بەردەوام چاوی لە هەتاوەکە بوو. تامەزرۆی ئەوە بوو زووتر ئاوابێ، تا بۆ وڵاتەکەی بگەڕێتەوە. وەکو چۆن جووتیارێك، رۆژ تا ئێوارێ بە دووی دوو گاجوتەوە، زەویەکی بەیار دەکێڵێت‌و خوا خوایەتی رۆژی لێ بڕوات‌و خۆر ئاوا بێت‌و هیلاك‌وماندوو بگەڕێتەوە بۆ ماڵ‌و شێو بکات، (ئودیسیوس)ش بەو ئاوایە، خواخوای بوو رۆژ ئاوا بێت. بۆیە هەرکە خۆر ئاوا بوو. یەکسەر هەستاو بە خۆشییەوە رووی کردە فیاسیانی دەریاوان‌و کەشتیڕان بە گشتی‌و ئالسینوسی سەر گەورەیان بە تایبەتی‌وگوتی:

"ئەی ئالسینوسی بە توانا، ئەی ناودارترین ناودار، بە دوعا ئەزبەنی، خوا حافیز لە هەمووتان. پێك هەڵدەن، بە سەلامەتی من بخۆنەوەو بە خۆشی بەڕێم بکەن. من ئێستا زۆر دڵخۆشم. بە ئاواتی خۆم گەییشتم. پاسەوان‌و دەریاوانتان بەگەڵ خستووم، دیاری‌وسەوقاتیتان داومەتێ، لە هیچم کەم نییە. ئومێدەوارم خواوەندانی ئاسمان ئەمەم پێ رەواببینن. هێڤیدارم لە گەڕانەوەدا ژنە پاك ڕەوشتەکەم‌و هەمووخۆشەویستانم بە ساغ‌و سەلامەتی ببینمەوە. هێڤیدارم ئێوەش کە لێرە دەمێننەوە، هاوسەران‌وفرزەندانتان بەختەوەر بکەن، و خواوەندان هەموو خێروخۆشیەکتان بدەنێ، وهیچ ناخۆشی‌و نەهامەتیەك بەسەر میللەتەکەتاندا نەیەت".

## ئالسینویوس داوا لە جەماوەری خەڵك دەکات

## نزاو دوعای خێر بۆ ئودیسیوس بکەن

خەڵکەکە، قسەکانی (ئودیسیوس)یان لە گیان خۆش بوو،وداوایان دەکرد کە رەوانی بکەن، چونکە قسەکانی دروست ورەوا بوو. ئیدی ئالسینویوسی جوامێرو دلاوەر،خولامەکەی گازکردو گوتی: "پۆنتونوس، هەرو شەرابێکی زۆر لە مەنجەڵێکی گەورەدا تێکەڵ بکە، وئەوسا بەریز بادە بەسەر هەمووانددا دابەشبکە. بۆ ئەوەی دوای نوێژو نزا بۆ زیوسی باب، میوانەکەمان بۆ وڵاتی باب و باپیرانی ڤڕێ بکەینەوە".

پونتونوس، یەکسەر هەستاو بادە هەنگوینییەکەی تێکەڵ کردو بەسەر هەمووانای گێڕاو بەشییەوە. هەرکەسەو لە جێی خۆیەوە بە یادی خواوەندانی نەمری ئاسمان نشین، بادە پرژێنیان کردو کەوتنە نۆشخۆری. لێ ئودیسیوسی بناڤودەنگ، هەستایە سەرپێیان و جامە دوو دەسکیەکەی خۆی پێشکەش بە ئەریتی کردو بە دەنگی بەرز گوتی: "ئەی شابانۆ، بە دوعا، من دەڕۆم. هیوادارم تا پیروخەرو دەبیت تا ئەو رۆژەی ئەجەل بەرۆکت دەگرێت، کە پیری ومردن قەدەروچارەنووسی هەموو بە شەرێکە، هەر شادوبەختەوەر بیت. من دەڕۆم، هیوادارم لەم کۆشکەدا، منداڵەکانت، کەسوکارت، ئالسینویوس پاشا، بە خۆشی بدینی وشادو بەختەوەر بژین."

ئودیسیوسی مەزن بەدەم ئەو قسانەوە،لە ئاستانەی دەرگاکە وەدەرکەوت. ئالسینویوسی جوامێرو بە توانا خولامێکی بەگەڵ خست تا بەرەو کەشتییەکەو کەناری دەریا رێنوێنی بکات. (ئاریتی)ش چەند قەرەواش وکلفەتێکی بەگەڵ خست، یەکێکیان عەباوکراسێکی کەتانی تازە شۆراوی پاك وخاوێنی بۆ هەڵگرتبوو، دووەمیان باوڵەکەی بۆ هەڵگرتبوو، وسێیەمیان خۆراك و بادەی ئاڵی بۆ هەڵگرتبوو. کە گەییشتنە کەنار دەریاکەو نزیکی کەشتییەکە، دەریاوانەکان، شتەکان و خواردەمەنی و خواردنەوەکانیان لێوەرگرتن و بە گورجی لە کەشتییەکەدا عەماریان کرد. ئەوسا لە پاشی کەشتییەکەوە دۆشەك وچەرچەفێکی کەتانیان بۆ ڕاخست، تا بتوانێ بە دڵنیایی و ئاسوودەیی بخەوێت. هەنگێ ئودیسیوس سەرکەوتە سەر کەشتییەکەو چوو بە بێدەنگی لەسەر جێگاکەی خەوت. ئەوسا دەریاوانە گەنجەکان بەریز چوونە سەر سەوڵەکانی خۆیان لەجێی خۆیان دانیشتن و گوریس وکندرە لەنگەرگرەکانیان لە بەردە کونەکان کردەوە. هەر کە دەستیان بە سەوڵ لێدان کرد، ئیدی خەوێکی خۆش وقوڵ، میناکی مەرگ ئودیسیوسی بردەوە. وەکو چۆن لە دەشتێکا چوار ئەسپی خورت و بە قوەت لە ژێر زەبری قامچیدا تاو دەدەن و عەرەبانەیەك بە هەشتاو رادەکێشن، کەشتییەکەش بەو ئاوایەو زۆر بە خێرایی بەناو جەرگەی دەریادا رێگەی خۆی دەبڕی و بە چوار دەوری خۆی دا شەپۆلانی پڕکەف بەجێدەهێشت، هێندە خێرا دەڕۆیی، شاباز کە تیژ باڵترین باڵندەیە، بە بای قولانیدا نەدەگەیی. کەشتییەکە بەوپەڕی خێرایی دەڕۆیی و شەپۆلانی شەق دەکردو قارەمانێکی دەبرد کە لە بەردەباری و زیرەکی دا نیمچە خوایەك بوو بۆ خۆی. قارەمانێك کە تا ئەو کاتە لە شەڕگەو مەیدانی بەشەران و لە شەڕی شەپۆلاندا چەرمەسەری زۆری دیتبوو. بەڵام ئێستا بێ هیچ جوڵەیەك، لێی خەوتبوو، و هەموو ئەو دەردومەینەتیانەی فەرامۆش کردبوو.

كە ئەستێرەی بەیانی هەڵهات، ئەوسا پیرە کەشتی لە دورگەی ئیتاکا نزیك بووەوە.

## گەیشتنی ئودیسیوس بۆ ئیتاکاو غەزەبی پوسیدون

لە وڵاتی ئیتاکادا بەندەرێك هەیە بە ناوی فورسیس، کە پیرەمێردی دەریایە. ئەم بەندەرە کەوتووەتە نێوان دوو دەماغەی ڕكوئەستونیەوە کە لە زریانو شەپۆلانی سامناکی دەریای دەپارێزن. بەندەرەکە هێندە هێوروئارامە، کە کەشتیانی رەختەومکوم دەگەنە ئەویٚ و لەنگەر دەگرن،پێویستیان بە بەستنەوەوکندری لەنگەرگیری نابێت. لە سەرەتای بەندەرەکەدا دار زەیتونێکی بەلقوپۆ هەیە، لە نزیکی دار زەیتونەکەوە ئەشکەوتێکی جوانی دڵگیری قووڵ زاری کردووتەوە.ئەمە تایبەتە بەو حۆریو پەرییە دەریاییانەی کە (نیادیس)یان پێدەڵێن. لە نێو ئەشکەوتەکەدا ئامانی بادەگرتنەوەوگۆزەی دوو دەسکی هەن کە مێش هەنگان هەنگوینی تیا دەکەن. هەروەها دەزگاوخەرەکی گەورەی بەردینیش دەبینریٚ کە پەریەکان پارچەوحەریری ئەرخەوانی دەریا رەنگی ئەوتۆی لەسەر دەچنن کە چاو لە تەمەشای تێر نابێت. هەروەها کۆمەڵێك کانیوسەرچاوەی تێدان کە لە هەڵقوڵین ناکەون. ئەم ئەشکەوتە دوو دەرگای هەیە. یەکێکیان روو لە باکوربای باکورەو بەشەر دەتوانن لێوەی وەژووربکەون. ئەویتریان روو لە باشوورو بای باشوورە. ئەمە تایبەتە بە خواوەندان، وهەرگیز خەڵکی لێوە وەژوورناکەون. فیاسیەکان، کە شارەزا بوون، خۆیان بەم بەندەرەدا کرد، کەشتییەکەیان هێنایە کەنارەوە، تا نیوەیان هێنایە سەر لمەڵانی کەنارەکە، ئەوسا لە کەشتییە رەختەومکومەکە دابەزین. ئودیسیوسیان بە نوێنەکانیەوە هەڵگرتو لەسەر لمەڵانی کەنارەکەدا رایانکشاند. هێشتا لە غورابی خەودا بوو. ئەوسا هەموو ئەو دارایيو پێشکەشیو دیاریو سەوقاتیە گران بەهایانەی کە شیرەتکارانو پیاوماقولانی فیاسی لەسەر خواستی ئەتینا پێیان بەخشی بوو، تا بە دەستی بەتاڵ بۆ وڵات نەگەڕێتەوە،داگرت. هەموویان لە ژێر دارزەیتوونەکەو دوور لە ڕێگا کەڵەکە کرد. چونکە دەترسان نەبادا ڕێبوارێك، بەر لەوەی ئودیسیوس خەبەری ببێتەوە، بەوێدا تێپەڕیٚو تەماح بیگریٚ، دەستکاریان بکات یان بیاندزێت. دوایی دەریاوانەکان بەرەو وڵاتی خۆ گەڕانەوە.
بەڵام پۆسیدونی زەوی لەرزێن، ئەو هەڕەشەوگوڕەشانەی لە بیرنەکردبوو کە کاتی خۆی لە ئودیسیوسی نیمچە خواوەندی کردبوو، بۆیە بە پەلە خۆی گەیاندە لای زیوسوبەمجۆرە سکاڵای خۆی بۆ کرد:

"ئەی زیوسی باب! من چیتر ناتوانم لە نێو خواوەندانی جاویداندا سەربەرز بکەمەوە، هیچ سامو تامێکم نەما. چونکە بەشەرانی فانی هیچ حیسابێکم بۆ ناکەن،سیوایان لێم بووەتەوە. تەنانەت فیاسیەکانیش، کە بە خۆت دەزانی لە نەژادو توخمو تۆوی منن، شەرمیان لێم شکاوە. من کاتی خۆی بڕیارم دابوو، ئودیسیوس دووچاری کۆمەڵێك ئاریشەوئاستەنگو چەرمەسەریو ناخۆشی بکەم ئەوسا بۆ وڵاتی خۆی بگەڕێتەوە. بڕیاری ئەوەم نەدا بوو قەت نەگەڕێتەوەو لە خۆشیو شادی گەڕانەوە بۆ وڵات بێبەش بێت. چونکە ئاگادار بووم کە رۆژێك تۆ مژدەی گەڕانەوەت پیٚ دابوو، وبە ئاماژەی سەر ئەوەت بۆ دووپات کردبووەوە. کەچی ئەم فیاسیانە لە کەشتییەکی تیژڕۆیان ناوە، ونەوەستاون تا لە ئیتاکا بە نووستووی دایانگرتووە. هێندەیان دیاریو

سەوقاتی: لە برونز،وزێرو جلكوبەرگ، لەگەڵی ناردووە، كە ئەگەر ئودیسیوس زۆر بە شێنەیی و بێ هیچ كۆسپ و ئاستەنگێك لە شەڕی تەروادە گەڕاباوەو هەموو بەشە تالانی ودەسكەوتە جەنگییەكانی خۆی هێناباوە، بارتەقای ئەم دیاریانەی نەدەكردەوە".

زیوسی هەورەوان وەڵامی دایەوە:

"ئەوە بەڕاستتە! ئەی هەژێنەری زەوی، ئەی خاوەن دەسەڵات، ئەوە تۆ چی دەڵێی؟ كێ دەتوانێ بێ ڕێزی بەرانبەر بە تۆ بكات. هیچ خواوەندێك ڕێ بە خۆی نادات، باشترین وبە تەمەنترین خواوەند، تۆ، بڕەنجێنێ و بێ ڕێزیت دەرهەق بكات. سەبارەت بە بەشەران، كێ زۆر بە هێزو گۆساخی و دلێری خۆی دەنازێت،وڕێزو حورمەتی تۆ ناگرێت، بۆت هەیە دەستبەجێ، یان دوایی، چۆنت پێ باشەوچۆنت پێ خۆشە، بەو ئاوایە تەمبێی بكەیت و تۆڵەی لێبستێنی".

هەنگێ پوسیدونی زەوی لەرزین وەڵامی دایەوەوگوتی:

"ئەی خواوەندی هەورانی توندوگەواڵ گەواڵ! من دەمتوانی ئەوە بكەم كە تۆ دەیڵێی، بەڵام من هەمیشە لە پشم وغەزەبی تۆ دەترسم وخۆمی لێ دووردەگرم. جا ئێستا دەمەوێ ئەم كەشتییە جوانەی فیاسیان، وەختێ لەلای ئودیسیوسەوە، بە نێو دەریای پڕ تەم ومژدا دەگەڕێتەوە، تەفرو تونا بكەم، تا جارێكی دی نەخەڵەتێن، لە خۆوە پاسەوانی ورێنوێنی خەڵكی بكەن. ودەخوازم بە كێوێكی بەرز دەوری شارەكەیان بگرم".

زیوسی هەورەوان بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"گیانەكەم، من بم لە جیاتی تۆ كاتێ كە كەشتیەكە لە شار نزیك دەبێتەوە، وخەڵكی لە نێو شارەوە بەدەم چاوەڕوانییەوە تەمەشای دەكەن، لە نزیكی كەنارەكەدا دەیكەم بە تاشە بەردێك لە شێوەی كەشتییەكی تیژڕەودا، تا هەركەسێك ئەو موجزاتە بدینێ واقی وڕبمێنێ، وئەوسا شارەكەیان دەخەمە پشت كێوێكی بەرزەوە كە كەس نەیبینێ".

پۆسیدونی زەوی لەرزێن كە گوێی لەو قسانەوە بوو، یەكسەر بەرەو سخیریای قەڵەمڕەوی فیاسیەكان وەڕێكەوت، لەوێ چاوەڕوانی كرد. وەختێ كەشتییەكە زۆر بە خێرایی بەرەو كەنار دەهات، پۆسیدونی زەوی لەرزێن بەپەلە خۆی گەیاندێ وگۆڕیێ و كردی بە تاشە بەردێك و دەستێكی بەژێریدا هێنا، ولە زەویدا ریشاژۆی كردو چەقاندی ئەوسا بە پەلە گەڕایەوە.

ئەوسا فیاسیانی مەنشور بە دەریاوانی وسەوڵەوانی، دەستیان بە قسان كرد، هەركەسەو ئاوڕی لەوەی تەنیشت خۆی دەدایەوەودەیگوت:

"پەكو! كێ كەشتییەكەی لە دەریادا چەقاند؟ خۆ تۆزێ لەمە پێش وەكو با دەهات. سەیرە، لە هەتەری چاوا بوو! بە تەواوەتی دیاربوو."

بەو جۆرە یەكیان دەدواند. بەڵام نەیاندەزانی ئەم كارە چۆن ڕووی دا. هەنگێ ئالسینویوس ڕووی كردە خەڵكەكەوگوتی: "هاوار بە ماڵم، ئەوا پێشبینییەكانی بابم هاتنە دی! هەمیشە دەیگوت پۆسیدون غەزەبمان لێدەگرێ، چونكە ئێمە بە هانای هەموو كەسێكەوە دەچین، بە سەلامەتی بە دەریادا ڤرێی دەكەین و دەیگەیەنینەوە مەزڵ وشوێنی خۆی. دەیگوت ڕۆژی دێ، كەشتییەكی زۆر جوانی فیاسی، كە لە بەڕێكردنی خەڵكی دەگەڕێتەوە، لە ناو جەرگەی دەریای

بە تەمتوماندا نقوم دەبێت‌و شارەکەمان دەکەوێتە پشت کێوێکی گەورەوەو دیارنامێنێ. ئەمە قسەکانی ئەو پیرەمێردە بوو، سەیر ئەوەیە، ئەوەتا هەموو قسەکانی وادێنەدی. دەی کوڕینە بە خۆ بکەون، چیتان پێدەڵێم وابکەن. با چیتر هیچ غەریب‌وغەوارەیەك، کە ڕێی دەکەوێتە شارەکەمان، بە کەشتی خۆمان نەگەیەنینەوە مەزڵ‌وشوێنی خۆی. با دوانزە جوانەگای هەڵبژاردە بۆ پۆسیدون بکەینە نەزروقوربانی، بەڵکو هێور ببێتەوەو غەزەبەکەی بنیشێتەوەو شارەکەمان نەخاتە پشتی کێوێکی بەرزەوە". کە خەڵکەکە گوێیان لەو قسانە بوو، ترسان، وبە پەلە جوانەگاکانیان ئامادە کرد.

## ئودیسیوس لە وڵاتی خۆیدا غەریبە

کە خەڵکەکە گوێیان لەو قسانە بوو ترسان‌و، بە پەلە جوانەگاکانیان ئامادە کرد. ئەوسا راوێژکاران‌و سەرانی فیاسی، لە دەوری کوشتنگەکە (مذبح) خڕ بوونەوەو کەوتنە نوێژونزا بۆ پۆسیدون. لەم لاشەوە ئودیسیوسی مەزن لە خاکی وڵاتی خۆیدا، خەبەری بووەوە، لێ چونکە دەمێ بوو، لێرە ڕۆیی بوو، ئیتاکای زیدی خۆی نەناسیەوە. لەلایەکی تریشەوە، چونکە پەلاس ئەتینای کیژی زیوس، نەیدەویست کەس بیناسێتەوە. هەروهەڵاو تەم‌و مژێکی بە هەرچوار نکالدا بڵاوکردبووەوە.دەیویست بەخۆی لە هەموو شتێکی ئاگاداربکاتەوە، و تا تۆڵەی هەموو فزونکاری‌و بەدکاریەکان لە خوازگارەکان نەکاتەوە، ژنەکەی‌و، کەسوکاروخەڵك‌و خواکانی وڵاتەکەی نەیناسنەوە. بۆیە هەموو شتەکان: ڕێگادرێژەکان، بەندەرولەنگەرگا ئارام‌و بێ مەترسیەکان، شاخ‌وکێوو بەندەنە ڕك‌و ڕژدو هەڵدێرەکان،درەختانی پڕ لق‌وپۆ و گەڵاوگۆڵ، هەر هەمووی لەبەر چاوی ئودیسیوس غەریب‌و نامۆ بوون. ئودیسیوس لە پڕ هەستاو، چاوی بە خاکی وڵات‌و مەفتەنی خۆدا گێڕا، ئەوسا ئاهێکی هەڵکێشاو بە هەردوو دەست کێشای بەرانی خۆیدا،و بەدەم ئاهوناڵەوە گوتی:

"وا وەیلا بە حاڵم، هاوار لە خۆم، نەگبەت‌و بەدبەخت خۆم، ئێرە کوێیە، کەوتوومەتە ناو چ کەسانێکەوە؟ ئایا خەڵکانێکی سەختگیر، ناکەس،وستەمکارن یان غەریبدۆست‌و میوانپەروەرو لە ناخدا خواناس‌و بە ویژدان‌و لە خواترسن؟ ئەدی ئەم هەموو سەروەت‌وسامان‌و شتە بۆ کوێ بەرم، ئەدی خۆم بۆ کوێ سەر هەڵگرم؟ باشە بۆچی لەوێ، لەلای فیاسیەکان نەمامەوە؟ دەمتوانی بەرچاوتکا ڕوو لە پاشایەکی بە توانای دیکە بنەم، وبە پیاوەتی خۆی‌و بە قەدروحورمەتەوە بۆ وڵاتی خۆمی ڤڕێ بکردمایەوە. ئێستا نازانم ئەو سەروەت‌وسامانە لە کوێ دابنەم، بێگومان نابێ لێرەیان دابنەم. چونکە دڵنیام دەدزرێن. ئەمە چ بەدبەختییەکە؟ کەواتە ئەو ڕێنوێن‌و شیرەتکارە فیاسیانەی منیان بۆ ئەم غەریبستانەدا هێناوە، خەڵکێکی بە ئینساف‌و زیرەك نەبوون، خۆ ئەوان قەوڵیان دامێ بۆ ئیتاکام بەرن، لێ بێ قەولیان کردووە! دەك بەر غەزەبی زیوس بکەون، زیوس پەنای لێقەوماوانە، کاروکردەوەی هەموو تیرەی بەشەر دەبینێ، وسزای تاوانباران دەدات. باوەجو با شتەکانم بژمێرم، بزانم ئەو دەریاوانانە، لە گەڕانەوەدا، هیچیان لێ نەبردووە".

## ئودیسیوس، ئەتینا لە کڵێشەی شوانکارەیەکدا دەبینێ

ئودیسیوس دوای ئەو قسانە، کەوتە ژماردنی سێ پایە جوانو،مەنجەڵو زێڕوجلكو بەرگە جوانەکانیو هیچیان کەم نەبوو. بەڵام پەستوغەمگین، بە کەناری دەریاکەدا دەهاتودەچوو. لە دووری ئاخی وەتەن بە کوڵو بە دڵ دەگریا. ئەتینا لە شێوەو هەیئەتی شوانکارەیەکی منداڵکاری تازە هەڵچووی یەکجار جوانی شازادە ئاسادا لێی نزیك بووەوە. کەپنەکێکی یەکجار نایابی بە شانیا دابوو، سەندەڵێکی رەخشانیشی لە پێدا بوو، وگۆپاڵێکی بە دەستەوە بوو. ئودیسیوس بە دیتنی ئەو دڵی کرایەوەو خێرا چوو بۆ پێشوازی، وبە دەنگی بەرز گوتی:

"ئەی دۆست، سڵاوت لێ بێ. تۆ یەکەم کەسی کە لەم مەرزوبووەت دەبینم. هیوادارم نیازت بەرانبەر بە من خراپ نەبێت. دەخیلت بم، ئەمانەتی تۆو ئەم شتانەم، خۆم بە تۆ دەسپێرم، وەکو خواوەند لەبەرت دەپاڕێمەوە، خۆمت لە بەر پێیان داوێم. پیاوی چاك بە، راستیم پێ بڵێ تا بزانم ئێرە کوێیە، ئەم خەڵکە کێنو چ تیرەو تایفەو نەژادێکن؟ ئایا ئێرە دوڕگەیە یان تخوبوئاقاری کیشوەرێکی سەر دەریایە؟

هەنگێ ئەتینا،خوابانۆی چاوگەش بەرسڤی دایەوە:

"ئەی غەریب، وا دیارە تۆ یان گێلی، یان لە شوێنێکی دوورەوە هاتوویت. وا ئەم وڵاتە ناناسیت. بە هەرحاڵ وڵاتێکی ئەوەندەش گومناو نیە. ناوی خۆی هەیە، خەڵکانێکی زۆر، چ رۆژهەڵاتیو چ رۆژئاواییو چ دوورو چ نزیك ناویان بیستووەو دەیناسن. بێگومان وڵاتێکی سەختوبەردەڵانو پڕ گاشەو، هەورازو نشێوانە، راستە بە کەڵکی جلیتانێوئەسپ سواری نایەت. لێ ئەگەر وڵاتێکی بەرینو تەختانیش نیە، زۆریش تەنگەبەرو بێ کەڵكوخراپ نیە، تا حەزبکەی گەنمی لێ دەڕوێت، رەزو مێو زۆرەو بادەی باش بەرهەم دێنێ. وڵاتێکی بە بارانو تەڕو بە شەونموخوناوە. بارانوخوناڤی لێنابڕێ. مەڵبەندوپەروەرشتگەی پەزوماڵاتە، هەموو جۆرە دارودرەختێکی تیایە، پڕە لە کانیوسەرچاوەو گۆلاوی ئاودار کە بە درێژایی ساڵ وشك ناکەن. جا ئەی غەریب، ئێرە وڵاتی ئیتاکایە، کە ناوی تا تەروادەش رۆییوە، هەرچەندە، گوایە لێرەوە، لەم وڵاتەی ئاخیانەوە، زۆر دوورە."

## ئودیسیوس درۆ دەگەڵ شوانەکەدا دەکات

ئودیسیوس،کە گوێی لەو قسانەی بالاس ئەتینا، کیژی زیوسی سپەردار بوو، زۆر دڵخۆش بوو بەوەی دوای ئەو هەموو مەینەتیوچەرمەسەریە، لە ئاخی مەفتەنی خۆیو مەڵبەندی بابو باپیرانی خۆیدایە. هەنگێ ئودیسیوس بێئەوەی راستی بدرکێنێ، هەڵیدایەو گوتی:

"ئا، ناوم بیستووە،کە لە کریتیش بووم، ناوی ئیتاکام بیستبوو. کریت دوورە، لەو دیوی دەریایاندایە. ئێستاش بە تاقی تەنیاو بەم هەموو سەروەتوسامانەوە رێم کەوتووەتە ئێرە. ئەوەندەو زیاتریشم، لەو وڵاتەدا کە شار بەدەریانکردووم، بۆ منداڵەکانم بەجێهێشتووە، بۆیە هەڵاتووم، چونکە (ئورسیلوخوس)ی کوڕی ئازیزی (ئیدومینیوس)م کوشتووە. ئورسیلوخوس، تا بڵێی چالاكوچەلەنگو قۆچاخ بوو. کەس نەبوو لە سەرانسەری کریتدا هاوتای بکاتەوەو، بە بای قولانیدا بگات. دەیویست هەرچی داراییودەسکەوتێکم هەیە لێمی بستێنێ، ئەو دەسکەوتو داراییەی بە هەزارو یەك گیانەهاریوچەرمەسەری لە تەروادە بە دەستم هێنا بوو.

شەڕ نەما لە پێناویدا نەیکەم، وشەپۆلی دەریا نەما لە ڕایدا بە گژیا نەچم. بۆیەش ڕقی لێ هەڵگرتبووم، چونکە لە تەروادەدا نەچوو بوومە ژێر فرمانی بابی و نەبوو بووم بە پیاوی ئەو. بۆ خۆم فەرماندەی خەڵکانی تر بووم. ئیدی کە لە کێڵگەو مەزرا دەگەڕایەوە بۆ ماڵ، چوومە سەر ڕێگاکەی،دەگەڵ پیاوێکی خۆمدا، بۆسەیەکم بۆ نایەوەو کردم بە قوربانی نێزەیەکی برونزین. شەوێکی زۆر تاریك بوو، چاوچاوی نەدەبینی، کەس نەیبینین و کەس نەیزانی من کوشتوومە. بەڵام کە ئەو کارەم کرد، بە پەلە خۆم گەیاندە کەشتییەك ولە دەریاوانەکانی، کە فیاسیانی خانەدان و ڕەسەن بوون، پاڕامەوە کە دەگەڵ خۆدا بمبەن،وبۆ ئەوەی دڵیان نەرم بێ و دەست بە رووممەوە نەنەن، برێك لەم داراییەی خۆم دانێ وداوام لێکردن کە لە پیلوس یان لە ئیلیس–ی ڕەخشان کە قەڵەمڕەوی ئیپیانە دامگرن. لێ بۆ نەگبەتی من، کردی بە زریان وگژەبایەك بە تەمای خۆ نەماین. وێڵ وسەرگەردان، بێئەوەی هیچ نیازێکی خراپیان دەرهەق بە من هەبێ، بەدەم شەپۆلی و زریانەوە هاتن وشەوێ لێرە گیرساینەوە، بەپەلە کەوتینە سەوڵ لێدان و خۆمان بەم بەندەرەدا کرد. هەرچەند زۆرمان برسی بوو، بەڵام بیرمان لە شیو نەکردەوە. یەکسەر لە کەشتییەکە دابەزین، هەموو شەکەت وماندوو، پاڵکەوتین وبێ شێو سەرمان نایەوە. بەیانی کە لە خەو رابووم، سەیرم کرد، هەموو شتەکانم، لە کەشتییەکە داگیراوەو لە تەنیشت خۆمەوە دانراون. تومەز شەوێ کە من لەبەر کفتی خەوم لێدەکەوێ، دەریاوانەکان شتەکانم دادەگرن و سواری کەشتییە بۆردەبن و بەرەو سیدونی ئاواو ئاوەدان، دەڕۆن، ومن بەم نیگەرانی و پەریشانیە بەجێدێڵن کە بە خۆت دەمبینی."

## ئەتینا خۆی لە ئودیسیوس ئاشکرا دەکات

کە ئودیسیوس ئەو قسانەی کرد، خوابانۆ، ئەتینای چاوگەش بزەیەکی بۆ کرد، ودڵسۆزانە دەستێکی بە پشتدا هێنا. خۆی لە شێوەو هەیئەتی ژنێکی جوانی باڵابەرزی لێزان ودەست ڕەنگین وبەردەباروژیردا گۆڕی بوو،هەڵیدایەو گوتی:

"ئەوەی بیەوێ گرەو لە تۆ بەرێتەوە، دەبێ یەجگار لێزان وبەردەبارو وردبین بێ. جا خوای دەکرد خواوەند دەبوو، ئەی چارەسازی بەردەباری وردبین، تۆ کەنگێ لەم هونەرنوێنییە تێر دەبیت، وا دیارە لە وڵات وزێدی خۆتیشا هەر دەستبەرداری فێڵ وئوینان نابیت، وبە حیکایەت وچیرۆکانی خەیاڵی خۆت لە بن حەوت توێکڵان دەشاریتەوە، چونکە لە ناخی دڵتەوە حەز لەو کارەدەکەیت! جا ئێستا با هەردووکمان کە لە چارەسازی و بەردەباری و راوێژو تەگبیری بە سوودا، کارامەین و ئەزموونانی زۆرمان بڕیوە، با واز لەم ڕواڵەتبازیانە بێنین،چونکە تۆ لە راوێژوگوتاردا سەرتۆپی تیرەی بەشەریت، ومن لە نێو خواوەنداندا بە دبلۆماسیەت وچالاکی و لێهاتووی بەنێوبانگم. یانی تۆ تەنانەت پالاس ئەتینای کیژی (زیوس)ش ناناسیتەوە کە لە هەموو ئاستەنگ و تەنگانەیەکدا یاری تۆ بووەو ڕزگاری کردوویت،ولە دڵی خەڵکی فیاسیدا بەڕێزوخۆشەویستی کردوویت! جا ئێستا هاتووم بۆ ئێرە تا نەخشەیەك دابنەین کە ئەم هەموو دیاری وسەوقاتی و سەروەت و سامانەی فیاسیانی خانەدان ورەسەنزادە پێیان داوی لە شوێنێکی باشدا تاقەت بکەین، حەز دەکەم ئەوەش بزانی کە فیاسیەکان لەسەر قسەو داوای من ئەو هەموو سەوقاتیەیان داوێتێ،

چونکە حەزم دەکرد بە دەست‌ودەسکەوت‌و دیاری زۆرەوە بۆ زێدومەفتەنی خۆت بگەڕێیتەوە. هەروەها دەخوازم هەر هەموو ئەو کێشەوئاریشانەت پێ بڵێم کە قەدەر لە نێو کۆشک‌و تەلارە بەرزەکەت لە چارەی نووسیوویت. تۆ بە ناچاری دەبێ دان بە خۆتا بگری‌و تەحەمولی هەموو کێشەو ئاریشەیەك بکەیت، وبە هیچ کەسێك چ پیاو وچ ژن نەڵێیت کە دوای ئەو هەموو چەرمەسەری‌و گرفت‌و ئاریشانە، بۆ ولات گەڕاویتەوە. خۆت لە گێلی بدەو بە تەوهین‌و فزونکاری‌و بەدرەفتاری هیچ کەسێك شێلو مەبە".

## ئودیسیوس منەتباری خۆی بۆ ئەتینا دەردەبڕی

ئودیسیوسی زاناوچارەسازو بەردەبار وەلامی دایەوە: "خواوەندا، پیاو چەند زیرەك‌وزەین روون‌و پڕ حیکمەت بێ، کە تۆ دەبینێ، ئەستەمە بتناسێتەوە،چونکە تۆ خۆت بە هەموو شێوەیەك دەگۆڕی، دەچێتە پێست‌وکلێشەی هەرکەسێکەوە کە بتەوێ. من زۆر چاك دەزانم، کە جاران، کاتێ ئێمەی کوڕانی ئاخیایی، لە دەڤەری تەروادەدا شەڕمان دەکرد، یەجگار سازگار بووی دەگەڵما. بەلام دوای ئەوەی شارە بەرزەکەی (پریام)مان گرت، وێران‌وتالانمان کرد، سواری کەشتی بووین بگەڕێینەوە، یەکێك لە خواوەندەکان کوڕانی ئاخیایی پەرەوازەو پەڕاگەندەکرد. ئیدی لەوساوە، ئەی کیژی زیوس، من هەرگیز تۆم نەبینییەوەو هەستم نەکرد جارێك هاتبیتە سەر کەشتییەکەموله گرفتاری‌وئاریشانم رزگاربکەی‌و دڵم بدەیتەوەو خەمی دڵم بڕەوێنیتەوە. ئیدی بەو جۆرە وێڵ‌وسەرگەردان، دڵ پڕ لە کەسەرو ژان، ئاوارەو ماڵ وێران، بێهودە دەسوڕامەوە، تا خواوەندان فریام کەوتن‌و لە بەدبەختیان رزگارم کردم‌و گەییمە خاکی پڕ خێرو بەرەکەتی فیاسیان، وهەنگێ پەیدا بوویت‌و بە قسە خۆشەکانت لە ولاتی فیاسیاندا دڵخۆشیت دامەوەو بەخۆت رێی شارەکەیانت پێنیشان دام. جا ئێستا بە بابت سوێندت دەدەم —باوەڕ ناکەم گەییشتمە ئیتاکا، هەست دەکەم لە دەڤەرێکی دیکە دام‌و تۆ بە شۆخی‌وسوعبەتەوە ئەو قسانەم دەگەڵ دەکەیت، تا فریوم بدەیت‌وگاڵتەم پێبکەیت– راستیم پێ بڵێ ئاخۆ بەڕاستی بۆ ولاتی باب‌و باپیرانم هاتوومەتەوە؟

## ئەتینا، ئودیسیوس دڵنیا دەکات کە لە ولاتی خۆیدایە

ئەوسا، ئەتینا،خوابانۆی چاوگەش بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"بەڕاستی تۆ کەسێکی بە هەڵوێست‌ونەگۆڕی، خاوەنی قسەی خۆتی. بۆیە ناتوانم پشتت تێ بکەم، وبە کول‌وکۆڤانانت بسپێرم، چونکە تۆ کەسێکی هوشیارو بە ئاگاو دووربین‌و بەردەباریت. هەر پیاوێکی دی لە بری تۆبا، دوای گەڕانەوەی بۆ ولات، لە پاش ئەو هەموو بەسەرهات‌و دەردو مەینەتیانە حەزی دەکرد یەکسەر بڕواتە ماڵەوەو منداڵ‌و ژنەکەی دیتباو لەوانی دەپرسی. کەچی تۆ دەتەوێ تاقیب بکەیت‌وبزانیت ژنەکەت هەمان ژنی جارانە، شەوو رۆژ بەدەم خەم‌و پەژارەی دووری تۆوە، بەدەم فرمێسك رشتنەوە بەسەردەبات، ئەوسا لێی بپرسیتەوە.لێ سەبارەت بە من هەرگیز گومانم لە گەڕانەوەت نەبووە. لە دڵی خۆدا دەمزانی پاش ئەوەی هەر هەموو هاوڕێکانت لە دەست دەدەی، دوا بە یەکیان تیا دەچن، بۆ ولاتی خۆت دەگەڕێیتەوە. هەروەها نەمدەویست دژایەتی مامم،پۆسیدون بکەم.کە بۆیە رقی لە تۆ هەڵگرتبوو چونکە چاوی کوڕە ئازیزەکەی،

(سیکلۆپ پولیفیموس)ت دەرهێنا بوو. جا ئێستا وەرە با خاکی ئیتاکات نیشانبدەم تا دڵنیابیت کە بۆ وڵاتی خۆت گەڕاویتەوە. ئێرە بەندەری (فورسیس)ی پیرەمێری دەریایە. ئا هۆوەش، ئەوەی سەرەتای بەندەرەکەش دار زەیتونە بە بەرگ‌وبارەکەیە، ئەوەی سەرووی درەختەکەش، ئەشکەوتە قوڵە دڵگیرەکەیە، پەرستگەی ئەو پەریە دەریاییانەیە کە (نیادیس) یان پێدەڵێن. هەمان ئەو ئەشکەوتو پەرستگەیەیە کە تۆ لەوێدا قوربانی گەورەو بێ شومارت پێشکەش بە پەریانی دەریایی دەکرد. ئەمەش چیای چڕە دارستان‌وچوغووردی (نیریتونە)".

## ئودیسیوس لە نیادیس-ەکان دەپاڕێتەوە

خوابانۆ بەدەم ئەو قسانەوە تەم‌وهەورەکەی رەواندەوەو زەوی دەرکەوت. هەنگێ ئودیسیوسی رەنجدیدەو بە سەبرو بەردەبار، کە زانی لە خاکی وڵاتی خۆیدایە، لە خۆشیا دانەویەوەو خاکی بە فەڕو بەرەکەت‌و زادپەروەری ئیتاکای ماچ کرد. ئەوسا هەستا هەردوو باڵی کردەوە، رووی کرد پەریەکان‌و بەمجۆرە کەوتە نزاوپاڕانەوە:

"ئەی پەریانی نیادیس، ئەی کیژانی زیوس! هەرگیز باوەڕم نەدەکرد جارێکی دیکە دەتان بینمەوە، ئۆخەی وا جارێکی دی دەتان بینمەوە، خەنی لە خۆم وا ئەمجارەش بینیمنەوە، سڵاو لە دیدارتان، شەرت بێ بە شەرتی خوا، ئەگەر کیژی زیوس، فەراهەمکەری تاڵان‌ودەسکەوتان، بە دلۆڤانی خۆیم لەگەڵ بکات، عەمرم بدات کە کوڕە ئازیزەکەم بەخێو بکەم تا گەورە دەبێت، وەکو جاری جاران نەزرونیازتان بۆ بکەم، قوربانی‌ودیاریتان پێشکەش بکەم."

## ئەتینا تەگبیری باش بۆ ئودیسیوس دەکات

ئەتینا، خوابانۆی چاوگەش. بە خۆشییەوە بەرسڤی دایەوە:

"چاوو دڵت روون، ورەت بەرز بێ، دڵ لە دڵ مەدە. با ئێستا دارایی‌و دەسکەوتەکانت لە بنەبانی ئەشکەوتە موبارەکەکە تاقەت بکەین. چونکە ئەوێ زۆر ئەمینەو کەس دەستیان بۆ نابات. ئەوسا بیر بکەینەوەو نەخشەیەك دابنەین کە هەموو کاروبارەکان بە باشترین شێوە بەڕێوە بچن‌و بگەنە ئەنجام.

خوابانۆ بەدەم ئەو قسانەوە خۆی بە شکەفتە قووڵ‌و تاریکەکەدا کرد تا پەنایەك بۆ شتەکانی ئودیسیوس بدۆزێتەوە. لەو ماوەیەدا ئودیسیوس هەموو شتەکانی هێنا: زێڕ، برونزی بتەو، ئەو جلو بەرگە نایابانەی کە فیاسیەکان بە دیاری دابویانێ. پالاس ئەتینا، کیژی زیوسی سپەردار، هەر هەمووی بە جوانی لە پاڵ یەکدا دانا، وئەوسا تاوێرێکی بەزارکی شکەفتەکەوە نا. هەنگینێ بە جووتە لەبن دار زەیتونە موبارەکەکەدا دانیشتن، دەربارەی مەرگی خوازگارە قۆڕەدەماخ‌و خۆپەسندەکان قسانیان کرد. هەوەڵجار، ئائینا، خواوەندی چاوگەش، هاتە قسەو گوتی:

"ئەی کوڕی لایرتیس، ئەی زیوس زادە، ئەی ئودیسیوسی زرنگ‌وچارەسازو بەردەبار، بیرێك لەوە بکەوە چۆن خوازگارانی بێشەرم تەمبێ بکەی‌و بیانکەی بە پەندی زەمانە. سێ دانە ساڵە لە کۆشك‌و تەلارەکەی تۆدا تەراتێنیانە، خۆیان کردووە بە ئاغاو خاوەن ماڵ، چاویان بریوەتە ژنە نەجیب‌و داوێنپاك‌وخانەدانەکەت، پشی پشی بۆ دەکەن‌و دیاری‌و سەوقاتی پێشکەش دەکەن، و دەیانەوێ فریوی بدەن. بەڵام ئەو چاوبەگریان‌و دڵ بەژان، هەمیشە چاو لە رێی گەڕانەوەی تۆیە.

پەیکێك بۆ لای ئەم دەنێریۆو جوابێك بۆ ئەو، بە قسەی خۆش‌و بەڵێنی درۆ دەستی دەستیان پێدەکات، وشتێکی دی لە هزروبیری خۆیدا گەڵاڵە دەکات".

هەنگێ ئودیسیوسی زرنگ‌وبەردەبار بەرسڤی دایەوەوگوتی:

"واوەیلا بە حاڵم! کەواتە ئەی خوابانۆ ئەگەر تۆ فریام نەکەوتبای‌و هەموو شتێکت پێ نەگوتبام، ئەوا لە ماڵەکەی خۆمدا دەکوژرام‌و بە هەمان مەرەدوچارەنووسی ئاگامەمنون، کوڕی ئوتریوس، دەچووم. دەی سا ئێستاش نەچووە بچێ، رێیەکم بۆ دابنێ تا تۆڵەیان لێبستێنم. تۆ لەگەڵمدا بە، پشتم بگرە، وهەمان بێباکی‌و نەترسی ئەوسام بخە دڵ کە پەلاماری شورەو قوللەو قەلاّتانی تەروادەمان دەداو یەك یەك هەڵمان دەتەکاندودەمان روخاند. بەڵێ، ئەی خوابانۆی چاوگەش، ئەگەر تۆ بە هەمان گەرم‌وگوڕی، بە هەمان جۆش‌وخرۆشی ئەوسا، لایەنگریم لێبکەی، ئامادەم شەڕی سێ سەد شەڕڤانی دڕ بکەم، بەڵێ، ئەی خوابانۆی فەرمانڕەوا، ئەگەر تۆ حەزبکەیت‌و بە دڵ لایەنگیرم بیت."

## ئەتینا، شێوەی ئودیسیوس دەگۆڕێت

هەنگێ ئەتینا، خوابانۆی چاوگەش بەرسڤی دایەوەوگوتی: "دڵنیابە کە پشتیوانیت دەکەم‌و کە دەستمان دایە ئەو کارە دژوارو ئەستەمە چاوت لێ غافڵ ناکەم. لە ئێستاشەوە لەبەرچاومە چۆن خوێن‌ومێشکی ئەو خوازگارانەی کە ماڵی تۆ بە نەهەق دەخۆن‌و تەخشان‌و پەخشانی دەکەن، و بەسەر زەوی بەریندا دەڕژێ‌ودەپژێت. بە هەرحاڵ، باواز لەم قسانە بێنین، دەی ئێستا وەرە با شێوەت بە جۆرێ بگۆڕم کە کەس نەتناسێتەوە. پێستی نەرم‌وجوانت بەسەر بەدەنی چوست‌و چالاکتەوە چرچ‌ولۆچ دەکەم، قژە زەردەکەت دەوەرێنم، جلێکی شڕوشپڕێوی ئەوتۆت لەبەر دەکەم، هەر کەسێ بت بینێ قێزت لێبکاتەوە، چاوە جوانەکانت، بە جۆرێ کزوپروش دەکەم کە یەجگار ناشیرین‌و بێ نموود بێیتە بەرچاوی خوازگارەکان. تەنانەت ژن‌و کوڕەکەشت. ئیدی هەوەڵجار بڕۆ بۆ لای بەرازەوانەکەت، وەکو جاری جاران دڵسۆزی تۆیە، رێزو حورمەتی کوڕەکەت‌وپنلوپی ئاقڵ‌و ئاغری لەلایە، بە دڵ‌وبەگیان بەرازەکانت بە خێو دەکات. ئێستا لە دەوروبەری تاوێرەکانی کوراکس، ولە نزیکی سەرچاوەی ئاریتوزدا بە دیار بەرازەکانتەوەیە کە بە کەیفی خۆ ناسکە بەڕوو دەخۆن‌و ئاوی گەوارا، دەخۆنەوە، کە ئەمە مایەی قەڵەو بوونی بەرازانە.

بچۆ بۆ ئەوێندەرو بەلای بەرازەوانەکەوە دانیشەو پرسیاری هەموو شتێکی لێبکە. منیش ئەی ئودیسیوس، بەرەو ئەسپارتەی مەڵبەندی ژنانی جوان دەڕۆم، تا تیلیماخۆسی کوڕت بانگ بکەمەوە. چونکە چووە بۆ لاسیدیمون، بۆ لای مینیلاوس تا هەواڵێك لە تۆوە بزانێ کە ئاخۆ هێشتا لە ژیاندایت، یان نا."

## ئەتینا، ئودیسیوس لە سەلامەتی کوڕەکەی ئەرخایەن دەکات

ئودیسیوسی بەردەباروفرەزان، بەرسڤی دایەوەوگوتی:

"باشه بۆچی هەموو شتێکت پێ نەگوتووە، خۆ تۆ عالم بە هەموو شتێکی؟ یانی قەدەر وای لە چارەنووسیوە کە ئەو بەسەر دەریای نەسرەوتەوە وێڵوسەرگەردانو رەنجەڕۆ بێت، وخەڵکی دیکە بە خوتو خۆڕایی ماڵی بە فیڕۆ بدەنوبخۆن؟
ئەتینا،خوابانۆی چاوگەش بەرسڤی دایەوە:
"زۆر لە خەمی ئەودا مەبە، هیچ خەمت نەبێ، من بۆ ئەوێندەرم ڤڕێ کردووە، تا هەواڵی خۆشی دەست بکەوێ. هیچ زەحمەتێك ناکێشێت، تووشی هیچ ناخۆشیەك نابێت. لە کۆشكوتەلارەکەی کوڕی ئاتریوسدا، بێ خەموخەیاڵ لێی دانیشتووەو، لەوپەڕی نازونیعمەتدا دەژی.
ئەوی راستی بێ، کۆمەڵێك لە خوازگارانی گەنج بە سواری کەشتییەکی بۆر چوونەتە سەر رێگەیو خۆیان بۆ لە بۆسە ناوە، تا لە گەڕانەوەدا بۆ وڵات، دەرفەتی لێ بێننوبیکوژن. بەڵام پێم وایە، گەلێك لەو خوازگارانەی کە بەناهەق ماڵی تۆ دەخۆنو بە فیڕۆی دەدەن، بەر لەوەی فریای ئەم کارە بکەون، ئەو ئاواتەیان دەبەنە ژێر گڵەوەو گڵ چاویان تێردەکات."

## ئەتینا، ئودیسیوس مەسخ دەکات

ئەتینا کە لە قسەکانی بووەوە، گۆچانەکەی بەسەراپای ئودیسیوس دا هێنا. پێستی ناسكو نەرمی بەسەر بەدەنی چوستوچەڵەنگییەوە چرچو لۆچ کرد. قژە زەردەکەی یەکپارچە هەڵوەریو قژ بەسەریەوە نەما.خستییە پێستی کابرایەکی پیری کەنەفتەوە، چاوەکانی، کە جاران زۆر جوان بوو، لێڵوتاریكو کزوپروش کرد. لە جیاتی جلەکانی خۆی، کراسوعەبایەکی شڕوشەپڕێوی چڵكنوپڵكنی، دووکەڵاوی لەبەرکرد، وئەوسا کەوڵێکی تووك وەریوی دەڵبی، حەیوانە کێویەکی خۆشبەزی دا بەشانیا. گۆپاڵوتورەکەیەکی ناهەمواری کون کونی دەسك پرزۆڵ پرزۆڵی دایەوە دەستی، کورم دەویست ئودیسیوس بناسێتەوە.
دوای ئەوەی هەردووکیان لەسەر ئەم نەخشەو تەگبیرە رێککەوتن، لێکدی جیا بوونەوە. ئەوسا خوابانۆ، بەرەو لاسیدیمونی رەخشان رۆیی تا کوڕەکەی ئودیسیوس بێنێتەوە.

***

<u>پەراوێز:</u>

*- ئاریتی: ژنی ئالسینویوسی سەرداری فیاسیانو، دایکی ناوسیکایە.
*- نیادیس: ئەمانە کیژی زیوسن، پەرین. لە کانیو سەرچاوەو نافورەو روبارو دەریاچان مەسئولن، خەڵقەندەی هەمیشە رووخۆشو دەم بە خەندەن. زۆریان بە هرەی شیفابەخشیو نجومگەریان هەیەو دەکارن ئەم بەهرەو بەرەکەتانە بە هەر کەسێك بدەن کە لە ئاوی وان بخواتەوە.
*- ئیدومینیوس: پاشای کریتە،کوڕی دیوکالیونی کریتییە. یەکێك بوو لە شەڕڤانە نەبەزەکانی شەڕی تەروادە. کە لە گەڕانەوەدا تووشی زریانێکی بەترەف بوو بوو. سوێندی بۆ پۆسیدون خواردبوو کە ئەگەر بە سەلامەتی رزگاربێتو بگاتەوە نیشتمان، یەکەمجار تووشی هەر شتێك بێت، سەری ببڕێو بۆ پۆسیدونی بکات بە قوربانی. بە رێکەوت تووشی کوڕەکەی خۆی دەبێت، لە سوێندەکەی خۆی ژێوان نابێتەوەو کوڕەکەی سەر دەبڕێ.دوای ئەوەی کریت تووشی قاتیو

قڕی دەبێت.کریتییەکان شار بەدەری دەکەن. بەرەو ئیتاليا سەری خۆی هەڵدەگرێتو لە کالابریا ئاکنجی دەبێتودەژی.

*- ئاریتوزا: نافورەیەکە لە ئورتیجیا.بە گوێرەی ئەفسانان ئالفیوس، خواوەندی روبار، کە رۆژێ چاوی بە پەرییەك بە نێوی ئاریتوزا دەکەوێت خەریکە لە ئاوەکەیدا مەلە دەکات. حەزی لێدەکاو شەیدای دەبێت. بەڵام ئاریتوزا ئاوڕی لێناداتەوەو بەرەو ئورتیجیا دەڕوات. ئارتیمیسی خوابانۆ لەوێندەر مەسخی دەکاتودەیکات بە نافورەیەك،لێ ئالفیوس هەر دەستبەردار نابێت. بە ژێر دەریادا دەڕوات وتێکەڵ بە نافورەکە دەبێتو سەرچاوەی نافورەو کانیەکە بە ئاوەڕۆی خۆیەوە دەبەستێو بەو جۆرە یەکانگیر دەبن. بۆیە کاتی خۆی باوەڕێکی باو هەبوو، کە پەیوەندیەکی راستەقینە لە نێوان روباروسەرچاوەوکانیو نافورەدا هەیە.

## سروودی چواردەیەم

### کورتەی سروودەکە:

شوێن، کوختەکەی (یومایوس)ـە، ئودیسیوس دەگاتە ئەوێندەر. یارۆی بەرازەوان، خواردن بۆ ئودیسیوس ئامادە دەکات. گلەیی لە دەست خوازگارەکان دەکات،وداخی ئەوە دەخوات کە ئاغای هێشتا نەگەڕاوەتەوە. کابرای میوان (ئودیسیوس) بە دڵنیاییەوە پێی دەڵێت کە ئودیسیوس بەو زووانە دەگەڕێتەوە.لێ یارۆی پیرەمێرد (بەرازەوانەکە) باوەڕ بە قسەو سوێندی یارۆی میوان ناکات. هەنگێ ئودیسیوس، چیرۆکێکی نیمچە خەیاڵی‌ونیمچە راستی، دەربارەی بەسەرهاتەکانی خۆی بۆ دەگێڕێتەوەو وا دەنوێنێ کە خەبەری لە هاتنەوەی ئودیسیوسی ئاغای یومایوس هەیە. جارێکی دی یومایوس باوەڕی بە قسەی کابرای میوان نایەت، وکابرای میوان دڵنیای دەکات کە راست دەکات. ئیدی شوانکاران لە دەشت‌و دەرو لەوەڕگان دەگەڕێنەوە. یومایوس، بەرازێك بۆ شیو دەکوژێتەوەو باوکانە رەفتارە دەکات. کە دنیا ساردی دەکات، ئودیسیوس، سەری چیرۆکێکی خەیاڵی دادەمەزرێنێ‌و دەیەوێ دڵی بەرازەوانەکە نەرم بکات، و نوێنێکی گەرمی بۆ قەتاندنی شەوێ بداتێ.

***

### ئودیسیوس بەرازەوانەکەی دەدۆزێتەوە

ئودیسیوس کە لە بەندەرەکە وەڕێکەوت، ملی رێگەیەکی سەختی بەردەڵانی گرت‌و بە نێو بێشەیەکی چڕە دارستانداو بە هەورازێکی بەرزا هەڵگەڕا. رووی کردە ئەو شوێنەی کە ئەتینا، ناونیشانەکەی بۆ هەڵدا بوو، کە گوایە نشیمەنی بەرازەوانە وەفادارو دڵسۆزەکەی ئەوە. ئەم بەرازەوانە لە هەر هەموو خولاموخزمەتکارو دەستو پێوەندەکانی دیکەی ئودیسیوس، دڵسۆزترو بە ئەمەك تر بوو، بەدڵ‌و بەگیانی پارێزگاری لە ماڵ‌و دارایی ئاغای خۆی دەکرد. ئودیسیوس کە گەییە ئەوێندەر سەیری کرد لەبەر کوختەکەیداو لە شوێنێکی بەرزا، کە لە دوورەوە ببینرێ، لە نزیکی حەوشەو حەسارێکی گەورەدا دانیشتووە. یارۆی بەرازەوان، بەخۆی، دوای رۆییشتنی ئاغای، ئەم حەوشەو حەسارانەی بە ئانقەست گەورەو بەرین دروست کردبوو، تا بەرازەکان بە ئاسانی بەناویا ڕاکەڕاك بکەن. بەڵێ لە غیابی ئاغایدا، بەبێ ئەوەی هیچ پرسێك بە پنلوپی یان لایرتیس بکات، بە بەردوکەڤری زەلام ئەم حەوش‌وحەسارەی دروست کردبوو. شورەیەکی بازنەیی بە دەورا کێشا بوو، ولەسەر دیوارەکەوە بە چڤڵودڕوان تەیمانێکی بۆ دروست کردبوو، لە دەرەوەی حەوشەو حەسارەکەدا،وبە چوار دەوریا، کۆمەڵێك سنگی ئەستوری لە دار بەڕوو

دروستکراوی، وەکو تەیمان بەڕیزو لە نزیکی یەکتر داکوتا بوو. لە حەوشەکەدا، دوانزە ئاغەڵی لە ریزی یەکەوە بۆ بەرازەکان دروستکردبوو. هەر ئاغەڵێك پەنجا مالۆسی تێکردبوو، ئەم مالۆسانە زابوون‌و بێچویان هەبوو. بەڵام یەکانەکان لە دەرێی ئاغەڵەکان دەخەوتن، ژمارەی یەکانەکان زۆر لە مالۆسەکان کەمتر بوو. چونکە یەکانەکان بۆ خوازگارەکان دەکوژرانەوەو ژمارەیان کەم دەبووەوە. بەرازەوانەکە بە بەردەوامی باشترین بەرازی قەڵەوودابەستەی بۆ دەناردن. بۆیە تەنیا سیٚ سەدو شەست یەکانە مابوونەوە. چوار سەگی دڕی دڕندە ئاسا کە بەرازەوانەکە بە خۆی پەروەردەی کردبوون، هەمیشە بە دیار بەرازەکانەوە بوون‌و پاسیان دەکردن. لەو کاتەدا کە ئودیسیوس هات، یومایوسی بەرازەوان دانیشتبوو، چەرمێکی خۆشەکراوی گای بە دەستەوە بوو، وپێتاوی بۆ خۆی دروست دەکرد. شاگردەکانی کە چوار کەس بوون، سیانیان هەریەکەو رەوە بەرازێکیان بەلایەکدا بۆ لەوەڕ بردبوو، یومایوس، چوارەمیانی بۆ شار ناردبوو. چونکە چاری ناچار بوو، دەبوایە یەکانەیەك بۆ خوازەگارە خۆپەسندەکان ببات، تا بیکوژنەوەو بیکەن بە بەزم‌و سوورو سکی خۆیانی پیٚ تێربکەن.

## بەرازەوانەکە، ئودیسیوس لە سەگەکان دەپارێزیٚ

کە سەگەکان، چاویان بە ئودیسیوس کەوت، بە گەفە گەف‌وحەپ‌و هۆر، تاویان دایە‌.لیٚ ئودیسیوس زیرەکی کرد، یەکسەر لەجێی خۆی دانیشت‌و گۆپاڵەکەی نایە عاردی. ئەگەر وای نەکردبا لەگێن بوو، لەویٚ‌و بە بەرچاوی بەرازەوانەکەی خۆیەوە، شەبەقی برینێکی گەورەی تیٚ بکەن‌و لایەکی هەڵدڕن. بەڵام بەرازەوانەکە، بە هەشتاو غاری دا، چەرمەکەی لە دەست کەوت. بانگی لە سەگەکانی کرد، بە بەردەباران لە یارۆی دوور خستنەوە.و رووی کردە ئاغاکەی خۆی‌و گوتی: "پیرەمێرد، لەزگ بوو سەگەکان هەڵتبدڕن. زۆر لە ناکاودا تاویان دایتیٚ... خوا رەحمی کرد، دەنا بەسەر مندا ساغ دەبوویتەوە. خۆم خەمم کەم بوو، خەمی تۆشم بەملدا دەهات. خواوەندان مسیبەتێکی وەهایان بەسەردا داوم کێو لە بن دێنیٚ. ئاغایەکم لە کیس چووە، وێنەی نەبووەو نابێتەوە. هەرچەند بیرم دەکەوێتەوە کزە لە جەرگم هەڵدەستیٚ،و وەکو بارانی بوهار فرمێسکم لە چاو دەباریٚ. من لێرە بەرازەکانی ئەو بەخێو دەکەم. قەڵەویان دەکەم، کە بێگانان بیخۆن، وئەویش، ئەگەر لە ژیاندا مابیٚ، ئێستا لە غەریباتی‌و لە نێو قەومێن نەناس‌و بێگانەدا، وێڵ‌و سەرگەردان عەزرەتی پاروە خواردنێکە. بە هەرحاڵ، پیرەمێرد، با بچینە کوختەکەی من، خواردن‌و بادەت دەدەمیٚ. کە تێرو پڕت خواردو خواردەوە هەنگیٚ پێم بڵیٚ لە کوێوە هاتوویت،و چیت بەسەر هاتووەوچیت لێقەوماوە.

## بەرازەوانەکە

## لە کوختەکەی خۆیدا میوانداری ئودیسیوس دەکات

بەرازەوانەکە بەدەم ئەو قسانەوە میوانەکەی بۆ ناو کوختەکەی برد. بردیە ژوورەوە، وردە گەڵاو ناسکە چڵ‌وچێوی بۆ راخست‌و کەوڵێکی ئەستووری توکنی بزنە کێوی بەسەردا راخست، کە

بەخۆی لەسەری دەخەوت. یومایوس، یارۆی بێگانەی لەسەر ئەو جێگایە دانیشاند. ئودیسیوس کە زۆر بەو پێشوازییە گەرموگوڕە خۆشحاڵ بوو، هەڵیدایەوگوتی:

"ماڵخۆ، یاخوا بەو دوعایە بی کە من بۆت دەکەم. لە زیوس و هەموو خواوەندەکانی دی دەپاڕێمەوە بە هەموو مرازێکت بگەیت، مادامێکی بەو گەرمو گوڕیە پێشوازی من دەکەیت."

یومایوسی بەرازەوان بەرسڤی دایەوەوگوتی:

"غەریبۆ، ئەو قسانە مەکە، ئەگەر کەسێکی زۆر لە تۆ بێنەواتریش روو بکاتە ئێرە، لەسەرمە پێشوازی بکەم. ئەمە داب‌ونەریتی میواندارییە، چونکە غەریب‌و رێبواران، سەرگەردان‌و لێقەوامان، میوان‌و خۆشەویستی زیوسن. بۆیە لەسەرمانە پێشوازیان بکەین. بەڵام داوای بوردن دەکەم، کە نان‌و خوانەکەم نانی خەجاڵەتیە. ئیدی ئێمە شوانین، دیاریی شوانیش شنگە یان ئاڵەکۆك. زەمان‌و رۆژگاری سەربەرزی و فەریحی رۆیی، بەسەرچوو. واوەیلا بە حاڵی ئەو رەنجبەرو خولامەی دەکەوێتە بەر دەستی کۆڵکە ئاغاو فەرخە میرانی وەکو ئەمانەی ئێمە. رێك ئەمە لە من روویداوە. ئیدی بۆ نەگبەتی‌و بەدبەختی من، ئاغایەکم هەبوو، رۆیی‌و نەگەڕایەوە. بەڕاستی لە من چوو، چونکە خۆشی دەویستم، رێزی دەگرتم، لە دەستی دەهات موڵك‌و ماڵم بداتێ، خانووم بۆ بکات، ژنێکی جوانم بۆ بێنێ، وەکو هەر ئاغایەکی دلۆڤان‌وباش، رەنج‌و دڵسۆزی رەنجبەری خۆی لەبەر چاوبێ‌و پاداشتی بداتەوە .ئەو رەنجبەرو خولامانەی کە خواوەند دەست بە باڵیانەوە دەگرێ‌و لە کارەکانیاندا سەرکەوتوویان دەکات. وەکو من کە خواوەندان ئەمەیان دەگەڵ کردووم‌و بەرەکەتیان خستووەتە کارەکانمەوە. جا ئەگەر من شانسم هەبوایەو ئاغام تەمەنی لێرە، لە ماڵی خۆی ببردایەتە سەر، لە سایەی ئەودا دەوڵەمەند دەبووم‌و دەبووم بە خاوەنی زۆر شت‌و نەیدەهێشت پێویستم بە هیچ شتێك ببێ. بەڵام حەیفێ رۆیی، لە من چوو. خۆزگە توخم‌و تۆوی هەموو کەس‌وکاری هیلین دەبڕایەوە. چونکە ئەو ژنە بووە باعیسی مەرگی جەنگاوەرانێکی یەجگار زۆر! ئاغای منیش هەر بەو مەسەلەیەوەو بە مەبەستی تۆڵە ئەستنەوەی ئاگامەمنون، بەرەو ئیلیوس، مەڵبەندوپەروەرشتگەی ئەسپانی جوان رۆیی تا شەڕی تەروادەییان بکات.

## یومایوس رێزی ئودیسیوس دەگرێت‌و باسی ئاغاکەی بۆ دەکات

بەدەم ئەو قسانەوە، کەمەربەندەکەی، بەسەر چاکەتەکەیەوە لە پشت بەست، وئەوسا چوو بۆ یەکێك لەو ئاغەڵانەی کە پڕ بوو لە بێچوە بەراز. جووتێکی لێ هەڵبژارد، هێنانی‌و کوشتنیەوە. ئەوجا پارچە پارچەی کردن، لە شیشی دان‌و نانیە سەر ئاگر. کە هەمووی برژاند، هەر بە شیشەکانەوە هێنای‌و بە گەرمی نایە بەردەست ئودیسیوس. ئاردی جۆ سپی پێوە پرژاند، بادەیەکی بە تامی هەنگوین ئاسای لە گلێنەیەکدا گرتەوەو هەنگێ لە هەنبەر کاورای غەریب دانیشت‌و بەمجۆرە خوڵکی کردوکەوتە قسە:

"فەرموو کاکی غەریب! دەست راکێشە، ئیدی ئەمە نان‌وخوانی خزمەتکارو خولامانە. بریتییە لە گۆشتی بێچووە بەراز، بەرازی دابەستەو قەڵەو بۆ خوازگاران دەنێردرێ. ئەوان بێ هیچ شەرم‌و شورەییەك، بێ ئەوەی زەرەیەك خۆف خوایان لە دڵدا بێ، تۆزقاڵێك سۆزو بەزەییان لە دڵدا بێ،

دەیخۆن! غافڵن لەوەی کە خواوەندانی موبارەك‌و جاویدان بەدڕەفتاریان پێ خۆش نیە. دادپەروەران‌و چاکەکاران سەرفرازدەکەن. تەنانەت دژمنانی دڵڕەق، ئەوانەی پەلاماری وڵاتی خەڵکی دەدەن‌ودەیگرن، زیوس ڕێگەیان دەدا تالاّن‌و بڕۆبکەن، و بە کەشتی پڕ لە دەسکەوتی تالاّنییەوە بۆ وڵاتی خۆ بگەڕێنەوە، ترسێکی گەورەیان لە دڵدایە، ولە ناخا لە قاروغەزەبی خواوەندان دەترسن، بەڵام ئەمانە، ئەم خوازگارە بێ چاووئابڕوانە لێرە دایان کوتاوەو هەر مێشیش میوانیان نیە. کە تەماشات دەکەن، پێدەچێ شتێك بزانن، بانگێکی خواییان بەرگوێ کەوتبێ کە ئاغام بە داخ‌و کەسەرو سوێوە مردبێ. بۆیە لێبڕاون نەك هەر ژنەکەی فریو بدەن‌و بڕۆنەوە بۆ ماڵی خۆیان، بەڵکو هەرچی دارایی‌وسەروەت‌و سامانێکیشی هەیە، بەوپەڕی بێ شەرمی‌و گۆساخی بەفیڕۆی بدەن‌وگسکی لێبدەن. شەوو ڕۆژ نیە، قوربانییەك‌و دووان وسیان نەکوژنەوەو نەیکەن بە بەزمو سوور، و بادەو بەزم‌وخواردنەوە ئەوە هەر باسی مەکە. بە جۆرێ سەریان تێکردووە هاکا تەواویان کردو چۆڕبڕ بوو. یانی ئاغام یەجگار دەوڵەمەندەو فرە زەنگین بوو. سەروەت‌وسامانی لە حیساب نەدەهات. کەس نە لە جیهانداو نە لە ئیتاکادا بە ئەندازەی ئەو دەوڵەمەند نەبوو. بە تاقی تەنیا بە قەد بیست قارەمان موڵك‌وماڵ‌و پەزومالاّتی هەبوو. گوێ بگرە با بۆتی بژمێرم: دوانزە گاگەلی لە دەشتا هەبوو، دوانزە مێگەل پەز، دوانزە ڕەوە بەراز، دوانزە مێگەلە بزن کە شوانانی بێگانەو خۆماڵی بەخێویان دەکردن‌و دەیان لەوەڕاندن. لێرەش، یازدە مێگەلە بزنی دی هەن کە لەوپەڕی دوڕگەکەدا دەلەوەڕن، وپیاوانی ئازموودەو جێ متمانە سەرپەرشتیان دەکەن. هەریەکێك لەو پیاوانە، بە بەردەوامی، وڕۆژ بە ڕۆژ، قەڵەوترین بزنی ناو مێگەلەکەی بۆ خوازگارەکان دەبات. منیش کە ئەم بەرازانە بە خێو دەکەم‌و پەرستاری‌و تیماریان دەکەم، هەموو ڕۆژێ زۆر بە دیقەت، باشترین یەکانە هەڵدەبژێرم‌و بۆیان دەنێرم."

## ئودیسیوس زیاتر بەرازەوانەکە دەجوڵێنێ...

یومایوس ئەو قسانەی دەکرد،ویارۆی غەریبیش کڕوکپ، متەقی لە خۆ بڕی بوو، و بە تاسوقەوە ملی بە گۆشتی برژاوو بادەی ئاڵەوە نابوو، ولە دڵی خۆیدا بیری لەوە دەکردەوە چۆن خوازگارەکان لە ناو بەرێت‌و بە زەبری شمشێران بیان کات بە پەندی زەمانە. پاش ئەوەی تێرو پڕی خواردوخواردەوە. ئەوسا یومایوس جامەکەی خۆی، ئەو جامەی کە هەمیشە پێی دەخواردەوە،لە مەی تەژی کردو پێشکەش بە ئودیسیوسی کرد، لێی وەرگرت‌و لە دڵی خۆیدا زۆری پێ شادبوو. ئەوسا ڕووی تێکردوگوتی:

"هاوڕێ، ئەو پیاوە فرە زەنگین‌و بەهێزەی کە تۆی کڕیوەو لە موڵك‌وماڵ‌و دارایی خۆی بەهاکەی داوی کێیە؟ وتت لەگەڵ ئاگامەمنون دا چووەتە شەڕی تەروادەو لە پێناوی ئەودا تیا چووەو کوژراوە. ئەو چیرۆکەم بۆ بگێڕەوەو ناوەکەیم پێبڵێ، لەوەیە من بیناسم. چونکە پێموایە زیوس و خواوەندانی دیکەش دەزانن کە ئاخۆ من دیتوومە یان نا. گەر من ئەوم دیبێ، هەنگێ دەتوانم هەواڵێکیت بدەمێ، چونکە من زۆر وڵات‌وجێیانی دوورگەڕاوم!"

## یومایوس بە شانوباڵی ئاغاکەیدا هەڵدەدا

هـەنگیٚ گـەورەی بەرازەوانـەکان (یومـایوس) هەڵیدایـەوگوتی: "پیرەمێـر، هـیچ کەسـێك، چـەند زۆریش گەڕابیٚ، تا ئێستا نەیتوانیوە خەبەرێکی راستو دروستمان لە بارەیـەوە بداتیٚ. یـان ژنو کوڕە ئازیزەکەی دڵنیا بکات کە هێشتا زندووە. هەرچییەك دەڵێن هـەر قسـەی رووتـەو هیچـی تـر. هەر هەردەگێڵیٚ رێی دەکەوێتە ئەم دەڤەرەو پێویستی بە نانو ئیسراحەت دەبیٚ، بۆ ئـەوەی دای بکەینو خزمەتی بکەین، بیٚ شەرمانە درۆمان بۆ هەڵدەرێژنو دوورونزیك توخنی راستی ناکـەون. هەرکەسـێکیش لـە رێگـەی دەریـاوە دێتودەگاتـە ئیتاکـا، یەکڕاسـت بـۆ لای شـابانۆ دەچـێتو کۆمەڵێك درۆی باڵداری بۆ هەڵدەرێژێت. ئەویش پێشوازییەکی گـەرمی دەکات. خوانێکی باشـی بـۆ دەڕازێنێتـەوەو، مینـاکی هـەر ژنێـك کـە مێردەکـەی لـە غـەریباتی مردبـیٚ، بـەدەم فرمێسـكو گریانەوە، هەزارویەك پرسیاری لێدەکاتوجا تۆش پیرەمێرد، بۆی هەیە وەکو هـەر یـەکێك لەوانـە چیرۆکێك لە خەیاڵدانی خۆتەوە هەڵرێـژیت، تـا عـەباو کراسـێکی پـیٚ وەرگریتو خـۆت پۆشـتەو پـەرداخ بکەیتـەوە. بـەڵام ئاغـام، لـەوە دەچـیٚ لـە مێـژ بـیٚ کسـۆکانو داڵاشـێن تیـژباڵ گۆشـتیان خـواردبیٚو هـەر ئێسـقانی مابێتـەوە و روحو گیـانی لەبـەر بڕابێـت، یـان ماسـی لـە بەحرانـدا خواردبێتیان، وئێسقانەکانی لە کەناری دەریاکەدا وەبن زیخو لمان کەوتبیٚ. بەو جۆرە لەوێندەر تیا چووە، وخـەمو پـەژارەی بۆ کەسوکاروهەموو دۆستانی، بـە تایبـەتی بـۆ مـن بـە جێهێشـتووە. چونکە من جارێکی دی، لە هیچ شوێنێکدا، تەنانەت لە ماڵی داكو بابی خۆمیشدا، کە لەوێندەر هاتوومە دنیاو، ئەوان بە خێویان کردوم، ئاغای وا دلۆڤانودلاوا نابینمـەوە. ئەوەنـدەی بەخـەمی ئەوەوەمو بۆ ئـەو دەگریم، ئەوەنـدە بـە خـەمی داكوبابمـەوە نـیم. هەرچـەندە بیریـان دەکـەمو حـەز دەکـەم لـە وڵاتـی خـۆدابم. بـەڵام زیـاتر بیری ئودیسیوسـی رەحمـەتی دەکـەمو خـەمبارو پـەرۆشـی ئـەوم. ئـەی غـەریبۆ مـن هەرچـەندە ئاغـام خـۆی لێـرە نیـە، لـە ناومانـدا نیـە، بـەڵام مـن بـەرێزو حورمەتەوە ناوی دەبەم. چونکە ئەو بـە دڵ لـە خـەمی منـدا بـوو، لـە هـەموو ئـەوانی دی خۆشـتری دەویستم. من هەمیشە، چەند لێشمەوە دووربیٚ، بە سەروەری گەورەم ناوی دەبەم!".

## ئودیسیوس سوێند بۆ بەرازەوانەکە دەخوات کە ئاغای دەگەڕێتەوە

هەنگیٚ ئودیسیوسی بەردەباروچارەساز بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"دۆستی ئازیز! تۆ بۆیە سووری لەسەر ئەوەی کە ئودیسیوس جارێکی دی ناگەڕێتـەوە، چونکە بە خۆت پیاوێکی بە گومانیودێرباوەڕی. بە هەرحاڵ من دڵنیات دەکەم،وسوێندت بـۆ دەخـۆم کـە ئودیسـیوس دەگەڕێتـەوە. هـیچ مژدانەیەکیشـم نـاویٚ تـا ئـەو رۆژەی کـە دێتـەوەو دەگاتـەوە نـاو ماڵەکـەی خـۆی. هـەنگیٚ کـراسو عەبایـەکی زۆر نایـابم بـدەنیٚ. بـەڵام پـێش ئـەوە، چـەندیش پێویسـتیم پێـی بـیٚ وەری نـاگرم. چـونکە هـەر کەسـێك هـەژاری وای لێبکـات، لـە پێنـاوی هـەر دەسـکەوتێکا، بکەوێتـە درۆ هەڵڕشـتن، بـەلای منـەوە لـە هادیسودەرگاوانـەکانی هـادیس کـە بـە بیـانووی دەسـتکورتی درۆیـان هەڵدەرێـژن، قێزەوەرتـرە. جـا مـن لـە پـێش هـەموو خواوەنـدەکانی تـرەوە بـە زیـوس، بـەم نانونمەکـە، بـەم وەچـاخوکوانووەی ئودیسیوسـی بێگونـاحو خانـەدان، کـە ئێسـتا رێـم تێیکـەوتووە، سـوێند دەخـۆم، ئـەوەی پـێتی دەڵـێم دێتـە دی: لـە زەرڤ ئـەم سـاڵدا

ئودیسیوس دەگەڕێتەوە. لە کۆتایی ئەم مانگەو سەرەتای هەیڤی داهاتوودا دەگەڕێتەوە سەر ماڵوحاڵی خۆیو تۆڵە لە هەر هەموو ئەوانە دەکاتەوە کە بەدرەفتاریو بێ ڕێزیان دەرهەق بە ژنەکەیو کوڕە سەربەرزەکەی کردووە".

## یومایوس باوەڕ بە قسەکانی ئودیسیوس ناکات

ئەی یومایوسی بەرازەوان، لە وەڵامی ئەو قسەیەدا پێت گوت:

"ئەی پیرەمێر! من ئامادە نیم لە بری ئەم مژدەو خۆشخەبەریەت، هیچ مژدانەیەکت بدەمێو (ئودیسیوس)ش جارێکی دی ناگەڕێتەوە ماڵی خۆی. نەخێر، ئەزبەنی ناگەڕێتەوە. بادەی خۆت بخورەوەو با بیر لە شتی دی بکەینەوە. باسی رابردووم بۆ مەکە، رابردووم وەبیر مەیەنەوە، چونکە کە گوێم لە باسی ئاغا دلۆڤانودڵاواکەم دەبێت، زۆر خەمباروپەریشان دەبم. دڵم دەگوشرێت. سوێندو پەیمانەکەت بە جێی خۆی. خواوەندان لە زارت بنۆڕن، هیوادارم ئودیسیوس بگەڕێتەوە، وەکو چۆن پینلوپی،ولایرتیسی پیرەمێرد،و تیلماخۆسی خواوەندئاسا، هیواداروچاوەڕوانن. من ئێستا خەمی (تیلماخۆس)ی کوڕی (ئودیسیوس)مە، بەڕاستی نیگەرانی ئەوم.خواوەندان ئاگاداری بن، بە جۆرێ هەڵیداوە هەر دەڵێی شلکە نەمامی خۆڕسکە. من دەڵێم لە نێو خەڵكوخوادا هیچی لە بابە رەسەنو خانەدانەکەی کەمتر نابێت، لە بەژنو باڵاو سەرو سیمادا بەشی کەسی نەهێشتووەتەوە. بەڵام پێدەچێ کەسێك یان خواوەندێك چووبێتە بن کلێشەیەوەو برێك هزرو بیرو دڵو دەروونی شێواندبێ. چووە بۆ پیلوسی موبارەك تا سۆراخێکی بابی بکات، وهەواڵێکی بزانێ،وخوازگارانی نەزانو خۆپەسندش بۆسەیان بۆ ناوەتەوە کە گوایە لە گەڕانەوەیدا بۆ وڵات، بیکوژن. تا تۆوی بنەماڵەی ئارکیسیوسی خواوەندئاسا، ببڕنەوەو ناوو ناوبانگیان لە ئیتاکادا بسڕنەوەو کوێربکەنەوە. بە هەرحاڵ با واز لە باسی ئەو بێنین. لەوەیە کەوتبێتە داوەوە! یان لەوەشە کوڕەکەی کرونوس فریای کەوتبێو رزگاری کردبێت. ئێستا، تۆ ئەی پیرەمێر، وەرە باسی سەربوردوواریقاتوبەسەرهاتی خۆتم بۆ بکە، ڕێكوراست هەرچیت هەیە بۆمی بگێڕەوە، تابزانم تۆ کێی؟ لە کوێوە دێی؟ خەڵکی چ شارێکیو بابو داکت کێن؟ بە چ کەشتییەك بۆ ئێرە هاتووی؟ دەریاوانەکان چۆن تۆیان بۆ ئیتاکا هێناوەو، کێ بوون؟ چونکە باوەڕ ناکەم تۆ بە پێی خۆت بۆ ئێرە هاتبیت."

## ئودیسیوس بەسەرهاتی خۆی بۆ بەرازەوانەکە دەگێڕێتەوە

ئودیسیوسی ژیر وەڵامی دایەوە: "بەسەرهاتی من دووروودرێژە، ئەگەر بە دوو قۆڵی لەم کوختەدا دانیشین،وباسی ئەو چەرمە سەریو نەهامەتیانەت بۆ بگێڕمەوە کە خواوەندان بەسەریان هێناوم، بەیەك ساڵی رەبەق تەواو نابێت. بە هەرحاڵ، من ئامادەم بۆتی بگێڕمەوە بە مەرجێ خواردنوخواردنەوە مشەبێ. هەر هەردووکمان لەم کوختەدا وەمێنین، وئەوانی دی بچن بەلای کاروباری خۆیانەوەو هەنگێ بە دەم خواردنەوەوە بە راشکاوی واریقاتی خۆمت بۆ دەگێڕمەوە.

"من شانازی بەوەوە دەکەم کە بە ڕەچەڵەك کریتیم، کوڕی پیاوێکی فرە زەنگینم، جگە لە من کوڕی تری زۆر بوون، کوڕەکانی تری لە ژنی شەرعی خۆی بوون. من لە ژنێکی زەڕخرێ،

کەنیزەکێك بووم، یانی خانەزا بووم. بەڵام وێڕای ئەوەش بابم، کاستوری کوڕی هیلاکس، لە ریزی کوڕەکانی تری، کوڕە شەرعیەکانی، دای دەنام‌وبە هەمان چاو سەیری دەکردم‌و لەگەڵ ئەواندا فەرقی نەدەکردم. تا لە ژیاندا بوو، چونکە خاوەنی موڵك‌وماڵێکی زۆرو فراوان‌و کوڕانی ئازاو سەرفراز بوو، لە نێو کریتییەکاندا بە ئەندازەی خواوەندێك بەناوبانگ‌و ڕێزدار بوو. بەڵام وەختێ مەرگ گەییە سەری‌و بۆ هادیسی بردەوە، کوڕە خۆ پەسندەکانی موڵك‌وماڵەکەیان بە تیروپشك لە بەینی خۆیاندا دابەش کردو سەبارەت بە منیش شتێکی کەمیان، دەگەڵ خانوویەکدا دامیّ‌و ئاو بێنەو دەست بشۆ. بەڵام بە زەبری ئازایەتی خۆم، توانیم خزمایەتی دەگەڵ ماڵباتێکی دەوڵەمەندا بکەم‌و ژنیان لیّ بخوازم. ئەوسا نە کەسێکی دەست سپی‌ودەستەوسان بووم، نە لە شەڕ دەپرینگامەوە. حەیفیّ ئێستا ئەو هێزو توانایەی جارانم نەماوە، هەرچەندە مزگەوت روخاوە، بەڵام ئەگەر جوان دیقەت بدەی میحرابی ماوە. وراستت دەویّ من مەینەتی‌و بەڵای زۆرم بەسەرهاتووە. بەڵام ئەریس‌و ئەتینا، دلێری‌و ئازایەتیەکی وایان دابوومیّ بەگژ هەڵبژاردەترین لەشکروئازاترین جەنگاوەراندا دەچووم. کاتیّ کە ئازاترین جەنگاوەرانم هەڵدەبژاردو بۆسەمان بۆ دژمن دەنایەوە، هەرگیز لە مردن نەدەترسام، ولە پێش هەمووانەوە دەردەپەڕیم‌وپەلامارم دەداو کە دژمن هەڵدەهات، بەدەم راکردنەوە بەر نێزانم دەدان‌و یەك یەك دەمکوشتن. لە شەڕو شەڕگەدا ئاوا بووم. بەڵام حەزم لە کاری کشتوکاڵی، وماڵداری‌و بەخێوکردن‌و پەروەردەی منداڵان نەبوو. زیاتر رمودەی کەشتی‌وکەشتیرانی‌و سەوڵەوانی بووم. ئاشقی شەڕو، نێزەی رەخشان، وشیرو تیرو ئەو شتانە بووم کە خەڵکی دی لێی دەترسان‌و لێی دەڕەوینەوە. هەڵبەتە هەرکەسەو رمودەو خولیای شتێکە، ئیدی من حەزم لەو شتانە بوو. بەر لەوەی کوڕانی ئاخیایی بۆ شەڕی تەروادە بڕۆن‌و پیّ بنەنە خاکی تەروادە، من نۆ دانە جار، فەرمانـدەیی جەنگاوەران‌و کەشتیانی خۆشڕەوم کردبوو، وچووبوومە سەر گەلان‌و وڵاتانی بێگانە. لەو شەڕانەدا، تالانییەکی زۆرم دەست کەوتبوو،بەر لەوەی دەسکەوت‌و تالانیەکان دابەش بکرێن، هەرچییەك باش بوایە بۆ خۆمم هەڵدەگرت،وپاشان ئەوەی دەمایەوە بە تیروپشك دابەش دەکراو لەوەشدا بەشێکی زۆرم پیّ دەبڕا. ئیدی بەو جۆرە زۆر زوو دەوڵەمەند بووم، ماڵەکەم پڕ بوو لە دەسکەوت، ئیدی لە نێو کریتییەکاندا سام‌وهەیبەت‌و، ڕێزوحورمەتی زۆرم پەیداکرد.

بەڵام کە زیوس، کە بانگ‌و بانگەوازی دەگاتە شوێنانی دوورو نزیك، ئامـاژەی بۆ ئەو لەشکرکێشیە شووم‌وترسناکە کرد کە زۆر جەنگاوەری تێدا کوژران، هەنگیّ جەماوەری خەڵکی روویان لە من‌و ئیدومنیوس نا، کە رابەرایەتی کەشتیەکان بەرەو ئیلوس بکەین. هیچ دەرفەتێکیش نەبوو خۆ لەو کارە بدزینەوە. چونکە دەبووین بە لۆمەکارو بنێشتە خۆشەی ژێر دانی هەموو کەس‌وناکەسێك. ئیدی نۆ دانە ساڵی رەبەرق، ئێمە کوڕانی ئاخیایی، لەوێندەر شەڕمان کرد. ئەنجام لە دەیەمین ساڵدا، پاش ئەوەی شارو قەڵاکانی پریاممان وێران‌و تالان کرد، بە سواری کەشتییەکانمان بەرەو وڵات گەڕاینەوە، بەڵام یەکێك لە خواوەندەکان، ئاخیاییەکانی لە ڕێگەدا پەراگەندەو پەڕەوازە کرد. بەڵام سەبارەت بە منی بەلەنگازو بێنەوا، زیوسی زانا، مەگەر هەر خۆی بزانیّ چ بەڵاو نەهامەتییەکی بەسەر هێنام! تەنیا یەك دانە مانگ بە

خۆشی و شادی دەگەڵ منداڵەکانم، ودەگەڵ ژنە شەرعی و فەرمییەکەمدا، لە نێو سەروەت و سامانە زۆرەکەمدا مامەوە. هەنگێ خولیاوکەڵکەڵەی سەفەری میسری خستە سەرم. ئیدی ئوستولێکی گەورەم دەگەڵ هاوڕێیانی خواوەند ئاسادا ئامادە کرد، کە بە دەریادا بەرەو میسر بڕۆم. نۆ دانە کەشتیم لە عۆیەدابوو، خەڵکێکی زۆرم لێ خڕ بوونەوە. هاوڕێ دڵسۆزەکانم، بەزم و سووریان سازکردو گێڕا، وقوربانیەکی زۆرم بۆ فەراهەم کردن تا بیکەن بە نەزری خواوەندان، و بەزم وخواردنی خۆیانیش. رۆژی حەوتەم سواری کەشتییەکانمان بووین،ولە کریتی بەرینەوە بەڕێکەوتین. چونکە بایەکی سازگارو بە قوەت لە باکورەوە دەهات، نەرم نەرم دەچووینە پێشێ، لە تۆ وایە لەنێو روبارێکی بێ مەترسیدا کەشتی داژوین. کەشتییەکانم تووشی هیچ زیان و ئاسیوێك نەبوون، هیچ دەریاوانێك نەخۆش نەکەوت، دوور لە هەر مەترسییەك دانیشتبووین، و بایەکەو دەریاوانەکان کەشتییەکەیان داژۆت.

رۆژی پێنجەم گەییشتینە روباری ئیجیبتوس (نیل)، روبارێکی مەنگ و ئارام وجوانە. کەشتییەکانمان لە روبارەکەدا ڕاگرت. هاوڕێ وەفادارەکانم راسپارد کە لەوێندەر بن وچاویان لە کەشتییەکان بێ.دیدەوانەکانیشم راسپارد کە بچنە سەر بورجەکانی خۆیان. ئیدی خەڵکم بە هەموو لایەکدا نارد، تاقیب بکەن بزانن چ هەیەو چ نیە. بەڵام هاوڕێکانم، تەماح گرتنی و فەرمانەکەیان لە عاردی دام و بە گوێیان نەکردم. یەکسەر پەلاماری خاکی میسریان دا، کەوتنە تاڵانکردنی کێڵگەومەزرایان. رفاندنی ژنان ومنداڵان،وکوشتنی پیاوان. ودەنگۆی شەڕ بە خێرایی لە شارا بڵاو بووەوە. خەڵکی لەگەڵ گەردی بەیاندا هاڕوژان، دەشت ودەر بە جارێ پڕ بوو لە جەنگاوەرانی پیادەو سوارە، بریسك و هۆڕی شیروتیرو نێزەو مەتاڵان هەترەشی پیاوی دەبرد. زیوسی چەخماخەوان، ترسێکی ئەوتۆی خستە دڵ ودەروونی هاوڕێکانمەوە، قەڵەمی دەست و پێیان شکاو کەس زاتی نەکرد خۆی بگرێ و رووبەڕووی دژمن ببێتەوە. نەگبەتی وبەدبەختی لە هەموو لایەکەوە تێیان ئالا. ئیدی میسرییان بە شیرو نێزە تێمان کەوتن و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتین و ئەوانی تریان بە دیلی برد تا سوخرەکێشی و بێگارییان پێبکەن. بەڵام سەبارەت بە من! زیوس ئیلهامێکی لە دڵ نام و یەکسەر رادەستی بووم. سەد بریا، لەوێندەر، لە وڵاتی میسر مردبام و بەگوێی زیوسم نەکردبا.چونکە هەر بەڵایەکم بەسەر هات لەوەوە بەسەرم هات. ئەوە بوو یەکسەر کڵاوخودە چاکەکەم لەسەرم داکەند. سپەرەکەم داکەند، نێزەکەم لە عاردی دانا. یەکڕاست بەرەو ئەسپ وگالیسکەکەی پاشا رۆییشتم، خۆم لەبەر پێیانی هاویشت، لاقیم ماچ کرد، بەزەیی پێمدا هاتەوەو لە گیانم خۆش بوو. کەوتمە گریان. سواری گالیسکەکەی خۆی کردم و بۆماڵی بردمەوە. ژمارەیەك لە جەنگاوەرەکانیان، بە نێزەوە، کە لە داربناو دروست کرا بوون، بە قەستی کوشت پەلاماریان دام. زۆرم لێ پڕو داخ لە دڵ بوون. بەڵام پاشا دووری خستنەوە، چونکە لە دڵی خۆیدا، لە غەزەب و تۆڵەی زیوسی پشت وپەنای لێقەوماوان دەترسا. گوایە زیوس زامنی لێقەوماووغەریبانە، نابێ نەهەقیان لێبکرێ. حەوت ساڵی تەواو لەوێ مامەوە، لە نێو میسریەکاندا زێڕوزیوێکی زۆرم کۆکردەوە. چونکە هەر هەموویان زێڕو زیویان بە دیاری دەدامێ. کە پێمان نایە ساڵی هەشتەمەوە، بابایەکی (فینیقی)م لێ پەیدابوو. هێند

دەغەڵکارو فریبۆك‌وخاپینۆك بوو گریۆی لە شەیتان دەبردەوە. کابرایەکی تەمەعکاری چاوچنۆك بوو، کە پێشتریش دەستی زۆر کەسی تری بڕی بوو. ئیدی هاتە بن کلێشمەوەو بە بەرچاوی هەموو خەڵکییەوە فریوی دامو بەگەڵ خۆی خستمو بۆ فینیقای بردم، کە ماڵ‌وموڵکی لەوێندەر بوو. ساڵێکی تەواو لەوێندەر، دەگەڵ ئەودا مامەوە. کە رۆژان بوون بە هەفتەو، هەفتە بوون بە مانگ‌و، مانگ بوون بە ساڵ، ووەرز سوڕایەوە، سواری کەشتی کردمو بە رێگەی دەریادا، بەرەو لیبیا وەڕێکەوتین! بە درۆوە وای دەنواند کە گوایە من باری دەگەڵدا بۆ ئەوێندەر دەبەم. بەڵام لە راستیدا بە تەما بوو، لەوێ بە باروشتەکانمەوە، وەکو کۆیلەیەك بە نرخێکی باش بمفرۆشێت‌و دەسکەوتێکی زۆر بۆ خۆی وەدەست بێنێ. بە گومان‌و دوودڵیەوە سواری کەشتی بوومو بەگەڵی کەوتم. هیچ چارێکی دیکەم نەبوو! خۆمان دایە دەم بای باکورەوە، بایەکی سازگاروخۆش، تا گەییشتینە دەریاکەی نێوان کریت‌و لیبیا. بەڵام دیار بوو کە زیوس مەرگی لە چارەی دەریاوانەکان نووسیوە. هەرکە لە کریت تێپەڕین‌و وشکاییمان لێ دیار نەما، و تەنیا دەریاو ئاسمان دیار بوو، هەنگێ کوڕی کرۆنوس هەورێکی رەش‌وتاریکی هێناو بەسەر کەشتییەکەوە رایگرت. زیوس قریواندی وچەخماخەیەکی لە کەشتییەکە دا. کەشتییەکە بە دەوری خۆیدا خولایەوە، لەگڕودووکەڵدا نقوم بوو، وهەر هەموو دەریاوانەکان لە کەشتییەکە بەر بوونەوە. ئیدی شەپۆلی دەریا، وەکو نەورەس بە دەوری کەشتییە بۆردا لولی دان‌و دەریا قووتی دان، و خواوەندان گەڕانەوەیان بە نسیب نەکردن،ونەگەییشتن جارێکی دی نەزرو نیازی سەدەینە بکەن. بەڵام سەبارەت بە من، وەختێ زیوس خەم‌و پەژارەی دڵی منی بینی بەزەیی پێدا هاتمەوەو رێك خستمیە باوەشی بۆرجی کەشتییە بۆرەوەو جارەکی تریش لە مەرگ رزگاری کردم. خۆم پێوە هەڵواسی‌و بە ئومێدی زیوس خۆم دایە دەم گژەباوە. بەو جۆرە نۆ دانە رۆژی تەواو وێڵ‌و سەرگەردان بەسەر دەریاوە بووم! شەوی دەیەم، کە شەوێکی تاریکی ئەنگوستەچاو بوو، شەپۆلێکی گەورەو بێرەزا دامیە پێش‌و لەسەر زەمین‌و کەنارەکانی (تیسپروتیس)ی نزیك خستمەوە. لەوێ، (فیدون)ی پاشایان، بێئەوەی هیچ خەراج‌و سەرانەیەکم لێبستێنێ پێشوازی کردمو گلی دامەوە.چونکە کوڕە ئازیزەکەی کە منی بینی بوو لە سەرماو ولەشەکەتیدا نیوە گیان بووم، دەستی گرتبوومو تا ماڵی بابی بردبوومەوە، و جل‌و بەرگی دابوومێ تا خۆمی پێ پۆشتە بکەم.

"منم لەوێ هەواڵی "ئودیسیوس"م بیست. پاشا پێیگوتم کە پێشوازی کردووەو رێزێکی زۆری گرتووەو بادەی دەگەڵ خواردووەتەوە، وبۆ وڵاتی خۆی گەڕاوەتەوە.و هەموو ئەو گەنجینەو سەروەت‌و سامانەی نیشاندام کە ئودیسیوس کۆی کردبووەو بە دەستی هێنا بوو: بڕونز، زێڕ، و ئاسنی ئاودراو. ئەوەی ئەو کۆی کردبووەوە، جگە لەوەی بۆ فیدون پاشای دانا بوو، بەشی دە پشتی خۆی‌و ماڵ‌وماڵباتەکەی دەکرد. هەر هەموو ئەو دارایی‌و دەستکەوتانە لە هۆڵە گەورەکەی ماڵی پاشادا لەسەر یەك کەڵەکە کرابوون. جا پاشا دڵنیای کردم کە ئودیسیوس بەرەو دودونا چووە، تا خۆی بگەیەنێتە دار بەڕووە موبارەکە بەرزەکە،ولق‌و پۆپە گێسوئاساکەی راوەشێنێ‌و نیازو مەبەست‌و ویستەکانی زیوسی پێبڵێ کە دوای ئەو هەموو ساڵە دووریو دەربەدەرییە چۆن

بۆ خاکی ئاواو ئاوەدانو بە فەڕو بەرەکەتی ئیتاکا بگەڕێتەوە، بە ئاشکرا یان بە نهێنی؟ هەروەها لە کۆشکە گەورەکەی خۆیدا، بەدەم نەریتی بادە پرژێنیو نۆشخواریەوە سوێندی بۆ خواردم کە کەشتییەکی بۆ دەخاتە دەریا، وکەشتیوانو دەریاوانەکان خڕ ئامادەن تا ئیتاکا، دەگەڵ ئودیسیوسدا بڕۆن... بەلاّم لە پێشا منی رەوانە نەکرد: بەرێکەوت کەشتییەکی (تیسپروتیس)ەکان ئامادەی سەفەر بوو بۆ دوڕگەی دولیخیوم، کە بە گەنم بەناوبانگە. هەنگێ شا، فەرمانی بە کەشتیوانەکان دا کە بە سەلامەتی بمگەیەننە لای شای ئاکاستوس. تومەز کەشتیوانەکان لە دڵی خۆیاندا، نیازیان خراپ بوو، خوازیاری ئەوە بوون جارێکی دیکە بکەومە گێژاوی نەگبەتیو بەدبەختیەوە. هەرکە کەشتییە خۆشڕەوەکە لەو وڵاتە دوورکەوتەوە، زانییان دەنگو دەستم ناگاتە هیچ ئاوەدانییەك، لێبڕان وەکو کۆیلە بمفرۆشن. ئیدی رووتیان کردمەوە، جلەکانیان لەبەر داکەندم، جبەوکراسێکی چڵکنی شرو شەپڕێویان لە بەرکردم، ئەم جلە شڕانەی کە بە چاوی خۆت لە بەرمیا دەبینی. ئێوارێ گەییشتنە کێڵگەو مەزرا جوانەکانی ئیتاکا کە لە دوورەوە دیار بوون. بە پەتێك چوار پەلیان بەستمەوەو لە نێو کەشتییەکەدا بەجێیان هێشتم. بە خۆیان بە پەلە دابەزینوچوون بۆ کەناری دەریاکە کە شیو بکەن. بەلاّم سەبارەت بە من، خواوەندان فریام کەوتنو بە خۆیان پەتەکەیان لە دەستولاقم کردەوە: ئەو کارانە لای خواوەندان ئاسانە. جلە شڕەکانم داکەند، لەسەرمەوە پێچان، بە بن سوکانی کەشتییەکەدا دزەم کرد،خۆم بە دەریاکەدا دا. یەکسەر کەوتمە باسکە مەلە. زۆر زوو لە دەریاکە وەدەرکەوتم، لەو خەڵکانە دوور کەوتمەوە. کە لە کەنارەکە سەرکەوتم، کەوتمە ناو بێشەیەکی چڕە دارستانی چوغوردەوەو لەوێندەر خۆم مەلاّس دا. کەوتنە گەڕان بە دوومدا، بە دەنگی بەرز گازیان دەکردم. بەلاّم کە زانیان هەوڵو گەڕانیان بێسوودە، بۆ لای کەشتییەکەیان گەڕانەوەو خواوەندان منیان لە ئاسیوو گەزەندی وان ڤەشێرت. ئەم کارانە بەلای خواوەندانەوە ئاسانە، ئەوسا خواوەندان بە حەولو قوەتی خۆیان گەیاندمیانە بەر دەرگای پیاوێکی باش، لای بەرازەوانێکی دلۆڤانو مەردورەند، وا دیارە ئەجەلم نەهاتووە!".

## یومایوس باوەڕ بە قسەکانی ئودیسیوس ناکات

ئەی یومایوس، ئەی بەرازەوان، وەلاّمی ئەو قسانەیت دایەوەو گوتت: "تەحا کە پیاوێکی غەریبو کلۆڵی! هەی نەگبەت خۆت! بەڕاستی بەسەرهاتەکەت زۆری کار تێکردم، ئەو هەموو مەینەتیودەربەدەریو ئاوارەییە، بەڕاستی شا بە تاقەتت! بەلاّم پێموایە لە شتێکا راستت نەکرد، و دڵت ئاسوودە نەکردم: ئەوەی دەربارەی ئودیسیوس گوتت راست نەبوو. نازانم بۆچی پیاوێکی وەکو تۆ درۆیان بکات!؟ من لێکدانەوەی خۆم لەمەڕ چارەنووسی ئاغام هەیە: هەر هەموو خواوەندەکان رقیان لێی بوو، بۆیە کە شەڕ تەواو بوو، لە ناو تەروادەییەکاندا، یان لە باوەشی دۆستەکانی خۆیدا نەیانکوشت. خۆ ئەگەر بکوژرابا، جەنگاوەرانی ئاخیایی شاخو رێکیان بۆ دروستدەکرد، گۆڕێکیان بۆ هەڵدەبەست، سەربەرزیو شانازییەکی زۆری بۆ کوڕەکەی بەجێدەهێشت. بەلاّم شتی وا نەبووە، خواوەندان ئەو سەربەرزییەیان بە نسیب نەکردووە، دیارە هارپییان رفاندوویانەو کەس هەواڵی نازانێت. من بۆ خۆم لێرە دەگەڵ بەرازەکانمدا دوور لە

خەڵکیو ئاوەدانی دەژیم. وتەنانەت بۆ شاریش ناچم، مەگەر پنلوپی سەرتۆپی ژنانی ئاغرو ئاقڵ، کە هەواڵێکی تازەی ئودیسیوسی بگاتیٚوبنێرێت بە شوێنمدا. هەنگێ خەڵکی لەدەوری ئەو کەسەی هەواڵەکەی هێناوە خڕدەبنەوە، وپرسیارباراني دەکەن. هەرچیەکیان بە بیروخەیاڵدا بێت لێی دەپرسن، ئیدی هەندێك بە ماتەڵ بوونو نەهاتنەوەی ئاغایان خەمبارو دڵتەنگو هەندێکی دی بە نەهاتنەوەی زۆر شادوخۆشحاڵنو خوا خوایانە ئاوی ئاموونو توونی بابا بچێت، چونکە بە کەیفی دڵی خۆیان، بێئەوەی کەس لێیان بپێچێتەوە، ماڵی دەخۆنوسەروەتو سامانی بە فیڕو دەدەن. بەڵام من لەوەتای کابرایەکی ئیتولیایی، بە درۆ چیرۆکێکی بۆ گێراومەتەوە، نە گوێ لە کەس دەگرمو نە پرسیاردەکەم: کابرای ئیتولیایی کەسێکی خۆی کوشتبوو،سەری خۆی هەڵگرتبوو، پاش دەربەدەریوسەرگەردانیەکی زۆر، رێی کەوتە لای من، پێشوازییەکی گەرمم لێکرد، رێزو حورمەتێکی زۆرم گرت. ئەو کابرایە گوتی کە ئودیسیوسی لە نێو کریتییەکاندا، لە کۆشكوسەراکەی ئیدومینیوسدا بینوە، کە خەریکی چاککردنەوەی کەشتییەکەی خۆی بوو کە زریانو شەپۆلان شەقوشریان کردبوو. یارۆ دەیگوت کە یان هاوین یان پایز دەگەڕێتەوە، وسەروەتو سامانێکی یەجگار فرە دەگەڵ هاوڕێ خودائاساکانیا دێنێتەوە. جاتۆش ئەی پیرەمێر، کە ئەو هەموو مەینەتیەت بەسەر هاتووەو رەنجی زۆرت کێشاوە، وقسمەتو نسیب تۆ گەیاندووەتە کوختەکەی من، بە چیرۆکانی درۆ دڵم خۆش مەکە. هیچ مەراییەکم لەبەر مەکە. چونکە من لەبەر ئەو قسە هەڵبەستراوانە خاتروحورمەتت ناگرم، وبەو قسانەش بەزەییم پێتانایەتەوە. بەڵکو لەبەر خاتری زیوس، لە ترسی زیوس کە زامنی میوانو غەوارانە،رێزت دەگرمو بەزەییم پێتا دێتەوە.

## ئودیسیوسو بەرازەوانەکە مەرج دەکەن

ئودیسیوسی دووربینوبەردەبار پەرسڤی دایەوەو گوتی:

"بەڕاستی دڵێکی دێرباوەڕت هەیە. خۆ من سوێندم بۆ خواردیت، یانی سوێندش باوەڕ ناکەی! قەیدی نیە، مادامێکی وایە وەرە منو تۆ مەرجێك بکەین، بەڵام دەبێ خواوەندانی ئۆلەمپ نشین، بەو سەرەوە بە شایەد بگرین. ئەگەر ئاغات بۆ ئەم ماڵە هاتەوە، ئەوا دەبێ دەستی جلکی زۆر نایابم بۆ بکڕێتو بۆ دولیخیومم بنێری، چونکە زۆرم دڵ پێوەیە. بەڵام ئەگەر ئاغات وەکو چۆن من دەیڵێم نەهاتەوە، ئەوا خزمەتگوزارەکانت راسپێرە کە لەسەر شاخێکەوە هەڵمدێرن، تا هەپرون بە هەپرون ببمو ببم بە پەندوعیبرەت بۆ هەر رێبواردەرۆزەکەرێکی دی تا بە خەبەرو هەواڵی درۆ، تۆ فریو نەدەن".

بەرازەوانی پایەبەرز وەڵامی دایەوە:

"نۆبەتی ئەو قەوانەیە، غەریبۆ، دەتەوێ ببمە بنێشتەخۆشەی ژێر دانی خەڵكوخوا. خەڵکی ئێستاو ئایندە بە داستان بیگێڕنەوە، کە من لە کوختەکەی خۆمدا میواندارییم کردویت، رێزم گرتوویت، وپاشان رووتم کردویتەوەو کوشتوومیت! باشە دوای ئەوە بە چ چاوورووویەکەوە، نوێژ بۆ زیوس بکەم. نزا بکەمولەبەری بپارێمەوەو داوای کۆمەکی لێبکەم؟ ئەو خورمایەی تۆ

خواردووته ناوکەکەی لە گیرفانی مندایە...بە هەرحاڵ ئێستا کاتی شیوە، هەر ئێستا هاوڕێکانم دێنەوەو نان‌وخوانێکی بەلەزەت ئامادە دەکەین".

## یومایوس زیافەت بۆ ئودیسیوس دەکات

لە گەرمەی ئەو قسانەدا بوون، بەرازەوانەکان بە خۆو رەوە بەرازەکانیانەوە هاتنەوە. بەرازەکانیان لە ئاغەڵان کردو دەرگایان لێداخستن: بەرازان لە ژوورەوە کەوتنە مڕەمڕ. هەنگێ سەر پاسەوانی شەریف ئەمری بە هاوڕێکانی کرد: "کوڕینە باشترین بەراز بێنن تا بۆ میوانەکەمانی، کە لە رێیەکی دوورەوە هاتووە، بکوژینەوە. ئێمەش بە سایەی ئەوەوە شتێکی لێدەخۆین. ئێمە رەنج دەدەین‌و ئەم بەرازە کەڵبە چەرمووانە بە خێو دەکەین،وخەڵکی دی بە ناهەق بەری رەنج‌و ماندوو بوونمان دەخۆن."

کە لەو قسانە بووەوە، بەنێزەی قورس کەوتە دارشکاندن، وئەوانی دیکەش بەرازێکی قەڵەوی پێنج ساڵەیان هێنا، هێنایان لەلای وەجاخ‌و ئاورگەکەوە رایان گرت. سەر بەرازەوان خواوەندانی لە یاد نەکرد، چونکە پیاوێکی دیندار بوو، بۆ نۆبەرە هەندێ کۆڵکەی لە سەری بەرازە شفرە چەرمووەکە کردەوەو خستییە ئاگرەکەوەو نزاو نوێژی بۆ هەموو خواوەندەکان کرد، لێیان پاڕایەوە کە ئودیسیوسی فرەزان بۆ ماڵی خۆی بگەڕێتەوە. هەنگێ دەستی دایە کۆتەرە دار بەڕوویەك‌وکێشای بەسەری بەرازەکەداو حەیاتی لەبەر بڕی. لە کاتی دارشکاندنەکەدا، ئەو کۆتەرەیەی بە تایبەتی بۆ ئەو کارە وەلاوە نابوو. ئەوسا بەرازەوانەکانی دی خێرا سەریان بڕی‌و لە لەشیان جوێ کردەوە. کەوڵیان کردو بە پەلە پارچە پارچەیان کرد. ئەوسا یومایوس، وەکو نۆبەرە چەندین پارچە گۆشتی خاوی لە هەر شوێنێکی لاشەی بەرازەکە کردەوە، لە بەزو چەوری ئالاندن‌و بڕێك ئاردی جۆی تێوە پرژاندن‌و نایە سەر ئاورگەکە. بەرازەوانەکانی دیکەش، گۆشتەکەی تریان جنی‌و بە شیشیانەوە کرد، پاش ئەوەی جوان برژاندیان، هێنایان، لە شیشەکانیان داماڵی‌و لەسەر خوانەکە لە قاپیان کرد. هەنگێ یومایوس هەستا گۆشتەکە دابەش بکات، لە دابەشکردنا بەڵەدوبەویژدان بوو. گۆشتەکەی کرد بە حەوت بەشەوە: بەدەم نوێژو نزاوە بەشێکی بۆ پەریانی دەریایی‌و هیرمیسی کوڕی میا خستە لاوە. ئەوی تری بەسەر پیاوەکاندا دابەش کرد، هەریەکەو بەشی خۆی دایە. ئەوسا وەکو رێزی تایبەت پشتە مەغزە درێژەکەی، پیرە بەرازی شفرە چەرمووی بۆ ئودیسیوس دانا. بەمەش ئاغاو سەروەرەکەی خۆی زۆر شادو دڵخۆش کرد. هەنگێ ئودیسیوسی دڵ وریاو فرەزان‌و بەردەبار هەڵیدایەوگوتی:

"هیوادارم چەند من لێت رازیم، (زیوس) دە ئەوەندە لێت رازی بێ. چونکە ئەوەندە بە تەنگ منی غەریب‌و بەلەنگازەوەیت."

ئەی یومایوس، ئەی بەرازەوان، لێرەدا بەرسڤت دایەوە: "فەرموو میوانی بەڕێز، فەرموو نانەکەت بخۆ، خودا خۆی دەزانێ لە کێ رازی دەبێت‌و لە کێ رازی نابێت. هەر خۆی توانا بە هەموو شتە."

دوای ئەو قسەیە، نۆبەرانەی بەرازەکەی نەزری خواوەندان کرد، دوای ئەوەی بە نەریتی نۆشخواری، بادەی ئاڵی ئاگرینی پرژاند، گۆزە شەرابەکەی دایە دەست ئودیسیوسی وێرانکەری

شاران، ئەوسا لە بەرانبەر بەشە خۆراکەکەی لەسەر خوانەکە دانیشت. ئەوسا میساولیوس نانی بۆ دانان. میساولیوس خولامی تایبەتی یومایوس بوو، کە بە پارەی خۆی، بەبێ ئاگاداری پنلوپیولایرتیس-ی پیرەمێرد، لە غیابی ئودیسیوسی ئاغایدا، لە تافیەکانی کڕی بوو. میوانەکان دەستیان بۆ خواردنەکەی بەردەمیان درێژ کرد. پاش ئەوەی تێرو پڕیان خواردو خواردەوە، میساولیوس سفرەوخوانی پێچایەوە، هەموو تێروپڕ هەستان تابڕۆن بخەون.

## ئودیسیوس، بەرازەوانەکە تاقی دەکاتەوە

شەوێکی تاریکی ئەنگوستەچاو دنیای لە باوەش گرت. زیوس، باوبۆران‌و زریانێکی بەترەڤ هەڵکرد، بای باشووری بارانی، خۆشی نەدەکردەوە. ئودیسیوس، ویستی خانەخوێیەکەی، کە ئەوەندە بە خەمیەوە بوو، وبە دەوریا دەهات، تاقی بکاتەوەو بزانێ ئاخۆ دڵی دێت جبەکەی خۆی داکەنێ‌و بیداتێ، یان داوا لە یەکێك لە هاوڕێکانی دەکات جبەکەی خۆی بداتێ. بەو مەبەستە هەڵیدایەوگوتی: "یومایوس، گوێ بگرە، کوڕینە ئێوەش کە یارویاوەری ئەون گوێ بگرن، شتێکم لە دڵدایەو حەزدەکەم بۆ تانی باس بکەم. هەڵبەتە ئەمە کاریگەری بادەکەیە. بادە کار لە ماقولترین کەس دەکات، وای لێدەکات هەستێ گۆرانی بڵێ. پێبکەنێ، هەستێ سوڕ بدات، بڕەقسێ، چەقەنە لێبدات، قسەی وا بکات کەنەکردنی زۆر باشتربێ. بەڵام مادامێکی دەستم پێکرد تازە هیچتان لێناشارمەوە. خۆزگەم بەو رۆژگارەی کە گەنج بووم، بەوسای کە لە دەوری شورەو حەسارەکانی تەروادەدا خۆمان لە بۆسە دا، سەرانی ئەو لەشکرکێشییە ئودیسیوس‌و مینیلاوسی کوڕی ئوتریوس بوون، وسێیەمیان من بووم، ئەوان منیان بە فەرماندە هەڵبژاردبوو. کە گەییشتینە نزیکی شاروشورەو حەسارە بەرزەکانی، لە دەوری شارا، لە بێشەیەکی چڕو چوغووردا، لە نێو زەلکاوونەیجەزارێك دا، بە خۆوچەك‌وئەسلەحەوە خۆمان مەڵاس دا، شەومان بەسەردا هات، بایەکی بەترەف‌وسارد لە باکورەوە هەڵیکرد، باسریشك دەستی پێکرد، هێندە سارد بوو، تفت هەڵدابا دەیبەست. بەفر سەروگوێلاك‌و سپەرو مەتاڵەکانی داپۆشین. هەمووان پاڵتۆو جبەیان پێبوو، بێخەم بە مەتاڵ‌و تاقمەکانیانەوە خەوتن. تەنیا من بەبێ پاڵتۆ هاتبووم. دابووم بە هاوڕێکانم. ئەمە کارێکی گەوجانە بوو، هەرگیز وێنام نەدەکرد، بیکات بەو توۆف‌و وەیشوومەیە. بە سپەرونیتاق‌و کڵاوخودی رووتەوە، دوای جەنگاوەرەکان کەوتبووم. کە دوو بەتڵی شەو بوری‌وستێران بەرەو ئاوا بوون کشان، ئانیشکێکم بە قەبرغەی ئودیسیوسدا، کە لە نزیکییەوە بووم، کێشا، یەکسەری گوێی هێنا، وپێم گوت:

"ئەی کوڕی لایرتیس، ئەی توخم‌و توۆی زیوس، ئەی ئودیسیوسی چارەسازوبەردەبار، خەریکە دەمرم، لە سەرما رەق دەبمەوە، پاڵتۆم پێ نیە، یەکێك لە خواوەندەکان دەسخەڕۆی کردم‌و بە توێی کراسێك هاتووم، نازانم تەگبیرم چیە!"

کە ئەو قسەیەم کرد، یەکسەر لە دڵی خۆیدا ئەم نەخشەیەی دانا، کابرایەکی یەجگار زیرەك‌و زرنگ بوو، لە نەخشەدانان‌وشەڕدا بلیمەت بوو، دەمی لە پەنا گوێم ناو لەبن لێوانەوە گوتی:

"وس بە با ئاخیاییەکانی دی گوێیان لێت نەبێ."

ئەوسا سەری نایە سەرباسکی و گوتی:

"براینــۆ، گــوێ رادێــرن، خــەوتبووم، خــەونێکی خــواییم بــینی، ئێمــە زۆر دووریــن لــە کەشتییەکانمانەوە.دەبێ یەکێك بەپەلە بڕوات بۆ لای مینیلاوسی سەر لەشکرو پێی بڵێ بەلەز کۆمەڵێك شەڕڤان و جەنگاوەری دیکەمان بۆ بنێرێ".

هەرکە لە قسەکەی بووەوە، تواس، کوڕی ئەندریمون، بەپەلە هەستا، پاڵتۆ ئەرخەوانیەکەی داکەندو لە عاردی دانا، وبە غار بەرەو لای کەشتییەکان پەل بووەوە. ئیدی من پاڵتۆکەیم لەبەر کردو خپ لێی خەوتم، کاتێ چاوم هەڵێنا، سەیرم کرد سپێدە تازە گزنگ دەدا. ئێی پیرە دنیا، دنیای بێ وەفا، ئەگەر ئێستاش وەکو ئەوسا گەنج وبە تاقەت بوایەم، هەڵبەتە یەکێك لە بەرازەوانەکانی ئەم گوندە، چ لە رووی بەزەیی و دلۆڤانییەوە چ وەکو رێزنان لە ئازایەتی و دلاوەری من، پاڵتۆیەکی وێدەدام. کەچی ئێستا چونکە شڕپۆش وشڕۆلەم، قەدرم نازانن."

## یومایوس لە تاقیکردنەوەکەی ئودیسیوس دەردەچێ

ئەی یومایوسی بەرازەوان، هەنگێ بەرسڤت دایەوەوگوتت:

"ئەی پیرەمێرد، بەڕاستی چیرۆکێکی جوانت بۆ گێڕاینەوە، هیچی نا واقیعی و بێهودەت تێ هەڵکێش نەکرد، بۆیە، خەمت نەبێ، بەلای کەمەوە بۆ ئەمشەو بێ دڵیت ناکەین. بەڵام رووی نەبوونی رەش بێ، ئێمە شتێکت دەدەینێ کە شایستەی هەژارێکی بێچارەی ماندووی خازۆکە، نەك شایستەی تۆ. بۆ ئێستا هەر ئەوە شك دەبەین. بەڵام کە سارەزی هەستایت، ئەم جلە شڕانە دەشۆیت، چونکە لێرە جلکی زیادە نیە، پاڵتۆ وجبەی زیادەمان نیە کە بە کاری خەڵکی دی بێت، هەرکەسەو یەك دەست جلکی هەیە. بەڵام کە کوڕە ئازیزەکەی ئودیسیوس، کە کوڕێکی گەلەك دلۆڤانە بێتەوە، دەستە جلکێکی تایبەتی ونایابت دەداتێ، وهەر شوێنێکت بوێ، بۆ ئەوێندەرت ڤڕێ دەکات".

بەدەم ئەو قسانەوە هەستا، لە نزیکی ئاورگەکەوە جێی بۆ ئودیسیوس ڕاخست و کەوڵە مەڕو بزنی لەسەر راخست، ئودیسیوس لەو جێیەدا خەوت. یومایوس،پاڵتۆیەکی ئەستووری پێدا دا، کە لە پەنایەکەوە بۆ تەنگانەی هەڵگرتبوو کە ئەگەر سەرما زۆری بۆ هێنا لە جیاتی پاڵتۆکەی تری لەبەری بکات.

بەو جۆرە ئودیسیوس لەوێندەر نووست و پیاوە گەنجەکانی دیکەش لەولای ئەوەوە خەوتن. بەڵام بەرازەوانەکە حەزی نەدەکرد لەوێ بنوێ، حەزی دەکرد بچێ لای بەرازەکانی بخەوێ، بۆیە خۆی ئامادەکرد کە بڕواتە دەرێ بۆ ناو بەرازەکان. ئودیسیوس زۆر بەوە دڵخۆش بوو کە دەیبینی بەو رادەیە، لە غیابی ئاغاکەیدا مشووری ماڵاتەکەی دەخوات. یومایوس هەوەڵجار شمشێرەکەی کردە شانی، ئەوسا پاڵتۆیەکی ئەستووری لەبەرکرد تا لە سەرماو زریانەکەی بپارێزێ. ئەوجا کەوڵە بزنێکی توکنی هەڵگرت، نێزەیەکی بە دەستەوە گرت، تا کسۆکان ودزو پیاو خراپانی پێ لە بەرازەکان پاس بکات. رۆیی تا لە لای بەرازە شفرە سپییەکان بنوێ. کە لە ژێر تاوێرە بەردێکی زەلامی پەنا بادا وەرکەوتبوون.

***

## پەراوێز:

*- هیلین: جوانترین ژنی سەردەمی خۆی بووە. کیژی زیوس و لیدا بوو. ژنی مینیلاوسی پاشای لاسیدیمون بوو، وهیرمیونی لێ بوو. پاریسی تەروادەیی حەزی لێدەکات و لە ڕێگای دەریاوە ڕەدووی خست و بۆ تەروادەی ڕەڤاند،وئەم ڕووداوە شەڕی بەناوبانگی تەروادەی لێکەوتەوە.

*- لیبیا: ناوە گریکییەکەی کیشوەری ئەفریقیایە.

*- دودونا: کاهینی زیوس بوو. کۆنترین کاهینی وڵاتی گریکە. بە جوڵەی لق وچڵی دار بەڕووان پێشبینی بۆ خەڵکی دەکردو ئایندەی دەخوێندەوە.

*- میا: کیژی ئەتڵەس بوو، گەورەترین وجوانترین بلیادیس بوو، دایکی هیرمیس بوو لە زیوس، کە لە ئەشکەوتێکی چیای کولینی بووی.

*- تواس: یەکێك بوو لە ئاشقە زۆرەکانی هیلین. بۆیە بە سەرکردایەتی ئوستولێکی چل کەشتی چوو بۆ شەڕی تەروادە. وەکو جەنگاوەرێکی دلێرو وتاربێژێکی بەدەم و زمانی جەنگی تەروادە ناسرا بوو. یەکێك بوو لەو قارەمانانەی کە لە نێو ئەسپە دارینەکە خۆیان لە بۆسە دا.

## سروودی پانزەیەم

### کورتەی سروودەکە:

پالاس ئەتینا بەرەو لاسیدیمون دەڕوات، تا تیلماخۆسی کوڕی ئۆدیسیوس ئاگاداربکاتەوە کە کاتی گەڕانەوەی بۆ ئیتاکا هاتووە. شاو شابانۆ، واتا مینیلاوس‌و هیلینا، دیاری‌وسەوقاتییەکی فرە پێشکەش بە قارەمانی لاو دەکەن.

لە کاتی بەڕێکردندا، هیلینا مژدەی پێشبینییەکی خۆشی دەداتێ. ئیدی تیلماخۆس لە ڕێی فرسەوە بەرەو پیلوس دەڕوات، ولەوێندەر لە پیسیستراتوس جیا دەبێتەوەو نەستور نابینێ. دەگەڵ تیوکلومینوسدا کە یەکێکە لە هەڵاتوانی شاری ئارگوس، سواری کەشتی دەبێت. شەوی دووەمیش ئودیسیوس لە ماڵی یومایوسی بەرازەوان دەمێنێتەوەو پرسیاری ژیانی خەمناکی لایرتیس ومەرگی دایکە پیرەکەی، لە بەرازەوانەکە دەکات. بەرازەوانەکە وەڵامی دەداتەوەو باسی خۆیشی بۆ دەکات کە چۆن لە داك‌و بابێکی شاو شابانۆ بووەو پاشان دزیویانەو لە ئیتاکا فرۆشراوە. شەوی دواتر تیلماخۆس لە باشووری ئیتاکادا دەگاتە وشکایی، تیوکلومینوس لەوێ بەجێدێلێ‌و بەرەو شار بەڕێدەکەوێ‌و بۆ کوختەکەی یومایوس دەڕوات..

** *

### ئەتینا ئامۆژگاری تیلماخۆس دەکات کە بۆ وڵات بژڤڕێتەوە.

پالاس ئەتینا بەرەو لاسیدیمونی رۆیی بوو تا کوڕە سەربەرزەکەی ئودیسیوسی جوامێر ئاگادار بکاتەوە کە پێویستە بگەڕێتەوەو هانی بدات بە پەلە بکەوێتە رێ. سەیری کرد تیلیماخۆس‌و کوڕە رەسەنەکەی نەستور، هەردووکیان لە هۆڵەکەی پێشەوەی کۆشکەکەی مینیلاوس، پاشای ناوداردا خەوتبوون. کوڕەکەی نەستور لە غوڕابی خەودا بوو. بەڵام تیلیماخۆس بە درێژایی شەوەکە خەو نەچووە بووە چاوی. چونکە نیگەرانی بابە کلۆڵەکەی بوو. ئەتینای چاوگەش چوو بەدیاریەوە وەستا، وگوتی:

"ئەی تیلیماخۆس! هەق نیە لەوە زیاتر وێڵ‌وسەرگەردان، لە ماڵ‌و کۆشکی خۆت دوور بیت، و موڵك‌و ماڵ‌و کەسو کارەکەت بەبێ خاوەن بۆ ئەو خوازگارە بێ ئینسافانە بەجێ بێڵی. زنهار! ئاگاداربە نەبا ئەوانە لە نەبوون‌و غیابی تۆدا، موڵك‌وماڵەکەت بەسەر خۆدا دابەش بکەن‌و بە خوت‌و خۆڕایی بیخۆن‌و تۆش دەستت لەبنی هەنبانە بۆرەوە دەربچێت! کەواتە ئەگەر دەتەوێ دایکە داوێنپاکەکەت لەسەر ماڵ‌وحاڵی خۆی ببینیتەوە، خێراکە داوا لە مینیلاوسی دلاوەرو

قارەمان بکە تا زووە بەرێت بکاتەوە، چونکە باب و براکانی دایکت پێیان لێکردووەتە کەوشەوەو هانی دەدەن و داوای لێدەکەن بێتە ڕەداو مێرد بە یوریماخۆس بکات. چونکە ئەو کابرایە پێشکەشی و جیازیەکی زۆر زیاتر لە خوازگارانی دی داوەو جار بە جاریش زیاتری دەکات. جا ئاگاداربە نەبادا، لە دووری تۆو بە تۆبزی گەنجێکی بەنرخ و ئازیز لە ماڵەکەت بدزن و بفڕێنن! بەخۆت دەزانی دڵی ژنان چونە، بەوان بێ هەرچیان هەیە لەگەڵ خۆدا بیبەن و ماڵی مێردەکەیان پێ ئاواو ئاوەدان بکەنەوە. بیر لە منداڵەکان ومێردی پێشوویان کە مرد، ناکەنەوە. وهەر لێیان ناپرسنەوە. کەواتە خێرا بڕۆ، بە خۆت و بەدەستی خۆت هەرچی گەنج وماڵت هەن، بە یەکێك لەکارەکەرە هەرە دڵسۆزەکانتی بسپێرە، تا ئەو کاتەی خواوەندان هاوسەرێکی سەلاروسەنگین و سەربەرزت بە نسیب دەکەن. جا با شتێکی دیکەشت پێ بڵێم،حەزدەکەم ئەم قسەیەم بەهەند وەربگری و وەکو گوارە لە گوێی بکەی. دڕترین خوازگارانی دایکت، لە تەنگەی نێوان ئیتاکاو ساموسی بەردەڵاندا، بۆسەیان بۆ ناویتەوەو لێبڕاون بەر لەوەی بگەیتەوە وڵاتی خۆت، بێکەس کوژت بکەن. بەڵام وا دەزانم ئەم پیلانەیان سەر ناگرێت! وگەلێك لەو خوازگارانەی بە ناهەق ماڵی تۆ دەخۆن وسەروەت وسامانت بە فیڕۆ دەدەن، ئەو ئاواتە دەبەنە ژێر گڵەوە. بە هەرحاڵ لەم سەفەرەتا، تا دەتوانی خۆت وکەشتییە روختەکەت لە دورگەکان دوور بگرە، لامەدە، شەوو رۆژ بدە دەم یەکەوەو هەر کەشتی بازۆ.خەمت نەبێ هەرکە وەرێکەوتی، ئەو خواوەندەی ئاگاداری و پشتیوانی تۆی لە ئەستۆ گرتووە، بایەکی سازگارت لە دواوە هەڵدەکات وکەشتییەکەت وەپێش دەدات. کەی گەییشتیە نزیکترین کەناری ئیتاکا، کەشتییەکەت و هەموو کەشتیەوانەکانت بۆ شار بنێرەوە. لێ خۆت لە پێشا بچۆ بۆ لای ئەو بەرازەوانە هەرە دڵسۆزەت، کە بە دڵ و بە گیان ماڵاتەکەت بۆ بەخێووبەخودان دەکات. شەو لەوێ بمێنەوە، وئەمری پێبکە کە بچێت بۆ شارو پنلوپی هەرە ئاقڵ وئاغر ئاگادار بکاتەوە، کە تۆ بە ساغ وسەلامەتی لە پیلوس گەڕاویتەوە."

## پیسیستراتۆس ئامۆژگاری تیلیماخۆس دەکات کە پەلە نەکات.

هەرکە ئەتینا لە قسەکانی بووەوە، بەرەو ئولەمپی سەربەرز گەڕایەوە. لەو بەینەدا تیلیماخۆس، پاژنەی پێی کوڕەکەی نەستوری بە ئەسپایی راکێشاو خەبەری کردەوە، پێی گوت:

"پیسیستراتوس، کوڕەکەی نەستور! ڕابە، ئەسپە سم خڕەکان بێنەو بیانخە ژێر نیرو لە گالیسکەکەیان ببەستە، رێیەکی دوورمان لە بەرەو دەبێ بڕۆین."

پیسیستراتۆسی کوڕی نەستور بەرسڤی دایەوە:

"ئەی تیلیماخۆس چەند پەلەمان بێ، ناتوانین بەم تاریکە شەوە بڕۆین. ئەسپەکان رێ دەرناکەن! زۆری نەماوە بۆ بەیانی، چاوەڕوان بکە تا مینیلاوسی نێزەدار، کوڕی ئوتریوس، دیاریی و سەوقاتیەکانت بۆ ئامادە دەکات، لە گالیسکەکەی باردەکات و بەڕێمان دەکات و دوعاخوازیمان لێدەکات! میوان هەمیشە یادی خانەخوێی باش ومیهرەبان دەکاتەوەو رێزی دەگرێت."

## مینیلاوس ئامادەیە هاوکاری تیلیماخوس بکات

لەو قسانەدا بوون، کە بەیان لە عەرشی زێرینەوە دەرکەوت. لەو کاتەدا مینیلاوسی دلێرو بێباك لە خەو ڕابوو. لە نێو جێگاکەی هیلینی زوڵف شۆڕ هاتە دەرێ و بۆ لای ئەمان هات. هەرکە کوڕە

ئازیزەکەی ئودیسیوس بینی، خێرا کراسەکەی لەبەر کرد، وپاڵتۆ درێژکەی بە شانیاداو، بەرەو دەرکە ڕۆیی. کە لە مینیلاوس نزیك بووەوە،تیلیماخۆسی ئازیزی کوڕی ئودیسیوسی موبارەك، بە خانەخوێیەکەی گوت:

ئەی مینیلاوس، ئەی کوڕی ئوتریوس، ئەی زیوس زادە، ئەی سەردارو سالاری جەنگاوەران‌و لەشکران، کاتی ئەوە هاتووە بۆ مەفتەن‌و زێدی باب‌و باپیرانم ڤڕێ بکەیتەوە، حەزم لێیە بۆ وڵاتی خۆم بڕۆمەوە."

هەنگێ مینیلاوسی دلێرو قارەمان بەرسڤی دایەوە:

"ئەی تیلیماخۆس، مادامێکی بە خۆت لێبڕاویت بڕۆی، من بە تۆبزی گلت نادەمەوە، زۆرت لێناکەم، بە دڵی خۆت بکە. میوان ئازیزە، نە بە تۆبزی رادەگیرێ‌و نە دەردەکرێ. تا لە ماڵی خانەخوێ بێ وبیەوێ وەمێنێ، ماڵ ماڵی خۆیەتی‌و دەبێ بەرێزو حورمەتەوە رەفتاری دەگەڵ بکرێ، وکە ویستیشی بڕوات، دەبێ بە حورمەتەوە بەرێبکرێ. ئیدی هەموو شتێ بە خوێ‌و خوێش بەمانا. بەڵام جارێ راوەستە تا دیاریە هەڵبژاردەکانی خۆم دێنم‌و لە گالیسکەکەی بار دەکەم‌و تەمەشایان بکەیت‌ودڵت پێیان خۆش بێت. هەروەها ژنان رابسپێرم نان‌وخوانێکی باشمان لە هۆڵە گەورەکەدا بۆ فەراهەم بکەن. چونکە ئەمە لەلایەکەوە رێزنانە لە میوان، و لەلایەکی ترەوە سەفەر، بە تایبەتی سەفەری دوورودرێژ بە دەشت‌و دەرو دەریایانی پان‌و بەریندا، بە سکی تێر خۆشە. ئەگەر حەزیش دەکەی گەشتێك بە هیلاس‌وبەناو ئەرگوس دا بکەی، ئەوا ئامادەم بە خۆم لەگەڵتا بێم، با بە پیاوەکانم بڵێم، ئەسپان بخەنە ژێر نیرو لە گالیسکەی ببەستن‌و ئیدی بە شارانت دا دەگێرم‌و دەچینە میوانی خەڵکی. بێگومان هیچ کەسێك بە دەستی بە تاڵ بەرێمان ناکات. بەلای کەمەوە شتێکمان دەدەنێ دەگەڵ خۆدا بیهێنینەوە: سێکوچکەیەك بێ، مەنجەڵێکی برونز بێ، جووتێك قاتر بێ یان سوراحییەکی زێڕ بێ.."

تیلیماخۆسی زرنگ‌وبە ئاوەز بەرسڤی دایەوە:

"ئەی مینیلاوس،کوڕی ئوتریوس، زادەی زیوس، ئەی سەرداری لەشکران، دەمەوێ بڕۆمەوە بۆ ماڵ چونکە کە لەوێندەرەوە هاتم، کەسم رانەسپارد کە چاوی لە موڵك‌وماڵەکەم بێت. دەترسم لەم گەڕانەمدا بە دوای بابی خودا ئاسامەوە، خۆیشم تیا بچم. یان لە غیابی خۆما گەنجێکی پڕ بەها لە ماڵەکەما بدزرێ."

## مینیلاوس‌و هیلینا دیاریی بە نرخ دەدەن بە تیلیماخۆس

کە مینیلاوسی دلێرو بێباك گوێی لەو قسانە بوو، خێرا فەرمانی بە ژنەکەی‌و قەرەواش‌و کەنیزەکەکانی دا کە بزانن چی لە ماڵیدایە، نان‌و خوانێکی پوختەی لێ دروست بکەن. هەنگێ ئیتیونیوس، کوڕی بویتوس کە تازە لە خەو هەستا بوو، ودراوسێی کۆشکەکەی مینیلاوس بوو هات.مینیلاوسی نەترس ئەمری پێکرد ئاگرێك بکاتەوەو گۆشت ببرژێنێ. یەکسەر فەرمانەکەی ئاغای جێبەجێ کرد. ئەوجا مینیلاوس خۆی بە گەنجینە بۆنخۆشەکەیدا کرد. هەر خۆی نەبوو. هیلیناو (میگاپینتیس)شی لەگەڵدا بوون. کە گەییشتنە ئەو شوێنەی توحفەو گەنجەکانی تیا دانرابوو، مینیلاوسی کوڕی ئوتریوس دەستی دایە جامێکی دوودەسکی، وبە میگاپینتیسی

کوڕیشی گوت که ئەویش سوراحیەکی زیوی گەورەی بادەگرتنەوە لەگەڵ خۆیدا ببات. هیلین بە دیار سەندوقێکەوە وەستا بوو کە پڕبوو لە جل‌وچەرچەف زۆر نایابی دەستچنی خۆی. هیلین، خانمی خانمان، یەکێك لە جلکە هەرە جوان‌و نایابەکانی، کە لە جوانیا وەکو ئەستێرە دەدرەوشایەوە، ولە ژێر هەموو جلەکانی ترەوە دابوو، دەرهێنا. ئەوسا لە گەنجینەکە وەدەرکەوتن‌و بەنێو ماڵەکەدا هاتنەوە تا گەییشتنە لای تیلیماخۆس. مینیلاوسی قژ زەرد گوتی:
"تیلیماخۆس، هێڤیدارم زیوسی چەخماخەوان، مێردی هیرا، پشت‌و پشتیوانت بێ،و بە سەلامەتی بگەیتەوە ماڵی خۆت. جا بەم بۆنەیەوە، بەنرخترین توحفەی کۆشك‌وسەراکەم، کە ئەم سوراحیە هەرە جوان‌و پڕ بەهایەیە، کە یەکپارچە زیوی خاڵیسەیەو تەنیا قەراخەکەی زێڕکفتە، دەستکردی هیفایستوسە، کاتی خۆی شەڕڤانی بەناو ودەنگ فایدیموس، پاشای سیدونیان، کە چوومە سەردانی، لە گەڕانەوەمدا بۆ وڵات، بە دیاری دایمێ. جا ئێستا من ئەمە دەکەم بەدیاری‌و پێشکەش بە تۆی دەکەم."
مینیلاوسی جەنگاوەری بێباك، کوڕی ئۆتریوس، بەدەم ئەو قسانەوە، جامە دوو دەسکیەکەی دایە دەست تیلیماخۆس. (میگاپینتیس)ش سوراحیە زیوەکەی هێناو لە بەردەمیا داینا. ئەوسا هیلینای گۆناخڕ هات، جلەکانی بەسەر دەستەوە بوو،گوتی:
"منیش کوڕە ئازیزەکەم ئەم جلەت بە دیاری‌و وەکو یادگاری دەستکردی هیلین پێشکەش دەکەم، تا لە رۆژی زەماوەندەکەتدا، هاوسەرەکەت لەبەری بکات. بەڵام دەبێ بیدەیت بە دایکت تا بۆتی هەڵبگرێت، بۆ ئەو رۆژە. ئومێدەوارم بە خۆشی‌وبە سەلامەتی بگەیتەوە ماڵ‌و نیشتمانی خۆت."

## مینیلاوس دەعوەتێکی یەجگار نایابی بۆ دەکات

هیلین هەر کە لە قسەکانی بووەوە، جلەکانی لە بەردەم تیلیماخۆس دا دانا. بەوپەڕی خۆشحاڵیەوە لێی وەرگرت. میر پیسیستراتوس، دیاریەکانی هەڵگرت‌و خستنییە ناو سەندوقی گالیسکەکەوەو لە ناخەوە زۆری بەدڵ بوون. ئەوسا مینیلاوسی قژ زەرد هەردووکیانی بردە ژوورێ. لەسەر کورسی بەرز دانیشتن. قەرەواشێك بەمەسینەیەکی زێڕی زۆر جوانی پڕ لە ئاوەوە وەژوورکەوت، ئاوەکەی بۆ لە دەستشۆرێکی زیو کرد تا دەستیان بشۆن. ئەوسا مێزێکی زۆر خاوێنی بریقەداری هێنایە بەردەمیان. پاشان گەورە کەیبانۆی ماڵ نان‌و خواردنی بۆ هێنان‌و لەسەر مێزەکەی بەردەمیان ریزی کرد. هەنگێ کوڕەکەی بویتوس هات‌و گۆشتە برژاوەکەی بەسەردا دابەشکردن. کوڕە سەربەرزەکەی مینیلاوس بوو بە ساقیان‌و بادەی بۆ تێکردن. ئەوسا میوانەکان بە ئەدەبەوە دەستیان بۆ خواردنەکەی بەردەمیان درێژ کرد. پاش ئەوەی تێروپڕیان خواردوخواردەوە، تیلیماخۆس‌و کوڕە رەسەن‌و خانەدانەکەی نەستور، ئەسپەکانیان خستە ژێر نێرو لە گالیسکەیان بەستن تا بڕۆن. لە دەروازەکەی ژوورەوە وەدەرکەوتن‌و بە دەروازەکەی دەرەوەدا رەت بوون. مینیلاوسی قژ زەرد دوایان کەوت، جامێکی زێڕی پڕ لە بادەی بە دەستی راستی هەڵگرتبوو، تا بەر لەوەی بکەونە رێ، قوربانی شەراب پێشکەش بکەن‌و دوا نۆشخواری بکەن. لەبەردەم ئەسپەکاندا وەستاو بەیادی ئەوان خواردیەوەو گوتی:

"کوڕینە بە دوعا، سەفەر بەخێر، سڵاوو ڕێزم بگەیەننە نەستوری سەرداری لەشکران، من منەتباری ئەوم، چونکە بە درێژایی ئەو ڕۆژگارەی ئێمەی ئاخایی لە شەڕی تەروادەدا بووین، وەکو بابێکی دلۆڤان بوو بۆ من."

تیلیماخۆسی فرەزان بەرسڤی دایەوەو گوتی:"

بەسەر چاو، ئارخایەن بە، پاشای گەورە، ئەی زیوس زادە، هەرکە گەییشتینە جیّ هەموو ئەو قسانەی پێدەگەیەنین، قسەی تۆ ئەمرە. ئومێدەوارم کە گەییمەوە ئیتاکا، ئودیسیوس لە ماڵەکەی خۆیدا بدینم، و ئەم میوانداریيە بۆ ئەویش بگێڕمەوە. پێی بڵێم کە بەر لەوەی بکەوینە ریّ چ لوتفو کەرەمێکت دەرهەق کردوومو چەندت دیاریو سەوقاتی بەنرخ وگرانبەها بەگەلّ خستووم!".

## هیلینا پێشبینییەکی خۆش دەربارەی ئودیسیوس دەکات

که ئەو قسانەیان دەکرد، باڵندەیەك لە دەستە راستەوە هەڵفڕی. قازێکی ماڵیی گەورەی سپی وەك چۆڕی شیری بە چنگەوە بوو کە لە حەوشەکەدا رفاندبووی. پیاوانو ژنان بە هاتو هاوار دوای کەوتن. هەڵۆکە لێیان نزیك بووەوە، بە دەستە راستداو بە بەردەم ئەسپەکاندا چوو بە ئاسماندا. کە ئەم دیمەنەیان بینی دڵیان کرایەوەو لە ناخدا ئاسوودە بوون. پیسیستراتوس، کوڕی نەستور، بەر لە هەمووان هەڵیدایەوگوتی:

"ئەی مینیلاوس، ئەی زادەی زیوس، ئەی سەرداروسالاری جەنگاوەران، ئەمە چی بوو، خواوەندان ئەم نیشانەوموجیزاتەی نیشانی ئێمە دا، یان بۆ تۆ بوو؟

کە ئەو قسەیە کرد، مینیلاوسی خۆشەویستی ئاریس لە فکران ڕاچوو، تیا مابوو چۆن ئەو نیشانەیە، بە هێمنیو ئاقڵی شرۆڤە بکاتو لێك بداتەوە. بەڵام هیلین کە ریشوی سەرپۆشەکەی لە عاردی دەخشا، پێشی کەوتوگوتی:

"گویّ بگرن، من بە گوێرەی ئەو سەرۆیەی خواوەندان لە دڵیان ناوم، ئەم فاڵەتان بۆ دەخوێنمەوە، ودڵنیام کە دێتە دی. وەکو ئەو هەڵۆیە، کە پەروەردەی کۆسارانەو داكو بابو بێچوەکانی، ولانەو کاشانەی لەوێندەرە،ولەوێوە هاتو ئەم قازە ماڵیوکەوییەی فڕاند، بەو ئاوایە (ئودیسیوس)ش دوای ئەو هەموو نیگەرانیوسەرگەردانیو مەینەتییەی بۆ ماڵی خۆی دەگەڕێتەوەو تۆڵەی خۆی دەستێنیّ. خۆ لەوەشە ئێستا لە ماڵەوە بیّ، ودوای خوازگارەکانی بڕیبێتەوە."

## تیلیماخۆس بە دڵخۆشی وەڕیّ دەکەوێت

تیلیماخۆسی ژیرو زرینگ بەرسڤی دایەوەوگوتی:

"خواوەندی خواوەندان، زیوسی چەخماخەوان، مێردی هیرا، لە زارت بنۆڕیّ. ئەگەر ئەم پێشبینییەی تۆ بێتە دی، من وەکو خوابانۆیەك نەزرونیازت پێشکەش دەکەم. لەوێندەر، لە ماڵی خۆما، بەردەوام وەك ئەوەی خوابانۆبیت، نوێژت بۆ دەکەم."

دوای ئەو قسەیە، قامچییەکی لە ئەسپەکان دا، ئەسپ وەکو بروسکە بە نێو شارا، بەرەو دەشتە بەرینەکە بۆی دەرچوون. ئەو ڕۆژە تا ئێواریّ، مل بەنیر هەر تاویان داوە. کە گەییشتنە (فرس)،

چوون بۆ ماڵی دیوکلیس، کوڕی ئۆرتیلوخۆسی، کوڕی ئالفیوس، شەویان لەوێ ڕۆژ کردەوەو دیوکلیس پێشوازییەکی گەرمی کردن و نان وخوانێکی باشی بۆ فەراهەم کردن.

## تیلیماخۆس دەگاتە قەڵای بیلوس

هەرکە سپێدە بە قامکە گۆڵئاساکانیەوە، بەیانی دا جووتە لاو، گالیسکە زێڕنیشانەکەیان لە ئەسپەکان بەست، وسوار بوون. ئەسپ وگالیسکەیان لە دەروازە گەورەکەوە لە حەوشە بردە دەرێ. پیسیستراتوس قامچییەکی بە ئەسپەکاندا کێشا. ئەسپ وەکو با بۆی دەرچوون، بە جۆرێ تاویان دەدا، ڕێگە خۆی لەبەر نەدەگرتن. زۆر زوو گەییشتنە قەڵای هەزار بە هەزاری پیلوس. هەنگێ تیلیماخۆس، رووی کردە کوڕەکەی نەستوروگوتی:

"ئەی کوڕی نەستور قسەیەکت پێ بڵێم بە قسەم دەکەی؟ شانازییە بۆ ئێمە هەمیشە میوان و خانەخوێی یەکتربین، لە ماڵی یەکتر بین، جگە لەوەی بابمان دۆستی دێرینی یەکترن، خۆیشمان هەڤسال وهاوتەمەنین، ئەم سەفەرەش هێندەی دی دۆستایەتیمان بتەودەکات. تۆ ئەی شامێری پەروەردەی زیوس، لەوە زیاتر لەگەڵم مەیە، من سواری کەشتییەکەم دەبم و دەڕۆم، دەبێ بە پەلە بگەمەوە ماڵێ. بۆیە لا نادەم ونایەمە خزمەت بابت، چونکە دەترسم ئەم پیرە پیاوە، بە مەبەستی خزمەتکردنی زیاتری من، بە تۆبزی گلم بداتەوەو نەیەڵێت بڕۆم. منیش زۆر پەلەمە بە زووترین کات بگەمەوە وڵات."

کە تیلیماخۆس ئەو قسانەی دەکرد، کوڕەکەی نەستور سێ ودووی دڵی خۆی دەکرد کە چی بکات،وچۆن بە قسەی بکات. لەم بەراوردو لێکدانەوەیەدا بوو کە لە پڕ بیروخەیاڵی لەسەر بیرۆکەیەك گیرسایەوە کە بەلای خۆیەوە باشترین چارەسەر بوو. سەری ئەسپەکانی بۆ لای کەشتییە خۆشڕەووکەناری دەریاکە بادایەوە. ئەو دیاریو سەوقاتییە بەنرخانەی کە مینیلاوس پێشکەش بە تیلیماخۆسی کردبوو، داگرت،وخستنییە ناو کەشتییەکە. ئەوسا تیلیماخۆسی هاندا کە پەلە بکات، وگوتی:

"خێراکە، سەرکەوە سەر کەشتییەکەت، وبە هاوڕێکانت بڵێ، با ئەوانیش سەرکەون، وبەر لەوەی من بگەمەوە ماڵێ،وفریا بکەوم باسی تۆ بۆ بابم بکەم، بەڕێبکەون و بڕۆن. چونکە من بابی خۆم دەناسم و دەزانم چەند سەخت وتوندە، مەحاڵە ڕێگەت بدات، بڕۆی. بە خۆی دێ بۆ ئێرەو بە تۆبزی بۆ ماڵەوەت دەباتەوەو مەحاڵە بە تەنیا بۆ ماڵ بگەڕێتەوە. بە هەرحاڵ زۆر توڕە دەبێت."

دوای ئەو قسانە، سەری ئەسپە یاڵ شۆڕەکانی بادایەوەو بەرەو شاری پیلوسیەکان گەڕایەوەو زۆر زوو گەییشتەوە ماڵێ. بەڵام تیلیماخۆس لەو ماوەیەدا بانگی لە پیاوەکانی کردو فەرمانی پێدان:

"هاوڕێیان خۆتان سازبکەن و کندڕو پەت وگوریس و کەرەستەو تفاقی سەر کەرشتییەکە ڕێك بخەن، وسەربکەون، بەڵکو بە پەلە دەڕۆین!".

هەرکە ئەو قسەیەی کرد، یەکسەر بە گوێیان کرد. دەستبەجێ سواری کەشتییەکە بوون، وهەر کەسەو لە جێی خۆی و بەلای سەوڵی خۆیەوە دانیشت.

## تیلیماخۆس نوێژ بۆ ئەتینا دەکات

ئیدی تیلیماخۆس، لە کاتێکا لە بەشی دواوەی کەشتییەکەدا خەریکی نوێژو نزاو قوربانی کردن بوو بۆ ئەتینا، کابرایەکی بێگانەو غەوارەی لێ هاتە پێشێ. ئەم کابرایە پیاوێکی کوشتبوو و لە ئارگوسەوە هەڵاتبووو، بابایەکی فاڵبین‌و غەیبزان بوو. بەڕەگ‌و ڕەچەڵەك دەچووەوە سەر خانەدان‌و ماڵباتی میلامپوس. میلاپوس جاران لە پیلوسی مەڵبەندی پەزان ئاکنجی بوو، و دەژیا. یەجگار زەنگین ودەوڵەمەند بوو، کۆشك‌وتەلارێکی فرە گەورەی عەنتیکەو بەشکۆی لە شاری پیلوسدا هەبوو. پاشان سەری خۆی هەڵگرت‌و ڕۆیی بۆ ناو بێگانان، لە زێدومەفتەنی خۆی‌و لە(نیلیوس)ی جوامێر، پاشاو سەرداری بەشەران هەڵات، ئەو نیلیوسەی بۆ ماوەی یەك ساڵی تەواو بە ناهەق دەستی بەسەر هەموو دارایی‌وموڵك‌و ماڵەکەی میلاپوسدا گرت، وخۆیشی لە سوچی ڕەشچاڵان توند کرد. لە ماوەی ئەو ساڵەدا لەکۆشك‌وسەراکەی فیلاکوسدا، لە زیندانێکی تەنگ‌و تاریك دا، کۆت‌و زنجیریان کردبوو. لە پێناوی کیژەکەی نیلیوس‌و سزای ئەو کارە گەوجانەو شێتانەیەی بە فیت‌و هاندانی خوابانۆیەکی نەسرەوت، ئیرینیس–ی ماڵ وێرانکەر ئەنجامی دابوو، ڕەنج وئازارێکی کوشندەی دەکێشا. بەڵام سەرباری ئەوەش لە مردن خەلەسی‌و گاگەلەکەی لەفیلاکییەوە بۆ پیلوس هێنا، وبەمەش تۆڵەی لە نیلیوسی خواوەند ئاسا کردەوەو کیژەکەی لێ سەندو کردی بە هاوسەری براکەی خۆی. پاشان باری کرد بۆ وڵاتی خەڵکێن بێگانە، بۆ ئارگوس، مەڵبەندوپەروەرشتگەی ئەسپان. ئیدی قەدەر، وای لە چارە نووسی بوو کە لەوێ بگیرسێتەوەو ئاکنجی ببێ‌و، حوکمی گەلێك لە ئارگوسیەکان بکات. لەوێ ژنی هێنا، کۆشك‌وسەرایەکی بەرزو گەورەی بۆ خۆ دروست کرد، دوو کوڕی بوو بە ناوی ئەنتیفاتس و مانتیوس، ئەم کوڕانە زۆر بە تواناو بەهێزو بەهرەدار بوون. پاشان ئەنتیفاتس، ئویکلیسی بوو، کە پیاوێکی یەجگار عەگیدوجوامێر بوو. پاشان ئویکلیس، (ئەمفیارایوس)ی خستەوە، ئەمە شەڕڤان‌و لەشکر بەزێنێکی بێ وێنە بوو. زیوسی سپەردارو ئەپۆلو لە کانگای دڵەوەخۆشیان دەویست. وێڕای ئەمەش زۆر نەژیا، نەگەییە تەمەنی پیری، ملوانکەیەکیان بە بەرتیل دابوو بە ژنەکەی، ئەویش قەناعەتی پێکردبوو کە بچێت بۆ تیبەو، لەوێندەر کوژرا. ئەمە دوو کوڕی هەبوون بە نێوی ئالکمایون‌و ئەمفیلوخۆس، بەڵام مانیتوس،کوڕەکەی تری میلامپوس، پولیفیدس‌وکلیتوس)ی لێکەوتنەوە.کلیتوس یەجگار جوان‌و قۆز بوو، خوابانۆی زێڕین عەرش، سپێدە، حەزی لێکردو ڕفاندی بۆ ناو خواوەندان تا لەوێندەر بژی. ئەپولو، لە دوای مردنی ئەمفیارایوس، (پولیفیدس)ی کرد بە پێشگۆو فاڵبینێك کە لە نێو تیرەی بەشەراندا لینگەی نەبوو.دوای مردنی ئەمفیارایوس، لەگەڵ بابی دا بەشەڕ هات وچوو بۆ هیبریسیا، لەوێ ئاکنجی بوو، و هەموو خەڵکی بۆ پرس‌و ڕاوفاڵ وپێشگۆیی روویان تێدەکرد.

## گفتوگۆی نێوان تیوکلومینوس‌و تیلیماخۆس

جا ئەو غەریب‌وغەوارەیەی کە لە پڕ لە تیلیماخۆس پەیدا بوو، وهاتە پێشێ، کوڕی ئەو بوو، (تیوکلومینوس)ی ناو بوو. کە بینی تیلیماخۆس لە ناو کەشتییەکەیدا خەریکی نوێژو نزایە، لە

خواوەنـدان دەپاڕێتـەوە، قوربانیـان پێشـکەش دەکـات، وسـونەتی نۆشـخواریو بـادە پـرژێنی بـۆ خواوەندان ئەنجام دەدات، زیاتر لێی چووە پێشیّو بە دەمولەبزێکی شیرین پێی گوت:

"ئەی برادەر،مادامێکی لێرەدا خەریکی نوێژونزاو قوربانیکردنی بۆ خواوەندان، جا توبی تـو ئـەو قوربانیانـەی پێشـکەش بـە خواوەنـدانی دەکـەی، تـۆ گیـانی خـۆت، تـۆ گیـانی ئـەو هاوڕێیانـەی دەگەڵتدان، هەرچیەکت لێدەپرسم رێك وراست، بیّ پێچو پەنا، بیّ پەردە، بیّ ئەوەی هیـچ شـتێکم لێوەشێری بەرسڤم بدەوە. پێم بڵـیّ تـۆ کێـی؟ لـە کێـوە دێـی؟ خـەڵکی چ شـارێکی؟ داكو بابت لـە کوێن؟"

تیلیماخۆسی ژیرو زرینگ وەڵامی دایەوە:

"کەواتـە غـەریبۆ، دڵنیابـە رێـك وراسـت وەڵامـت دەدەمـەوە. مـن خـەڵکی ئیتاکـام. ئودیسیوسـی بابیشم، ئەگەر بتوانم بڵێم رۆژیّ لـە رۆژان بـابم هـەبووە، لـەویّ دەژیـا. بـە شـێوەیەکی خـەمناك تیـا چووە. ئێستاش ئەم هاوڕێیانەم خڕکردووەتەوەو سواری ئەم کەشتییە بۆرە بووین، وهـاتووم بـۆ ئێرە تا سۆراخێکی بابم بکەمو هەواڵێکی بزانم، کە زۆر لە مێژە رۆییوە."

تیوکلومینوس—ی خواوەندا ئاسا، بەرسڤی دایەوەوگوتی:

"دەیسا منیش کەسێکی قاچاخم. لە زاگەومەفتەنی خۆم هەڵاتووم. چونکە پیاوێکی خزمـی خـۆم کوشتووە. براوکەسوکارێکی فرەی لەویّ، لـە ئـارگۆس، پەروەرشتگەو مەڵبەنـدی ئەسـپی رەسـەن هەیە. لە نێو ئاخاییەکاندا زالّ وفەرمانڕەوا بوون. جا من بـۆ ئـەوەی خـۆم لـە تۆڵـەی وانو مـەرگی رەش بدزمـەوە، لـەویّ هـەڵاتووم، و وادیـارە چارەنووسـی مـن ئەمەیـە کـە عـەودالّو رەهەنـدەو سـەرگەردان بم. تکـات لێدەکـەم مـنی رەهەنـدە، لێقـەوماو بگـرە خـۆت، لـە کەشـتییەکەت دا جـێم بکەوە، کارێکی وا بکە نەمکوژن، چونکە پێمواپە، دژمنەکانم لە دوومن، تاقیبم دەکەن."

تیلیماخۆسی دانا وەڵامی دایەوە:

"چ قەیدییە، مادامێکی خۆت گەرەکتە، من لـە کەشـتییە روختەکـەم داتنـاگرم. فـەرموو لەگەڵمانـدا وەرە. لەوێنـدەریش، لـە مـاڵی خۆمـان بـەپێی توانـا وەکـو یـەکێك لـە خۆمـان رەفتـارت دەگـەڵ دەکەین".

## تیوکلومینوس بەگەڵ تیلیماخۆس دەکەویّ

دوای ئـەو قسـانە نێـزە برونزییەکـەی لێوەرگرتو لـە نـاو کەشتییەکەدا داینـا. ئەوسـا بـە خـۆی سـواری کەشـیتیە درێژەکـە بـوو، چـوو لـە دواوە دانیشـت، ولـە تەنیشـت خۆیـەوە جێـی بـۆ تیوکلومینوس کردەوە. کەشتیوانەکان، رەسن وگوریسەکانیان لە پاشـەڵی کەشـتییەکە کـردەوە. تیلیمـاخۆس فـەرمانی بـە کەشـتیوانەکان دا کـە رەسـنەکان وەکـەنو ئـەوزارەکان کـۆ بکەنـەوە. یەکسەر فەرمانەکەیان جێبەجیّ کرد، ساریەکەیان کە لە دارکاژ بوو، بەرزکردەوەو لـە جێـی خـۆی چەقاندیان، جوان قایمیان کرد، ئەوسا بادەوانی سپیان هەڵکرد، بە سیرمەی بادراوی چـەرمی گاجووتـان بەسـتیان. ئـەتینای چـاوگەش لـە ئاسمانـەوە بایـەکی سـازگاری بـۆ هـەڵکردن تـا کەشتییەکەیان خێراتر دەریای سوێر ببڕیّو زووتـر بگاتـە جـیّ. بـەو جـۆرە بـە بـەردەم سەرچاوەو کانیاوە جوانوسازگارەکانی کرونیوخالکیس دا تێپەڕین.

ئەوسا خۆر ئاوا بوو،شەو هەواری هەڵدا،دنیاو ڕێگاوبانان لە تاریکیدا نقووم بوو. کەشتییەکە بە حوکمی بایە سازگارەکەی زیوس زۆر زوو گەییە فیای PHEUE، وبە ئیلیس دا، کە ئیپیان لەوێندەر فەرمانڕەوا بوون، تێپەڕی .تیلیماخۆس لەوێوە ڕووی کردە دوڕگە ڕکو ڕژدەکان، ولە ناخا دەترساو بیری لەوە دەکردەوە کە ئاخۆ لە مردن دەخەلەسێ؟ ئاخۆ دەکەوێتە داوەو دەگیرێت؟!

## ئودیسیوس لێدەبڕێ
## بچێتەوە بۆ ماڵی خۆیو خوازگارەکان بدینێ

لەو بەینەدا ئودیسیوسو بەرازەوانە مەردوڕەندەکە لە کوختەکەی ئەودا، لەسەر سفرە دانیشتبوونو نانیان دەخوارد. پیاوەکانی دیکەش لەولایانەوە مژولی نان خواردن بوون. پاش ئەوەی تێرو پڕیان خواردوخواردەوە، ئودیسیوس هاتە قسان: دەیویست بەرازەوانەکە تاقی بکاتەوەو بزانێت ئایا بە هەمان گەرموگوڕیو دلۆڤانییەوە خولکی مانەوەی دەکات، پێی دەڵێت لەوێندەر، لە گوندی وەمێنێ، یان دەستی پێوە دەنێو بۆ شاری ڕەوانە دەکاتو لەکۆڵ خۆی دەکاتەوە. بۆیە گوتی:

گوێ بگرە یومایوس، ئێوەش کوڕینە گوێتان لێبێ، من بە نیازم سۆزی، بۆ ئەوەی لەوە پتر نەبم بە بار بەسەر ئێوەوەو لەسەر کیسەی ئێوە نەژیم، بۆ شار بڕۆم. حەزدەکەم ڕێنوێنیو ئامۆژگاریم بکەی، و یەکێکی باوەڕپێکراوم بەگەڵ بخەی کە ڕێگەم نیشانبداتو بۆ شارم بەرێت.کە گەییمە شار، ئیدی بۆ خۆ دەسوڕێمەوەو لە دەرکەی ماڵان دەدەم، ویەکێك پەیدا دەبێت قومە ئاوێك، و لەتە نانێکم بداتێ. حەزیش دەکەم بچم بۆ ماڵی ئودیسیوسی خواوەندئاسا، وخەبەرو هەواڵی بگەیەنم بە پنلوپی ئاقڵو ئاغر. ئەوسا دەتوانم خۆ بەنێو خوازگارە خۆپەسندو بێ شەرمەکانیا بکەم، بەڵکو لەو هەموو خێرو فەڕەی بەخوتو خۆڕایی کەوتووەتە بەردەستیان، نانو ئاوێکم وێدەدەن. ئەگەر چاکەیەکی وام دەگەڵ بکەن، ئامادەم بە دڵی خۆیان خزمەتیان بکەم. جا با ئەوەشت پێ بڵێموبیکەمە دەستەوە کە لە سایەی بەرەکەتی هیرمیسی موبارەکەوە، کە هەر خۆی بەهرە بەخشی هەر کەسێکەو کارسازی کاری بەشەرانە، هیچ بەشەرێك لە خۆشخزمەتیو خزمەتگوزاری دا بە بابی قولانمدا ناگات. بۆ نموونە دارکردن، دارشکاندن بۆ وەجاخوئاگردان، ئاگرکردنەوە، گۆشت برژاندن، ومەی گێڕی، وەلحاڵ لە هەر خزمەتگوزاریەکدا کە نۆکەرو خولامان، بۆ ئەشرافانو پیاوماقولانی دەکەن، کارامەومەعلانم.

## یومایوس ڕێگەی ئودیسیوس نادات، بڕوات

ئەی یومایوس، ئەی بەرازەوان! ئەو قسانە زۆریان کارتێکردی، بۆیە بەسەرسامی بەرسڤت دایەوەوگوتت:

"پەنا بە خواوەندانی مەزن! ئەی میوانی ئازیز بۆچی ئەو بیرانەت بە مێشکدا هاتوون؟ ئەمە چ قسەیەکە تۆ دەیکەی؟ وادیارە ئەجەل هەڵی گرتوویتو دەتەوێ بەزووترین کات تیا بچیت. ئاخر بەچ ئەقڵێکەوە گەرەکتە بچیتە ناو کۆڕومەجلیسی خوازگارانێکەوە کە خۆ پەسندیو نامەردیو

دڵڕەقیان گەییوەتە کەشکەڵانی ئاسمان؟ ئەوانە پێشخزمەتانی وەکو تۆیان بە بەلاشیش ناوێت، پێشخزمەتانی وان هەموو گەنج و باڕن، تەڕپۆش وشیکپۆشن، ئەوانەی خزمەتیان دەکەن، کوڕی جوان و قژ رەخشان و نەوڕەسن. بەڵێ خزمەتکارەکانی ئەوان لەو جۆرەن،مێزوخوانیان هەمیشە پاك وخاوێن، پڕ لە نانو گۆشت و بادەیە. پیاوی چاك بە لێرە وەمێنە، تۆ لێرە بەسەر کەسەوە بار نیت. نە بەسەر منەوە، نە بەسەر هیچ کەسێك لەو پیاوانەوە کە دەگەڵ مندان. کە کوڕە ئازیزەکەی ئودیسیوس بێتەوە، جل وبەرگی نایابت دەداتێ، وەهەنگێ بۆ هەر کوێت بویٚ ودڵت پێوەی بیٚ دەت نێرێت."

هەنگێ ئودیسیوسی رەسەن، نموونەی سەبروحەوسەڵە، گوتی:

"ئەی یومایوس، هیوادارم من چەندت لێرازیم، زیوست دە ئەوەندە لێرازی بیٚ. چونکە تۆ لە ژیانی سەرگەردانی و دەرۆزەکاریت قوتارکردم. بەڕاستی ژیانی گەدایی وخوازەڵۆکی قورس و ناخۆشە. ئەم سکە خەڵکی ناچاردەکات مل بو ئەو ژیانە پڕ لە زەلیلی و زەبوونیە بدەن. جا مادامێکی تۆ گلم دەدەیتەوەو دەخوازی چاوەنۆڕی ئاغات بم، وەرە باسی دایك وبابی ئودیسیوسی خواوەند ئاسام بۆ بکە، کە بەجێی هێشتن پیر بوون، ئایا هێشتا لە ژێر پرشنگی هەتاودان و دەژین یان مردوون وچوون بۆ هادیس؟.

## یومایوس شتێك لەمەڕ رۆژگاری

## منداڵی خۆی بۆ ئودیسیوس دەگێڕێتەوە.

یومایوس، سەرۆکی بەرازەوانەکان وەڵامی دایەوەوگوتی: "بوەستە، ئێستا هەموو شتێکت بۆ دەگێڕمەوە، هیچت لێنا شارمەوە. لایرتیس هێشتا ماوە، دایمەی خوا لە زیوس دەپاڕێتەوە کە لە ماڵەکەی خۆیدا گیانی بکێشێت. چونکە یەجگار خەمبارو لێو بەباری رۆییشتنی کوڕەکەی و مەرگی ژنە سەلاروسەنگین و ئاقڵ وئاغرەکەیەتی. بەڕاستی مەرگی ژنەکەی زۆری کارتێکرد، زۆر زوو پیری کرد! ئەو ژنە لە داخ وسوێی کوڕەکەی بوو بوو بە داسك و دەرزی، هەمیشە دەردەدارو چاو بەگریان بوو. بە دەم دەردوئازاری دووری کوڕەکەیەوە،بە نامرادی سەری نایەوە. ئومێدەوارم ئەو جۆرە مردنە هەرگیز بە نسیب هیچ کەسێکی ئەم دوڕگەیە، کە منیان خۆش دەویٚ و دۆستانە رەفتارم دەگەڵ دەکەن نەبێت! تا ئەو ژنە لە دنیادا بوو، سەرم لێدەدا، لە حاڵیم دەپرسی، ئەویش سەرباری خەم وکول و کۆڤانی خۆی، زۆرم پیٚ خۆش بوو کە دەی لاواندم، بۆ من خەمرەوێنێکی گەورە بوو. چونکە بە خۆی دەگەڵ کتیمینی کیژە چکۆلەیدا، کە جلکێکی شپ وشۆڕی لەبەردا بوو، بە خودان و پەروەردەی کردبووم، و لەگەڵ منداڵەکانی خۆیدا فەرقی نەدەکردم، یان فەرقێکی زۆر کەمی دەکردم. کە هەردووکمان گەورە بووین، ئەویان دا بەشوو، رۆیی بۆ سامی تا لەوێندەر دەگەڵ شووەکەیدا بژی. هەڵبەتە مارەیی و جیازییەکی یەکجار فرەیان وەرگرت! سەبارەت بە منیش، خانمی گەورە ئانتیکلی (دایکی ئودیسیوس) دەستە جلێکی یەجگار جوان وجووتیٚ پێڵاوی بۆ کردم و بۆ گوندی و ناو کێڵگەو مەزرایانی ناردم. لەو سەردەمەدا لە هەموو کاتیٚ پتر لە دڵیا شیرین بووم. جا ئێستا من هەر هەموو ئەو سۆزومیهرەم لە دەست داوە. بەڵام شوکر خواوەندان، بەرەکەتیان خستووەتە کاروکۆششمەوە، لە سایەی

بەرەکـەتی وانـەوە، تێـر دەخۆم‌ودەخۆمـەوە، کـە میـوانێکی بـەڕێز روو دەکاتـە کوختەکـەم بەسـەربەرزیو روو سـووری رایـدەگرمو بـەڕێی دەکەم،ولـە هیچم کـەم نیـە. بـەڵام هـەرگیز نـاتوانم چاوەڕوانی قسەیەکی خۆش، یان کردارێکی میهر ئامێز لە خانمی تازەم، پنلوپی، بکەم. لەوەتای خوازگارانی بێ چاوو روو رژاونەتە ئەم ماڵە، نەگبەتیو بەدبەختی باڵی بەسـەردا کێشاوە! بـەڵام وێڕای ئەمـەش رەنجبەرونۆکـەرو خزمـەتگوزاران زۆریـان پێویست بەوەیە رووبـەڕوو قسـە دەگـەڵ خـانمی خـۆدا بکـەن‌وپرس‌و راوێـژی پێبکـەن، لـە مـاڵی ئـەودا نان‌وئـاو بخۆن،ولـە گەڕانـەوەدا بـۆ کێڵگەو مەزراکانیان،دیاریەکی دڵخۆشکەریان لە خانمی گەورە وەرگرتبێ".

هەنگێ ئودیسیوسی بەردەبار هەڵدایەوگوتی:

"ئێی دنیای دون! کەواتە تۆ ئەی یومایوسی بەرازەوان، هەر بە منداڵی لە داك‌وباب‌و زاگەی خۆت رفێنراوی. باشە وەرە ڕاستم پێبڵێ. ئایا ئەو شارە گەورەیەی کە باب‌وداکت تیـای دەژیـان، گیراو بە تالان چوو؟ یان تۆ منداڵ بوویت‌و بە تـەنیا لای پـەزو ماڵاتـان بوویت‌ودژمنـان رفانـدیانیت‌و لـە کەشتیان نایت‌و، بۆ ئێرەیان هێنایت‌و بە پارەیەکی باش بە ئاغاتیان فرۆشتی؟!".

سەرۆکی بەرازەوانەکان بەرسڤی دایەوەوگوتی:

"ئەی میوانی ئازیز، سەبارەت بە پرسیارەکەت، دانیشە، بادەی خۆت بخۆرەوەو گوێبگرە با بۆتی بگێڕمەوە. شەوگاردرێژە، بەشی خەویش دەکات‌و بەشـی گـوێگرتنیش. نـابێ لـە ئێسـتاوە بچیتە ناو جێگا! خەوی زۆر بە هەمان ئەندازەی خەوی کەم خراپە... بەڵام کوڕینە ئێـوە، کێتـان حـەزتان لـە خـەوە بـا بچـێ لـە دەرەوە بخـەوێ! هەرکـە رۆژ بـووەوە، نـان بخـۆن‌و ئەوسـا بـەرازەکانی ئاغـام ڕابدەن بۆ دەشـت‌ولەوەڕ. ئێمـە جـارێ لێـرە، لـە کوختەکـەدا، دەخۆین‌ودەخۆینـەوەو دەردە دڵ بـۆ یـەکتری دەکـەین،ویادی مەینەتیـە زۆرو زەبەنـدەکانمان دەکەینـەوەو بەمـە خـەمی دڵمـان بـە بادەدەین.باس‌و یادی رەنج‌و مەینەتی بۆ کەسێك کە مەینەتیو تەنگانەو ئاستەنگی زۆری دیبێ، لەزەت‌و خۆشی خۆی هەیە. دەیسا تۆش گوێبگرە با وەڵامی هەموو پرسیارەکانت بدەمەوە.

دوورگەیەك هەیە سیرای پێدەڵێن، رەنگە ناوت بیستبێ. کەوتووەتە سەرووی ئورتیجیـاوەو هـەتاو لەوێندەرەوە نشێو دەبێتەوەو بەرەو ئاوا بوون دەچێت. خەڵکەکەی زۆر نین، بەڵام وڵاتێکی باشـە، پـەزو مـاڵات‌و وڵسـاتی زۆرە، رەزو بـاخ‌و گەنمـەجاڕی فرەیـە. گرانـیو قـات‌و قـڕی تیـا نیـە، خەڵکەکـەی تووشـی نەخۆشـی سـەخت‌و دژوارو بـە ئـازار نـابن. بـەڵام کـە خەڵکەکـەی پـیر دەبـن، ئـەپولوی زیـوین کـەوان، دەگـەڵ ئارتیمسـدا دێ،و بـە تـیری رەحمـەت تێیـان دەکـەوێو بـێ هـیچ ئازارێـك دەیانکوژێـت، ئـەم دوڕگەیـە بریتییـە لـە دوو شـار، خەڵکەکـە گشـتیان لـەو دوو شـارەدا دەژیـن. بـابی مـن، کتیسیوسـی کـوڕی ئورمینـوس، کـە لـە خواوەنـدان دەچـوو، حوکمڕان‌وپاشـای هەردوو شارەکە بوو.

رۆژێ فینیقییەکان، کە بە کەشتیوانیودەریاوانی بەنێوبانگن، بەڵام رژدو چـروك‌و تـەماعکارن، بـە کەشتییەکی پـڕ لـە وردەواڵـەو تەتکەوپەتکـەو مت‌ومورەوە بـۆ ئـەو دوڕگەیـە هـاتبوون. لـەو سـەرو بەنـدەدا ژنێکـی فینیقـی، جـوان، بـاڵا بـەرز، ودەسـترەنگین لـە کـاری دەسـتی ژنانـەدا، لـە مـاڵی بـابم دەژیا. ئەم فینیقییە فریبۆکانە، لە خشتەیان بردبوو، رۆژێك کە ئـەم ژنـە لـە نزیکـی کەشتییەکەی

ئەواندا، خەریکی کوڵوکانی دەبێت، یەکێك لەو کەشتیوانانە خۆی دەگەیەنێتێ، بە جۆرێ دەکەوێتە خاكوپای،وئەڤینوەرزی کە هیچ ژنێکی تەبیعەت سەنگینیش بەرگەی نەگرێ، بەو جۆرە هەپەی دەنێتوله پاڵ کەشتییە بۆردا بە دزییەوە دەگەڵی جووت دەبێت. ئەوسا هەر ئەو پیاوە لێی پرسی بوو کە کێیەو خەڵکی کوێیە، ئەویش بێ چەندوچوون کۆشکەکە بەرزەکەی بابمی پێ نیشان دەداتودەڵێت:

"من شانازی بەوە دەکەم کە خەڵکی سیدونم کە بە برونز بەنێوبانگە، کیژی (ئاریباس)م کە پیاوێکی فرە زەنگینە. کاتی خۆی کە لە کێڵگەومەزرایان دەگەڕامەوە، تافیانی دزانی دەریایی، بۆ ئێرەیان رفاندمو بە بەهاو نرخێکی فرە بەم پیاوەیان فرۆشتم."

هەنگێ ئەو پیاوەی کە بە دزییەوە دەگەڵی جووت بوو بووو، پێی دەڵێت:

"باشە حەزناکەیت دەگەڵ ئێمەدا بگەڕێیتەوە بۆ وڵاتی خۆت، وجارێکی دی بابو دایکت لە کۆشكوسەرا بەرزەکەیاندا ببینی؟ هێشتا زندوونو دەڵێن دەوڵەمەندیشن".

ژنەی تاین بەرسڤی دایەوە:

"با زۆریش حەزدەکەم، بەڵام دەبێ سوێندم بۆ بخۆن کە هیچ ئەزیەتم نادەنو بە سەلامەتی دەمگەیەننەوە زاگەو مەفتەنی خۆم."

ئەو قسەیە دەکاتوهەمووان، وەکو چۆن ئەو داوای لێکرد بوون، سوێندی بۆ دەخۆن. کە لە سوێندەکەیان دەبنەوە، ژنەی تاین دەکەوێتە قسانودەڵێت: "گوێ بگرە، بە هاوڕێکانت بڵێ، ئەگەر لە رێگەدا یان لەسەر کانیوسەرچاوەکەدا دیتیانم، کەسیان قسەم دەگەڵ نەکەن، نەبادا یەکێك بماندینێو بچێ بۆ کۆشكو سەراو پاشا ئاگادار بکاتەوە. هەنگێ من دەزندان دەخاتو ئێوەش دەکوژێت. ئەم قسەیەی من بکەنە ئاڵقەو لە گوێی بکەن. ئامان زمانی خۆتان بگرن. بەپەلە کەلوپەلەکانتان باربکەن. هەرکە ئامادەو ساز بوون، بە پەلە جوابێکم بۆ بنێرن: چونکە چەندی بتوانموبەردەستم بکەوێ زێڕو زێوەران دەگەڵ خۆدا دێنم. حەزیش دەکەم لە هەقی ئەوەی کە بە کەشتی خۆتان دەمبەن شتێکتان بدەمێ. من لێرە، منداڵێکی ئاغای دلاوەرو خانەدانم بەخێو دەکەم، منداڵێکی زۆر زرینگو زیتەڵە، هەرکە لە ماڵ وەدەردەکەوم بەغار دووم دەکەوێت. دەتوانم دەگەڵ خۆمیدا بهێنمو بیدەم بە ئێوە،ودەتوانن بۆ خۆتان لە هەر وڵاتێکی بێگانەدا، بەنرخێکی باش بیفرۆشن.

هەرکە ئەو قسەیەی کرد، ئیدی یەکڕێ بۆ کۆشکە جوانەکەی ئاغای گەڕایەوە.فینیقیەکان یەك دانە ساڵی تەواو لە وڵاتی ئێمەدا مانەوە. ئەوەندەیان سەروەتوسامان بەدەست هێنا، کە عەماری کەشتییە گەورەکەیانی پڕکرد،و کە ئامادەو سازبوون، ودەبوایە برۆن، یەکێکیان نارد کە ئەو ژنە ئاگادار بکات. پیاوێکی، حیلەبازی خاپینۆك، بە خۆو گەردانەیەکی زێڕی بە مرواری بەین کراوەوە خۆی بە کۆشکەکەی بابمدا کرد. ئیدی کارەکەرەکانودایکی ئازیزم، گەردن بەندەکەیان لێوەرگرت، و زۆریان ئەم دیوو ئەو دیو کرد، بە دڵیان بوو، سەواو مامەڵەیان کرد، لەسەر نرخەکەی رێك کەوتن، ویارۆ لەو بەینەدا، بێئەوەی هیچ قسەیەك بکات، سەرێکی بۆ ژنەی تاین لەقاند، وئەوسا یەکسەر بەرەو کەشتییە گەورەکە گەڕایەوە. ژنەش دەستی منی گرتو لە

ماڵ وەدەرکەوتین،کە گەییشتینە ڕاڕەوەکەی پێشەوەی کۆشکەکە، سەیری کرد مێز ریز کراوەو ئامادە کراوە بۆ میوانەکانی بابم کە تازە چوو بوون بۆ کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی گشتی، مێزەکان کاس جامیان لەسەر دانرابوو. خێرا سێ جامی هەڵگرت وخستییە باخەڵییەوەو شاردنیەوە. من بێئەوەی ئەقڵم بە هیچ شتێکدا بشکێ، دووی کەوتم. دوای ئەوە خۆرئاوا بوو، تاریکی باڵی بەسەر دنیادا کێشا. بەپەلە ڕۆییشتین تا گەییشتینە بەندەرەکە. کەشتییە خۆشڕەوەکەی فینیقیەکان لەوێ وەستا بوو. کەشتیوانەکان کە ئامادەی ڕۆییشتن بوون، ئێمەشیان سەرخست و رێگەی دەریایان گرتەبەر. زیوس بایەکی سازگاری لە دوو هەڵکردین. شەش دانە شەوو ڕۆژ بەسەر کەشتییەوەو بە ناو دەریادا ڕێمانکرد. کە زیوسی کوڕی کرونوس، شەوی حەوتەمی لێ ڕۆژکردینەوە، ئەرتەمیسی کەوانکێش، تیرێکی لەو ژنەداو، وەکو چۆن نەورەسێك یان هەر باڵندەیەکی دی شڵپ خۆی بە دەریادا دەدا، بەو ئاوایە شڵپ کەوتە ناو کەشتییەکە. ئیدی دەریاوانەکان لاشەکەیان فڕێدایە دەریاکەوە تا ماسیو سەگانی ئاوی بیخۆن. منیش تەنیاو خەمبار لە سوچێکەوە کزکۆڵەم کرد. ئیدی باوشەپۆلان پیرە کەشتیان بۆ ئیتاکا ڕەپێش دا.لەوێندەر لایرتیس بە ماڵو زێڕی خۆی کڕیمی، و بۆ یەکەمجار چاوم بەم وڵاتە کەوت. ئودیسیوس، توخموتۆوی زیوس بەرسڤی دایەوەوگوتی:

"ئەی یومایوس، بەڕاستی بەو چیرۆکە خەمناکەت، بەو سەربهوردە دژوارەت، خەمبارت کردم. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوەشدا، زیوس چاکەیەکی لەگەڵدا کردوویت، کە دوای ئەو هەموو نەگبەتیە تووشی کردوویت بە تووشی پیاوێکی دڵاواو بەخشندەوە. نانوئاوی زۆر، خواردنو خواردنەوەی مشەت دەداتێو ژیانت باشە. ئەگەر لە جیاتی من بوایەی چت دەکرد. دوای ئەو هەموو دەربەدەریو شارانگەڕییە، تازە بە تازە، ئاوارەو سەرگەردان ڕێم کەوتووەتە ئێرە."

## تیلیماخۆس دەگاتەوە وڵات

بەدەم ئەو قسانەوە شەوگاریان شەق کرد. ئەوسا ڕاکشان بخەون. ماوەیەکی کەم خەوتن،و خێرا سپێدەی زێڕین عەرش بەیانی دا. لەو ماوەیەدا تیلیماخۆسو هاوڕێکانی لە کەناران نزیك دەبوونەوە. هێواش هێواش بادەوانەکانیان دادایەوە، ساریەکەیان داگرت. بە سەوڵ لێدان کەشتییەکەیان، گەیاندە بەندەرەکە، ئەوسا لەنگەریان خست. کەشتییەکەیان بەڕەسنەو گوریسان بەستەوەو، بە خۆیان دابەزینە سەر کەنارەکە. خواردنیان ئامادەکرد. بادەی ئاڵیان گرتەوە، هەرکە تێروپڕیان خواردوخواردەوە، تیلیماخۆسی زانا ڕابوو و ڕوو لە هاوڕێکانی گوتی:

"کوڕینە ئێستا ئێوە بە کەشتییە بۆر بڕۆنەوە بۆ شار. من لێرە بەجێ بێڵن، دەمەوێ سەرێکی کێڵگەومەزراو شوانەکانم بدەم. ئێواری، کە لە پشکنینی مەزراوکێڵگەکانم بوومەوە بۆ شار دەگەڕێمەوە. سبەینێ کە ڕۆژ بووەوە، هەقی ئەم زەحمەتەتان بۆ دەکەمەوە. دەعوەتێکی باشی خواردنو گۆشتوبادەی ئاڵتان دەکەم.

هەنگێ تیوکلومینوسی خواوەند ئاسا هەڵیدایە:

"ئەدی من کێوە بچم، هاوڕێ چکۆلەکەم؟ لە ئیتاکای بەردەڵاندا ڕوو بکەمە کام سەردارو چ ماڵە گەورەیەك یان دەبێ یەکسەر بڕۆم بۆ لای دایکتوماڵی تۆ؟

تیلیماخۆسی ژیرو زرینگ وەڵامی دایەوە:

"جارێکی دیکە بۆ ماڵی خۆمانت دەعوەت دەکەم. راستە لە هیچمان کەم نیە کە شایستەی میوانی میوانپەروەری بێت. بەڵام تۆ ئاسوودە نابیت، چونکە من لە ماڵ نابم، ودایکیشم ناتبینێ، راستە دایکم لە ماڵە،بەڵام ئەوەندە خۆی نیشانی خوازگارەکان نادات. بۆ خۆی لە سەرەوەیەو لە ژوورەکەی خۆیدا،بە دیار دەزگاکەی خۆیەوە دانیشتووەو خەریکی رشتن‌وچنینە. بەڵام من ئەدرەسی کەسێکی ترت پێدەڵێم کە دەتوانی بچیت بۆ لای ئەو، ئەویش یوروماخۆسی دلاوەری کوڕی پولیبوسی دووربینە کە لە نێو خەڵکی ئیتاکادا زۆر خۆشەویستەو وەکو خواوەندێکی تەمەشا دەکەن‌و رێزی دەگرن. ئەوی راستی بێ باشترین پیاوی شارە، لە هەر هەموو خوازگارەکانی دی بالاترو زیاترە، زۆریش بە تەمایە دایکم بخوازێ‌و جێی ئۆدیسیوس بگرێتەوەو بە هەمان پایەو سەربەرزی بگات. هەڵبەتە ئایندەش نادیارە، مەگەر هەر زیوسی ئوڵەمپی ئاسمان نشین بیزانێ. کێ دەڵێت ئەو کارە سەردەگرێت. بە چ مەعلوم بەلایەکی کوشندەو رۆژێکی شوومی لە چارە نەنووسی بێت."

## تیوکلومینوس تیلیماخوس دڵنیا دەکات

کە لە قسەکانی بووەوە، واشەیەك بە دەستە راستیا هەڵفڕی. ئەمە پەیکی تیژ باڵی ئەپۆلۆ بوو، کۆترێکی بە چنگ هەڵگرتبوو، پەڕەکانی هەڵدەکەندو پەڕەکان لە نێوان تیلیماخۆس‌و کەشتییەکەدا دەکەوتنە سەر زەوی‌و بلاودەبوونەوە. هەنگێ تیوکلومینوس دەستی تیلیماخۆسی گرت‌و لە هاوڕێکانی دوورخستەوەوپێی گوت:

"تیلیماخۆس، ئەم باڵندەیە پەیامی خواوەندێکی پێیە، دەنا مەحاڵە لە خۆوەو بەبێ ویستی خواوەند، بەو جۆرە بەلای دەستە راستی تۆدا هەڵفڕێ. من هەرکە دیقەتم دا یەکسەر زانیم ئەمە باڵندەی فاڵو بەختە، نیشانەونوقلانەی خێرە. بۆیە دڵنیابە لەم دەڤەرەدا، لە ئیتاکادا، هیچ بنەماڵەو ماڵباتێك شان لە شانی ماڵباتی ئێوە نادات،و سەرکەوتن هەر بۆ ئێوەیەو جڵەوی فەرمانڕەوایی لە دەستی ئێوەدا دەبێت."

تیلیماخۆسی ژیروئاقڵ گوتی:

"هانام بە دەمت.خواوەندان لە زارت بنۆڕن. شەرت بێ، ئەگەر ئەم پێشبینییەت بێتە دی، لە دیاری‌و پێشکەشیانت بگرم. هێندەت دیاری‌وسەوقاتیان بدەمێ، هەرکەسێك بتبینێ، خۆزیات پێبخوازێت."

هەنگێ تیلیماخۆس رووی کردە پیرایوس، کە لە هاوڕێ هەرە وەفادارو باوەڕپێکراوەکانی بوو، وگوتی:

"پیرایوس، ئەی کوڕی کلوتیوس، تۆ کە لە هەر هەموو ئەو هاوڕێیانەی کە بۆ پیلوس لەگەڵما بوون، گوێڕایەڵترو روح سووکتری، تکات لێدەکەم، ئەم میوانە غەریبە بەرەوە بۆ ماڵی خۆت، رێزی بگرەو خزمەتی بکە تاخۆم دەگەڕێمەوە."

پیرایوس، رمبازی بەنێوبانگ، گوتی:

"ئەی تیلیماخۆس! هیچ خەمت نەبێ، چەند لە کێڵگەومەزراکانت دەمێنییەوە، بمێنەوە. من مشوری دەخۆم، نایەڵم غەریبی پێوە دیاربێت. ئەوەی لەسەر خانە خوێ بێت بە زیادە بۆی دەکەم."

## تیلیماخوس بەلەز بۆ ئاغەڵی بەرازەکان دەڕوات

.کە لەو قسانە بووەوە، سەرکەوتە سەر کەشتییەکە، فەرمانی بە هاوڕێکانیشی دا کە سەرکەون و پەت وگوریسی پاشەڵی کەشتییەکە بکەنەوە. یەکسەر وبە پەلە سەرکەوتن. هەرکەسەو لە شوێنی خۆی و لەلای سەوڵەکەی خۆیەوە دانیشت، وتیلیماخۆس پێڵاوە جوانەکانی لەپێ کرد، نێزە قورسە سەر برونزیە نوك تیژەکەی خۆی لەسەر کەشتییەکە هەڵگرت. دوای ئەوە کەشتیوانەکان پەت وگورسی پاشەڵی کەشتییەکەیان کردەوە. ساریەکەیان لە جێی خۆی چەقاند. بادەوانیان هەڵکرد،وچۆن تیلیماخۆسی ئازیز، کوڕی ئودیسیوسی موبارەك فەرمانی دابوونێ، بەو ئاوایە پیرە کەشتیان بەرەو شار تاودا. بەڵام تیلیماخۆس، بە پەلە کەوتە ڕێ و زوو بە زوو گەییە ئاغەڵەکە، کە پڕ بوو لە بەراز. هێندە زۆر بوون لە ژمارە نەدەهاتن، و بەرازەوانە دڵسۆزو وەفادارەکەیان لە ناوەندی بەرازەکاندا نووستبوو.

***

### پەراوێز:

*- یوروماخۆس: کوڕی پولیبوس بوو، یەکێك بوو لە دڵبەندوخوازگارە دیاروگەورەکانی پنلوپی. کە ئودیسیوس بە جلکی دەرۆزەکەرەوە خۆی بە کۆشکەکەی خۆیدا دەکات، یوروماخۆس تەڵفیزیەکی زۆری پێدەکات. بەڵام کاتێ کە ناتوانێ کەوانەکەی ئودیسیوس راکێشێت و بیهێنێتە سەر پێ، زۆر تەریق دەبێتەوە، ولە ئەنجامدا ئودیسیوس،کوشتی.

*- سامۆس: دوڕگەیەکە لە دەریای ئیجەدا، دەکەوێتە ئەو بەشەوە کە پێی دەگوترێ دەریای ئیکاری، لە رەخی ئیونیادایە.

*- پیسیستراتوس: بچووکترین کوڕی نەستورو ئەناکسیبیایە. دەگەڵ تیلیماخۆسدا چوو بۆ ئەسپارتە تا سۆراخێکی ئودیسیوس لە مینیلاوس بزانن.

*- میگابینیتس: کوڕی مینیلاوسە لە یەکێك لە کارەکەرەکانی، لە رۆژی زەماوەندی هیرمیونی خوشکیدا، کچەکەی ئیلیکتوری ئەسپارتی دەخوازێت، بەو بیانووەی کە کوڕێکی نا شەرعییە، لە عەرشەکەی بابی بێ بەشکرا. بەڵام کە مینیلاوس مرد، ئەو لەگەڵ براکەیدا، (هیلین)ی ناچارکرد بۆ رودس هەڵێت.

*- هیرا: خوشكوژنی زیوسە. شابانۆی خواوەندان بوو. دەگەڵ زیوسدا لەسەر عەرش دادەنیشت و هەموو خواوەندانی ئولەمپ رێزیان دەگرت، و

*- هیفایستوس: یەکێکە لە خواوەندە گەورەکانی ئولەمپ. خواوەندی ئاگرە، کوڕی زیوس و هیرایە. ئەفرۆدێتی خواست. خواوەندی ئاگر بوو، لە کاتی شەڕدا وەکو چەك بەکاری دێنا، ولە

کاتی تردا وەکو وەسیلەیەکی تواندنەوەی ئاسن و کانزایان بەکاری دێنا، بۆیە بە ئاسنگەری خواوەندان و باشترین سنعەتکاری کانان دەناسرێت.

*- ئەلیفوس: خواوەندی روبارە. شێت وشەیدای ئەرتەمیس بوو. بەڵام کە ئەرتەمیس رووی نەدایە، هەڕەشەی لێکرد، بەڵام ئەرتەمیس دەموچاوی خۆی لە قوڕگرت و ئەلفیوس نەیتوانی بیدینێ، وبەو جۆرە خۆی لێ دەربازکرد.

*- میلامپوس:

کوڕی ئیدومینییە. برای (بیاس)ـە، بەهرەیەکی گەورەی خێفزانی و پێشبینی و فاڵبینی هەیە، گوایە تولەماران بە زمان گوێیان لستوەتەوەو بەهرەی ئەوەی لەلا دروست بووە کە لە زمان و دەنگی تەیروتووگیانلەبەران تێبگات.

*- ئەنتیفاتیس: گەورەی دێوانی بەشەرخۆرە لە سەقلیە. هەر هەموو کەشتییەکانی ئودیسیوسی داغان و پارچە پارچە کرد تەنیا یەکێکیان نەبێت.

*- ئیرینوس: یەکێکە لە خوابانوانی تۆڵەئەستێنی کە ژمارەیان سێ دانەیە.

*- نیلوس: کوڕی پوسیدونە. نیلوس کیژێکی لە رادەبەدەر جوانی دەبێت بە ناوی پیرۆ. نیلوس لە دڵی خۆیدا بڕیاردەدات کە بیدات بەو کەسەی بچێ بۆ فیلاکی و گاگەل و پەزەکانی ئیفیکلوس بڕفێنێ و بۆی بێنێ. میلامپوس، دەچێتە ژێر ئەو بارەو لە جیاتی (بیاس)ی برای دەڕوات بۆ فیلاکی. بەڵام ئیفیکلوس بە دیلی دەیگرێت و یەك دانە ساڵی تەواو لە زیندانی ئەودا دەمێنێتەوە. نیلوس لەو ماوەیەدا دەست بەسەر هەموو موڵك ومالەکەی میلامپوسدا دەگرێت. بەڵام میلامپوس لە سایەی خێفزانی و تالحبینی خۆی، لە زیندان دەربازدەبێت، گاگەل و پەزەکان بۆ پیلوس دێنێ، ئەوسا تۆڵەی خۆی دەکاتەوەو پیرو دەدات بە بیاسی برای.

## سروودی شانزەیەم

### کورتەی سروودەکە:

تیلیماخۆس، لەگەڵ گەردی بەیانیدا دەگاتە کوختەکەی یومایوسی بەرازەوان، کە خەریکی قڕێکردنی ڕەوە بەرازەکان دەبێت بۆ دەشتولەوەڕ. تیلیماخۆس لەو بۆسەیە رزگاردەبێت کە خوازەگارەکان بۆیان نابووەوە. سەگەکانی یومایوس، پێی ناوەڕن، بە خۆشیەوە کلکە لەقێی بۆ دەکەن. ئودیسیوس بەمە دڵخۆش دەبێت. یومایوس میوانەکەی رادەسپێرێ کە ئاگای لە ئاغا گەنجەکەی بێت. بەڵام ڕێگەی ئاغای نادات کە بڕواتەوە بۆ شارو بۆ کۆشکەکەی خۆی. نەبادا ڕووبەڕووی گۆساخیوبێ ئەدەبی خوازگارەکان ببێتەوە. یومایوس بەرەو شار پەل دەبێتەوە تا خەبەر بە پنلوپی بدات کە کوڕەکەی بە سەلامەتیو بەبێوەی گەڕاوەتەوە. ئودیسیوس کە ئەتینا دەیخاتەوە دۆخی ئاسایيو هەوەڵجاری خۆی، خۆی بە کوڕەکەی دەناسێنێت. باوكو کوڕ دەربارەی کوشتنی خوازگارەکان تەگبیرو راوێژ دەکەن. تیلیماخۆس ژمارەی خوازگارەکان بە بابی دەڵێتو داوای لێدەکات، بە شێوەو سیمای ئاسایی خۆیەوە ڕووبەڕووی خوازگارەکان نەبێتەوەو خۆی پێشانیان نەدات. هەردووکیان لەسەر ئەوە ڕێکدەکەون کە ئودیسیوس هەر تەوسو توانجو تەڵفیزییەك قەبوڵ بکات، تا کاتی تۆڵە ئەستاندن دێت. کە خوازگارەکان دەزانن تیلیماخۆس بە سەلامەتی گەڕاوەتەوە، زۆریان لەبەرگران دەبێت،و بیر لە نەخشەیەکی دی، بۆ کوشتنی دەکەنەوە. پنلوپی سەرزەنشتێکی فرەی ئانتینوس دەکات کە نەخشەی کوشتنی تیلیماخۆس کێشا بوو. یومایوس–ی بەرازەوان بۆ شوێنی خۆی دەگەڕێتەوە.

***

### یومایوس پێشوازی تیلیماخۆس دەکات

لەو کاتەدا، جووتێك پیاو، ئودیسیوسوبەرازەوانە رەسەنەکە، لە ناوەندی کوختەکەدا، ئاگرێکیان کردەوە،دەگەڵ گەردی بەیاندا تاشتیان ئامادە دەکرد،و بەرازەوانەکانیان دەگەڵ ڕەوە بەرازەکاندا بۆ دەشتولەوەڕ ناردبوو. کە تیلیماخۆس دەرکەوت، سەگە دڕەکان، نەك هەر پێی نەوەڕین، بەڵکو بە کلکەلەقێ بە دەوریا دەسووڕانەوە. ئودیسیوس هەستی بە جمو جوڵی سەگەکان کرد.گوێی لە دەنگی پێ بوو، بۆیە بە پەلە ڕووی کردە یومایوسوگوتی:

"یومایوس، وادەزانم هاوڕێیەکت یا ئاشنایەکت بۆ ئێرە دێت. چونکە سەگەکان نەك هەر پێی ناوەڕن، بەڵکو بە دەوریشیا دێن،ومن گوێم لە ترپەی پێیە".

ئودیسـیوس هێشـتا بـە تـەواوەتی لـە قسـەکەی نـەبووبووەوە کـە کـوڕە ئازیزەکـەی گەییشـتە بەردەرگا. یومایوس سەرسامو شادمان بەرزەپا لەبەری هەستا. لە خۆشیا ئەو سوراحیەی، کە خـەریك بـوو بـادەی ئـاڵی تیـا دەگرتـەوە، لـە دەسـت کەوتـە خـوارەوە. بـە پەلـە چـووە پێشـوازی ئاغاکەی، تەوێڵوچاوە جوانەکانی، وهەردوو دەستی ڕامووسی، لە خۆشیا دەستی بەگریان کرد. وەکـو چـۆن باوکێـك، کـوڕێکی تاقانـەی زۆر خۆشەویسـتی هـەبێت، ئـەم کـورە بکەوێتـە وڵاتێکـی دوورو، دوای دە ساڵ لە غوربەتودەربەدەریو مەینـەتی، لـە پـڕا بگەڕێتـەوەو بابـە خەمناکەکـەی باوەشی پێدا بکاتوله هەمێزی بگرێت. وماچ بارانی بکات، بەو ئاوایە یومایۆس، ئەو بەرازەوانـە ئەمەکدارو رەسەنە، باوەشی بە تیلیماخۆسی خواوەندئاسادا کرد، وبە جۆرێ کەوتـە رامووسـانی وەکو ئەوەی لە مردن رزگاری بووبێ، وبە دەم گریانەوەو بە دەنگی بەرز دەیگوت:

"تیلیماخۆس، ئەمە تۆی! گەڕایتەوە روناکی چاوەکانم. کە زانیم بە کەشتییەکەت بـەرەو بیلـوس رۆییشـتین بـە تـەما نەبووم،هـەرگیز جـارێکی دی بتبینمـەوە. وەرە، وەژوورکـەوە، ئـەی بەنـدی دڵەکـەم، کـوڕە ئازیزەکـەم، وەرە دانیشـە بـا لـە ماڵەکـەی خۆمـدا، تێـر تێـر تەمەشـات بکـەم. دیـارە یـەکڕێ لـە وڵاتـی غەریبایەتیـەوە بـۆ ئێـرە هـاتووی، دەنـا ئەمـە عـادەتی تـۆ نیـە، بێـی بـۆ گونـدیو سـەری مـەزراو شـوانان بـدەی، بـەڵکو بـە بـەردەوامی لـە شـار دەمێنییـەوە، پێموایـە حـەز دەکـەی هەمیشـە بـە چـاوی خـۆت رەفتـاری نامەردانـەو دژمنانـەی خوازگـارە گۆسـاخو بـێ ئەدەبـەکان بدینی".

## یومایوس، تیلیماخۆس سەبارەت بە دایکی دڵنیا دەکات

تیلیماخۆسی ژیرو زرینگ وەڵامی دایەوەوگوتی:

"قسەی تۆیە پیرە باب. بۆیە بۆ ئێرە هاتووم، تا بە چاوی خۆم بتبینم، هـەواڵێکی دایکـم بـدەیتێ کـە ئـاخۆ هێشـتا لـە کۆشكوسـەراکەدا مـاوە، یـان شـووی بـە پیـاوێکی تـر کردووە،وجێگاکـەی ئودیسیوس چۆڵو هۆڵ،جاڵجاڵۆکان کردوویانە بە هێلانە."

سەرۆکی بەرازەوانەکان وەڵامی دایەوە:

"نـەخێر، هێشـتا ورەبـەرزو نـەگۆڕ لـە کۆشكوسـەراکەی تـۆدا مـاوەو. هەمیشـە خـەمینوخـەمبار، شەوو رۆژ بە دەم ئاهوناڵەوفرمێسکانەوە دەباتە سەر."

کە لە قسەکەی بووەوە، نێزە برونزیەکەی لە دەستی تیلیماخۆس وەرگرت. هـەنگێ تیلیماخۆس لـە ئاسـتانە بەردینەکـەوە خـۆی بـە ژووری کوختەکـەدا کـرد. هەرکـە تـۆزێ نزیـك بـووەوە بـاوکی، ئودیسیوس هەستا کە جێگاکەی خـۆی بـداتێ، بـەڵام تیلیماخۆس رازی نـەبوو وگـوتی: "فـەرموو تۆ لە جێی خـۆت دانیشـە. شـوێن بـۆ مـن پەیـدا دەبێـت. ئـەم پیـاوەی کـە لێرەیـە شـوێنم بـۆ دابین دەکات."

## یومایوس خواردن بۆ ئودیسیوسو تیلیماخۆس دێنێ

کە ئەو قسەیەی کرد، ئیدی ئودیسیوس گەڕایەوەو لە شـوێنەکەی خـۆی دانیشـتەوە. یومـایوس باوەشـێك گیـاو گـەڵای سـەوزی هێنـا، رایخسـتوپۆسـتینێکی تـوکنی نـەرمی بەسـەرا دا. کـوڕە ئازیزەکەی ئودیسیوس لەسەری دانیشت. هـەنگێ یومـایوس لـە دوو خوانچـەدا گۆشـتی بـرژاوی

شەویّی بۆ هێنان، ئەوسا، بە پەلە نانی لەسەر سەبەتان بۆ هێنان، ئەوسا لە سوراحیەکی داریندا بادەی هەنگوین ئاسای بۆ گرتنەوە. کە لەو کارانە بووەوە هات لە بەرانبەر ئودیسیوسی موبارەکدا دانیشت، و ئەوسا هەموو دەستیان بۆ خواردنەکەی بەردەمیان درێژ کرد. کە تێرو پڕیان خواردوخواردەوە، تیلیماخۆس رووی کردە بەرازەوانە مەردورەندەکەو گوتی:

"ئەی پیرەباب، ئەم میوانە لە کوێوە هاتووە؟ دەریاوانەکان چۆنیان بۆ ئیتاکا هێناوە؟ ئەو دەریاوانانە کێ بوونە؟ چونکە ناچێتە ئەقڵەوە بە پێیان بۆ ئێرە هاتبێ!".

ئەی یومایوس، ئەی بەرازەوان، هەنگێ وەڵامت دایەوەوگوتت:

"پەلە مەکە کوڕی خۆم، هەر ئێستا هەموو شتێکت پێدەڵێم. بە خۆی دەڵێت گوایە خەڵکی کریتە،و دەمێکە ئاوارەیەو، بەدەم ئاوارەیی و دەربەدەرییەوە شارانی زۆر گەڕاوە. ئیدی ئەوە بەختوناوچەوانی خۆی بووە. ئێستاش لە کەشتییەکی تیسپروتەکان هەڵاتووەو پەنای وەبەر ئەم کەوێلوکوختەی من هێناوە. جا من بە تۆی دەسپێرم، چی لێدەکەی، بیکە، بەڵام ئەوەت لە بیربێ پەنای بۆ تۆ هێناوە".

## تیلیماخۆس هاوسۆزی دەگەڵ کابرای غەریبدا دەکات

تیلیماخۆسی ژیروزرینگ وەڵامی دایەوە:

"ئەی یومایوس، بەڕاستی قسەکانت خەمباریان کردم. ئاخر من چۆن دەتوانم ئەم میوانە بەرمە ماڵی خۆم،و وەکو پێویست لای خۆم ڕایبگرمو خزمەتی بکەم؟ من بە خۆم هێشتا منداڵم، لە خۆم رانابینم، گەر یەکێك گەڕم پێبکاتوشەڕم پێبفرۆشێت بتوانم بەزەبری هێزو توانا داکۆکیو بەرگری لە خۆم بکەم. دایکیشم دوودڵە، نازانێت دەبێت چیبکات: ئایا دەبێ لەگەڵ مندا وەمێنێو ئاگاداری ماڵەکە بکاتو بە یادی مێردەکەیەوە بژیو حورمەتی خۆیو یادگاری مێردەکەی بگرێت، یان دەبێ لە نێو ئەو خوازگارانەی کە حاڵی حازر، لە ماڵەکەی خۆیدا دەورو خولی دەدەن، یەکێك هەڵبژێریو لەگەڵی بڕواتو شووی پێبکات کە لە هەمووان خانەدانتر بێ،و زۆرترین دیاریوجیازی پێشکەش بکات. سەبارەت بەم میوانەش، مادامێکی هاتووەتە ماڵەکەی تۆ، باشترین دەستە جلی بۆ دەکەم، شمشێرێکی دوو دەمی دەدەمێ، جووتێ پێڵاوی باشی بۆ دەکەمو بۆ هەر کوێیەك حەزی لێبێ ڕەوانی دەکەم. یان ئەگەر حەزدەکات لێرە بمێنێتەوە، ئەوا لای خۆت رایگرەو جێی بکەرەوە. من جلو بەرگو خواردنی بۆ دەنێرمو هەموو مەسرەفێکی دەکێشمو نایەڵم ببێ بە بار بەسەر تۆو هاوڕێکانتەوە، ولەسەر کیسەی ئێوە بژی. بەڵام من نایبەمەوە بۆ ماڵی خۆم، نایبەم بۆ ناو ئەو خوازگارە گۆساخو بێ چاوو روانە، بۆ ناو ئەو خۆپەسندو لە خۆباییانە، دەترسم تەڵفیزی پێبکەن، و منیش ئەمەم پێ قووت ناچێتو خەفەتی پێدەخۆم. خۆ پیاو چەندیش دلێرو ئازا بێ، زەحمەتە بە تەنیا دەرەقەتی کۆمەڵێك بێتو بە خۆت دەزانی خوازگارەکان ژمارەیان زۆرە."

## کابرای غەریب ئامادەیە شەڕی خوازگارەکان بکات

ئودیسیوسی نەجیمزادە، نموونەی پشوودرێژیو سەبروحەوسەڵە پێیگوت:

"ئەی دۆست، ئەگەر ڕێم بدەی، حەزم لێیە دوو قسە لەو بارەیەوە بکەم.چونکە کە گوێم لێبوو باسی ئەو خوازگارانەت دەکرد کە چۆن لە ماڵەکەی خۆتداو بە تۆبزیو بە بەرچاوی خۆتەوە ئەو هەموو بەدرەفتاریە دەکەن، وبەو نامەردییە ئازاری روحی پیاوێکی باشی وەکو تۆ دەدەنو بتەویٚو نەتەویٚ، دەبیٚ تەحەمول بکەی، زۆرم لە دڵ گرانوناخۆش بوو. جا حەزدەکەم پێم بڵێی ئایا تۆ بە خوایشتی خۆت ئەم کۆیلەیەتیو زوڵمو زۆرە قەبوڵ دەکەی، یان خواوەندێك رقی لیٚ هەڵگرتوویتو میللەتەکەی خۆتی لێکردوویت بە ناحەزودژمن؟ یان بەینت دەگەڵ برایەکانت دا نیەو پشتیان تێکردویت؟ خۆ برا بەینیانیش ناخۆش بیٚ لە تەنگانەدا، فریای یەکتر دەکەونو، لەسەر یەکدی هەڵدەدەنیٚ. خۆزگە بەم ئەقڵو ئاوەزەمەوە، ئەم تەمەنەی ئێستای تۆم دەبوو! بریا کوڕی ئودیسیوسی ناودار دەبووم، یان خودی ئودیسیوس دەبووم، بزانە چۆن خۆم بە کۆشکەکەی ئودیسیوس، کوڕی لایرتیس دا دەکرد وقەیسەریم لەو خوازگارە بیٚ شەرمانە دەکرد بە کونە مشك! ئەوپەڕی لەبەر تەنیا باڵی دەرەقەتیان نەدەهاتمو بێکەس کوژیان دەکردم. ئەوەم پیٚ خۆشترە لە ماڵەکەی خۆمدا بمکوژنوبمرم، نەك هەموو رۆژیٚ بە بەرچاوی خۆمەوە ئەو هەموو بیٚ حورمەتیە بکەن. جنێو بە میوانانم بدەن، وقەرەواش و کارەکەرەکانم لە پەناو پاساری کۆشكوسەراکەمدا بەگیر بێننو رەفتاری نا شایستەیان لەگەڵ بکەنو دەست بۆ ناموسیان بەرن. بادەو شەرابم بخۆنەوەو برێژن.ماڵم بخۆنو تەخشانو پەخشانی بکەنو، هیچ حیسابێکم بۆ نەکەن."

## تیلیماخۆس هانا بۆ یومایوس دەبات

تیلیماخۆسی ژیرو زرینگ وەڵامی دایەوە:

"کە وایلێهات، من بە راشکاوی هەموو راستیەکانت پێدەڵێم. راستت گەرەکە خەڵکی هیچ رقێکیان لێم نیە. هیچ گلەییەکیش لە برایانم، کە لە رۆژانی تەنگانەدا بە فریات دەکەون، ناکەم. ئیدی خواستی زیوسی کوڕی کرونوس ئەوە بووە کە ماڵباتی ئێمە هەر کوڕی تاقانەیان هەبیٚ: ئارکایسیوس تەنیا لایرتیس-ی هەبوو، لایرتیس تەنیا ئودیسیوسی هەبوو، (ئودیسیوس)ش تەنیا منی هەبوو و بە تاقی تەنیا لە کۆشكوسەراکەیدا بەجێی هێشتمو رۆیی، وچاوی بە دیداری من رۆشن نەبوو، سەرباری ئەوەش دژمنانێکی بیٚ ژمارە رژاونەتە ماڵەکەم. هەر هەموو میرو پاشایانی دورگەکانی ئەم دەوروبەرە، وەك دورگەی: دولیخیوم، وسامی، وزاکنتوس-ی بە جەنگەڵ ودارستان، هەروەها سەردارو فەرمانڕەوایانی ئیتاکای بەردەڵانیش، بە بیانووی داخوازی دایکمەوە لە ماڵی مندا دەخۆنودەخۆنەوەو بە کەیفی خۆیان ماڵو موڵکم وێران دەکەنو لە نێو دەبەن. دایکیشم نە دەتوانیٚ جوابیان بدات کە شوو ناکات، ونە دەتوانیٚ مەسەلەکان یەکلایی بکاتەوەو چیتر ماڵو موڵکەکەم وێران نەکەن، ئیدی هەموو رۆژیٚ لە ماڵی مندا سووروئاهەنگو بەزمو زیافەتودەعوەتە، ئەگەر کار وا بڕوات بەو زووانە خۆیشم لە نێو دەبەن. بەڵام وادیارە دەستی خواوەندانیش لەم کارەدا هەیە. پیرەباب خێراکە بڕۆ بۆ شار، پەیام بۆ پنلوپی ئاقڵوئاغر بەرەو پێی بڵیٚ من بە سەلامەتی لە پیلوس گەڕاومەتەوە. من لێرە دەمێنمەوەو تۆ بڕۆ بۆ ئەویٚو ئەو هەواڵەی بدەیە. هوشیاربە لەو زیاتر کەس بە هەواڵەکە

نەزانێت، با هیچ یەكێك لە ئاخاییەكان نەزانن، چونكە زۆریان دژی منن، خێرا ئەو هەواڵە بۆ پنلوپ ببەو زوو بگەڕێوە بۆ ئێرە.

هەنگێ ئەی یومایوس، ئەی بەرازەوان وەڵامت دایەوەوگوتت:

"حاڵی بووم، پێش ئەوەی تۆش ئەمە بڵێی، بە خۆم، لە دڵی خۆدا بە تەمای ئەوە بووم كە نەیەڵم كەس پیبزانێ. بەڵام پێم بڵێ ئایا دەتوانم لە سەر ڕێگەی خۆمەوە، لابدەمە لای لایرتیس، و ئەم هەواڵەی پێبگەیەنم؟ پیاوێكی زۆر نەگبەتو داماوە! كاتی خۆی زۆری خەفەت بۆ ئودیسیوس خوارد، بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو داخ وكەسەرەشدا، كەمو زۆر سەرپەرشتی كێڵگەو مەزراكانی دەكرد، ولەماڵەكەی خۆیدا دەگەڵ نۆكەرو ڕەنجبەرەكانیا هەڵدەساو دادەنیشتو گەر حەزی لێ بوایە لەگەڵیاندا دەیخواردودەیخواردەوە. بەڵام ئێستا وەكو دەڵێن، لەوەتای تۆ بۆ بیلوس ڕۆییشتووی، خواردنوخواردنەوەی جارانی نەماوە، ناچێتە سەرپەرشتی كێڵگەكانی، دانیشتووەو دەگری، پێستی بەسەر ئێسكییەوە هیشك بووەو چنگێكی لێماوەتەوە."

تیلیماخۆسی ژیرو زرینگ وەڵامی دایەوەوگوتی:

"سەد حەیف ومخابن، بەڕاستی مایەی داخ وكەسەرە، زۆری بۆ پەرۆشم. بە هەرحاڵ واز لەمە بێنە. خۆ ئەگەر بە خۆزگە بووایە،و هەموو خۆزیایەكی بەشەر بهاتبایە دی، ئەوا بەر لە هەر شتێك خۆزیام دەخواست بابم بە زووترین كات بگەڕێتەوە! بە هەرحاڵ تۆ بڕۆ، پەیامی خۆت بگەیەنەو زوو بگەڕێوە، نەچی بەناو كێڵگەو مەزرایان بكەوی و لە لایرتیس بگەڕێی. بە دایكم بڵێ، ئەگەر ئەقڵی بڕی، با بەنهێنی یەكێك لە كارەكەرەكانی بنێری و هەواڵەكە بە پیرەمێردیش رابگەیەنن".

## ئەتینا خۆی پیشانی ئودیسیوس دەداتوداوای لێدەكات دەگەڵ كوڕەكەیدا نەخشەی تۆڵە بكێشن.

تیلیماخۆس ئەو قسانەی كرد. یومایوسی بەرازەوان، پێڵاوەكانی هەڵگرت، لە پێی كردنو بەرەو شار كەوتە ڕێ. ئەتینا كە چاوەڕوانی ڕۆییشتنی یومایوس بوو، هەركە بینی ئەو بەڕێ كەوتو لە گوندەكە دوور كەوتەوە، یەكسەر هاتە بەر كەوێڵەكە. لە شێوەی ژنێكی جوانی بە ژنو باڵابەرزی دەست ڕەنگیندا، لەبەر دەركەی كوختەكە وەستاو تەنیا خۆی نیشانی ئودیسیوس دا. تیلیماخۆس كە لە بەرانبەریا دانیشتبوو، نە كەسی بینی و نە هەستی بە هیچ كرد. چونكە خواوەندان خۆیان بە هەموو كەسێك نیشان نادەن. بەڵام ئودیسیوس بینی، سەگەكانیش دیتیان، بەڵام پێی نەوەڕین، ترسان، كلكیان دەگەڵۆزیان گرتو بۆ ئەو سەری ئاغەڵەكە هەڵهاتن. هەنگێ ئەتینا بڕۆی لە ئودیسیوس هەڵتەكاند. ئودیسیوس لە مەبەستی حاڵی بوو، ولە ژوور وەدەركەوت، خۆی گەیاندە پاڵ دیوارە بەرزەكەی حەوشەو لە بەردەمیا وەستا. ئەتینا پێی گوت:

"ئەی شێرە پیاو، توخموتۆوی زیوس، ئەی كوری لایرتیس، ئەی ئودیسیوسی دووربینو چارەسازو بەردەبار، ئێستا كاتی ئەوە هاتووە خۆت لە كوڕەكەت ئاشكرا بكەی و بێ پەردە قسەی دەگەڵ بكەی، ونەخشەی كوشتنو لە ناودانی خوازگارەكان دابنەیتو ئەوسا بڕۆیت بۆ شارە

بەنێوبانگەکەت. منیش لێتان دوور ناکەومەوەو لە نزیکەوە چاوم لێتان دەبێت، چونکە تاسەمەندی شەڕوتۆڵەم."

ئەوسا، سەوڵەجانە زێڕینەکەی بەسەر پایدا هێنا، هەوەڵجار دەستێ جلکی پاکوخاوێنی لەبەر کرد. بەژنو بالای کۆکتروڕەنگو رووی گەنج ترکردەوە. رەنگی هەڵهێنایەوە، گۆناکانی خڕ بوونەوە، ردێنی رەشوجوان بووەوە. کە بەو شێوەیە گۆڕا، ئیدی خوابانۆ، ئەتینا رۆیی، ئودیسیوس بەو دۆخە تازەیەوە وەژوور کەوتەوە. کوڕە ئازیزەکەی واقی وڕما، ترسی لێنیشت، چاوی کەلاخست، نەبا ئەوە خواوەندێك بێ، ئەوجا بە پەلە هەڵیدایەوگوتی:

"ئەی غەریبۆ، چۆن بەم دەمودەستە واگۆڕای. تۆ پیاوەکەی تۆزێ لەمەو پێش نیت. ئەم جلانەت لەبەر نەبوو. ئێستا رەنگو روویەکی ترت هەیە. بێگومان یەکێکی لە خواوەندانی ئاسمان نشین. ئەگەر وایە سەبرێکم لێبگرە، با قوربانیو نەزری شایستەت پێشکەش بکەم. زێڕو زێوەرانت پێشکەش بکەم. بەڵکو لێمان دەبوریودەمانبەخشیت!".

## ئودیسیوس خۆی لە کوڕەکەی ئاشکرا دەکات.

هەنگینێ ئودیسیوسی رەسەنزادە، ئودیسیوسی بەردەبارگوتی: "ئەرخایەن بە کە من خواوەند نیم، بۆچی بە خواوەندانم دەشوبهێنی؟ من بابی تۆم، ئەو بابەی کە زۆرت خەفەت بۆ خوارد، زۆری بۆ گریایت، لە رای ئەودا بوویت بە نیشانەی بەد رەفتاری نامەردانی موزیڕوبەدخوو."

بەدەم ئەو قسانەوە کوڕەکەی راماوسی، جڵەوی خۆی پێنەگیراو روندك بەسەر گۆناکانیا جۆگەی بەستو رژایە خوارێ. تا ئێستا جڵەوی گریانی گرتبوو، ونەی هێشتبوو تاقە روندکێك لە چاوانی بێت. بەڵام تیلیماخۆس کە هێشتا باوەڕی نەدەکرد، ئەو پیاوە بەڕاستی بابی بێت، دووبارە گوتی:

"نا! باوەڕ ناکەم. تۆ ئودیسیوسی بابی من نیت. بەڵکو تۆ خواوەندێکیوگەرەکتە بەو قسانە هێندەی دی دەردم گران بکەیت، وبۆ بێ بابی خۆم زیاتر بگریموبناڵم. چونکە هیچ بەشەرێکی فانی چەند ئەقڵمەندو پڕ بەهرەو تواناش بێت، ئەگەر خواوەند نەبێت، یان خواوەندێکی لە پشت نەبێت، ناتوانێ بەو ئاسانیە دۆخە گۆڕکێ بەخۆی بکات، هەرکاتێ بیەوێ بەدڵی خۆی دۆخەگۆڕکێ بکات. خۆی بگۆڕێ لە پیرەوە بۆ گەنج یان بە پێچەوانەوە، ئەم موجیزاتە لە توانای بەشەری فانی بەدەرە. تۆ تۆزێ لەمەپێش پیرەمێردێکی شڕۆڵەی شەپڕێو بوویت، کەچی ئێستا لە خواوەندانی ئاسمان نشین دەچیت!".

## ئودیسیوس کوڕەکەی دڵنیا دەکات کە باوکیەتی

ئودیسیوسی دووربینوبەردەبار بەرسڤی دایەوەوگوتی:

تیلیماخۆس، پێویست ناکات ئەوەندە سەرسام بیت. دڵنیابە جگە لە من هیچ ئودیسیوسێکی دی پێ نانێتە ئەم ماڵە. من خودی ئودیسیوسم. هەمان ئەو ئودیسیوسەم کە دوای بیست ساڵ لە دەربەدەریو ئاوارەییو مەینەتیوسەرگەردانی دەگەمەوە وڵاتی بابو باپیرانم. بەڵام دڵنیابە ئەو دۆخە گۆڕکییەی کە بە چاوی خۆت بینیتو زۆرت پێ سەیرە، ئەوە کاری ئەتینایە، وئیدی بە کەیفی خۆی شێوەو هەیئەتم دەگۆڕێ، جارێ دەمکات بە دەرۆزەکەرێکی شڕۆڵەی شپرزەو

شەپڕێو، جارێ دەمکات بە گەنجێکی جوانی کۆك‌وپۆشتەو بۆشناغ. ئەم کارە بۆ خواوەندان ئاسانە، کە مرۆڤێك وا لێبکەن جارێ گەنج‌وچەلەنگ‌ودەوڵەمەند بنوێنێ، وجارێك زەبوون‌و کەساس‌وهەژاروپیروشڕۆڵەوسواڵکەرئاسا بنوێنێ.

## ئۆدیسیوس و تیلیماخۆس دەست لە ملی یەکدی دەکەن‌ودەگرین

پاش ئەو قسانە دانیشت. تیلیماخۆس باوەشی بە بابە دلاوەرەکەیدا کردودەستی بەگریان‌و فرمێسك ڕشتن کرد. ئیدی بە جووتە سۆزیان بزواو لە هۆڕژنی گریانیان دا. وەکو چۆن جووتێ باز، یان جووتێ هەڵۆی چنگ تیژی چنگ هەڵگەڕاوە، شوانان بێچوە باڵە فرە نەبووەکانیان لە هێلانان دەردێنن‌و دەیان بەن، فریادو هاوار دەکەن، ئەو جووتەش، باب‌وکوڕ بەو ئاوایە لە هۆڕژنی گریانیان داو میناکی بارانی بوهار فرمێسکیان دەباراند، وخەریك بوو بەدەم گریانەوە ڕۆژیان لێ ئاوا دەبوو، کە تیلیماخۆس لەپڕ هەڵیدایەوپرسی:

باشەن باوکە، دەریاوانەکان بە چ کەشتییەك تۆیان بۆ ئیتاکا هێنا؟ نەیان گوت کێن وخەڵکی کوێن؟ چونکە مەحاڵە بە پێیان بۆ ئێرە هاتبیت."

## ئۆدیسیوس ژمارەی خوازگارەکان لە کوڕەکەی دەپرسێت

ئۆدیسیوسی دووربین‌وبەردەبار بەرسڤی دایەوەوگوتی:

"بوەستە کوڕی خۆم. هەر ئێستا هەموو شتێکت بۆ دەگێڕمەوە، هەموو ڕاستیەکانت پێدەڵێم. ئەوانەی منیان بۆ ئێرە هێنا لە فیاسیەکان بوون، ئەمانە بە دەریاوانی‌و کەشتی‌وکەشتیرانی بەناوبانگن. هەر بێگانەیەك بچێتە ناویان، بۆ هەر کوێیەکی بوێ، دەیگەیەنن. لە کەشتییەکی خۆشڕەویان نام، بەناو دەریا کەوتن، خەوم لێکەوت، کاتێ چاوم کردەوە، لە ئیتاکادا دایان بەزاندم، یەك دنیا دیاری جوان‌و بەنرخیان دامێ، لە برونزەوە بیگرە تا دەگاتە زێڕو زێوەرو جلکی زۆر نایاب‌ودەستچن. هەر هەموو ئەو گەنجینەو دیاریە بەنرخانە لە ئەشکەوتێکی دوورە دەست‌و ئەمیندا دانراون‌و لە حیمایەی خواوەنداندایە. ئێستاش من بە فەرمانی ئەتینا هاتووم بۆ ئێرە، تا دەربارەی کوشتنی دژمنەکانمان تەگبیروراوێژ بکەین. جا ئێستا ناوو ژمارەی خوازگارەکانم پێبڵێ، تا بزانم ژمارەیان چەندەو چتۆ پیاوگەلێکن، تا سێ‌ودووی دڵی خۆم بکەم‌و بزانم ئایا دەتوانین بەدوو قۆڵی، هەر هەردووکمان پەلاماریان بدەین‌و بەرهەقیان بکەین، یان دەبێ هانا بۆ خەڵکانی تر بەرین وکۆمەکیان لێبخوازین."

## تیلیماخۆس سڵ لە هێزو ژمارەی خوازگارەکان دەکاتەوە

هەنگێ تیلیماخۆسی ژیرو زرینگ، بەرسڤی دایەوەوگوتی:

"باوکە، من هەمیشە گوێم لە خەڵکی بووە کە بە ڕێزوحورمەتەوە باسیان کردویت، بە شانازییەوە ستایشیان کردویت، گوتویانە لە شەڕا قارەمانی بێ وێنەو لەتەگبیرو ڕاوێژدا، بەردەبارو دووربینی. بەڵام ئەم ئیشەی کە باسی دەکەیت، کارێکی ئاسان نیە، یەجگار ترسناکە. من زۆرم

پێ سەیرە، چۆن دوو کەس بە تەنیا دەتوانن شەڕی دەیان کەسی ئازاو دڕ بکەن! خۆ ئەوان دە کەس‌وبیست کەس نین، یەجگار زۆرترن، راوەستە ئێستا بۆتیان دەژمێرم، پەنجاو دوو گەنجی هەڵبژاردە کە شە دانە خزمەتکاریان دەگەڵە لە (دولیخیوم)ەوە هاتوون، بیست‌وچوار کەس لە (سامی)یەوە هاتوون، بیست گەنجی ئاخایی لە زاکونتوسەوە هاتوون، ودوانزە کەسیش لە ناو ئیتاکاوە هاتوون‌و کە هەر هەموویان لە پیاو ماقولان‌وخانەدانانی دەرەجەیەکی شارن، میدونی پەیاماوەر وشایەری موبارەك، ودوو سفرەچی چالاك‌وکارامەشیان دەگەڵە. زۆر دەترسم ئەگەر لەماڵەوە بەگژ ئەو هەموودا بچیت‌و بتەوێ تۆڵەی بەد رەفتاریەکانیان لێبسەنیتەوە، دەرەقەت تەیەیت‌و بە جۆرێ گیرۆدە ببی کە پەشیمانی حاسڵ بکەی. باشتر وایە بیرێك لەوە بکەیتەوە، کە ئەگەر دەکرێت، هەوادارانێك پەیدا بکەیت، خۆ بەخش، بەگەڵمان بکەون، وبەدڵ لە پێناوی ئێمەدا بجەنگن."

ئودیسیوسی دنیادیدەوچارەساز بەرسڤی دایەوە:

"زۆر باشە! کەواتە با قسەی دڵی خۆمت پێبڵێم، قسەکەم بە هەند بگرە، باش گوێ بگرەو ورد بیری لێبکەوە، ئایا ئەگەر ئەتیناو بابە زیوس لەگەڵمان بن بەسە، یان بیر لەوە بکەمەوە خەڵکانی دیکەش پەیدا بکەم."

هەنگێ تیلیماخۆسی فرەزان بەرسڤی دایەوە:

"ئەو دووانەی کە باست کردن، پشت‌وپشتیوانی زۆر باشن، هەرچەندە لە حەوت تەبەقەی ئاسمان‌و لە نێو هەورانداا ئاکنجین، بەڵام بەسەر هەموو تیرەی بەشەروخواوەندانی جاویدانیشدا زاڵن."

## ئودیسیوس نەخشەی کار بۆ کوڕەکەی دادەنێت

ئودیسیوسی مەزن، دووربین‌و بەردەبار گوتی:

"بێگومان کاتێ لە ماڵەکەی خۆما شەڕ لە نێوان ئێمەو خوازگارەکاندا هەڵدەگیرسێت، وئەریس خۆی ساغ دەکاتەوەو لایەنگری لە لایەك دەکات، ئەو دووە خۆ لەو شەڕە خوێناویە بە دوور ناگرن‌و بەهانامانەوە دێن. بۆیە سبەینێ شەوەکی بڕۆرەوە بۆ ماڵ‌ومیناکی جاران بچۆرەوە ناو خوازگارە گۆساخ‌و بێ ئەدەبەکان. دوای ئەوە بەرازەوانەکە، من لە شێوەو روخساری دەرۆزەکەرێکی کلۆڵی پیرۆ شپرزەی بەستەزماندا بۆ شار دێنێ. جا ئەگەر ئەوانە لە ماڵەکەی خۆمدا چەندیان گاڵتە، سوکایەتی پێکردم، یا بەد رەفتاریان دەگەڵ کردم، تۆ خۆت بگرەو شێلو مەبە. تەنانەت ئەگەر لەلاقیان گرتم‌و بەنێو ماڵەکەدا رایانکێشام‌و بردیانم لە دەرکەوە توڕیان دامە دەرەوە، یان لێیاندام، تۆ تەنیا تەماشا بکەو خۆت لێم مەکە بە خاوەن. هەوڵبدە بە قسەی خۆش‌و بە زمانی نەرم بیانهێنییە رەدا کە ئەو گەوجاتیە نەکەن‌و دەستبەرداری ئەو کارە بن. دیارە بە قسەت ناکەن، چونکە مەرگیان نزیك بووەتەوە. جا گوێ بگرە با شتێکی دیکەشت پێ بڵێم، ئەم قسەیەت چاك لە بیر بێ‌و فەرامۆشی نەکەی. هەر کاتێ ئەتینای خاوەن حیکمەت‌و خۆشتەگبیر فەرمانی پێ فەرمووم، کە دەست بەکار بم، من سەرێکت بۆ دەلەقێنم‌و دەبێ یەکسەر حاڵی ببی‌و دەستبەجێ هەرچی چەکێکی کوشندە لە ماڵەکەدا هەیە هەر هەمووی کۆ بکەیتەوەو

بیبەی لە عەمارە گەورەکەدا هەڵی بگریتو بیشاریتەوە با لەبەر دەست دا نەبن. ئەگەر خوازگارەکان هەستیان پێکردو هۆی هەڵگرتنی چەکەکانیان لێپرسیت. بە قسەی خۆشو زمانی نەرم فریویان بدەو بڵێ:

"لە تەپو دووکەڵیان دوور دەخەمەوە، دووکەڵ خواردوونیو خەریکە رەنگ دەبوێرنو وەکو ئەوسا نەماون کە ئودیسیوس لەماڵەوەی بەجێ هێشتنو بۆ شەڕی تەروادە رۆیی. یەکپارچە تەنیودووکەڵن، وخەریکە لە رەونەق دەکەون. ئەمە جگە لەوەی کوڕی کرونۆس ترسێکی گەورەی لە دڵ ناوم، دەبێ خۆمی لێ بپارێزم، ئەویش ئەوەیە وەختێ بادەگرتنی وخەیاڵ بوون، دەترسم دەست بدەنە چەکو پڕ بدەنە یەکترو یەکدی بریندار بکەنو هەم خۆتان عەیبدار بکەنو هەم ئەو نانوخوانە بێ رێز بکەنو... چونکە چەك بە تەبیعەتی خۆی مرۆۋ بۆ خۆی رادەکێشێت." تەنیا بۆ خۆمان، بۆ هەردووکمان، دوو سپەری چەرمەگا، دوو شمشێر، ودوو نێزە لەلایەکەوە دابنە، تا لە کاتی پەلاماری دژمندا، زوو بەزوو دەستمان بیانگاتێ، ئەوسا پالاس ئەتینا،زیوسی خواوەندی فرەزانا، گێلوحوڵ دەکات. جا دەمەوێ شتێکی دیکەشت پێ بڵێم، دەبێ جوان بیخەیتە دڵتەوەو لای کەس نەیدرکێنی. ئەگەر بەڕاستی کوڕی منیتو خوێنی من لە دەمارتدایە، نابێ هیچ کەسێك بزانێت کە ئودیسیوس لەو ماڵەدایە. نە لایرتیس، نە بەرازەوانەکە، نە هیچ یەکێك لەخوڵامو خزمەتکارەکان، تەنانەت خودی (پنلوپی)ش نابێ بەم رازو نهێنییە بزانن، منو تۆ هەموو ژنەکان، کارەکەرەکان تاقی دەکەینەوە، ئەوسا دەچین هەموو خوڵامو خزمەتکارەکانیش تاقی دەکەینەوە تا بزانین کێ لەگەڵمانە، رێزمان دەگرێتو لە ناخا لێمان دەترسێت،وکێ دژمانەو هیچ باکی پێمان نیەو هیچ حیسابێك بۆ پایەو گەورەیی تۆ ناکاتو بە هیچت نازانێ؟"

کوڕە رەسەنەکەی بەرسڤی دایەوە:

"باوکە! پێم وایە، لە ئێستا بە دواوە لە نزیکەوە دەمناسیت، بەچاوی خۆت دەبینی کە کون لە جەرگما نییە، وگەڕانەوەم لە مەزەبدا نیەو هەرگیز لە راوێژو فەرمانی تۆ لا نادەم. بە هەرحاڵ ئەمە بەجێی خۆی! بەڵام پێموایە سوور بوونو پێداگری لەسەر ئەم نەخشەیە، بە قازانجی ئێمە نیە، بۆیە داوات لێدەکەم زیاتر بیری لێ بکەیتەوە، هەر وازی لێ بێنە، تۆ ماوەیەکی زۆرت دەوێ تا خەڵکی تاقی بکەیتەوە، دەبێ لێرەوە بۆ ئەوێ، لەم کێڵگەوە بۆ ئەو کێڵگە بڕۆیت تا خەڵکەکە تاقی بکەیتەوەو بزانی کێ لەگەڵتەوکێ دژتە. جا لەم ماوەیەدا خوازگارەکان بە کاوەخۆ، بەوپەڕی ئاسوودەیی، لە کۆشکەکەماندا تەراتێن دەکەن، بە کەیفی دڵی خۆیان، بەوپەڕی بێ ویژدانی سەروەتو سامانمان بە تالان دەبەن، ماڵمان دەخۆنو هەرچیمان هەیەو نیە پاکوی دەدەنو هیچمان بۆ نایەڵنەوە. سەبارەت بە ژنان، من دەگەڵ ئەوەدام بە هەموو شێوەیەك تاقیان بکەیتەوە، دایانپشکنیو بزانی کێیان دژتن، وکێیان دڵسۆزتن، بەڵام سەبارەت بە پیاوان، من دەگەڵ ئەوەدا نیم بێهودە بە ناو کێڵگەومەزراو ئاغەلان بکەویو یەك یەك تاقیان بکەیتەوە، تا هەڵوێستیان بزانیت. ئەم کارە بۆ دوایی هەڵدەگرین، وئێستا چاوەڕوانی ئاماژەی زیوسی سپەرداربە."

## پینلوپی بە گەییشتنەوەی تیلیماخۆ دەزانێ

لەو کاتەدا کە ئودیسیوس و کوڕەکەی ئەو قسانەیان دەگەڵ یەکدیدا دەکرد، ئەو کەشتییە روختەیەی کە تیلیماخۆس و هەموو هاوڕێکانی لە بیلوسەوە هێنا بوو، گەییە کەناری ئیتاکا، هەرکە گەییە بەندەرە قوڵەکە، لەنگەریان گرت. کەشتییە بۆریان راکێشایە سەر لمەلانی کەنارەکە،و دەریاوانەکان گورج بورج و بادەوان و تفاقی کەشتییەکەیان کردەوە، وزوو بەزوو دیاری وسەوقاتیە جوان و نایابەکانیان بۆ ماڵی کلوتیوس گواستەوە. ئەوسا پەیکێکیان بۆ ماڵی ئودیسیوس نارد تا پەیام بگەیەنێتە پنلوپ، ژنی هەرە ئاقڵ وئاغر، کە تیلیماخۆس لە گوندی لایداوەو ئەوانی راسپاردووە کە کەشتییەکە بۆ شار بەرنەوە، تا شابانۆی رەسەن و خانەدان نیگەران نەبێت و سەر نەکاتە گریان و روندك رشتن. ئیدی یارۆی پەیك و بەرازەوانی رەسەن، لە رێگە تووشی یەکتر بوون، هەردووکیان هەمان پەیامیان بۆ شابانۆ دەبرد. کە گەییشتنە کۆشکەکەی ئودیسیوسی خواوەند رەچەڵەك، کابرای پەیك لە بەردەم قەرەواش و کارەکەرەکاندا گوتی: "خاتوونی، کوڕە ئازیزەکەت، ئەمە تۆزێکە لە بیلوس گەڕاوەتەوە!"
ئەوجا یومایوس لەپنلوپ نزیك بووەوەو هەموو قسەو راسپاردەکانی تیلیماخۆسی، بێ زیادو کەم پێگوت.کە پەیامەکەی پێگەیاند، لە کۆشك وسەراکە وەدەرکەوت، ملی رێگەی گرتە بەر تا بچێتەوە بۆ لای رەوە بەرازەکانی.

## خوازگارەکان دەکەونە تەگبیرو راوێژ

خوازگارەکان، کە بە هاتنەوەی تیلیماخۆسیان زانی، زۆریان پێ سەیر بوو، شپرزەو توڕە بوون، لە هۆڵە گەورەکە وەدەرکەوتن، چوونە ناو حەوشە. لە پاڵ دیوارە بەرزەکەو بەرانبەر دەروازەکە دانیشتن. یوروماخۆس، کوڕی یولیپوس، بەر لە هەمووان هەڵیدایەوگوتی:
"براینۆ! وا دیارە ئەم تیلیماخۆسە، بە سەرەڕۆیی خۆی، دەستی خۆی وەشاند، سەفەرەکەی کرد! ئێمە واماندەزانی ئەم کارەی پێناکرێت! بە هەرحاڵ ئەوەی چوو چوو، ئێستا پێویستە باشترین کەشتی، بە کارامەترین کەشتیڕان و سەوڵەوانەوە بە دەریادا بنێرین، تا بە زووترین کات خەبەر بگەیەننە ئەو هاوڕێیانەی کە لەوێن، خێرا بۆ وڵات بگەڕێنەوە".
هێشتا بە تەواوەتی لە قسەکانی نەبوو بووەوە، کە ئەمفینوموس لە جێی خۆیەوە ئاوڕی دایەوە، سەیری کرد کەشتییەکەیان گەییوەتە بەندەرە قوڵەکەو، کەشتیوانەکان خەریکن بادەوانەکان دادەنەوەو سەوڵەکانیان بە دەستەوەیە. لە قاقای پێکەنینی دا، وگوتی:
"پێویست ناکات کەسیان بە دوودا بنێرین، ئەوەتا بە خۆیان هاتنەوە، وان لە لەنگەرگاکە! یان یەکێك لە خواوەندەکان هەواڵی داونەتێ، یان بە چاوی خۆیان کەشتییەکەیان دیتووەو نەیانتوانیوە بیگەنێ و پێشی پێبگرن."
هەرکە ئەفینوموس لە قسەکەی بووەوە، هەموو هەستان و بەرەو کەناری دەریا وەڕێکەوتن. هاوڕێکانیان بەپەلە کەشتییە بۆریان راکێشایە سەر لمەلانی کەنارەکە، دەریاوانەکان کەرەستەو تفاقەکانیان داگرت. ئەوسا خوازگارەکان چوون بۆ شوێنی کۆبوونەوە، نەیانهێشت جگە لە خۆیان کەس چ گەنج و چ پیر لە کۆبوونەوەکەیاندا بەشدار بێت. ئەوسا ئەنتینوس، کوڕی یوپایتیس رووی تێکردن وگوتی: "کوڕینە ئەمە شتێکی زۆر سەیرە، بەڕاستی رووداوێکی

ناخۆشە! تۆ بزانە چۆن خواوەندان ئەم پیاوەیان دەربازکرد! نۆبەچیەکانمان، بە درێژایی رۆژ، کام شوێنە بەرزوباگرە، لەوێوە چاودێریان دەکردو ئێشکیان دەگرت، زوو زوو یەکتریان دەگۆڕی و کە شەویشمان لێ دا دەهات، هەرگیز نەدەچووین لە کەناری دەریادا بنووین، شەو تا بەیانی لە ناو کەشتیدا دەماینەوەو بە گژ شەپۆلاندا دەچووین وچاوەروانمان دەکرد کە تیلیماخۆس پەیدا ببێ و بیخەینە کەمینەوە، بیگرین و بێکەس کوژی بکەین. بەلام وادیارە یەکێك لە خواوەندەکان دەستی بە باڵییەوە گرتووەو بە سەلامەتی بۆ ولاتی خۆی گەڕاندووەتەوە. جا ئێستا دەبێ بیر لەوە بکەینەوە چۆن لە ناوی بەرین. دەبێ داوێکی کوشندەی ئەوتۆی بۆ بنەینەوە کە رزگاربوونی نەبێت. پێموایە تا ئەو بمێنێ، ئێمە هیچ بە هیچ ناکەین، و ریسەکەمان لێدەکاتەوە بە خوری. چونکە بە خۆی گەنجێکی زیرەك و هۆشمەندو بە ورەیە، وخەڵکەکەش لێمان رازی نین .جا با تا زووە فریای خۆمان بکەوین، دەرفەتی نەدەین ئاخاییان لە مەیدانی شاردا کۆبکاتەوەو قسەیان بۆ بکات. چونکە هەر بەوەندەوە ناوەستێت، رکابەریمان دەکات، ولە بەردەم هەمووواندا جاڕمان لێدەدات کە چۆن ژێراوژێر داومان بۆ ناوەتەوەو ویستومانە بە ناهەق بیکوژین، نەمان توانیوە بیگرین. خۆ ئەگەر خەڵکی بەم کارە ناڕەوایانەی ئێمە بزانن، هەر حەیامان دەچێت، ریسوامان دەکەن. دەبێ ئاگامان لە خۆ بێ نەبادا بە گژماندا بێن، شار بەدەرمان بکەن، وناچاربین پەنا وەبەر ولاتی بێگانە بەرین.جا دەبێ دەست پێشکەری بکەین،و ئەم دژمنە سەرسەختەمان، لە دەرێی شار، لە گوندی، یان لە رێگەدا بگرین. هەنگێ دەتوانین دەست بەسەر سەروەت وسامانەکەیدا، بەسەر دارو نەداریدا بگرین و بە شێوەیەکی یەکسان و دادوەرانە بەسەر خۆمانیدا، دابەش بکەین،و خانووەکەشی دەدەین بە دایکی و بەو پیاوەی کە دەیخوازێت. خۆ ئەگەر ئەم پێشنیازەشتان بە دڵ نیە، گەرەکتانە تیلیماخۆس بمێنێ و هەر هەموو میراتییەکەی بابی پێببڕێت، با چیتر لێرە نەمێنین و بە ناهەق موڵك ومالی بە فیڕۆ نەدەین و تەخشان و پەخشانی نەکەین، با هەرکەسەو لە موڵك ومالی خۆی، لە کیسەی خۆی پاداشت و دیاریی و جیازی پێشکەش بە پنلوپ بکات، ئەوسا پنلوپی ئەو کەسە بە هاوسەری خۆی هەڵدەبژێرێ کە زۆرترین پاداشت و دیاری و جیازی پێشکەش کردووەو چارەنووس و قەدەر قەڵەمی لێداوە.

## ئەمفینومۆس دژی نەخشەی کوشتنی تیلیماخۆس دەوەستێ.

دوای ئەو قسانە هەموو مات و بێدەنگ بوون. هەنگێ ئەمفینوموس، کوڕی رەسەنی نیسوس شا، کوڕی ئەریتیاس، کە پێشەنگی ئەو خوازگارانە بوو، کە لە دولیخیومی مەڵبەندی گەنم و مێرگانەوە هاتبوو،و قسەکانی ئەو پتر لە قسەی هەموو ئەوانی تر، بە دڵی پنلوپی بوو، چونکە بە تەبیعەت پیاوێکی ئاقڵ و بە ویژدان وبە ئینساف بوو، هەستاو رووی کردە ئاپۆڕاکەو بە نیازێکی پاکەوە گوتی:

"براینۆ، من بەش بە حاڵی خۆم لەگەڵ کوشتنی تیلیماخۆسدا نیم. کوشتنی خەڵکی شانەژادو رەسەن، قەباحەتێکی گەورەیە، کاری کردەنی نیە. با جاریّ بزانین خواستی خواوەندان بە چیە. ئەگەر خواستی زیوسی مەزنی لەسەر بێ، هەنگێ من ئامادەم بە خۆم بیکوژم، و هەموو کەسێکی

دیکەش بۆ کوشتنی هان بدەم، بەڵام ئەگەر خواستی خواوەندانی لەسەر نەبوو، ئەوا ئامۆژگاریتان دەکەم دەست لەو کارە هەڵگرن وچاوپۆشی لێبکەن."

ئاپۆڕاکە، قسەکانی "ئەمفینوموس"یان زۆر بە دڵ بوو. ئیدی هەستان و چوونەوە بۆماڵی ئودیسیوس، کە گەییشتنەوە ئەوێندەر هەرکەسەو لە شوێنی ئاسایی خۆی دانیشتەوە.

## پنلوپی دێتە سەر خوازگارەکان

دوای ئەوە پنلوپی، ژنی هەرە ئاقڵ و ئاغر، لێبڕا بێتە سەر خوازگارە گۆساخ و بێ شەرم و چاو قایمەکان. چونکە زانی بووی کە لە ماڵەکەی خۆیدا زەمینە بۆ مەرگی کوڕەکەی خۆش دەکەن. (میدون)ی پەیاماوەر، گوێی لە تەگبیرو راوێژیان بوو بوو، خێرا ئەو هەواڵەی گەیاندبووە پنلوپی. ئیدی دەگەڵ کەنیزەك وکارەکەرەکانیا چوو بووە خوارەوە بۆ هۆڵە گەورەکە،. کە گەیی بووە ئاستی خوازگارەکان، لە تەنیشت دەرگای هۆڵەکە راوەستا بوو، رووبەندە رەخشانەکەی دادابووەوەو، رووی کردبووە ئەنتینوس و بەمجۆرە کەوتبووە سەرزەنشتی:

"ئەی ئەنتینوس، ئەی پیلانگێڕی بێ شەرمی دوو روو، ئەی شەڕانی شەڕاشۆ! گوایە تۆ لە ئیتاکادا بە ئاقڵی و پیاوچاکی بەناوبانگی! ئەگەر خانم وابێ دەبێ قەرەواش سەگی کوێ بێ! وا دیارە تۆ ئەو پیاوە نیت، بوختانیان بۆ کردویت. کەرپیاو! بۆچی نەخشەی کوشتنی تیلیماخۆس دەکێشیت؟ یانی بیر لەوە ناکەیتەوە کە زیوس بە چاوی خۆی ئەم کردەوانەتان دەبینێ! لە زیوس، کە پشت و پەنای لێقەوماوانە، ناترسیت! زەمینەسازی بۆ کوشتنی ئەم و ئەو کارێکی ناڕەوایە. یانی بیرت چووەوە کە بابت لە ترسی گەل، کە زۆر لێی پڕبوون، پەنای وەبەر ئێرە هێنا؟ بابت دەگەڵ تافییەکان، دزانی دەریایی، دەستی تێکەڵ کردبوو، تیسپورتەکانیان، کە دۆست و هاوپەیمانی ئێمە بوون، تالانکرد، کە ئەوسا دەیانویست بیکوژن، لە نێوی بەرن، دارو نەداری تالان بکەن، بیخەنە سەر ساجی عەلی. بەڵام ئودیسیوس خەڵکەکەی هێورکردەوە، جڵەوی گرتن و نەیهێشت ئەو کارەبکەن، ئێستاش بێئەوەی سەری کیسەی خۆت بکەیتەوە، بە ناهەق ماڵی ئەو دەخۆی، ئەوەی تۆ بە ناهەق دەیخۆی، تەخشان وپەخشانی دەکەی ماڵی ئودیسیوسە. چاوت بڕیوەتە ژنەکەی ودەتەوێ ژێراوژێر کوڕەکەشی بکوژی، بەڕاستی زۆم لەبەر گرانە. جا من هاتووم پێت بڵێم کە دەست بەرداری ئەو کارانە بە، ئامۆژگاری هاوڕێکانیشت بکە."

## یوروماخۆس پینلوپی هێور دەکاتەوە

یوروماخۆس، کوڕی پولیبوس بەرسڤی دایەوەوگوتی:

"ئەی کیژی ئیکاروس، ئەی ژنی هەرە ئاقڵ و ئاغر! دڵ لە دڵ مەدە، خۆت نیگەران مەکە. تا ئەو رۆژەی من لە دنیادا بم و چاوانم روناکی بدینن، کوڕ نەبووەو نیە بتوانێ دەست لە تیلیماخۆسی کوڕی تۆ بکاتەوە. دڵنیا بە هەرکەسێك دەست بۆ کوڕەکەی تۆ درێژ بکات، شمشێری من بە خوێنی خۆی سوور دەکات. من ئێستاش لە یادمە ئودیسیوسی شارانگر چۆن لە باوەشی دەگرتم، گۆشتی برژاوی دەدایە دەستم، و بادەی سووری ئاڵی، لە جامەکەی خۆی بەدەممەوە

دەکرد. بۆیە تیلیماخۆس بۆ من لە هەموو کەس خۆشەویستترو ئازیزترە، وبا دڵنیا بێت کە بە دەستی خوازگارەکان ناکوژرێت. خۆ ئەگەر ئەجەلیش لەلایەن خواوەندانەوە هات، ئیدی کەس دەسەڵاتی ئەجەلی نیە."

ئەو قسانەی بۆ دڵدانەوەی پنلوپی کرد. بەڵام ژێراوژێر نەخشەی کوشتنی تیلیماخۆسی دەکێشا. هەنگێ پنلوپ بۆ ژوورەکەی خۆی سەرکەوت، ژووری چی، دیوارەکانی هێندە رەخشان بوو لە تۆ وایە ئاوێنە بەندە. لەوێ کەوتە گریان بۆ ئودیسیوسی مێردی. تا ئەتینای چاوگەش، خەوێکی خۆشی بەسەر چاوەکانیا داباراند.

## ئەتینا، ئودیسیوس بۆ سواڵکەرێکی پیر دەگۆڕێ

یارۆی بەرازەوان، دەمەو ئێوارەیەکی درەنگ گەڕایەوە بۆ لای ئودیسیوس و کوڕەکەی کە بەرازێکی یەکساڵەیان کوشتبووەوەو خەریکی ئامادە کردنی شێو بوون. بەڵام ئەتینا خێرا فریاکەوت، سەوڵەجانێکی بە سەراپای ئودیسیوس، کوڕی لایرتیس دا، هێنا، کردییەوە بە دەرۆزەکەرێکی پیری شڕۆڵەی شەپڕێو تا بەرازەوانەکە نەیناسێتەوەو بە هەڵەداوان نەچێت مژدە بۆ پنلوپی ببات، وبەڵکو رازەکە بە شاراوەیی وەمێنێ.

تیلیماخۆس رووی کردە بەرازەوانەکەوگوتی:

"ها یومایوسی مەردورەند، هاتیتەوە. دەنگوباسی شار؟ ئایا خوازگارە گۆساخەکان لە کەمینەکەیان گەڕاونەتەوە یان هێشتا خۆیان بۆ من لە بۆسە داوە، تا کە بۆ ماڵ گەڕامەوە، لە رێگەدا غافڵگیرم بکەن وبمکوژن؟"

تۆش ئەی یومایوس، ئەی بەرازەوان، وەڵامت دایەوەوگوتت:

"ئەوەی راستی بێ، دەنگو باسی شار نازانم، کە بە شارا رۆییشتم هیچم لە کەس نەپرسی، من خواخوام بوو پەیامەکەی تۆ بگەیەنمو بەلەز بۆ ئێرە بگەڕێمەوە. بەڵام لە رێگەدا تووشی پەیکێکی قۆچاخ بووم کە هاوسەفەرەکانی تۆ ناردبوویان مژدەی هاتنەوەی تۆ بە دایکت بدات، و لە پێش مندا خۆی گەیاندە دایکت. لەمە دڵنیام، چونکە بە چاوی خۆم دیتم. بەڵام شتێکی دیکەش دەزانم، بە چاوی خۆم دیتم. تازە گەیی بوومە ئەو هەورازەی کە دەڕوانێتە سەر شار، و لە تەپەی هیرمیسەوە تەماشام کرد، کەشتییەکی خۆشڕۆ خۆی بە بەندەرەکەماندا دەکرد، خەڵکێکی زۆری تیا بوو، پڕبوو لە سپەرومەتاڵ و قەڵغان و شمشێری دوو دەم ونێزەی نوک تیژی دوو سەر، وام بە زەینا هات کە ئەوان بن، بەڵام دڵنیانیم".

کە یومایوس ئەو قسەیەی کرد، تیلیماخۆسی ورەبەرز بزەیەکی کرد. نیگایەکی ماناداری بابی کردو نەیهێشت بەرازەوانەکە هەستی پێبکات وبیدینێ.

پاش ئەوەی لە کارەکەیان بوونەوە، شێوەکەیان ئامادەکرد، سفرەیان راخست، خواردن و خواردنەوەیان دانا، کەس گلەیی لە بەشی خۆی نەبوو، دوای ئەوەی تێرو پڕیان خواردو خواردەوە، ئیدی لێی پاڵکەوتن، ئاسوودەو سەر رەحەت خەوتن.

***

# سروودی هەڤدەیەم

## کورتەی سروودەکە:

تیلیماخۆس، بەیانی زوو بەرەو شار دەڕوات. کە دەگاتە کۆشکەکەی بابی، لەلایەن یوریکلیا و دایکییەوە پێشوازی دەکرێت. پنلوپی داوا لە تیلیماخۆس دەکات بۆی بگێڕیتەوە کە مینیلاوس‌و هیلین چۆن پێشوازی‌و میوانداریان کردووە. ئەوسا پاڵەوانی لاو بۆ مەیدانی شار دەڕوات. تیلیماخۆس دەیەوێ، قەناعەت بە دایکی بکات کە میوانداری تیوکلومینیوس–ی فاڵبین‌وخێفران بکات‌و لە ماڵی خۆیاندا بیدینێ. ئەم پیاوە زۆر بە متمانەوە قسان بۆ پنلوپی دەکات‌و ئەرخایەنی دەکات کە ئودیسیوس لە ئایندەیەکی نزیکدا بۆ ئیتاکا دەزڤڕێتەوە. لەم کاتەدا خوازگارەکان لە هۆڵەکەدا کۆدەبنەوەو دەیانەوێ بەزم‌و ئاهەنگ بگێڕن. ئودیسیوس‌و یومایوس–ش دەکەونە ڕێ‌و بۆ کۆشك‌و سەراکەی ئودیسیوس دێن. لە ڕێگەدا تووشی میلانتیوسی بزنەوان‌و خولامی ئودیسیوس دەبن. دەکەوێتە جنێودان بە ئودیسیوس‌و بەدرەفتاری دەگەڵ دەکات. ئودیسیوس‌و یومایوس دەگەنە جێ، تەنیا ئارگوس، سەگە پیرەکەی ئودیسیوس، ئودیسیوس دەناسێتەوە. کە دەرۆزەکەری ساختە دەگاتە ناو کۆشکەکە، دەمەقاڵێیەك لە نێوان ئانتینوس‌و یومایوس چێدەبێت. تیلیماخۆسی ڕەسەنزادە دەکەوێتە ناوبژییان. ئانتینوس گاڵتەو تەڵفیزی بە ئودیسیوس دەکات‌و تەپڵەکێك بەسەریا دەکێشێت. پنلوپ کە گوێی لە دەنگە دەنگ‌وهەراو هەنگامە دەبێت بە هەڵەداوان دێت‌و بەرگری لە کابرای بێگانە دەکات. تەنانەت لێدەبڕێت کە بڕێك پرسوجۆی دەگەڵ بکات. بەڵام ئودیسیوس کە ناچارە خۆی ئاشکرا نەکات، پرسوجۆیەکە بۆ شەوێ هەڵدەگرێت. یومایوس بە تەنێ بۆ گوند دەگەڕێتەوە.

***

## تیلیماخۆس، بەرازەوانەکە ڕادەسپێرێ ئاگای لە یارۆی غەریب بێ

کە سپێدە بەیانی دا، تیلیماخۆس، کوڕە ئازیزو دڵبەندەکەی ئودیسیوسی موبارەك، سەندەڵە جوانەکانی لە پێکرد، نێزە قورس‌و خۆشدەستەکەی هەڵگرت. پەلەی بوو بەزووترین کات بگاتە شار. ڕووی کردە بەرازەوانەکەو گوتی:

"ئەی بابی میهرەبان، من هەر ئێستا بۆ شار دەڕۆم تا دایکم بمدێنێ، چونکە دەزانم تا من نەدینێ، سوکنایی نایەت‌و لە گریان‌و ڕوندك ڕشتنان ناکەوێ. بەڵام داوات لێدەکەم میوانە بەدبەختەکەمان بۆ شار ببە، با بۆ خۆی بە سواڵ‌وسەدەقە نانێ بۆ خۆی پەیدا بکات. یەکێك

پەیدا دەبێ پارووە نان‌وقومە ئاوێك یان پیاڵە شەرابێکی بداتێ. بەڕاستی من ناتوانم بە هەموو کەسێکدا ڕابگەم. لە ڕادەبەدەر خەمباروسەقاڵم! ڕەنگە میوانەکەمان بەم قسانە زویر بێت، داوای بوردن دەکەم، ئەوە حەقیقەتی مەسەلەکەیەو حەزناکەم درۆی دەگەڵ بکەم.
ئودیسیوسی چارەسازو دووربین بەرسڤی دایەوەوگوتی:
"ئەزبەنی، دڵنیابە منیش حەزناکەم لێرە بمێنمەوە. بۆ خەڵکی دەرۆزەکەر هەر چۆنێ بێ شارەکە لە دەشت‌و مەزرایان باشترە. ئەوەی مەبەستی بێ شتێکم دەداتێ. من گەنج نیم، لە تەمەنێکا نیمم لێرە لەم ئاغەڵ‌و کێڵگەو مەزرایەدا بمێنم‌و لە هەموو کارێکا هەر گوێڕایەڵی سەرکاران بم. تۆ بڕۆ، خەمی منت نەبێ، ئەم پیاوەی کە فەرمانت پێ دا، بۆ شارم دەبات. باجارێ تۆزێ خۆم لەبەر ئاگر گەرم بکەمەوە، هەتاو بە تەواوەتی هەڵبێ‌و دنیا گەرم ببێ هەنگێ دەڕۆم. چونکە جلەکانم زۆر تەنك‌و تیواڵن‌و دەترسم سەرمای ئەم بەرەبەیانە بمچێنێ. تۆش دەڵێی شار لێرەوە دوورە."

## تیلیماخۆس دەگاتە کۆشکەکەی دایکی

کە ئەو، ئەو قسانەی دەکرد، تیلیماخۆس ئاغەڵەکانی بڕی بوو، وبە هەشتاو دەڕۆیی، و لە ناخی ناخەوە بیری لە تۆڵە، لە کوشتنی خوازگارەکان دەکردەوە. کە گەییە کۆشکە گەورەکە، خێرا نێزەکەی بە پایەیەکی بەرزا هەڵپەسارد، ئەوسا لە ئاستانە بەردینەکەوە وەژوورکەورت.
یوریکلیای دایەنی، کە فەروی لەسەر کورسیەکان رادەخست، لە دوورەوەو بەر لە هەر کەسێکی دی بینی. یەکسەر بە چاوانی تەژی روندکەوە بەرەو پیری غاری دا. ئەوسا کارەکەرەکانی دیکەی ئودیسیوسی بەردەبار دەوریان دان، وبەدەم خێرهانینەوە سەروشانیان ماچ کرد.

## پنلوپی بە گریان‌و ڕامووسان پێشوازی کوڕەکەی دەکات

هەنگێ پنلوپی ئاقل‌وئاغر لە باڵەخانەکەی خۆی هاتە دەرێ. هێندە جوان بوو دەتگوت ئەرتەمیس یان ئافرۆدێتی زێڕینە. بەدەم گریانەوە دەستی لە ملی کوڕە ئازیزەکە وەرینا، نێوچەوان‌و چاوە جوانەکانی ڕاموسین. بە دەنگیکی گریان ئامێزەوە گوتی:
"تیلیماخۆس، ئەی گلارە دیدەکانم، هاتییەوە! ئەمە تۆی! لەو ڕۆژەوە کە بە پەنهانی‌و بەبێ پرس‌ورای من بۆ سۆراخی بابی ئازیزت، ڕۆییشتی، بە تەمای ئەوە نەمام هەرگیز جارێکی دی بتبینمەوە. بە هەرحاڵ با واز لەم قسانە بێنین، وەرە بزانم چیت دیت، چیت بیست، چیت زانی، هەر هەموویم مووبە موو بۆ بگێڕەوە."
تیلیماخۆسی ژیرو زرینگ بەرسڤی دایەوە:
"دایکە، گلەییم لێ مەکە، تکات لێدەکەم مەمخە گریان، ئازاری روحم مەدە، مادامێکی لە مەرگ رزگار بووم، ڕابە دەمو چاوت بشۆ، جلکێکی پاك‌وخاوێن‌و جوان لەبەر بکە، دەگەڵ کارەکەرو هاودەمەکانی خۆتا بچۆ باڵەخانەکەی خۆت، بەڵێن بە هەموو خواوەندان بدە کە ئەگەر زیوس تۆڵەی ئێمە لە دژمنانمان بکاتەوە. قوربانی گەورەیان پێشکەش بکەیت. من دەچم بۆ مەیدانی شارو ئەو میوانەی کە لە پیلوسەوە تا ئێرە لێم جیا نەبووەتەوە، دەگەڵ خۆدا بۆ ماڵ دێنمەوە. ئەوم دەگەڵ هاوڕێ خواوەند ئاساکانمدا لە پێش خۆمەوە بۆ ئێرە ناردووە، (پیرایوس)م

راسپاردووه دەگەڵ خۆیدا بۆ ماڵی بەرێتەوە، ڕێزوحورمەتی بگریٚو، دۆستانە ڕەفتاری دەگەڵ بكات تا من دێمەوە".

كە لە قسەكانی بووەوە، پنلوپ یەكسەر، بیٚ چەندوچوون بە گوێی كرد.دەموچاوی شت، جلێكی پاكوخاوێنی لەبەركرد، بەڵێنی بە هەموو خواوەندەكان دا كە ئەگەر زیوس ڕۆژیٚ لە ڕۆژان تۆڵەیان لە دژمنان بكاتەوە قوربانی زۆر گەورەیان پێشكەش بكات.

## تیلیماخۆس خوازگارەكان دەبینیٚ

هەنگیٚ تیلیماخۆس، نێزە بەدەست لە ماڵ وەدەركەوت. دوو كسۆكی خۆشبەزی بە دواوە بوون. ئەتینا جوانیەكی خوایی ئەوتۆی بە سەروسیمای بەخشی بوو كە تێدەپەڕی خەڵكەكە سەریان لیٚ سووڕدەما. خوازگارە خۆپەسندەكان لێی خڕ دەبوونەوەو بە ڕواڵەت پێشوازیان دەكرد، دەڵەچەییان لەبەر دەكرد، ستایشیان دەكرد، وژێراو ژێرو لە ناخی دڵەوە بیریان لە كوشتنی دەكردەوە. بەڵام تیلیماخۆس خۆی لەو كەسانە دوورگرت، چوو لە بەینی مینتور، ئەنیتفوس، وهالیتیرسیس دا، كە لە دۆستانی دڵسۆزو دێرینی باوكیو ماڵباتەكەیان بوون، دانیشت. باسی سەفەرەكەیان لێپرسی. ئەوسا پیرایوسی ڕمبازی بەنێوبانگ، دەگەڵ میوانەكەیدا هات بۆ مەیدانی شار،وتیلیماخۆس، دوای تۆزێك چوو بە لایانەوە. پیرایوس ڕووی كردە تیلیماخۆسو گوتی: "تیلیماخۆس، بە پەلە چەند كارەكەرێك بۆ ماڵی من بنێرە تا ئەو دیاریانەی كە مینیلاوس دایتیٚ، بێننەوە."

تیلیماخۆسی ژیرو زرنگ بەرسڤی دایەوە:

"ئەی پیرایوس، جاریٚ نازانین، بارودۆخەكە چۆن دەكەوێتەوەوچی ڕوو دەدات. ئەگەر خوازگارە خۆپەسندەكان لە ماڵەكەی خۆماو بە دزییەوە بمكوژن،وپاشان هەموو میراتیەكەی بابم بەسەر خۆدا دابەش بكەن، ئەوا تۆ ئەو دیاریانە بۆ خۆت هەڵگری باشترە لەوەی یەكێك لەوان بیبات. خۆ ئەگەر دەرەقەتیان هاتمو لە نێوم بردن، هەنگیٚ هەم بۆ تۆ خۆشتر دەبیٚ ئەو دیاریانەم بۆ بێنی، و هەم بۆ من خۆشتر دەبیٚ لێتی وەربگرم".

## تیلیماخۆس باسی سەفەرەكەی بۆ دایكی دەكات

دوای ئەو قسانە، تیلیماخۆس، میوانەكەی، كە زۆر ماندوو وشەكەت بوو، بۆ ماڵ بردەوە. كە گەیشتنە كۆشكو تەلارە گەورەو بەرزەكە، عەباو پاڵتۆكەیان داكەندو لەسەر كورسیو نیشیمەنە بەرزەكانیان، دانان، وئەوسا خۆیان بە گەرماوە ڕەخشانەكاندا كرد، پاش ئەوەی قەرەواشو كەنیزەكان شۆردیانو زەیتیان لە بەدەنیان دا،و سەروكراسو جبەی خوریان لەبەركردن، لە گەرماو هاتنە دەریٚ، وچوون لە هۆڵە گەورەكەدا دانیشتن. قەرەواشێك بە ئافتاوەیەكی زێڕی پڕ لە ئاوەوە وەژووركەوت، دەستشۆرێكی زیوی بۆ دانانو ئاوی بە دەستدا كردن ودەستیان شۆرد. ئەوسا مێزێكی زۆر خاوێنی لە بەردەمدا دانان. ئەوسا گەورە كابانی ماڵیٚ هات، نانوخۆراكێكی زۆرو هەمە جۆرو تایبەتی بۆ دانان. دایكی تیلیماخۆس هات، لە بەرامبەر تیلیماخۆسو لە نزیكی دەرگاكە لەسەر كورسیەك دانیشتو، خەریك بوو ڕیسێكی كەتانی باریكی لەسەر

تەشییەك هەڵدەكرد. ئەوسا تیلیماخۆس و میوانەكەی دەستیان بۆ خواردنە زۆرەكەی بەردەمیان برد. پاش ئەوەی تێرو پڕیان خواردوخواردەوە، پنلۆپی ئاقڵ وئاغر هەڵیدایەو گوتی:

"تیلیماخۆس، من دەچمە سەرەوە، لەسەر جێگەكەی خۆم پاڵ دەكەوم و ئەو جێگەیەی كە گەواهو شایەدی گریەو زاری منە، و لەوساوە كە ئودیسیوس دەگەڵ كوڕانی ئوتریوس دا، ئاگامەمنون و مینیلاوسدا، ڕۆییوە، من بەردەوام بەروندكی چاوانم تەڕی دەكەم. وا دیارە تۆ ناتەوێ بەر لەهاتنەوەی خوازگارەكان بۆ ئێرە، بە ڕاشكاوی پێم بڵێی چیت لە بارەی گەڕانەوەی بابتەوە بیستووە"

تیلیماخۆسی ژیرو زرینگ بەرسڤی دایەوەوگوتی:

"زیز مەبە دایكە گیان، ئێستا هەموو شتێكت پێدەڵێم . چووین بۆ پیلوس، لەوێندەر نەستور پاشامان بینی. لە كۆشكە بڵندەكەی خۆیدا، زۆر بە گەرمی ودلۆڤانی، میناكی كوڕێكی خۆی، كوڕێك كە لە مێژ بێ لێی دووركەوتبێتەوەو تازە لە غەریبایەتی گەڕابێتەوە، بەو ئاوایە پێشوازی كردم. ئەلهەقی هەم خۆی و هەم كوڕە سەربەرزەكانی زۆریان خزمەت كردم. بەڵام گوتی تا ئێستا تاقە وشەیەكی لە هیچ بنیادەمێك دەربارەی مان یان نەمانی ئودیسیوسی بەردەبار نەبیستووە. ئەوسا بە سواری گالیسكەیەكی زۆر ڕوختەومكوم و جوان بۆ لای مینیلاوس–ی كوڕی ئوتریوس ڕمبازی بەناوبانگ، ڕەوانە كردم. لەوێ هیلینای ئارگۆسیم بینی، كە بە خواستی خواوەندان گەلێك لە ئارگۆسیان و تەروادەییان لە ڕای ئەودا كەوتنە زەحمەت و تیا چوون. مینیلاوسی نەترس و شەڕڤان و شێرە پیاوی مەیدان وشەڕگە، یەكسەر لێی پرسیم كە بۆچی بۆ لاسیدیمونی شكۆدار چووم. منیش بێ پێچ پەنا هەموو ڕاستییەكانم پێگوت. هەنگێ وەڵامی دامەوەو گوتی:

"لەم نەگبەتییە! تف لەم ڕۆژگارە! یانی ئەم پیاوە زەبوون و بودەڵانە، ئەم ترسنۆكانە، دەیانەوێ شوێنی قارەمانێكی بێباك، بوێرونەترس بگرنەوە، لە جێگاكەی ئەودا بخەون! باوەڕ بكە وەكو چۆن ئاسكێك بێچوەكانی لەلانەی چۆڵی شێرێك دا دەنوێنێ و، بە خۆی بۆ لەوەڕ دەكەوێتە نێو چیاو دۆڵی بژوێنان، وپاشان شێرە دەگەڕێتەوەو هەردوو بێچوەكە هەڵدەدڕێ و دەیانكوژێت، (ئودیسیوس)ش بەو ئاوایە بەسەر خوازگارەكاندا دەدات، سووك و ڕیسوایان دەكات، یەك یەك هەڵیان دەدڕێ و دەیانكوژێت. ئەی زیوسی باب، ئەی ئەتینا، ئەپولۆ، لێتان دەپاڕێمەوە، كە كاتی خۆی ئودیسیوس بە چ هێزو قوەتێكەوە لە لیسبوس–ی جوانا زۆرەبانی لەگەڵ فیلومیلایدس دا گرت و دای بە عاردیدا، و وەكو شووتی شەقی كرد، هەموو ئاخاییەكانی شاد كرد، بە هەمان هێزو تواناوە بگەڕێتەوەو بەناو خوازگارەكان بكەوێ، وشایی و زەماوەندیان لێبكات بە شین و ماتەم! بەڵام سەبارەت بە پرسیارو داواكانی تۆ، نە درۆت دەگەڵ دەكەم و نە فریوت دەدەم، پیرەمێردی دەریا، هەرچییەكی پێگوتم وەكو خۆی، بێ ئەوەی هیچت لێبشارمەوە، بێ كەم و زیاد پێدەڵێم. پیرەمێردی دەریا گوتی ئودیسیویس لە دوڕگەیەكی دوورا، لە ماڵی پەری دەریایی، كالیپسودا، بە ماتی وخەمباری دیتوە. كالیپسو بە تۆبزی لای خۆی گلی داوەتەوەو دەستبەسەری كردووە. ناتوانێت بۆ زاگەو مەفتەنی باب و باپیرانی خۆی بگەڕێتەوە، چونكە نە كەشتی سەوڵداری هەیەو نە كەسی دەگەڵە بتوانن بە ڕێگەی دەریادا بیهێننەوەو دەربازی بكەن."

ئەمە وەڵامی مینیلاوسی رمبازی بەناوبانگ، کوڕی ئوتریوس بوو. کە لە سۆراخ و پرسیارەکانم بوومەوە، ئیدی بەرەو ماڵ گەڕامەوە، خواوەندانیش لە دوامەوە بایەکی سازگاریان هەڵکردو زۆر زوو، وبە سەلامەتی گەیاندمیانەوە نیشتمانی ئازیزم."

## تیوکلومینوس پێشبینی دەکات کە ئودیسیوس لە وڵاتی خۆیدایە

دڵی پنلوپ، بەو قسانەی تیلیماخۆس، کەوتە گومانەوە. ئەوسا تیوکلومینوس، کە لە خواوەندان دەچوو، هەڵیدایەوگوتی:

"ئەی ژنی بەڕێزی ئودیسیوس-ی کوڕی لایرتیس! وادیارە مینیلاوس هیچ شتێك دەربارەی ئودیسیوس نازانێت. حەزدەکەم گوێ لە من بگرێت، دڵنیابە لەوەی دەیڵێم و پێشبینی دەکەم، هیچ شتێکت لێناشارمەوە، قەسەم بە زیوس و هەموو خواوەندان، قەسەم بەم نان ونمەکەی کە لە ماڵی ئودیسیوسی خانەدان و رەسەندا کردوومەوبە نسیبم بووە، ئودیسیوس حاڵی حازر لە زاگەو مەفتەنی خۆیدایە، بۆیە دەرناکەوێ، چونکە دوورونزیك تاقیبی ئەم بەد رفتاریانە دەکات کە لە ماڵەکەیدا دەکرێت، وخۆی بۆ رۆژی تۆڵە، بۆ ئەو رۆژەی کە قڕدەخاتە خوازگارەکان، ئامادە دەکات. کە لە کەشتییەکەدا بووم، تەیرێکم بینی، رێك نیشانەی ئەم قسانەی من بوو، بە (تیلیماخۆس)شم گوت."

پنلوپی ئاقڵ وئاغر بە رسقی دایەوە:

"هانام بە دەمت، خواوەند لە زارت بنۆڕێ. خۆزیا ئەم قسەیەت دەهاتە دی، بزانە چۆن ئەوسا لە ماڵی دنیام دەگرتیت، هێندەم دیاری و پێشکەشیان دەدایتێ، هەرکەسێك لە رێگاو باندا، دیتبای، سەری سوڕماباو بەغیلی بە بەختەوەری و خۆش شانسیت دا هاتبا."

## میدون خوازگارەکان بۆ شێو بانگ دەکات

لەو کاتەدا پنلوپی ئەو قسانەی دەکرد، خوازگارەکان لە مەیدانەکەی بەردەم کۆشکەکەی ئودیسیوس دا خەریکی قورس هەڵدان و رم هاویشتن بوون، وگۆساخی و خۆ پەسندی خۆیان دەنواند. بەڵام کە ئێواری داهات و کاتی شێو هات، شوانان، ران و پەزانیان لە هەر چوارنکالی دەشت و مێرگانەوە بەرەو ماڵ کردەوە، میدون، کە خوازگارەکان لە هەموو خولامەکانی دیکەیان خۆشتر دەویست،وهەمیشە لە بەزم و سووریان دا بەشداردەبوو، پێی گوتن:

"کوڕینە، ئێستا کە لە وەرزش و گەمە تێر بوون، بۆ ماڵ بگەڕێنەوە، با خوان برازێنینەوەو نان بخۆن، نانخواردن لە کاتی خۆیدا خۆشە."

هەرکە میدون ئەو قسەیەی کرد، هەموو هەستان و بەرەو کۆشکە گەورەکە پەل بوونەوە. کە گەییشتنە ماڵەوە، عەباوپاڵتۆکانیان لەسەر کورسیە بەرزەکان دانا. ئیدی کۆمەڵێ بەران و بزن، و بەرازی قەڵەو و گوێرەکەیەکیان کوشتەوەو بۆ خواوەندانیان کردە قوربانی و، بەزم و سوورێکیان بەرپا کرد بە دڵی خۆیان.

لەم ماوەیەدا، ئودیسیوس و بەرازەوانی پیاوباش بە پەلە لە مەزراو کێڵگەکانەوە بەرەو شار دادەگەڕان. یومایوس لە پێشا دەستی بە قسان کردوگوتی:

"غەریبۆ، مادامێکی گەرەکتە ئەمڕۆ بۆ شار بڕۆیت، فەرموو با بڕۆین، هەرچەندە، ئەگەر بە دەستی من بێت لێرەت گل دەدەمەوە تا ئاگاداری کێڵگەکەو ئاغەڵەکان بکەیت، بەلآم چارنییە، ئەمە فەرمانی ئاغامە. ناتوانم فەرمانی ئەو لە عاردی بدەم، چونکە دەترسم گلەییم لێبکات وسەرزەنشتم بکات،لۆمەو سەرزەنشتی ئاغا لە عەزابی قەبر گرانترە. کەواتە تا رۆژ درەنگ نەبووە با بڕۆین،چونکە دنیا لای ئێواریٚ زۆر سارد دەبێت."

ئودیسیوسی دووربین وبەردەبار بەرسڤی دایەوەوگوتی:

"لێت تێدەگەم، لە قسەکانت حاڵیم. منیش لە بیری ئەوە دابووم کە هەمان کاربکەم کە تۆ دەیڵێی، زۆر چاکە، با بڕۆین. بە درێژایی ڕێگە، تۆ ڕیٚ پێشاندەرم بە، تۆ چاوساغم بە. بەلآم ئەگەر گۆپاڵی حازرت هەیە، دانەیەکم بدەیە بۆ ڕێگا، چونکە وەکو تۆ دەڵێی ڕێگاکە سەختو نشێوە."

کە لە قسەکانی بووەوە، تورەکە شڕەکەی کە یەك پارچە پینە،ودەسکەکەی پەتێکی رزیو بوو، دا بە شانیا. (یومایوس)ش لەسەر داواکەی خۆی گۆپاڵێکی دایە. ئەمان بە دوو قۆڵی کەوتنە ڕیٚ، ئاغەڵەکانیان بەسەر سەگو شوانو بەرازەوانەکاندا بەجێهێشت. بەمجۆرە سەرۆکی بەرازەوانەکان، ئاغای خۆی لە شێوەو روخساری پیرەمێردێکی دەرۆزەکەری داماوی، بیٚ نەوای گۆپاڵ بە دەستی، شڕۆڵەی شەپڕێوی شپرزەدا بەرەو شار دەبرد. کە ڕێگا سەختو بەردەلآنەکەیان بڕیو نزیکی شار بوونەوە، گەیینە سەر کانیو سەرچاوەو فوارەیەکی یەجگار جوان، ئەستێڵێکیان لە بەرا دروست کرد بوو، وخەڵکی دەهاتن لەوێندەر ئاویان دەبرد. ئیتاکوسونیریتوسو پولیکتۆر ئەم حەوزوکانییەیان دروستکرد بوو. پەڵە سپیدارێکی ئاشقە ئاو، بە شێوەیەکی بازنەیی دەوری دابوو، ئاوێکی تەزیو ساردو سازگار لە تاوێرێکی بەرزەوە دەرژایە خواریٚ. لە سەرووی کانیو فوارەکەوە پەرستگەیەکی تایبەت بە پەریان دروست کرا بوو. ڕێبواران نەزرو نیازی خۆیان لەوێندەر دەکردو دادەنا. لەوێدا تووشی میلانتوسی کوڕی دولیوس بوون، کە باشترین بزنی مێگەلەکەی خۆی دابووە پێش، ودەیبردن تا خوازگارەکان بیانکوژنەوەو بیکەن بە بەزمو سوور، دوو شوانیشی دەگەڵ بوون. کاتیٚ کە ئودیسیوس و یومایوسی بینی، کەوتە جنێودان پێیان، هێندەی قسەی ناشیرینوسووك پێوتن کە ئودیسیوس لە ناخدا زۆر پەستو تووڕە بوو.. بە دەنگی بەرزو بە تەوسەوە پێی گوتن:

"راستیان گوتووە تەیری گول عاشق بە داری زەقنەبووتە، دەی گوم بن لەبەر چاوم. ماشەڵڵا لە کاری خواوەندان بزانە دووانی چۆن کەوتوونەتە یەك. ئەی بەرازەوانی نەگبەت، ئەم مێمڵە، ئەم سك لەوەڕێنە ئەم چەپەڵە قێزەونە بۆ کویٚ دەبەی؟ پیاو لەسەر نان خواردن بیدینیٚ، دڵی لێی تێك هەڵدیٚ. ئەمە هی ئەوەیە لەم دەرگاوە بۆ ئەو دەرگا بڕوات، و ورتکەنانو بەرماوە لە خەڵکی سواڵ بکات... خۆ ئەمە پیاوی شمشێرو شەڕگەو مەیدانان نیە! ئەگەر ئەم دەعبایە بدەیتە من، لە کەوێڵەکەی خۆما رایدەگرم، ئاغەڵو پشتیری پیٚ پاك دەکەمەوەو، دەی نێرم گیای ناسك بۆ کارژۆڵەکان بێنیٚ. هەنگیٚ پەنیری دەرخوارد دەدەم،ئیدی بۆ خۆی دەبوژێتەوەو قەڵەو دەبیو لاقی قەوی دەبن. بەلآم چونکە بە عەمراتی کاری نەکردووە، مل بۆ کار نادات، و دەرۆزەو سواڵەکەی پیٚ خۆشترە، دەیەویٚ بە سواڵوسەدەقە خۆی بژێنیٚ،ورگە تێر نەخۆرەکەی تێر بکات. جا من

دڵنیات دەکەم، ئەگەر ئەمە بڕوات بۆ کۆشکو سەراکەی ئۆدیسیوسی موبارەك، هێندەی تەپەڵەك، بەسەرو گوێلاکو لاقەبرغەدا دەکێشن، تا روحی دەردەکەن.
دوای ئەو قسانە، بە تەنیشت ئودیسیوسدا تێپەڕیو تا توانی شاپێکی تیٚ هەڵدا، بەڵام نەیتوانی ئودیسیوس لە ڕێگاکە دوور بخاتەوە، لە جێی خۆی وەستا. تیا مابوو چیبکات، گۆپاڵێکی پێدا بکێشێتو بیکوژێت، یان پڕی بداتیٚو بە هەردوو دەستان بەرزی بکاتەوەو بیدات بە عاردیداو مێشکی بپـژێنیٚ. بـەڵام هەرچـۆنیٚ بـوو جڵـەوی خـۆی گـرت، رقو قـینی خـۆی خـواردەوە. بەرازەوانەکە چاوی بڕیە دوڕچاوانی میلانتیوسو بە دەم جنێو دانەوەو دەستەودوعا رووی کردە ئاسمانو بە دەنگی بەرز کەوتە نزاو پاڕانەوە:
"ئەی پەرییانی ئەم هانەساروفوارەیە! ئەی کیژانی زیوس! ئەی ئەوانەی ئودیسیوس هەمیشە بەرخو بەرخۆلانی بۆ کردوون بە قوربانی، من تکاکاری بەردەرگای ئێوەم، لەبەرتان دەپاڕێمەوە ئەم دوعایەم گیرابکەن، کارێکی وا بکەن ئەو ئاغایەم، بە ڕێنوێنی خواوەندێك بگەڕێتەوە! ئەگەر ئەو بگەڕێتەوە هەنگیٚ ئەی پیاوی گۆساخی خۆسەر، دەبینی چۆن ئەم کەشوفشو لە خۆبایی بوونەت لیٚ دەردێنێتەوە. تا ئەم پەزو ماڵاتە بە دەست شوانانی خوێڕیو نامەردەوە بن، رۆژ بە رۆژ دەپوکێنەوەو لە کەمی دەدەن."
میلانتیوس-ی بزنەوان بەرسڤی دایەوەوگوتی:
"ئەمە چ ناماقوڵییەك بوو! ئەم سەگە بەدنیهادە چ شەکرێکی شکاند؟! نەمرم بەم زووانە لە کەشتییەکی رەشی روختەی باردەکەم، لە ئیتاکای دەبەمە دەریٚو بە پارەیەکی باشی دەفرۆشم. سەبارەت بە تیلیماخۆس، ئومێدەوارم لە مڕۆ زووتر نییە، ئەپولۆی زیوین کەوان، لە ناو کۆشکەکەدا، بەرتیرانی بداوبیکوژێت، یان خوازگارەکان بیکوژن،وەکو چۆن ئودیسیوس ئاوەو ئاوچوو وجارێکی دی بەر بەدواوە ناکاتو هەرگیز ناگەڕێتەوە.

## ئودیسیوس ویومایوس راوێژ دەکەن

دوای ئەو قسەیە ئەوانی بەجێهێشتو رۆیی، ئەوان هێدی هێدی دەهاتن، بەڵام میلانتیوس بە پەلە دەڕۆییو زوو بە زوو گەییشتەوە کۆشکەکەی ئاغای. یەکسەر وەژوورکەوت، چوو لە نێو خوازگارەکاندا، لە بەرانبەر یوروماخۆس کە لەوانی تری خۆشتر دەویست، رۆنیشت. پێشخزمەتان بەشە گۆشتی خۆیان لەبەردەم دانا، ئەوسا گەورە کابانی ماڵ. نانی بۆ هێنا. ئودیسیوسو بەرازەوانەکە کەمێك دوور لە کۆشکەکە راوەستان: گوێیان لە دەنگی مۆسیقاو گیتار بوو ، ئەمە پێشەکیو سەرەتای گۆرانییەك بوو کە فیمیوس بۆ خوازگارەکانی دەگوت. ئودیسیوس دەستی بەرازەوانەکەی گرتوگوتی:
"یومایوس، بێگومان ئەمە کۆشکوسەراکەی ئودیسیوسە، لە نێو سەدان کۆشکو سەرای دیکەدا دەناسرێتەوە. بیناکەی یەجگار مکومو بتەوە! هۆڵوحەوشەو حەسارەکانی دەگەڵ دیوارەکانیدا یەجگار گونجاوەو جوانیەکی تایبەتیان هەیە. دەرگاکانی هێندە بتەون، کەس ناتوانیٚ بە زۆر بیانشکێنیٚ. هەستدەکەم میوانێکی فرە لە ژوورەوە خەریکی بەزموسورو ئاهەنگن. چونکە لەپاڵ

بۆنی گۆشتی برژاودا، دەنگی ساز دێت، کە خواوەندان دایاننناوە هەر دەگەڵ بەزمو سووراندا لێ بدرێت."

هەنگێ ئەی یومایوسی بەرازەوان بەرسڤت دایەوەو گوتت:

"ڕاست دەکەی، چونکە کەسێکی بە دیقەتو وردی بە ئاسانی کۆشکەکەت ناسییەوە. بەڵام با بیر لەوە بکەینەوە کەچی بکەینو یان تۆ لە پێشا بچووە ژوورەوەو تێکەڵ بە خوازگارەکان بەو من لێرە، لە دەرەوە چاوەڕوان دەکەم. یان ئەگەر حەزدەکەی تۆ لێرە ،لە دەرەوە چاوەڕوان بکە،و من لە پێشا وەژووردەکەوم. بەڵام دەبێ پەلە بکەی، خۆت ماتەڵ نەکەی، نەبادا لە دەرەوە بتبینن و لێت بدەنو دەرتبکەن، ئاگات لە خۆ بێ ها! دوایی نەڵێی بۆ پێت نەگوتم؟

ئودیسیوسی ناوداروبەردەبار وەڵامی دایەوەوگوتی:

"خەمت نەبێ، تێدەگەم، بە قسەت دەکەم، خۆیشم بیرم لەمە دەکردەوە. تۆ لە پێشا بڕۆ، من لێرە چاوەڕوان دەکەم. من لەگەڵ جنێوو قسەی ناخۆشو تێهەڵدانا ڕاهاتووم. من چ لە مەیدانی شەڕداو چ لە نێو دەریاو زریانو شەپۆلاندا، ناخۆشی یەجگار زۆرم دیتووەو، لە دژواریو ناخۆشیاندا قاڵ بوومەتەوە، دەی قیروسیا با ئەمەشی بێتە سەر.ئیدی چارەی سکی برسی هەر ئەمەیە، برسیەتی سەرچاوەی ڕەنجو ئازاری تیرەی بەشەرە، هەر لە پێناوی سکی برسیدایە کە پاپۆڕانی جەنگی ڕوختەومکوم بە دەریادا ڕەوانە دەکەن تا مەرگو وێرانی بۆ دژمنان بە دیاری بەرن، هەر برسیەتییە کە خەڵکی بە گژ یەکدیدا دەکات، ودەبێتە مایەی هەڵگیرسانی شەڕ."

## ئودیسیوس وسەگەکەی یەکدی دەناسنەوە

کە ئەو قسانەیان دەکرد، سەگێك کە لەوێ، لە گۆشەیەکدا وەرکەوتبوو، سەری هەڵبڕیو گوێچەکەکانی قوڵاخ کردەوە، ئەو سەگە ئارگۆس بوو، کە ئودیسیوسی بەردەبار بە دەستی خۆی پەروەردەو بە خودانی کردبوو،بەڵام هیچ سوودێکی لێ نەبینی بوو، چونکە بەر لەوەی سەگەکە بە تەواوەتی پێبگات، ئودیسیوس بۆ ئیلیوسی موبارەك ڕۆیی بوو. جاران کە لاوان دەچوون بۆ ڕاوی بزنەکێوی،ومامزو کەروێشکی کێوی دەگەڵ خۆیان دەبرد. بەڵام لەوەتای ئاغاکەی ڕۆیی بوو، بێ خاوەنو بێناز لەسەر ئەو زبڵدانو کۆمەڵە پەینو تەرسو شیاکانەی بەر دەرگاکان وەردەکەوت، تا خوڵامو نۆکەران دەهاتن، پەینەکانیان بۆ کێڵگەو مەزرا زۆرو زەبەندەکان بار دەکرد. بەڵێ سەگەکەی ئودیسیوس، ئارگۆس لەوێدا، لە ناو پەینو شیاکەدا وەرکەوتبوو، و ئەسپێ تێی دابوو. کاتێ کە ئودیسیوسی لە نزیك خۆیەوە بینی، ناسییەوە، هەردوو گوێی خەواندوکلکی بۆ لەقاند. بەڵام هێندە کەسیرەو بێتاقەت بوو، توانای ئەوەی نەبوو لە خاوەنە دلۆڤانو میهرەبانەکەی بێتە پێشەوە. کاتێ ئودیسیوس، سەگەکەی بەو حاڵەوە بینی فرمێسك زاییە چاوانی. بەڵام بەلەز رووی وەرگێڕاو، فرمێسکەکانی سڕیو نەیهێشت یومایوس بیدینێ. بە پەلە لێی پرسی:

"یومایوس، زۆرم پێ سەیرە، سەگێکی وا لەم سەر زبڵدانە بێناز کەوتووە. هەیکەلێکی جوانی هەیە. بەڵام نازانم ئاخۆ ڕاکردنو تاودانەکەشی لە گوێرەی شێوەو هەیکەلەکەیەتی؟ یان سەگێکی

ئاساییە لەو سەگانەی کە لە کۆشك‌وتەلاراندا بەخێو دەکرێن، و گەورە پیاوان هەر بۆ خۆ نواندن رای دەگرن."

ئەی یومایوس، ئەی بەرازەوان هەنگیٚ بەرسڤت دایەوەو گوتت:

"ئەوەی راستی بیٚ ئەم سەگە هی پیاوێکە لە غەریبی دا مردووە. ئەگەر وەکو ئەوسای کە ئودیسیوس بۆ شەڕی تەروادە رۆیی، بمابایەوە، بە چاوی خۆت دەتبینی چەند قۆچاخ‌و خۆشبەزە! سەرت لە تیژڕەوی دەسوڕما. کە بە نێو دەشت‌ومێرگ‌ولێڕەواران دەکەوت، هیچ نێچیرێك نەبوو لە چنگی دەربچێت. تا حەزکەی بە بۆن بوو، بە بۆن شوێن نیچیران دەکەوت! بەلاّم ئێستا وا لێکەوتووەو تین‌و تاوی نەماوە، خاوەنەکەی لە غەریبایەتی دا، دوور لە ولاّتی خۆی مردووە، و قەرەواش‌وکەنیزەکانی خەمساردو بێموبالات کە ترسی ئەویان نەماوە، گوێی نادەنیٚ‌و فەرامۆشیان کردووە. ئیدی خزمەتکاران ئەگەر ئاغایان نەبێت، بە دڵسۆزی کارناکەن. مرۆڤ ئەو رۆژەی کە دەبێت بە کۆیلەوخولاّم، زیوسی دەنگ دلێر، نیوەی پیاوەتی‌و شەهامەتی مرۆڤانی لیٚ دەسەنێتەوە."

### یومایوس خۆی بە نێو ئاپۆڕای خوازگارەکاندا دەکات

یومایوس دوای ئەو قسانە، خۆی بە کۆشکەکەدا کرد، یەکسەر چوو بۆ ئەو هۆڵەی کە خوازگارەکانی لێبوو. تێکەڵ بەوان بوو. بەلاّم ئارگوس، سەگەکەی ئودیسیوس، هەرکە دوای بیست ساڵ، چاوی بە خاوەنەکەی کەوتەوە، تۆپی‌و گیانی لەبەر برا.

تیلیماخۆس کە سەروسیمایەکی خوایی هەبوو، لە پێش هەموو کەسێکدا یومایوسی بینی کە بە هۆڵەکەدا دەهاتە پێشیٚ، یەکسەر سەرێکی بۆ لەقاندوئاماژەی کردیٚ کە بچێتە لای ئەوەوە. یومایوس چاوێکی بە دەوروبەری خۆیدا گێڕا، تەپڵەکێکی لە نزیکی ئەو پێشخزمەتەی کە خواردن‌و گۆشتی برژاوی بەسەر خوازگارەکاندا دابەش دەکرد، دۆزییەوە. ئەو تەپڵەکەی هەڵگرت‌و بردی لە هەنبەر مێزەکەی تیلیماخۆسی داناو لەسەری دانیشت. خولاّمێك پارچەیەك گۆشتی بۆ خستە سەر نان‌ولە بەردەمیا داینا."

### ئودیسیوس لە شێوەی سواڵکەرێکدا خۆی بە کۆشکەکەیدا دەکات

دوای ئەوە بە ماوەیەکی کەم، ئودیسیوس لە شێوەو روخساری دەرۆزەکەرێکی پیرو بێنەوادا خۆی بە کۆشك‌و سەراکەدا کرد. خۆی بەسەر گۆپاڵێکدا دابوو، وجلێکی یەجگار شڕوشەپڕێوی لەبەر بوو. ئەوجا لە ژوورەوە، لەسەر ئەو ئاستانەیەی کە لە دار بناڤ دروستکرا بوو، دانیشت‌و پیشتی دا بە یەکێك لە کۆڵەکەکانی دەرگاکەوە بە شێوەیەکی هونەرمەندانە لە دارسەرووددروست کرا بوو. تیلیماخۆس، بەرازەوانەکەی بانگ کردە لای خۆی، کولێرەیەکی گەورەی لە سەبەتەیەکی جوان دەرهێنا، وپڕ بە هەردوو چنگی گۆشتی خستە سەرو پێیگوت:

"ئەم خواردنە ببەو بیدە بەو سواڵکەرە،وپێی بڵیٚ بە خۆی بەسەر یەکە بە یەکەی خوازگارەکاندا بگەڕیٚ‌و داوای سواڵیان لێبکات. کە ئاتاجی هات شەرم بەتاڵە."

یومایوس خواردنەکەی وەرگرت‌و بۆ ئودیسیوسی برد، پێی گوت:

"غـەریبۆ، تیلیمـاخۆس ئەمـەی بـۆ ناردوویـت، داوات لێـدەکات، بەسـەر یەکـە بـە یەکـەی خوازگارەکاندا بگەڕێی‌وداوای سواڵیان لێبکەی. دەڵێت سواڵ سواڵە، شەرمی ناوێ، کە ئاتاجی هات شەرم بە تاڵە!".

هەنگێ ئودیسیوسی دووربین‌وبەردەبار گوتی:

"زیوسا، ئەی بابە زیوس لە بەرت دەپاڕێمەوە، دەست بە باڵی تیلیماخۆسەوە بگرە. بەختەوەرو سەربەرزی ناو خەڵکی بکە! هیوادارم بە ئاواتی دڵی خۆی بگات!".

بە دەم ئەو قسانەوە، بە هەردوو دەست خواردنەکەی لێوەرگرت، ولە بەردەم خۆیداو لەسەر تورەکە شڕەکەی داینا. بە درێژایی ئەو ماوەیەی کە شایەرەکە لە هۆڵەکەدا گۆرانی دەچڕی. (ئودیسیوس)ش نانەکەی دەخوارد. کە شایەرەکە لێبووەوە، (ئودیسیوس)ش لە نان خواردن بووەوە. ئیدی خوازگارەکان کەوتنە هوراکێشان‌وچەپڵە لێدان بۆ شایەرە موبارەکەکە. هەنگێ ئەتینا خۆی گەیاندە ئودیسیوسی کوڕی لایرتیس، هانی دا کە بەسەر خوازگارەکاندا بگەڕێ‌و سواڵی نانیان لێ بکات. تا لەو ڕێگەیەوە چاك‌وخراپیان لێکدی جیا بکاتەوە.بەڵام وێڕای ئەوەش لەوە ناچوو ئەتینا بیەوێ کەسیان لە مەرگ بخەلەسێنێ.ئەوجا ئودیسیوس لە دەستی ڕاستەوەو بە ڕیز پێیاندا هات، دەگەییە هەر یەکێکیان بە جۆرێ دەستی پان دەکردەوەو دەلالایەوە، لە تۆ وایە لەوەتای هەیە هەر سواڵکەر بووەو بە سواڵکەری سەری لە هێلکە جوقاوە. هەندێ لە خوازگارەکان بەزەییان پێدا هاتەوەو شتێکیان دەدایە. بەڵام هەموو سەرسام‌و حەپەساو لە یەکتریان دەپرسی ئەمە کێیەو لە کوێوە هاتووە.

## خوازگارەکان بێزاری خۆیان لە سواڵکەرەکە دەردەبڕن.

لەم بەینەدا میلانتیوسی بزنەوان هەستاوگوتی:

"ئەی خوازگارانی شابانۆی سەربەرزم، گوێبگرن، با باسی ئەم غەوارەیەتان بۆ بکەم، چونکە من پێشتریش دیوومە. ئەمە یارۆی بەرازەوان دەگەڵ خۆیدا هێناویەتی. بەڵام خۆی ناناسم. نازانم لە چی تیرەو تایفەیەکەو لە کوێندەرەوە هاتووە."

دوای ئەوە ئەنیتینوس کەوتە سەرزەنشت‌وسەرکۆنەی بەرازەوانەکەو گوتی:

"ئەی بەرازەوان، ئەی کۆیلەی بەدناو، بۆچی ئەم پیاوەت بۆ شار هێناوە؟ یانی هەر لەومان کەمە! چما خۆمان سواڵکەرو مێملانمان کەمن کە بەزم‌و ئاهەنگەکانمان لێ بشێوێنن؟ یانی ئەو هەموو خەڵکەت پێ کەمە، ڕژاونەتە ئێرەو بە خوتو خۆڕایی ماڵ‌و دارایی ئاغات دەخۆن‌و بە فیڕۆ دەدەن! تا بچیت ئەم میوانی ناوەختەش بێنی؟

تۆش یومایوس، ئەی بەرازەوان بەرسڤت دایەوەوگوتت: "ئەی ئەنتینیوس! ئەو قسانە لە کەسێکی خانەدان‌و ڕەسەن نەژادی وەکو تۆ ناوەشێتەوە. ئاخر کێ دەچێت بە دوای بابایەکی بێگانەدا دەگەڕێ تا دەعوەتی بکات‌و میوانداری بکات. ئەگەر ئەو بێگانەیە لەو خەڵکانە نەبێت کە دەتوانن خزمەتێك پێشکەش بکەن‌و سوودێك بە خەڵکی بگەیەنن. خەڵکانێکی میناکی نجومگەران، فاڵبینان، پێشگۆیان، پزیشکان، بەناو دارتاشان، یان شاعیرو شایەرانی موبارەکی بەهرەمەند کە بەدەنگ‌وئاوازی خوداداییان دڵی خەڵکی خۆش‌و شاد بکەن‌و ڕوحیان ئەفسون

بکەن؟ جا ئەم جۆرە خەڵکانە لە سەرانسەری دنیادا بە گەرمی پێشوازی دەکرێن‌و کەس لاری لێیان نییە. کەس ناچێت گەدایەك دەعوەت بکات‌و بە خوتو خۆڕایی ماڵی خۆی دەرخوارد بدات‌و بیکات بە بار بەسەر خۆیەوە! بەڵام تۆ زیاتر لە هەموو خوازگارەکانی دی دژایەتی خولام‌و خزمەتکارەکانی ئودیسیوس، بە تایبەتی من، دەکەیت. بەڵام من خانمی گەورەم خۆشبێ، تا ئەوو تیلیماخۆسی خواروخسار لەم کۆشك‌وسەرایەدا بن، باکم بە هیچ نیە!".

هەنگێ تیلیماخۆسی زرینگ وەڵامی دایەوەوگوتی:

"بێدەنگ! وەڵامی ئەم پیاوە مەدەوە، لەوەی پتر بە تانی قسان دا مەچۆ! چونکە ئەنتینوس، بە تەبیعەت حەزی لەوەیە بە قسەی ساردو رەق دڵی خەڵکی برەنجێنێ، وتوڕەیان بکات. خەڵکی دیکەش هاندەدات چاو لەو بکەن‌و هەمان رەفتاری ئەو بکەن."

هەنگێ تیلیماخۆس رووی کردە ئەنتینوس‌و بە توندی گوتی:

"ئەنتینوس، کاتێ کە هانم دەدەیت ئەم داماوە غەریبە لە هۆڵ‌و سەراکەم وەدەربنەم، بەڕاستی باوکانە خەمی من دەخۆیت! وەکو چۆن باوکێك لە خەمی کوڕی خۆیدایە، بەو ئاوایە خەمی من دەخۆیت! ئومێدەوارم خواوەندان تووشی کاری وامان نەکەن! ئاخر میوان‌وغەوارە دەرکراوە؟! نا، شتێك هەڵگرەو بیدەرێ، من لەسەر ئەمە گلەییت لێناکەم، سەرزەنشتت ناکەم، بەڵکو داوات لێدەکەم شتێکی بدەیتێ. جا لەمبارەیەوە نەترست لە دایکم هەبێ‌و نە لە هیچ یەکێك لەو خزمەتگوزارو پێشخزمەتانەی کە لە ماڵی ئودیسیوسی موبارەکدان. خەمت نەبێ، کەسیان پێیان ناخۆش نییە.بەڵام تۆ ئەم داکۆکیەت لەبەر خاتری ئێمە نیە، لەبەر خاتری خۆتە، گەرەکتە بە خۆت لەسەر خوان‌و نانی ئاواوئاوەدان دانیشیت، بخۆیت‌و بخۆیتەوەو بەشی هیچ کەسێکی دی نەدەیت."

ئەنتینوس بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"ئەی تیلیماخۆسی قسە زل، ئەی گۆساخی خۆسەر ئەوە چ دەڵێی؟ ئەگەر هەر خوازگارێك بە ئەندازەی منی پێدابا، هێندەی دەست دەکەوت کە تا سێ دانە مانگی دی روو نەکاتەوە ئەم ماڵە."

## ئودیسیوس دەست لە ئەنتینوس پان دەکاتەوە

ئەو قسەیەی کرد، ودەستی برد، لە ژێر مێزەکەیەوە، ئەو تەپڵەکەی دەرهێنا، کە لە کاتی نان خواردنا لاقی لەسەر دادەنا.. ئەوانی دی هەر یەکەو شتێکیان بە کابرای گەدا داو تورەکەکەیان بۆ پڕکرد لە نان‌وگۆشت. ئودیسیوس، لەو کاتەدا کە دەیویست بۆ شوێنەکەی خۆی، بۆ بەر دەرگاکە بگەڕێتەوەو ئەوەی پێیان دابوو بیخوات. لە ئاستی ئەنتینوس دا وەستاوگوتی:

"برادەر! تۆش شتێکم بدەیە، هەڵبەتە تۆ لەوانی دی کەمتر نیت، هەژارترینیان نیت، بەڵکو بە پێچەوانەوە لە هەموویان دەوڵەمەندتر، خانەدانتر دیاری، سەروسیمات لە سەردارو پاشا دەچێت. بۆیە هەقە تۆش وەکو ئەوانی دی نەك هەر نانێکم بدەیتێ، بەڵکو زیاتریشم بدەیتێ. هەنگێ منیش لە سەرانسەری دنیادا ستایشت دەکەم‌و باسی بەخشندەییت دەکەم. چونکە منیش رۆژێ لە رۆژان ماڵێکی شاهانەم هەبوو، دەوڵەمەندو دەستڕۆ بووم، و هەر لێقەوماو، و

دەرۆزەکەریك، بە هەر ناوومەبەستو نیازێك روویان کردبا ماڵەکەم، بێ بەشم نەدەکردنو شتێکم دەدانێ. راستت دەوێ هێندەم خولامو خزمەتکارو کۆیلە هەبوو، لە ژمارە نەدەهاتن. موڵكو ماڵی دنیا هەر باسی مەکە، ئەوەندەم هەبوو، هیچ دەوڵەمەندێکی گەورەو بەختەوەرو بەنێوبانگ بە بای قولانمدا نەدەگەیی. بەڵام زیوسی کوڕی کرونوس هەر هەمووی لێ سەندمەوە، وکەوتمە سەر ساجی عەلی. دیارە زیوس وای پێ باش بووە. هەر ئەوە بوو واداری کردم دەگەڵ رێگرانی دەیارییدا بەرەو ئیجیپتوس (میسر) بڕۆم، تا لە سەفەرێکی دوورو درێژدا نابووت ببمو بکەومە سەر ساجی عەلی. ئەوە بوو کەشتییەکانم، لە روباری ئیجیپتوسدا ڕاگرت. وئەوسا هاوڕێ دڵسۆزو ئەمەکدارەکانم راسپاردن کە ئاگایان لە کەشتییەکان بێو بە هیچ لایەکدا نەڕۆن. هەروەها دیدەوانانم راسپارد بچنە سەر بەرزاییەکانو چاودێری هەموو شوێنەکان بکەن. بەڵام هاوڕێکانم بە گوێیان نەکردم، ودوای هەواو هەوەسو ئارەزووی شێتانەی خۆیان کەوتن. یەکسەر دەستیان بە تالانکردنی کێڵگەو مەزرا جوانەکانی خەڵکی میسر کرد، ژنانو منداڵانیان رفاندن، پیاوانیان کوشتن، ئیدی دەنگوباسی ئەو ئاشوبوتالانو بڕۆیە زوو بەزوو گەییە ناو شار. خەڵکی شار کە بانگەوازی شەڕیان بیست، لەگەڵ گەردی بەیانی دا خڕ بوونەوە، ودەشتو دەر بە جارێ پڕبوو لە جەنگاوەری پیادە،و ئەسپوگالیسکەو شیرو نێزەی برونزی درەخشان. زیوسی چەخماخەوان، ترسێکی وەهای خستە دڵودەروونی هاوڕێکانی منەوە، کەس زاتی نەدەکرد، رووبەڕووی دژمن بوەستێ. هەرچوار دەورمان گیرابوو. ئەوسا دژمن بە نێزەوە تێمان کەوتنو ژمارەیەکی فرەیان لێکوشتین. ئەوانی تریان بەدیلی بردین، تا بیانکەن بە سوخرەکێشی خۆیانو بێگاریان پێبکەن. سەبارەت بە من، لەو کاتەدا تووشی بابایەکی بێگانە بوون کە بۆ قوبرس دەڕۆیی، دامیان بەو کابرایە کە لەگەڵ خۆیم بەرێ. نێوی دمیتور، کوڕی ئیاسوس، پاشای بە زەبرو زەنگی قوبرس بوو. لەوێندەرەوە، دوای دەردو مەینەتیەکی زۆر، بۆ ئێرە هاتووم."

ئەنتینوس، بەتوندی وەڵامی دایەوە:

"چ ئەهریمەنێك ئەم غەزەبەی بۆ ئێرە ناردووە، تا بەزمو سوورەکەمان لێ بشێوێنێ؟ ئەی گەدای گۆساخو بێ چاوو روو، بڕۆ ئەو ناوەڕاستە بوەستە، لە مێزەکەی من دوور بکەوەوە، دەنا میسرو قوبرسێکی زۆر خراپترت پێ نیشاندەدەم.. بڕۆ، بڕۆ بەسەر مێزەکانی ترا بگەڕێ، ئەوانە شتی زۆرت دەدەنێ، لە کیسەی خۆیان دەرناچێت، پیاوەتی بە ئاوی حەمامەوە دەکەن، بۆ نە ، هەموو شتێکیان بە زیادەوە لەبەر دەستدایە."

هەنگێ ئودیسیوسی دوورئەندێش وچارەسان، پاشەو پاش کشایەوەو گوتی:

"سەیرە! چەند بەسەروسیماو رواڵەت جوانی، ئەوەندە بە دڵ ناشیرینو رژدوچروکی! باوەڕ ناکەم دڵت بێت لە ماڵی خۆت بە ئەندازەی تۆسقاڵێك نمەك، بە هیچ فەقیرێك بدەیت. تۆ کە ئێستا لەسەر خوانی خەڵکی دانیشتوویتو ئەم هەموو نیعمەتە زۆرەت لەبەر دەستدایە، دڵت نایەت نانێك بدەیتە من، جا وەرە ماڵی خۆت بوایە!"

هەرکە ئەو قسەیەی کرد، ئەنتینوس لە دڵی خۆیدا زۆر تورە بوو. بڕۆی ویك هێنایەوەو مۆرەیەکی لێکرد، ئەوسا بە توندی گوتی:

"بێگومان، بە وشکی لەم هۆڵە وەدەرناکەوی، دەبێ باجی ئەم جنێوانەت بدەی."

بەدەم ئەو قسانەوە تەپڵەکەکەی ژێر لاقی خۆی هەڵگرتو خێواندییە ئودیسیوسو، لە پشتەوە رێك بەر شانی راستی کەوت. ئودیسیوس وەکو تاوێرێکی بتەو، بێ جوڵە لە جێی خۆی چەقی. جەزرەبەکەی ئەنتینوس، تاقە هەنگاوێکیش نەیجوڵاند، سەرێکی تۆڵە ئامێزوی لەقاندو بەرەو دەرگاکە گەڕایەوە. لەوێندەر دانیشتو تورەکەکەی، کە تەواو پڕ بوو بوو، لە عاردی دانا، ورووی لە خوازگارەکان گوتی:

"ئەی خوازگارانی شابانۆی بەناوبانگ، گوێبگرن با قسەی دڵی خۆمتان پێبڵێم. پیاو وەختێ کە لە پێناوی موڵكومالّ، سەروەتوسامان، ولّسات یان پەزو مەڕی خۆیدا بجەنگێو لێیبدەن، زۆری لەبەر گران نابێتو ئێشی نایەت. بەڵام ئەنتینوس بۆیە لێی دام چونکە برسیمە، داوای شتێکم کرد کە سکی خۆمی پێ تێر بکەم. ئاخر سکی برسی لە خواش ناترسی، ئەم سکە نەفرەتیە سەرچاوەی هەموو بەڵایەکە کە بەسەر مرۆڤدا دێت. جا ئەگەر هەژاران خواوەندانو خوابانۆیانی تۆڵەیان هەیە، من تکایان لێدەکەم، لێیان دەپاڕێمەوە، کە ئەم ناهەقییە قەبولّ نەکەنو ئەنتینوس بکوژن ئەم شاییەی لێبکەن بە شین".

ئەنتینوس، کوڕی یوپیتیس، بەرسڤی دایەوەوگوتی:

"ئەی غەوارە، دەمت لێك بنەو دانیشەو بەبێ دەنگ نانەکەت بخۆ، یان بڕۆ بۆ شوێنێکی دیکە. ئەگینا نۆکەرو خولامان بۆت هەڵدەستنو لەلاقت دەنەونو گێرەی ئەم ناو ماڵەت پێدەکەنو لەسەر ئەو قسە جوانانەت! هەر بە زندوویەتی کەوڵت دەکەن."

## یەکێك لە خوازگارەکان لۆمەی ئەنتینوس دەکات

دوای ئەو قسانە هەموو خوازگارەکان تورە بوون. یەکێکی گەنجی گۆساخیان هەڵیدایەو گوتی:

"ئەنتینوس تۆ کارێکی باشت نەکرد، تۆ دەستت لە پیاوێکی سەرگەردانی هەژاری بێ دەرەتان کردەوە. باشە ئەگەر ئەمە خواوەندێك بێ، وخۆی بەو شێوەیە گۆڕی بێ، هەنگێ چ دەکەی!. ئێمە هەموو دەزانین خواوەندان بە شێوەی جۆراو جۆر خۆیان دەگۆڕن، لە شێوەی غەوارەو هەژارانێك کە لە شوێنانی دوورەوە هاتبن، ئەم شارو ئەو شار دەکەنو بە نێو خەڵکی دا دەگەڕێن تا ستەمکارانو دادپەروەران بناسن."

خوازگارەکان. بەو شێوەیە دەدوان. بەڵام ئەنتینوس گوێی بە قسەکانیان نەدا. تیلیماخۆس کە بینی لە باوکیان دا، زۆری لە دڵ گران بوو. هەرچەندە جڵەوی خۆی گرتو نەیهێشت رونداك لە چاوانی بێت، بە بێدەنگی سەرێکی لەقاند،ولە کانگای دڵەوە خۆی بۆ تۆڵە ئامادە دەکرد.

## پنلوپی هاودەمەکانی دەدوێنێ

کاتێ پنلوپی زانی لە کۆشکە گەورەدا، لە دەرۆزەکەرێکیان داوە، رووی کردە کارەکەرو قەرەواشەکانی وگوتی:

"دەك بەر قارو غەزەبی ئەپولۆ بکەوی ئەنتینوس. خۆزگە ئەپولۆی کەمانکێش، لێی دەدایت، و هەقی ئەو داماوەی لێدەکردیتەوە!".

یورینومی، کابانوگەورەی کارەکەرەکان گوتی:

"خۆزگە تووكو نەفرینەکانمان گیرادەبوو. ودوای ئەم پیاوانە دەبڕایەوەو شتاقیان جارێکی دی رۆژی روناکیان نەدەبینی."

پنلوپی ئاقڵو ئاغر وەڵامی دایەوە:

"ئەی دایەن، ئەمانە هەر هەموویان دژمنی منن، جگە لە بەدخوایی هیچی تریان لە بیروخەیاڵدا نیە. بەڵام ئەنتینوس لە هەر هەموویان خراپترە، دەڵێی غەزەبی رەشە. ئەم کابرا غەریبە هاتووەتە ئەم ماڵە، دەرۆزە دەکات. هەژاریو نەبوونی ئەمەی پێکردووە. ئەوانی دی هەرکەسەو شتێکی داوەتیو تورکەکەیان بۆ پڕکردووە. بەڵام ئەنتینوس، نەك هیچی نەداوەتێ، بەڵکو تەپڵەکەکەی ژێر پێی تێسرەواندووەو کێشاویەتی بە شانی راستی ئەم بەلەنگازەدا."

## پنلوپی داوا دەکات کابرای غەریب بدینێ

بەو جۆرە، لە باڵەخانەکەی خۆیدا، دەگەڵ هاودەمو قەرەواشەکانی دا قسەی دەکرد. ئودیسیوسی ناوداریش لەو ماوەیەدا نانەکەی دەخوارد. ئەوسا پنلوپ ناردی بە شوێن بەرازەوانەکەداو پێی گوت:

"یومایوسی دلێر، هەرە بەو غەریبە بێژە بێتە ئێرە. دەمەوێ بیدینمو چەند پرسیارێکی لێبکەم. پێدەچێت زۆر گەڕابێو شوێنانی زۆری دیتبێ. بەڵکو شتێکی دەربارەی ئودیسیوسی بەردەبارو بە سەبر بیستبێ یان بە چاوی خۆی ئەوی دیتبێ."

ئەی یومایوس، ئەی بەرازەوان، هەنگێ بەرسڤت دایەوەوگوتت:

"ئاها! ئەی شابانۆ، خۆزگە ئەم ئاخاییانە بێدەنگ دەبوون! دڵنیام بە قسەکانی دڵخۆش دەبیت. من سێ دانە شەو لەگەڵیا بووم، سێ دانە رۆژ لە کەوێڵەکەی خۆمدا گلم دایەوە. کە لە کەشتی هەڵاتبوو، یەکسەر رووی کردبووە لای من، بە درێژایی ئەو سێ شەوورۆژە لە یەکبینە سەربوری ریسك ئامێزو کارەساتباری خۆی بۆ گێڕاومەتەوەو هێشتا هەر تەواو نەبووە. جا وەکو چۆن هۆنەروگۆرانی بێژێکی خۆوێژی نەخوێنەوار، بە ئیلهامێکی خوایی هەڵدەکاتە گۆرانی، و گوێدێران مەستوئەفسوون دەکات، وهەموو متەق لە خۆ دەبڕنو تا دوا بەند بە تاسەوە گوێی لێدەگرن، ئەم پیاوەش بەو ئاوایە، لە ماڵەکەی خۆمدا، بە گێڕانەوەی سەربورو بەسەرهاتەکانی مەستو ئەفسوونی دەکردم. دەڵێت ئاشنایەتی کۆن لە نێوان ماڵباتی ئەووماڵباتی ئودیسیوسدا هەیە. خەڵکی کریتە، لە تیرەی مینوسە. ئیدی وەختێ گلۆڵەی کەوتووەتە لێژی، بەدەم دەربەدەریو ئاوارەییەوە، شوێناوشوێنی کردووەو رێی کەوتووەتە ئێرە. بە دڵنیاییەوە دەڵێت کە لە نزیکی ئێرەدا، لە سەر زەمینی بە پیتوبەرەکەت، ئاواو ئاوەدانی تسپروتانەکاندا بیستوویەتی کە ئودیسیوس هێشتا لە ژیاندایەو، بەو زووانە بە دیاریو دەسکەوتانی فرەوە بۆ وڵاتی خۆی دەگەڕێتەوە."

پنلوپ، ژنی هەرە ئاقڵو ئاغر، لە وەڵاما گوتی:

"بڕۆ، بۆ ئێرەی بێنە، دەخوازم، بە خۆی رووبەڕوو، قسەم بۆ بکات. ئەو خەڵکەش با لە حەوشتەو بەردەرگا، یان لە هۆڵەکەدا، بۆ خۆ خەریکی بەزموسووری خۆبن، دڵیان خۆشە. سەروەتو سامانیان، ماڵودارایییان، لە کۆشكو ماڵەکانیاندا بە دەقی خۆیەوە دەمێنێتەوە، نانیان، بادەو شەرابیان، مەگەر تەنیا خوڵامو نۆکەرەکانیان لێی بخۆنو بخۆنەوە. بە خۆیان هەموو رۆژێ دێن بۆ ماڵی ئێمە، گاوگۆتاڵمان، مەڕو پەزمان، بزنانی قەڵەومان دەکوژنەوەو بەزمو سووری خۆیانی پێخۆش دەکەن، وبادەی سوورو ئاڵ هەڵدەدەن، بێئەوەی بیرێك لەوە بکەنەوە کە بەشێکی زۆری دارایی ئێمە لە نێو چووە... چونکە پیاوێکی وەکو ئودیسیوس لێرە نیە کە ماڵەکە لە وێرانی بپارێزێ. ئەگەر ئودیسیوس دەهاتەوە، دەگەییەوە زێدی خۆی، بزانە چۆن دەگەڵ کوڕەکەیدا، ئەم پیاوانەی بەسزای بەدرەفتاریو بێ پەروایییان دەگەیاند."

لەو قسانەدا بوو کە تیلیماخۆس پژمەیەکی گەورەی کردو لە سەرانسەری ماڵەکەدا دەنگی دایەوە. پنلوپی پێکەنی، یەکسەر بە یومایوسی گوت:

"بڕۆ، کابرای غەوارە دەگەڵ خۆدا بۆ ئێرە بێنە. ئایا گوێت لێ نەبوو کە کوڕەکەم دەگەڵ کۆتایی قسەکانمدا پژمی؟ ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە خوازگارەکان شتاقیان لە مەرگومردن ناخەلەسن. جا با شتێکی دیکەشت پێبڵێم، تۆ بە شایەد بە، ئەگەر بزانم کابرا راستگۆیەو راستییەکان دەڵێت، باشترین دەسە جلکی دەدەمێ."

## ئودیسیوس بە پارێزەوە داواکەی پنلوپی قەبوڵ دەکات

بەرازەوانەکە، هەرکە گوێی لە قسەکەی خانم بوو، یەکسەر رۆیی، خۆی گەیاندە جەم ئودیسیوسو پێی گوت:

"کاکی غەریب، بەڕێز، پنلوپی ئاقڵوئاغر، دایکی تیلیماخۆس، گازت دەکات. حەزدەکات پرسیاری مێردەکەی بکات. ئەم ژنە یەجگار پەرۆشی مێردەکەیەتی! ئەگەر بزانێ تۆ راستی پێ دەڵێیت، دەستێ جلکی زۆر نایابت دەداتێ، کە حاڵی حازر تۆ زۆرت پێویست بە جلکانە. سەبارەت بە نان، چەندت گەرەکە دەتوانی لە خەڵکی سواڵ بکەی، خێرەومەندانێ هەن شتێکت بدەنێ."

هەنگێ ئودیسیوسی دووربینوبەردەبار بەرسڤی دایەوەوگوتی:

"ئەی یومایوس، من دەتوانم هەموو راستیەك بە کیژی ئیکاروس، بە پنلوپی ئاقڵو ئاغر، بڵێم. زۆر شت دەربارەی ئودیسیوس دەزانم. چونکە ئێمە هەمان نەگبەتیومەینەتی رۆژگارمان دیتووەو جەڕباندووە. بەڵام من دەترسم بە نێو ئاپۆڕای ئەم خوازگارە بێ شەرمانەدا تێپەڕم، کە گۆساخی و بێ پەروایییان گەییوەتە ئاسمانی ئاسن ئاسا. چونکە ئەو پیاوە، کاتێ کە بە نێو کۆشكو تەلارەکەدا رێم دەکرد، بێ ئەوەی خراپەیەکم بۆ هیچ کەسێك بووبێ، بە ناهەق لێیدام. نە تیلیماخۆس لەسەرم هاتە جوابو نە کەسی دیکە. بۆیە بە پنلوپ بڵێ، با تا رۆژئاوا دەبێ، چاوەڕوانم بکات. هەنگێ لە پاڵ ئاگردانێك دا دام بنێت، چونکە بەخۆت دەزانی جلەکانم زۆر شڕۆڵەو تەنكوتیواڵنو، یەکەم کەس رووم لە تۆ نا کە یارمەتیم بدەیت. جا با هەنگێ پرسیاری گەڕانەوەی مێردەکەیم لێبکات.".

یومایوسی بەرازەوان، دوای ئەو قسانەی ئودیسیوس، بە تەنیا گەڕایەوە. کە گەییە بەر دەرگاو وەژوورکەوت، پنلوپی گوتی:

"ها، یومایوس بۆچی نەتهێنا؟! ئەم گەدایە بە تەمای چیە؟ ئایا لەوە دەترسێت یەکێك بەد رەفتاری دەگەڵ بکات؟ یان شەرم دەکات بێتە ژوورەوە؟ یان لە خۆی ناگریٚ بێتە ژوورەوە؟ گەداو شەرمیان گوتووە!".

هەنگیٚ ئەی یومایوس، ئەی بەرازەوان بەرسڤت دایەوەوگوتت:

"نا هەقی نییە. قسەکەی ماقولە. هەرکەسێکی دیکەش لە جیاتی ئەو بوایە، هەر وای بیر دەکردەوە. دەیەویٚ لە شەڕو ئاسیوی ئەم پیاوە گۆساخ و بیٚ پەروایانە، کە خۆیان لە هەموو کەس بە گەورەترو زیاتر دەزانن، بە دوور بێت. بەوپەڕی نەزاکەتەوە داوا لە تۆ دەکات، تا خۆر ئاوا دەبێت چاوەڕوانی بکەی. بۆ تۆش ئەی شابانۆی هێژا واچاکترە، هەر خۆت، بە تەنیا گوتوبێژی دەگەڵ بکەی. قسەی دەگەڵ بکەیت وگوێی لێبگریت."

هەگیٚ پنلوپی ئاقڵ وئاغر وەڵامی دایەوە:

"ئەم غەوارەیە لە ئاقڵ دەچێت، حیساب بۆ هەموو شتێك دەکات، با قسەکەی ئەو بیٚ. پێشنیازەکەی بەجێیە. چونکە کەس نیە لە دنیادا، هێندەی ئەم پیاوانەی لێرە دایانکوتاوە، ملهوڕو ستەمکارو بەدنمەك وبەدنیهادو بەدخوا بیٚ."

## یومایوس دەڕوات، خوازگارەکان دەکەونە بەزم ورەقسین

دوای ئەو قسانەی پنلوپ، یومایوسی مەردورەند، دوای ئەوەی هەموو شتێکی بە خانمی گەورە گوت، بۆ نێو ئاپۆڕای خوازگارەکان گەڕایەوە. چووە لای تیلیماخۆسەوە، بۆ ئەوەی کەس گوێی لە قسەکانی نەبێت، دەمی لە پەنا گوێی ناوگوتی:

"ئەزبەنی، من دەڕۆمەوە بۆ لای بەرازەکان، و پارێزگاری ئەو سەروەت و سامان و موڵك وماڵەی ئەوێندەر دەکەم کە سەرچاوەی بژێوی تۆش ومنیشە. ئیدی بۆ خۆت لە نزیکەوە چاودێری کاروبارەکانی ئێرە بکە. بەڵام ئاگات لە خۆ بیٚ، دەستێکت لیٚ نەوەشێنن، گەلێك لە خەڵکی ئاخایی لێت بە داخن و بە ئۆینن. ئومێدەوارم زیوس قڕیان تێبخات و قەزای ئێمە لەوان بخات!".

تیلیماخۆسی زرینگ بەرسڤی دایەوەوگوتی:

"گویٚ مەدەیە، ئەوەی ئاسمان قەڵەمی لیٚ نەدابیٚ، نابێت! بڕۆ نانەکەت بخۆو بڕۆ. درەنگە هاکا شەو داهات. بڕۆ بەڵکو سارەزی دێیتەوەو چەند سەرێك قوربانی باش لەگەڵ خۆتا دێنی. خەمی هیچی ترت نەبیٚ، هەموو شتێکی ئێرە بە خواوەندان ومن بسپێرە."

دوای ئەو قسانەی تیلیماخۆس، کابرای بەرازەوان دووبارە لەسەر کورسیە بریقەدارو خاوێنەکەی خۆی دانیشتەوە. پاش ئەوەی تێرو پڕی خواردو خواردەوە، لە هۆڵەکەو پاشان لە کۆشکەکە وەدەرکەوت و ملی ڕێگەی بەرەو لای بەرازەکانی گرتەبەر. ئیدی شەو داهات وخوازگارەکان هەموو کەوتنە ئاهەنگ گێڕان وگۆرانی و هەڵبەڕکیٚ.

***

پەراوێز:

*- مینوس: پاشای کریتو کوڕی زیوسو یوروپ بوو. دوای ئەوەی هەردوو براکەی خۆی: رادامانتوسو سارپیدونی شار بەدەرکرد، بوو بە پاشای بێ هەڤڕکی کریت. ئەمە خۆی بە پاشایەکی دادپەروەر دەزانی. لە پوسیدون پاڕایەوە کە گایەکی بۆ بنێرێ تا بیکات بە قوربانی. خواوەندی ناڤبری دوعاکەی گیراکرد، بەڵام گایەکە کە لە دەریاوە دەرهاتبوو یەکجار جوان بوو، مینوس تەماح دەیگرێودەیگۆڕێ بەگایەکی ترو گایەکەی پوسیدون، خواوەندی دەریا بۆ خۆی هەڵدەگرێت، ئیدی خواوەند بەوە تۆڵەی لێ ئەستاندەوە کە کردیە کارێك پاسیفای ژنی مینوس بکەوێتە داوی عەشقی گایەکەوە.

*- ئیاسوس: کوڕی زیوسو ئیلیکترایە. دیمتیر حەزی لێکردو بلوتوسی لێی بوو، و زیوس بە چەخماخەیەك کوشتی.

*- تیوکلومینوس:نجومگەرو فاڵبینێکی سەردەمی هومەری بوو، کوڕی نجومگەر بولوفایدیس، لە بنەماڵەی میلامپوس بوو. ناچار بوو لە ماڵی خۆی، لە ئەرگوس هەڵێت، چونکە هاوولاتییەکی کوشت. کە رۆیی بۆ پیلوس تووشی تیلیماخۆس بوو کە سۆراخی بابی، ئودیسیوسی دەکرد. داوای لە تیلیماخۆس کرد پەنای بداتو بیپارێزێت. تیلیماخۆس دەگەڵ خۆیدا بۆ ئیتاکای برد. لەوێندەر تیوکلومینوس فاڵی بۆ پنلوپی گرتەوەو دڵنیای کرد کە ئودیسیوس لە وڵاتی خۆیدایە. جارێکی دیکەش پێشبینی چارەنووسی شوومی خوازگارەکانی پنلوپی کرد. بەڵام باوەڕیان پێنەکرد وگاڵتەیان بە پێشبینییەکانی دەهات.

*- فیلومیلایدیس:پاشای لیسپوس بوو. رێبوارانی ناچاردەکرد، دەگەڵی بەشەڕبێن. ئەنجام بە دەستی ئودیسیوس کوژرا.

## سروودی هەژدەیەم

### کورتەی سروودەکە:

لەو کاتەدا کە ئودیسیوس دەست لە خوازگارەکان پان دەکاتەوە، گەدایەکی دی بە نێوی ئیروس دێتە ژووریٚو دەیەویٚ ئودیسیوس لە کۆشکەکە وەدەربنیٚ. خوازگارەکان هەر بۆ سەرگەرمی خۆیان، زیاتریان لێکدی تیژدەکەن. ئیدی دەکەونە شەڕەمستانو ئیروس لێدانێکی باش دەخوات. ئودیسیوس لە لاقێکی دەنەویٚو رایدەکێشێتە دەرێی دەرگاکە. پێشبینی ئەوە بۆ یەکێك لە خوازگارەکان بە نێوی ئامفینوموس دەکات کە ئودیسیوس لە ئایندەیەکی نزیکدا دەگەڕێتەوەو هەقی بەرودوا لە خوازگارەکان دەکاتەوە. بەڵام ئامفینوموس پێشبینییەکە بە هەند وەرناگریٚ.

پنلوپ دێت بۆ هۆڵە گەورەکە. تیلیماخۆسی کوڕی رادەسپێرێت کە ئاگای لە میوانە بەدبەختەکەی بێتو رێزی بگرێت. پنلوپ ئامادەیی خۆی رادەگەیەنیٚ کە شوو بە یەکێکیان بکات. ئیدی خوازگارەکان لە خۆشیاندا دیاریو پێشکەشی فرەی دەدەنیٚ. خوازگارەکان دەکەونە گەمەو شاییو هەڵپەڕکیٚ، "میلانتو"ی کارەکەر، بەد رەفتاری دەگەڵ ئودیسیوس دا دەکاتو ئازاری دەدات، و یوروماخۆس، بە دەم بادە دابەشکردنەوە بەسەر میوانەکاندا، تەپڵەکێك دەسرەوێنێتە ئودیسیوس، بەڵام تەپڵەکەکە سەر دەکاتو بەری ناکەوێت. پاش ئەوەی تیلیماخۆسو ئامفینوموس ناو بژیان دەکەنو بە قسەی خۆش ساردیان دەکەنەوە، ئیدی هەموو بڵاوی لێدەکەن.

***

### دەمە قاڵی نێوان ئودیسیوسو ئەرنایوسی گەدا

ئێستاش گەدایەکی زۆر ناسراو وەژوورکەوت. ئەمە لە دەرگای هەموو ماڵێکی ئیتاکای دەداو سواڵی لێدەکردن. کابرایەکی یەجگار زۆر خۆر بوو، لە خواردنو خواردنەوە تێر نەدەبوو، هیچ تواناو غیرەتێکی نەبوو. زلحۆرتێکی ناقۆڵای بیٚ هونەر بوو. ناوی ئەرنایوس بوو، کە لە دایك بوو بوو، دایکی بەرێزی ئەو ناوەی لێنا بوو. بەڵام هەموو لاوانی دەڤەرەکە پێیان دەگوت ئیروس، چونکە هەر پەیامێکیان پیٚ راسپاردایە، دەی گەیاند. ئەم گەدایە خۆی وەژوورا کرد، دەیویست ئودیسیوس لە ماڵەکەی خۆی وەدەربنیٚ، بۆیە بەمجۆرە کەوتە سووکایەتیوگاڵتە پێکردنی:

"پیرەمێرد لاکەوە، ئەو بەر دەرگایە بەرە بدە تا لاقم نەگرتوویتو تورِم نەداویتە دەریٚ. ئەدی نابینی هەموو چاوم لێدادەگرن بە زۆر وەدەرت نێم؟ بەڵام من پێم شەرمە ئەو کارە بکەم. دەی خێراکە، ئەو داڵانە بەردە تا کار نەگەییوەتە شەڕە مستو تێهەڵدان."

ئودیسیوسی دووربین تورە بوو، برۆکانی وێکهێنانەوەو گوتی:

"تۆ کابرایەکی سەیری! من هیچ خراپەو ئاسیوێکم، نە بە زمان، نە بە کردەوە بۆ تۆ نەبووەو نابێت. من بابایەکی بە غیلو بەرچاوتەنگ نیم. هەر شتێکیشت بدەنیٚ، چەند زۆرو بەنرخیش بیٚ بەغیلیت پێنابەم. ئەم داڵانەش گەورەیە، جێی هەردووکمانی تیا دەبێتەوە. پێویست ناکات

حەسوودی بە خەڵکی دیکە بەریت. پێموایە تۆش کابرایەکی گەدای گەڕۆڵی وەکو منی. خواوەندان رزق‌و رۆزی هەرکەسێك دیاری دەکەن. باسی شەڕە دەستانیش مەکە، با تورە نەبم، هەرچەندە پیرم، بەڵام دەمو کەپوت پڕ لە خوێن دەکەم. هەنگێ بۆ خۆم لە سبەیەوە دەحەسێمەوە، چونکە تۆ جارێکی دی نایەیتەوە بە ماڵی ئودیسیوسی کوڕی لایرتیس دا."

ئیروسی گەدا زۆر تورە بوو،گوتی:

"ئیرۆس نەگبەتیت بێ! خوا ئەو خوایەیە ئەم سك لەوەڕێنە لە برسا مردووە، کەوتووەتە لاف‌و گەزاف‌و هەڕەشە لە من دەکات! تۆ تەمەشا، لە پیرەژنی ناو موبەقان دەچێت. تۆزێ حورمەتی خۆت بگرە دەنا کە کێشام بە دەم‌و فلْقتا، هەر سی‌ودوو دانەکەت دەخەمە خوارەوە، وەکو شفرەو کەڵبەی مالۆسێك کێڵگەو مەزرایانی وێران کردبێت. دەی ئەگەر پیاوی هەستە، با ئەمانەش بمان بینن. ئاخر چۆن دەرەقەتی هەڤرکێکی لەخۆت گەنجتر دێی؟."

## خوازگارەکان دێنە تەماشای شەڕی جووتە گەدا

بەو جۆرە، جووتە گەدا، لەبەردەم دەرگا بەرزەکاندا، زۆر بە توندی کەوتنە هەڵشاخان بە یەکتردا. کاتێ ئەنتینوسی بەهێزو توانا ئەو دیمەنی شەڕو دەمەقاڵێیەی بینی، لە کانگای دڵەوە پێکەنی‌و روو لە خوازگارەکان گوتی:

"کوڕینە، ئەمە سەیرترین وەرزشە کە لە ژیانما دەی بینم، تا ئێستا شتی وا لەم ماڵەدا رووی نەداوە، قسە مەکەن خواوەندان داویانە، سەرگەرمی‌و رابواردنمان بۆ پەیدا بوو! ئەو کابرا غەریبەو ئیرۆس گەرم بوون‌و هەربینا بەربوونە وێژەی یەکدی. وەرن با تیژیان بکەین‌و بە شەڕیان بدەین."

هەرکە ئەو قسەیەی کرد، هەموو بە پێکەنین وسوعبەتەوە لە دەوری جووتە گەدای شڕپۆش خڕ بوونەوە. ئەنتینوس، کوڕی یوپایتیس هەڵدایەو گوتی:

"خوازگارانی بەڕێز لەگەڵ ئەنگۆمەو گوێتان لێم بێ. ئەوەی لەسەر ئاگرە ورگ‌وگیپەی بزنە، داماننناوە بۆ شێو بکوڵێت. پڕمان کردوون لە چەوری‌وخوێن. هەرکەسێك لەم شەڕەدا سەرکەوت، ئەوی تری بەزاند، بۆی هەیە بڕوات‌و بە دڵی خۆی دانەیەکی لێ دەربێنێ‌و بیخوات. رێگەشی دەدەین هەمیشە بەشداری بەزم‌و سووری ئێمە ببێ، ورازی نابین هیچ دەرۆزەکەرێکی دی جگە لەو بەسەرە مێزەکانماندا بسوڕێتەوەو داوای سواڵ بکات."

هەمووان، قسەکەی (ئەنتینوس)یان بەگەن کرد. هەنگێ (ئودیسیوس)ی بەردەبار ڕابوو، زیاتر بە مەبەستی رێ گومکێ گوتی:

"خزمینە، هیچ ماقول نیە، پیرە پیاوێکی خەمکوشتەی سەرکوێری چەپۆك‌وچەپاڵەی رۆژگار، شەڕی پیاوێکی گەنجی زۆر لە خۆی بچووکتر بکات. بەڵام ئەم سکە نەفرەتیە کە بەڵای گیانی منە، ناچارم دەکات خوابەختەکی بێمە مەیدان. بەڵام دەبێ هەر هەمووتان سوێندی گەورەم بۆ بخۆن، پەیمانی راستیم بدەنێ، کە کەس لەسەر ئیرۆس نەکاتەوەو بە ناهەق نەکەوێتە وێزەی من‌و بە تۆبزی ئیرۆس بەسەر مندا زاڵ بکات‌و سەربخات."

ئودیسیوس لە قسەکەی بووەوە. هەمووان وەکو چۆن ئەو داوای کردبوو، سوێندیان خوارد.
پاش ئەوەی لە سوێند خواردن بوونەوە، تیلیماخۆسی جەوان وخورت رابوو،گوتی:
"پیرەمێرد، ئەگەر حەزدەکەی لەم پیاوە بدەیت و لێرەی وەدەربنەیت، ترست لە هیچ کەسێکی ئاخایی نەبێت، چونکە ئەوەی کە لە تۆ دەدات، دەبێ خۆی بۆ شەڕی گەورەتر ئامادە بکات،و منیش کە میوانداری تۆم کردووەو خانەخوێی تۆم ئەمە لە کەس قەبوڵ ناکەم، و سەردارەکانی دیکەو میران ئەنتینوس و یوروماخۆس)ش پیاوی زۆر ئاقڵ و ژیرن، هەمان هەڵوێستی منیان هەیە."
هەموویان، قسەکەی (تیلیماخۆس)یان سەلماند. هەنگێ ئودیسیوس لاق و قۆڵ و بازووی هەڵکرد، رانە جوان و ئەستوورەکانی دەرکەوت، شانە پانەکانی، سینگ و بازووە بەهێزو ئەستوورەکانی نیشان دان. ئەتینا لێی هاتە پێشەوە، بە قودرەتی خۆی دوو هێندەی تر لاق و باسك و بازووە بە هێزو ئەستوورەکانی بەرجەستەکرد. خوازگارەکان سەریان سوڕما، هەرکەسەو دەیڕوانیە ئەوەی لای خۆیەوەودەیگوت:
"ئیرۆس بە گەوجێتی خۆی، قوڕی بۆ خۆی گرتەوە. ئەم پیرەمێردەو ئەم لاق و باسك و بازووە ئەستوورو بەهێزە! چارنییە ئیرۆس دەبێ سزای سەرکێشی و موزیڕی خۆی بدات. بە کەوڵکردن کەوڵی دەکات."

## ئەنتینوس گاڵتە بە ئیرۆس دەکات و هەڕەشەی لێدەکات.

کە ئیرۆس گوێی لەو قسانەی ئەوان بوو، بە جارێ نەترەی بەردا. بەڵام وێڕای ئەوەش خزمەتگوزارو خولامان کەمەریان توند بەست و بە تۆبزی هێنایانە پێشەوە. ئازای بەدەنی لە ترسا وەکو بی نێو ئاو دەلەرزی. ئەنتینوس بەدەم تانەو تەشەرەوە پێیگوت:
"دەك داوەشێی چەنەبازی فشەکەر، مردنت لەو حاڵە باشترە کە بەو جۆرە لە هەنبەر پیرە پیاوێکی مەینەت زەدەدا، زراوت تۆقیوەو ئازای بەدەنت دەلەرزێ. دەك لە بار دایك چووبای. جا بۆیە پێت دەڵێم و دڵنیات دەکەم کە ئەگەر ئەم پیاوە بەسەرتا زاڵ بێ و سەربکەوێ، ئەوا دەتخەمە کەشتییەکی رەشەوەو بۆ مەملەکەتەکەی شا (ئیخیتوس)ت دەنێرم، کە ئیش وکاری ئەوەیە لوت و گوێی پیاوان دەکات. هەرکە بگەیتە ئەوێ بە شمشێرێکی تیژ لووت و گوێت دەبڕێت و کێرو گونت دەردێنێ وتوڕی دەداتە بەر کسۆکان."

## ئودیسیوس، ئیرۆس دەبەزێنێ وتوڕی دەداتە دەرێی کۆشکەکە.

داوی ئەوەی ئەنتینوس ئەو قسانەی کرد، ئیرۆس هێندەی دی ترسی لێنیشت. بە تۆبزی بۆ مەیدانی شەڕەکەیان رەوان کرد. جووتە هەڤڕك ئامادەو تەیار بەرانبەریان لێکدی گرت. بەڵام ئودیسیوسی نەجیمزادە، نموونەی سەبرو تەحەمول، لە دڵی خۆیدا بیری کردەوە، ئایا بە جۆرێکی وەهای لێبدات کە یەکسەر بیکوژێ و تەختی عاردی بکات، یان رەحمێکی پێدا بکات، سووکە دەستێکی لێبوەشێنێ و بکەوێتە عاردی و بەس؟ پاش بیرکردنەوەیەکی کەم وای بە چاك زانی بۆ ئەوەی ئاخاییەکان گومانی لێنەکەن و نەیناسنەوە، تەنیا سووکە دەستێکی لێ بوەشێنێ. هەنگێ دەستیان لێکدی بەرزکردەوە. ئیرۆس مستێکی توندی خێواندە شانی راستی

ئوديسيوس، بەڵام ئوديسيوس يەكسەر كێشای بە بنا گوێيدا، ئێسقانەكەی پەنا گوێی شكاندو خوێنێكی خەست لە دەمو زارييەوە فيچقەی كرد. ناڵەيەكی كردو كەوتە سەر عاردی. بەدەم دانەجيڕەوە كەوتە لەقەفرتێ. خوازگارەكان دەستيان بەرزكردەوە، خەريك بوو لەبەر پێكەنين دەبورانەوە. دوای ئەوە ئوديسيوس لە لاقی ئيرۆس نەوی، بەڕاڕەوەكەدا رايكێشا، تا ئەو ديوی دەرگای داڵانەكەی برد. لەوێ، لە حەوشەدا، لە پەنا ديوارێكدا داينا، دار دەستەكەی دايە دەستی، ئەوسا بە پەلە پێی گوت:

"بۆ خۆت لێرە دانيشە، بەرازوكسۆكان دەربكە. نە خەڵەتابی جارێكی دی خۆت بكەی بە كوێخاو دەمڕاستی گەداو رێبواران. ئەگينا خراپتر دەبينی، فشەكەری بێ سەروبەر."

## خوازگارەكان سوپاسی ئوديسيوس دەكەن

دوای ئەو قسانە، جۆركە، هەرزاڵ هەرزاڵەكەی دا بە شانيا. چوو لە بەر دەرگاكە، لە شوێنەكەی خۆی دانيشت. خوازگاروتەمەشاڤانەكان، بەدەم پێكەنينەوە وەژووركەوتن‌و بەمجۆرە دەست خۆشيان لێدەكرد:

"ئەی غەوارە ماڵت ئاوا بێ، زيوس‌وخواوەندانی دی بە دڵی خۆتت لەگەڵ بكەن. هەموو هيواو ئاواتێكت بێننە دی، وەكو ئەم دەرۆزەكەرە زگدڕاوەت لە كۆڵ ئەم دەڤەرەو ئێمە كردەوە. بەو زووانە رەوانەی لای ئيخيتوس شای دەكەين، كە دژمنی سەرسەختی بەشەرانە."

ئوديسيوسی مەردەمێر، زۆری دڵ بەو قسانە خۆش بوو. ئەوسا ئەنتينوس، ورگێكی گەورەی پڕ لە چەوری وخوێنی بۆ دانا، (ئەمفينوموس)ش دوو نانی لە سەبەتە دەرهێناو لە بەردەميا داينان، وجامێكی زێڕی تەژی بادەشی بۆ داناو گوتی:

"نۆشی گيانت بێ، مامە پيرەی بەڕێز. هەرچەندە ئێستا وەزع‌و حاڵت خراوە، بەڵام هيوادارم لەئايندەدا بەخت يارت بێ‌و ببی بە خودانی سەروەت‌وسامانی فرە."

## ئوديسيوس، ئەمفينوموس هشياردەكاتەوە.

هەنگێ ئوديسيوسی مەردە مێرو بەردەبار بەرسڤی دايەوەو گوتی:

"ئەی ئەمفينوموس، تۆ لە پياوێكی ئاقڵ‌و پڕ ئەزموون دەچيت، خانەدانيت پێوە ديارە. وەكو من بيستوومە باوكيشت پياوێكی دەوڵەمەندو ناودار بووە، بەڵێ من دەزانم كە نيسوسی خەڵكی دوليخيوم، هەم دەوڵەمەند بووەو هەم بە ئينساف‌وجوامێر بووە. دەڵێن تۆ كوڕی ئەويت، و پياوێكی بە سەنگ‌و ئيحتوباری وقسان وەردەگريت. بۆيە قسەيەكت بۆ دەكەم، حەزدەكەم بە هەندی وەربگريت. لەوەتای دنيا دنيايە، گۆی زەوی، هيچ بوونەوەرێكی لاوازترو ساويلكەتر لە مرۆڤی نەگرتووەتە خۆ، تا بەشنگ‌و تاقەتە، تا بووەودارايە، باكی بە هيچ نيە، هەر خۆی وخۆی ناناسێت،تەنانەت خواوەندانيش بە هەق ناناسێت. بەڵام كە دەكەوێتە تەنگانەوەو لێدەكەوێ هەنگێ خواوەندانی بير دەكەوێتەوەو هاواريان بۆ دەبات‌وبادەداتەوە. ئيدی ئەقڵی بەشەر رێك دەگەڵ ئەو رۆژەدا خۆی دەسازێنێ كە زيوس، گەورەی خواوەندان‌و بەشەران، بە سەريا دێنێ. بادانەوە هەوێنی تەبيعەتی تيرەی بەشەرە. من زۆر شت لەمبارەيەوە دەزانم، چونكە رۆژێ لە رۆژان زۆر دەوڵەمەندوبەختەوەر بووم. دەبوايە ئێستاش بە خۆشی‌و بەختەوەری ژيابام، بەڵام بە

هۆی غەڕاییوکەللە ڕەقی خۆم لەلایەك، وبە پشتیوانی ئەوەی باب‌و برایان لە تەنگانەدا فریام دەکەون، هەڵەی زۆروخەتاو بێدادی فرەم کردو ڕۆژم بەم ڕۆژگارە گەیی. بۆیە هەقە بنیادەم هەمیشە خۆی لە هەر جۆرە ستەمکاری‌و بێدادییەك بپارێزێت، و لە هەموو شتێکدا بە ئینساف بێت‌وگەر خواوەندان سەروەت‌و سامانێکیان دایە لە خۆی بایی نەبێت! تۆ بڕوانە ئەم خوازگارانە دەستیان داوەتە چ ناهەقی‌و بێویژدانییەك، چۆن شولیان لێهەڵکێشاوە ماڵ‌و دارایی خەڵکی دەخۆن‌و بە فیڕۆ دەدەن،و بەدوور لە هەر حەیاوحورمەتێك مامەڵە لەگەڵ ژنی پیاوێکدا دەکەن، کە دڵنیات دەکەم بەو زووانە دەگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی‌و بۆ ناو کەس‌و کارودۆستانی ئازیزی. چونکە حاڵی حازر زۆر لێرەوە نزیکە. ئومێدەوارم کە خواوەندێك هیدایەتت بدات‌و بۆ ماڵی خۆتت بەرێتەوەو وەختێ دەگاتەوە ماڵی خۆی‌و نیشتمانە ئازیزەکەی ڕوو بەڕووی نەبیتەوە. چونکە پێموایە کە هاتەوە شەڕێکی خوێناوی لە نێوان خوازگارەکان‌و ئەودا دەقەومێ‌و شتاقیان بە سەلامەتی دەرباز نابن.".

دوای ئەو قسانە، پرژە شەرابێکی وەکو عادەت پرژاندە سەر زەوی. ئەوجا شەرابە ئاڵە هەنگوین ئاساکەی هەڵداو،جامەکەی دایەوە دەست ئەمفینوموس. ئەمفینوموس، خەمبار وخەمین بە دەم سەر لەقاندنەوە بۆ ناو هۆڵەکە زڤڕییەوە. دڵی باشی نەدەگوت، ڕوحی پێشبینی خراپەی دەکرد. وێڕای ئەمەش لە دێوی مەرگ نەخەلەسی. ئەتینا لەوێندەری هێشتەوە تا بە دەست‌و نێزەی تیلیماخۆس بێتە کوشتن. بۆیە چوو لەسەر کورسییەکەی خۆی دانیشتەوە.

## پنلوپی دەیەوێ خۆی پیشانی خوازگارەکان بدات

دوای ئەوە ئەتینا،خوابانۆی چاوگەش، پنلوپی، کیژی ئیکاروس، ئاقڵترین ژنی خستە سەر کەڵکەڵەی ئەوەی کە خۆی پیشانی خوازگارەکان بدات، تا هێندەی دی ئاشقی ببن‌و، تا لەبەر چاوی مێردەکەی‌و کوڕەکەی بەڕێزتر ببێ. بۆیە بەدەم پێکەنینێکی نابەجێوە، بە دایەنەکەی گوت:

"ئەی یورینومی، هەرچەندە لە تەرح‌و دیداری ئەم خوازگارانە بێن بێزارم، کەچی سەیرە! حەز دەکەم خۆمیان نیشان بدەم، و بەو بۆنەیەوە دەمەوێ کوڕەکەم بدینم‌و دوو قسەی دەگەڵ بکەم. ئامۆژگاری بکەم کە ئاگای لە خۆی بێ، ئەوەندە تێکەڵاوی ئەم ملهوڕو خۆ پەسندانە نەبێت، چونکە لە ڕوو مەراییودەڵەچەیی بۆ دەکەن، بەڵام لە پاشملە داوی بۆ دەنەوەو بیر لە کوشتنی دەکەنەوە".

یورینومی دایەن‌وکارەکەر گوتی:

"بەڵێ، کیژەکەم، هەق بە تۆیە. قسەکەت بە جێیە. مەوەستە. بڕۆ قسەی خۆت بۆ کوڕەکەت بکەن، هیچی لێ مەشارەوە. بەڵام خۆت پاك بشۆ، بۆن لە خۆت بدە، زەیت لە گۆناکانت بدە، بەم گۆنا فرمێسکاویانەوە مەچۆ خوارەوە. خۆ ناکرێ هەتا هەتایە خۆت بە خەفەتەوە بکوژی. بڕوانە شوکر کوڕەکەت بووە بە پیاوێکی تەواو. ئەدی تۆ هەموو داوایەکت لە خواوەندان ئەوە نەبوو، کە کوڕەکەت بە ڕدێنەوە بدینی؟

هەنگێ، پنلوپی ئاقڵ‌و ئاغر، بەرسڤی دایەوەوگوتی:

"ئەی یورینومی، من دەزانم ئەو قسانەت لە رووی دڵسۆزییەوەیە، بەڵام تکایە تەکلیفی خۆشتن و خۆ جوانکردنم لێمەکە. لەوەتای ئودیسیوس سواری کەشتی بوو، ورۆیی، خواوەندانی ئوڵەمپ نشین، بۆ هەتا هەتایە جوانییەکەی منیان بردەوە. برۆ ئوتونوی و هیپودامی-م بۆ بانگ بکە، با لەگەڵما بێنە خوارێ، ولە نێو هۆڵەکەدا لەم لاو لەولامەوە بوەستن. چونکە شەرم دەکەم بە تەنیا بچمە نێو ئەو پیاوانە."

هەنگێ پیرەژن، بە پەلە رۆیی، جووتە کارەکەری ناڤبری ئاگادارکرد کە بەلەز بڕۆن بۆ لای خانمی گەورە.

## ئەتینا جوانیەکی لە رادەبەدەر بە پنلوپی دەبەخشێت

دوای ئەوە، ئەتینا، خوابانۆی چاوگەش بیرێکی دیکەی بە خەیاڵدا هات. خەوێکی قووڵی بەسەر کیژی ئیکاروس دا داباراند. یەکسەر سەری قورس بوو، چوار پەلی خاو بووەوە، لەسەر جێگاکەی راکشاو شەکەت و ماندوو خەوی لێکەوت. لەم ماوەیەدا ئەتینا جوانی و شیرینیەکی وەهای پێبەخشی کە ئاخاییان سەریان سوڕبمێنێ. هەوەڵجار بە عەترێك لەو عەترانەی کە ئەفرۆدیتی کلاوزەڕ لە ئاهەنگی فریشتانی جوانیدا لە خۆی دەدا، دەموچاوی شۆرد. پرشنگێکی خوایی سەیر کەوتە سەر سیماو چارەی جوانی. بەژن و باڵای لە جاران بەرزترو جوانترو بە شکۆتر دەهاتە بەرچاو. هێندە سپی و سوۆڵ بوو، لە تۆ وایە عاجی تازە تاشراوە. دوای ئەوەی خوابانۆی یەزدانی نەژاد لەو کارانە بووەوە لێیدا رۆیی. هەنگێ کارەکەرو هاودەمەکانی بەدەم قسانەوە وەژوور کەوتن. پنلوپی لە دەنگی ئەوان خەبەری بووەوە. دەستێکی بە سەرو رووی خۆیدا هێناو گوتی:

"بەو هەموو کەسەرەوە، چ خەوێکی ئەفسوناویم لێکەوتبوو! خۆزیا ئەرتەمیسی داوێنپاك، لە ساتێکی ئاوا ئارامدا دەیکوشتم و نەجاتم دەبوو. چیتر بە عەزرەتی دووری میردە ئازیزەکەمەوە، مێردە بێ هاوتاکەمەوە، بە عەزرەتی ئەو مەردەمێردەوە، بالاترین پیاوی ناو ئاخیانەوە نە دەتلامەوە."

## پنلوپی لەسەر دەرۆزەکەرەکە گلەیی لە تیلیماخۆس دەکات

دوای ئەو قسانە لە باڵەخانە رەخشانەکەی خۆیەوە دابەزی. بە تەنیا نەبوو. دوو کارەکەری بە دواوە بوون. کە خانمی رەسەن و خانەدان گەییە بەرانبەر خوازگارەکان، لە پاڵ یەکێك لە پایە بتەوەکاندا راوەستا، رووبەندەکەی لادا. کارەکەرە دڵسۆزەکانی لەملاو لەولایەوە وەستان. کە خوازگارەکان چاویان پێکەوت، ئەژنۆیان سست بوو. بە جارێ بەنج بوون. لە ناخا ئەفسوونی جوانیەکەی بوون. هەرکەسەو لە دڵی خۆیدا لە خواوەندان دەپاڕایەوە کە ببێ بە نسیبی. بەڵام ئەو رووی کردە تیلیماخۆس، کوڕە ئازیزەکەی وگوتی:

"تیلیماخۆس! تۆ کە منداڵ بووی بە هۆش وگۆشتر بووی. کە منداڵ بوویت، زۆر جوان بیرت دەکردەوە. کەسێکی بە ئینساف و بە زاکون بوویت. ئێستا کە گەورە بوویت، هەرکەسێك، تەنانەت بێگانەیەکیش تەماشای بەژن و باڵاوجوانیت بکات، دەزانێ کوڕی بابایەکی خانەدان و رەسەن و دەوڵەمەندو مەردە مێری. بەڵام وا دیارە هۆشمەندی و زاکونیەکەی جارانت نیە. لە خۆت

ناپرسیت ئەم فەرتەنەو ئاژاوایە چیە لەمماڵەدا!، ئاخر چۆن رێگە دەدەی بابایەکی غەریب، کە رووی کردۆتە ماڵەکەت، میوانە، بەو جۆرە بەدرەفتاری دەگەڵ بکرێ، بەو شێوەیە ئازار بدرێ، بڕەنجێنرێ! باشە ئەگەر ئەو پیاوە لە ماڵەکەی ئێمەدا شتێکی بەسەر هاتبا، مردبا، چیمان دەکرد؟ بێگومان ناوت دەزڕا، شەرمەزارو ریسوای ناو خەڵكوخوا دەبوویت."

تیلیماخۆسی هۆشمەند وەڵامی دایەوەوگوتی:

"دایکە! ناهەقت ناگرم، گلەییەکەت بەسەرچاو، تورە بوونەکەت بە جێیە. بەڵام وێڕای ئەمەش بیر دەکەمەوە، دەزانم چی چاکەو چی خراپە، تا ئێستا منداڵ بووم. بەڵام راستت دەوێ، ئەقڵ هەموو کاتێ میوان نیە، و زۆرجار نازانم چی بکەم، چ هەڵوێستێك بنوێنم. ئەم پیاوانەی بڕبڕ لەسەر خوانو سفرەی ئێمە دەخۆنو دەخۆنەوە، هەموو نیازیان خراپە. بە ئاشکرا ماڵی من وێران دەکەن، ومنی تەنیا باڵ کەسێك شك نابەم پشتیوانیم بکات! حەزدەکەم ئەوەشت پێبڵێم، کە شەڕی نێوان ئەو پیاوە غەریبەو ئیرۆس بە دڵی خوازگارەکان نەشکایەوە، چونکە میوانەکەی ئێمە بەسەریا، سەرکەوت. داوام لە قاپی بابە زیوس، وئەتیناو ئەپولۆ ئەوەیە کە ملی ئەم خوازگارانەی تۆ کە دەرو ژووریان لێگرتووین، بشکێنن، چوار پەلیان بشکێت، لاقیان عاردی نەگرێت، بە هەمان دەردی ئیرۆس بچن، کە ئەوەتا، لە حەوشەدا سەر شۆرو ملکەچ، وەکو سەرخۆشو مەستی مەست گێژوحۆل دانیشتووەو نەخۆی بە پێوە دەگرێتو نە دەتوانێ بە هیچ لایەکدا بڕوات، چونکە چوارپەلی شکاوە."

## پنلوپی یادی قسەکانی ئودیسیوس دەکاتەوە

دایكوکوڕ ئەو گوتوبێژەیان کرد. یوروماخوس رووی کردە پنلوپو گوتی:

"ئەی پنلوپ، ئەی کیژی ئیکاریوس، ئەی ئاقڵترین ژن، ئەگەر ئاخایانی سەرانسەری ئارگوس بەم حاڵەوە بت بینن، لە سبەینێوە، ئیدی ماڵەکەت لەبەر خوازگاران بەر ناکەوێت، چونکە هیچ ژنێکی ئەم دنیایە، نە لە بەژنوباڵا، نە لە جوانیو خشیکی نە لە ئەقڵو سەلاریدا، بە تۆزی پێتا ناگات."

ئەوسا پنلوپی فاما گوتی:

"ئەی یوروماخوس، جوانی من، بە ژنو باڵای من، قەدو قامەتی من، ئەو رۆژە خواوەندان لە منیان سەندەوە کە ئارگوسییان سواری کەشتی بوونو بەرەو ئیلوس بەرێکەوتن،و ئودیسیوسی مێردم لەگەڵیاندا رۆیی. ئەگەر ئودیسیوس گەڕاباوەو سایەداری کردبامو بەرێوەبردنی موڵكو ماڵەکەی لە ئەستۆ گرتبا، ئەوسا شکۆوسەرفرازی من، لە دنیادا گەورەتروجوانتر دەبوو. رێزو حورمەتم پتر دەبوو. بەڵام ئێستا کەوتوومەتە ژێر باری خەم، یەکێك لە خواوەندان بەڵای دنیای لێ بار کردووم. کاتی خۆی مێردەکەم هەستی بەمە کردبوو، بەر لەوەی بڕوات، مەچەکی دەستی راستی گرتم وگوتی:

"ئافرەت، باوەڕ ناکەم هەموو شەڕڤانانی ئاخایی بە سەلامەتی لە تەروادە بگەڕێنەوە،. چونکە تەروادەییەکان، وەکو دەڵێن، پیاوی شەڕن، رمبازن، کەوانکێشن، ئەسپ سواری کارامەو لێهاتوون، کە ئەمە تای تەرازووی سەرکەوتن بەلای ئەواندا قورس دەکات، وجەنگاوەرو شەڕڤانی کارامەو باشن. بۆیە نازانم خواوەندان چیان لە چارە نووسیوم، ئاخۆ بە سەلامەتی دەگەڕێمەوە،

یان لەویٚ، لە خاکی غەریبی دا، لە تەرواده دەمرم. تۆ لێرە سەرپەرشتی ئەم موڵكومالە بکە، ئیدی هەمە کارەی ئێرە بە. ئاگات لە دایكو بابم بێت. وەکو چۆن ئێستا ئاگات لێیانەو پێیاندا رادەگەی، بە هەمان شێوەو زیاتر ئاگات لێیان بێت، پاشان کە بینیت کوڕەکەمان گەورە بوو، ریشو سمێڵی هات، ئیدی بە ئارەزووی خۆت شوو بە یەکێك بکەو ئەم ماڵە بەجێ بێڵە."

"بەڵێ، ئەوە وەسێتوراسپاردەی مێردەکەم بوو، ئەوەتا خەریکە هەموو پێشبینیو قسەکانی دێنە دی. ئەو شەوەی کە دەبێ بریاری شووی تیا بدەم خەریکە نزیك دەبێتەوە. بەلام من ژنێکی نەگبەتو بەدبەختم، زیوس لە هەموو شادییەکی بێبەش کردووم. ئەوەی میناکی خۆرە داویەتە دڵمو نیگەرانم دەکات، ئەوەیە کە خوازگارانی ئەمڕۆ، زۆر پابەندی دابو نەریتی کۆن نین: جاران، ئەوانەی دەچوونە داخوازیودەیانویست دڵی ئافرەتێکی نەجیمزادەو رەسەن، کیژی پیاوێکی دەوڵەمەند رازی بکەن،هەڤرکیو رکابەری یەکتریان دەکرد، ئەوانە لەگەڵ خۆدا گوێرەکەو گاو مەڕی قەڵەویان دەهێنا، تا ئەو ئافرەتە بتوانیٚ بە روو سووریو سەربەرزی، بە شێوەیەکی شایستە میواندارى، ئەو میوانە بەرێزانە بکات، ودیاریو سەوقاتی بەنرخو گرانبەهایان بۆ دێنا، ونەدەچوونە سەر حازرەکیو نە دەچوونە سەر سفرەو خوانی خەڵکی، لە کیسەی خۆیان خوانو سفرەیان دەڕازانەوە."

کە ئەو قسانەی کرد، ئۆدیسیوسی مەردەمێرو بەردەبار لە دڵی خۆیدا زۆر خۆشحاڵ بوو، چونکە دەیزانی ئەوە تاکتیکە، گەرەکیەتی بە زمانی لووسو قسەی خۆش دیاریو پێشکەشییەکی زۆر لە خوازگارەکان بکێشێتەوە، دەنا نەخشەی تری لە بیروخەیاڵدا بوو.

## خوازگارەکان دیاری بۆ پنلوپی دێنن

هەنگیٚ ئەنتینوس کوڕی یوپیتیس، هەڵیدایەو گوتی:

"ئەی پنلوپ، ئەی کیژی ئیکاروس، ئەی هۆشمەندترین ژن، هەر پیاوێکی ئاخایی، چەندت دیاریو سەوقاتی بۆ دێنیٚ، لێی وەربگرە، چونکە وەرنەگرتنی دیاری کارێکی رەوا وشایستە نیە. بەلام سەبارەت بە ئێمە لێرە ناڕۆین تا تۆ یەکێك لە ئاخاییەکان، ئیدی هەر کێیەك بیٚ، کە خۆت لە هەمووان بە شایستەترو جامێرتری بزانی، هەڵنەبژێریتو شووی پێنەکەیت."

ئامادە بووان، قسەکانی (ئەنتینوس)یان بەدڵ بوو، هەرکەسەو خولامێکی بۆ ماڵی خۆی ناردەوە تا دیارییەك بێنیٚ. عەزیزییەکی دەڵبی، زۆر جوان، گوڵدوزی کراو، یەخە بە دوگمەو قەیتانیان بۆ ئەنتینوس هێنا، کە بە دوازدە دوگمەی زێڕ دادەخرا، تا بە دیاری پێشکەش بە پنلوپی بکات. خولامەکەی (یوروماخۆس)ش بە گەردانەیەکی زێڕی زۆر جوانەوە، کە ناوە ناوە گۆی عەنبەرینی تیٚ هەڵکێشرا بوو، ومیناکی خۆر دەدرەوشایەوە، گەڕایەوە. خولامەکانی (یوروداماس)ش بە جووتیٚ گوارەی سیٚ گۆی مرواری درشتەوە، کە خشڵێکی زۆر دەگمەنو نایاب بوو، و ئاوی چاوی دەبرد، گەڕانەوە. هەروەها خولامەکەی پساندر، کوڕی پولیکتورش بە گەردانەیەکی زێڕی یەکجار جوانو رەخشانەوە گەڕایەوە. بەو جۆرە هەر یەکێك لە ئاخاییەکان سەرو دیاری شایستەیان پێشکەش کرد. هەنگیٚ خانم بۆ باڵەخانەکەی خۆی سەرکەوتەوە. کارەکەرەکانی، دیاریەکانیان بۆ هەڵگرتوبە دوویدا سەرکەوتن. خوازگارەکان دووبارە کەڵکەڵەی هەڵپەڕکیٚو

گۆرانیان کەوتە سەر. بەدەم کەیف و شادییەوە ڕۆژیان گەیاندە شەو. یەکسەر سێ مەنقەڵیان هێنایە ژوورەوە، پڕیان کردن لە داری وشکوسەخت، کە تازە بە تەور شەق کرابوون، تا زوو ئاگر بگرێت و دەوروبەریان بۆ ڕوناك بکاتەوە، مەخشەڵیان لە قلێشی دارەکان دانا، کارەکەرو قەرەواشە دڵسۆزەکانی ئودیسیوس، لە وێندەر بوون، بە نۆرە چەپکە پووشی وشکیان دە مەنقەڵەکان دەناو ئاگرەکەیان خۆش وخۆشتر دەکرد. دوای ئەوە ئودیسیوسی، زیوس زادە، مەردەمێرو جامێر، ڕووی کردە کارەکەرەکان وگوتی:

"ئەی کارەکەرانی ئودیسیوس، ئەو ئودیسیوسەی کە لە مێژە لێرە نیەو لێتان دوورە، ئێوە بڕۆنە سەرەوە، بچن بۆ باڵەخانەکەی خانمی بەڕێزتان، لەوێ، لەنك ئەو دانیشن و هەوڵبدەن سەرگەرمی بکەن، تەشی دەگەڵدا بڕێسن، یان خوری بۆ بپشکنن، خەمتان نەبێ من لە جیاتی ئێوە سەرپەرشتی ئاگرەکان دەکەم. ئەگەر ئەم پیاوانە هەتا بەیانیش دانیشن نایەڵم گلەییان هەبێت. من پیاوێکی بە سەبروتەحەمولم، قاڵبووی بۆتەی ژیانم.".

## میلانتوی کارەکەر جنێو بە ئودیسیوسی گەدا دەدات

هەرکە ئەو قسانەی کرد، کارەکەرەکان دەستیان کرد بە پێکەنین، وتەمەشا کردنی یەکدی. میلانتوی خشیك و ڕوومەت خڕ، کەوتە جنێودانی، ئەمە کیژی دولیوس بوو، پنلوپی بەخۆی بەخێوی کردبوو، ومنیاکی منداڵی خۆی پەروەردەی کردبوو، ولە هیچ شتێکدا بێ دڵی ئەوی نەدەکرد. هەرچیەکی حەز لێبایەو دڵی خۆشکردبا دەیدایە. کەچی ئەم ژنە هیچ ئەمەك و دڵسۆزییەکی دەرهەق بە پنلوپی نەبوو، وئاشق و شەیدای یوروماخوس بوو بوو. پەیوەندی نابەجێی لەگەڵدا دروست کردبوو. بۆیە ڕووی کردە ئودیسیوس و بەم قسە ساردو سووکانە بەرسڤی دایەوە:

"ئەی غەوارەی نەگبەت، چیە، ئەقڵت تێکچووە؟ بۆچی ناڕۆی بۆ خۆت لە کارگەی ئاسنگەریەکە یان لە پەناگەی گشتی بنوویت؟ بۆچی بەرانبەرت لەم هەموو خانەدانە گرتووەو بێ پەرواو بێ شەرم قسەی زل وچەنەبازی دەکەی؟ دیارە شەراب مەستی کردوویت، یان هەر بە خۆت کابرایەکی ئەقڵ سووك و هەرزەوێژی، یان لەبەر ئەوەی بەسەر گەدایەکی میناکی ئیرۆس دا زاڵ بووی ئیدی لە خۆت بایی بوویت و خۆت گەوج کردووە؟ ئاگات لە خۆ بێ یەکێکی لە خۆت بەهێزترت لێپەیدا نەبێت، ومستێکی قورست بە تەپڵی سەرا بکێشێت و سەراپات لە خوێنا هەڵکێشی ولێرەت وەدەربنێ."

هەنگێ ئودیسیوس بڕۆی وێکهێنانەوە، مۆڕەیەکی لێکردو بە توندی گوتی:

"هەی دێڵە سەگی بێحەیا، هەر ئێستا دەچم ئەم قسانەت بۆ تیلیماخۆس دەگێڕمەوە، تا هەر لێرەدا پارچە پارچەت بکات."

کارەکەرەکان، بەو قسانە زۆر ترسان. بە پەلە پروزێ بڵاوەیان لێکرد، هێندە ترسا بوون، لاقیان لە دوویان نەدەچوو! چونکە پێیان وابوو هەڕەشەکەی دەباتە سەرو بە جدییەتی. بەڵام ئودیسیوس بە دیار مەنقەڵەکانەوە وەستا تا پێیان ڕابگات و نەیەڵێ بکوژێنەوە. بە چاوی

دەیڕوانیە یەکە بە یەکەی خوازگارەکان،و لە دڵدا لێوی لێدەکرۆشتن و، بیری لەوە دەکردەوە چۆن نەخشەو پلانەکانی بە کردەوە ئەنجام بدات.

## یوروماخۆس تەڵفیزی بە ئودیسیوسی گەدا دەکات

بەڵام ئەتینا،خوازگارەکانی دندە دەدا کە لەسەر قسەی ساردوسڕو تانەو تەشەری خۆ بەردەوام بن. تا زیاتر دڵی ئودیسیوس، کوڕی لایرتیس برەنجێ، وپتر لێیان پڕ بێ، ورقی هەستێت. بۆیە یوروماخۆس، کوڕی پولیبوس، هەر بۆ ئەوەی هاوڕێکانی بێنێتە پێکەنین وسەرگەرمیان بکات، کەوتە گاڵتەوتەڵفیزی کردن بە ئودیسیوس وگوتی:

"ئەی خوازگارانی شابانۆی ناوداروسەرفراز، گوێبگرن تا قسەی دڵی خۆمتان پێبڵێم. ئەم پیاوە لە خۆڕا بۆ ئێرە نەهاتووە،بە ویستی خواوەندان رێی کەوتووەتە ماڵی ئودیسیوس، لەوە دەچێت تیشکی مەشخەڵەکان لەسەری ئەوەوە هەستێ، ئەوەتا سەری ساف و لووس، تاقە موویەکی پێوە نییە."

دوای ئەوە رووی کردە ئودیسیوسی مەردەمێرو قارەمانی شارانگرو گوتی:

"ئەی غەریب، بۆ نایەی لای من کاربکەی؟ دەتنێرم بۆ گوندی و لە کێڵگەو مەزراکانمدا کاربکە، و کرێیەکی باشت دەدەمێ. لەوێ بەرد بۆ دیوار کۆبکەوە، درك و داڵ هەڵکەنە، بژاربکە، دارو دەرختان بنێژە. بە درێژایی ساڵ نان وخۆراکی مشەت دەدەمێ، جلو بەرگت بۆ دەکەم، پێڵاوت بۆ دەکەم. بەڵام نا، باوەڕناکەم کاری وا بکەی، فێری نانی سواڵیت، حەزت لێیە بە وڵاتانا بگەڕێی و دەست بە دەرگای ماڵانەوە بنەی، بە سواڵ وسەدەقە ورگە دڕاوەکەت تێر بکەی."

## ئودیسیوس بەرپەرچی یوروماخۆس دەداتەوە

ئودیسیوسی مەردە مێری دووربین و بەردەبار بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"یوروماخۆس، خۆزگە لە سەرەتای هاویندا، ئەو کاتانەی کە رۆژ درێژە، من و تۆ دەچووینە دەرو، هەریەکەو داسێکی چوون یەکمان پێ دەبوو، ولە بەیانی زووەوە تا ئێوارەیەکی درەنگ، بەبێ پشوو، بەبێ نانخواردن درەومان دەکرد، هەنگێ پێم نیشان دەدایت کە من پیاوی کارم یان تۆ. یان خۆزگە پێکەوە دەچووینە جووت، سەرو جووتێ گای بوغەی غللوری زەردباوی، تێر ئالیك و گیای، هاوساڵ وهاوقەوەتیان دەداینێ،و چوارگاوەخان زەویان دەخستە بەردەستمان و دەستمان بە جووتان دەکرد. هەنگێ پێم نیشان دەدایت کە خەتە جووت وهۆگانەی کێمان وردو نەرم و راستە. یان خۆزگە کوڕەکەی کرونوس بەو زووانە شەڕێکی لە شوێنێکەوە هەڵدەگیرساند، من قەڵغانێك و، دوو نێزەو، کڵاوخوودێکی پۆڵایینی پڕ بە سەری خۆم پێ دەبوو، بزانە چۆن لە ریزی پێشەوەی جەنگاوەراندا، بە چاوی خۆت دەتبینیم وچیتر رووت نەدەهات تەشەرم لێ بدەی و بەورگی من بڵێی هەنبانەی گەدایان. بەڵام تۆ پیاوێکی گۆساخ و دڵڕەق و بێ ئینساف، چونکە دەوروبەرەکەت خەڵکانێکی بودەڵەو ترسنۆکن، وا دەزانی زۆر گەورەو رەشیدو عەگیدی، نەهەقت ناگرم،پشیلە لە چاوی مشکدا شێرە. خۆزگە ئودیسیوس دەگەڕایەوە، دەگەییشتەوە وڵات و زێدی باوانی، بزانە چۆن دنیا لە یوروماخۆس دەبوو بە چەرمی چۆلەکە. چۆن ئەم کۆشك و سەرا گەورەو دەرك و دەروازانەی لێدەبوو بە کونە مشك و نەیدەزانی لە کوێوە هەڵبێ!".

## یوروماخۆس تەپڵەکۆکەیەك دەسرەوێنێتە ئودیسیوس

یوروماخۆس، لە دڵی خۆیدا، زۆر لەو قسانە تووڕە بوو، بڕۆی وێکهێنانەوەو مۆڕەیەکی لێکرد، رووی تێکردو بە توندی گوتی:

"هەی خوێڕی، ئێستا ئاکامی ئەم دەمدرێژیو گۆساخیەت پێنیشان دەدەم. تۆ بووی بەو پیاوەی بە بەرچاوی خەڵکییەوە قسەی سووك بە من بڵێی! وەڵلا هەڵدەکەوی! ئەوە تۆ سەرخۆشی یان هەر بە تەبیعەت چەنەبازو هەڵەوەڕی؟ یان لەوەتای بە سەرگەدایەکی میناکی ئیرۆس دا زاڵ بوویت، لە خۆت بایی بوو؟"

ئەوسا هەڵیگرتە تەپەڵەکۆکەی ژێر پێی و تێی سرەواند. بەڵام ئودیسیوس، لە ترسی یوروماخۆس، سەری دانەواندو لە بەردەم ئەمفینوموسی دولیخیومی دا دانیشت. تەپەڵەکەکە بەر دەستی راستی ساقییەك کەوت، سوراحیە شەرابەکەی دەستی کەوتە سەر عاردەکەو بە تەق و هۆڕشکا. بەخۆیشی ناڵەیەکی کردو بە پشتا کەوتە سەر عاردی. خوازگارەکان لە نێو هۆڵە تاریکەکەدا کردیان بە هەراوزەنا، هەرکەسەو بەوی تری دەگوت:

"خۆزیا ئەم کابرا غەوارەیە، لە ولات و شوێنێکی دیکەدا دەتۆپی و بۆ ئێرە نەدەهات. تەماشا چ گۆبەندێکی ناوەتەوە! خەریکە لەسەر بابایەکی دەرۆزەکەر بەگژ یەکدا دەچین! نۆبەتی ئەو قەوانەیە، ئەگەر کار بوا بڕوات، بەزمو ئاهەنگەکەمان بە دڵەوە نانووسێت."

## تیلیماخۆس داوا لە خوازگارەکان دەکات
## کە بۆ ئیسراحەت بچنەوە ماڵی خۆیان

هەنگێ تیلیماخۆسی دلێرو جامێر رووی تێکردن و گوتی:

"گەلۆ، ئێوە سەیرن، زۆر شێتن، تێرو پڕتان خواردووەو خواردووەتەوە، مەستیتان پێوە دیارە، پێدەچێت خواوەندێك دندەتان بدات و تیژتان بکات! بەزمو ئاهەنگی خۆتان گێڕاوە، هەرچەندە من لەوانە نیم میوان، هەرکەسێك بێ، دەربکەم، بەڵام ئەگەر دەتانەوێ ئیسراحەت بکەن، بچنەوە لە ماڵی خۆتان بخەون!"

کە گوێیان لە قسەکانی تیلیماخۆس بوو، هەموو لێویان گەست، سەریان لەم پڕکێشی و جەسارەتەی ئەو سوڕما. ئەمفینوموس، کوڕی نیسوسی خانەدان، ونەوەی ئەریتیاس هەڵیدایەو گوتی:

"گەلۆ، دۆستان، قسەکانی بەجێیە، پیاو نابێ لە قسەی هەق و دروست تووڕە بێ و وەڵامی نابەجێ و رەق و دژمنانە بداتەوە. لە ئێستا بە دواوە نە ئەم کابرا غەوارەیەو نە هیچ یەکێك لەو خزمەتکارانەی کە لە ماڵی ئودیسیوسی موبارەك دان ئەزیەت مەدەن. دەیسا با ساقی یەك بە یەك بەسەردا بگەڕێ و پیاڵان تەژی بکات، بەڵکو نەریتی نۆشخواری ئەنجام دەدەین، وئەوسا بۆ ئیسسراحەت بچینەوە بۆ ماڵی خۆمان. ئەم کابرا غەریبەش لێرە، لە ماڵی ئودیسیوسدا بۆ تیلیماخۆس بە جێ بێڵین، چونکە رووی کردووەتە ماڵی ئەو ومیوانی ئەوە."

هەمووان، بە قسەیان کرد. مولیوسی گاردوخولامی ئەمفینوموس، گۆزەیەك شەرابی گرتەوە،

**بەسـەر یـەك بـە یەكیانـدا گـەڕا، بـادەی بـۆ هـەمووان تێكـرد، بـە یـادی خواوەنـدان بـادەپرژێنی و نۆشـخواریان كـرد، ئەوسـا ملیـان بـە شـەرابی هـەنگوین ئاسـاوە نـاو بخـۆڕەوە. پـاش ئـەوەی تێروپڕیان خواردەوەو لێبوونەوە، هەركەسە، بۆ خەوتن، بەرەو ماڵی خۆی ڕۆیی**

***

## پەراوێز:

***– دولیوس:**

**خولامی ئەمەكدارو باخەوانی پنلوپی هاوسەری ئودیسیوسە. كە پنلوپی شووی كرد، دولیوس، میلانتوی كیژی خۆی دایە. دولیوس، كە ئودیسیوس گەڕایەوە، و دەگەڵ خوازگارەكاندا بەشەڕ هات، پشتی ئودیسیوسی دژ بە خوازگارەكان گرت.**

## سروودی نۆزدەیەم

### کورتەی سروودەکە:

پاش رۆییشتنی خوازگارەکان، ئودیسیوس بە کوڕەکەی دەڵێت ئەو چەك‌و ئەسلەحەیەی کە لە هۆڵەکەدا بوون، بگوازێتەوەو بشارێتەوە. ئەتینا بە خۆی مەشخەڵ بەدەست پێشی دەکەوێت. پنلوپی، میلانتو، لەسەر ئەوەی قسەی ساردو سووکی بە کابرای غەوارە گوتبوو، سەرزەنشت دەکات. پنلوپی پرسیاری زێدو مەفتەن لە یارۆی بێگانە دەکات، یارۆ خۆی لە وەڵامدانەوە دەدزێتەوە. پنلوپی پێداگری دەکات، ئودیسیوس مل دەدا. پنلوپی زۆر بە تاسەوە گوێ لە کابرای گەدا دەگرێت کە گوایە ئودیسیوسی لە کریتدا دیتووە. پنلوپی راستگۆیی کابرای گەدا تاقی دەکاتەوە. یارۆ پێشبینی ئەوە دەکات کە ئودیسیوس بەو زووانە دەگەڕێتەوە. پنلوپی، یوریکلیای پیرەدایەن رادەسپێرێت کە لاق‌و لەتەری کابرای گەدا بشوات. یوریکلیا، ئودیسیوس بە کۆنە جێزامێکی سەر لاقیا دەناسێتەوە. ئودیسیوس پێی دەڵێت کە قسە نەکات‌و ئەو رازە لای کەس نەدرکێنێ. پنلوپی خەونێکی خۆی بۆ ئودیسیوس دەگێڕێتەوە کە گوایە نیشانەی گەڕانەوەی مێردەکەیەتی. پنلوپ لێدەبڕێ پێشبڕکێیەك لە بەینی خوازگارەکاندا رێك بخات. کابرای گەدا ئەو پێشنیازە پەسند دەکات. بە گوێرەی مەرجێن پێشبڕکێیەکە، پنلوپ شوو بە براوەی پێشبڕکێیەکە دەکات.

***

### ئودیسیوس نەخشەی کوشتنی
### خوازگارەکان بۆ تیلیماخۆس دەکێشێت

ئودیسیوس بە تەنیا لە هۆڵەکەدا مابووەوەو دەگەڵ ئەتینادا بیری لە کوشتنی خوازگارەکان دەکردەوە. لە پڕ رووی کردە تیلیماخۆس‌وگوتی:

"تیلیماخۆس! دەبێ هەرچی چەك‌وئەسلەحە لێرە هەیە بگوازیتەوە شوێنێکی پەنهان‌و، لەبەر دەستدا نەبن. ئەگەر خوازەگارەکان داوایان کردن، یان لێیان پرسیت، بە زمانی شیرین‌و بە قسەی خۆش وەڵامیان بدەرەوە: گواستوومەنەتەوە شوێنێك کە لە ژەنگ‌ودووکەڵ دووربن، چونکە وەکو ئەوسا نەمابوون کە ئودیسیوسی پیر لێرەی دانان‌وچوو بۆ تەروادە. هەموو بەڵخیان گرتبوو، کەڕویان هەڵێنابوو. هاڵاوی ئاگر وێرانی کردوون! ئەمە جگە لەوەی دەترسام رۆژێك بەدەم بادەنۆشییەوە سەرتان گەرم بێ‌و کار بگاتە ئەوەی بە گژ یەکدا بچن‌و دەست بدەنە چەك‌و یەکتر بریندار بکەن‌و، بەزم‌وشاییەکەتان بشێوێ‌و ببن بە لۆمەکاری خەڵکی. بە خۆتان دەزانن، چەك خۆبەخۆ پیاو رادەکێشێت‌و جۆرە هەوایەکی پێدەبەخشێت."

### یوریکلیا بە دەنگی تیلیماخۆسەوە دەچێت

تیلیماخۆس، بە گوێی بابی کرد، دایەنە پیرەکەی، یوریکلیای گازکردو پێی گوت:

"ئەی دایەی دلۆڤان، خێراکە کارەکەرەکان بخەرە ژووری خۆیان، دەرگایان لەسەر داخە، تا چەك‌و ئەسلەحەکانی بابم دەبەمە عەمارەکە، ئەم چەکە جوانانە کە لەمماڵەدا بەبێ سەرپەرشت‌و

خاوەن دانراون، لەو رۆژەوە ئودیسیوس رۆییوە، تۆزو دووکەڵ خواردوونی. من هەنگێ زۆر منداڵ بووم، جا ئێستا گەرەکمە لە شوێنێکیان هەڵگرم کە دووکەڵو هالاوی ئاگریان نەگاتێ."

یوریکلیای دایەن بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"بەڵێ، کوڕی خۆم! ئومێدەوارم هەمیشە بە خۆت مشوری موڵکومالەکەت بخۆی، هەرچییەك لەم ماڵەدا هەیە بیخەیتە ژێر رکێفوچاودێری خۆت. بەڵام باشە کێ مەشخەڵت بۆ هەڵبگرێو پێشت بکەوێو رێگەت بۆ رۆشن بکاتەوە؟ خۆ تۆ گوتت ناتەوێ کارەکەرەکان بەمە بزانن! ئەگینا ئەوان رێگەیان بۆ رۆشن دەکردیتەوە".

تیلیماخۆسی هۆشمەند بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"ئەم پیاوە غەریبە لێرەیە، ئەو رێگەم بۆ رۆشن دەکاتەوە. هەرکەسێك نمەکی من بکات، لە خوانو جامی من بخواتوبخواتەوە، لە هەر کوێیەکەوە هاتبێ دەبێ کار بکات."

## ئودیسیوس و تیلیماخۆس چەکەکان تاقەت دەکەن

یوریکلیا، قەناعەتی بە قسەکانی تیلیماخۆس کرد. دەرگاکانی ماڵە گەورەکەی داخست. ئەوجا ئودیسیوسو کوڕە گەنجەکەی هەستان، بە پەلە کڵاوخودو مەتاڵە قوقزو نێزە نووك تیژەکانیان هەڵگرتو پالاس ئەتینا، بە مەشخەڵێکی زێڕینەوە کە رووناکیەکی بەشکۆو سامی پەخش دەکرد، پێشیان کەوت. ئەوسا تیلیماخۆس رووی کردە بابیولە پڕ گوتی:

"باوکە، من شتێکی سەیر دەبینم. لەسەرێ تا خوارێ هەموو شتێك، دیوارەکان، پایەو کۆڵەکەکان، کاریتە سنۆبەرەکان، ئەستونوکۆڵەکە بەرزەکان، هەر هەمووی لەبەر چاوما دەدرەوشێنەوە، دەڵێی تیشکی ئاگرێك دەبینم. هەبێو نەبێ خواوەندێك، لە خواوەندانی ئاسمان نشین بۆ ئێرە هاتووەتە خوارەوە".

ئودیسیوسی فاما وەڵامی دایەوە:

"بێدەنگ بە، زاری خۆت بگرە. هیچ پرسیارێك مەکە، ئەمە شێوازی کاری خواوەندانی ئولەمپ نشینە.ئێستا تۆ بڕۆ بخەوە، من لێرە دەمێنمەوە تا دەگەڵ کارەکەرەکانودایکتدا قسان بکەم. بێگومان دایکت ژێراوژێر بە پرسیاران دام دەگرێتەوە، نەهەقی نیە، چونکە خەمی یەکجار زۆری لە دڵبارە."

## تیلیماخۆس دەڕوات بخەوێ،
## وپنلوپی لە ژوورەکەی وەدەردەکەوێ

ئەوسا تیلیماخۆس، بە نێو هۆڵەکەدا، وبەبەر رووناکی مەشخەڵەکاندا، رۆیی بۆ ژووری نووستنەکەی خۆی، لەوێ لەسەر جێگاکەی، بە دەم چاوەڕوانی هەڵاتنی رۆژەوە، لێی راکشا. بەڵام ئودیسیوسی مەردەمێر لە هۆڵەکەدا مابووەوەو بیری لەوە دەکردەوە چۆن بە پشتیوانی ئەتینا، خوازگارەکان بکوژێت.

دوای ئەوە پنلوپی دوورئەندێش، ئاقڵوئاغر لە باڵەخانەکەی خۆیەوە هاتە خوارێ، لە تۆ وایە ئەرتەمیس یان ئەفرودێتی زێڕینە. لە نزیکی ئاگرەکەوە، هەمان کورسییان بۆ دانا، کە هەمیشە

لەسەری رۆدەنیشت، کورسییەك بوو کە بە عاج و زیو رازابووەوە، ئەم کورسیە دەستکردی وەستای دەسترەنگین ئیکمالیوس بوو، لە ژێرەوە تەپلەکێکی بۆ دروستکرد بوو تا پێی لەسەر دابنێ ،فەروەیەکی خورییان لەسەری دانا بوو، پنلوپی سەلاروسەنگین لە سەر ئەو کورسییە رۆنیشت.ئەوسا کارەکەران و هاودەمانی باسك چەرموو، لە ژووری خانمان هاتنەدەر، هەنگێ کەوتنە هەڵگرتنەوەی پاشماوەی نان وخوراك و سەر مێزەکان، لابردنی ئەو گلاس و جامانەی کە خوازگارەکان بادەیان پێ خواردبووەوە. ژیلەمۆو خۆڵەکەوەی نێو ئاورگەومەنقەڵەکانیان رشت، داروچڵ و چێوی تازەیان لە ئاورگەکان کرد، تا گڕی ئاگرەکە، ژوورەکە، هم گەرم و هەم رووناك بکاتەوە.

لێ میلانتو، هەمدیس بە تانەوتەشەرەوە رووی کردە ئودیسیوس وگوتی:

"کابرای بێگانە خۆ بە تەمانیت هەموو شەوەکەمان لێبکوژیت، تا بەیانی بەم ماڵەدا بسورێیتەوەو، ژنان کاربکەن و ماڵ پاك بکەنەوەو تۆ تەماشا بکەیت، و بزانی چ دەکەن و چ ناکەن؟ هەستە برۆ دەرێ، نانت خواردووەو بەسە، رابە هەر ئێستا وەدەرکەوە، ئەگینا بەم سەرەبزووتە تێت بەردەبم و فێرتدەکەم چۆن بچیتە دەرێ".

ئودیسیوسی مەزن، برۆی وێکهێنانەوەو مۆرەیەکی لێی کردوگوتی:

"خانمە باشەکەم، نازانم بۆچی ئەوەندە لە من پڕیت؟ هەر لەبەر ئەوەی چڵکن و چەپەڵم، شڕۆڵەو شەپڕێوم، دەست بە دەرگای ماڵانەوە دەنێم و دەرۆزەدەکەم؟ رووی نەبوونی و ناچاری رەش بێت کە ئەمەم پێدەکات، ئیدی ئەمە پیشەی هەموو گەدایان و لێقەوماوانە، ئیدی ئەمە رۆژگارە، منیش رۆژێ لە رۆژان لە ماڵێکی شاهانەدا، ناودارو سەربەرز دەژیام. دەوڵەمەندێکی گەورە بووم، هەر رێبوارێك، هەر گەدایەك رووی لێنابام، هەرکێیەك بوایەو هەر پێویستی وداوایەکی هەبووایە، دەستم بە روویەوە نەدەناو نائومێدم نەدەکرد. هێندەم خوڵام و نۆکەران هەبوو لە ژمارە نەدەهاتن، لە هیچم کەم نەبوو، ئەوەی لە ماڵە دەوڵەمەندانادا هەیەو، مایەی شۆرەت و ناوبانگە، لە ماڵی مندا بە زیادەوە هەبوو. لێ زیوسی کوڕی کرونوس گسکی لێدا، خستمیە سەر ساجی عەلی. ئیدی هەڵبەتە ئەوە ئیرادەو خواستی ئەو بووەو ئیرادەی ئەو رەتکردنەوەی نیە. جا تۆش بەوە مەنازە کە لە کارەکەروهاودەمەکانی دیکە تەڕ وبڕترو جوان وخشیك و ناسکتری و گوایە پایەت زیاترە، نا زۆر نزیکە رۆژێ لە رۆژان خانمی گەورەت لێت بچێ بە قیناو ترۆت بکات، یان ئودیسیوس بۆ زێدومەفتەنی خۆی بگەڕێتەوەو بە ماڵ ومنداڵی خۆی شادبێتەوە، هیچ دوور نییە! یان گریمان مردووەوجارێکی دیکە ناگەڕێتەوە، کوڕی هەیە. بەخۆت دەزانی تیلیماخۆس بە فەزڵی ئەپۆلۆ، چتۆ پیاوێکە. هیچ ژنێك لێرەدا نیە کە رەفتارێکی نا شایستە بکات و تیلیماخۆس هەستی پێنەکات و پێی نەزانێت، ئێستا منداڵەکەی جاران نییە."

## پنلوپی لە کارەکەرەکەی تورە دەبێت

پنلوپی دوورئەندێش، گوێی لەو قسانە بوو. رووی کردە کارەکەرەکەی و بە تورەیی گوتی:

"هەی دەمەوەری بێ شەرموحەیا. زۆر چاك ئاگام لە هەڵسوکەوتتە، ئەگەر من ژن بم ئەمەم لە بیر ناچێت، وئەم دڕکەت لە ژێر پێیان دەردێنم. نەخەڵەتابی لەسەر ئەم ئەتوارە ناشیرینەت برۆیت،و

سەر بخەیتە سەر ئەم قەلەندەرە. بە خۆت دەزانی کە من پێموتن دەچمە دەف ئەو کابرا غەریبەو سۆراخێکی مێردەکەمی لێدەکەم. کە بە خۆت دەزانی چەند پەرۆش‌وپەریشانی مێردەکەمم!".

دوای ئەوە رووی کردە یورینومی، سەرگەورەی کارەکەرەکان، وگوتی:

"یورینومی کورسییەك بێنەو فەرویەکی لەسەر راخە، تا ئەم غەریبە لەسەری دانیشێت‌و باسی خۆیم بۆ بکات‌و، وەڵامی پرسیارەکانم بداتەوە. دەمەوێ چەند پرسیارێکی لێبکەم."

## پنلوپی وئودیسیوس دەکەونە گفتوگۆیەکی خۆش

یورینـومی، یەکسـەر کورسـییەکی جـوان‌و رەونەقـداری هێنـا، لـە شـوێنی دیـاریکراو داینـا، فەرویەکی نەرمی لەسـەر راخسـت. ئەوسا ئودیسیوسـی مـەردەمێرو بـەردەبار لەسـەری رۆنیشـت. پنلوپی ئاقڵ‌و ئاغر رووی تێکردوگوتی:

"غـەریبۆ، گەرەکمـە پرسـیارێکت لێبکـەم، جـارێ تـۆ کێیت‌وکوێنـدەریت؟ دایـك‌و بابـت لـە کـوێن‌و کێن؟"

ئودیسیوسی جامێروچارەساز بەرسڤی دایەوەوگوتی:

"خانمەکـەم، لـەم دنیایـەدا، هـیچ کەسـێك نیـە بتـوانێ گلـەیی لـە تـۆ بکـات، یـان عـەیبێکت لـێ بدۆزێتەوە، شکۆو سەربەرزی‌و نێوبانگت گەییوەتە کەشکەلانی فەلەك. وەکو ناوبانگی سەرفرازی پاشایەکی بەشکۆ کە لە خواوەنـدان بترسێت، فـەرمانڕەوایی خـەڵکێکی زۆر بکـات، ودادپـەروەری پیـادەو پـاس بکـات. لـە سـایەی ئـەوا رەشـە خـاکی بـە پیـت، گـەنم‌و جۆودانەوێڵـە بەرهـەم دێـنێ، درەختـان لەبەر میوەو بەر دەشکێنەوە، مەڕو پـەزان زاوزێ دەکـەن، دەریـا ماسـیان لـە خـۆ دەگـرن، ئـەم هـەموو خێروبەرەکەتـە لـە سـایەی فـەرمانڕەوایی دادپـەروەرانـەی ئەودایـەو خـەڵکی لـە سـایەو سـەردەمی ئەودا شـادو بەختـەوەرن. جا مـن کـە ئێسـتا لـە ماڵەکـەی تـۆدام هـەموو پرسـیارێکم لـێ بکە، تەنیا پرسیاری زێدوداك‌و بـابم نـەبێت: ناچارم مەکـە یادگـارە ناخۆشـەکانم وەبیر بێنمـەوەو کـول‌و کۆڤـانم زیـاد مەکـە، مـن دەردو مەینـەتی زۆرم بەسـەر هـاتووە. مـاقولیش نییـە لـە مـاڵی کەسێکی دیکەدا هەمیشە چاوبە گریان‌و زار بـە ئاخ‌و ئوف ببینـرێم. خەم‌وکەسـەریش بـە وادەی خۆی. حەزیش ناکەم یەکێك لە کارەکەرەکانت یان خۆت، لە دڵی خۆدا گلـەییم لێبکـەن‌و بڵـێن ئـەم هەموو فرمێسك‌و گریانەی زادەی سەرخۆشییەو بادە کونی فرمێسکانی بـەرەڵلا کـردووە، بۆیـە وا بە کوڵ‌و دڵ دەگری."

پنلوپی سەلاروسەنگین، بەکاوەخۆ بەرسڤی دایەوەوگوتی:

ئـەی غـەریب، هەرچـی هەیبـەت‌و شـکۆیەکم هـەبوو، چ لـە جـوانی و چ لـە بـەژن‌و بـاڵا، ئـەو رۆژە خواوەندان لە منیان سەندەوە کە ئارگۆسییان، بە مێردەکەی منیشـەوە، سـواری کەشـتی بـوون، و بەرەو ئیلوس (تەروادە) رۆییشتن. ئاخ! خۆزیا ئـەم جامێرە دەگەڕایـەوەو دەیخسـتمەوە ژێـر بـاڵی خـۆی، هـەنگێ هەیبەت‌وشـکۆو سـەرفرازی‌ونێوبانگم زۆر زیـاتر دەبـوو. بـەڵام ئێسـتا، لـە دووری ئەو، بەشم هەر خەمە، وادیارە خواوەندێك ئەو هەموو خەم‌و بارەگرانەی لە من ناوە. ئـەوەتا هـەر هەموو ئەو گەورە پیاوانەی فەرمانڕەوایی دوڕگەێن– دولیخیوم‌و سـامی‌و زاکونتوسـی بێشـەلان‌و چغور،وتەنانەت ئەوانـەی ئیتاکـاو دەوروبەریشـی، هـەموو دەوروخـولم دەدەن، ودەیانـەوێ ناچـارم

بکەن شوو بە یەکێکیان بکەم، وبە ناهەق موڵك ومالّو سەروەت و سامانم، وێران دەکەن و بە فیڕۆ دەدەن. بۆیە هەموو شتێکم لەبەر چاوکەوتووە. دڵم لە هەموو شتێك تۆراوە: لە میوان، لە دەرۆزەکەرولێقەوماوان، لەو پەیامبەرو قاسیدانەی کە لە خزمەتی خەڵکیدان. هیچم لە بیر نەماوە، تەنیا ئودیسیوس نەبێت. خەریکە سوێم بۆی دەبێتەوە. جا ئەو خوازگارانە پێیان لێکردوومەتە کەوشەوەو گەرەکیانە زوو جوابیان لێبگێڕمەوە. منیش کە نامەوێ ئەم کارە سەربگرێ، ناچار دەبێ بیانوویەك بدۆزمەوەو دەستی دەستیان پێبکەم. هەوەڵجار یەکێك لە خواوەندەکان فریام کەوت و بیرۆکەیەکم بۆ هات کە دەزگایەکی گەورە لە ماڵەوە دامەزرێنم و بکەومە چنینی پارچەیەکی ناسك ودرێژو زۆر گەورە. ئیدی بەپەلە چووم بۆ لایان وگوتم:
"ئەی لاوان، ئەی خوازگارانی من، راستە ئێوە پەلەتانەو گەرەکتانە ئەم زەماوەندە زوو تەواو بێ. بەلاّم مادامێکی ئودیسیوسی جامێر مردووە، پەلەم لێمەکەن. تەونێکم دامەزراندووە، پارچەیەکم بە دەستەوەیە، با تەواوی بکەم، کارێك مەکەن ئەم تان وپۆیەم لێ خەسار ببێ. ئەم پارچەیەم بۆ کفنی لایرتیس-ی پاڵەوانە. کارێکی وەها مەکەن، کە ئەو رۆژەی ئەجەل بەرۆکی گرت و مالاّوایی لە ژیان کرد، کفنی نەبێت و ژنێکی ئاخایی ببینێ و بچێت لە ناو خەڵکیدا لۆمەی من بکات، بڵێ خەڵکینە ئەو پیاوە دەوڵەمەندە، ئەو هەموو رەنجەی دا، کەچی مردو پارچە کفنێکی پێ نەبڕا، لەشی بووکەکەی داڕزێ!".
کە ئەو قسانەم کرد، بە هەموو خۆپەسندییەکیانەوە دڵیان نەرم بوو. ئیدی بە درێژایی رۆژ کارم لەم پارچەیە دەکرد،وشەوان لەبەر رۆشنایی مەشخەلاّن، ئەوەی بە رۆژەوە دەمچنی، هەڵمدەوەشاندەوە. بەو جۆرە سێ دانە ساڵ، بەو فێڵە ئاخاییەکانم خەڵەتاند بێئەوەی پێبزانن یان هەست بە هیچ شتێك بکەن. بەلاّم ساڵی چوارەم، پاش ئەوەی رۆژان بوون بە هەفتە، هەفتە بوون بە مانگان، ومانگ بوون بە وەرزو ساڵ بەرەو کۆتایی چوو، هەر ئەم کارەکەرە بێ حەیاو شەرمانەی خۆم، چووبوون لای خوازگارەکان زمانیان لێدابووم، ئیدی لە پڕ هاتن بەسەرا کە من خەریکی هەڵوەشاندنەوەی کرەکەم بووم و دەستەکەم کەوتە روو. زۆریان سەرزەنشت کردم و توڕە بوون. بۆیە هیچ چارێکم نەما دەبوایە پارچەکە تەواو بکەم. جا ئێستا نازانم چۆن خۆم لەم زەماوەندە بدزمەوەو چ بیانوویەك بدۆزمەوەو دایك و بابم زۆرم لێدەکەن کە شوو بکەم. کوڕەکەم کە دەبینێ ئەو خەڵکە بە خوتو خۆڕایی و بە رۆژی روناك موڵك ومالّی وێران دەکەن، سەروەت و سامانی دەخۆن، بەنان و ئاوی ئەو دەژین و خەنجەر لە رەشکە کا دەدەن، زۆری لەبەر گرانە، تەواو بێتاقەت بووە.چونکە گەورە بووە، هەست بە هەموو شتێك دەکات، لە شتان حاڵییە. و توانای ئەوەی هەیە کاروباری موڵك ومالّی خۆی بەڕێوەبەرێ. و زیوس ئەوەندەی هۆش و فام داوەتێ کە پەی بە گەورەیی و خانەدانی ماڵباتەکەی خۆی بەرێت. جا ئێستا پێم بڵێ تۆ لە چ بنەماڵەیەکی و خەڵکی کوێی؟ بێگومان نە لە کونە دیوارەوە هاتوویتە دەرێ و نە لە کلۆری دار بەڕوویەکی ئەفسانەیی بوویت".

## ئودیسیوس خۆی لە باسی زێدوماڵبات دەدزێتەوە.

هەنگێ ئودیسیوسی فاماوچارەساز بەرسڤی دایەوەو گوتی:

ئەی ژنە سەلارو سەنگینەکەی ئودیسیوسی کوڕی لایرتیس، وادیارە سووری لەسەر ئەوەی بزانی من کێمو لە چ ماڵباتو بنەماڵەیەکم! کە وای لێهات، پێتی دەڵێم، هەرچەندە بەڕاستی بەوە دووچاری کولو کۆڤانێکی زیاتر لەوەم دەکەی کە ئێستا پێوەی دەتلێمەوە. چونکە هەمیشە هەروا بووە، خەڵکی دوورە وڵاتی میناکی من، ناچارە بەوڵاتاندا، وێڵ وسەرگەردان بگەڕێ، و گیرۆدەی هەزارو یەك دەردە سەرو گیروگرفتان دەبێت. بەڵام وێڕای هەموو ئەمەش بەرسڤی پرسیارەکانت دەدەمەوە. وڵاتێك هەیە بە نێوی کریت، ئەم وڵاتە کەوتووەتە ناوجەرگەی دەریاوە. زۆر جوان، بە پیتو بەرەکەتو بەبڕشتە، ئاو دەوری داوە، خەڵکەکەی هێندە زۆرن لە ژمارە نایەن، نەوەد شاری تیایە. خەڵکەکەی بە یەك زمان ناپەیڤن. بەڵکو بە چەند زمانێکی تێکەڵ قسان دەکەن. چونکە ئاخاییان، وئیتو کریتیانی دلۆڤانو دڵاوا، ودوریانی جامێرو دلاوەر کە سێ تیرەن، وپیلاسجینان لەوێندەر ئاکنجین. یەکێك لەو شارانە کنوسوسە، شارێکی گەورەیە، مینوسی هاودەمو هاوڕازی زیوسی مەزن لە تەمەنی نۆ ساڵیدا فەرمانڕەوایی ئەم شارەی دەکرد. مینوس بابی دیوکالیون بوو، دیوکالیون-ی دڵاواش بابی من بوو. دیوکالیون، جگە لە من کوڕێکی دیکەی هەبوو بە نێوی ئیدومینیوس. ئیدومینیوس بە کەشتییە خۆشڕۆکانی، لەگەڵ کوڕانی ئەتریوسدا ڕۆیی بۆ ئیلوس. بەڵام من لە ئیدومینیوس بچووکتر بووم، ناوێکی خۆشو بە شکۆم هەبوو: ئیتون. ئیدومینیوس لە من گەورەترو ئازاتر بوو. جا من لە کریت ئودیسیوس-م بینیو میوانداریم کردو دیاریو پێشکەشییانم دایە. ئەوەی ڕاستی بێ، کە بەرەو تەروادە دەڕۆیی زریانوگژەبا لە (مالیا)وە بەرەو کریتی ڕاماڵی بوو: ئیدی کەشتییەکانی لە ئەمنیسوس، لەبەر ئەشکەوتی ئیلیتویادا، کە یەجگار سەختودژوارە، ڕاگرتبوو، بە گوێپچڕ گوێپچڕ لەو تۆفو زریانە خۆی دەربازکردبوو. کە گەیێ بووە شار یەکسەر پرسیاری ئیدومینیوسی کردبوو،و گوتبووی دۆستو ئاشنای نزیکیەتی. بەڵام کە ئەو هات، ئیدومینیوس دە- دوانزە ڕۆژ بوو، بە خۆو کەشتییە تیژڕۆکانیەوە بەرەو ئیلۆس ڕۆیی بوو. ئیدی من " ئودیسیوس"م بۆ ماڵی خۆمان بردەوەو پێشوازییەکی گەرمو گوڕو دۆستانەم کرد. ئاخر ماڵێکی گەورەو دەوڵەمەندانەمان هەبوو، ئیدی خۆیو هەموو هاوڕێکانم دامەزراند، خزمەتێکی زۆرمان کردن هەموو پێویستییەکی میوانداریمان کۆکردەوە: لە ئارد، بادەی ئاڵو گای قوربانی، و پێشکەشمان کردن. ئیدی ئەو ئاخاییە جوامێرانە دوازدە ڕۆژی تەواو لە ماڵی ئێمە مانەوە، چونکە گژەباو زریان ڕێی نە دەدان، بڕۆن. باو زریانەکەی هێندە بە قوەت بوو، پیاو خۆی بە پێوە نەدەگرت، بێگومان ئەم زریانو گژەبایە غەزەبی خواوەندێك بوو. ئیدی لە ڕۆژی سێزدەیەمدا، زریانو گژەبایەکە نیشتەوەو ئەوانیش سواری کەشتی بوونوڕۆییشتن."

## پنلوپی لە حەژمەتاندا دەست بە گریان دەکات

ئودیسیوس درۆیەکی زۆری بۆ هەڵڕشت. بەڵام درۆکانی هێندە بەجێو ڕێ بوون، ئەگەر حەقیقەتیش بوایەن هەر ئەوەندە کاریان لە دڵو دەروونی دەکرد. بەدەم گوێگرتنەوە رونڪ زایە

چاوانی و بەسەر رورمەتیا جۆگەلەی بەست. وەکو چۆن با بەفری لوتکەی کۆساران دەتوێنێتەوەو بەرەو روباران جۆگەلە دەبەستێ و ئاوی روبارەکان هەڵدەستێ و سەرریژ دەبێت، بەو ئاوایە پنلۆپی فرمێسکی حەسرەتی بۆ دووری مێردەکەی دەڕشت. بۆ مێردێك كە لە هەنبەریا رۆنیشتبوو. ئودیسیوس كە گریانی ژنەكەی بینی، لە ناخا زۆری دڵ پێ سووتا، بەڵام بۆ ئەوەی نەخشەكەی پوچەڵ نەبێتەوە، چاوانی وەك ئەوەی ئاسن بن، زەق تێبڕیو نەیهێشت فرمێسكیان تێ بزێ.

كاتێ پنلوپی لە گریان تێربوو، كەمێك ئاسوودە بوو،گوتی:

"جا ئێستا، كاكی رێبوار، دەمەوێ تۆ تاقی بكەمەوە، وبزانم وەكو خۆت دەڵێی، بەڕاستی لە ماڵی خۆتا میوانداری مێردەكەمو هاوڕێ جامێرەكانیت كردووە. پێم بڵێ كە چ جلێكی لە بەردا بوو، چۆن پیاوێك بوو، هاوڕێكانی چۆن بوون؟"

## ئودیسیوس، چەند نیشانەیەكی دروست بە پنلوپی دەڵێت.

هەنگینێ، ئودیسیوسی فاماوچارەساز بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"خانمەكەم، زۆر ئەستەمە بتوانم، بە وردیو دروستی وەڵامی پرسیارەكەت بدەمەوەو دڵت خۆشبكەم، چونكە ئەمەی من باسی دەكەم زۆر لە مێژە، بیست ساڵێك دەبێت كە ئەو پیاوە لەلای ئێمەوە رۆیی. بەڵام هەوڵدەدەم ئەوەندەی لە یادوبیرم مابێ پێتی بڵێم. ئودیسیوسی مەردەمێر، عەبایەكی دەستچنی دوو بادی خوری نەرمو ناسكی ئەرخەوانی لەبەر بوو. بە ئاوزونەیەكی زێڕ كە دوو كونی تێدا بوو دادەخرا. بەڕاستی توحفەیەكی سەیر بوو: نیگاری تاژیەكی لەسەر نەخشێنرا بوو، كە بە هەردوو دەستان مامزێكی گرتبوو،ودەمی تێژەند بوو، ودەیویست خەفەی بكات، ومامزەكەش لە هەوڵو لەقەفرتێی ئەوەدا بوو خۆی دەرباز بكاتو، برەڤێ. ئێستاش لە یادمە كە ئودیسیوس كراسێكی بریقەداری بەدەن چەسپی لەبەردا بوو. هێندە نەرمو ناسكو تەنك بوو، لە توێكڵی پیازی وشك دەچوو، ومیناكی هەتاو دەدرەوشایەوە: ژنان هەموو حەیرانو ئەبڵەق تەماشایان دەكرد. بەڵام قسەیەكی دیكەشت پێ دەڵێم، حەزدەكەم باش گوێم لێبگریت: نازانم ئودیسیوس كاتی خۆی، لێرە، لەم ماڵەی خۆیدا هەمان ئەو جلوبەرگانەی لەبەر بووە، یان كە بە سواری كەشتی بەڕێ كەوتوون، هاوڕێیەكی ئەو جلانەی داوەتێ، یان لەوەیە خانەخوێیەكی ئەو جلانەی دابێتێ، چونكە ئودیسیوس پیاوێكی خۆشەویست بوو، لە ناو ئاخاییەكان كەم وێنە بوو. من بە خۆم شمشێرێكی برونز، عەبایەكی دوو بادی ناسكی یەكجار جوان، كراسێكی هاودامانم پێشكەش كرد. ئەوسا زۆر بە رێزوحورمەتەوە تا سەر كەشتییە روختەو مكومەكەی لەگەڵی چوومو رەوانم كرد. هەروەها با ئەوەشت پێبڵێم كە خزمەتكارێكی دەگەڵ بوو، تۆزێ لە خۆی گەورەتر بوو، ئێستا پێت دەڵێم چۆن پیاوێك بوو: پیاوێكی رەشتاڵەی، قژنی، قژلوولی شانو شەپیلك تۆزێ خوار بوو، نێوی یوریباتیس بوو. ئودیسیوس پتر لە هەموو هاوڕێكانی دیكەی، رێزی دەگرت، چونكە لە بیروبیركردنەوەو بەردەباریدا زۆر لێكدی دەچوون."

## ئودیسیوس تکا له پنلوپی دەکات که نەگری.

بـەو قسـەو بەڵگـە دروسـت و بـیٚ چـەندو چـوونانەی ئودیسـیوس، وەك دەمبـێن لـە گـۆزەی سـەرەونخون هـەڵگرن، کـونی فرمێسـکانی پنلـوپ بـەرەڵلا بـوو، وگریـا ئـەمما گریـان. کـه جۆشـی گریانی نیشتەوە، رووی تێکردوگوتی:

"ئەی میوان هەرچەندە تا ئێستاش لێرەدا، لەم ماڵەدا مایەی رێز بوویت، بەڵام له ئێستا بە دواوە پتر رێزت دەگرم، چونکه تۆ پیاوێکی راستگۆیت، ئەو عەبایەی که بەو وردییە باسی دەکەیت، من به خۆم دابوومیٚ، چووم له عەمارەکە دەرمهێنا، بە دەستی خۆم قەدم کرد، ئەو ئاوزوون و گیرە زێرەم بۆ جوانی لێدا بوو. سەد حەیف و مەخابن! جارێکی دی لە ماڵەکەی خۆیدا نای بینمەوە. بەڕاستی قەدەروچارەنووسێکی شووم ئەوی بەرەو ئیلوسی مەڵبەندی نەگبەتی و بەدبەختی، کە ناوەکەشی مایەی نەفرەت و بێزارییە، راپێچا."

ئودیسیوسی دووربین و بەردەبار وەڵامی دایەوەو گوتی:

"خانمەکەم، ئەی ژنـە سـەلارو سـەنگینەکەی ئودیسیوسـی کـوڕی لایـرتیس، لـەوەی پـتر رووی جوانی خۆت مەشێوێنە، لەوەی زیاتر فرمێسك بۆ مێردەکەت مەڕێژەو دڵی خۆت بە کول و کۆڤان مەتوێنـەوە. هەڵبەتـە مـن ناهـەقت نـاگرم، چونکە تـۆ یەکـەم ژن نیت کـە بـۆ مێـردی ئـازیزی خـۆی دەگری. هەر ژنێك له ئەنجامی ئاشقێنی وهەڤخەوی دا، منداڵی له مێردەکەی ببیٚ، با ئـەو مێـردەی زۆر لـە (ئودیسـیوس)کـە دەڵـێن وەکـو خواوەنـد وابـووە، کـەمتریش بـیٚ، هـەر خەفـەت بـۆ نـەمانی دەخوات و بۆیشی دەگریٚ. نا، من ناهەقت ناگرم، بەڵام داوات لێدەکەم لـەوەی پـتر مـەگری، و گـویٚ له من بگرە، هەرچیم پیٚ بێت دەربارەی ئودیسیوس بۆتی دەگێڕمـەوە، هـەر هـەموو شتێکت پـیٚ دەڵێم، هیچت لێنا شارمەوە. ئەوەی من دەربارەی ئودیسیوس بیستوومە ئەمەیە کە بـەم زووانـە دەگەڕێتـەوە. زۆر لێـرەوە نزیکـە، حـاڵی حـازر لـە خـاکی ئـاواو ئـاوەدان، و بەفـەڕو بەرەکـەتی تیسـپروتیانە، لـە ژیاندایـەو دنیایـەك دیـاری و پێشـکەش و گـەنجی گرانبـەهای لـە خـەڵکی کۆکردووەتەوەو بۆ ئێوەی دێنێتەوە. بەڵام کەشتییە گەورەکەی و هەر هەموو هاوڕیٚ دڵسۆزەکانی لە دەست داوە، وەختیٚ بە دوڕگەی ترینـاکیادا تـیٚ پـەڕیون، هـەر هـەموویان لـە دەریـادا خنکـاون، زیـوس و هیلیـوس لێیـان چـوون بـە قینـاو غـەوری غـەزەبیان کـردوون: چـونکه هاوڕێکـانی ئودیسیوس گاوگۆتاڵی هیلیوسیان کوشتووەتەوە، بۆیـە هـەر هـەموویان لـە دەریـای پـڕ شـەپۆڵ و گێژەنگ وگێـژاودا غـەرق بوون وخنکـاون. بـەڵام ئودیسـیوس، خـۆی بـە بنکـی کەشـتییەکەیەوە بەڵواسـیوە، و شـەپۆلی دەریـا رایـان مـاڵیوەو گەیاندویانەتـە کـەنارو لـە خـاکی فیاسـیانی تـوخم و تـۆوی خواوەنـدان دا گیرسـاوەتەوە. ئیـدی مینـاکی خواوەنـدێك پێشـوازیان کـردووەو رێـزو حورمەتیان گرتووە، دیاری و سەوقاتی فرەیان پێشکەش کردووە، خۆبەخش ویستوویانە بەگەڵی بکەون و بە سەلامەتی بیگەیەننەوە ماڵ و مەفتەنی خۆی. جا ئودیسیوس ئەگـەر خـۆی بیویسـتایە ئێستا لە مێژ بوو لێرە بوو. بـەڵام ئیدی لـە دڵـی خۆیـداو بـە حیکمـەتی خـۆی کـە لـە فامیـدەیی و بەردەباری و چارەسازیدا، پیاوێکی بیٚ هاوتایەو کـەس نییـە لـەو رووەوە بـە بـای قوڵانیـدا بگـات، وای بـە بـاش زانیـوە بـە وڵاتانـدا بگـەڕیٚ و سـەروەت و سـامانێکی فـرە کـۆ بکاتـەوەو ئەوسـا

بگەڕێتەوە. جا من هەموو ئەم زانیاریانەم لە فایدون، پاشاو سەرداری تیسپروتیان بیستووەو لە ماڵەکەی خۆیداو بەدەم نۆشخواریەوە سوێندی بۆ خواردم کە کەشتییەك لە دەریادایە، بە دەریاوانانەوە حازرو ئامادەیە، کە ئودیسیوس بگەیەنێتەوە زاگەو وڵاتی خۆی. بەڵام منی لە پێش ئەودا رەوانە کرد، چونکە بە رێکەوت کەشتییەکی تیسپروتانەکان بەرەو دولیخیوم، مەڵبەندی گەنمو دانەوێڵە بەڕێوەبوو. هەر هەموو ئەو سەروەت وسامانەشی نیشاندام کە ئودیسیوس کۆی کردبووەوە. هێندە زۆر بوو هێندە زۆر بوو بەشی دەپشتی ماڵبات و زۆرپەتی ئودیسیوسی دەکرد. بەڵام پاشای ناقیری گوتی کە ئودیسیوس بۆ پەرستگەی ددونا رۆییوە، تا دەنگی زیوس لەدار بەڕووە بەرزە، قژنو پڕ لق و پۆپەکەی ئەوێندەرەوە بژنەویۆ بزانێت کە ئیرادەی زیوس بە چیە، ئایا دوای ئەو هەموو ئاوارەیی و دەربەدەری و دوورە وڵاتیە بە ئاشکرا بۆ زاگەو نیشتمانی خۆی بگەڕێتەوە یان بە نهێنی.

جا وەکو پێم گوتیت، دڵنیابە کە سەلامەتەو بەو زووانە دێتەوە. لەوەی پتر لە وڵات وکەسوکارو دۆستانی دوور نابێت. جا من بە زیوس-ی پایەبەرزی هەرە توانا، بەم نان و نمەکەی ئودیسیوس، بەم وەجاغ وکوانگەی رێم تێی کەوتووە، سوێندت بۆ دەخۆم ئەوەی پێم گوتیت: وەکو خۆی، موو بە موو دێتە دی. لەم ساڵەدا ئۆدیسیۆس دەگاتەوە ئێرە، هەرکە ئەم مانگە تەواو بێ، ومانگی تازە دەست پێبکاتەوە، سەر هەڵدەداو پەیدا دەبێت."

هەنگێ پنلوپی فامیدە بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"ئاه، ئەی غەریب، هانام بە دەمت، خواوەندان لە زارت بنۆڕن، بریا ئەم قسانەی تۆ دەهاتنە دی. ئەوسا پەی بەڕاستگۆیی من دەبەیت، وهێندەت دیاری و سەوقاتان دەدەمێ، هەرکەسێك بتبینێ باوەڕ بە چاوی خۆی نەکات، بەغیلی بە بەخت و تالحت بەرێ. بەڵام دڵی من دەڵێت ئودیسیوس جارێکی دی بۆ ئەم ماڵە ناگەڕێتەوە. تۆش کەست دەست ناکەوێ کە لێرەوە بتبنێرێتەوەو بە سەلامەتی بتگەیەنێتەوە وڵاتی خۆت. چونکە ئەوانەی ئەمڕۆ لەم ماڵەدا خاوەن فەرمان و فەرمانڕەوان، لە پیاوەتی و شەهامەتدا، لە میوانپەروەری، و پێشوازی و بەڕێکردنەوەی میواندا ناگەن بە تۆزی پێی ئودیسیوسدا. رۆیی، ئودیسیوسێکی تر نابێتەوە. بە هەرحاڵ، با واز لەمە بێنین، ئادەی کارەکەرینە وەرن، ئەم پیاوە بەرن، پاك وخاوێن لاق و لەتەری بشۆن، تەختەخەوێکی بە مافورو دۆشەك و چەرچەف نەرمو خاوێن بۆ ئامادە بکەن، تا گەرمی ببێتەوەو شەوی بە ئارامی تیا رۆژ بکاتەوە. وسپێدە کە رۆژهەڵات دووبارە بیشۆن و عەترو گوڵاو پرژێنی بکەن. تاکو لە ماڵی ئێمەداو دەگەڵ تیلیماخۆسدا قاوەڵتی بکات و تێشت بخوات. خوام لەو خوایە هەر یەکێك لە میوانەکان بە ناهەق دڵی ئەم پیاوە برەنجێنێ و روحی ئازار بدات، ئیدی چەند تورە دەبێت لێرە جێی نابێتەوەوگلەیی لەسەر خۆی. جا ئەی غەریب! تۆ چۆن بۆت بە دیار دەکەوێ کە من لە هەڤپەروەری و فامیدەیی دا لە ژنانی دی زیاترم، ئەگەر لەم ماڵەدا، بە چڵکنی وپڵکنی و شڕوشەپڕێوی و بێ پشت و پشتیوان لەسەر خوان دانیشیت؟ تەمەنی بەشەر کورتە. جا ئەگەر کەسێك زبرو دڵڕەق بێ ولە هەنبەر خەڵکیدا بەدکردەوە بێت، تا لە ژیانا بێ هەمووخەڵکی نەفرەتی لێدەکەن، دەیکورهێنن، وخوا خوایانە رۆژێ زووتر بمرێت و بە خراپە باسی دەکەن.

بەلام ئەو کەسەی خاوەنی دڵو دەرونێکی باش بێت، مایەی گلەیی نەبێت، بیری ناڕەوای نەبێت، بێگانانو غەریبان لە وڵاتانو لە نێو خەڵکیدا بە چاکە ناوی دەبەنو دوعای خێری بۆ دەکەنو دەڵێن: پیاوێکی چاکەکارو پیاوانەیە."

## ئۆدیسیوس مەرجی بۆ دادەنێ

ئەوسا ئۆدیسیوسی فاماو سالۆر بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"ئەی هاوسەری ئۆدیسیوسی کوڕی لایرتیس، ئەی خانمە سەرفرازوسالۆرو سەنگینەکە، راستت دەوێ لەو رۆژەوە کە بە کەشتییە خۆشڕۆکانمەوە، چیا بەرزە بەفرگرتووەکانی (کریت)م بە جێ هێشتووە خەوی ناو نوێنی گەرمو نەرمم لەبەر چاوکەوتووەو حەزی لێناکەم. نا، دەمەوێ وەکو شەوانی پێشوو بخەوم، شەوانێکی یەکجار زۆرم لە ناو نوێنی چڵکنو پڵکندا، بە خەو زڕاوی، بە دەم چاوەڕوانی ئەوەوە کە سپێدە لە کەژاوەی زێڕینەوە سەر دەربێنێ، رۆژ کردووەتەوە. سەبارەت بە شۆردنی لاقو پێم، بەڕاستی من حەزی لێناکەم، قەبوڵ ناکەم هیچ یەکێك لەم کارەکەرو کەنیزانەی لە ماڵەکەی تۆدان دەستیان بەر لاقم بکەوێ، قەیدی نیە ئەگەر پیرەژنێك-ی فامیدەو سڕقایمو نهێنی پارێز هەبێتو لە ناخدا هەمان رەنجو ئازاری منی کێشا بێتو چەشتبێ، ئەگەر پیرەژنێکی وا هەیە، رازی دەبم لاقم بشوات."

## پنلوپی فەرمان بە یوریکلیا دەدات لاقی کابرای غەریب بشوات

پنلوپی سالۆر بەرسڤی دایەوەوگوتی:

"ئەی غەریبی بەڕێز، من لەم ماڵەی خۆمدا پێشوازیو خێرهاتنی زۆر میوانم کردووە کە لە وڵاتانی دوورەوە هاتوونو رێیان کەوتووەتە ئێرەو خەڵکی بەڕێزوحورمەت بوون، بەلام کەسیان بە ئەندازەی تۆ هوشیار نەبووە: قسەکانت بەجێو ئاقڵانەیە. ئێمە لێرە پیرەژنێکی زۆر دڵپاکو ژیرو مەندمان هەیە، ئەو بەدبەختە کە مێردی شیرداوەو سەرپەرشتیو پەروەردەی کردووە. ئەو رۆژەی لە دایکی بەر بووەوە، ئەو یەکەم کەس بوو کە لە باوەشی گرت. ئەو پیرەژنە، هەرچەندە زۆر پیرو بێ توانایە، لاقت دەشوات..." بانگی کرد: "ئەی یوریکلیا، خێرا وەرە بۆ ئێرە. هەڕە، لاقی ئەم پیاوە، کە لە تەمەنی ئاغاتدایە بشۆ. هەڵبەتە ئێستا دەستولاقی (ئۆدیسیوس)ش وەکو دەستو لاقی ئەمی لێهاتووە، چونکە مەینەتیودەربەدەری پیاو زوو پیر دەکاتو دەی پوکێنێتەوەودەیگۆڕێ."

## یوریکلیا فەرمانی خانم جێ بە جێدەکات

کە پنلۆپی ئەو قسانەی کرد، یوریکلیا هەردوو دەستی بە دەموچاوییەوە گرت. بەدەم روندکی گەرمو گوڕەوە، بە سۆزوگریانەوە، گوتی: "سەد حەیفومخابن، ئەی کوڕە ئازیزەکەم، کە ناتوانم هیچت بۆ بکەم. بەڕاستی ئەوەی زیوس بە تۆی کرد، بەکەسی تری نەکردووە، بە تۆی لە خوا ترس. تا ئێستا هیچ بەنی بەشەرێك بە ئەندازەی تۆ رێزی زیوسی چەخماخەوانی نەگرتووەو هێندەی تۆ رانە گۆشتی قەڵەوی لە رای ئەودا نەکردووە بە خێروسەدەقە، هێندەی تۆ قوربانی گەورەو (قوربانی سەدینە)ی پێشکەش نەکردووە، هەموو داوایەکت لێی ئەوە بوو کە تەمەن

مەودات بدات، بگەیتە پیری و کوڕە سەرفرازەکەت پەروەردە بکەیت و پێی بگەیەنیت. کەچی ئەوەتا تەنیا تۆ گیرت خواردووە، بێ سەروشوێن، بۆ وڵاتی خۆت نەگەڕاویتەوە! جا من دڵنیام کە قەرەواش و کارەکەرانی ئەو ماڵە گەورانەی کە ئودیسیوس بە دەربەدەری و ئاوارەیی رێی تێیان کەوتووە، گاڵتەیان پێکردووە، تانەو تەشەریان لێداوە، وەکو چۆن هەموو ئەم کارەکەرە بێ شەرم و حەیایانە لێرە گاڵتە بە تۆ دەکەن. ناهەقت ناگرم کە رازی نیت ئەوانە لاقت بشۆن، چونکە دەتەوێ لە تانەو تەشەریان بەدوور بیت. بەڵام گوێ مەدەیە، من لەبەر خاتری کیژەکەی ئیکاروس، پنلۆپی فامیدەو ئاقڵ و ئاغر، ولەبەر خاتری خۆت لاقت بە شانازییەوە دەشۆم. چونکە هەر خەمبار، بە خەمی خەمبار دەزانێت. من خۆم دەزانم چ خەمێکم لە دڵبارە. جا ئێستا گوێ بگرە، بزانە چیت پێدەڵێم: تا ئێستا خەڵکانێکی زۆر لە لێقەوماوان و دەربەدەران هاتوونەتە ئێرە، بەڵام کەسیانم نەبینی بە ئەندازەی تۆ، لە رووی شێوەو روخسار، قەدوباڵا، دەنگ و دەست و لاقەوە، لە ئودیسیوس بچێت."

ئودیسیوسی سالۆر بەرسڤی دایەوەوگوتی:

"تا ئێستا هەر کەسێك هەردووکمانی بینی بێ، گوتوویەتی کە من و ئودیسیوس زۆر لە یەکتر دەچین، هەر دەڵێی سێوێکین و کراوین بە دوو لەتەوە. وادیارە تۆش هەستت بەمە کردووە."

## یوریکلیا لایەنێکی منداڵیەتی ئودیسیوس دەگێڕێتەوە

دوای ئەوە پیرەژنن تەشتێکی خاوێنی بریقەداری هێنا، پڕی کرد لە ئاوی ساردو گەرم. ئودیسیوس لە پاڵ ئاورگەکەدا رۆنیشت، بەڵام لە پڕ رووی بەرەو تاریکییەکە وەرگێڕا. چونکە لەناکاودا ئەوەی بە بیرا هات کە نەبادا پیرەژن بە دەم شۆردنی قاچییەوە دەستی بەر شوێنی کۆنە برینەکەی قاچی بکەوێ و بیدینێ و بیناسێتەوەو ریسەکەی لێ ببێتەوە بە خوری. بە هەر حاڵ پیرەژن نزیك بووەوەو دەستی بە شۆردنی قاچی ئاغای کرد. یەکسەر جێی کۆنە زامەکەی ناسییەوە. ئەمە کاتی خۆی کە چوو بوو بۆ دەڤەری پارناسوس، بۆ سەردانی ئوتولیکوس و کوڕەکانی، بەرازێکی شفرە سپی پەلاماری دابوو، وقاچی بریندار کردبوو، کە ساڕێژش بوو بووەوە شوێنەکەی هەر مابوو. ئوتولیکوس باوکی دایکی ئودیسیوس بوو، ئوتولیکوس بە رێگری و چەتەیی و پەیمانشکێنی بەنێوبانگ بوو، کەس لەو رووەوە بەبای قولانیدا نەدەگەیی. هیرمیس بە خۆی ئەو بەهرەو توانایەی دابوویە. چونکە رانە گیسك و بەرخی چەورو قەڵەوی بۆ دەکردە قوربانی. ئیدی هیرمیس-ش لە چاکەی ئەوەدا بوو بوو بەدۆستی نزیکی. جارێك ئوتولیکوس دێت بۆ ئیتاکای ئاواو ئاوەدان، بۆ ناو خەڵکی دەوڵەمەندو زەنگینی ئەوێندەر، کاتێ کە لە شێو کردن بووەوە، یوریکلیا مەلۆتکەیەکی ساوای هێناوخستییە کۆشییەوەو گوتی:

"ئەی ئوتولیکوس! ئەمە کوڕی کیژەکەتە، فەرموو بە دڵی خۆت ناوێکی خۆشی لێبنە. چونکە دەزانم دەمێکە چاوەڕوانی ئەم رۆژە بوویت."

ئوتولیکوس بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"ئەی زاواکەم،و ئەی کیژەکەم، من ناوێکتان پێدەڵێم، و ئێوەش ئەو ناوەی لێبنەن. من کە هاتووم بۆ ئێرە لە خەڵکانێکی زۆری ئەم سەر زەمینە، ئەم دایکە دلۆڤان و میهرەبانە، چ پیاوان و چ ژنان

تورەو بێزارم، بەڕاستی خەڵکانێکی سپڵەو پێ نەزان و درێوو رەفتارن، جا پێویستە بەو بۆنەیەوە ناوی ئەم منداڵە ئودیسیوس، (واتە منداڵی غەزەب) بێت، جا کە گەورە بوو، وهات بۆ چیاو مەڵبەندی پارناسوس، بۆ سەردانی ماڵبات و کەسوکاری دایکی، کە موڵك و ماڵی منی لێیە، منیش دیاریو سەوقاتیەکی زۆری دەدەمێو بە دەستی پڕو باری سەنگین ودڵی خۆشەوە دەینێرمەوە."

جا ئودیسیوس بۆ ئەوێندەر چوو بوو تا ئوتولیکوس، باپیری، دیاریو سەوقاتی توحفەو نایابی بداتێ. ئوتولیکوس وکوڕەکانی بەگەرمی پێشوازیان کردبوو، لە هەمێزیان گرتبوو، وئەمفیتیا، دایکی دایکی، ئودیسیوسی لە هەمێز گرتبوو، دەستی لە مل کردبوو، سەریوچاوە جوانەکانی ماچ کردبوو. ئوتولیکوس ئەمری بە کوڕە رەسەنەکانی کردبوو خواردن ئامادە بکەن، فەرمانیان جێبەجێ کرد. یەکسەر گایەکی پێنج ساڵەیان هێنا کوشتیانەوەو کەوڵیان کردو پاکیان کردەوە، چوار پەلیان بڕیو. پاش ئەوە گۆشتەکەیان پارچە پارچەکردو جنیان. لە شیشیان داو زۆر وەستایانە برژاندیان ئەوسا بە یەکسانی بەسەر هەمووان‌دا بەشیان کرد. ئیدی ئەو رۆژەیان تا ئێواریێ لە ماڵەوەدا بە بەزموخۆشیو خواردنەوە بەسەر برد،و کەس گلەیی لە بەشی خۆی نەبوو. کاتێ خۆر ئاوا بوو، تاریکی باڵی بەسەر دنیادا کێشا، چوونە جێگاوە، پاڵکەوتن و خەو، ئەو نیعمەتە خۆشە، بردنییەوە.

کاتێ کە سپێدە بەیانی دا، کوڕانی ئوتولیکۆس بەخۆو تاژیانەوە بۆ راو رۆییشتن، و ئودیسیوسی جامێریش بە گەڵیان کەوت. بە چیای بەرزو چڕە دارستانی پارناسوس دا هەڵگەڕان، زۆر زوو گەییشتنە دۆڵە باگرەکانی پارناسوس. لەم کاتەدا خۆر، کە لە قوڵایی بەستێنی هێمن و هێدی ئوقیانووسەوە دەرکەوتبوو، تیشکی زێڕینی خۆی بەسەر دەشت ودەرو کێڵگەو مەزراکاندا پەخش دەکردەوە. راوچییەکان گەییشتنە دۆڵێك، تاژیەکان کەوتبوونە پێشەوەو بۆنیان بە عاردییەوە دەکردو تاقیبی نێچیریان دەکرد، کوڕانی ئوتولیکوس لە دوای تاژییەکانەوە دەهاتن، ئودیسیوسی رەسەنزادەش لە ناوەندیانەوەو لە نزیکی تاژییەکانەوە رێی دەکرد، نێزەیەکی درێژی بە دەستەوە بوو. بەڵێ، لە وێدا لە بێشەیەکی چڕوردا بەرازێکی گەورە خەوتبوو. بێشەکە هێندە چڕوچڕورد بوو، تەنانەت بای سەرکێشی شێدارو بارانی بە لێزمەو خوڕیش نەی دەبڕین وتیشکی هەتاویش نەیدەگەییشتێو نەی دەبڕی، چونکە یەجگار چڕ بوو، و لەبەر بارستایی گەڵای رژاو ئەرزەکەی دیار نەبوو. بەرازەکە گوێی لە دەنگی پێی راوچییەکان و هەڵبەزودابەزی تاژیەکان بوو. لە لانەکەی هاتەدەر، مووی لەشی رەپ راوەستابوو، و ئاور لە چاوانی دەباری. چەند هەنگاوێك لە دووری ئەوان، بێ جووڵەو رەق راوەستا. ئودیسیوس لە پێش هەمووانەوە، نێزە بەدەست، بە قەستی کوشت پەلاماری ئەو دڕندەیەی دا، بەڵام بەرازەکە خێراتر بوو، خۆی پێدا داو شەبەقی زامێکی گەورەی کردە سەرووی زرانی، بەڵام باش بوو نەگەییە ئێسقان. بەڵام وێڕای ئەوەش ئودیسیوس هەر دەستبەردار نەبوو،ونێزەکەی بەر شانی راستی کەوت و دیواودەر کونی کرد. بەرازەکە کەوتە سەر عاردیو بەدەم بۆڕاندنەوە گیانی دەرچوو. کوڕانی سەربەرزی ئوتولیکوس کەمێك خەریکی لاشەی بەرازەکە بوون، وئەوسا بە

پەرۆشـەوە دەوری ئودیسیوسـی خواوەنـد ئاسـایان دا، بەوپـەڕی دڵسـۆزیو زۆر بـە جـوانی و وەسـتایانە زامەکـەی ئودیسیوسـیان تیمـار کـرد. هەنـدێ وێـردی جادووییـان بەسـەرا خوێنـد، خوێنەکەی وەستایەوە. بەستیان. ئەوسا بە پەلە بۆ ماڵی بابە ئازیزەکەیان گەڕانەوە.پاش ئەوەی ئوتولیکـوس وکوڕەکـانی تیماریـان کـردو بـە تـەواوەتی چاك بـووەوە، هـەنگێ کۆمـەڵێك دیـاریو پێشکەشـی توحفـەو نایابیـان دایـێو بـە پەلـەو بـە دڵخۆشییەوە بـۆ وڵاتـی خـۆی، بـۆ ئیتاکایـان ناردەوە. بـابو دایکـە سـەرفرازەکەی بە گەڕانـەوەی ئـەو زۆر خۆشـحاڵ بـوون. پرسـیاریان لێکـرد چۆن بریندار بووەو چ ئازارێکی چەشتووە. بۆی گێڕابوونەوە کە دەگەڵ کوڕانی ئوتولیکوس دا، بۆ راوە بەراز چوو بوو بۆ چیاوی پارناسوس، وچۆن بەرازێکی کێوی شفرە سپی دڕودڕندە خۆی پێدا دابوو، وپەلاماری دابوو، وسەر ئەژنۆی هەڵدڕی بوو.

## یوریکلیا بەجێ زامەکەدا ئودیسیوس دەناسێتەوە.

پیرەژن، کە لاقی ئودیسیوسی بە دەست گرتبوو، یەکسـەر دەسـتی بـەر جێ زامەکـە کـەوتبوو، و ئودیسیوسی ناسـی بـووەوە، لاقـی بـەردا بـوو، وشـڵپ کـەوتبووەوە نێو تەشـتە ئاوەکـە، تەشـتەکە قڵپ بوو بووەوەو ئاوەکە رژابوو. هەنگێ هەم خەمبار بوو وهەم شادمان.هەردوو چاوی پڕبوون لە روندك، دەنگی گیرا. ردێنی ئودیسیوسی گرت وگوتی:

"ئـەرێ! بێگومـان تـۆ ئودیسیوسـی، ئـەی کـوڕە ئازیزەکـەم، لـە سـەرەتاوە نەمناسـیتەوە،دەبوایە دەست بە هەموو بەدەنتا بێنم، تا بتناسمەوە."

## ئودیسیوس داوا لە یوریکلیا دەکات کە قسە نەکات

دوای ئـەو قسـانە، چـاوانی بڕییـە پنلـوپی، دەیویسـت مـژدەی بـداتێ کـە مێـردە ئازیزەکـەی هاتووەتەوەو لە ماڵەوەیە. بەڵام پنلوپی نە لە نیگای ئەو حاڵی بوو، ونە هەستی بە هیچیش کـرد. چونکە ئەتینا هۆش وبیری (پنلوپی) بەلایەکی تردا برد. ئودیسیوس لـەو کاتـەدا دەسـتی راسـتی خستە سەر زاری پیرەژنو بە دەستەکەی تری بۆ لای خۆی راکێشا، وگوتی:

"ئـەی دایـەی میهرەبـان، بۆچـی دەتـەوێ بـە فـەوتانم بـدەی؟ تـۆ بـە خـۆت پـەروەردەت کـردووم، لـە باوەشـی تـۆدا گـەورە بـووم! دوای ئـەو هـەموو دەردو مەینەتییـە، ئـەوەتا سـەرەنجام پـاش بیسـت سـاڵ دەربـەدەریو دووری گەڕاومەتـەوە وڵاتـی خـۆم. جـا کـە بـە ئیلهاموسـەرۆی خواوەنـدێك ناسیوتمەوە، کڕ بە، زاری خـۆت بگـرەو نـابێ کـەس لـەم ماڵـەدا بـە هاتنـەوەم بزانێت. جا وا پێت دەڵێم، ئەم قسەیەم بکە بە ئاڵقەو لە گوێی بکە. ئەگەر بە پشتو پەنای خواوەندێك خوازگارەکـانم لـەنێو بـرد، هـەنگێ دێمـە سـەر کارەکـەرەکانو دەیـانکوژم، و لـە تـۆش هەرچـەندە دایەنیشـم بیـت، خۆش نابم. بۆیە ئەم رازە بپارێزە."

## یوریکلیا بەڵێن بە ئودیسیوس دەدات کە رازەکەی بپارێزێ

یوریکلیای فامیدەو دنیادیدە بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"حەیفت نەکرد، کوڕەکەم، ئەم قسەیە چی بوو لـە زارت دەرچوو! بە خـۆت مـن دەناسـیت، چـەند نەگۆڕو بە هەڵوێستم. دڵنیابە بـۆ پاراسـتنی ئـەو نهێنییـە دەبم بـە کـەڤر وتـاوێران. دەبم بـە ئاسـن.

خـەمت نـەبێت دەنگ لـە بەردوئاسنەوە بێت لـە منـەوە نايـەت. جا قسـەيەكی ديكەشـت پێدەڵێم، جـوان لای خـۆت هـەڵيگرە. ئەگـەر خواوەنـدان كرديـان، وخوازگارەكـان بـە دەسـتی تـۆ تياچـوون، هەنگیٚ من پێت دەڵێم كیٚ لە كارەكەرەكان پاكودڵسۆزەو كیٚ سپڵەوناپاكو بەد ڕەوشتە."

ئوديسيوسی سالۆر بەرسڤی دايەوەو گوتی:

"ئەی دايەی دلۆڤانودڵسۆز، چ پێويست دەكات تۆ پێم بڵێیٚ؟ پێويسـت بـەوە ناكـات. دەتـوانم بـە تاقـە نيگايـەك ناخيـان بخوێنمـەوەو بـزانم بـايی چـەندن. نـا تـۆ هـەقت نـەبیٚ هـيچ قسـەيەك مەكـە. هەموو شتەكان هەواڵەی خواوەندان بكە، بە ئاسمانيان بسپێرە".

دوای ئەو قسانە، پيرەژن كەوتە نێو ماڵەكە تـا ئـاوی تـر بێنـیٚ، چونكە ئاوەكـەی پێشـتر هـەمووی ڕژابوو. پاش ئەوەی ئاغاكەی خۆی شتو بە ڕۆنو زەيت چەوری كـرد، ئوديسـيوس جارێكـی دی كورسيەكەی لە ئاورگەكەی نزيك كردەوە تا خۆی گەرم بكاتەوە،و جیٚ زامەكەی بە جلە شڕەكانی خۆی داپۆشی.

ئەوسا پنلوپی فاميدە هاتە قسانوگوتی:

"ئەی كاكی غەريب، دەمەویٚ تا درەنگ نەبووە چەند پرسيارێكی ديكەت لێبكەم، چونكە تۆزێكـی دی، تەنانەت بۆ ئەو خەمبارانەی كە دەتوانن پاڵبكەون، كـاتی ئيسـراحەتو خـەوی شـيرين دێـت. بەڵام خواوەندان داخوكەسەرێكی بیٚ كۆتاييان بەسەر مندا داوە، كاروپيشەی شەوو ڕۆژم بووە بە خەمو گريان، ڕۆژ تا ئێواریٚ بەدەم سەرپەرشتی كاروباری ماڵـەوەمو بـە دەم ڕێنـوێنیو چاودێری كارەكەرو قەرەواشەكانمەوە هەر گريانو ڕوندك هەڵڕشتنە. كە شەويش دادیٚوهەمووان دەخەون، دەچمە سـەر جێگاكـەمو پاڵدەكـەوم هـەزارو يـەك بيروخـەياڵی تفتو تـاڵو نـاخۆش بـە مێشـكم دا دێتو دڵم تەنگوناخۆش دەكەنو ئيدی چار ناچار دەگريمو بۆ بەختی ڕەشی خۆم دەناڵم. وەكـو چۆن (ئايـدون)ی سـەر سـەوز، كيـژی پانـداريوس، بولبـولی باخـان، دەگـەڵ دەسـتپێكی بەهارانـدا، لەسـەر چڵـی درەختـانی چـڕە گـەڵاو لـقو پۆپـان هەڵدەنيشـێتو بـە دەنگێكـی بـە سـۆزو شـێوەن ئامێزوگريانـەوە دەنـاڵێنیٚ، يـادی ئيتيلـوس، كـوڕە ئازيزەكـەی خۆیوشـا زيتـوس، كـە ڕۆژیٚ لـە ڕۆژان بـە نەزانسـتە كـردی بـە قوربـانی شمشێرێكوكوشـتی، بـەڵیٚ يـادی ئـەو دەكاتـەوەو بـۆی دەگـری، منـيش بـەو ئاوايـە دەگريمودەنـاڵم. دوو دڵو نيگـەران، تيـا مـاوم،ئايـا لەگـەڵ كوڕەكەمـدا وەمێنمو پارێزگاریوسەرپەرشـتی هـەموو شـتەكان: دارايـی، سەروەتوسـامان، نۆكـەروخولامان، كۆشـكو سـەرا جـوانو بەرزەكـەم، و ڕێـزی نوێنوخەوتنگـەی مێردەكـەم بگـرمو لـە نێـو خەڵكيـدا سەربەرزو ڕێزداربم يان لەو ئاخيايانـەی دەوروخـولم دەدەن يـەكێك كـە لـە هـەموويان خانـەدارترەو دياریو سەوقاتی زياترم دەداتیٚوجيازی باشترم بۆ دەكات هەڵبـژێرمو دووی بكـەوم؟ ئەمـە جگـە لەوەی تا ئەو كاتەی كوڕەكەم منداڵ بوو وئەقڵی بە دنيـا نەدەشـكا، نەمـدەتوانی شـوو بكـەمو لـە مـاڵی مێردەكـەم بڕۆمو دوور بكەومـەوە،لیٚ ئێسـتاكە گـەورە بـووەو بـووە بـە پيـاو، بـە خـۆی داوام لێدەكاتو حەزدەكات لێرە بڕۆمو ماڵەكەی بـەجیٚ بێڵم، چونكە زۆری پێناخۆشـە كـە ئاخاييـەكان بـە بەرچـاوی خۆيـەوە مـاڵی دەخـۆن، سـەروەتو سـامانی بـەفيڕۆ دەدەنو لەسـەر كيسـەی ئـەو دەژين.. جا گوێبگرە با ئەم خەونەت بۆ بگێڕمەوە، بزانم چۆنی لێكدەدەيتەوە. لـە خـەومـدا بيسـت

دانه قازم لـه ماڵـەوە هـەبوو، گـەنمی خوساویان لەبـەر بـوو، وەدەیـانخوارد، کـە تەمەشـام دەکـردن‌و لێیان رادەمام، دڵـم زۆر خـۆش دەبـوو. کەچـی لـە پـڕ هەڵۆیـەکی دەنـووك خـواری زەلام لـە لوتکـەو بڵندایی کۆسارانەوە هات‌و یەك یـەك ملـی شکاندن‌وکوشـتنی، ئیـدی هـەر هـەموویان لـەم کۆشـك‌و سـەرایەدا لاڵ‌وپـاڵ بەسـەر یەکـدا کـەوتن، بـەڵام هەڵۆیەکـە هەسـتایەوەو خـۆی بـە حـەڵ حەلـەی ئاسمانی پرشنگداردا کرد. من لە خەوەکەدا هاوارم دەکردو بۆ قازە کوژراوەکانم دەگریام. ژنانی ئاخـایی کـەزی هـۆنراوەی جـوان، بـەدەم هـاوارو فیزاحەکەمـەوە هـاتن‌و لـە دەورم خـڕ بوونـەوە...
بـەڵام کـاتێکم زانـی هـەمان هـەڵۆ هاتـەوە، لەسـەر گوێسـەبانەی قەسـرەکە نیشـتەوە، بـە دەنگێکـی بەشەرانە بانگی لێکردم کە کڕ بم‌و گوتی:
"ئـەی کیـژی ئیکـارۆس-ی بـە ناوبـانگ، مـەگری، دڵنیابـە، ئەمـە خـەون نیـە، ئەمـە دیـدارێکی راستەقینەیەو دێتە دی. قازەکـان، خوازگارەکـانن، هەڵۆکـەش تـا تـۆزێ لەمـە پـێش مـن بـوو، بـەڵام ئێستاکە من شووەکەی جارانتم و گەڕاومەتـەوەو هـەر هـەموو خوازگارەکـان دەکوژم‌ودەیانکـەم بـە پەندو عیبرەتی زەمانە."
ئیدی لێرەدا خەبـەرم بـووەوەو لـەو خـەوە خۆشـە هەسـتام، کـە روانیمـە دەورانـدەورم سـەیرم کـرد قازەکان لە جێی خۆیـان بـوون‌و وەکـو جـاران دەوری تەشـتە دارینەکـەیان داوەو سـەرگەرمی گـەنم خواردنن".
ئودیسیوسی سالۆر بەرسڤی دایەوەو گوتی:
"خانمەکـەم، ئـەم خەونـە هـیچ لێکدانەوەیـەك هـەڵناگرێ، هـەر ئەوەیـە کـە خـودی ئودیسـیوس لـە خەونەکەدا بۆی شـرۆڤە کردوویت، گومـان لـەوەدا نییـە کـە هـەر هـەموو خوازگارەکـان دەکـوژرێن، شتاقیان لە چنگی ئەهریمەنی مەرگ رزگارنابن."

## پنلوپی هەندێ نیازی خۆی بۆ کابرای غەوارە دەدرکێنێ

پنلوپی ئاقڵ‌و ئاغر وەڵامی دایەوەو گوتی:
"غـەریبۆ! ئەلهـەقی خـەون شـتێکی سـەیرو ئـاڵۆزە، بەئاسـانی دەرك‌وشـرۆڤە ناکرێـت، ئـەوەی لـە خەودا دەبینرێ پتر خەیاڵە تا حەقیقەت بێ. بۆیـە دووروئەسـتەمە بـە دەسـتی بەشـەران بێتـە دی، جا دەرگای خەون‌وخـەیاڵان دووانـە، یـەکێکیان لـە شـاخ دروسـت کـراوەو ئـەویتریان لـە عـاج، هـەر خـەوێك لـە دەرگـا عاجیەکـەوە بێـت، پوچ‌ودرۆیـە، بـەڵام ئـەوەی لـە دەرگـا شـاخە سیقالدراوەکەوە بێـت، راسـتە،وهەر کەسـێك بیـدینی، بـە مـراد دەگـات. جـا مـن بـاوەڕ ناکـەم خەوەکـەی مـن لـەم دەرگایەوە هاتبێ، خۆزیا لـەم دەرگایـەوە هاتبـا، هـەنگێ من‌وکوڕەکـەم زۆرمـان پێخـۆش دەبـوو، و کەیفمان پێدەهات. جا من قسەیەکی ترت پێدەڵێم، با هەر بەینی خۆمان بێت. ئەو رۆژە شـوومەی کە من لـە ماڵەکـەی ئودیسـیوس دوور دەخاتـەوە، بـەو زووانـە دێـت، چونکـە حـاڵی حـازر لـە بیری ئەوەدام پێشبڕکێیەکی پاچان بسازێنم. مێردەکەم هەموو جارێ ئەو گەمەیـەی لـەم ماڵـەی خۆیـدا ئەنجام دەدا. دوانزە پاچی بە ریزی یەکەوە دادەنا، کە لە بناغـەی کەشـتی دەچـوون، بـە جـۆرێکی دادەنـان کـە کونـەکانیان بکەوتایەتـە ئاسـتی یەکـدی. ئەوسـا دوور دەکەوتـەوەو تیرێکـی دەهاویشت‌و لە هەر دوانزە کونەکەوە تێدەپەڕی. جا بە تـەمام داوا لـە خوازگارەکـان بکـەم هـەمان

کار بکەن. ئەوەی توانی کەوانەکەی بێنێتە سەرپێ‌و تیرەکەی بخاتە سەرو بە ئاسانی بە هەر دوازدە کونەکەیدا رەت بکات، ئەوا بەگەڵی دەکەوم، وئەم ماڵە بەجێ دێڵم، ئەم شوێنی گەنجایەتیەم، ئەم ماڵی بوکێنییەم، ئەم ماڵە زۆر جوان‌و پڕ رۆزی‌و رزقەم بەجێدێڵم کە باوەڕ ناکەم هەرگیزو تەنانەت لە خەونیش دا لە یادی بکەم‌وفەرامۆشی بکەم".

ئودیسیوسی فاما بەرسڤی دایەوەوگوتی:

"ئەزبەنی، ئەی هاوسەرە سەلارەکەی ئودیسیوسی کوڕی لایرتیس، بیرۆکەیەکی زۆر باشە، هیچ لێی مەوەستە، ئەو پێشبڕکێیە لە ماڵەکەی خۆتدا دەست پێبکە، چونکە بەر لەوەی ئەو پیاوانە کەوانەکان بێننە سەرپێ‌و تیری تێبخەن‌و تیرەکانیان بە کونی پاچەکاندا رەت بکەن، ئودیسیوسی مەردەمێرو فاما دەگاتە ئێرە."

## پنلوپی دەگەڵ کارەکەرەکانیا دەڕوات بخەوێ

پنلوپی دووربین بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"ئەی غەریب، تا تۆ دانیشیت‌و بەو قسانە دڵی من خۆش بکەیت، من خەوم نایەت. بەڵام بەشەر بەبێ خەویش هەڵناکات. خواوەندان کات‌و یاسایان بۆ خەڵکانی سەر زەوی ئاواو ئاوەدان‌و پڕ خێرو بەرەکەت داناوە تا ژیانی خۆیانی پێ رێك بخەن، و خەڵکی ناچارن پابەندی بن. کەواتە من دەچمە سەرەوە تا لەسەر جێگاکەی خۆم پاڵبکەوم. هەرچەندە جێگاکەم بۆ من دۆزەخە، هەر رەنج‌و غەزابە، بووە بە جێگەی گریان‌و، لەوەتای ئودیسیوس رۆییوە بۆ ئیلیوس-ی شووم‌و مایەی بێزاری من، هەمیشە لە فرمێسکی مندا تەڕە. من لەوێندەر بۆ خۆم پاڵدەکەوم: تۆ بۆ خۆت هەر لێرە بخەوە، جێگایەك بۆ خۆت لە عاردی رابخە، یان با کارەکەرەکانی من جێگایەکت بۆ چاك بکەن..".

دوای ئەو قسانە، سەرکەوتە سەرێ بۆ باڵەخانە شکۆدارەکەی خۆی، بە تەنیا نەبوو، کارەکەرەکانیشی دەگەڵ بوون. پاش ئەوەی دەگەڵ قەرەواشەکانیدا گەییشتە سەرەوە، لە بانگی گریانێکی خەمناك‌و بە کوڵی دا، بۆ مێردە ئازیزو بەڕێزەکەی، ئودیسیوس دەگریا. ئیدی جۆشی گریانی دانەمرکایەوە تا ئەتینای چاوگەش فریای کەوت چاوانی قورس بوون، وخەوێکی خۆشی لێکەوت.

* * *

پەراوێز:

*- پانداریوس:

فەرماندەی سوپاییانی لیسی بوو لە جەنگی تەروادەدا، لەم جەنگەدا وەکو تیرەندازێکی بە تواناولێهاتوو دەرکەوت. هونەرە قورسەکانی تیرەندازی لە ئەپولۆوە فێر بوو بوو. کاتێ کە ئاگربڕێکی کورت لە نێوان هەردوو سوپای دژمندا بەرقەرار بوو، تامینیلاوس وپاریس شەڕی تەن بە تەن بکەن. ئەتینا پانداریوسی هاندا تا تیرێك باوێتە مینیلاوس. بەمە شەڕی نێوان یونانیان‌وخەڵکی تەروادە هەڵگیرسایەوەو پانداریوس بە دەستی دیومید کوژرا.

*- ئیتیلوس:

به گوتەی هومەر، ئایدون کیژی پانداریوس و هاوسەری زیتوسی پاشای تیبە بوو، تاقە کوڕێکی هەبوو بە نێوی ئیتیلوس. جا ئایدون بەغیلی بە نیوبی کارەکەری دەبات چونکە شەش کوڕو شەش کیژی هەبوو. ئایدون دوچاری بەغیلییەکی شێتانە دەبێت، نەخشەی کوشتنی یەکێك لە منداڵەکانی نیوبی دەکێشێت. بەڵام بە هەڵە کوڕە تاقانەکەی خۆی دەکوژێت. زیوس بەزەیی بە حاڵیا دێتەوەو بۆ ئەوەی لە ئازارو کەسەری کەم بکاتەوە، دەیکات بە بولبل.

*- زیتوس:

کوڕی زیوس و ئەنتیوبییە، برای جمکی ئەمفیونە. لە هەموو سەرکێشی و خۆسەری و ریسکەکانی ئەمفیونی برایدا بەشداری دەکات، بەڵام ئەو بەهرە مۆزیکیەی ئەوی نابێت. دوای ئەوەی جووتە برا دەست بەسەر تیبەدا دەگرن،و شورەیان لە دەوری کێشا، ئەمفیون بەردەکانی بە زەبری ئاوازی مۆسیقا دەجولاندو لە جێی خۆیان دایدەنان، بەڵام زیتوس پشتی بە هێزی بازووی خۆی دەبەست.

*- ئوقیانوس:

کوڕی ئورانوس وجیایە، و بابی پەریانی دەریا، وخوابانۆیانی روبارانە. ئوقیانوس لە کۆی دەریاو دەریاچەو روباروکانیاوان پێکهاتووە.

*- پارناسوس:

چیایەکی موبارەکە، جێگەومەڵبەندی ئەپولۆو خواوەندانی هونەرە.

*- ئوتولیکوس:

کوڕی هیرمیس وبابی ئەنتیکلیای دایکی ئودیسیوسە. چەتەو رێگرێکی زەبەردەستی زۆر بەناوبانگ بوو. تواناو بەهرەی خۆ گۆڕین وگۆڕینی شتە دزیارییەکانی هەبوو.

## سروودی بیستەم

**کورتەی سروودەکە:**

**ئودیسیوس خەوی دەزڕێ، بیر لەوە دەکاتەوە سزای کارەکەرەکان بداتو تەمبێیان بکات، بەلام هەر چۆنێ بێ جڵەوی خۆی دەگرێتو خۆی کۆنترۆڵ دەکات. ئەتینا خەوی لێدەخات. پنلوپ بۆ بەختی رەشی خۆی دەگری. ئودیسیوس لە قاپی زیوس دەپاڕێتەوە کە دوو نیشانەی دڵخۆشکەرەی پێنیشان بدات، ودوعاو نزاکەی گیرا دەبێت. تیلیماخۆس بۆ کۆڕو مەجلیسی خوازگارەکان دەڕوات. قەرەواش وکارەکەرەکان کۆشكو سەراکە دەماڵن، شوانان بە خۆو قوربانیانەوە دەگەنە جێ. میلانتیوسی بزنەوان لێدەبڕێ کابرای گەدا لە کۆشکەکە وەدەرنێت، فیلویتیوسی سەرە شوان بەزەیی بەکابرای بێگانەدا دێتەوەو بە شێوەیەکی کاریگەر بۆی دەپاڕێتەوە. نیشانەو پێشبینییەکی روون خوازگارەکان نیگەران دەکاتو دەستبەرداری کوشتنی تیلیماخۆس دەبن. تیلیماخۆس وەکو خاوەن ماڵ قسان دەکاتو هەڕەشەی ئەوە دەکات کە هەر کەسێك جوێن بە میوانەکەی بدات، بێ سزا دەرناچێت. سفرەو خوانو بەزم دەڕازێنرێتەوە. ئەجیلاوس داوا لە خوازگارەکان دەکات ئارام بن، وئامۆژگاری تیلیماخۆس دەکات کە لە بە شوودانی دایکیا پەلە بکات. تیوکلیمینوس کە لەوێ میوان دەبێت، هەڵیدایەو بە دەنگی بەرز پێشبینی ئەوە دەکات کە ئەجەل بە سەر سەری خوازگارەکاندا دەسوڕێتەوەو رۆژی تۆڵە نزیك بووەتەوە.**

***

### ئودیسیوس خەوی دەزڕێت

**ئودیسیوسی بەنێوبانگ جێگاکەی لەدالانەکەی پێشەوە راخست، بریتی بوو لە کەوڵەگایەکی خۆشە نەکراو، ئەوجا چەند فەروە بەرخێکی، لە فەروی ئەو بەرخانەی کە خوازگارەکان دەیانکوشتنەوەو دەیان خواردن، بەسەردا راخستو لەسەری پاڵکەوت. یورینومی چەرچەفێکی بەسەریا دا. ئودیسیوس لەوێدا پاڵکەوت، بەلام خەوی لێنەکەوتو نەکەوت، لە دڵی خۆیدا بیری لە کوشتنی خوازگارەکان دەکردەوە. کارەکەرەکان لە هۆڵەکە وەدەرکەوتن، ئەو کارەکەرانەی کە هەریەکەیان لە سوچو پەنایەکدا دەگەڵ یەکێك لە خوازگارەکاندا رای دەبواردو بە دەمیانەوە پێ دەکەنی. بەڵێ بەدەم حیلکە حیلكو پێکەنینەوە لە هۆڵەکە وەدەرکەوتن. ئودیسیوس لە دڵی خۆیدا زۆر تورە بوو، بیری لەوە دەکردەوە کە ئاخۆ راپەڕێو هەموو ئەو ژنانە بکوژێت، یان وازبێنێ با بۆ دواجار دەگەڵ خوازگارە خۆپەرسندو بێ شەرمەکاندا رابوێرن. وەکو چۆن دێڵە سەگێك کە کەسێکی بێگانە دەبینێ، خۆی لە دەوری توتەڵە ساواکانی دەگێڕێو خۆی بۆ هەر شەڕو بەرەنگاربوونەوەیەك ئامادە دەکات، بەو ئاوایە دڵی ئودیسیوس کە لەم بەدکارییە پەستو بێزار بوو بوو، هاتبووە جۆش. بەلام دەستێکی بە سینەی خۆیدا کێشاو بە گلەییەوە گوتی:**

**"ئەی دڵ سەبرت بێ، ئارام بگرە، تۆ شتی زۆر لەمە خراترت تەحەمول کردووە. ئەو رۆژەی کە سیکلوپە دڕو دڕندەکە یاوەرە جامێرو بوێرەکانی خواردم، توانیت خۆت بگری، تا بە فەزڵی**

نەخشـەو پلانـە وردەکـانی مـن، کـە واتـدەزانی تـەواو، دەمریت ونـەجاتت نابێـت، لـە ئەشـکەوتی پیرەسیکلوپ بە سەلامەتی هاتیتە دەرێ."

## ئودیسیوس دەردە دڵ بۆ ئەتینا دەکات

بەو جۆرە خۆی دەدواندو دڵی هاندەدا کە سەبرو ئارامی بێ. بەڵام خۆی لە نێو جێگاکەیدا هـەر گینگڵـی دەدا، وەکـو چـۆن پیـاو پارچـە گۆشـتێکی تـەڕوبڕو چـەور دەخاتـە سـەر ئاگر تـا بەپەلـە ببرژێ،وخێراخێراهەڵیدەگێڕێتـەوە تـا بـە جـوانی وپەلـە ببرژێ، ئـەویش بـەو ئاوایـە لـە جێگاکـەی خۆیـدا ئـەم دیـوو ئـەودیوی دەکـرد، بیری لـەوە دەکـردەوە چـۆن بـە تـاقی تـەنیا ئـەو هـەموو زڕە خوازگارە خۆپەسندە بەرهەق بکات، چۆن بە تاقی تەنیا دەرەقەتی ئەو هەمووە دێت. بەڵام ئەتینا بەپەلە لە ئاسمانەوە هاتە خوارێ و لە شێوەی ژنێکدا چووە دیار سەری ئودیسیوس وگوتی:

"ئەی کڵۆڵی بەلەنگاز بۆچی تا ئێستا بێداری؟ ماڵ خراپ، ئەمە ماڵی خۆتـە، ئەوەش ژنەکەتـە، و ئـەوەش کوڕەکەتـە، کـە پیـاوێکی تـەواوەو هـەموو باوکێـك خۆزیـا دەخـوازێ کـوڕێکی وەهـای هەبێت."

ئودیسیوسی سالۆر بەرسڤی دایەوەوگوتی:

"بەڵێ، ئەی خوابانۆ، ئەوەی تۆ دەیڵێی هەر هەمووی راست ودروستە. بەڵام روحـم نیگـەرانـە، دوو دڵم لەوەی کە چۆن دەتوانم دەست لەو خوازگارە گۆساخ و بێ شەرمانە بکەمەوەو بەسـەریاندا زاڵ بم؟ وەکو بە خۆت دەبینی مـن تـەنیا باڵم و ئەوان ژمارەیـان زۆرە. ئەوەی لەمـەش زیـاتر نیگـەرانم دەکات، ئەوەیە گریمان بەکۆمەکی زیوس و تۆ بەسەریاندا سەرکەوتم و هەموویانم کوشت. ئەوسا پەنا بۆ کوێ بەرم؟ چۆن لـە دەسـتی هەقوەسێنان دەربـازبم؟ تکـات لێدەکـەم تـەگبیرێکی ئەمـەم بـۆ بکە."

## ئودیسیوس دەخەوێ

هەنگێ ئەتینا، خواوەندی چاوگەش، بەرسڤی دایەوەوگوتی:

"ئەی سەرسەختی بەلەنگاز، خەڵکی متمانـە بـە دۆسـت و پشتیوانی زۆر لاواز، کـەم حیکمـەت، بـە بەشەری فانی دەکەن، نازانم بۆچی تۆ متمانە بە من ناکەی، لە کاتێکا لە هەموو تەنگانەیەکدا، لـە گشت مەینەتیەکدا فریات کەوتووم وپاراستوومیت، من خواوەندم خواوەند! جا مـن بـە راشـکاوی پێت دەڵێم نـەك هـەر ئـەو خوازگارانـە، ئەگـەر پـەنجا دەسـتەی دیکـەش لـە پیاوانی فانی دەورمـان بگـرن و بیانـەوێ شـەڕی ئێمـە بکـەن، ئـەوا زەفـەرمان پـێ نابـەن و دڵنیابـە کـە زۆر بـە ئاسـانی بەسەریانا سەردەکەوی و بە بەرچاوی خۆیانەوە گاوگۆتاڵ و مەڕو پەزەکانیان بە تاڵانی دەبەیت و هیچیان لە دەست نایەت. ئێستا کە خەو گرتووتی، هـەڕە بنـوو، هەرکە خەو بردیتییەوە، ئیدی ئـەم هەمووخـەم و پـەژارەو نیگەرانیـەی کـە مێشـکی داگیرکردوویـت، دەڕەوێتـەوەو ئیسـراحەت دەکەی".

هەرکە ئەتینا لە قسەکانی بووەوە، خەو ئودیسیوسی بـردەوە، وخوابـانۆی چاوگەش بۆ ئولـەمپ گەڕایـەوە. لـەو کاتـەدا کـە ئودیسـیوس لـە غـوڕابی خـەودا بـوو، ولـە هـەموو خـەم و پەژارەیـەك خەلەسـی بـوو، هاوسـەرە فامیدەکـەی لـە خـەو ڕابـوو، لەسـەر جێگەکـەی دانیشـت و لـە بـانگی

گریانێکی بە کوڵی دا، پاش ئەوەی تێر گریاو کوڵی گریانی لە جۆش کەوت، ژنەی خانەدانو رەسەن زادە رووی کردە قاپی ئەرتەمیسو کەوتە نوێژو نزا:

"ئەی ئەرتەمیس، ئەی خوابانوی رەسەنوخانەدان، ئەی کیژی زیوس، خۆزگە سەد خۆزگە ئێستا تیرێکت لە جەرگم دەداو دەمودەست دەتکوشتم. یانی گەردەلولێکت هەڵدەکرد، وبە ئاسمانیا دەبردمو دەیخستمە ئوقیانوسی بەزریانو پڕ شەپۆلو گێژەنگو گێژاوانەوە! وەکو چۆن ئەمەت لەگەڵ کیژەکانی پانداریوس دا کرد. خواوەندان داكو بابیان کوشتبوون، ئیدی بە هەتیوی مابوونەوە، ئەفرۆدیتی پایەبەرز بە پەنیرو هەنگوینو بادەی خۆش بەخێوی کردن. هیرا، جوانیو سەلاریو سەنگینیو ئاوەزی بێ نەزیری دابوونێ، و ئەرتەمیسی پاکیزە بەژنو بالای بەرزی دابوونێو ئەتیناش تواناو بەهرەی دەستڕەنگینی دابوونێ. رۆژێك ئەفرۆدیتی خشیكو پایەبەرز بەرەو ئولەمپی سەربەرز دەڕوات، تا باسی شووکردنو زەماوەندی ئەو کیژانە دەگەڵ زیوسی هەورەوانو چەخماخەدار بکاتو پرسی پێبکات، چونکە زیوس ئاگاداری هەموو بەدبەختی یان بەختەوەرییەکە کە لە چارەی هەر بەشەرێکی فانی نووسراوەو دێتە رێی. لەو بەینەدا هارپییان، روحی گێژەلۆکەو با، کچۆڵەکان دەڕفێننو دەیانەدەن بە ئیرینۆسە ئێسك قورسو رەزاگرانەکان، وئەوانیش دەیانکەن بە کارەکەری خۆیان. خۆزگە سەد خۆزگە خواوەندانی ئولەمپ نشین، منیشیان بەو دەردەی ئەوان دەبردو لەبەر چاوان نەدەمام، یان ئەرتەمیسی گێسو جوانو زلف شۆڕ، تیرێکی لێدەدام، ودەگەییمە ژێر عەردی تەنگو تارو لەوێندەر ئودیسیوسم دەبینی، نەك لێرە شوو بە کەسێکی نا شایستە بکەمو دڵی خۆش بکەم. بە هەرحاڵ ئەگەر کەسێك رۆژ تا ئێوارەێ هەر بگریو خەفەت بخوات، کە شەوێ خەوی لێکەوت، دەتوانێ خۆی لەبەر هەر ئازاروداخو کەسەرێك بگرێت،چونکە خەو هەموو شتێك، چ خۆشو چ ناخۆش، چ باشو چ خەراپ لەبیر مرۆڤ دەباتەوەو سوکناییەکی دەداتێ. بەڵام من، منی نەگبەت، خەوم نییە، کە دەشخەوم بە ئیرادەی یەکێك لە خواوەندەکان، خەونی زۆر سامناك دەبینم. بۆ نموونە ئەمشەو لە خەوما پیاوێك لە پاڵما خەوتبوو، کوتومت لە ئودیسیوس دەچوو، رێك لەو شەوەی دەچوو کە دەگەڵ لەشکرەکەیدا رۆیی، زۆر دڵم خۆش بوو، چونکە وامدەزانی راستییەو خەون نییە، بەڵام..."

## ئودیسیوس لە خەو ڕادەبێو نوێژونزا بۆ زیوس دەکات

کە پنلوپ لە قسەکانی بووەوە، رۆژ بووەوە، هەتاوی زێڕین گزنگی دا. ئودیسیوسی جامێر گوێی لە دەنگی گریانی پنلوپ بوو، یەکسەر هەستی کرد کە پنلوپ لە دڵی خۆیدا ناسیویەتیەوەو بە دیارییەوە وەستاوە. ئودیسیوس بالاپۆشو فەروەکانی ژێر خۆی کردکردنەوە، قەدی کردن، ولەسەر کورسییەکی ژوورەوەی دانان. بەڵام کەوڵە گایەکەی بردە دەرەوە. ئەوسا دەستەو دوعا کەوتە پاڕانەوەو نزا لە زیوس وگوتی:

"ئەی زیوسی پایەبەرز، ئەی فەرمانڕەوا! ئەگەر ئیرادەی خواوەندان ئەوە بوو دوای ئەو هەموو دەربەدەرییە، دوای بڕینی ئەو هەموو دەشتودەرانە، ئەو هەموو روبارودەریاو بەحرانە، پاش ئەو هەموو دەردومەینەتیانەی بەسەرمتان هێنا، بەخواستی خۆتان بۆ زاگەو ولاتی خۆم

بمگەڕێننـەوە، خۆزگـە یـەکێك لەوانـەی نـاو ئـەم کۆشـكو سـەرایە دەهاتـە قسـەو پێشـبینییەکی خۆشی بۆ دەکردم، یان لە دەرێی کۆشكوسەراکە نیشانەیەکی (زیوس)م لیّ دەردەکەوت، زیویس نیشانەیەکی خێری نیشان دەدام."

## دوعاوکەی ئودیسیوس گیرا دەبێت.

بـەو جـۆرە پاڕایـەوە، زیوسـی مـەزنی مـەزنان گـوێی لـە دوعـاو نزاکـەی بـوو. یەکسـەر زیـوس، لـە ئولـەمپی سـەر بـەرزەوە، لـە ئاسمـانێکی سـامالّو سـایەقەوە، چـەخماخـەیەکی داو ئودیسیوسـی جامێر زۆری کەیف پێهات. لە هەمان کاتدا، ژنێك کە لە ماڵەکەدا دانەوێڵـە، گـەنمو جـۆی دەهـاڕی لە جێی خۆیـەوە، لـە نـاو کۆشکەکەوە، لـە شـوێنێکی نزیـك لـە ئودیسیوسـەوە، لـەو شـوێنەوە کـە دەستاڕەکانی ئەو مەردەمێرە، ئودیسیوسی تیا بوو، قسەیەکی مـوجیزە ئاسـای کـرد، کـە ئـەوانی دیکـەش گوێیـان لێـی بـوو. دوانـزە ژن ئـەم دەسـتاڕانەیان بەوپـەڕی زەحمـەتو ئەزیـەت دەگێـڕاو گـەنموجۆیان دەکرد بـە ئـارد، ئـەو ئـاردەی کـە کۆڵەکـەی ژیـانی بەشـەرە. ژنـەکانی دی کـە ئـاردی خۆیان هاڕی بوو، ولێبوو بوونەوە، خەوتبوون: تەنیا یەکێك لەو ژنانە هێشتا لـە کارەکـەی نـەبوو بووەوە، چونکە لە هەر هـەموویان بیّ تواناتر بـوو. ئـەویش کـە گـوێی لـە هـەورە بروسـکەکە بـوو، دەستاڕەکەی راگرتو قسەیەکی کرد کە بەلای ئاغایەوە، نوقلانەونیشانەی خێر بوو گوتی:

"ئـەی بابـە زیـوس، ئـەی فـەرمانڕەوای هـەموو خواوەنـدانو بەشـەران، تـۆ لـە ئاسمـانی سـامالّو سـایەقەوە، لـە ئاسمـانی پـڕ ئەسـتێرەوە، کـە لـە هـیچ شـوێنێکەوە پەڵـە هـەورێك بـە بـەرۆکی ئاسمانەوە نیە، ئەو هەورە برووسکەیەت نارد، بێگومـان ئەمـە نیشـانەیەو بـۆ کەسـێکی دەنێـری. دەیسـا منـیش کـە عەبدێکی بەلـەنگازو نەگبـەتی خـۆتم، روو دەکەمـە قـاپی تـۆ، دوعایـەکم هەیـە، ودوعاکەی منیش گیرا بکە. خۆزگە، ئەمڕۆ دوا رۆژ دەبوو، کە خوازگارەکان لێرە، لەم ماڵـەدا، لـەم کۆشـكو سـەرایەی ئودیسیوسـدا، لەسـەر سـفرەو خـوانی بەلـەزەتو ئـاواو ئـاوەدان دادەنیشـتن، زیوس گیان! دەزانی کە ئارد بۆ ئەوانـە دەهـاڕم چـەند مانـدوو دەبم! ئـەژنۆکانم لـە ماندوویـەتی دا شل دەبن، خۆزگـە ئەمـە دوا ژەمیـان دەبـوو لێـرە! و رزقو رۆزیـان لـە عـەردو ئاسمـان هەڵـدەگیرا!"

ئودیسیوسـی مـەردەمێرو رەسـەن بـەم قسـە مـوجیزە ئاسـایەو بـە هـەورە بروسـکەکەی زیـوس زۆر دڵخـۆش بـوو. چـونکە بـاوەڕی وابـوو ئـەو دوو ئامـاژەیـە نیشـانەی ئـەوە بـوون کـە تۆڵـە لـە خوازگارەکان دەسەنیّوبەسەریاندا زالّ دەبێت.

## تیلیماخۆس پرسیاری کابرای غەریب لە یوریکلیا دەکات

لـەو بەینـەدا کارەکـەرەکانی دی لـە کۆشـكو سـەراکەی ئودیسیوسـدا کۆبوونـەوە، و ئاگریـان لـە ئاورگەکانـدا کـردەوە. تیلیمـاخۆس-ی خواوەنـد ئاسـا لـە خـەو رابـوو، جلـەکانی لەبـەر کـرد، شمشێرە تیژەکەی لە شان کرد، سەندەڵە جوانەکانی لـە پێیـە ناسـکەکانی کـرد، نێـزە نـووك تیـژە برونزییەکەی بە دەستەوە گرت، رۆیی، لـە ئاسـتانەی دەرگاکـەدا وەسـتا. رووی کـردە یوریکلیـاو گوتی:

"دایـەی میهرەبـان، ئایـا خزمـەتی میوانەکـەت کـردووین، پێـی ڕاگـەییوی؟ ئایـا جێگـەو ڕێگـەو خواردنی باشتان داوەتیّ یان کەسیّ گوێی نەداوەتیّو بەبیّ شێو سەری ناوەتەوە؟ چونکە دایکم،

هەرچەندە فامیدەو ئاقڵە، هەندێجار وا رێکدەکەوێ ئەوەندەی رێزی خەڵکانی هیچ و پوچ دەگرێ و خزمەتیان دەکات، ئەوەندە رێزو حورمەتی خەڵکانی هەژێ و مەردەمێر ناگرێت و بگرە دەریشی دەکات."

هەنگێ یوریکلیای دووربین بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"کوڕەکەم، نابێ لەم رووەوە هیچ گلەییەك لە دایکت بکەی، چونکە، زەموگلەیی هەڵناگرێت، چونکە کابرا لێرەدا دانیشتووەو بە کەیفی دڵی خۆی بادەی خواردووتەوەو کە پنلوپ ویستویەتی نان وخواردنی بدەنێ، گوتویەتی برسی نیەو دڵی نان و خواردن نابات، پاشان کە ویستویەتی ئیسراحەت بکات و بخەوێ، پنلوپ بە کارەکەرەکانی گوتووە جێگەی بۆ راخەن. بەڵام ئەو بەلەنگازە داماوە بەخۆی نەیویستووە لەسەر مافوروجێگەی نەرم و گەرم بنوێت. ئیدی بۆ خۆی لە دالانەکەدا کەوڵەگایەکی خۆشەنەکراوی راخست و چەند فەروەیەکی بەسەریا راخست و لەسەری پاڵکەوت، و من بە خۆم بالاپۆشێکم بەسەریا دا."

## تیلیماخۆس دەچێ بۆ شوێنی کۆبوونەوە

دوای ئەو قسانە، تیلیماخۆس نێزە بە دەست، بەرەو مەیدانی کۆبوونەوەی ئاخاییەکان لە ماڵ وەدەرکەوت. هەر بە تەنێ نەبوو، جووتە تاژیە چالاك و چەلەنگەکەی بە دواوە بوون. لەم لاشەوە یوریکلیای پایەبەرز، کیژی ئوپس، کوڕی پیسینور دەستووری بە قەرەواش وکارەکەرەکان دەدا:

"وەرن، خێرا بکەونە کار، هەندێکیتان ماڵەکەو راڕەوودالانەکان گسك بدەن و ئاوپرژێنی بکەن، پەردە بەسەر کورسیەکاندا بدەن، هەندێکی ترتان مێزەکان بە ئیسفەنج خاوێن بکەنەوە، سوراحییە دوو دەسکی و جامە جوانەکان پاك بشۆن، هەندێکی ترتان بچن بۆ کانی و سەراوان و بە پەلە ئاو بێنن. چونکە خوازگارەکان هەر ئێستا دەگەنە ئێرە. چونکە ئەمڕۆ جەژنە، جەژنی هەموو تیرەی بەشەرە."

هەرکە ئەو قسانەی کرد، هەموو دەستبەجێ حازرو ئامادە کەوتنە کار. بیست کارەکەر چوون بۆ کانی تا ئاو بێنن، ئەوانی تر بەپەلە لە ماڵەوە کەوتنە کار.

## ئودیسیوس و یومایوس دەکەونە گفتوگۆ

هەنگێ نۆکەرو خولامانیش، هاتن. داریان بۆ سۆپاو ئاورگەکان شکاند. کارەکەرەکان لە کانی و سەراوان گەڕانەوە. ئەوسا بەرازەوانەکە، بەسێ دانە بەرازی قەڵەوی هەڵبژاردەی نێو رەوەکەوە، هات. لە حەوشە جوانەکەدا بەرەڵلای کردن تا بلەوەڕن، ئەوسا رووی کردە ئودیسیوس و بەدەم و لەبزێکی شیرین گوتی:

"ئەی غەریبۆ، ئایا ئاخاییەکان رێزوحورمەتیان گرتیت، یان ئەمجارەش وەکو یەکەمجار سووکایەتیان پێکردووی؟"

ئودیسیوسی فاما بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"ئاه، یومایوس، خۆزگە خواوەندان، ئەم خەڵکەیان بە سزای گۆساخی و بێ ئەدەبی خۆیان دەگەیاند! ئەو خەڵکەی کە لە ماڵی خەڵکی دا بەوپەڕی بێ شەرمی رەفتار دەکەن و کەمترین رێزو حورمەتیان تیا نیە."

## میلانتیوس تەشەر لە ئودیسیوس دەدات

لە کاتێکدا ئەو جووتە بەو شێوەیە قسەیان بۆ یەکتر دەکرد، میلانتیوسی بزنەوان هات بەسەرا، کۆمەڵێك بزنی قەڵەوی هەڵبژاردەی نێو مێگەلە بزنەکەی پێش خۆی دابوو، تا بۆ خوازگارەکان بیانکوژنەوەو دوو شوانی دیکەشی بە دواوە بوون. بزنەکانی بردو لە ژێر دالآنێکدا بەستنییەوە، ئەوسا رووی کردە ئودیسیوس‌و ئەم قسە ناڕەوایانەی پێ گوت:

"ئەرێ کابرا ئەوە هێشتا هەر لێرەی؟ دیسان دەتەوێ بەناوی گەداییەوە خەڵکی بێزاربکەی؟ باشە بۆ ناڕۆیت بۆ شوێنێکی دیکە؟ شوێن براوە؟! لەوە ناچێ بەبێ تێهەڵدان لێرە بڕۆیت، باشە، کە تۆ بەوپەڕی بێ شەرمی سواڵ دەکەیت، ماڵ براوە ئێرە نەبێت، لە هیچ ماڵە ئاخاییەکی دیکەدا جەژن نیە ئێرە نەبێت!؟"

ئودیسیوسی فاما هیچ وەڵامێکی نەدایەوە، سەرێکی لەقاندو لە دڵی خۆیدا بیری لە تۆڵە دەکردەوە.

## فیلوتیوس قسە دەگەڵ یومایوس و ئودیسیوس دا دەکات

ئەوسا فیلوتیوس، سەر گەورەی گاوانەکان هات، گوێرەکەیەکی قەڵەووچەند بزنێکی لەگەڵ خۆدا بۆ خواردنی خوازگارەکان هێنا بوو: چەند دەریاوانێك کە ئامادە بوون بەکرێ خزمەتی هەموو کەسێك بکەن، ئەو حەیوانانەیان لەگەڵ خۆدا هێنا بوو. فیلوتیوس حەیوانەکانی بە جوانی لە دالآنەکەدا بەستنەوە، وبە خۆی چووە لای بەرازەوانەکەوەو لێی پرسی:

"ئەی بەرازەوان، ئەم غەوارەیە کێیە وا هاتووەتە ماڵی ئێمە؟ دەڵێ کێیەو کوڕی کێیە؟ لە چ تیرەو تایفەیەکەو کوێندەرییە؟ بەڵەنگاز خۆت! بەسەروسیمادا لە شاو شازادان دەچێت. بەڵام خواوەندان کە بەختی یەکێکیان رەش کرد، ئیدی گوێ نادەنێ گەدا بێ یان پاشا!"

ئەوسا لە ئودیسیوس نزیك کەوتەوە، تەوقەیەکی دۆستانەی دەگەڵ کردو گوتی:

"سلاوت لێبێ، ئەی غەریب، زۆر پەرێشان دیاریت، هیوادارم بەم زووانە لە تەنگانە دەربچیت‌و بەخت بە پیرتەوە بێت! ئەی زیوسی بە توانا، هیچ خواوەندێك هێندەی تۆ بە سام‌و سامناك نیە، دڵت بە بەشەران ناسوتێ: بەخۆت دەیان هێنێتە دنیاوەو پاشان دووچاری بەدبەختی‌و دەردو رەنجی کوشندەو بەزەبریان دەکەیت. کە ئەم پیاوەم بینی ئارەقی شەرمەزاریم دەردا، فرمێسك زاییە چاوانم، چونکە ئودیسیوس–م بیر کەوتەوە. دەترسم ئێستا ئەویش، ئەگەر مابێ‌و لە ژیاندا بێ، جلێکی شڕوشپڕێوی وەکو جلەکانی ئەم پیاوەی لەبەردا بێ، و وێڵ‌و سەرگەردان چاوی لە دەستی خەڵکی بێت. خۆ ئەگەر مردبێ‌و ئێستا لە خانەی هادیسدا بێ، هەزار حەیف‌ومەخابن، بۆ ئەو مەردەمێرو جامێرە بێهاوتایە! هاوار بە ماڵی من! من هێشتا زۆر منداڵ بووم کە ئودیسیوس لە نێو سیفالینییەکانەوە هێنامی بۆ چاودێری و سەرپەرشتی گاڕانەکانی! هێندە بە دڵ‌و بەگیان گایە نێو چەوان پانەکانیم بەخێو کردوون، کە ئێستا ئەوەندە زۆر بوون لە ژمارە نایەن. کەس وێنای نەدەکرد ئەو گاڕانە بەو رادەیە زیاد بکات. بەڵام ئەوەی مایەی داخ‌و کەسەری دڵی منە، ئەوەیە بێگانان ئەمرم پێدەکەن پەیتا پەیتا لەو گایانەیان بۆ بێنم تا بیان کوژنەوەو بیخۆن، بێ ئەوەی گوێ بە کوڕەکەی بدەن کە لەم ماڵەدایە. یان بێئەوەی لە قارو

غەزەبی خواوەندان بترسن، بەڵكو لە هەوڵو هەڵپەی ئەوەدان كە موڵكوماڵەكەی ئاغامان، چونكە لە مێژە رۆییوەو هیچ سەروسۆراخێكی نیە، لە نێو خۆیاندا دابەش بكەن. بۆیە زۆرجار لە دڵی خۆمدا بیرم لەوە كردووەتەوە كە ئەگەر بە خۆو گاگەلەكەمەوە لێرە بڕۆمو پەنا وەبەر بێگانان بەرم، زۆر باشترە، لەوەی من گاگەل بەخێو بكەمو خەڵكی دیكە بە ناڕەوا بیخۆن. بەڵام كە بیرم لە كوڕەكەی ئاغامان دەكردەوە بە تەنیا لێرەیەو خاوەنی راستەقینەی ئەم موڵكو ماڵەیە، بە جوانم نەدەزانی بڕۆم. ژیوان دەبوومەوەو پێم رێی دا نە دەگرت. راستت دەوێ دەبوایە زۆر زوو ئێرە بەجێ بێڵمو پەنا وەبەر پاشایەكی جامێرو پیاوانە بەرم. چونكە بەڕاستی ژیانم، ژیان نیە، دۆزەخە، لە توانای هیچ كەسێكدا نیە. هاكا سەری خۆم هەڵگرتو رۆییشتم .بەڵام وێڕای ئەوەش دڵخۆشی خۆم بەوە دەدەمەوە كە لەگینە ئەو بەلەنگازە، رۆژێك لە رۆژان، لە شوێنێكەوە سەر هەڵبداتەوە، بزڤڕێتەوە، بپێتەوە بە ئاغای ماڵی خۆیو هەموو ئەو خوازگارانەی كە بە ناهەق خۆیان كردووە، بە خاوەن ماڵ، تەفروتونا بكاتو لە نێویان بەرێت."

## كابرای غەریب پێشبینی گەڕانەوەی ئودیسیوس دەكات

هەنگێ ئودیسیوسی بەردەبار بەرسڤی دایەوەوگوتی:

"ئەی گاوان، لەوە دەچێ تۆ پیاوێكی بە ئەمەك وبە نمەك بی. وا دیارە هەستیارو سالۆرو ژیری، بۆیە هەرچەندە سوێندت لەسەرم نیە، سوێندت بۆ دەخۆم: قەسەم بە زیوسی خودانو گەورەی خواوەندان، قەسەم بەم نانو نمەكەی من لەم ماڵەدا كردوومە، سوێند بەم كوانگو ئاورگەیەی ئودیسیوسی رەسەنو خانەدان كە رێم تێی كەوتووە، دڵنیات دەكەم كە تۆ فریا ناكەوێ ئێرە بەجێ بێڵی، ئودیسیوس دەگەڕێتەوە ئێرەو بە چاوی خۆت، ئەگەر حەز بكەی، دەبینی كە قڕ دەخاتە ئەو خوازگارانەی كە ئێستا لێرە فەرمانڕەوایی دەكەن".

كابرای گاوان وەڵامی دایەوەو گوتی:

"هانام بەدەمت، خۆزگە زیوسی كوڕی كرونوس ئەم پێشبینییەی تۆی دێنایە دی. هەنگێ دەتبینی چۆن دێمە دەستو بە چ هێزو توانایەكەوە كۆمەكی ئودیسیوسم دەكرد".

(یومایوس)ش بە هەمان شێوە لە هەموو خواوەندان پاڕایەوە كە ئودیسیوس-ی فاما بە زووترین كات بگەڕێتەوە سەر ماڵو حاڵی خۆی.

## خوازگارەكان نەخشەی كوشتنی تیلیماخۆس دەكێشن

ئەوان بەو جۆرە قسەیان دەگەڵ یەكدی دا دەكرد. لەم لاشەوە خوازگارەكان نەخشەی كوشتنی تیلیماخۆسیان دەكێشا. بەڵام لە پڕ بازێك لەلای چەپیانەوە دەركەوت، بازێكی بەرزە فڕ، كۆترێكی بەستەزمانی تۆقیوی بە چنگەوە بوو. ئەمفینوموس رووی تێكردنو هەڵیدایە:

"دۆستان، ئەم نەخشەی كوشتنی تیلیماخۆسە سەرناگرێت. باشتر وایە واز بێنینو بڕۆین فراڤێنی بۆ خۆ فەراهەم بكەین."

هەمووان قسەكەی (ئەمفینوموس)یان بەگەن كرد. گەڕانەوە بۆ كۆشكەكەی ئودیسیوسی مەردەمێر، پاڵتۆو عەباكانیان لەسەر كورسیەكان دانا. ئەوسا بەناو كەوتن، مەڕو بزنو بەرازو گوێرەكە دابەستەو قەڵەوەكانیان كوشتەوە. جەرگوناوەكانیان برژاند، بەسەر خۆدا دابەشیان

کرد، شەرابیان لە سوراحیاندا گرتەوە، بەرازەوانەکە جامی بەسەردا دابەش کردن. فیلوتیوسی سەرە شوان سەبەتە بەدەست نانی بۆ دانان. میلانتوس جێی ساقی گرتبووەوە. هەنگێ خوازگارەکان دەستیان بۆ نان و خوانەکەی بەردەمیان برد.

## تیلیماخۆس لێدەبڕێ بەرگری لە کابرای غەریب بکات

تیلیماخۆس بە مەبەستەوە، ئودیسیوسی بردە هۆڵەکە، لەسەر کورسی و مێزێکی پەرپوت داینا، تۆزێ جگەرو دڵی برژاوی بۆ دانا، بادەی بۆ لە جامێکی زێڕین کردو گوتی:
"بۆ خۆت لێرە، لە نێو ئەم پیاوانە دانیشەو شەرابی خۆت بخۆرەوە: خەمت نەبێ، نایەڵم هیچ کەسێك تەوس و تەڵفیزیت پێبکات یان دەستت لێ بکاتەوە. چونکە ئێرە پەناگەی گشتی نییە، بەڵکوماڵە، ماڵی ئودیسیوسە وبۆ منی پێکەوە ناوە. ئێوەش گەلی خوازگاران ئاگاتان لە دەمی خۆ بێ، کەس جنێو نەدات، کەس شەڕ نەفرۆشێت، تا شەڕو فەرتەنە لێرە نەقەومێ."

## خوازگارەکان سەریان لە جەسارەتی تیلیماخۆس سوڕدەمێنێ

هەرکە تیلیماخۆس ئەو قسەیەی کرد، هەموو لێویان گەست. زۆریان پێ سەیر بوو، کە تیلیماخۆس بەو جەسارەت و بێباکیە قسە دەکات. ئەنتینوسی کوڕی پوپیتس هەڵیدایەو گوتی:
"کوڕینە، گەلی ئاخاییان، هەرچەندە ئەو قسانەی تیلیماخۆس ناخۆشن، بە زمانی خۆی هەڕەشەمان لێدەکات، بەڵام نابێ بە هەندی بگرین. خوا بیکا بە قوربانی زیوسی کوڕی کرونوس. ئەو فریای کەوت و نەیهێشت، دەنا دەمێ بوو ئەم زماندرێژە دەمەوەرەمان، لێرەدا، لەم کۆشکەدا خەفەو بێدەنگ کردبوو".
ئەنتینوس ئەو قسانەی کرد. بەڵام تیلیماخۆس خۆی لێ بە خاوەن نەکردو هەر گوێشی نەدایە. لە هەمان کاتدا خولام و نوکەران قوربانی گەورە (قوربانی سەد سەرگا بۆ خواوەندان) یان بۆ خواوەندان بەرپا دەکرد، ئاخاییانی قژ درێژ پێکەوە لە ژێر سێبەری بێشەکەی ئەپولودا، ئەپۆلوی تیرەندازدا، کە تیری دەگەییە دوورترین شوێن، کۆ دەبوونەوە. پاش ئەوەی گۆشتەکەیان جوان و لە هەردوو دیوەوە برژاند، لە شیشەکانیان داماڵی و خوانێکی بەشکۆیان رازاندەوە. ئیدی سفرەچیان بەشە گۆشت و خۆراکێکی هاوتای بەشی ئەوانی دیکەیان بۆ (ئودیسیوس)ش دانا. ئەمە فەرمانی تیلیماخۆس، کوڕە ئازیزەکەی ئودیسیوسی موبارەك بوو.

## کتیسیپوس هەوڵدەدا تەعەدا لە کابرای غەریب بکات

ئەتینا بە ئانقەست جڵەوی بۆ خوازگارە سەرکێش و خۆپەسندەکان شل کردبوو، کە بە ئارەزووی خۆیان جنێو بدەن و ئاژاوە بنەنەوە، تا زیاتر دڵی ئودیسیوسی کوڕی (لایرتیس)یان لێ پڕ ببێ و پتر قینی هەستێت. جا بە رێکەوت، کابرایەکی کەللەشەقی بێ ئەدەب و زمان پیسیان لەنێودا بوو، بە نێوی کتیسیپوس، ئەمە خەڵکی سامی بوو، زۆر دەوڵەمەند بوو، بە حوکمی سەروەت و سامانی زۆر، خۆسەرانە کەوتبووە سەر خەیاڵ کە ژنەکەی ئودیسیوس، کە لە مێژ بوو بێ سەرو شوێن بوو، بخوازێت. هەستا رووی کردە خوازگارە لە خۆباییەکان و گوتی:

"ئەی خوازگارانی رەسەنو نەجیمزادە، گوێبگرن با شتێکتان پێبڵێم. ئەم کابرا غەوارەیە بەشێکی هاوتای بەشی هەر یەکێك لەوان وەردەگرێت! ئەمە کارێکی زۆر باشە، چونکە هیچ رەوای هەق نیە میوانانی تیلیماخۆس، هەرکێیەك هەنو لە هەر کوێیەکەوە رێیان کەوتووەتە ئەم ماڵە بێ بەش بکرێن. جا ئێوە بە شایەد بن، منیش وەکو دابی میوانداری لە بەشەکەی خۆم شتێك بەم غەوارەیە دەدەم، تا ئەویش بتوانێت بە دیاری پێشکەش بە کارەکەرە کیسە کێشەکە یان هەر خولامو خزمەتکارێکی دیکەی ماڵەکەی ئودیسیوسی بکات."

هەرکە لە قسەکەی بووەوە، دەستی برد، لە سەبەتەیەکی نزیکی خۆیەوە کە گۆشتی تیا بوو، سمە ولاخێکی هەڵگرتو راست خێواندییە ئودیسیوس. ئودیسیوس سەری دانەواندو سمەکە سەری کرد،و رێك بەر دیوارەکە کەوت. ئودیسیوس بزەیەکی ساردی کینە ئامێزی کردو هیچی نەگوت.

تیلیماخۆس بە تورەیی کەوتە سەرزەنشتی کتیسیپوسو گوتی:

"کتیسیپوس خوا بتکات بە قوربانی بەختی خۆت کە کابرای بێگانەت نەپێکا، بەراستی شانست هەبوو، کە خۆی لادا، ئەگینا بەم نێزە تیژە کوناودەرم دەکردیت، وکارێکی وام دەکرد بابت لێرەدا لە جیاتی زەماوەند، پرسەت بۆ بگێرێ.ی کەس بۆ نیە چیتر لێرەدا، لەم ماڵەدا کاری خۆسەرانە بکات، وخۆی بنوێنێ. من ئێستا منداڵەکەی جاران نیم، ئێستا گەورە بووم، بیر دەکەمەوە، لە هەمووشتێ تێدەگەم، خێرو شەری خۆم دەزانم. من ئێستا ئەو منداڵەی جاران نیم کە بە ئاشکرا، پەزتان دەکوشتمەوە، نانتان دەخواردم، وبادەو شەرابتان دەخواردمەوەو زەقەی چاوم دەهاتو هیچ دەسەلاتێکم نەبوو. چیتر ئەمەتان لێ قەبوولْ ناکەم. هەرچەندە زۆر زەحمەتە کەسێکی تەنیا بالْ دەرەقەتی کۆمەڵێك بێتو بتوانێ کۆنترۆڵیان بکات! بەلام نەخەڵەتابن جارێکی دی ئازارم بدەن، دەست لەم رکونییە هەڵگرن. خۆ ئەگەر سوورن لەسەر ئەوەی بمکوژن، فەرموو ئەوە عەرزو ئەوە گەز. مردنم زۆر خۆشترە لەوەی کە هەموو رۆژێ ئەم کارە درێوانەی ئێوە بدینم: بە بەرچاوی خۆمەوە میوانانم ئازار دەدەن، پەلی کارەکەرانم دەگرن، و لە ماڵە جوانەکەی خۆمدا، بە شێوەیەکی زۆر بێشەرمانە دەگەڵیاندا رادەبوێرن."

## ئەجیلاوس ئامۆژگاری تیلیماخۆس دەکات...

هەموو سەریان لە قسەکانی تیلیماخۆس سورما، کروکپ، بێدەنگو خامۆش بوون. کەس ورتەی لێوە نەهات تا ئەنجام ئەجیلاوسی کوری داماستور هەڵیدایەو گوتی:

"برادەرینە، پیاو نابێ قسەی هەقی پێناخۆش بێت،و بە زبری وەلام بداتەوە، قسەکانی بەجێن. واز لەو کابرا غەوارەیە بێنن، کەس بەد رەفتاری دەگەڵ هیچ خولامێکی ئەم ماڵەی ئودیسیوس دا نەکات. بەلام من حەزدەکەم قسەیەکی دۆستانە بە تیلیماخۆسو دایکی بڵێم کە رەنگە بە دڵی هەردووکیان بێت. تا ئەو کاتەی کە ئومێدتان بە گەرانەوەی ئودیسیوسی فاماو مەردەمێر هەبوو، و چاوەروانی گەرانەوەی ئەوتان دەکردو جوابتان لە خوازگارەکان نەدەگێرایەوە. کەس هەقی ئەوەی نەبوو گلەیی و گازاندەتان لێبکات، ئەو کارەتان کارێکی ئاقلانەو بەجێ بوو، چونکە لەگین بوو ئودیسیوس گەرابایەوەو هاتباوە سەر ماڵو حاڵی خۆی. بەلام ئێستا مەعلومە کە ئیتر

ناگەڕێتەوەو بە چاو نایبیننەوە. کەواتە تیلیماخۆس، بڕۆ لەگەڵ دایکتدا دانیشەو قسەی دەگەڵ بکە، پێی بڵێ، بزانە کێ نەجیمزادەترو کێ دیاریو پێشکەشی زیاتری دەداتێ، وجیازی پتری بۆ دەکات، با شوو بەو کەسە بکاتو بڕێتەوە. هەنگێ تۆش بار سووکو سەر سەلامەت، لە ماڵی خۆتا، میراتیەکەی بابت دەگریتە دەست،وکاروباری خۆت ڕێکدەخەیتو ماڵی خۆت بەڕێوە دەبەیتو بە ئیسراحەت دەخۆیتودەخۆیتەوە، ودایکیشیت لە ماڵی مێردێکی تردا خەریکی ماڵوماڵداری خۆی دەبێت."

## تیلیماخۆس بەرهەڵستی شووکردنی پنلوپی نابێت

تیلیماخۆسی زیرەکو هۆشمەند بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"ئەی ئەجیلاوس، قەستەم بە زیوس، قەستەم بە دەردومەینەتیەکانی بابم، کە بێگومان لە دووری ئیتاکا مردووە، یان وێڵو سەرگەردان شەڕ بە ژیان دەفرۆشێت، من هەرگیز بەرهەڵستی شووکردنی دایکم نیم. بەڵکو بە پێچەوانەوە هانی دەدەم بە دڵی خۆی یەکێك هەڵبژێرێو شووی پێبکات، وئامادەم دیاریو سەوقاتییەکی یەجگار زۆریشی پێشکەش بکەم. بەڵام شەرمم بە خۆیە، بە قسەی ساردوسڕ، بە ناخۆشی، وبە تۆبزی ناچاری بکەم ئەم ماڵو حاڵە بە جێ بێڵێ، چونکە ئەمە ڕەوای هەق نییەو هیچ خواوەندێك ڕەفتاری وام لێ قەبووڵ ناکات!"

دوای ئەو قسانەی تیلیماخۆس، ئەتینا خۆی لە کاروبارەکان هەڵقورتاند، هۆشو بیری خوازگارەکانی پەریشان کرد. کردیە کارێك بە شێوەیەکی هیستریانە لە قاقای پێکەنینێکی ناشیرینو بێبڕانەوە بدەن. بە جۆرێ پێدەکەنین دەتگوت ئستۆپی چەناگەیان پچڕاوە، بەدەم جوینی گۆشتەکەی نێو دەمیانەوە، خوێن لە زاریان دەچۆڕا، وچاویان نقومی روندکان دەبوو، هێندە دڵیان خەمناك بوو، دەیانویست لە بانگی گریان بدەن. کە تیوکلیمینۆس-ی خواوەند ئاسا ئەمەی بینی هەڵیدایێ گوتی:

"بەدبەختینە! ئەوە چیتانە، چ دەردێکتانە، چ نەگبەتیەك گرتوونی؟! وا وەیلا بە حاڵتان، سەراپاتان: سەرتان، دەموچاوتان، لاقتان لە تاریکی نیشتووە، ناڵەی گریان دنیای پڕ کردووە، گۆناتان نقومی روندکان بووە، خوێن هەستاوە، بە بەینی پایەو ستوونە جوانەکاندا، بە دەرو دیوارەکاندا ڕێدەکات، چوار دیواری کۆشكو سەراکە، پڕ بووە لە تاپۆو شەبەنگانو بەپەلە خۆیان بۆ قوڵایی تاریکخانەو زوڵوماتی ئێریبوس دەکوتن. هەتاو بە ئاسمانەوە نەما، تەمو مژێکی شووم باڵی بەسەردا کێشاوینو هەموو شتێکی داپۆشیوە.".

کە ئەو قسانەی کرد، هەموو کەوتنە ریشخەن پێی. هەنگێ یوروماخۆس، کوڕی پولیبوس، رووی تێکردنو گوتی:

"ئەم کابرایە شێتە، ئەم غەوارەیە کە نازانم لە کوێوە هاتووە، ئەقڵی لە دەست داوە، دەی گەنجینە وەرن پەلی بگرنو تووڕی بدەنە ئەو مەیدانە، بیبەنە دەرەوە، مادامێکی ئێرەی لەلا تاریكو تاریکستانە، با بۆ خۆی لەوێ رابوێرێ."

## تیوکلیمینوس پێشبینی شەڕ دەکات

تیوکلیمینوس-ی خواوەندئاسا بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"یوروماخۆس، من داوام لێنەکردوویت کەسم لەگەڵدا بنێری، پێویستم بە کەس نییە، بە خۆم دەڕۆم. چاوو گوێو ئەقڵو هۆشم هەیە، بەوانەوە لێرە دەڕۆم، نەگبەتیو بەدبەختییەکی کوشندە دەبینم کە بەسەر سەرتانەوە دەسوڕێتەوەو کەس ناتوانێ لێی رزگار بێ، هیچ یەکێك لە خوازگارەکان، هیچ یەکێك لە ئێوە کە لەماڵەکەی ئودیسیوسی موبارەکدا تەراتێنتانەو بەئارەزووی خۆتان خەڵکی ئازار دەدەنو جگە لە پیلانو دەسیسەو تاوانی ناڕەوا هیچتان لە بیرو لە خەیاڵدا نییە، لێرە دەرباز نابنوبە سەلامەتی دەرناچن.؟

## خوازگارەکان گاڵتە بە تیلیماخۆس دەکەنو ئەو گوێیان ناداتێ

بەدەم ئەو قسانەوە لە کۆشکە گەورەکە وەدەرکەوتو بەرەو لای پیرایوس وەڕێکەوت کە بەوپەڕی رووخۆشیو دڵخۆشییەوە پێشوازی کرد. بەڵام خوازگارەکان هەموو کەوتنە روانینی یەکتر، کەوتنە گاڵتە کردن بە میوانەکانی تیلیماخۆس بەو نیازەی کە توڕەی بکەن. یەکێك لە گەنجە لەخۆباییەکان گوتی:

"ئەی تیلیماخۆس! هیچ خانەخوێیەك بە ئەندازەی تۆ بێ بەخت نییە: دەنا ئەم کابرا گەداو گەڕۆڵە نان خۆرو جێگرە چیە لای خۆت گلت داوەتەوە، دەبێ نانی بدەیتێ دەبێ شەرابی بدەیتێ، نە سەلکی سیرە نە قنچکی پیازە، نە پیاوی ئاشتییە نە کوڕی جەنگو مەیدان، هیچ کارێکی لە دەست نایە، لات پاڵەوانی خوایە، ئەسڵەن هەر بارە بەسەر زەویو ژیانەوە! ئەمجار نۆرەی ئەمی ترە هاتووە لە خۆوە خۆی لێکردووین بە غەیبزانو فاڵبین. وەرە بە قسەی من بکە، با ئەم غەریبانە بخەینە سەر کەشتییەکی گەورەو بۆ دوڕگەی (سیسیل)یان بنێرین، سیسیلەکان بەهایەکی باشمان دەدەنێ".

بەڵام تیلیماخۆس کەمو زۆر گوێی بە قسەکانیان نەدا، کڕوکپ دەیڕوانیە بابی، و بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی ئەوە بوو، بابی لە ئانو ساتدا بێتە دەستو بەربێتە گیانی خوازگارە بێ شەرمو گۆساخەکان.

## پنلوپی گوێ بۆ قسەی خوازگارەکان هەڵدەخات

لەم کاتەدا پنلوپی دوورئەندێش، کیژی ئیکاروس، کورسیە جوانەکەی خۆی لە هەنبەر ئەواندا، بەرامبەر بە هۆڵو داڵانەکە، بە جۆرێ دانا بوو، کە خوازگارەکان لە ژوورەوە هەر قسەیەکیان دەکرد، ئەو جوان جوان گوێی لێدەبوو. چونکە قوربانیەکی یەجگار زۆریان کوشتبووەوە، هەموو شادو بە کەیفو بەدەم قاقاو پێکەنینەوە خۆیان حازر دەکرد بۆ فراڤین، لەسەر خوانی ئاواو ئاوەدان، رازاوە بە خواردنی مشەو بەلەزەتوخۆش کۆببنەوە.

بەڵام بۆ شێو، خواردنێکی دیکە ئامادە دەکرا، کە زۆر ناخۆش بوو، خواردنی وا ناخۆش نەبووەو نەبووەتەوە، خۆراکێك بوو بەو زووانە خوابانۆیەكو مەردەمێرێك پێشکەشیان دەکردن. ئەوە کردەوەی نامەردانەی خۆیان بوو دەهاتەوە رێیان.

*    *    *

**پەراوێز:**

***- پانداریوس:**

**کوڕی میروپسی خێفزانو فالْبینی خەلْکی میلی یە، مێردی هارموتوی، و بابی ئایدونو کلیونیراو میرۆبی یە. زیوس سەگێکی زێڕینی دەبێت، پانداریوس دەیدزێتو لەلای تانتالوس دای دەنێت بەلاّم هیرمیس سەگەکە دەدۆزێتەوەو تانتالوس بە سزای خۆی دەگەیەنیٚ. ئیدی پانداریوس لەگەلْ ژنەکەیو هەر سیٚ کیژەکەیدا بۆ سەقلیە هەلْدیٚت، بەلاّم زیوس لیٚی نابێتەوەو لەگەلْ هارموتوی ژنیدا دەیانکوژێت.**

***- ئیرینوس:**

**ئەمانە سیٚ خوشکن بە جەستە بالْدارن، قژیان مارە، نێویان: ئالیکتو، تیسیفون و مژر-ە. ئەمانە ئالەتی تۆلْەی دەستی خواوەندان بوون، کە شەلاقو مەشخەلْ بەدەست، بە دنیادا دەگەڕانو بەشەرانی تاوانباریان دەدۆزییەوەو ئەشکەنجەیان دەدان، گوایە ئەمانە زادەی خاکێکن کە بە خوێنی ئورانۆس پیتێنرا بوو، کاتیٚ کە ئورانوس بە دەستی کرونوس کوژرابوو.**

***-ئایدون:**

**گوایە ئایدون کیژی پانداریوسو هاوسەری زیتوس، پاشای تیبە بوو وتەنیا یەك کوڕی هەبوو بە نێوی ئیتیلوس، نیوبەی کارەکەری شەش کوڕو شەش کیژی بوو بوو، ئایدون بەغیلی پیٚ برد بوو، ئیدی نەخشەی کوشتنی یەکیٚ لە مندالْەکانی نیوبە دەکێشێت، بەلاّم بە هەلْە تاقە کوڕەکەی خۆی دەکوژێت، زیوس-ش بۆ سوکنایی داخوکەسەری ئایدون، دەیکات بە بولبولو تا ئێستا بۆ مەرگی تاقانەکەی دەنالْیٚ.**

***- ئوپس:**

**خواوەندی فەڕو بەرەکەتو بەروبوومە. گوایە ژنی شا تورنوسو دایکی جوبیتەرە، خوابانۆی کشتکارییە لە سالْێکا دوو چەژنی هەیە، یەکێکیان لە وەرزی خەلەو خەرمانە ئەویتریان لە وەرزی جووتو تۆودانە.**

***- هادیس:**

**خواوەندی دنیای مردووانە، بە دوورە لە هەر بەزەییو دلۆڤانییەك.**

***- ئیریبوس:**

**کوڕی خاوسو بابی ئیترو هیمیرایە. رەمزی تاریکییە بە تایبەتی تاریکی ژێر زەوی، بۆیە ئیریبوس زۆر جار وەکو ئامارە بۆ جیهانی ژێرین، هادیس بەکار دەهێنریٚ.**

## سروودی بیستو یەکەم

**کورتەی سروودەکە:**

پنلـوپ دەچـێت کەوانەکـەی ئودیسـیوس دێـنیٚو داوا لـە خوازگارەکـان دەکـات دەسـت بـە پێشـبڕکێیەکە بکـەن، یومـایوس تیرەکـان لای خـۆی دادەنێـت.تیلیمـاخۆس هەوڵـدەدا کەوانەکـەی بابی راکێشێتو بهێنێتـە سـەرپیٚ، چیوای نـامێنیٚ دەرەقـەتی ئـەو کـارە بێـت، کـە بـە ئامـاژەیـەکی ئودیسیوس دەستبەردار دەبێت. خوازگارەکانیش بێهودە خۆیـان تـاقی دەکەنـەوە. ئودیسـیوس دەگەڵ یومایوسو فیلویتیوسدا لە هۆڵەکە دەچێتە دەریٚو خۆی پێیـان دەناسـێنیٚو ئامـۆژگـاریو رێنوێنی پێویستیان دەکات. یوروماخۆس-ش خۆی تاقی دەکاتەوە، بـەڵام هـیچ ناکـاتو کەوانەکەی بۆ نایەتـە سـەرپیٚ، و تـوڕە دەبێـت. بـە پێشـنیازی ئـانتینوس پێشـبڕکێیەکە دەخرێتـە سبەی. (ئودیسـیوس)ش داوا دەکـات کـە خـۆی تـاقی بکاتـەوە. ئـانتینوس ئەمـەی بـە دڵ نابێـت. تیلیماخۆس ئاشکرای دەکات کە تـەنیا ئـەو دەتـوانیٚ کەوانەکـە بکێشـێتو بهێنێتـە سـەرپیٚ. هـەر چەندە خوازگارەکان ناڕەزایی دەردەبڕن، بەڵام یومـایوس، کەوانەکـە دەداتـە دەسـت ئودیسـیوس. تیلیمـاخۆس فـەرمان بـە یوریکلیـا دەدات کـە لـەو کاتـەدا کـە فیلویتیـوس دەرگاکـانی حەوشـە دادەخـات، ئـەویش ئـەو دەرگایانـەی دێنـە سـەر هۆڵەکـە دابخـات. ئودیسـیوس کەوانەکـەی رادەکێشێتو تیرەکەی بە کونی هەر دوازدە پاچەکەدا رەت دەبێت.

***

### پنلوپی کەوانەکەی ئودیسیوس دێنیٚو مەرجەکانی شووکردنی خۆی رادەگەیەنیٚ

ئـەتینا، خوابانۆی چاوگەش، ئـەوەی خسـتە دڵـی پنلـوپی فامیـدە، کیـژی ئیکـاروس-ەوە، کـە بچێت تیروکەوانەکـەی ئودیسـیوس بێنیٚ، هـەم وەکـو ئـەوزاری پێشـبڕکیٚو هـەم وەکـو سـەرەتاو دەستپێکی مەرگو کوشتار، بیخاتە بەر دەستی خوازگارەکان. پنلوپی بـە قاڵدرمـە بەرزەکانـدا بـۆ باڵەخانەکەی خۆی سەرکەوت، کلیلێکی چەماوەی روختەی هێنا، کە لە برونز دروست کرابوو، و دەسکەکەی لە عاج بوو. دەگەڵ کارەکەرو هاونیشنەکانیا چوو بۆ دوورترین ژووری ماڵەکە: ئـەم ژوورە عـەماری گەنجینـەکانی ئودیسـیوس بـوو، پـڕ بـوو لـە برونـز، وزێـڕو توحفـەی لـە ئاسـن دروستکراو. کەوانەکەیو تیردانێکی لێبوو، پڕ بوو لـە تـیری کوشـندە. ئـەم تیروکەوانـە دیـاریی ئیفیتوسی کوڕی یوریتوس بوو کە ئودیسیوس لە لاسیدیمون تووشـی بـوو بـوو. ئـەم جووتـە، لـە میسینی لە ماڵی ئورتیلوخۆسی دووربینو سالۆر یەکتریان بینی بوو. ئودیسیوس بۆیە چوو بـوو بۆ ئەوێندەر، تا هەقو قەرزێکیان لەسـەر ئـەو خەڵکـە بـوو وەری بگرێتـەوە: چونکـە میسـینیەکان، بەکەشتییە گەورەکانیان سیٚ سەد سەر مەڕیان بە شوانەکانیانەوە لە ئیتاکاوە بۆ ئەوێنـدەر ڕفانـد بوو. ئیدی ئودیسیوس رێگەیەکی دوورو درێژی بڕی بـوو وبـۆ سـۆراخو تـاقیبی ئـەو پەزانـە چـوو بوو. ئەوسا هێشتا گەنجێکی مناڵکار بوو، لەلایەن باوکیو پیرەمێرەکانی ترەوە بـەو کـارە قورسـە

راسپێردرابوو. جا (ئیفیتوس)ش کە دوازدە ماینی رەسەنی جوانوو لەبەری لیێ ون بوو بوو، چوو بوو بۆ ئەوێندەر تا تاقیبیان بکات. بەڵام ئەو ماینانە سەریان خوارد،و لەسەریان بە کوشت چوو. کە بۆ سۆراخ چوو بوو بۆ ماڵی هەرقلی کوڕی زیوس، ئەو هەرقلەی لە مەیدانی ئازایەتیدا گۆی هونەری بردبووەوەو هاوتای نەبوو. هەرقل تەماحی کردبووە ماینەکان، گەوج گەوج بێئەوەی گویێ بداتە دابونەریتی میوانداری، بێئەوەی لە غەزەبی خواوەندان بترسێت، بێئەوەی رێزی ئەو سفرەو نانو نمەکەی خۆی بگرێت کە بۆی دانا بوو. لە ماڵەکەی خۆیدا، ئیفیتوسی بێکەس کوژ کردبوو، وماینە سمخڕو رەسەنەکانی بۆ خۆی هەڵگرتبوو. لەو کاتانەدا کە ئیفیتوس لە ماینەکانی دەگەڕا، ئودیسیوسی بینی بوو، و ئەو کەوانەی بە دیاری پێشکەش کردبوو. ئەم کەوانە جاران هی یوریتوسی مەردەمێر بوو، بەڵام کە مردبوو، لە کۆشکە بەرزەکەی خۆیدا، بۆ ئیفیتوسی کوڕی بەجیێ هێشتبوو. ئودیسیوس-ش بۆ یادگارو بەمەبەستی بتەوکردنی پەیوەندی دۆستانەیان شیرێکی تیژو نێزەیەکی قایمی پێشکەش کردبوو. بەڵام ئەو جووتە هەرگیز لەسەر سفرەو خوانی یەکتر دانەنیشتن: چونکە کوڕەکەی زیوس، زوو کوڕەکەی یوریتوس، ئیفیتوسی خواوەند ئاسای، کە ئەو کەوانەی پێشکەش بە ئودیسیوس کردبوو، کوشتبوو. جا ئودیسیوس کە چوو بۆ شەڕی تەروادە، ئەو کەوانەی لەگەڵ خۆدا نەبرد، بەڵکو وەکو یادگاری دۆستێکی ئازیز لە ماڵەوە بەجێی هێشت. تەنیا لە وڵاتو زاگەی خۆیدا بەکاری دێنا.

پنلوپی خانەدانو رەسەن گەییە بەر عەمارەکە، چوارچێوەی دەرگاکە زۆر وەستایانە لەدار بەڕوو دروستکرا بوو، رێكو ئەستونی وەستا بوو، زۆر بەمکومی دووتاکی دەرگایەکی لە رەندە دراوی سافو لووسی لە خۆ گرتبوو، خێرا دەستی برد، پەتی کوڵۆمتەی دەرگاکەی شل کردەوەو ئەوجا کلیلەکەی بە کلیلدانی دەرگاکەدا کرد، و بە توندی بایدا، وەکو چۆن گایەك لە مێرگداو بەدەم لەوەڕەوە دەبۆڕێنیێ، بەو ئاوایە دەرگاکە بە هاڕوهۆڕ لەبەردەمیا کرایەوە. خانم خۆی بە ژوورا کرد، سەرکەوتە سەر ئەو سەکۆیانەی کە سەندوقانی پڕ جلكو بەرگی جوانو بۆندرایان لەسەر هەڵچنرا بوو. ئەوسا دەستی برد کەوانەکەی، کە لە کیفێکی بەڕەونەقی رەخشاندا، بە دیوارەکەوە هەڵواسرا بوو داگرت. لەوێندەر دانیشت، کەوانەکەی خستە سەر هەردوو ئەژنۆی، لەو دەمەدا کەخەریك بوو لە کیفەکەی دەردێنا، لە بانگی گریانێکی بە کوڵی دا. کە تێر گریاو کوڵی گریانی لە جۆش کەوت، ریێو ریێ بۆ هۆڵە گەورەکەو بۆ نێو خوازگارەکان رۆیی. کەوانەکەو تیردانێکی پڕ لە تیری کوشندەو مەرگباری بە دەستەوە بوو. هاودەمو کارەکەرەکانیش بە دوویدا هاتن. سندوقێکیان هەڵگرتبوو کە پڕ بوو لە ئاسنو برونزو ئەو کەرەستانەی کە جاران ئودیسیوس لە گەمەو سەرگەرمیەکانی خۆیدا بەکاری دێنان. کە خانمی رەسەنو خانەدان گەییە نزیکی خوازگارەکان، خۆی بە هۆڵەکەدا کرد، لە پاڵ پایەیەکی مکومدا، لە نزیکی دەرگاکەوە، وەستاو رووبەندە درەخشانەکەی دادایەوە. دوو کارەکەری بە ئەمەكو دڵسۆز لە راست و چەپیا وەستان.

پنلوپ یەکسەر رووی کردە خوازگارەکان وگوتی:

"ئەی خوازگارانی لە خۆبایی، ئێوە کە دەزانن خاوەنی ئەم ماڵە لێرە نییە، لە مێژە رۆییوەو نەگەڕاوەتەوە، ئەمەتان بە هەل زانیوەو بە بیانووی ئەوەوە کە خوازبێنی من دەکەن و گەرەکتانە شوو بە یەکێکیتان بکەم، دەستتان بەسەر ئەم ماڵەدا گرتووەو هەمیشە هەر سەرگەرمی خواردن و خواردنەوەن، جا بۆ ئەوەی ئەو بیانووەتان بڕم، من پێشنیازی گرەوێك دەکەم، گرەوەکەش ئەوەیە کەوانەکەی ئودیسیوسی مەردەمێرو مویارەکتان بۆ دێنم، هەرکەسێك توانی بە ئاسانی و لەوانی تر باشتر بهێنێتە سەرپێ و تیرێکی پێ بهاوێ و بە کونی دوانزە پاچی بەریزی یەکەوە ئاودیوی بکات، من یەکسەر بەگەڵ ئەو دەکەوم و لە پێناوی ئەودا ئەم ماڵە کە ژینگەی بوکێنیم و لانەی تاق لاویم بوو، ماڵێکی بە رزق و رۆزی و ئاواو ئاوەدان و بەفەڕو بەرەکەت بوو، بە جێدێڵم، هەرچەندە پێم وایە قەتاو قەت و تەنانەت لە خەویش دا لە یادم ناچێت."

### ئەنتینوس، یومایوس سەرکۆنە دەکات

دوای ئەو قسانە فەرمانی بە یومایوسی بەرازەوان دا کە کەوانەکەو پاچەکان بۆ خوازگارەکان ئامادە بکات. یومایوس بەدەم گریانەوە تیروکەوانەکەی لێوەرگرت و لەو شوێنەی دانا کە خانم فەرمووو بووی. گاوانەکەش کە چاوی بە تیرو کەوانەکەی ئاغای کەوت، سۆزی هاتە جۆش و لە بانگی گریانی دا. ئەنتینوس بە توندی کەوتە سەرزەنشتیان و گوتی:

"ئەی گوندییانی بێ ئەقڵ، گەوجینە، بۆچی بەو جۆرە دەگرین و روحی ئەم خانمە ئازار دەدەن؟ چما خۆی خەمی کەمە! مێردێکی لە دەست داوە وێنەی نەبووەو نابێتەوە، خەم و گریان هەر بۆ ئەم باشە! دەی هەڕن لە جێی خۆ دانیشن و نانەکەتان بخۆن، یان بڕۆن لە دەرەوە بگرین. ئەم کەوانە لێرە دابنەن خوازگارەکان بۆ خۆیان دەکەونە رکابەری. ئەمە کارێکی یەجگار دژوارە، کێشانی ئەم کەوانە هەوانتە نییە. هیچ کەسێك لەمانەی ئێرە هاوتای ئودیسیوس ناکاتەوە. من بە چاوی خۆم دیتبووم و هەرچەندە ئەوسا منداڵ بووم، بەڵام شێوەیم لە بیرماوە".

هەرچەندە ئەو قسانەی کرد، بەڵام لە دڵی خۆیدا بە ئاواتەوە بوو بتوانێ ژێی کەوانەکە راکێشێت و تیرەکە بە هەر دوازدە کونی پاچەکاندا ئاودیوو بکات.غافڵ بوو لەوەی یەکەم تیری ئودیسیوسی مەردەمێر، بەر ئەو دەکەوێت و شەرابی مەرگی پێ دەنۆشێت. چونکە ئەو یەکەم کەس بوو، ئودیسیوسی لە ماڵەکەی خۆیدا تەوهین کردو خوازگارەکانی دیکەشی لێ هاندا کە رێزی نەگرن و ریسوای بکەن.

### تیلیماخۆس هەوڵدەدا کەوانەکە بێنێتە سەرپێ لێ پاشگەزدەبێتەوە.

هەنگێ تیلیماخۆسی بە هێزو توانا، هەڵیدایەوگوتی:

سەیرە! بەڕاستی سەیرە! هەبێ و نەبێ زیوسی کوڕی کرونوس مێشکی تێکداوم. باوەڕ بە گوێی خۆم ناکەم، ئەوە دایکی منە، ئەو دایکە ئازیزو خۆشەویستەم، ئەو دایکە هێمن و ئاقڵ و مەندە، کە دەڵێت دەگەڵ پیاوێکی تردا دەڕوات، لەم ماڵە وەدەردەکەوێ، کەچی من گەوج گەوج پێدەکەنم، وەکو ئەوەی هیچ شتێك رووی نەدابێت، نا دەبێ مێشکم تێك چوو بێت. کەواتە ئەی خوازگاران، مادامێکی لەسەر پێشبڕکێ و گرەوەکە رازین، با پێشبڕکێییەکە دەست پێ بکرێ، پاداشتی ئەم پێشبڕکێیە خانمێکە وێنەو هاوتای نە لە دەڤەری ئاخاییان هەیە، نە لە پیلوسی

موبارەك، نە لە ئارگوس و نە لە میسینی و نـە لـە خـودی ئیتاك و نـە لەسـەر زەمین. ئێوە خۆشـتان ئەمە چاك دەزانن، ئیدی چ پێویست دەکا مـن دایکـی خـۆم هەڵکێشـم و بـە شـان و باڵیـدا هەڵبـدەم؟ کەواتە وەرن، بیانوان مەدۆزنەوە، با کارەکە درێژە نەکێشێت، بزانین کێ دەتوانێ ژێی ئەم کەوانـە بێنێتـەوە! هـەزار قسـە بـە کردەوەیـەك ناچێت! منـیش خـۆم بـەم کەوانـە تـاقی دەکەمـەوە، ئەگـەر توانیم بیهێنمە سەر پێ و تیرەکەم بە کونی هەر دوازدە پاچەکەدا ئاودیو کرد، ئەوا ئـەوەم لـە دڵدا نابێ بە خەفەت و گریێ کە ببینم دایکی ئازیزو بەڕێزم لـەم ماڵـە وەدەردەکـەوێ و دەگـەڵ مێردێکـی تردا دەڕوات. چونکە کوڕێکی لە پاش بەجێ دەمێنێ، کە دەتـوانێ کەرەسـتە جەنگییـەکانی بـابی بـەکاربێنێ و مینـاکی ئـەو لـە مەیـدان و پێشـبڕکێیان پێشـەنگ و سـەرقافڵە بـێ و گرێووخـەڵاتان بباتەوە".

کـە لـە قسـەکەی بـووەوە، عەباکـە سـورباوەکەی داکەنـد. گـورج هەسـتایە سـەرپێیان، شمشـێرە تیژەکـەی لـە شـانی داگرت بۆ ئـەوەی پاچـەکان بـەریز دابنـێ، چاڵێکـی ئـەوتۆی دروسـت کـرد کـە جێی هەموو پاچەکانی تیا ببێتـەوە، پاچەکانی بـە هێڵێکـی راسـت لـە چاڵەکەدا دانـا،وگڵی کـردە دەوریـان و بـە پێیـان گڵەکـەی کوتایـەوە. هـەموو سـەریان لـەم کـارەی سـوڕما، زۆر بـە جـوانی و بـە رێکی پاچەکانی دانا. ئەگەرچی پێشتر هەرگیز شتی وای نەبینی بوو! ئەوسا چـوو لـە ئاسـتانەی دەرگاکە وەستا،ودەستی بە راکێشانی کەوانەکە کرد. سێ دانە جار تاقیکردەوە، پڕ بە دڵ حەزی دەکـرد، بتـوانێ کەوانەکـە بێنێتـە سـەرپێ و تیرەکـەی بـە کـونی پاچـەکاندا ئـاودیو بکـات، بـەڵام بێهـودە... جـاری چـوارەمیش هـەوڵی دا، چـیوای نـەما کەوانەکـە بکێشـێ و تیرەکـە بهـاوێ، کـە ئودیسیـوس ئاماژەیـەکی کـردێ کـە دەسـتبەردار بێت. هـەنگێ تیلیماخۆس دووبـارە رووی کـردە ئامادەبووان و گوتی:

"زۆر بـە داخـەوەم! تـۆ بڵێـی مـن هـەتا هەتایـە هـەروا لاوازو بـێ توانـا!... یـان هێشـتا زۆر منـداڵم و نەگەییوومەتـە ئـەو ئاسـتەی کـە ئەگـەر کەسـێك بـەد رەفتـاریم دەگـەڵ بکـات و غـەدرم لێبکـات و بـە ناهەق توڕەم بکات، هەقی خۆمی لێبکەمەوە! کەواتە ئێوە، کە لە مـن بـەهێزترن، وەرن ئـەم کەوانـە تاقی بکەنەوەو با ئەم پێشبڕکێیە تەواو بێت وببڕێتەوە."

ئەوسـا چـوو کەوانەکـەی لـە عـاردی دانـاو بـە دەرگـا سـاف و لوسـەکەوەی هەڵپەسـارد. تیرێکـی کوشندەی لەلایەوە دانا، ئەوسا گەڕایەوە، لەسەر کورسییەکەی خۆی دانیشتەوە.

پاشان ئەنتینوس، کوڕی یوپیتس رووی کردە ئامادەبووان و گوتی:

"دەی کوڕینە با هەموو هەستین. یەك یەك لە چەپەوە بۆ راست، لەو شوێنەوە کە مـەی گێڕ، بـادە دابەش دەکات، دەست پێبکەین." هەموو قسەکەی ئەنتینوس-یان پەسند کرد.

## لایدویس کەوانەکەی پێ ناهێنرێتە سەر پێ

یەکـەم کـەس کە هەسـتا لایـدویس، کوڕی ئوینـوس بـوو. ئەمـە فاڵبین و پێشـگۆی خوازگارەکـان بوو، هەمیشە لە بنەبانی هۆڵەکەدا، وبەدیار سوراحیە بادەی گەورەوە دادەنیشت. ئەم پیاوە تاقە کـەس بـوو کـە بێـدادی خوازگارەکـانی لـەگیان نـاخۆش و پـێ نابـەجێ بـوو. یەکـەم کـەس بـوو کـە تیروکەوانەکەی هەڵگرت، رۆیی، چووە سەر سەکۆکە تا خۆی تاقی بکاتەوە، هەرچی کـردو کۆشـا

نەیتوانی ژێیەکە بخاتە سەر کەوانەکە.دەستە ناسکەکانی ماندوو بوون، ئەوسا رووی کردە خوازگارەکان و گوتی:

"دۆستان، من ناتوانم رایکێشم، با یەکێکی دی بێت. ئەم تیروکەوانە سەری گەلێك لەم سەردارانەی ئێرە دەخوات. چونکە پیاو بمرێت باشترە لەوەی بژیو نەگات بەو شتەی کە هەموومان لێرە لە پێناویدا خڕ بووینەتەوەو بە هیوای دەژین. لەوەیە ئێستا هەرکەسەو لە دڵی خۆیدا بە ئاوات و ئارەزووی ئەوەوە بژی کە پنلوپی ژنی ئودیسیوس ببێ بە هاوسەری. بەڵام هەق وایە کە کەوانەکەیان تاقی کردەوە، زانیان چتۆ کەوانێکە، ئیدی بکەونە تاقیبی ژنێکی روبەند جوانی ئاخایی دیکەو دیاریی و جیازییەکانی پێشکەش بەو بکات. بەڵام پنلوپی با بۆ ئەو کەسە بێت کە بە نرخترین دیاری و جیازی پێشکەش دەکات و چارەنوس دەیکات بە حەڵاڵی."

## ئەنتینوس گاڵتەو تەوس بە لایودیس دەکات

دوای ئەو قسانە، کەوانەکەی دانا، بە دەرگا ساف و لوسەکەیەوە هەڵپەسارد. تیرێکی کوشندەی لە تەنیشتەوە دانا، ئەوسا رۆیی، لە شوێنەکەی خۆی دانیشتەوە. بەڵام ئودیسیوس زۆر تورە بوو، رووی تێکردوبە توندی گوتی:

"لایودیس، ئەم قسە قۆڕە چیە دەیکەی. بەڕاستی پیاو پەست دەکەیت، ئەم تیروکەوانە بۆچی سەری گەلێك لەو سەردارانەی ئێرە دەخوات و ژیانیان کوێر دەکاتەوە؟ هەر لەبەر ئەوەی تۆ نەتتوانی ژێیەکەی بخەیتە سەر! دەزانی بۆ نەتتوانی؟ چونکە دایکە سەربەرزو بەرێزەکەت بۆ ئەوەی نە هێناویتە دنیا کە ببی بە تیرەندازو کەوانکێش. تۆ پیاوی کەوانکێشی نیت، ... بەڵام دڵنیابە لە نێو خوازگارە نێودارەکاندا خەڵکانێك هەن، ئەم کارە بکەن، سەبرێ بکە، بزانە چۆن بە چاوی خۆت دەیبینی".

## میلانتیوس کەوانەکە دەداتە ئاگروچەوری دەکات

ئەوسا، میلانتیوسی، سەرە شوانی گاز کردوگوتی:

"وەرە میلانتیوس، هەڕە لە هۆڵەکەدا ئاگرێك بکەوە، کورسیەکی گەورەی لەلاوە دابنێ، فەروەیەك بەسەر کورسیەکەدا بدە، ئەوسا بەلەز هەڕە لە ژوورەوە کلۆ پیوێکی گەورە بێنە، تا ئێمە، پیاوانی گەنج، کەوانەکە گەرم بکەین و بە پیوەکە چەوری بکەین، ئەوسا تاقی بکەینەوەو کۆتایی بەم شەڕە بێنین."

میلانتیوس، بەپەلە ئاگرێکی کردەوە،کورسیەکی بەلای ئاگرەکەوە دانا، فەرویەکی لەسەر کورسیەکە راخست، کلۆ پیوێکی گەورەی لە ژوورەوە هێنا. گەنجەکان، کەوانەکەیان گەرم کرد، چەوریان کردو تاقیان کردەوە، بەڵام هیچ کەسێکیان نەیتوانی ژێیەکەی بخاتە سەر، چونکە کەسیان ئەو هێزو توانایەیان نەبوو. بەڵام ئەنتینوس و یوروماخۆسی(یوریماخۆس) خواوەندئاسا هێشتا مابوون، ئەم جووتە سەرداری خوازگارەکان بوون، لە هەر هەموویان کارامەترو بەهێزتر بوون، وکەس نەبوو لەو رووەوە شان لەشانی ئەوان بدات.

## یارۆی غەوارە داوا لە هەردوو شوانەکە دەکات

## هەڵوێستی خۆیان دیاری بکەن

لەم کاتەدا سەرە شوانەکەو بەرازەوانەکە بە جووتە چوونە دەرەوە. ئودیسیوسی موبارەکیش دوا بەدوای ئەوان چووە دەرەوە. پاش ئەوەی قەدەرێك لە هۆڵەکە دوورکەوتنەوەو چوونە نێو حەوشەکە. ئودیسیوس رووی تێکردن و بە نەرمی و بەزمانی شیرین گوتی:

"ئەی گاوان و سەرەشوان، تۆش ئەی بەرازەوان، شتێکم لە مێشکدایە، تیا ماوم پێتانی بڵێم یان نا، بەڵام دڵم پێم دەڵێت کە بیڵێم، "ئەگەر ئودیسیوس، لە پڕێکا لە شوێنێکەوە پەیدا بێت، ئەگەر خواوەندێك بیگەیەنێتەوە ئێرە، ئێوە چی دەکەن؟ ئایا ئامادەن لە پێناوی ئەودا شەڕ بکەن؟ ئایا لایەنگری خوازگارەکان دەکەن یان هی ئودیسیوس؟ حەزدەکەم بە راشکاوی و بێ لەروو دامان قسەی کانگای دڵ و روحی خۆتانم پێ بڵێن".

هەنگێ گاوانەکە بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"خۆزگە سەد خۆزگە بابە زیوسی هەرە بە توانا، ئەوەی لەگەڵ دەکردین، خۆزگە کارێکی وای دەکرد ئەو مەردەمێرە بە رێنوێنی یەکێك لە خواوەندەکان دەگەڕایەوە، ئەوسا دەتبینی بە چ هێزو توانایەکەوە، بە چ شەهامەت و دلاوەرییەکەوە بەرگریم لێدەکرد، خۆم لە پێناویدا بە کوشت دەدا."

ئەوسا (یومایوس)ش دەستەو دوعا لە هەموو خواوەندەکان پاڕایەوە کە ئودیسیوسی دووربین بگەڕێتەوە سەر ماڵ وحاڵی خۆی.

## یارۆی غەوارە خۆی لێیان ئاشکرا دەکات

وەختێ ئودیسیوس، لە راستگۆیی و ئەمەکداری ئەو جووتە رەنجبەرەی خۆی دڵنیا بوو، دووبارە رووی تێکردن و گوتی:

"من ئودیسیوس-م، ئەوەی کە ئێستا لە بەردەمتاندا وەستاوەو قسان دەکات ئودیسیوسە. دوای بیست دانە ساڵ لە دەربەدەری، ئاوارەیی، دەردو مەینەتی و چەرمەسەری وا جارێکی دی گەڕاومەتەوە سەر زەمین و وڵات و مەفتەنی باب و باپیرانم، من دڵنیام کە لە نێو هەموو نۆکەرو خوڵامەکانمدا، تەنیا ئەم جووتەتان خوازیارو تاسەباری گەڕانەوەی منن. سەبارەت بەوانی دیکە، قەت گوێم لە کەسیان نەبوو، دوعایەکی بەخێر بکات، لە خواوەندان بپاڕێتەوە کە جارێکی دی بگەڕێمەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆم. جا گوێ بگرن با من نیازی دڵی خۆمتان پێبڵێم کە بە تەمام لە ئایندەدا چیبکەم. ئەگەر ئاسمان دەستی دام و قڕم خستە خوازگارەکان، سەرو ژنتان بۆ دێنم، سەرو خانووتان دەدەمێ بە ناومالّی تەواوەوە،و سەروو زەویتان لە نزیکی زەوییەکانی خۆمەوە دەدەمێ، و هەتا هەتایە وەکو دوو برادەرو برای تیلیماخۆس سەیرتان دەکەم. جا بۆ ئەوەی دڵنیا بن و هیچ گومانێکتان لا نەمێنێ، وەرن نیشانەیەکتان پێنیشان دەدەم کە هیچ چەندو چوونێك هەڵناگرێ، ئەویش جێی کۆنە زامێکە کە کاتی خۆی کە دەگەڵ کوڕانی ئوتولیکوس دا، بۆ راوە بەراز چووبووینە چیای پارناسوس، بەرازێك پەلاماری دام و سەرووی ئەژنۆمی هەڵدڕی."

## جووتە شوان لە خۆشیاندا باوەش

## بە ئۆدیسیوس دا دەکەن و ماچی دەکەن

بەدەم ئەو قسانەوە لاقی هەڵکرد، جلە شڕەکانی لەسەر شوێنەواری کۆنە زامە گەورەکەی سەر لاقی لادا. کە بە چاوی خۆیان نیشانەکەیان بینی و هیچ گومانێکیان لەلا نەما، باسکیان لە قەدی ئۆدیسیوسی سالۆر وەرپناو بەدەم گریانەوە، زۆر بە گەرمی کەوتنە رامووسانی شان و سەری. ئۆدیسیوس-ش سەرو دەستی ئەوانی ماچ کرد. رۆژ بەرەو ئاوا بوون دەچوو، وئەوان هەر دەگریان، خۆ ئەگەر ئۆدیسیوس فریا نەکەوتباو بێدەنگی نەکردبان، لەگێن بوو تا سبەی بەیانیش هەر بگرین.ئۆدیسیوس پێی گوتن:

"ئەم شین و شەپۆرە بڕنەوە، نەبادا یەکێك بێتە دەرێ و بەم حاڵەوە بمان بینێ و ریسەکەمان ببێتەوە بە خوری. جائێستا با یەك یەك وەژووربکەوین. هەرجارەی یەکێکمان، نەك هەموو پێکەوە. لەپێشا من وەژووردەکەوم، پاشان ئێوە، یەك یەك وەرنەوە ژوورێ. ئیدی با ئیشارەتێکمان لە بەیندا بێت، دیارە خوازگارەکان، هەر هەموویان بەوە قاییل نابن کە تیروکەوانەکە بدرێ بە من: بەڵام تۆ ئەی یومایوسی مەردو رەند، بە هۆڵەکەدا وەرەو کەوانەکە بدە دەستی من، ئەوسا بڕۆ دەستوور بە ژنەکان بدە کە دەرگای سەراکەی خۆیان توند دابخەن،و پێیان بڵێ کە ئەگەر ناڵەیەك یان هاوارێکیان لە هۆڵ و سەرای پیاوانەوە بەر گوێ کەوت، هەقیان نەبێ و لە سەرای خۆیان نەیەنە دەرێ و خەریکی کاری خۆیان بن. تۆش ئەی فیلویتیوس، یەکسەر بڕۆ دەرگای حەوشە کلۆم بدەو بە پەتێکی قایم توند توند بیبەستە."

دوای ئەو قسانە خۆی بە ماڵە گەورەو بەرزەکەدا کرد. رۆیی و لە شوێنەکەی خۆی دانیشتەوە. پاشان هەردوو رەنجبەرەکەی ئۆدیسیوسی موبارەك یەك لە دوای یەك چوونە ژوورەوە.

## یوریماخوس-ش کەوانەکەی بۆ ناهێنرێتە سەر پێ

لەم کاتەدا یوریماخوس کەوانەکەی بە دەستەوە گرتبوو ودەیدایە بەر بڵێسەی ئاگرەکە تا گەرم بێ، بەڵام وێڕای ئەوەش نەیتوانی ژێیەکەی بخاتە سەرو رای بکێشێت. زۆری لە دڵ گران بوو، لە داخا هاواری کرد:

"وا وەیلا بە حاڵم! حەیام چوو! شەرمەزاری لای خۆم و لای ئێوەش بووم. زۆرم پێ ناخۆشە. نەك تەنیا لەبەر ئەوەی (پنلوپی)م لە دەست چوو، هەرچەندە ئەمەم زۆر لە دڵ گرانە، بەڵام چی زۆرە ژن زۆرە، چ لە دورگەی ئیتاکاو چ لە شارانی دی. بەڵکو زیاتر خەمبارو شەرمەزاری ئەوەم کە ئەوەندە لە ئۆدیسیوسی موبارەك کەمترین، توانای ئەوەمان نیە کەوانەکەی ئەو بێنینە سەر پێ. ئەمە ریسواییەکە کە نەوەکانی ئێمە بە داستان دەیگێڕینەوە."

## ئەنتینوس دڵی یوریماخۆس دەداتەوەو

## کەوانکێشییەکە دەخاتە سبەینێ

هەنگێ ئەنتینوسی، کوڕی یوپیتیس بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"ئەی یوریماخۆس شتی وا نییەو وا نابێت، تۆ بە خۆتیش ئەمە چاك دەزانی. بەلام ئەمڕۆ جەژنی ئەپولۆیە، خەڵکی لە سەرانسەری ولاتا جەژن دەگێڕن،وجەژنێکی گەورەو موبارەکە. بۆیە ئەمڕۆ رۆژی کەوانکێشی نیە. کێ دەتوانێ کاری وا بکات؟ ئەو کەوانە لەلایەکەوە دابنەن، پێشبڕکێیەکە هەڵگرن بۆ سبەینێ. با پاچەکان لە شوێنی خۆیان وەمێنن، باوەڕ ناکەم هیچ کەسێك بێت بۆ ماڵی ئودیسیوس و بیانبات. دەی مەیگێڕ بابێ مەی بەسەر ئەو خەڵکەدا بگێڕێ! بەڵکو بە یادی خواوەندان بادە پڕژێنی و بادەنۆشی دەکەین و جارێ کەوانەکە لابەرن. بە میلانتیوسی سەرداری بزنەوانان بڵێ، سبەینێ لەگەڵ گەردی بەیانی دا، باشترین بزنێن ناو بزنەگەلەکەی بێنێ، تا بیانکەین بە نەزرو قوربانی بۆ ئەپولۆ، کەوانداری هەرە بەناوبانگ: ئەوسا دەچینەوە سەر کەوانەکەو دەیهێنینە سەرپێ و کۆتایی بەگرەو وپێشبڕکێیەکە دێنین".
هەمووان پێشنیازەکەی ئەنتینوسیان قەبوڵ کرد. ئەوسا نۆکەرو خولامان ئاویان بە دەستی خوازگارەکاندا کرد. خزمەتگوزارانی گەنج بادەیان گرتەوە، لە سوراحی گەورەیان کرد، بەسەر خەڵکەکەیاندا گێڕا، هەوەڵجار چەند دڵۆپێکیان لە جامەکانیان کرد، بە مەبەستی بادە پڕژێنی و نۆشخواری.کەتنە خواردنەوە، پاش ئەوەی تێرو پڕیان خواردەوەو مڕ بوون، ئودیسیوسی سالۆر و فاما، رووی تێکردن و بە نیازگلاوی گوتی:
"ئەی خوازگارانی شابانۆی ناودار! شتێکم بە خەیاڵدا هاتووە حەزدەکەم پێتانی بڵێم. رووی دەمم زیاتر لە هەردوو بەڕێزان یوریماخۆس و ئەنتینوسە. ئەنتینوس تۆزێك لەمە پێش قسەیەکی زۆر ئاقلانەو بەجێی کرد، ئەگەر نەبێ بە بێ ئەدەبی داوایان لێدەکەم ئەمڕۆکە دەست لە تیرەندازی و کەوانکێشی هەڵگرن و خەمی بردنەوەیان نەبێ و شتەکە بە خواوەندان بسپێرن، لە ئێستاوە تا سبەی هەزار کلاو بە بایەك، هەنگێ خواوەندان خۆیان دەزانن کێ سەردەخەن. بەلام تکای من لە ئێوە ئەوەیە ئەو کەوانەم وێدەن، با منیش بە بەر چاوی ئێوەوە هێزی بازوانم تاقی بکەمەوە، بزانم ئاخۆ هەمان هێزو توانای جارانم لە بەدەنا ماوە، یان ژیانی سەخت و دژوار، ئاوارەیی و برسیەتی، ودەستکورتی بۆ هەتا هەتایە لە نێوی بردووە".

## ئەنتینوس زۆر بە توندی
## بە رووی یارۆی غەوارەدا هەڵدەشاخێ

هەرکە ئەو قسەیەی لە زار دەرچوو، هەر هەموویان تووڕە بوون، دەترسان لەوەی بتوانێ کەوانەکە بکێشێت و دەستیان لە بنی هەمبانە بۆرەوە دەربچێت. بۆیە ئەنتینوس زۆر بە توندی پێدا هەڵشاخی و گوتی:
"هەی رووتەی نەگبەت، تۆ بە قەد نوکە دەرزییەك هۆش و گۆشت نیە. دەبێ مەمنونی بەختی خۆت بیت کە رێمان داویت، لە نێو ئێمە، میرانی پایە بەرزدا، دانیشیت، وەکو ئێمە نان بخۆیت،و لە هیچ خواردنێکت بەشت لە بەشی ئێمە کەمتر نەبووە،و گوێت لە هەموو قسەو باسێکمانەو هیچ شتێکت لێنەشاردراوەتەوە، جگە لە تۆ رێگەمان بە هیچ گەداو دەرۆزەکەرێك نەداوە گوێی لە قسەو باسمان بێت. وادیارە بادەی خۆش و بەلەزەت لە کەللەی داوی و گەوجی کردویت، ئیدی ئەوە حوکمی بادەیە، هەرکەسێك زیادە خۆری بکات و ئەندازەی خۆی نەزانێت، تێکی دەدات و

گومڕای دەکات. ئاخر هەر بادە بوو کە لە ماڵەکەی پیریتوسی مەزن و جامێردا، سەری لە ئوریتیون–ی ناودار شێواند. ئوریتیون ئەسپە پیاوێك بوو، نیوەی بەدەنی ئەسپ و نیوەکەی تری بەشەر بوو. ئوریتیون چوو بوو بۆ ناو لاپیتانەکان، لەوێ زۆری خواردبووەوە، گەوج بوو بوو، لە ماڵەکەی پیریتوس دا بەدمەستی و کاری نابەجێی کردبوو. ئیدی کوڕان و پاڵەوانانی لاپیتایی توڕە بوو بوون، پیلیان گرتبوو، بە دالان و ڕاڕەوەکەدا رایانکێشا بوو و لە دەرکەیان ئاودیو کرد بوو. دوای ئەوەی لوت و گوێیان بڕی بوو. تێریان گاڵتە پێکردبوو، وکابرا باری گرانی بەدمەستی دابوو بەکوڵیاو وەکو شێتان ڕۆیی بوو. ئیدی شەڕی نێوان کەنتوران (ئەسپە پیاوان)و لاپیتان لەوەوە هەڵگیرسا بوو، و یەکەم کوشتەی ئەو شەڕە، ئوریتیونی بەدمەست و سنور بەزێن، ئەو ئەسپەپیاوە بوو. جا وا لە پێشەوە پێت دەڵێم کە تۆش ئاگات لە خۆ بێ، ئەگەر ئەو کەوانە بکێشیت و بێنیتەوە، دووچاری کارەساتێکی گەورە دەبیت. چونکە ئەوسا هیچ یەکێك لە ئێمە ڕەحمت پێدا ناکات، چوار پەلت دەبەستین و لە کەشتییەکی بۆرت دەنەین و هەواڵەی لای شا (ئیخیتوس)ت دەکەین، کە بەڵای گیانی بەشەرانەو هیچ بەنی بەشەرێك بە زندوویەتی لە دەستی قوتار نابێت. کەواتە بە دەقی خۆتەوە دانیشە، کڕو کپ بۆ خۆت بخۆرەوەو هەقی کەست نەبێت. مەچۆ بە گژ خەڵکانی لە خۆت گەنجترا."

## پنلوپی بەرگری لە کابرای غەوارە دەکات

هەنگێ پنلوپی ئاقڵ و ئاغر هەڵیدایەو گوتی:

"ئەنتینوس نە جوانەو نە ڕەوایە، دەگەڵ میوانانی تیلیماخۆس دا، هەرکێیەك هەبن، بەدرەفتاری بکەیت و سووکایەتیان پێبکەی. یانی لەوە دەترسی ئەگەر ئەم غەوارەیە بتوانێ کەوانەکەی ئودیسیوسی مەردورەند بێنێتە سەرپێ. ئیدی دەگەڵ خۆیم دەبات و دەبم بە ژن و هاوسەری ئەو؟ نا، پێم وایە هەرگیز شتی وای لە بیرو لە خەیاڵدا نیەو بەو ئاواتەش نیە، بۆیە پێویست ناکات کەس نیگەران بێت. دانیشن بێ خەم نانی خۆتان بخۆن، وبەڕاستی ئەم نیگەرانی و دڵتەنگییە هیچ پایەو بناخەیەکی نیەو بیرێکی بێهودەیە."

هەنگێ یوریماخۆس بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"ئەی ئیکاروس زادە، ئەی پنلوپی دووربین، ئێمە لەوە ناترسین، ئەم پیاوە گرێوەکە بەرێتەوەو بۆ خۆیت بەرێت، چونکە ئەمە ماقول نیە، بۆیە مەحاڵە... بەڵکو ئێمە لە قسەو قسەلۆکی هەندێ ژنان و پیاوانی هەرزەو بودەڵە دەترسین کە بێن لە نێو ئاخاییاندا بیکەن بە قاووبڵێن: "ئەم خوازگارانەی کە بە تەمای ژنی پیاوێکی زۆر خانەدان و مەردو ڕەند بوون، زۆر بودەڵەو خوێڕی دەرچوون، تەنانەت نەیان توانی کەوانەکەی بێننە سەرپێ، ژێیەکەی بخەنە سەر. کەچی سواڵکەرێکی گەڕۆڵ–ی، کە کەس نازانێ کوێندەرییە، هات و بە یەکەم کەڕەت کەوانەکەی کێشاو تیرەکەی بە کونی پاچەکاندا ئاودیو کرد! سبەینێ خەڵك وامان پێدەڵێن و ئەمەش بۆ ئێمە ئەوپەڕی شەرمەزاری و ریسواییە".

پنلوپی سەلاروسەنگین بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"یوریماخۆس، ئەوەی بە ناهەق ماڵو سامانی مەردەمێرێکی خانەدانو جامێر دەخواتو بەفیڕۆ دەدات، ڕێزو حورمەتی ماڵەکەی ناگرێت، نابێ بە تەمای ئەوە بێت خەڵکی دانی خێری پێدا بنەن. ئیتر بۆچی خەمی ئەو ریسواییەتە کە باسی دەکەی، بۆچی لە قسەی خەڵکی دەترسیت؟ ئەم غەوارەیە پیاوێکی باڵا بەرزوتۆکمەیە، بە قسەی خۆی بابایەکی وەچاخزادەو لە بنەماڵەیەکی خانەدانەو کوڕی پیاوێکی فرە مەزنە. دەی کەوانەکەی بدەنێ، با خۆی تاقی بکاتەوە، بزانین دەتوانێ بیهێنێتە سەر پێ یان نا. جا با ئەوەشتان پێبڵێمو زۆریش بە جددیمە کە ئەگەر توانی کەوانەکە بکێشێتو ئەپۆلۆ ئەو سەرفرازییەی پێ ڕەوا بینی، مینش جوانترینو باشترین دەستە جلکی دەدەمێ، نێزەیەکی نوك تیژی دەدەمێ تا خۆی لە کسۆکانو خەڵکان پێ بپارێزێت، و شیرێکی تیژی دوو دەمی دەدەمێ لەگەڵ جووتێ سەندەڵی جوانا کە لە پێی بکاتو ئەوسا کوێی حەز لێ بێو بە دڵ بێ بۆ ئەوێندەری ڕەوان دەکەم."

## تیلیماخۆس خۆی بە گەورەی ماڵ دەزانێ

هەنگێ تیلیماخۆسی ژیر، هاتە قسان وگوتی:

"دایکە! هیچ ئاخاییەك، جگە لە من توانای بەسەر ئەم کەوانەدا ناشکێ، بۆیە ئەوەم پێ دەبڕێ، بە ئارەزووی خۆم بە هەرکەسێکم بوێ بیدەم یان نەیدەم. هیچ کەسێك لەسەرانو میرانی سەرانسەری ئیتاکای سەختو بەردەڵان، یان لە فەرمانڕەوایانی دورگەکانی بەرانبەر ئیلیسی مەڵبەندو پەروەرشتگەی ئەسپان، بۆی نیەو ناتوانێ دەست بخاتە ڕێگەم، قسە لە قسەم بکاتو لە بڕیاری خۆم ژێوانم بکاتەوە، تەنانەت ئەگەر بمەوێ کەوانەکە بە یەکجارەکیو بە دیاری بدەم بەم کابرا غەوارەیە،و بۆ ماڵی خۆی بەرێتەوە. بۆیە باشتر وایە بچیتەوە سەراو باڵەخانەکەی خۆت خەریکی کاروباری خۆت، دەزگای چنینو خەڕەك و خەڕەککاری خۆت بیتو کارەکەرو قەراواشەکانت ڕێنوینی بکەیت کە خەریکی کاری خۆبن. تیرو تیرەندازی،و کەوانو کەوانکێشیو کەوانداری کاری پیاوانە،و بەر لە هەموو کەسێك کاری منە، چونکە لێرەدا، لەم ماڵەدا من ئاغاو سەروەرم".

پنلوپی کە سەری لەم قسانە سوڕما بوو، گەڕایەوە بۆ باڵەخانەکەی خۆی، قسەکانی کوڕەکەی کاریان لە دڵی کرد. کە لەگەڵ کارەکەرکانیا بۆ باڵەخانەکەی سەرکەوت، ئەوجا کەوتە گریان بۆ مێردە ئازیزەکەی، بە دەم گریانەوە مایەوە تا ئەتینای چاوگەش فریای کەوتو خەوێکی خۆشی لێخست.

## بەرازەوانەکە، کەوانەکە بۆ کابرای غەوارە دەبات

لەم بەینەدا بەرازەوانە ئەمەکدارەکە کەوانەکەی هەڵگرتو دەیهێنا کە بیدات بە ئودیسیوس. خوازگارەکان لە هەموو سوچێکی ڕاڕەوودالانەکانەوە هاواریان لێکردو، یەکێکیان گوتی:

"ئەی بەرازەوانی بەدبەخت، ئەو کەوانە بۆ کوێ دەبەی، چما شێت بوویت؟ ئەگەر ئەپولۆو خواوەندانی دیکە دوعاو نزامان گیرا بکەن، هەر سەگەکانی خۆت، ئەو سەگانەی بە خۆت بەخێویان دەکەیت، لە پاڵ گەلە بەرازەکەتدا، تەنیاو بێکەس وڕگت هەڵدەدڕنو پارچە پارچەت دەکەن"

یومایوس، کە گوێی لەو هەموو هاوارو هەرایە بوو ترسا، کەوانەکەی لە هەمان شوێنی خۆی دانایەوە، ترسا، ناهەقی نەبوو، خوازگارەکان زۆر بوون و ئەو تەنیا بالْ.

(تیلیماخۆس)ش لەو لاوە هاوارو هەڕەشەی لێدەکرد:

"ئەهای پیرەباب! نەخەڵەتابی بە قسەی ئەوانە بکەی. خێرا کەوانەکە بەرە. گوێ بە هاوارو هەڕەشەی ئەوانە مەدە، دەنا پەشیمان دەبیتەوە. هوشیاربە بە قسەیان نەکەیت، دەنا بە پالْ بۆ دەشتت دەنێرمەوە، هەرچەندە لە تۆ بچووکترم سەنگەسارت دەکەم. چونکە لە تۆ بە هێزترم و پێت دەوێرم. ئاە خۆزگە وەکو چۆن لە تۆ بەهێزترم، بەو ئاوایەش لەهەموو ئەو خوازگارانەی کە لەم کۆشك و سەرایەدا تەراتێنیانە، بەهێزتر دەبووم، ئەوسا دەتبینی چۆن بە زووترین کات ئەم ماڵەم لە شەڕیان پاك دەکردەوە،و بە جۆرێ لێرەم دەردەپەڕاندن کە خەڵکی بەزەیی پێیاندا هاتباوەو، کێوە دەچوون چووبان".

کە تیلیماخۆس ئەو قسانەی کرد، هەموو خوازگارەکان لە قاقای پێکەنینیان دا، تێر گاڵتەیان بە تیلیماخۆس کردو داخی دڵی خۆیان هەڵڕشت. بەڵام یومایوس کەوانەکەی بەناو هۆڵەکەدا هێناو خۆی گەیاندە جەم ئودیسیوسی جامێرو کەوانەکەی دایە دەستی. دوای ئەوە یوریکلیای بانگ کردە دەرەوەو پێی گوت:

"ئەی یوریکلیای دوور ئەندێش،تیلیماخۆس ئەمری بەوەیە کە دەرگای حەرەمسەرا توند دابخەیت، و ئەگەر ژنێك لە ژوورەوە، گوێی لێ بوو لە هۆڵی پیاوانەوە دەنگە دەنگ و هات و هاوار بەرز بووەوە، نەیەڵی لە ژوور بێتە دەرێ. با بۆ خۆی کڕو کپ، بێ جوڵە، لە حەرەمسەرادا خەریکی کاری خۆی بێت".

یوریکلیا، بە گوێی کردو دەمودەست هەموو دەرگاکانی حەرامسەرای توند داخست.

فیلویتیوس، بەبێدەنگی لە ماڵەکە وەدەرکەوت، خۆی گەیاندە ناو حەوشەو دەرگاکانی داخست. لە ژێر دالانەکەدا پەتێکی کەشتی بەستنەوە هەبوو، پەتەکەی برد. دەرگاکانی توند توند پێ بەست و ئەوسا هاتەوە ژوورێ، بێئەوەی چاو لە ئودیسیوس بگوازێتەوە، ڕۆیی و لە شوێنەکەی خۆی دانیشتەوە. ئودیسیوس کەوانەکەی بەدەستەوە گرتبوو، ئەم دیوو و ئەو دیوی دەکرد، دەستی پێدا دێنا، ورد ورد تەمەشای دەکرد تا بزانێ لە غیابی خاوەنەکەیدا مۆرانە لێی نەداوەو نەیخواردووە، هەر یەك لە خوازگارەکانیش دەیڕوانییە ئەوەی تەنیشت خۆی و دەیگوت:

"بێگومان ئەم کابرایە شارەزایەو لە کەوانکێشی دەزانێت. ڕەنگە لە ماڵی خۆیدا کەوانێکی وەهای هەبێت، یان لەگینە بیر لەوە بکاتەوە کەوانانی میناکی ئەمە دروست بکات، تەمەشا ئەم گەدا گەڕۆڵە شڕۆڵە کەس نەناسە، چۆن ئەم دیوو و ئەو دیوی دەکات، چۆن لێی ورد دەبێتەوە".

ئەوسا گەنجێکی دی لە خوازگارە فیشاڵبازو خۆ هەڵکێشەکان، بە تەوس و تەڵفیزییەوە گوتی:

"هیوادارم، ئەم کوڕیژگە جوانە، وەکو چۆن ئێستا کەوانەکە دەکێشێت و سەردەکەوێ، بەو ئاوایە لە ژیانیشدا سەرکەوتوو بێت".

## خوازگارەكان ترسيان لێدەنیشێت

خوازگارەکان ئەو جۆرە قسانەیان دەکرد، لێ ئودیسیوسی سالۆری چارەساز، هەرکە کەوانە گەورەکەی تاقیکردەوەو جوان تەمەشای کردو هەڵیسەنگاند، وەکو چۆن پیاوێك لە هونەری چەنگژەنیو شایەریو سترانبێژیدا، زەبەردەستو کارامە بێ، و بەئاسانی ژێیەکانی لەکلیلەکانی دەبەستێو تەواو لەم سەرو لەو سەرەوە توندوکۆکی دەکات –( ئودیسیوس)ش بەو ئاوایە کەوانە گەورەکەی هێنایە سەرپێ، ژێیەکەی لێ قایم کرد، پاشان بە دەستی راست ژێیەکەی گرتو تاقی کردەوە، ودەنگێکی خۆشو دڵگیری لێهەستا، هەر لە دەنگو ئاوازی پەڕەسێلکە دەچوو. خوازگارەکان زۆریان پێ ناخۆش و لە دڵ گران بوو، رەنگیان لە روودا نەما. لەم کاتەدا زیوس چەخماخەیەکی توندی لێدا، ئەمە ئاماژەیەکی ئاشکرا بوو، ئەم نیشانەو ئاماژەیەی کە کوڕە لێزانو خاوەن نەخشەو پلانە پڕ پێچو پەناکانی کرونوس ناردی، ئودیسیوسی خانەدانو مەردەمێرو بەهێزو توانای زۆر دڵخۆش کرد. بە پەلە تیرێکی کوشندەی، کە لە تیردانەکە دەرهێنرا بوو، ولەسەر مێزێکی نزیکی ئەو دانرا بوو، هەڵگرت. بەڵام تیرەکانی دی هەر لە نێو تیردانەکەدا بوون، ئەو تیرانەی کە بەو زووانە دەبوون بە بەڵای گیانی خوازگارەکان. کە ئەو تیرەی هەڵگرت، خستییە گۆشەی کەوانەکە، بێئەوەی لە شوێنی خۆی هەستێ، ژێیەکەو تیرە کوشندەکەی راکێشا، سێرەی لە نیشانەکە گرتو تیرەکەی بەردا، تیری تاین، بێئەوەی کورت بێنێ یان سەر بکات، یان لا بکات رێك بە کونی هەموو پاچەکاندا رۆیيو لەو دیوەوە دەرچوو. هەنگێ ئودیسیوس رووی کردە تیلیماخۆس وگوتی:

"ئەی تیلیماخۆس! میوانەکەت نەبووە مایەی شەرمەزاریت. نیشانەکەم پێکا، کەوانەکەم بە ئاسانی هێنایە سەر پێ، کەواتە هێشتا هێزو تینو تاوەکەی جارانم ماوە، و تانەو تەشەرو تەڵفیزی خوازگارەکان نابەجێ بوو. ئێستاش بەر لەوەی خۆر ئاوابێو چاوەڕوانی شەو بکەین، کاتی ئەوە هاتووە خواردنی ئێواریێ بە خوازگارانی ئاخایی بدەیتو پاشان ئاهەنگی گۆرانی ساز دەست پێبکات. چونکە خۆشيو دڵگیری هەر بەزمو سورێك بەبێ ئاوازو گۆرانی ناتەواوە.

ئودیسیوس دوای ئەو قسانە چاوێکی لە تیلیماخۆس هەڵتەکاند. ئەوسا تیلیماخۆس، کوڕە ئازیزەکەی ئودیسیوسی موبارەك، شمشێرە تیژەکەی لە قەدی بەست، نێزەکەی بە دەستەوە گرتو لە نزیکی کورسیەکەی خۆيو لە پاڵ باوکیا، سەراپا نوقمی چەك، حازرو ئامادە راوەستا.

***

## پەراوێز:

*– ئیفیتوس:

کوڕی یورتیوس–ی پاشای یوخاليو برای ئیولییە. کەوانە بەناوبانگەکەی یوریتسی بە میرات بەرکەوت. و ئەمیش هەمان کەوانی بە دیاری پێشکەش بە ئودیسیوس کرد کە پاشان هەموو خوازگارەکانی پنلوپی بەو کەوانە کوشتن... ئیفیتوس پاشان کە چوو بوو بۆ لای هەرقلو تاقیبی هەندێ ماینی دزراوی خۆی کردبوو، هەرقل توڕە دەبێتو دەیکوژێت.

*- یوریتوس:

پاشای یوخالی، کوڕی مینیلاوس‌و بابی ئیولی‌و ئیفیتوس بوو، یوریتوس لەسەر دەستی ئەپولۆ فێری تیرەندازی‌و کەوانکێشی بوو، شارەزاییەکی ئەوتۆی لەو بوارەدا پەیدا کرد کە چوو بە گژا ئەپۆلۆدا، ئەویش تورە بوو، وهەر بە گەنجی کوشتی.

*- میسینی:

شارێکی کۆنی یونانە.

*- هەرقل:

کوڕی زیوس‌و ئالکمینە. ئالکمین ژنی فەرمی ئەمفیتریون بوو، زیوس بە دزییەوە لەگەڵیا جووت دەبێت‌و هەرقلی لێدەکەوێتەوە.هیرای ژنی زیوس کە بە خیانەتی زیوس دەزانێت، تورە دەبێت، کارێکی وەها دەکات هەرقل بەر لە رۆژ ومانگی خۆی لە دایك ببیٚ تا لە باربچێت. بەڵام لە بار ناچێت‌و دەژی. ئەوجا دوای دوو سیٚ مانگ هیرا جووتیٚ ماری بۆ دەنێرێتە ناو بێشکەکەی تا پێوەی بدەن‌و بیکوژن. بەڵام هەرقل بەو ساواییە چنگ دەنێتە بینی مارەکان‌و هەردووکیان دەتاسێنیٚ‌و خەفەیان دەکات‌و بەوە رەگ‌و ریشەی خواییانەی خۆی دەنوێنیٚ.

*- کەنتور:

گوراوێکە نیوەی ئەسپەو نیوەکەی تری بەشەرە. ئەمە لە ئاهەنگی زەماوەندی پیریتوس دا لەویٚ دەبێت‌و دەیەویٚ بووکە بڕفێنیٚ، ئیدی شەڕ لە نێوان کەنتوران‌و لاپیتانیان دا هەڵدەگیرسێت، کەنتوران، سانتورشیان پیٚ دەگوتریٚ.

*- پیریتوس:

کوڕی دیا بوو لە زیوس. پاشای لاپیتانیان بوو.. کە لە شەڕێکدا دەگەڵ تیسیوسدا رووبەڕووی یەکتر بوونەوە. هەردووکیان، شەڕڤانیی یەکتریان چووە دڵەوە، ئیدی دژمنایەتیان نایەلاوەو پەیمانی دۆستایەتیان دەگەڵ یەکتردا بەست.

*- لاپیتانەکان:

قەومێکی ئەفسانەیین گوایە لە کۆسارەکانی تسالی دا دەژین، وئەمانە دەگەڵ کەنتور (سانتور)ەکاندا بەشەڕ دێن.. ئەو شەڕە شەڕێکی بەناوبانگە. سەرداروپاشای لاپیتانەکان، پیریتوسی کوڕی ئیکسیون بوو، واتە زڕبرای کەنتورەکان (سانتور) بوون. کەنتورەکان داوای بەشی خۆیان لە میراتی ئیکسیون دەکرد. پیریتوس بۆ ئەوەی رامیان بکات بۆ زەماوەندەکەی خۆی دەعوەتیان دەکات: کەنتورەکان دوای بادەنۆشی پەلاماری لاپیتانەکان دەدەن‌و دەیانەویٚ هیپودامی دەزگیرانی پیریتوس بڕفێنن، ئیدی لێیان دەبێت بە شەڕو کەنتورەکان لەو شەڕەدا شکست دێنن.

## سروودی بیستو دووەم

**کورتەی سروودەکە:**

ئودیسیوس هەوەڵجار ئەنتینوس دەپێکێ. خوازگارەکان هەڕەشەی لێدەکەن، و ئەویش خۆی ئاشکرا دەکات. یوریماخۆس داوای ئەمانو زنهار دەکاتو دەڵێت ئامادەیە پاداشتێکی زۆر بە ئودیسیوسی جوامێر بداتو هەر قەرەبوویەکی گەرەك بێ بیداتێ، بەڵام ئودیسیوس قەبووڵ ناکات.

یوریماخۆس دەکوژێت، (و تیلیماخۆس)ش ئەمفینوموس دەکوژێتو دەڕوات چەك بۆ بابی، وخۆیو یومایوس و فیلویتیوس دێنێ، لە پەلەپەلیو بێ موبالاتیدا دەرگای عەمارەکە داناخات. میلانتیوسی خاینو ناپاك لە عەمارەکە چەك بۆ خوازگارەکان دێنێ، کە دەگەڕێتەوە هەردوو شوانەکە پەلاماری دەدەنو هەر چوار پەلی دەبەستن. ئەتینا لە شێوەو هەیئەتی مانتوردا دەردەکەوێ... لە شێوەی پەرەسێلکەیەکدا بەشداری شەڕ دەکات. لە پڕ سپەرەکەی دەردێنێو خوازگارەکان هەراسان دەبن، لئیودس چەند لە ئودیسیوس دەپاڕێتەوە کە بیبەخشێت، سوودی نابێ، تەنیا فیموسی ئاشق و هۆنەرو شایەرو میدونی خزمەتکارو تەتەری ئودیسیوس لەمەرگ دەخەلەسن. دوانزە کەسیش لە کارەکەرە خەتاکارەکان بە فەرمانی تیلیماخۆس لە دار دەدرێن. دوای کوشتنی میلانیتوس بە عەزابەوە، ئودیسیوس یەکێك بە دووی پنلوپی و کارەکەرە دڵسۆزەکانی دا دەنێرێت.

****

### ئودیسیوس ترسو لەرز دەخاتە دڵی خوازگارەکانەوە

ئەوسا ئودیسیوسی سالۆر، جلە شڕەکانی لەبەر خۆی داکەند، چووە سەر سەکۆکەی بەر دەرگاکە، کەوانو تیردانەکەشی دەگەڵ خۆدا برد، تیرە تیژو کوشندەکانی هەڵڕشتنە بەر پێی خۆیو روویکردە خوازگارەکانو گوتی:

"ئاخری ئەم پێشبڕکێیە دژوارە دوایی هات. ئێستا دەمەوێ نیشانە لە نیشانێکی تر بگرمەوە، کە کەس بەر لە من نەی ئەنگاوتووە. ئیدی بە تەمای ئەپۆلۆ بزانم ئەو سەرفرازیەم پێ ڕەوا دەبینێ یان نا".

هەرکە لە قسەکەی بووەوە، تیرێکی کوشندەی ژەهراوی گرتە ئەنتینوس، ئەنتینوس لەم کاتەدا، جامێکی زێڕینی دوو دەسکی پڕ لە شەرابی بە دەستەوە بوو، وخەریك بوو بۆ دەمی دەبرد تا بیخواتەوە. هەموو شتێکی لە بیر بوو تەنیا مەرگ نەبێت. کێ باوەڕی دەکرد، لە بەزمو سوورێکی ئاوهادا، لە نێو ئەو هەموو میوانەدا، پیاوێکی تەنی باڵ، چەندیش ئازا بێ، پڕکێشی ئەوە بکات بەو ئاوایە بیکوژێت، وژیانی خۆیشی بخاتە خەتەرەوە؟ ئودیسیوس تیرەکەی هاویشت. ڕێك بەر ملی ئەنتینوس کەوت، دیواودەر کونی کرد. بە پشتا کەوت، جامەکە لە دەستی کەوتە خوارەوە، یەکسەر خوێن لە هەردووکونە کەپوویەوە فیچقەی کرد. کەوتە لەقەفرتێ، لاقی بەر مێزەکەی

بەردەمی کەوت، مێزەکە سەرەونخون بووەوە، خواردنەکانی سەری بە عاردیدا پەرش و بڵاو بوونەوە. نان و گۆشتی برژاو تێکەڵ بە خاك وخۆڵ بوو. خوازگارەکان کە ئەو دیمەنەیان بینی لە سەرانسەری هۆڵەکەدا کردیان بە هەراو هەنگامە، هەموو لە جێی خۆ راپەڕین، شپرزەو نیگەران دەیانڕوانیە چوار دیواری ماڵەکەو بۆ چەکاکانیان دەگەڕان، بەڵام نە سپەرێك نە نێزەیەك بە دیوارەکانەوە نەما بوو کە پەری بدەنێ و بەکاری بێنن. ئەوسا بە توڕەیی بە ئودیسیوسدا هەڵشاخین و کەوتنە جنێوو هەڕەشە:

"ئەی غەریب دیارە تۆ ئەجەلت هاتووە وا خەڵکی بەر تیران دەدەیت. جارێکی دی بەشداری لە هیچ پێشبڕکێیەك ناکەیت، تەواو مەرگی خۆت مسۆگەر کرد. بەڵێ، تۆ کەسێکت کوشتووە کە خانەدانترین و بەناوبانگترین شازادەی گەنجی ئیتاکا بوو، بۆیە هەر لێرەدا دەبی بە خۆراکی قەل و داڵان."

## ئودیسیوس هەڕەشەی مەرگ لە خوازگارەکان دەکات

بۆیە بەو شێوەیە قسانیان دەکرد، چونکە وایان دەزانی ئودیسیوس بە هەڵە ئەنتینوسی کوشتووە. ئەم گەوجانە نەیدەزانی مەرگ بەسەر سەری خۆیانەوە باڵەفڕەیەتی! ئودیسیوس–ی بەردەبار ژێراوژێر مۆڕەیەکی لێکردن وگوتی:

"ئەی سەگینە، واتان دەزانی من جارێکی دی لە تەروادە ناگەڕێمەوە؟ بۆیە ماڵتان وێران دەکردم، سەروەت و سامانتان بە تاڵان دەبردم، بە تۆبزی دەگەڵ کارەکەرەکانی مندا دەخەوتن، بێئەوەی لەخواوەندانی ئاسمان نشین بترسن، و بێئەوەی بیر لەوە بکەنەوە کە لەگینە رۆژێ لە رۆژان کەسێك پەیدا بیێ و تۆڵەتان لێ بسەنێتەوە، من هێشتا بەسەر دنیاوە بووم، لە ژیاندا بووم تەماحتان کردبووە ژنەکەم! دەیسا دەربازبوونتان مەحاڵە، دەبێ بمرن!"

## یوریماخۆس لە ئودیسیوس دەپاڕێتەوە

هەرکە ئەو قسانەی کرد، هەموو ترسیان لێنیشت و رەنگیان زەرد هەڵگەڕا، هەرکەسەو چاوی بۆ دەرویەك دەگێڕا کە بشێت لە مەرگی شوومی رزگار بکات. تەنیا یوریماخۆس هاتە قسان و گوتی:

"ئەگەر تۆ بە راستی ئودیسیوسی پاشای ئیتاکای و گەڕاویتەوە ناومان، ئەوا هەموو قسەکانت راستن،گلەییەکانت هەق و بە جێن، زۆر هەڵەو کاری نابەجێ و نامەردانە لە ماڵی تۆدا، لە کێڵگەو مەزرایانی تۆدا لەلایەن ئاخاییانەوە کراوە، بەڵام سەبەبکارو هاندەری سەرەکی هەر هەموو ئەو بەدکارییانە ئەنتینوس بوو، کە ئەوەتا لە عاردی کەوتووە. با ئەوەشت پێبڵێم کە ئەو پیاوە مەبەستی خواستنی پنلوپی نەبوو، ئەو مەسەلەیەی زۆر بە هەند نەگرتبوو، ئەو لە بیری شتێکی دیکەدا بوو کە زیوس پێی رەوا نەبینی. تەگبیری لەگەڵ تەقدیرا یەکی نەگرت. بەنیاز بوو ببێ بە فەرمانڕەوای شارە ئاواو ئاوەدانەکەی ئیتاکا، وژێراوژێر نامەردانە کوڕە تاقانەکەی تۆ بکوژێت و دنیای بۆ تەخت ببێ. بەڵام ئەوەتا بەسزای هەقی خۆی گەیی. کوژراو ئاواتەکەی نەهاتە دی. جا تۆش چاوپۆشی لەمانە بکە کە ماون، ئەمانە هاووڵاتی و رەعیەتی خۆتن، ئەوسا ئێمەش بە شارا دەگەڕێین و سەروەت و سامانی دنیا کۆ دەکەینەوە، هەرچیمان لەم ماڵەدا

خواردووەوخواردووتــەوە، بــەزیادەوە بــە مــەمنونی بــۆتی قــەرەبوو دەکەینــەوە، هەرکەســەو بــە ئەندازەی نرخی بیست سەرگا، زێڕو برونزت دەدەینێ و هێندەت دیاری دەدەینێ تا دڵت چاك دەبێت، وکەسیش بۆی نیە تا ئەو کاتە ناهەقت بگرێ و گلەییت لێبکات."

## ئودیسیوس هەڕەشەی مەرگ لە هەموو خوازگارەکان دەکات

ئودیسیوسی سالۆر مۆڕەیەکی لێکردوگوتی:

"گوێبگرە، یوریماخۆس، هەر چیت هەیەو هەرچیت لە باب و باپیرانەوە بۆ ماوەتەوە، وهێندەی دیکەشی بخەیتە سەر، من دەستبەرداری کوشتار نابم و تا بە دەستی خۆم تۆڵەی خۆم نەستێنم و هەموو خوازگارەکان بە سزای گۆساخی و بێ ئەدەبی و بەدرەفتاری خۆیان نەگەیەنم واز ناهێنم و ناهێنم. تەنیا ئەوەتان بۆ ماوەتەوە یان بێنە مەیدان و رووبەڕوو شەڕی رەقیبی خۆ بکەن، یان کلکان لە گەڵۆز بگرن وهەڵێن، کە پێم وانیە هەڵاتن دادتان بدات و لە مردن رزگارتان بکات."

## یوریماخۆس داوا لە خوازگارەکان دەکات

## پەلاماری ئودیسیوس بدەن

خوازگارەکان، بەو قسانەی ئودیسیوس، قەڵەمی دەست و پێیان شکا. دیسان یوریماخۆس هەڵیدایەو گوتی:

"براینۆ، وەکو دەبینن ئەم کابرایە خوێن بەرچاوی گرتووەو دەست بەردار نابێت. جا ئێستا کە کەوانەکەی بە دەستەوەیەو هەموو تیرەکانی لەبەردەم خۆیدا داناوەو بەردەرکەی لێگرتووین، واز ناهێنێ تا تاقوبڕمان نەکات. چارمان هەر ئەوەیە شەڕبکەین، دەست بدەنە شمشێرەکانتان، خۆ بدەنە، پەنای مێزەکان تا لە تیرەکانی بخەلەسن، ئەوسا هەموومان بە کۆمەڵ پەلاماری دەدەین، بەڵکو بتوانین لەبەر دەرگاکەی لابدەین و بە هەڵەداوان بەناو شار بکەوین، وهانا بۆ خەڵکی بەرین و داوای کۆمەك بکەین! ئیدی بەو جۆرە کارێ دەکرێ و ئەو نەگبەتە دوا تیری کەوانی خۆی دەهاوێ و شتەکە دەبڕێتەوە."

## یوریماخۆس دەکوژرێ

هەرکە ئەو قسەیەی کرد، بە پەلە هەڵیکێشایە شمشێرە تیژە دوو دەمە برونزییەکەی،و بە دەم نەعرەتەیەکی ترسناکەوە بەرەو ئودیسیوس هێرشی برد. بەڵام ئودیسیوسی مەردەمێرو خانەدان، تەڕدەست تیرێکی هاویشتێ، رێك لە ژێر مەمکییەوە، سینگی سمی و بە جەرگیا چەقی. شمشێرەکەی لە دەست کەوت، خۆشی بەسەرا کەوتە سەرمێزەکە، ئەوسا کەوتە سەر ئەرزەکە، هەموو خۆراك و جامە بادەی سەر مێزەکە بەسەر یەکا رژاو، بە دەم دوا هەناسەی ژیانەوە رۆیی و نێو چەوانی کێشا بە عاردیداو بەدەم لەقەفرتێوە، کورسییەکی سەرەونخون کردو دوا تیشکی ژیان لە چاوانیدا کوژایەوە.

## تیلیماخۆس، ئەمفینوموس دەکوژێت

دوای ئەوە ئەمفینوموس، بە پەلەو بە شمشێری تیژەوە بەرەو ئودیسیوسی دلاوەر هێرشی برد، بە هێڤی ئەوە بوو، لەبەر دەرگاکەی دوور بخاتەوە. لێ تیلیماخۆس تەڕدەستی کردو لە پشتەوە

نێزه تیژو برونزیەکەی بەنێوان هەردوو شانیا کردو گەیاندیە قوڵایی سینگی، ئەمفینوموس، هاوارێکی پڕئازاری کردو بە دەما ڕما،وتەختی تەوێڵی دای بە عاردیدا. بەڵام تیلیماخۆس نێزەکەی بەو دەقەوە هەر بە پشتیی ئەمفینوموسەوە بەجێهێشتو بە هەشتاو گەڕایەوە، چونکە دەترسا ئەگەر خەریکی دەرکێشانەوەی نێزە درێژەکە بیٚ،و لەو کاتەدا کە بە سەر جەنازەکەدا دانەویتەوە، یەکێك لە خوازگارە ئاخاییەکان دەرفەتی لیٚ بێنیٚ، بە شمشێرەوە پەلاماری بداو جەزرەبەیەکی پیٚ بگەیەنێت، بۆیە بەلەز بۆ دەف بابە ئازیزەکەی زڤڕییەوەو کە گەییە نك ئەو بە حەماسەوە گوتی:

"بابە! من دەڕۆم سپەرێك، ودوو نێزەو کڵاوخودێکی یەکپارچە برونزت بۆ دێنم کە ڕێك پڕ بە سەرت بێتو جوان لاجانگەکانت داپۆشێت. بە خۆیشم چەك هەڵدەگرم،و چەكوسپەر بۆ بەرازەوانەکەو گاوانەکەش دێنم، وا باشترە چەکی تەواومان پیٚ بیٚ تا بە سەلامەتی دەرچین".

## تیلیماخۆس ڕمومەتاڵێك بۆ ئودیسیوس دێنیٚ

هەنگیٚ ئودیسیوسی فاما بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"خێراکە بڕۆن تا تیرم پیٚ ماوە، هەڕە ئەو چەكو ئەسلەحانە بێنە، خێرا وەرەوە نەبادا بە تەنیا دەرەقەت نەیەمو لەبەر دەرگاکەم دووربخەنەوە."

تیلیماخۆس بە پەلە رۆیی بۆ ئەو عەمارەی چەکەکانی تیا تەقەت کردبوو، چوار قەڵخانو هەشت نێزەو چوار کڵاوخودی برونزی کە لە یاڵی ئەسپ ریشویان بۆ کرا بوو، هەڵگرتو بە پەلە بۆ لای بابە ئازیزەکەی زڤڕییەوە، خۆی لە پێش هەموانەوە چەكو ئەسلەحەی لە خۆی بەست، دوو ڕەنجبەرەکەش چاویان لەو کردو چەكو ئەسلەحەیان لە خۆ بەست. ئیدی سەراپا نقومی چەك، حازرو ئامادە، هاتن ئەم دیوو وئەودیووی ئودیسیوسی مەردەمێروسالۆریان گرت. بەڵام ئودیسیوس تا تیری پیٚ مابوو، لێکدا لێکدا نیشانەی لە خوازگارەکان دەگرتەوە، لەماڵەکەی خۆیدا یەك یەك دەی ئەنگاوتنو بەسەر یەکتردا دەکەوتن. کە تیری پیٚ نەما، ئەوسا کەوانەکەی، لە هەنبەر تاکێکی دەرگای تەلارەکەداو بە دیوارە مکومو سافو لوسەکەوە، هەڵپەسارد. ئەوسا قەڵغانێکی لە شان کرد، قەڵخانەکە لە پێستی گا دروست کرابوو،چوار چین بوو بەسەریەکەوە، واتە چوار بەر بوو، وکڵاوخودێکی قایمو مکومی لەسەرنا، گولینگەو ریشوەکانی کە لە یاڵی ئەسپ دروست کرا بوون، بە توندی بەسەر سەرییەوە دەلەرییەوە، ئەنجام دوو نێزەی نوك تیژی برونزی هەڵگرت. دیوارە مکومو قایمەکە بە بەرزییەوە دەرگایەکی پێوە بوو. ئەم دەرگایە کەوتبووە پشتەوەی هۆڵەکەو تاقە ڕێگا بوو بۆ دەرەوە. ئودیسیوسی مەزن بەرازەوانە دڵسۆزەکەی راسپارد کە لەوێندەر بوەستیٚو پاسەوانی ئەو دەرگایە بکات، چونکە تاقە مەفەڕ بوو کە خوازگارەکان بتوانن لێوەی هەڵێن. بەڵام ئەجیلاوس رووی کردە هاوڕێکانی خۆیو گوتی:

"ئەریٚ ئەوە کەس نیە خۆی بگەیەنێتە دەرگا بەرزەکەی پشتەوەو لەوێندەرەوە هاواریٚ لە خەڵکی بکات کە فریامان بکەون؟ ئەگەر ئەمە بکرایە خەڵکەکە زوو فریامان دەکەوتنو ئەم کابرایەیان لە

کۆڵ دەکردینەوەو دوا تیری کەوانی خۆی دەهاویشتو دەبڕایەوە، وەك دەڵێن زەرەر لە نیوەش بگەڕێتەوە هەر قازانجە."

هەنگێ میلانتیوسی سەرگەورەی بزنەوانەکان بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"ئەی ئەجیلاوس! ئەی زیوس زادە، کاری وا ناکرێت، چونکە دەرگای حەوشە زۆر نزیکەو دەرباز بوون لە ڕاڕەوەکەوە بۆ دەرێ یەجگار ئەستەمە. تەنیا یەك زەلامی تۆزێ ئازا لەوێ بێت، دەتوانێ ڕێگە بە هەموومان بگرێ. بەڵام بوەستە هەر ئێستا دەچم بۆ عەمارەکەو چەكو قەڵغانت بۆ دێنم، چونکە پێم وایە ئۆدیسیوسو کوڕە ڕەسەنەکەی چەکەکانیان لەوێندەر تاقەت کردووە نەك لە شوێنێکی دی."

## خوازگارەکان قەڵغانو ڕمو نێزەیان دەست دەکەوێ

میلانتیوسی بزنەوان، دوای ئەو قسانە، بە ڕاڕەوەکانی کۆشکەکەدا ڕۆیی و خۆی گەیاندە عەمارەکە،دوانزە سپەر، دوانزە نێزەو دوانزە کڵاوخودی برونزی ڕازاوە بە ریشوی یاڵە ئەسپی هێناو بە پەلە گەڕایەوەو دانی بە خوازگارەکان. وەختێ ئۆدیسیوس سەیری کرد، خوازگارەکان هەموو قەڵغانو نێزە بە دەست خۆ تەیاردەکەن، دڵی دالەرزیو هەستی بە مەترسیەکی زۆر کرد. رووی کردە تیلیماخۆس وبە توندی گوتی:

"تیلیماخۆس، بە مەزەندەی من یەکێك دژایەتیمان دەکاتو یارمەتی خوازگارەکان دەدات، ئیدی یان یەکێك لە کارەکەرەکانە یان میلانتیوسە."

هەنگێ تیلیماخۆسی زرینگ بەرسڤی دایەوەوگوتی:

"باوکە، ئەوە هەڵەی منە، جگە لە من کەسی تر خەتابار نیە، چونکە من دەرگا مکومەکەی عەمارەکەم پێوە نەداوە. دیارە هەواڵدزەکەیان لە من زرینگترو وریاتر بووە، ئادەی یومایوس، شێرەپیاو فریاکەوە بچۆ دەرگای عەمارەکە دابخە، وبزانە ئایا یەکێك لە کارەکەرەکان ئەم کارەی کردووە، یان میلانتیوس، کوڕی دولیوس؟ کە من گومانی زۆرم لەوە."

## ئۆدیسیوس فەرمانی حەپسکردنی میلانتیوسی خیانەتکار دەدات

ئەوان لەو قسانەدا بوون، کە میلانتیوس، سەرگەورەی بزنەوانان، دووبارە بەرەو عەمارەکە دەڕۆیی تا چەكو جبەخانەی جوانترو زیاتر بێنێ. بەرازەوانە شەریفەکە بەدی کردو یەکسەری روویکردە ئۆدیسیوس کە لە نزیکیەوە بوو، وگوتی:

"ئەی ئۆدیسیوس، ئەی کوڕی لایرتیس، ئەی گۆشکراوی زیوس، ئەی فاماو چارەسان، ئەوا ئەو پیاوە بەدکارو نامەردەی کە لێی بە گومان بووین، دووبارە بۆ عەمارەکە دەڕواتەوە. جا پێم بڵێ تۆ ئەمرت بە چیە، ئایا ئەگەر دەروەستی هاتم بیکوژم یان بۆ ئێرە، بۆ لای خۆتی بێنم، تا ئەم بۆرە پیاوە بێ ئابڕوو سپڵەیە سزا بدەیتو تۆڵەی هەر هەموو ئەو تاوانوخیانەتانەی لێ بکەیتەوە کە لە ماڵی تۆدا کردوونی؟"

ئۆدیسیوسی هۆشیار بەرسڤی دایەوە:

"تیلیماخۆس و من لێرە، لە هۆڵەکەدا، لە هەنبەر خوازگارەکاندا، چەند شەڕڤانو بەهێزیش بن، دەوەستین. ئێوە بە دوو قۆڵی، دەستوپێیانی توند لە پشتەوە ببەستنو توڕی بدەنە

عەمارەکەوەو دەرگاکە توند لەسەر خۆتان دابخەن. دوای ئەوە گوریسێکی قایمی تێوە ببەستن، بەستوونێکدا بەرزی بکەنەوەو بە کاریتەیەکیەوە هەڵواسن، بەو دەقەوە لێیگەڕێن تا بە دەم ئازارەوە گیانی دەردەچێت".

جووتە رەنجبەر یەکسەر بە گوێیان کرد. بەرەو عەمارەکە رۆییشتن، میلانتیوس چوو بووە ژوورەوەو ئەو جووتەی نەدەبینی. لەوسەری عەمارەکە، لە چەك دەگەڕا، جووتە رەنجبەر لەم بەرو لەوبەری دەرگاکە بۆی وەستان، کە میلانتیوس-ی سەر گەورەی بزنەوانان گەییە ناو دەرگاکە، بە دەستێك کڵاوخودێك‌و بە دەستەکەی تری سپەرێکی دەڵبی هەڵگرتبوو، کڵاوخودو سپەرێکی کۆن‌و تەپوتۆزاوی، کە کاتی خۆی لایرتیسی قارەمان لە گەنجیدا بەکاری دێنان. ئیدی دەمێ بوو ئەو جەنگەوزارانە بە بێناز لەوێندەر کەوتبوون. دورمان‌و تەقەڵ‌و قایش‌و قوروشەکانیان هەڵتەقی بوو و پچڕا بوون — رێك لەم کاتەدا جووتە رەنجبەرو خوڵام پەلاماریان دا، گرتیان،و بە قژ رایانکێشایە ژوورەوە، وەکو قۆچی قوربانی دایان بە عارديدا، بە پەتێکی زبر دەست‌و لاقیان توند لە پشتەوە بەست، وەکو چۆن ئوديسيوسی جامێرو بەردەبار، کوڕی لایرتیس فەرموو بووی، بەو ئاوایە دەست‌ولاقیان توند لە پشتەوە بەست‌و ئەوجا گوریسێکی قایمیان تێوە بەست، بە ستوونێکدا بەرزیان کردەوەو بە کاریتەیەکیانەوە هەڵواسی. ئەوسا یومایوسی بەرازەوان رووی تێکردو بەدەم تەوس‌و توانجەوە پێی گوت:

"ئەی میلانتیوس. ئەمشەو بۆ خۆت،لێرە لە ناو جێگای نەرم‌و گەرمدا، کە زۆری حەز لێدەکەی، بەسەر دەبەیت!و بۆ خۆت چاوەڕوان بە، تا کیژۆڵەی بەیان لە نێو شەپۆلانی ئوقیانوسەوە رادەبەێت‌و، ئەو خوابانۆی زێڕین عەرەشە، رێك لەو کاتەدا هەڵدێ کە تۆ دەچی بزنان بۆ خوازگاران دێنی تا لێرەدا، لەم ماڵەدا بیکوژنەوەو خوانی پێ برازێننەوە."

## ئەتینا لە شێوەی مینتوردا خۆی پیشانی ئوديسيوس دەدات

جووتە رەنجبەر، میلانتیوسیان، بەو دەقەوە، بەدەست‌و پێ بەستراوی، بە هەڵواسراوی لەوێندەر بەجێهێشت. بە خۆیان جەنگەوزاریان لە خۆدا، دەرگا ساف‌و لوسەکەیان لە دوای خۆوە داخست،و بۆ لای ئوديسيوسی فاماو چارەساز زڤرینەوە. ئیدی ئەمان بە چوار قۆڵی، دلێرو ئازا، ئامادەو تەیار بەر دەرگایان گرت. ئەوانەی ناو هۆڵەکە سەرباری ئازایەتی‌و دلێری ژمارەشیان زۆر بوو. هەردوو بەرەی شەڕ بەرانبەریان لێکدی گرت. هەنگێ ئەتینا،کیژی زیوس، کە بە دەنگ‌و رەنگ خۆی کردبوو بە مینتور، خۆی بۆ ئوديسيوس نواند. ئوديسيوس زۆر خۆشحاڵ بوو، رووی تێکردوگوتی:

"ئەی مینتور! فریامان بکەوە، لە مەرگمان رزگار بکە، ئێمە دۆستی گیانی بە گیانی بووین، چاکەی من لە بیر مەکە، تۆ هاوڕێ وهاوتەمەنی منی".

هەرچەندە بەو شێوەیە قسەی دەکرد، بەڵام لە دڵی خۆیدا هەستی دەکرد کە ئەمە ئەتینایەو چووەتە کڵێشەی مینتورەوە. لەو بەریشەوە خوازگارەکان لە ناو هۆڵەکەوە بە دەنگی بەرز هەڕەشەیان لەو خوابانۆیە دەکرد. ئەجیلاوسی کوڕی داماستور بەر لەوانی دی روو لە ئەتینا هاواری کرد:

"ئەی مینتور، ئامان بە قسەی ئودیسیوس نەخەڵەتێی، نەکەی بە قسەی ئەو، دژی خوازگارەکان بوەستی‌و پشتیوانی لەو بکەی. چونکە زەرەر دەکەی، ئامان بە قسەی نەکەی، چونکە کە ئەو جووتەمان، باب‌و کوڕمان کوشت، هەنگێ تۆش دەکوژین. نەکەی ئەم ریسکە بکەی، باجی ئەم ریسکە سەرتەو دەبێ بیدەی. کە کوشتمانیت ئەوسا دەست بەسەر دارو نەدارت دا، چ لە شارو چ لە دەشت‌و کێڵگەو مەزرایاندا دەگرین‌و بە دەردی موڵك‌و ماڵەکەی ئودیسیوس-ی دەبەین. رێگە بەکوڕو کچانت نادەین لە ماڵی خۆدا بژین و ژنە خانەدان‌و دڵسۆزەکەشت لە ئیتاکا وەدەردەنەین، شار بەدەری دەکەین."

## ئەتینا لۆمەی ئودیسیوس دەکات‌وندەی دەدا

ئەو قسانە، هێندەی دی ئەتینای تورە کرد. بۆیە رووی کردە ئودیسیوس‌و بە ئاوایەکی لۆمەئامێزو توند گوتی:

"ئەی ئودیسیوس، کوا هەڵمەت‌و ئازایەتی جارانت؟ کوا ئەو ئودیسیوسەی نۆ دانە ساڵی بەردەوام، لە پێناوی هیلینی باسك سپی، رەسەن زادەدا شەڕی تەروادەییەکانی کرد، وبە کۆمەڵ شەڕڤانی لێکوشتن؟! کوا ئەو ئودیسیوسەی کە بە راوێژوتەگبیرو نەخشەی ئەو شارە گەورەکەی پریام، شاری پڕ پێچ‌و پەنای تەروادە هاتە گرتن؟! خێرە ئێستا کە گەڕایتەوە ماڵەکەی خۆت، لە ناو ماڵ‌و کەسوکاری خۆتا باشارت بەستراوەو لە بری شێر ئاسا پەلاماری خوازگارەکان بدەی، قڕیان بکەی، خەریکە دەگریت؟ نا، وەرە گیانە، وەرە لای منەوەو تەمەشا بکە بزانە مینتوری کوڕی ئالکینوس، چتۆ پاڵەوانانە شەڕی دژمنانی تۆ دەکات،وچاکەو پیاوەتیت دەداتەوە."

هەڵبەتە ئەو قسانەی بۆ ئەوە نەبوو کە دەم‌و دەست، ئودیسیوس بە یەکجارەکی و بێ چەندو چون سەربخات. بەڵکو زیاتر بۆ ئەوەی بوو ئودیسیوس و کوڕە سەرفرازەکەی پتر جۆش بدات‌و هێزو تواناو ورەیان تاقی بکاتەوە. بۆیە بە خۆی لە شێوەی پەرسێلکەیەك دا هەڵفڕی‌و خۆی بە بن میچی هۆڵەکەدا، کە لە تەنیدا رەش هەڵگەڕابوو، کرد. لەسەر کاریتەیەك هەڵنیشت‌و لەوێندەرەوە دەیڕوانیە شەڕەکە.

## ئەجیلاوس، خوازگارەکان بۆ شەرو پەلامار هاندەدا

هەنگێ ئەجیلاوس-ی کوڕی داماستور، لەگەڵ یورینوموس‌و ئەمفیمیدون، و دیموپتولیموس، و پیساندری کوڕی پولیکتور، وپولیبوسی هوشیاردا، خوازگارەکانی بۆ شەڕ هاندەدا، چونکە ئەمانە لە ئازایەتیدا سەر تۆپی هەموو ئەو خوازگارانە بوون کە تا ئێستا مابوون‌و لە پێناوی گیانی خۆدا دەجەنگین، ئەوانی دی هەموو بوو بوون بە قوربانی تیروکەوانی ئودیسیوس‌و لەو گۆڕە کەوتبوون‌و،حەیاتیان لەبەر بڕا بوو.

ئەجیلاوس رووی تێکردن‌و هاواری لێکردن:

"برادەرینە، دڵنیابن کە ئەم پیاوە سەر سەخت‌و نەبەزە بەو زووانە کوڵ دەدات، ئەی قور بەسەری، ئەوە تا مینتور دوو قسەی بۆ کردو پشتی تێکردو رۆیی. رەقیبانی ئێمە تەنیا ئەو چوار کەسەن کە بە خۆتان لەبەر دەرگاکەیان دەبینن، هەموو پێکەوەو بە یەك کەڕەت رمبارانی مەکەن. وەرن با تەنیا شەش کەسمان -هەموو ئەوانەی کە لێرەین- نێزەی خۆ بهاوین، بەڵکو

کاری ئودیسیوس تەواو بکەین‌و زیوس سەرکەوتنمان بە نسیب بکات. کە ئودیسیوسمان لە کۆڵ ببێتەوە، ترسم لەوانی دیکە نیە."

هەرکە لە قسەکانی بووەوە، هەر شەشیان، وەکو چۆن ئەو فەرمانی دابوو، بە دڵی پڕ رق‌و جۆشەوە، نێزەی خۆیان هاویشت. بەڵام ئەتینا کارەکەی پوچەڵ کردنەوە، هیچ نێزەیەکیان بەر نیشانەی خۆی نەکەوت. یەکێکیان بەر چوارچێوەی دەرگا مکومەکەی هۆڵەکە کەوت، یەکێکی تریان بەر دەرگاکە کەوت، و یەکێکی تریان کە زۆر قورس‌و برونزین بوو رێك لە دیوارە مکومەکە چەقی، ئیدی هیچ نێزەیەك نیشانەی خۆی نەپێکا. پاش ئەوەی دەستەکەی ئودیسیوس لە رمبارانی خوازگارەکان رزگار بوون، ئودیسیوسی پشوو درێژ وبەردەبار، رووی کردە هاوڕێکانی وگوتی:

"کوڕینە! من دڵنیام کە کاتی ئەوە هاتووە ئێمە خوازگارەکان رمباران بکەین، نابێ ئەم دەلیڤەیە لە دەست بدەین، دوای ئەو هەموو غەدرەی لێیان کردووین، دوای ئەو هەموو تاوانەی دەرهەق بە ئێمەیان کردووە، هێشتا ئەوان سەرگرانن‌و دەیانەوێ بمانکوژن.. کوڕینە فرسەتە گەر نەیانکوژین، دەمانکوژن."

## ئودیسیوس وهاوڕێکانی شەڕدەکەن ئەمما شەڕ!

هەرکە ئودیسیوس لە قسەکانی بووەوە، هەموو بە جارێ نیشانەیان لە دژمن گرتەوە، نێزە نوك تیژەکانی خۆیان هاویشت‌و هەرکەسەو نیشانەی خۆی ئەنگاوت. ئودیسیوس، دیموپتولیموسی کوشت. تیلیماخۆس، یوریادیسی کوشت. یومایوسی بەرازەوان، ئیلاتوسی کوشت. سەرەنجام گاوانەکەش، پیساندری کوشت. بەو جۆرە هەموو ئەوانە زاریان لە خاك‌وخۆڵی هۆڵە گەورەکە چەقی. خوازگارەکانی دی هەموو لە ترسا پاشەکشەیان کرد، خۆیان لە سوچێکی دووری هۆڵەکە خزاند. ئودیسیوس‌و هاوڕێکانی هێرشیان بردە سەر کوژراوەکان‌و نێزەکانی خۆیان لە جەستەیان دەرهێنایەوە.

## ئەتینا پشتیوانی لە ئودیسیوس وهاوڕێکانی دەکات

دوای ئەوە خوازگارەکان، دیسان تێهەڵچوونەوە، زۆر بە جدی کەوتنە رمبارانی ئودیسیوس و جەماعەتەکەی. بەڵام دیسان ئەتینا وەکو جارەکەی تر، زۆربەی نێزەکانی پوچەڵ کردنەوە. نێزەی یەکێکیان بەر لاشانی مکومی دەرگای هۆڵەکە کەوتبوو، یەکێکی دی بەر دەرگاکە کە توند داخرا بوو، کەوتبوو. یەکێکی دی، کە نێزەیەکی قورسی نوك تیژی برونزی بوو لە دیوارەکە چەقی بوو. بەڵام ئەمفیمیدون، بە ئاستەم مەچەکی تیلیماخۆسی پێکا بوو، وبە حاڵ روشاندبووی. کتیسیپوس بە رمە درێژەکەی سەروی شانی یومایوسی روشاندبوو، و ڕمەکە لەسەر قەڵغانەکەی تیغی کردبوو، ولەو دیووەوە کەوتبووە سەر زەوی. ئەوسا ئودیسیوسی فاماو یاوەرەکانی هاتنە دەست‌و کەوتنە رمبارانی خوازگارەکان. وەکو جارەکەی پێشوو، ئودیسیوسی قاتیحی شاران، یوریداماسی کوشت. تیلیماخۆس، ئەمفیمیدونی کوشت. بەرازەوانەکە پولیبوسی کوشت. و ئەنجام گاوانەکە، رێك سەر سینگی کتیسیپوسی پێکا. خۆی گەیاندە سەری‌و بە تەوسەوە گوتی:

"ئەی کوڕی پولیتیرسیس، ئەی چەنەبازی زمان درێژی جنێوفرۆش، جارێکی دی بەخۆ نەفشی، و لە خۆڕا جنێوان بە خەڵکی بدەیتو غەڕاو مەغروور هەڕەشە بکەیتو چارەنووسی خەڵکی دیاری بکەیت. چونکە دیاریکردنی رووداوان کاری خواوەندانەو هەر لە خۆیان دێت، نەك لە تۆ. لە بیرتە ماوەیەك لەوە پێش کە ئودیسیوسی خواوەند ئاسا، کە لە قیافەتی گەدادا هاتبووە ماڵەکەی خۆیو گەدایی دەکرد، چۆن سمەگایەکت تێسرەواند!، دەیسا ئەم نێزەیە لە تۆڵەی ئەوەیە، وەری بگرە، وا بزانە دیاریی میوانداریە."

## ئەتینا ترسو لەرز دەخاتە دڵی خوازگارەکانەوە

گاوانەکە ئەو تەشەرانەی لە کتیسیپوس دا. ئودیسیوس، لە نزیکە شەڕێکدا، بە نێزە درێژەکەی، کوڕەکەی داماستوری پێکا. (تیلیماخۆس)ش لیوکریتوسی کوڕی ئیڤینوری پێکا. نێزەیەکی لەورگی دا، دیواودەر کونی کرد. یەکسەر بەدەما ڕماو تەختی تەوێڵی دای بە عاردیدا. هەنگێ ئەتینا سپەرە کوشندەکەی لە جێی خۆیەوە بەسەر سەریانەوە هەڵداو هەموو خوازگارەکان لە ترساندا زراویان تۆقی. هەموو وەکو گاگەلێك کە لە رۆژگاری درێژی هەوەڵی هاویندا سیرەمۆزە تێی بەربێو لە تاوا بە هەموو لایەکدا غار دەدا، ئەوانیش بەو ئاوایە، ترساوو تۆقیو، شێت ئاسا، بەناو هۆڵەکە کەوتبوونو بە هەموو لایەکدا هەڵدەهاتن. لەم لاشەوە وەکو چۆن کەرگەزانی چنگ تیژی دەنووك قولابی، لە لوتکەی کۆسارانەوە تاو دەدەنە مەلانی چکۆلەو بێ دەسەلات، ومەلەکان لە ترسا بەپەلە لە مەرزی هەورانەوە هەڵدێنو بەرەو دەشتایی دادەکشێن، وکەرگەزەکان تێیان دەکەونو بێکەس کوژیان دەکەن، ومەلەکان لە بەردەم کەرگەزەکاندا خۆ ناگرنو هیچ مەفەڕێکیش شك نابەن، وخەڵکی کە ئەو دیمەنە دەبینن، بە شەوقو زەوقەوە لە هەوەڵەوە تا کۆتایی تەمەشای دەکەن. ئودیسیوسو یاوەرەکانی بەو ئاوایە نیشتبوونە سەر رەقیبەکانی خۆیان، و هەر سەر بوو وبەدەم هاوارو فریادی دڵتەزێنەوە، بە زەبری نێزەو شمشێران شەق دەبوو، ودەپەڕی، خوێن بەسەر سەلبەندی هۆڵەکەدا رێی دەکرد.

## لیودیس لە ئودیسیوس دەپاڕێتەوە کە لە گیانی خۆش بێ

هەنگێ لیودیس بە هەڵەداوان بەرەو ئودیسیوس رۆیی، دەستەو داوێنی کەوت، کەوتە لالانەوەوپاڕانەوە،گوتی:

"دەخیلە ئودیسیوس، لاقت ماچ دەکەم، بەزەییت پێمدا بێتەوە، لە گیانم خۆش بە. دڵنیابە من نە بە قسەو نە بە کردەوە غەڵەتم دەربارەی هیچ ئافرەتێکی ئەم ماڵە نەکردوو. بگرە زۆرجار هەوڵم داوە کە خوازگارەکانی دیکە، لەو جۆرە کارە بگێڕمەوە، بەڵام بە گوێیان نەدەکردمو لە دزێوکاری نەدەگەڕانەوە، بۆیە ئەوەتا کردەوەی خۆیان هاتەوە رێو باجی ئەو گەوجێتیوسەرکێشییەیان دا. من لە نێو ئەواندا بابایەکی فاڵبین بووم. هیچ تاوانێکم نەکردووە، کە شایستەی کوشتن بم. ئەگەر بمکوژی، هیچ جیاوازییەك لە نێوان خەتابارو بێ خەتا نامێنێ! ئیدی خەڵکی بۆچی چاکەی بێهودە بکەن!"

## ئودیسیوس، بێ بەزەییانە لیودیس دەکوژێ

ئودیسیوس، مۆرەیەکی لێکردوبەرسڤی دایەوە:

"ئەگەر وەکو خۆت دەڵێی تۆ تەنیا وەکو فاڵبین‌وئایندەڕوان دەگەڵ خوازگارەکان بووبی، بێگومان زۆرجار دوعای ئەوەت کردووە کە گەڕانەوە بە چاوی خۆم نەبینم، تا ژنەکەم بە ناچاری دووی تۆ بکەوێ‌و منداڵت بۆ بخاتەوە، بۆیە دەبێ بمریت".

ئودیسیوس، دوای ئەو قسانە، دەستی برد، شمشێرێك لەبەردەمیا کەوتبوو، شمشێرەکەی ئەجیلاوس بوو کە بەدەم مردنەوە لە دەستی کەوتبوو، بەڵێ ئەو شمشێرەی هەڵگرت، تا هێز لە دەستیا بوو، لە ملی لیودیسی دا، کە سەری بە عاردی دا خل بووەوە،هێشتا هەر قسەی دەکرد.

## فیمیوس داوای ئەمان لە ئودیسیوس دەکات

لەو بەینەدا، فیمیوسی هۆنەروشایەر، کوڕی تیرپیس، کە خوازگارەکان بە تۆبزی هێنابوویان‌و بە ناچاری گۆرانیان پێدەگوت، لەمەفەرێك دەگەڕا کە لە ئەهریمەنی مەرگ رزگار بێت. بە خۆی‌و سازە خۆشاوازەکەیەوە لە نزیکی دەرگا بەرزەکەدا وەستا بوو، تیا مابوو، نەیدەزانی چیبکات، ئایا لە هۆڵەکەوە دەربکەوێ‌و بچێت بۆ پەرستگە مکومەکەی زیوس–ی مەزن، پاسەوانی ماڵان، و لە قوربانگەکەیدا دانیشێت، ئەو قوربانگەیەی کە لایرتیس‌و ئودیسیوس جارەهای جار گایان تیا کوشتووەتەوەو بۆ خواوەندانیان کردووەتە قوربانی، یان بڕوات‌وخۆی لەبەر پێیانی ئودیسیوس بهاوێ، لاقی ماچ بکات‌و لێی بپاڕێتەوە کە لە گیانی خۆش بێت؟ ئەنجام هاتە سەر ئەو باوەڕەی کە باشتر وایە بچێت دەستەو دامێنی ئودیسیوس بکەوێ. ئیدی سازە نێو بەتاڵەکەی لە بەینی سوارحیەیەك بادەو مێزێکی زیونیشان دا، لە عاردی دانا. بەڕاکردن بەرەو ئودیسیوس رۆیی، خۆی لەبەر پێیانی هاویشت، ئەوجا زەبوون‌وکەساس کەوتە پاڕانەوە:

"ئامان ئودیسیوس، هانام بۆ تۆ هێناوە، لاقت ماچ دەکەم، بەزەییت پێمدا بێتەوە، لە گیانم خۆش بە. تیرەی شایەرو ئاشقان ناکوژرێن، جا ئەگەر شایەرێك، کە بۆ خواوەندان‌و بەشەران دەخوێنی، بکوژیت، تووشی عەزابی ویژدان دەبیت، ژێوان دەبیتەوە، من بابایەکی خۆ کردیمە، هەر شیعرو گۆرانیەك کە دەیڵێم، ئیلهامی ئاسمانییە، خواوەندێك لە دڵمی دەنێت. بۆیە کە لە هەنبەر تۆدا گۆرانی دەڵێم، وام دێتە بەرچاو، کە تۆش خواوەندێکی بۆ خۆت، واتە ئەوەی شایەرو ئاشق دەیڵێ ئیلهامە، زمانی بەرەی شایەرو ئاشقان لە کۆت‌و زنجیرە نادرێ، بۆیە پەلەی کوشتنی منت نەبێ.

جا تیلیماخۆسی کوڕی ئازیزت شایەدە کە من بە ئارەزووی خۆم نەدەهاتم بۆ ماڵی تۆ تا لە بەزم‌و ئاهەنگی خوازگارەکاندا گۆرانی بڵێم. بەڵکو ئەوانە، کە لە من زۆردارترو زۆرتر بوون، بە تۆبزی، بێخوایشتی خۆم بۆ ئێرەیان دەهێنام."

## تیلیماخۆس داوا لە بابی دەکات

## کە فیمیوس و میدون نەکوژێت

که ئەو قسانەی دەکرد، تیلیماخۆسی مەردو رەند گوێی لێ بوو، خێرا رووی کردە بابی، کە لێوەی نزیك بوو، وگوتی: "راوەستە، لەو پیاوە مەدە: بێ تاوانە، پێویستە لە میدون-ش خۆش بین. چونکە کە من منداڵ بووم هەمیشە سەرپەرشتی دەکردم. زۆر بە خەممەوە بوو. خوا بکات فیلویتیوس و بەرازەوانەکە، بە رێکەوت نەیان کوشتبێ، یان خوابکا لەو کاتەدا کە تۆ بەناو هۆڵەکە کەوتبوویت و سەگ بە حەسارت بە دژمنان دەکرد، بە دەستی تۆ نەکوژرابێت."

میدونی پڕ ئەقڵ، کە خۆی خزاندبووە ژێر مێزێك و کەوڵە گایەکی تازە سەربڕاوی بەخۆیدا دابوو تا لە دێوی مەرگی رەش رزگار بێ، هەر گوێی لە قسەکانی تیلیماخۆس بوو، خێرا لە ژێر مێزەکە هاتە دەرێ. کەوڵە گایەکەی فڕێ دا، بەرەو تیلیماخۆس غاری داو خۆی لەبەر پێیانی هاویشت و بەمجۆرە کەوتە لالانەوەوپاڕانەوە:

ئەوەتام ئەزبەنی، من میدونم، ئامان، هانام بۆ تۆ هێناوە، فریام کەوە، قسە دەگەم بابت بکە، هێندە لەو خوازگارە بێ ئەقڵانەی کە ماڵ و داراییان بە فیڕۆ دەداو هیچ حورمەتێکیان بۆ تۆ دانە دەنا، پڕو توڕەیە، دەترسم چاوی من نەبینێ و بمکوژێت و ئاوەوئاو بڕۆم".

## ئودیسیوس تکای کوڕەکەی قەبووڵ دەکات

ئودیسیوسی فاما بزەیەکی بە روویدا داوگوتی:

"مەترسە، مادامێکی تیلیماخۆس پشتیوانی کردیت و بەرگریت لێدەکات، ئەوا لە گیانت خۆش بووم. هیچ خەمت نەبێ.جا حەزدەکەم ئەوە بزانیت و بۆ خەڵکی تریشی بگێڕیتەوە کە ئەوەی دەمێنێتەوە هەر چاکەیە، خراپەوکرێتکاری و جنێودان هیچی لێ شین نابێت. دەی خۆت و ئەو ئاشق و شایەرە بە نێوبانگە لەم هۆڵە وەدەربکەون، ولە دەرەوە، دوور لەم کوشت وکوشتارە بۆ خۆ دانیشن، وچاوەڕوان بکەن، تا من لێرە، لە ژوورەوە لە کارەکانم دەبمەوە."

هەرکە ئودیسیوس ئەو قسانەی کرد، هەردووکیان بە جووتە لە هۆڵەکە وەدەرکەوتن، وچوون لە نزیکی قوربانگەکەی زیوسی مەزن دانیشتن. ئەبلەق وحەیران دەیانڕوانییە چواردەوری خۆیان و هێشتاش هەر چاوەڕوانی مەرگ بوون.

ئەوسا ئودیسیوس زۆر بە وردی کەوتە گەڕان بە پەناو پاسارانی هۆڵەکەدا، تا لەوە دڵنیا بیت کە هیچ خوازگارێك خۆی نەشاردووەتەوەو لە مەرگی رەش دەرباز نەبووە. بەڵام هەر هەموویان لە خاك و خوێندا گەوزا بوون و بە کۆمەڵ کەوتبوون. وەکو چۆن ماسیگران، تۆرە سفتەکانیان هەڵدەدەنە دەریاوەو پاش ئەوەی ماسییەکی زۆری تێدەکەوێ و تۆڕەکەیان لە دەریای سپیواژی کەف پڕژێن دەردەکێشنەوەو بە ماسییەکانەوە لە کەنارەکە توری دەدەن، وهەموو ماسییەکان بەدەمە داچەقێ سوێ بۆ شەپۆلانی دەریا دەخۆن، وئەوسا تیشکی بە پرشنگی هەتاو لێیان دەدات و گیانیان دەردەچێ و بێ جوڵە بەسەر یەکدا دەکەون، لاشەی خوازگارەکانیش بەو جۆرە بەسەر یەکدا کەوتبوون. هەنگێ ئودیسیوسی بەردەبار، روو لە تیلیماخۆس گوتی:

"تیلیماخۆس، هەڕە دایە یوریکلیام بۆ گاز بکە، تا نیازو مەبەرستی خۆمی پێبڵێم."

## تیلیماخۆس، یوریکلیا گاز دەکات

تیلیماخۆس، یەکسەر رۆیی، لە دەرگای حەرەمسەرای دا، هەر لە دەرەوە گوتی:

"ئەی دایەی هەژیو گرانقەدر، ئەی سەرپەرشتیاری هەموو ژنانو قەرەواشانی ئەم گەورە ماڵە، رابە، لەزێ بکە، بابم تۆی دەوێ، گەرەکییە قسەت دەگەڵ بکا".

یوریکلیا، هەرکە گوێی لە دەنگی تیلیماخۆس بوو، دەرگای حەرەمسەراکەی کردەوەو هاتە دەرێ. تیلیماخۆس پێشی کەوت، لەوێ ئودیسیوس-ی لە نێو لاشەو جەنازەی خوازەگارەکاندا، کە هەموو کوژرا بوون، بینی. سەراپای لە تۆزوخوێندا هەڵکشا بوو. وەکو چۆن شێرێك لە بێشەیەکدا گاکێوییەك هەڵدەدڕێو پاش تێر بوون، بەرێی خۆیدا دەڕوات، وسینەو بەرۆكو دەمو قەپۆزی لە هەموو لایەکەوە، لە خوێنا هەڵکشاوەو دیمەنی زۆر سامناكو ترس ئەنگێزە! بە هەمان شێوە دەستو پێی (ئودیسیوس)ش خڵتانی خوێن بوو. وەختێ یوریکلیا، ئەو هەموو جەنازەیە، ئەم هەموو خوێنەی بینی کە لەبەریان دەڕۆیی، یەکسەر لە هەڵهەڵەی خۆشی دا، بەلام ئودیسیوس، زوو بێدەنگی کرد، وبەدەم سەرزەنشتەوە گوتی:

"پیرەژن، لە دڵی خۆتا شادی بکە، جڵەوی خۆت بگرەو هەڵهەڵە لێمەدە، شایی بوون بە مردووان گوناحە، کارێکی نا پەسندە. ئەمانە تازە مردوونو هیچ دەسەلاتێکیان نیە، ئیرادەی خواوەندانو بەدکاریو بێ ئینسافی خۆیان، ئەمەی بەسەر هێناون. ئەمە کردەوەی خۆیانەو هاتووەتەوە رێیان. چونکە لەم دنیایەدا حیسابیان بۆ کەس نەکردووە، رێزی نەگەدارو نە پاشایان نەگرتووە. گۆساخیو بێ ئەدەبی خۆیان، بەم رۆژوچارەنووسەی گەیاندن. جا ئێستا پاکو پیسێکی کارەکەرەکانم بۆ بکە، کێ لەم کۆشكو سەرایەدا بەد رەفتاری کردووەو حورمەتی بۆ من دانەناوەو گوناحبارە، وکێ پاكوبێگەردو بە حورمەتو بێ تاوانە".

## یوریکلیا پاكو پیسی بۆ دەکات.

یوریکلیای دایەنی بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"کوڕەکەم، دڵنیایە بە راستت پێدەڵێمو راستی لە من دەزانیت. پەنجا کارەکەر لەم کۆشكو سەرایەدا هەن، کە کارکردن، خوری پشکنینو ئەنجامدانی هەموو کاروبارێکی ماڵم فێر کردوون. لەم پەنجا ژنە تەنیا دوانزە کەسیان بە پێی خۆیان رێگەی شەرمەزاریان گرتووە، شولیان لێ هەڵکێشاوەو شەرمیان نە لە من و نە لە خودی پنلوپی نەکردووە، زۆر بێ منەتو بێباك رەفتاریان کردووە. سەبارەت بە (تیلیماخۆس)ش ماوەیەکی زۆر کەمەو تازە بووە بە پیاو و دایکی رێی نە دەدا خۆی لە کاروباری کارەکەرەکان هەڵقورتێنێو جڵەویان بگرێو... بە هەر حاڵ، با من خۆم بگەیەنمە باڵەخانەکەو ئەم هەواڵە بە هاوسەرەکەت بگەیەنم، چونکە کە من هاتم، ئەو لە غوڕابی خەودا بوو، وادیارە یەکێك لە خواوەندەکان خەوی لێخستبوو.

ئودیسیوسی فاما بەرسڤی دایەوە:

"نا، جارێ، خەبەری مەکەوە. بەلام بە هەموو ئەو کارەکەرانەی کە بێ ناموسیو بەد رەفتاریان کردووە، بڵێ با بێن بۆ ئێرە".

دوای ئەو قسانە، یوریکلیا لە هۆڵەکە وەدەرکەوت. رۆیی تا ئەو دەستورە بەکارەکەرەکان بدات و وادارِیان بکات بێن بۆ لای ئودیسیوس.

ئەوسا ئودیسیوس، تیلیماخۆس و گاوان و بەرازەوانەکەی گازکردو پێی گوتن:

"هەر ئێستا دەست بە گواستنەوەی ئەو لاشانە بکەن و بیانبەنە دەرەوە، بە کارەکەرەکانیش بڵێن کە یارمەتیتان بدەن. ئەوسا مێزو کورسی و تەپڵەکە جوانەکان بە ئاوو ئیسفەنج بشۆن و خاوێنیان بکەنەوە. پاش ئەوەی ماڵەکەتان تەواو رێك خستەوە، ئەوسا کارەکەرەکان لێرە بەرنە دەرێ، لە ژوورە تایبەتیەکەی پەنای دیوارە بەرزەکانی حەوشەدا، بە شمشێران تێیان بکەون و دوا بە یەکیان بکوژن، تا لەزەتی ئەو داوین پیسییەی بەدزییەوە دەگەڵ خوازگارەکاندا دەیان کرد، لەگەڵ خۆدا بەرنە گۆڕەوە."

## کارەکەرەکان بە دەم گریانەوە دێن

دوای تۆزێك کارەکەرەکان بە کۆمەڵ هاتن، لە ترسا خۆیان پێکەوە نوساند بوو. دەگریان ئەمما گریان، روندك وەکو بارانی بوهار لەچاویان دەرباری. هەوەڵجار جەنازەی کوژراوەکانیان بردو لە ژێر دالانەکەی ناو حەوشە، کە بورج و قوللەیەکی مکومی هەبوو، بەسەر یەکەوە هەڵیان چنین. ئودیسیوس فەرمانی دەدانیٚ و داوای لێدەکردن پەلە بکەن. کارەکەرەکانیش بە ناچاری لاشەکانیان دەبرد. ئەوسا بەئاووئیسفەنج کەوتنە شۆردن و خاوێنکردنەوەی کورسییە جوانەکان و مێزەکان. تیلیماخۆس و گاوانەکەو بەرازەوانەکە بە بێڵ و خاکەناز کەوتنە رنینی ئەو خوێن و خوڕەی لەسەر عەردی هۆڵەکە خەست بوو بووەوە. کارەکەرەکان خوێن و خوڕەکەیان هەڵدەگرت و دەیانبرد و لە دەرێیان دەڕشت. کە ماڵەکە بە تەواوەتی پاك کرایەوەو رێك خرایەوە، ژنەکانیان لە کۆشك و سەرا مکومەکە بردە دەرێ. بە دالانێکی سەر بە گومەزی پەنای دیوارە بەرزەکەی حەوشەدا بریادنن، خستیاننە شوێنێکی تەنگی ئەوتۆوە کە هیچ مەفەڕو شوێنی راکردنی تیا نەبوو، هەنگێ تیلیماخۆسی ژیرو فامیدە هاتە قسان و گوتی:

"مەگەر هەر خۆم بزانم ئەم ژنانە چەندیان سوکایەتی بە من و بە دایکم کردووە، چۆن بە بێ ئەدەبی و گۆساخی خۆیان بوو بوونە مایەی شەرمەزاری و سەرشۆڕی من و دایکم. چۆن بە ئاشکرا دەگەڵ خوازگارەکاندا دەخەوتن و رایان دەبوارد، بۆیە دەبێ بە ریسوایی بمرن".

## کارەکەرە بێ ئابڕووەکان دەکوژرێن

دوای ئەو قسانە، گوریسێکی ئەستوورو قایمی کەشتی بەستنەوەی هێنا، بە کۆڵەکەیەکی بەرزو ئەستوورییەوە بەست، ئەوجا بە بن میچی ژوورە سەر بە گومەزەکەوە تەناف ئاسا، بە بەرزییەکی ئەوتۆوە رایەڵی کرد، کە ژنەکانی پێوە هەڵواسرێ پێیان نەگاتە عاردی. جا وەکو چۆن پۆلە کۆترێك یان قومرییەك کە لە شەقەی باڵ دەدەن و بە هەشتاو بەرەو هێلانەی خۆ دەبنەوە،و بە دەم فڕینەوە، لە پڕ تۆڕێکی سەر مێرگوزارێکیان دێتە رێ،و خڕ تێی دەکەون و تووشی چارەنووسی شووم و کوشندەی خۆ دەبن. بەو ئاوایە، ئەو ژنانەش بە ریز وەستا بوون، سەروپەتیان، بە گرێیەکی شل لە مل کرابوو، کە بەرە بەرە لە ملیان دەجەڕی، تا بەو پەڕی داماوی و کەساسی بمرن، بۆ ماوەیەکی کەم لاقیان جوڵاو ئەوسا بۆ هەتا هەتایە خامۆش بوو.

ئەوسا (میلانتیوس) یان بە دالآن و ڕاڕەوەکەدا هێنا، وگەیاندیانە ژوورە تایبەتیەکە، لەوێ بە شمشێری برونزین لوت وگوێیان بڕی، گەڵوگونیان بڕی و فڕێیان دایە بەر کسۆکان، هەر بەوە دڵیان دانەسەکنی، هەستان هەرچوار پەلیشیان بڕی.
کە لێبوونەوە، دەست و پێی خۆیان شت، گەڕانەوە بۆماڵەکە، بۆ لای ئودیسیوس. ئیدی هەموو شتێك بڕابووەوە. هەنگێ ئودیسیوس رووی کردە، دایەنە ئازیزەکەی خۆی، یوریکلیاو گوتی:
"پیرەژن گۆگرد بێنە، ئەو دەرمانەی هەموو پیسییەك دەبات، بیهێنە باخۆمی پێ پاك بکەمەوە، هەروەها ئاگر بێنە تا بە گۆگرد، هەموو ماڵەکەو ڕاڕەوەکان پاك بکەمەوە. بە پنلوپی- ش بڵێ دەگەڵ هەموو هاودەمەکانیا بۆ ئێرە بێت،وبە هەموو کارەکەرەکانی دیکەش بڵێ بە پەلە بێن."
هەنگێ دایەنە دڵسۆزەکەی، یوریکلیا بەرسڤی دایەوەو گوتی:
"بەسەر چاو کوڕەکەم، فەرمانت بە سەر سەرە. بەڵام با جارێ دەستە جلێکی جوانت بۆ بێنم و خۆت بگۆڕە. ئەم جلە شڕانە فڕێ بدە، جوان نین، خەڵکی لۆمەت دەکەن".
ئودیسیوسی فاما بەرسڤی دایەوەوگوتی:
"جارێ، بەر لە هەر شتێك، ئاگرێکمان لە ماڵەکەدا بۆ بکەرەوە".
یوریکلیای دایەن، یەکسەر ئاگرو گۆگردی هێنا، ئودیسیوس سەرانسەری ماڵەکەو دالآن و ڕاڕەوەکانی تەعقیم کرد. هەنگێ پیرەژن، یوریکلیا، بە هۆڵە پاك و تەمیزەکەدا ڕۆیی تا بە ژنەکان بڵێ بەپەلە لە بۆ ئێرە بێن. ژنان هەموو مەشخەڵ بەدەست لە ژووری خۆیان هاتنە دەر. لەدەوری ئودیسیوس خڕبوونەوە. باوەشیان پێدا دەکرد، سەرو شان و دەستیان زۆر بە گەرمی و بەوپەڕی دڵسۆزی ماچ دەکرد. ئودیسیوس پڕ بە دڵ ئارەزووی گریانی دەکرد، چونکە لە ناخی دڵەوە هەر هەموویانی باش دەناسی و بە دیتنیان خۆشحاڵ بوو.

** *

## پەراوێز:

*-پریام:

لە کاتی شەڕی تەروادەدا پاشای تەروادە بوو، بەڵام پیر بوو.

## سروودی بیستو سێیەم

**کورتەی سروودەکە:**

یوریکلیای دایەن، پنلوپی لە گەڕانەوەو هاتنەوەی ئودیسیوس ئاگادار دەکاتەوە، بەڵام پنلوپی هەرچی دەکاودەکۆشێ ناتوانێ باوەڕبکات. پنلوپی لە باڵەخانەکەی خۆیەوە دادەبەزێو دێ بۆ هۆڵە گەورەکە، کە ئودیسیوس لەوێندەرە، دوو دڵە، جارێ هەست دەکات دەیناسێتەوەو جارێ دەکەوێتە گومانەوە. تیلیماخۆس سەری لەم ساردو سڕییەی دایکی سوڕ دەمێنێو گلەیی لێدەکات... بابو کوڕ پێکەوە دەربارەی ئەگەری راپەڕینو داوای تۆڵە لەلایەن ئیتاکیانەوە، راوێژو تەگبیر دەکەن. ئودیسیوس، بەوردی وەسفی ژووری زاوایەتیەکەی بۆ پنلوپ دەکات. ئیدی پنلوپ دڵنیا دەبێتولە گومان دەکەوێ. ئودیسیوس، ئەو پێشبینیو پێشگۆییانەی کە تیریسیاس دەربارەی ئەوی کردبوو (ئودیسیوس) بۆ پنلوپ دەگێڕێتەوە. ئودیسیوسو پنلوپ، باسی بەسەر هاتە دژوارو ئەستەمەکانی خۆیان بۆ یەکتر دەگێڕنەوە. ئودیسیوس بەیانی زوو بۆ لای لایرتیس دەڕوات.

***

### یوریکلیا مژدەی گەڕانەوەی ئودیسیوس بە خانمەکەی دەدات

خانمی پیر، بە دەم پێکەنینی شادییەوە، بە قاڵدرمەکاندا بۆ قاتی سەرەوە سەرکەت، تاکو مژدە بە خانمی گەورە بدات کە مێردە ئازیزەکەی هاتووەتەوەو ها لە ماڵەوە. هەرچەندە پیر بوو. بەڵام لاقی لە خۆشیاندا بوژابوونەوەو زۆر سووك هەنگاوی هەڵدەنا، خۆی بە پەلە گەیاندە دیار جێگاکەی پنلوپی، بەسەریا دانەوییەوەو بە ئەسپایی بە گوێیدا سرکاند:

"پنلوپی، رابە، رابە کیژە چکۆلەکەم ڕابە، تەماشا بکە، وەرە بە چاوی خۆت ئەو کەسە ببینە کە ساڵانی ساڵە چاوەڕوانیت. وەرە بە چاوی خۆت ئودیسیوس بدینە، ئەگەر چی لە مێژە بێ سەرو شوێنە، بەڵام ئەوەتا، وا لە ماڵەوەیە، وەرە تەمەشا بکە. چۆن قڕی خستووەتە ئەو خوازگارە خۆپەسندانەی کە ماڵەکەیان تاڵان دەکرد، سەروەتو سامانیان دەخوارد،و تاقە کوڕەکەیان دەچەوساندەوە".

پنلوپی دووربین بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"ئەی دایەی میهرەبان، چیە تێکچوویت، خواوەندان شێتیان کردوویت: خواوەندان توانایان بەسەر هەموو شتێکدا دەشکێت، حەزکەن ئاقڵترین کەس شێت دەکەن،و بێ ئەقڵترین کەس ئاقڵ دەکەن. وا دیارە ئەوان ئەقڵیان تێکداویت، ئەگینا جاران زۆر بە ئاوەزو ئەقڵ دروست بوویت. خۆم خەمم کەمە، وا تۆش دێی ئەم چیرۆکە خەیاڵییەم بۆ دەگێڕیتەوە! کەست دەست ناکەوێ پێی رابوێری من نەبێت! بۆچی لەو خەوە خۆشەت کردم؟ باوەڕبکە لەوەتای ئودیسیوس بۆ ئەو کاولە، بۆ ئیلوسی شووم رۆییشتووە من خەوی وام لێنەکەوتووە؟! دەیسا خێرا بڕۆرەوە بۆ ژوورەکەی خۆت. بچۆوە بۆ ناو کارەکەرەکان. باوەڕ بکە، ئەگەر تۆ نەبوایەی، وهەر ژنێکی دی هاتباو ئەو هەواڵە خەیاڵیەی بۆ هێنابامو لە خەوی کردبام، زۆر خراپ لێی تووڕە دەبوومو بە

عاجزی دەمناردەوە بۆ ئەو شوێنەی لێوەی هاتووە. بەڵام دەڵێی چی، لەگەڵ تۆدا، بەو تەمەنەوە هیچم پێناکرێت، مەجبورم لەگەڵتا نەرم بم.

## یوریکلیا هەواڵی کوشتاری خوازگارەکان بۆ خانم دەگێڕێتەوە

هەنگێ یوریکلیا، دایەنی دڵسۆزودلۆڤان، بەرسڤی دایەوە:

"نا، بەندی دڵەکەم، کچە بچووکەکەم، من بە تۆ رانابوێرم، یاری بە ئەقڵت ناکەم. من بەڕاستیمە، ئودیسیوس لێرەیە، گەڕاوەتەوە ماڵەکەی خۆی، چۆنت پێ دەڵێم وایە، هەمان ئەو غەریبەیە کە هەمووان بەد رەفتاریان دەگەڵ دەکرد! تیلیماخۆس، لە مێژە بەمەی زانی بوو. بەڵام ئاقڵانە خۆی لەگێلی دابوو، تا نەخشەو نیازی بابی وەشێریێو چاوەڕوان بکات، کە بابی لە دەرفەتی گونجاودا، بێتە دەستو تۆڵە لەم خەڵکە نامەردو بێ شەرمو بەدخوایە بکاتەوە".

هەنگێ پنلوپی ئاقڵو ئاغر لە خۆشیا راپەڕی، باڵی کردەوە، باوەشی بە پیرەژندا کرد، کونی فرمێسکانی بەربوو، گریا ئەمما گریان، ئەوسا بە تاسەوە گوتی:

"ئەی دایەی میهرەبان، وەرە رێكو راست پێم بڵێ، ئەگەر راستە وەکو تۆ دەڵێی هاتووەتەوە، چۆن بە تەنیا دەرەقەتی خوازگارە نامەردو بێ ئابڕووەکان هاتووەو قڕی کردوون؟ ئەو تەنیا باڵو ئەو دوابڕاوانە هەمیشە زۆر بوون".

یوریکلیا، دایەنی دلۆڤانو دڵسۆز وەڵامی دایەوەو گوتی:

"من نە هیچم بینی و نە هیچیشیان لەمبارەیەوە پێ گوتم: تەنیا گوێمان لە ناڵەو هاواری کەسانێك بوو کە دەکوژران: ئێمەی ژنان، هەموو بەدەم هەڵ لەرزینەوە، لە سوچێکی حەرامسەرا مکومەکەماندا خڕ بوو بووینەوە، دەرگاکانیان توند لەسەر داخستبووین، هیچ رێگەیەکی چوونە دەرەوە نەبوو. تا کاتێکم زانی تیلیماخۆس هات لە دەرگای داو هەر لە دیوی دەرەوە گازی کردمو پێی گوتم کە بابی ناردوویەتی بە شوێنماو منی گەرەکە. کە رۆییشتم سەیرم کرد ئودیسیوس لە نێو جەنازەی کوژراوەکاندا راوەستاوە، جەنازەکان بە چوار دەوریا، و لە عاردەکەدا بەسەر یەکترا کەوتبوون. ئەگەر دەتبینی چۆن وەکو شێرێکی سەراپا لە خوێنو خاکا هەڵکشاو، هەڵی دەڕوانی، لە خۆشیدا لە پێستی خۆت نەدەهێوریت! ئێستا هەموو لاشەکان وەکو لێژنە دار لەبەر دەرگاکانی حەوشەدا هەڵچنراون. (ئودیسیوس)ش خەریکە ماڵەکە بە گۆگرد تەعقیم دەکاتو ئاگرێکی گەورەی کردووەتەوەو منی بە دووی تۆدا ناردووە کە بۆ ئەوێندەرت ببەم. دەی رابە دووم بکەوە، تا دوای ئەو هەموو دابڕانو مەینەیتە، بە یەکتر شاوشکور ببنەوە! بەڵێ ئەمە ئەو رۆژەیە کە دەمێکە چاوەڕوانیت، شوکر ئاواتەکەت هاتووەتە دی. بەڵێ ئودیسیوس هاتووەتەوە، ئودیسیوس بە خۆی، بەڵێ هاتووەتەوە ماڵەکەی خۆی، هاتووەتەوە تا بە هاوسەرەکەیو کوڕەکەی شادبێتەوەو تا لە ماڵەکەی خۆیدا، تۆڵەی خۆی لە خوازگارە بێ ئابڕوو بەد رەفتارەکان بکاتەوە. جا وەرە ببینە بزانە چتۆ تۆڵەیەکی لێکردوونەتەوەو چۆنی کردوون بە پەندی زەمانە.

## یوریکلیا، پنلوپی له هاتنەوەی ئودیسیوس دڵنیا دەکات

هەنگیٚ پنلوپی دووربین گوتی:

"ئەی دایەنی میهرەبان، زۆریش گەشبین مەبە، نەبادا ئەم خەیاڵ پلاٚوەشمان کەڕوو بیٚنیٚ. دەزانی ئەگەر ئەو بگەڕێتەوە، چەندە هەموومان خۆشحاڵ دەبین، بە تایبەتی من و کوڕەکەی، کە لە خوێنی هەردووکمانە. بەڵام ئەو چیرۆکەی تۆ دەیگێڕیتەوە راست نیە، سەبارەت بە خوازگارەکان، هەڵبەتە یەکێك لە خواوەندەکان، لە گۆساخی و بەدکاری و بێدادیان تووڕە بووەو غەزەبی لێگرتوون و بەو شێوەیە قڕی کردوون. چونکە، ڕێزی هیچ کەسێکی ئەم دنیایەیان، چ گەداو چ پاشا، نەدەگرت. هەرکەسێك لێیان نزیك بوایەتەوە، دیانکرد بەقەشمەرو گەپجاڕی خۆیان. سەبارەت بە ئودیسیوس، کە کەوتووەتە غەریباتی و سەیری کردووە ناتوانیٚ جارێکی دی بگاتەوە خاکی ئاخیا، بە نامرادی و دوور لە خاکی ئاخیا سەری ناوەتەوەو جارێکی دی نایەتەوە ناو ماڵ و منالّی خۆی".

هەنگیٚ یوریکلیا، دایەنی دلۆڤان، بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"کچە چکۆڵەکەم، ئەم قسەیە چیە تۆ دەیکەی! قسەی وا مەکە کیژم. مێردەکەت زرك و زندوو، ها لە ژووریٚ ،لەبەر ئاورگەی دانیشتووە، کەچی تۆ دەڵێی هەرگیز نایەتەوە! بۆ ئەوەندە دێر باوەڕی! باشە هەر بۆ ئەوەی باوەڕ بکەی، من نیشانەیەکت دەدەمیٚ کە هەرگیز چەندو چوون و گومان هەڵناگرێت. بە خۆت دەزانی کاتی خۆی بەراز پەلاماری دا، لاقی بریندار بوو، وئێستاش ئەو جیٚ زامەی بەلاقەوە ماوەو لێی بووە بە نیشانە. کە قاچیم دەشت یەکسەر ناسیمەوە، زۆرم حەزدەکرد ئەوەت پێبڵێم، بەڵام توند دەمی گرتم و ئەمری پێکردم کە ئەو رازە بە کەس نەڵێم، دیار بوو نەخشەیەکی بە دەستەوە بوو. تۆ ئێستا لەگەڵ مندا وەرە، ئەگەر قسەکەی من دەرنەچوو، ودرۆم دەگەڵ کردبووی گەردنت ئازا بیٚ، خوێنم حەلاڵی تۆ بیٚ و بە درێوترین شێوە بمکوژە."

پنلوپی ئاقڵ و ئاغر بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"ئەی پیرەژنی میهرەبان، تۆ چەند رۆشنبین و ئەقڵمەندیش بی، زۆر ئەستەمە پەی بە رازو نهێنی و نیازو مەبەستی خواوەندانی نەمر ببەیت. بە هەرحاڵ با واز لەم قسانە بێنین، با برۆین بۆ لای کوڕەکەم تا خوازگارە کوژراوەکان وئەو کەسەی کوشتوونی، ببینین".

## تیلیماخۆس گازاندەیەکی توند لە دایکی دەکات

بە دەم ئەو قسانەوە، لە باڵەخانەکەی خۆیەوە هاتە خوارەوە. دوو دڵ بوو لەوەی کە ئایا لە دوورەوە پرسیار لە مێردە ئازیزو دڵسۆزەکەی بکات، یان یەکسەر بەرەو رووی بچێت، باوەشی پێدا بکات، وسەروشانی ماچ بکات؟ بەڵام کە لە ئاستانە بەردینەکە رەت بوو، و وەژوورکەوت، لەبەر رۆشنایی ئاورەکەو بەرانبەر بە ئودیسیوس رۆنیشت. ئودیسیوس لە پاڵ کۆڵەکەیەکی بەرزا دانیشتبوو و چاوی بڕی بووە عاردی و نیگەرانی ئەوە بوو کە هاوسەرە خانەدانەکەی کە ئەو دەبینیٚ چی پیٚ دەڵێت: بەڵام پنلوپی تا ماوەیەکی زۆر خامۆش و بێدەنگ بوو، گێژو

حەپەساو جاریّ بە سۆزو تاسەوە ریّك دەیڕوانییە دوڕ چاوانی و مەیلیّکی پەیدا دەکرد، جاریّکی دی دەیڕوانییە جلوبەرگە شڕوشەپڕیّوەکەی و مەزەندەکەی لیّ تیّك دەچوو، ونەیدەناسییەوە.

هەنگیّ تیلیماخۆس هاتە قسان و بە توندی گوتی:

"دایکە، ئەی دایکی دلّڕەق و نا میهرەبان، بۆچی وا دڕدۆنگی! بۆچی وا دوور لە بابم دانیشتوویت، بۆ نایەی لە پالّیا دانیشیت و پرسیارانی لیّبکەی؟ هیچ ژنیّك ئەوەندە دلّ رەق نەبووە، کە بەمجۆرە خۆی لە میّردیّك دووربگریّت کە دوای ئەو هەموو رەنج و مەینەتی و زەحمەتەی دیتویەتی، وپاش بیست سالّ دەربەدەری و ئاوارەیی بۆ ولاّتی خۆی گەڕابیّتەوە! بەلاّم تۆ هەر وا بوویت، دلّت لە بەرد رەقترە".

پنلوپی دووربین بەرسڤی دایەوە:

"کوڕی خۆم! من سەرم لەم وەزعە سوڕماوە. پەشۆکاوم، نەدەتوانم قسە بکەم، نە پرسیاری لیّبکەم، و نە رووبەڕوو نیگای بکەم. بەلاّم خۆ ئەگەر ئەم پیاوە ئودیسیوس بیّت و بەڕاستی گەڕابیّتەوە، ئەوا خەمت نەبیّت، دلّنیابە کە بە ئاسانی و بیّ هیچ چەندوچوون و گومانیّك یەکدی دەناسینەوە: چونکە هەندیّ نیشانان لە نیّواندا هەن تەنیا هەردووکمان دەیزانین،خەلّکانی دی ئاگایان لیّی نیە".

## ئودیسیوس دلّنەوایی تیلیماخۆس دەکات

ئودیسیوس کە گویّی لەو قسانە بوو، بزەیەکی بۆ کرد، روویکردە تیلیماخۆس وگوتی:

"تیلیماخۆس، دایکت زویر مەکە، سەر مەخە سەری، لیّبگەڕیّ با بە خۆی تاقیم بکاتەوە، هەنگیّ بیّ چەندوچوون دەمناسیّتەوەو دلّنیا دەبیّت. ئیّستا بۆیە دڕدۆنگ و ساردو بیّ مەیلە، چونکە ئەم جلکە شڕوشەپڕیّوانەم لەبەردایە،و باوەڕ ناکات ئودیسیوس بم!. بە هەرحالّ ئیّمە دەبیّ بیر لەوە بکەینەوە کە هەموو کاروبارەکان بە باشترین شیّوە ریّك بخەینەوە. لەم مەرزوبۆیەدا، کە کەسیّك، کەسیّك دەکوژیّت، ئەگەر کوژراوەکە، کەسوکارو زوڕیەتیشی نەبیّ کە تۆلّەی بستیّنن، یارۆی بکوژ هەر سەری خۆی هەلّدەگریّ. کەسوکارو ولاّت بە جیّدیّلّیّ و دەڕوات! کەچی ئیّمە نەك یەك زەلام بگرە بورج و قەلاّی ئەم شارەمان رووخاندووە، لاوانی خانەدانترین مالّباتیّن ئەم شارەمان کوشتووەو لیّرە نەڕۆییشتووین! حەزدەکەم بە وردی بیر لەمە بکەیتەوە".

تیلیماخۆسی ژیرو فامیدە گوتی:

"بابۆ، ئەمە ئیشی تۆیە، پیّویستە بە خۆت تەگبیری بکەیت. وەکو دەلّیّن کەس ئەوەندەی تۆ لەمڕووەوە بەڕاو تەگبیر نیە. هیچ بەنی بەشەریّکی سەر رووی زەمین، لە ئەقلّمەندی دا بە تۆزی پیّی تۆدا ناگات. ئیّمەش بە دلّ و بە گیان پشتیوانیت دەکەین،ومن بەش بە حالّی خۆم تاهیّزی بزووتن لە لەشما بە گوڕ بیّ، دریّغی ناکەم و لە دیّویش نا پرینگیّمەوە."

ئودیسیوسی سالۆر بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"کەواتە گویّبگرە، با من باشترین تەگبیری خۆمت پیّ بلّیّم. جاریّ بڕۆ پاك خۆت بشۆرە، جلەکانت بگۆڕە، جلی جوان لەبەربکە، بە کارەکەرو قەرەواشەکانیش بلّیّ با جوانترین جلك لەبەر بکەن و باش خۆیان بڕازیّننەوە، بە شایەرو هۆنەرە موبارەکەکەش بلّیّ بە خۆو سازە خۆش

ئاوازەکەیەوە بێتو، ئاهەنگێکی شایی و هەڵپەرکێمان بۆ گەرم بکات، تا هەرکەسێك، چ لە ڕێبوارانو چ لە دراوسێکان، کە گوێیان لە ئاوازەکە بوو، بڵێن، وادیارە لێرە ئاهەنگی شایی و زەماوەندە. دەبێ ئاگادار بین، نابێ، بەر لەوەی لە شار دەربچین، وخۆمان بگەیەنینە ڕەزو باخاتە پڕ بەروبوومەکانمان، هەواڵی مەرگی خوازگارەکان لە شارا بڵاوبێتەوەو بکەوێتە سەر زاری خەڵکی. کە گەییشتینە ڕەزو باخەکانمان، لەوێندەر بە شێنەیی چاوەڕوان دەکەین، بزانین ئیرادەو خواستی زیوس بەچی بوو، وادەکەین."

هەموو بە گوێیان کرد، چوونە گەرماو، خۆیان شت، جلو بەرگی تازەو خاوێنیان لەبەر کرد. قەرەواشو کارەکەرەکان خۆیان رازاندەوە. ئەوسا شایەرو هۆنەری موبارەك سازە خۆش ئاوازەکەی هەڵگرت، جۆشو خرۆشی گۆرانی و هەڵپەرکێی خستە دڵی هەمووانەوە، یەکسەر هەڵپەرکێ گەرم بوو، دەنگی پێی کوڕانو کیژانی کەمەرباریكو جوان لەسەرانسەری هۆڵەکەدا دەنگی دایەوە، ئەم هەراو بەزمە گەییە دەرەوە، ئەوانەی کە گوێیان لێبوو، دەیانگوت:

"وا دیارە یەکێك لە خوازگارە زۆرەکان، شابانۆی هێناوەتە ڕەداو خواستویەتی، دیارە ئەمە شایی و زەماوەندی ئەوە. ژنێکی بێ وەفا دەرچوو، نەیتوانی خۆی بگرێتو لە ماڵە گەورەو بەشکۆکەیدا وەمێنێ‌و چاوەڕوان بکات تا مێردە خانەدانو ڕەسەنزادەکەی دەگەڕێتەوە!".

## ئۆدیسیوس بە جوانترین شێوە دێتە بەردەم پنلوپی

بەڵێ، خەڵکی بێئەوەی ئاگایان لە راستی ڕووداوەکان بێ، ئەو قسانەیان دەکرد.

لەم بەینەدا، یورینۆمی گەورەی قەرەواشانو بەڕێوەبەری ماڵەکە، ئۆدیسیوسی بەردەبارو بە سەبرو حەوسەڵەی لە ماڵی خۆیدا شت. بەزەیت چەوری کرد، کراسو عەبایەکی زۆر جوانی لەبەر کرد. لەولاشەوە ئەتینا جوانی‌وجەماڵێکی ئەفسونانی پێ بەخشی، لە قەوارەی خۆی باڵابەرزترو تۆکمەتر دەهاتە بەرچاو، قژی چەپك چەپك بەسەر هەنیەیدا کەوتبوو، هەر زینەتە بوو سەیری بکەی. وەکو چۆن شاگردێك لەسەر دەستی هیفایستوسو پالاس ئەتینا فێری هەموو جۆرە هونەرێك بوو‌بێتو وەستایانە زێڕو زیو لە یەك بداتو شاکاری یەجگار دانسقەو نایابو دڵگیری لێ دروستبکات، ئەتیناش بەو ئاوایە سەروسیماو شانوملی ئۆدیسیوسی جوانو شیرین کرد. کە لە گەرماو هاتە دەرێ، هێندە جوان بوو دەتگوت خواوەندانە. هاتو لەسەر هەمان کورسی پێشوو، بەرانبەر بەپنلوپی دانیشت، ئەوسا گوتی:

"سەیرە، خواوەندانی ئاسمان نشین، جیا لە هەموو ژنان دڵێکی زۆر ڕەقیان بە تۆ داوە. باوەڕ بکە هەر ژنێکی دی لە جیاتی تۆ بایە، بەم دڕدۆنگی‌وساردو سڕییە مامەڵەی لە تەك مێردەکەیدا نەدەکرد. مێردێك دوای ڕەنجو مەینەتیەکی زۆر، پاش بیست ساڵ ئاوارەیی و دەربەدەری بێتەوە بۆ لای، بگەڕێتەوە ولاتی خۆی، بەو بێ موبالاتیە پێشوازی بکات. دەی قەیدی نیە، باوا بێ، دایەنی میهرەبان وەرە با بڕۆین جێگەیەکم بۆ چاك بکە با میناکی ڕۆژگارانی پێشوو بە تەنێ بخەوم. وا دیارە ئەم ژنە لە جیاتی دڵ، ئاسنی لە سینەدایە".

پنلوپی ئاقڵو ئاغر بەرسڤی دایەوەوگوتی:

"نه گیانه، دڵنیابه من نه کەسێکی لوت بەرزم‌و نه گەرەکمه خۆم بنوێنم، نه تۆش به بچووك‌و کم دەزانم‌و نه گەرەکمه بتشکێنم. نه سەرسامی پەشێوی کردووم. زۆر چاك دەزانم‌و لە بیرمە کاتێ کە بە کەشتییە مکوم‌و سەوڵ درێژەکەت لە ئیتاکا رۆییشتی چی بوویت‌و کێ بوویت. بە هەرحاڵ، با واز لەو قسانە بێنین.وەرە یوریکلیا، ئەم جێگەیەی بۆ ببە دەرێی ژووری نووستن، لەوێ باش بۆی چاك بکە، پەشمینەی باشی لەسەر رابخە، سەر جێگەی فەروی پێدا بدەو چەرچەف‌و لێفەی پاك‌وخاوێنی بۆ دابنە".

پنلوپی، بۆیە ئەو قسەیەی کرد تا مێردەکەی تاقی بکاتەوە. هەنگێ ئودیسیوس لە جێی خۆی راپەڕی‌و بە توڕەیی روویکردە ژنە دڵسۆزو وەفادارەکەی‌و گوتی:

"ژنەکە، بەڕاستی قسەیەکی ناخۆشت کرد، داغت نا بە جەرگمەوە. کێ تەختە خەوەکەی منی گواستووەتەوە، کێ جێگۆڕکێی پێکردووە؟ ئەمە کارێکی زۆر ئەستەم‌و دژوارە، زەبەردەست ترین پیاو باری نابات، مەگەر خواوەندێك بێتە هێمدادو یارمەتی، بێگومان ئەگەر خواوەندێك رەزای لەسەر بێ، دەتوانێ بە ئاسانی‌و بێ هیچ زەحمەتێك لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تری بگوازێتەوە: بەڵام ئەم کارە بۆ بەشەرانی فانی ئاسان نیە، هیچ بە شەرێك چەند گەنج‌و بەهێزو تواناش بێ ناتوانێ بە ئاسانی بیجوڵێنێ. ئەم تەختە خەوە نیشانەیەکی تایبەتی پێوەیە دەستکردی منە. بەم دوو دەستەی خۆم دروستم کردووە. لە حەوشەدا دار زەیتونێك ڕوا بوو، چڕە گەڵاو سەرسەوزو قایم‌و بتەوو بەرز ڕوا بوو، هێندە بەرز بوو دەتگوت ئەستون‌و کۆڵەکەیە. ژوورەکەی خۆمم لە دەوری ئەو دارە دروستکرد، بە تاوێرە بەردی سەخت‌و لەسەر یەك دروستم کرد، سەرەکەیم گرت، هەموو دەرگاکانیم لە تەختە دروست کردبوو.

ئەوجا گەڵاو چڵوچێوەکانی دار زەیتونەکەم بڕی، قەدی درەختەکەم رێك لەسەر رەگ‌و ریشەکەیەوە بڕی، ئەوسا بە تەشویێ‌و رەندە جوان داتاشیم، بە رێکی‌و لە شێوەی چوار گۆشەدا مشت‌و ماڵمدا، بەو جۆرە پایەکانی تەختە خەوەکەم لێدروست کرد، ئەوسا بە مەتەیەك چوار دەوریم کون کرد. لەسەر ئەم پایەیە هەموو پارچەکانی تەختە خەوەکەم بە رەندە ساف‌و لوس کردو بە روکەشی زێڕو زیوو عاج رازاندمەوە. ئەوسا چەرمێکی خۆشەکراوی ئەرخەوانی پرشنگدارم بەسەریا داکوتی. ئەمە یەکێکە لەو نیشانە تایبەتیانەی کە دەمویست پێتی بڵێم، بزانە چۆنم لە بیرماوە، جا ئافرەت نازانم ئاخۆ تەختە خەوەکەم هێشتا لە جێی خۆی ماوە یان پیاوێکی دی بۆ ئەوەی بیگوازێتەوە بۆ شوێنێکی دی، دار زەیتونەکەی لەبنەوە بڕیوەتەوە."

### پنلوپی دەست لە ملی ئودیسیوس دەکات‌و تەوازۆی بۆ دێنێتەوە

دوای ئەو قسانە پنلۆپی تەزوویەکی پێداهات، هەستی کرد ئەژنۆکانی سست دەبن‌و دڵی خاو دەبێتەوە. چونکە ئەوەی ئودیسیوس باسی کرد، موو بە موو راست‌و دروست بوو، بە دەم گریانەوە رابوو، یەکراست بەرەو ئودیسیوس غاردی دا، دەستی لە ملی وەرینا‌و بەدەم ماچکردنی سەرو نێو چەوانیەوە گوتی:

"ئەی ئودیسیوس، ئەی ئاقڵترین بەشەری دنیا، لێم زویر مەبە. خواوەندان ئێمەیان کرد بە نیشانەی تیری خەم وکەسەران، بەغیلیان پێبردین کە بە خۆشی پێکەوە تاڤ لاوی بەرینە سەر،

لەزەت و خێر لەلاوی خۆ ببینین و پێکەوە پیرو خەڕۆ ببین. بە هەرحاڵ نە لێم زویر بەو نە لێم توڕە بە کە هەوەڵجار تۆم بینی لە هەمێزم نەگرتیت و ماچم نەکردیت. چونکە هەمیشە ترسی ئەوەم لە دڵ بووە کە نەبادا یەکێك بێ بۆ ئێرەو بە قسەو زمانی لوس فریوم بدات. چونکە خەڵکانی خاپینۆك و فریبۆك و بەدخوا زۆرن! بۆ نموونە ئەگەر هیلینی ئارگۆسی، کیژی زیوس، بیزانیبایە کە شەڕڤانان و شێرە پیاوانی ئاخایی دووی دەکەون و بۆ وڵات و زاگەی خۆیی دێننەوە، هەرگیز تەسلیم بە بێگانەیەك نەدەبوو ودەگەڵی نەدەخەوت! هەڵبەتە گومان لەوەدا نیە کە یەکێك لە خواوەندەکان ویستوویەتی ئەم ریسواییەی بەسەر بێت. دەنا لە سەرەتاوە هەرگیز بیری لەم حەماقەتە نەکردبووەوە، کە ئەو شەڕە گەورەیەی لەسەر هەڵگیرساو بووە مایەی ڕەنج و ئازارو خەم و داخی ئێمەش. جا ئێستا کە هەموو نیشانەکانی تەختە خەوەکەت هەڵدا، کە جگە لە هەردووکمان و ئاکتوریس-ی کارەکەر کە بە بووکی بۆ ئێرە هاتم بابم دابووی بە من و دەرگاوانی و پاسەوانی ژووره مکومەکەمانی دەکرد، ئیدی عەبدەل بەشەر نەی بینی بوو. جا ئێستا کە تۆ ناونیشانەکەت بە دروستی هەڵدا، هەرچەندە دڵم دێر باوەڕە، بەڵام هیچ قسەیەکم نەماو تەواو دڵنیا بووم".

## ئودیسیوس ژنەکەی لە هەمێز دەگرێت ولە هۆڕژنی گریان دەدا

ئودیسیوس، بەو قسانەی پنلۆپی، سۆزی هاتە جۆش ودڵی پڕ بوو لە گریان. بۆیە بە دەم هۆڕژنی گریانەوە، دەستی لە ملی هاوسەرە دڵسۆزەکەی کرد، وبە سینگی خۆیەوە دەگوشی. وەکو چۆن کۆمەڵە کەشتی سوارێك، لە دەریادا، بەر غەزەبی پوسیدون کەوتبن و کەشتییەکەیانی بەر زریانی تووش و شەپۆلانی سەرکێش دابێت و تێك و پێکی شکاند بێ، کاتێ کە وشکایی و زەویان لێ بە دیاردەکەوێ، زۆر دڵیان خۆش دەبێ و دەکەونە مەلە، بەڵام ژمارەیەکی یەجگار کەمیان لە دەریای کەفپرژێنی سپیواژ دەرباز دەبن و بە سەلامەتی دەگەنە کەنار، سەراپایان لە کەفدا هەڵکێشاوە، چونکە لە دەستی مەرگ رزگار بوون، کە دەگەنە سەر زەوی دڵخوازی خۆیان، زۆر شاد دەبن ولە خۆشیاندا لە پێستی خۆ ناهێورن، بەو ئاوایە هاتنەوەی ئودیسیوس بۆ پنلوپی خۆش وشادیبەخش بوو، نیگای دەکردو نەیدەتوانی باسکە سپیەکانی لەگەردنی شووەکەی بەربدات.

خۆ ئەگەر ئەتینا، خوابانۆی چاوگەش، فریا نەکەوتباو شەوی درێژ نەکردباوەو ئەنگاوتنی سپێدەی قامك گوڵینی ماتەڵ نەکردباو دوا نەخستبا، بێگومان سپێدەش گریانی ئەوانی دەبینی. ئەتینا شەوی درێژکردەوە، کردیە کارێك سپێدەی زێڕین عەرەش جارێ لە ئوقیانوسدا وەمێنێ و نەیهێشت ئەسپە خۆشبەزەکانی، لامپوس و فایتون، لە گالیسکەکەی ببەستێ، ئەو ئەسپانەی کە روناکی بۆ بەشەران بە دیاری دێنن، هەنگێ ئودیسیوس بە هاوسەرەکەی خۆی گوت:

"ئافرەت، هێشتا مەینەتیەکانم تەواو نەبووە، ئایندە کارێکی زۆر، دژوارو زەحمەتی بەسەرا داوم کە دەبێ بیانگەیەنمە سەر. روح و تاپۆی تیریسیاس-ی فاڵبین و نجومگەر پێشبینی ئەمەی بۆ کردووم. رۆژێ چووم بۆ جیهانی ژێرین، بۆ لای هادیس، تا پرسیاری رێگەیەك بکەم کە بتوانم دەگەڵ هاوڕێکانمدا، بە سەلامەتی و بە خۆشی، بۆ وڵات و زاگەی خۆ بگەڕێمەوە، لەوێ روح و

تاپۆی تیریسیاس ئەو پێشبینییەی بۆ کردم. بە هەرحاڵ، ئافرەت وەرە با بچینە ناو جێگا، و بە دەم هەڤخەویەوە، بێ خەموخەیاڵ، خەو بمانباتەوە.

پنلوپی ئاقڵوئاغر بەرسڤی دایەوەو گوت:

"کە خواوەندان تۆیان بە سەلامەتی گەیاندووەتەوە کۆشکو سەرا بەرزو مکومو قایمەکەت، هاتویتەوە وڵاتی بابو باپیرانت، هەرکاتێ دڵت دەیەوێ جێگاکەت حازروئامادەیە. بەڵام ئێستا کە سەری قسەت کردەوەو خواوەندان ئەو شتەیان خستووەتە دڵتەوە، پێم بڵێ ئەو رەنجو مەینەتیو کارە دژوارانە چین کە لە ئایندەدا دێنە رێت. پێم وایە دواییش هەر دەیزانم، خۆ ئەگەر لە ئێستاوە بیزانم هیچ شتێك لە مەسەلەکە ناگۆڕێ".

## ئودیسیوس پێشبینی فاڵبینەکە بە پنلوپی دەڵێت

هەنگێ ئودیسیوسی فاماو بەردەبار، بەرسڤی دایەوەوگوتی:

"ئاها! ئەی ژنە بەلەنگازەکەم، پەلەی چیتە، بۆ دەتەوێ بۆتی باسبکەم؟ قەیدی نیە، بۆتی باس دەکەمو هیچت لێناشارمەوە. هەڵبەتە دڵنیام کە تۆ بەم قسەیە، بەم باسە دڵخۆش نابیت، وەکو من کە بە هیچ جۆرێ دڵم پێی خۆش نیە. یارۆی فاڵبین پێی گوتم بەپەلە سەوڵێکی مکومو درێژ بخەمە سەر شانو لەم شارەوە بۆ ئەو شار بڕۆمو نەوەستمەوە تا دەگەمە ناو قەومێك کە نە دەریایان بینیبێو نە ناویان بیستبێو نە خوێ لە خواردن بکەن، و نە سەریان لە کەشتی تەنگەسوورو سەوڵی چاك، کە بە پەڕوباڵی کەشتی حەساوە، دەربچێت. ئەوسا نیشانەیەکی دامێ، کە دەقاو دەق وەکو خۆی، بێ ئەوەی هیچی لێ بپەڕێنم، بۆ تۆی دەگێڕمەوە. نیشانەکەی ئەمە بوو: هەرکاتێ لە رێگەدا تووشم بوو بە تووشی رێبوارێکەوەو لێم بپرسێت ئەو شەنەیەت بۆ شەنەبا ناوەتە سەر شان، ئەوا گەییوومەتە مەزڵو دەبێ سەوڵەکەم لە عاردی بچەقێنم، و قوربانیەکی شایستەو گەورە کە بریتی بێ لە بەرازێكو گایەكو بێچوە بەرازێکی نێر کە بتوانێ لە مالۆسانی بپەڕێت، پێشکەش بە پوسیدون بکەم. وئەوسا ملی رێگە بەرەو وڵاتوماڵی خۆ بگرم، هەرکە گەییشتمەوە قوربانی گەورە (قوربانی سەدینە) بۆ هەموو خواوەندانی جاویدانی ئاسمان نشین، بەریز بێ ئەوەی هیچیان بپەڕێنم، بکەم. هەنگێ دوور لە دەریا، بە دەوڵەمەندی، لە نێو گەلی بەختەوەرو تێرو پڕوخۆشگوەزرانی خۆمدا، دوای ئەوەی پیرو کە لەلا دەبم، هەنگێ بە ئاسوودەییو بە ئارامی دەمرم. بە قسەی ئەو ئەمە چارەنووسی ئایندەم دەبێت."

پنلوپی ئاقڵو ئاغر بەرسڤی دایەوە:

"ئەگەر خواوەندان پیرییەکی خۆشو ئاسودەو ئارامیان لە چارەنووسیبیت، مانای وایە ئومێدی ئەوە هەیە کە رۆژێ لە رۆژان لە نەگبەتیو بەدبەختی رزگاربین".

## ئودیسیوس و پنلوپی پێکەوە دەنوون

ژنو مێرد بەو جۆرە قسەیان بۆ یەکتر دەکرد. لەو بەینەدا یورینومیو پیرەدایەن، لەبەر تیشکی مەشخەڵان، تەختە خەوەکەیان، بە دۆشەكو فەرشی نەرم بۆ ئامادە دەکردن. پاش ئەوەی تەختە خەوەکەیان بۆ رازاندنەوە، پیرەدایەن گەڕایەوە بۆ حەرەمسەرای ژنان تا لەوێندەر بخەوێ. یورینومی-ش مەشخەڵ بە دەست پێش خانمو ئاغای کەوت کە جێگاکەیان پێ نیشان بدات،

دوای ئەوەی کردنیە ژووری زاواو بوکێنیانەوە، هاتە دەرێ‌و چوو لە ژووری خۆی بنوێت. هەنگێ ژن‌و مێرد، دوای ئەو هەموو دووری‌ودابڕانە، هەردوو تاسەمەندو تامەزرۆ تێك ئالان‌و مەگەر هەر خوا بزانێت لە چ کەیف‌وخۆشیەکدا بوون. تیلیماخۆس‌و گاوانەکەو بەرازەوانەکە شاییەکەیان بە تاڵ کرد. بە ژنەکانیشیان گوت بەسەو وازبێنن، ئیدی هەرکەسەو چوو لە شوێنێکدا، لە کۆشکەکەدا کە لە تاریکی دا نقوم بوو بوو، نووست.

ئەو جووتە، پاش ئاشقێنی‌و هەڤخەوییەکی تامەزرۆو تاسەشکێن، ئەوسا کەوتنە گێڕانەوەی سەربهوردو بەسەرهاتی خۆ بۆ یەکتری. خانمی خانەدان‌و رەسەن باسی ئەوەی گێڕایەوە کە چۆن خوازگارانی دزێوکارو بێشەرم بە تەماحی ئەو رژابوونەماڵەکەو لە پەستاو بێڕانەوە گاو مەڕو پەزی قەڵەویان دەکوشتەوەو دەیان برژاند، چۆن کەپوڵە بادەکانیان، یەك لە دوای یەك دەخواردەوەو چۆڕبڕیان دەکرد، وئەویش زەق زەق تەماشای دەکردن‌و بێدەسەڵات‌و بێ توانا خەمی دەخواردو خەمیش خوێناوی جگەری دەخواردەوە. ئودیسیوسی رەسەنزادەو خانەدانیش، هەرچی بەسەر خەڵکی هێنابوو، وهەرچییەك بەسەر خۆی هاتبوو، و چ دەردو رەنجێکی کێشا بوو، هەمووی لە سیری تا پیازی بۆ پنلوپی گێڕایەوە. ژنەی تاین بە دڵ‌و بە گیان گوێی لێدەگرت‌و بە روح لەزەتی لە قسەکانی دەبرد. تا ئودیسیوس هەموو بەسەرهاتەکانی خۆی بۆ نەگێڕایەوە، خەو لە چاوانی نەکەوت.

ئودیسیوس بەسەر هاتەکەی لەوێندەرەوە دەستپێکرد کە چۆن بەسەر سیکونەکاندا زاڵ بوو بوو، وپاشان چۆن گەیی بووە دەڤەرو قەڵەمڕەوی لۆتسخۆرەکان، و ئەوسا ئەوەی بۆ گێڕایەوە کە چۆن سیکلۆپ، دیوی یەکەڵەچاو، دڕندانە پەلاماری هاوڕێکانی داوەو بێڕەحمانە خواردوونی، و چۆن ئودیسیوس بە دەستی خۆی تۆڵەی هاوڕێکانی، هاوڕێ جوامێرو قارەمانەکانی، لێ کردووەتەوە. ئەوجا چۆن گەییوەتە لای ئەیولوس- Aeolus و چۆن ئەیولوس بە گەرمی پێشوازی لێکردووەو لە گەڕانەوەدا یارمەتی داوە،وچۆن چارەنووس تەگەرەی خستووەتە رێگەی‌و نەیتوانیوە بگاتەوە وڵات‌و زاگەی خۆی، چۆن دووبارە تۆفان‌و زریان دەیگرن‌و بەدەم هاوارو ناڵینەوە دەیخەنەوە دەریای سامناکی بە گێژەنگ‌و شەپۆلانەوە. چۆن گەییە تیلیپیلوس، شاری لیستریگونسەکان، کە هەموو کەشتیەکانیان بە هاوڕێکانیەوە داغان‌و وێران کردو لە نێو برد، تەنیا ئودیسیوس بە خۆی‌و کەشتییە بۆرەکەیەوە رزگاری بوو. ئەوسا باسی هەر هەموو چاوو راو،ودەسی دەسی‌و فەندەڵ فێڵەکانی کیرکی بۆ گێڕایەوە، چۆن بە کەشتییەکی گەورەی فرەنشیمەن‌و کورسی چووە بۆ خانەی نماوی هادیس تا راوێژو پرس بە روحانیەتی تیریسیاس-ی تیبەیی بکات، و لەوێ تاپۆو روحانیەتی هەموو هاوڕێکانی‌و دایکی کە ئەوی هێناوەتە دنیاو بە ساوایی گۆش‌و بە خێوی کردووە، دیتووە. هەروەها چۆن گوێی لە دەنگ‌و ئاوازی ئەفسوناوی لە پەستاو بێڕانەوەی سیرنیان بووە، چۆن گەییوەتە تاوێرە بزۆزەکان‌و تەنگەی خاریبدسی سامناك‌و سکیلا کە هیچ بەنی بەشەرێك لێی دەرباز نەبووە. ئەوسا بۆی گێڕایەوە کە چۆن هاوڕێکانی گایەکانی هیلیوس-یان کوشتووەتەوەو زیوسی ئاسمان نشین لێیان چووە بە قیناو بروسکەیەکی دوکەڵاوی لە کەشتیە خۆشڕەوەکەی ئەو داوە،وهەر هەموو

یاوەرە عەگیدو دلاوەرەکانی کوشتووەو تەنیا ئەو لە ئەهریمەنانی شوومی مەرگ خەلەسیوە. هەروەها چۆن گەییوەتە دوڕگەی ئوجیجای قەڵەمڕەو ونشیمەنی کالیسپۆی فریشتەی دەریا، کە لەوێندەر لە ئەشکەوتە گەورەو قوڵەکانی خۆیدا گلی داوەتەوە، خزمەتی کردووە، خواردنی باشی داوەتیێ،و ویستویەتی شووی پێبکات،و تەماحی خستووەتە بەر ئەگەر بێتە ڕەداو بیخوازێت، کارێکی وا دەکات ببێ بە یەکێك لە نەمرانو هەتا هەتایە بە گەنجی وەمێنێو پیری زەفەری پێنەبات. بەڵام هەرچی کردو کۆشا نەیتوانی دڵی نەرم بکاتو بیهێنێتە رەدا. ئەوسا چۆن دوای هەوڵو تەقەلایەکی فەرهادانە گەییووەتە خاکی فیاسیانو بەوپەڕی میهرەبانیو دڵسۆزی پێشوازیان کردووەو بە قەد خواوەندێك ڕێزو حورمەتیان گرتووە، ئەوسا بە کەشتییەك بۆ وڵاتی ئازیزی خۆیان بردووەتەوە، برونزو زێڕو جلو بەرگێکی زۆریان بە دیاری داوەتیێ. کە ئودیسیوس لە گێڕانەوەکەیدا گەییە ئێرە، تا رادەیەك خەمی دڵی هەڵڕشت، ئازای خاو بووەوە، خەو دایگرت، سەر سووكو دڵڕەحەت بە جووتە خەوێکی قوڵیان لێکەوت.

## ئودیسیوس تەگبیر بۆ ژنەکەی دەکات

کە ئەتینا، خوابانۆی چاوگەش هەستی کرد ئودیسیوس بە تەواوەتی تێر خەوو تێر ئاشقێنیو هەڤخەوی بووە، کیژۆڵەی بەیانی عەرش زێڕینی بە پەلە لە ئوقیانوسەوە دەرهێنا تا رووناکی بە دیاری بۆ تیرەی بەشەران بەرێت. ئودیسیوس، لە جێگە نەرمو گەرمەکەی هاتە دەرێو بە هاوسەرەکەی گوت:

"ئافرەت! ئێمە هەردووکمان، دەردو رەنجی زۆرمان کێشاوە، تۆ لێرە بە دڵی پەریشانو چاوانی بەگریان چاوەڕوانی گەڕانەوەی من بوویت، ومنیش، زیوسو خواوەندانی دیکە لێم چوو بوون بە قیناو هەرچیم دەکردو دەکۆشا نەیادەهێشت بۆ وڵاتە ئازیزەکەم بگەڕێمەوە، بۆ ئەو وڵاتەی خەریك بوو سویێم بۆ دیتنی دەبووەوە. جا ئێستا کە هەردووکمان لێرەدا، لەمماڵەدا لەم جێگەوبانەدا کە ئارامگەی دڵی هەردووکمانە، یەکمان گرتووەتەوە، تۆ سەرپەرشتی ماڵو ناو ماڵەکە بکە، سەبارەت بە مێگەلە پەزو گاگەلو رەوە بەرازەکانم کە خوازگارە بێ ویژدانو ستەمکاروەکان سووکیان کردوون، خەمت نەبێ، پەزێکی فرە بە تۆبزی لە خەڵکی دەستێنم، و کارێکی وەها دەکەم خەڵکانی ئاخایی، هێندەم مەڕو ماڵات بدەنێ، تا ئاغەڵەکانم پڕ پڕ دەبن. بەڵام من جارێ بە نیازم بڕۆم بۆ دەشت، بۆ ناو رەزو باخەکانمو سەرێکی بابی بەڕێزم دەدەم، کە بێگومان لە دووری من زۆر خەمبار بووە. سەبارەت بە تۆش ئافرەت گیان، ئامۆژگاریم ئەوەیە، هەرچەندە لە هۆشمەندی تۆ دڵنیام، کە خۆر هەڵدێ، ئیتر دەنگۆ لە شارا بڵاودەبێتەوە کە خوازگارەکان، لە کۆشكو سەرای ئێمەدا کوژراون، لەگەڵ هاونشینەکانتدا بچۆ قاتی سەرەوەو مەیە دەرەوە، نە کەس ببینە، و نە پرسیار لە هیچ کەسێك بکە".

## ئەتینا ئودیسیوسو هاوڕێکانی دەرباز دەکات

بە دەم ئەو قسانەوە چەكو تەدارەکی جەنگی لە خۆدا، هێندە جوان بوو هەر لە خۆی دەهات. تیلیماخۆسو گاوانو بەرازەوانەکەشی لە خەو هەستاندن، ئەمری پێکردن کە چەكو تەدارەکی جەنگ لە خۆ بدەن. خێرا زرێیان پۆشیو جەنگەوزاریان لە خۆدا، دەرگاکانیان کردەوە، لە

حەوشە وەدەرکەوتن، ئودیسیوس لە پێشیانەوە ڕێی دەکرد. لەو کاتەدا هەتاو گزنگی دا، دنیا ڕوناك بووەوە، بەڵام ئەتینا، بۆ ئەوەی لەبەر چاویان ون بکات، لە کاژە هەورێکییەوە پێچان و بەلەز لە شاری بردنەدەرێ.

***

## پەراوێز:

*- هیفایستوس:

خواوەندی ئاگرو ئاسنگەری خوای خواوەندانە.

*- تیریسیاس:

بەناوبانگترین فاڵبین وخێفزان و نجومگەرە.

*- ئەیولوس:

پاشای بایە.

*- لیستریگونیس:

لە تیرەی پوسیدونن، قەومێکی کێوی زەبەلاحی بەشەرخۆرن.

## سروودی بیست‌و چوارەم

**کورتەی سروودەکە:**

هیرمیس، روحی خوازگارەکان بۆ جیهانی ژێر زەوی دەبات. لەوێندەر ئاگامەمنون‌و ئەخیل دەبینن کە سەرگەرمی گفتوگۆن. ئەمفیمیدون، کە یەکێك بوو لە خوازگارەکان، لەوەلامی پرسیارێکی ئاگامەمنون دا، چیرۆکی کوشتاری خوازگارەکان دەگێڕێتەوە. ئودیسیوس بۆ کێڵگەکەی لایرتیس دەڕوات‌و خۆی بە بابی دەناسێنێ. لە کاتی نان خواردندا دولیوس‌و کوڕەکانی لە کێڵگەوە دێن‌و ئودیسیوس دەناسنەوەو زۆریان پێخۆش دەبێت. هەواڵی کوشتارەکە لە هەموو شوێنێ بڵاودەبێتەوە. ئوپیتس، پێش هەوادارانی خۆی دەکەوێ دەیەوێ شەڕی ئودیسیوس بکات. ئەتینا راوێژ دەگەڵ زیوس دا دەکات، خواستی زیوس ئەوە دەبێت کە ئاشتی لە ئیتاکادا بەرقەرارو بەرکەماڵ بێت. شەڕ دەست پێدەکات. ئوپیتس دەکوژرێ.بەڵام ئەتینا زوو دەکەوێتە ناوبژی‌و هەردوو دەستەکە ئاشت دەکاتەوە.

***

## هیرمیس پێش تاپۆی خوازگارەکان دەکەوێ

هیرمیسی خواوەندی سیلن، روحی خوازگارەکان بۆ لای خۆی گازدەکات. دارعاسایەکی زێڕینی هەبوو کە بە کەیفی خۆی بۆ خەواندن یان بێدارکردنەوەی بنیادەمان بەکاری دێنا. بەو دارعاسایە روحەکانی بێدار دەکردەوە،بەدەم پرتەو بۆڵەوە دووی دەکەوتن.وەکو چۆن لە ئەشکەوتێکی گەورەو قووڵدا،شەمەلەکۆرەیەك،لە گروپەکەی خۆی کە بە شێوەیەکی هێشوویی خۆیان بە تەختە بەردێکەوە هەڵواسیوە بەردەبێتەوەوجیا دەبێتەوە،هەموو ئەوانی دی چونکە بە یەکەوە بەندن،دەکەونە جوکەجوك وفڕکە فڕك بە نێو ئەشکەوتەکەدا،بەو ئاوایە رۆحەکان بەدەم پرتە پرت‌و خوتە خوتەوە رێیان دەکرد. هیرمیس، خواوەندی چاکەکار، بە کوێرە رێگا تاریك‌و نماویەکاندا دەی بردن. روحەکان لە ئوقیانوس‌و بەردەڵانە پڕ گاشەکەی لیوکاس‌و پاشان لە دەروازەکانی هلیوس‌و قەڵەمڕەوی خەونان تێپەڕین،وزوو بە زوو گەییشتنە مێرگوزاری سرێش کە نیشتمان‌و نشیمەنی روحان، واتا تاپۆی ئەو خەڵکانەیە کە لە شەڕدا کوژراون.

لەوێ روح‌و تاپۆی ئەخیلی کوڕی پیلیوس، پاتروکلوس، و ئەنتیلوخوس-ی رەسەن‌و بێوێنە،و ئەجاکس-یان بینی. ئەجاکس لە جوانی‌و بەژن‌و باڵادا، لە دوای کوڕەکەی پیلیوس، سەرتۆپی هەموو داناییەکان بوو، قارەمانێك بوو کەس بەبای قولانیدا نەدەگەیی. ئەمانە هەموو دەوری روح‌و تاپۆی ئەخیل-یان دابوو کە روحی ئاگامەمنونی کوڕی ئوتریوس، خەمبارو پەژمردە هاتە ناویان، و روحی هەر هەموو ئەوانەی کە لەماڵی ئیجیستوس دا لەگەڵی کوژرا بوون، دەوریان دا.

بەر لە هەمووان تاپۆو روحی ئەخیل هاتە قسان‌و روویکردە ئاگامەمنون‌وگوتی:

"ئەی کوڕی ئوتریوس، ئەوەی ئێمە دەمانزانی زیوسی بروسکەئەنداز، تۆی لە هەر قارەمانێکی دیکە خۆشتر دەویست‌و رێزی دەگرتیت. چونکە تۆ لە خاکی تەروادەدا، لە گەرمەی شەڕدا، لە شەڕی تەروادەدا کە ئێمەی ئاخایی لەوپەڕی تەنگانەدا بووین، تۆ گەورە سەرداری سوپا بوویت،

کە سوپایەکی بێ شومارو ئازاو بوێر بوو. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، دێوی ئەجەل-ی سازش ناپەزێر، کە هیچ بنیادەمێك لەدەستی دەرباز نابێت، زۆر زوو گەییشتە سەرت و گیانی کێشایت. شاڵلا هەر ئەوسا، لە مەیدانی شەڕدا، لە هەڕەتی شۆڕەت و ناوبانگ و سەرفرازیدا لە تەروادەدا کوژرابای، هەر نەبوایە سوپای ئاخاییان گڵکۆیەکیان بۆ هەڵدەبەستی و دەتتوانی نێوبانگ و سەرفرازییەك بۆ کوڕەکەت بەجێ بێڵی. بەڵام وا دیارە قەدەر ناخۆشترین مەرگی لە چارە نووسی بوویت!"

تاپۆو روحی ئاگامەمنون، کوڕی ئوتریوس بەرسڤی دایەوەوگوتی:

"ئەی کوڕە بەختەوەرەکەی پیلیوس، ئەی ئەخیلی خواوەندئاسا، کە تۆ لە شەڕگەکانی تەروادەدا، دوور لە ئارگوس، کوژرایت، ئازاترین کوڕانی تەروادەیی و ئاخایی لەسەر تەرمەکەی تۆ شەڕی یەکتریان دەکرد، بە چوار دەورتا بە بریندراری دەکەوتن و دەمردن. لاشەکەت، زەلام و ترسناك، لە نێو تەپوتۆزدا، بێباك لێی کەوتبوو، و ئەوەی بیرت لێنەدەکردەوە سوارچاکی و ئەسپ تاودان بوو. ئێمە بە درێژایی رۆژەکە هەر لە شەڕدا بووین، خۆ ئەگەر زیوس فریانەکەوتباو باهۆزو زریانی بەرپا نەکردبا، شەڕەکە نەدەوەستا. دوای ئەوەی جەنازەکەمان هەڵگرتیت و لەمەیدانی شەڕگە دوورمان خستەوەو بۆ ناو کەشتییەکانمان برد، لەوێ جەنازە جوانەکەمان بە ئاوی شیرتێن پاك پاك شۆردو زەیتمان کردو دامان نا. داناییەکان بەدەم گریان و قژ رنینەوە لە دەورت خڕ بوونەوە، بە کوڵ و بەدڵ بۆت گریان. دایکت کە بە هەواڵەکەی زانی دەگەڵ خوابانۆیانی دەریادا، لە دەریا هاتە دەرێ، شەپۆلانی دەریا بە جارێ هاڕوژان، هاوارو فیغانێکی وایان لێ هەستا هەترەشی پیاویان دەبرد،. پیاوانی ئاخایی هەموو لەزگ بوو، بەرەو کەشتییەکان پێ وەغارێوە بنەن و مەیدان چۆڵ بکەن. ئیدی نەستوری سەرەپیاو، ئەقڵمەندو دنیا دیدە فریا کەوت و پێشی پێگرتن و بە زمانێکی خۆش وشیرین گوتی:

"گەلی ئارگۆسیان بوەستن، کەس هەڵنەیەت، کوڕانی دلێری ئاخایی ورە بەر مەدەن، مەترسن. ئەوە دایکی ئەخیلە، دەگەڵ خواوەندانی نەمری دەریادا، لە جەرگەی دەریاو شەپۆلانەوە هاتووە، تا جەنازەی کوڕەکەی ببینێ". دوای ئەو قسانە ئیدی دلێرانی ئاخایی هێور بوونەوەو ترسیان شکاو لە هەڵاتن کەوتن."

ئەوسا کیژانی پیرەمێردی دەریا، بەدەم شیوەن و گریانەوە لە دەورت خڕبوونەوە، وبە پارچەی موبارەك و خوایی دایان پۆشیت. ئەوسا، نۆ کیژەکەی زیوس، خوابانۆیانی هونەر، بە سۆزو گریانەوە کەوتنە سەردولکەدادان و بە دەنگێکی خۆش و دڵگیرو کاریگەر بۆ یەکتریان دەسەندەوەو خۆزیا دەت توانی بە چاوی خۆت ئەو دیمەنە ببینی، هیچ ئارگۆسیەك نەبوو، ماتەم دای نەگرتبێ و نەگری: چونکە خوابانۆیانی هونەر، بە دەنگ و ئاوازی پڕ سۆزیان، بە جۆرێ کاریان لە دڵ و دەرونان کردبوو، کە خواوەندانی نەمرو بنیادەمانی فانی هەڤدە شەوو رۆژی تەواو بۆ تۆ گریان و گریان. رۆژی هەژدەیەم جەنازەکەیان بە ئاگر سپاردیت، وبە هەر چوار دەورتدا ژمارەیەکی زۆر مەڕی دابەستەو گای شاخ کەوانییان کوشتەوەو کردیاننە قوربانی. ئیدی تۆیان بە جلی موبارەکی خوایی و بۆن و بەرامەی ئامبروزی و روحی هەنگوینەوە سوتاند:

قارەمانانی ئاخایی، پیادەو سوارە، دەستە دەستە، چەك بەدەست، بە دەوری ئەو ئاگرەدا كە تۆی تیا دەسووتایت، دەسوڕانەوەو بۆت بەداخ بوون. كاتێ كە تەواو سووتایتو ئاگرەكەی هیفایستوس کوژایەوە، سارەزی، ئێسكو پروسكە سپییەكەتمان كۆ كردەوە، لە بادەو عەتری بۆن خۆشمان هەڵكێشا. دایكت كۆپەڵەیەكی دوو دەسكی زێڕی هێناو داینێ، گوتی ئەمە دیاریی دیونیسوسو دەستكردی هیفایستوسی بەناوبانگە. ئەی ئەخیلی مەزن ئێسكو پروسكەكەمان لەو كۆپەڵەیە نایت،و ئێسكو پروسكەكەی پاتروكلوسی كوڕی مینویتیوس–شمان لەگەڵ ئێسكو پروسكی تۆدا كۆكردەوەو لە هەمان كۆپەڵەمان نا. بەڵام ئێسكو پروسكی ئەنیتلوخۆس–مان كە لە دوای پاتروكلوس لە هەموو هاوڕێكانت خۆشترت دەویست، بە جیا دانا. پاشان لەشكری بە توانای خەڵكی شەڕڤانو جەنگاوەری ئارگوس، ئەو ئێسكو پروسكانەیان بە كۆپەڵەكەوە، لە لوتكەیەكی بەرزو دیاری دەریای پانو بەرینی هیلیسپونت دا ناشتو گۆڕێكی گەورەو بەرزیان لەسەر هەڵبەست كە خەڵكانی ئەمڕۆو ئایندەش لە دوورەوەو لە دەریاوە بە جوانی ببینن.

دایكت داوای دیاریو خەڵاتی جوانی لە خواوەندان كرد،و لە ناوەندی مەیدانی پێشبڕكێیەكدا داینان، تا بە سەر براوەكانی ئەو پێشبڕكێیەی دا دابەش بكات كە لە نێوان سەرانی ئاخایی دا بەرپا دەكرا. تۆ بە خۆت، لە یادی قارەمانانو لە پێشبڕكێو بۆنەی عەزاداریدا بەشداریت كردووە، و بە چاوی خۆت دیتوتە كەسەردارو پاشایەك دەمرد، چ پێشبڕكێو بۆنەیەكی شكۆداریان بۆ ساز دەكردو چۆن لاوان خۆیان بۆ بەشداری ئەو رێورەسمو بۆنەیە ئامادە دەكرد، وچۆن خەڵاتو دیاری توحفەو عەنتیكە بەسەر براواندا دابەش دەكرا. بەڵام ئەگەر ئەو دیمەنەت بەچاوی خۆ دەبینی هەر سەرت سوڕدەما، لەو هەموو خەڵاتە جوانو نایابو دانسقەیەی كە تیتیس، خوابانۆی زیوین پا، لەسەر شەرەفی تۆو لە رێوڕەسمی یادی تۆدا هێنابووی. چونكە هیچ كەسێك هێندەی تۆ لە دەف خواوەندان خۆشەویستو مایەی رێزو حورمەت نەبووە، بۆیە هەرچەندە تۆ مردوویت، بەڵام شكۆو ناوو ناوبانگت كوێر نەبووەتەوە، ئەی ئەخیل هەمیشە خەڵكی بە چاكە یادت دەكەنەوەو بەخێر ناوت دەبەن. بەڵام سەبارەت بە من چ خێرێكم لە شەڕو ئازایەتیو یەك لایی كردنەوەی شەڕ دەست كەوت؟ بۆیە بە پەلە گەڕامەوە، چونكە زیوس، لە چارەی نووسی بووم كە بە دەستی ئیجیستوسو ژنە ناجسنو نەفرەتییەكم، بەو مەرگە شوومە بچم".

لەو قسانەدا بوون، كە هیرمیس، لەگەڵ روحی ئەو خوازگارانەدا كە ئودیسیوس كوشتبوونی، پەیدا بوو. جووتە قارەمان كە سەریان لە دیتنیان سوڕما، یەكسەر بەرەو روویان چوون. روحی ئاگامەمنونی كوڕی ئوتریوس، یەكسەر ئەمفیمیدونی ناوداری كوڕی میلانیوسی ناسییەوە، كە خۆشی دەویست. چونكە لەو ماوەیەدا كە چوو بوو بۆ ئیتاكا بوو بووە میوانی ئەو. روحی كوڕی ئوتریوس، بەر لە هەمووان هاتە قسانوگوتی:

"ئەمفیمیدون، ئێوە كە هەمووتان خەڵكانی هەڵبژاردەو هاوساڵن، خێرە وا بە كۆمەڵ هاتوونەتە ژێر زەمینی تەنگوتار؟ خۆ ئەگەر كەسێك سەرپشك كرابا كە بژاردەترینو خانەدان ترین خەڵكی

شارێك بێنێ، لەمانە باشتری هەڵنەدەبژارد. ئایا پوسیدون، لێتان چووە بە قیناو لە جەرگەی دەریاداو بەسەر کەشتییەکانتانەوە زریان و شەپۆلانی گەورەو کوشندەی بەگژدا کردوون و بەم دەردەی بردوون؟ یان کاتێ کە چوونەتە سەر خەڵکی، رانە مەڕی جوان و گاگەلتان تالان کردوون، و پەلاماری شارو ژنتان داون، و ئەوانیش لێتان هاتوونەتە دەست و بەو جۆرە قڕیان کردوون؟ وەڵامم بدەوە، من، دۆستی خانەوادەکەی ئێوەم. بیرت نایە کە دەگەڵ مینلاوسی یەزدانی نەژادا هاتمە ئیتاکا، هاتمە ماڵی ئێوە تا ئودیسیوس رازی بکەین، بە خۆو کەشتییە گەورەو رەختەکانییەوە، دەگەڵ ئێمەدا بۆ ئیلوس (تەروادە) بێت؟ یەك دانە مانگی تەواو رێگەی دەریامان بڕی، تا بە هەزار زەحمەت ئودیسیوس-مان، ئەو دژمن بەزێن و، شارگرەمان رازی کرد کە بەگەڵمان بکەوێ.

روحی ئەمفیمیدون بەرسڤی دایەوە:

"ئەی ئاگامەمنون، ئەی کوڕە سەرفرازەکەی ئوتریوس، ئەی گەورە سەرداری گەل، ئەی گۆشکراوی زیوس، هەمووی ئەو شتانەم لەبیرن، وا دەزانم ئێستایە. دەمەوێ رێك وراست. چیرۆك و سەرگوزشتەی رۆژگاری خەمناکی ئاقیبەتی خۆمانت بۆ بگێرمەوە. لەمێژ بوو ئودیسیوس رۆیی بوو، ئێمەش بە نیازی داخوازی ژنەکەی، چوو بووینە ماڵەکەی. ئیدی ئەو پێی نەگوتین کە نیازی شووکردنی نیە، جوابمان بکات و شتەکە یەکلایی بکاتەوەو ببڕێتەوە. تومەز لە دڵی خۆیدا بۆ نەخشەو پیلانێك دەگەڕا کە تاڵاوی مەرگمان پێ بنۆشێت و قڕمان بکات. یەکێك لە نەخشەو فەندەڵ و فێڵەکانی ئەمە بوو:

"هەستا لە ژوورەکەی خۆیدا خەرەك و دەزگایەکی گەورەی چنینکاری دامەزراند، بناغەی پارچەیەکی ناسك و درێژی دانا". هەنگێ خێرا هاتە نك ئێمە وگوتی:

"کوڕینە، ئەی خوازگارانی من! دەزانم ئێوە بە پەلەن، کە من شوو بکەم، جا مادامێکی ئودیسیوسی مەزن مردووە، پەلەم لێمەکەن تا ئەم پارچەیە دەچنم و تەواوی دەکەم. کارێك مەکەن کە ئەم رایەڵ و تان و پۆیەم لێخەسار بێت. ئەمەم بۆ کفنی لایرتیسی سەروەرە، با حازربێ بۆ ئەو رۆژەی کە مەرگی شووم بەرۆکی دەگرێت و دەیکوژێت. کارێکی وەها مەکەن ژنە ئاخاییەك بڕوات لە نێو خەڵکیدا لۆمەم بکات و لە پاشملەم بڵێت، ئەیەڕۆ، خۆ ئەو پیاوە مەزنە، ئەو پیاوە داراو دەوڵەمەندە مردو گەزە کفنێکی لەگەڵ خۆدا نەبرد!" بە هەرحاڵ، قسەکانی هێندە بەجێ و رێ بوون، ئێمە بە هەموو غرورو خۆپەسندیەکمانەوە ملمان بۆ داواکەی دا. ئەوسا دەستی بە کار کرد، بە رۆژەوە پارچەکەی دەچنی و بەشەو لەبەر تیشکی مەشخەلان، کارەکەی خۆی هەڵدەوەشاندەوە. بەو جۆرە سێ دانە ساڵی رەبەق، بێئەوەی بێڵێ کەس پێبزانێ، ئاخاییەکانی فریو داو درێژەی بە کەڵەك و فێڵەکەی خۆی دا. بەڵام کە ساڵی چوارەم هات، گوزەری هەیڤان، وەرزیان بە دوودا هات، رۆژانێکی زۆر تێپەڕین، یەکێك لە کارەکەرەکانی خۆی کە ئاگای لەو نەخشەو پیلانە بوو، هات و ئەو فێڵەی بۆ ئاشکرا کردین. کە چووین بەسەرا، ودیتمان خەریکە پارچە جوانە دەسکارەکەی خۆی بەوپەڕی شێنەیی هەڵدەوەشێنێتەوە، زۆرمان پێ سەیر بوو. ئیدی چاری نەما، دەبوایە ئەو کارە ئەنجام بدات و تەواوی بکات. کارەکەی تەواو کرد، پێی

نیشـان دایـن، پارچـەیەکی زۆر گـەورەو جـوانو پـڕ نـەخشو نیگـار بـوو. پـاك شـتبووی، دەقـی کردبوو، هێندە بەڕەونەقو پرشنگدار بوو، تیشـکی هـەتاوو تریفەی مـانگی وەبیر دێنایـەوە. لـەو بەینەدا یەکێك لە خواوەندە بەدخواکان، ئودیسیوسـی لـە شـوێنێکی دوورەوە، گەیانـدبووەوە ئـەو مەزرایەی کە بەرازەوانەکەی تیادا ئاکنجی بوو. کوڕە دڵسۆزو وەفادارەکەی ئودیسـیوس–ش، بـە کەشتییەکی رەش لە سەفەرێکی پیلۆسی لمەلاّنەوە گەڕابووەوەو لە مەزرای ناڤبری، لە دەڤ یارۆی بـەرازەوان لای دابـوو. دوای ئـەوەی بـاب و کـوڕ تـەگبیر دەکـەن، نەخشـەی قڕکردنـی خوازگارەکـان دادەنەن، دێنەوە بۆ شار. لە پێشا تیلیماخۆس هات، دوا بـە دوای ئـەو ئودیسـیوس هـات. یـارۆی بەرازەوان پێشی کـەوتبوو، ورێنـوێنی دەکرد، جلێکی شڕوشـپڕێوی لەبەر بوو. وەکو گەدایـەکی پیری زەبـوونو بێکـەس دەهاتـە بەرچاو، بـە کۆمـەکۆم خـۆی بەسـەر دار عاسـایەکدا دابـوو و رێـی دەکـرد. کـە بـەو شـێوەیەو کـوتو پـڕ خـۆی بـە ژوورا کـرد کـەسمان، تەنانـەت ئەوانـەی کـە تەمەنیشـیان هـەبوو،وکاتی خـۆی دیتبوویـان، نـەمان ناسـیەوەو نـەمانزانی کـە ئـەوە خـودی ئودیسیوسە. ئەلهەقی سوکایەتیەکی زۆرمـان پێکرد، جنێوی زۆرمـان دایـێ، و تەنانـەت لێشـمان دا. ئەویش لـە ماڵەکـەی خۆیـدا، بـە دڵێکی فراوانـەوە، بـە سـەبرو حەوسـەڵەیەکی زۆرەوە، هـەموو جنێو، لێدان، سوکایەتیو تەڵفیزییەکی قەبوڵ دەکرد. بـەلاّم زۆری پێنەچـوو، بـەرێنوێنی زیوسـی مـەزن، خواوەنـدی سـپەردار کەوتـە کـارکردن. تیلیمـاخۆس، بـە تـەگبیرو ئامـاژەی بـابی هـەموو جەنگـەوزارە کوشـندەو بڕنـدەو بـە سـامەکانی لـە هۆڵەکـەو لـە ماڵەکـەدا خڕکـردەوە، بردنـیو لـە عـەماری تاقـەت کـردن. دەرگاکـانی تونـد کێلـۆن دا. ئەوسـا ئـەو زۆرزانـە، ژنەکـەی هانـدا کـە تیروکەوانەکەی ئەو دەگەڵ هەر دوازدە پاچـەکەدا بێنـێو پێشبڕکێیەك لـە نێوان ئێمـەی بەدبەخت دا سازبکات کە هەرکەسێك بتوانێ کەوانەکەی ئودیسیوس بێنێتە سـەرپێو تیرێك بـە کونی هـەر دوازدە پاچەکەدا ئـاودیو بکـات، بەگـەڵ ئەو کەسـە دەکـەوێتو شـووی پێدەکات. ئەمـە سـەرەتای کۆتـایی ئێمـە بـوو. چـونکە هـیچ کەسـێك لـە ئێمـە تاقـەتی بەسـەر ئـەو کەوانـە قـورسو مکومـەدا نەدەشـکا، لــەوە بــێ هێزتربــووین ئــەو کەوانــە راکێشــین. بــەلاّم کــە کەوانەکــە گەییــە دەســتی ئودیسیوس، هـەموو بە دەنگی بـەرز هاوارمـان کرد، کەوانەکـەی مـەدەنێ، هەرچیەك دەڵـێ با بۆ خۆی بڵـێ، نابێ کەوانەکەی بدرێتێ. بەلاّم تیلیمـاخۆس کە لـەوێ بوو، سـوور بـوو لەسـەر ئـەوەی کەوانەکـەی بـدرێتێ، ئـەوە بـوو دەسـتووری دا کـە کەوانەکە بدەنـە ئودیسـیوس بـا ئـەویش خـۆی تـاقی بکاتـەوە. هـەنگێ ئودیسیوسـی مـەزن، نموونـەی سەبروحەوسـەڵە، کەوانەکـەی وەرگـرت، سـووكو ئاسـان رایکێشـاو تیرەکـەی بـە هـەر دوازدە کـونی پاچـەکاندا ئـاودیو کرد، ئەوسـا لەبـەر ئاسـتانەی دەرگاکـە راوەسـتا، تیرەکـانی هەڵڕشـتنە بـەر پێـی خـۆی، نیگایـەکی سـامناکی چـوار دەوری خۆی کرد، تیرێکی کوشندەی هاویشت، هەوەڵجار شا ئەنتینویوسـی پێکـا، ئەوسا کەوتـە تیرەندازی، نیشـانەی لـە هەرکەسێك دەگرتـەوە دەی پێکـا. خوازگارەکـان کە لـە دەوری یـەکتر خڕ بـوو بوونـەوە، یـەك یـەك دەکـەتنودەمردن. هـەنگێ بۆمـان دەرکـەوت کـە خواوەنـدێك پشـتیوانی لێدەکات. چونکە هەر لە سەرەتاوە لە سەرانسـەری راڕەووداڵانو پـەناو پەسێرەکانی کۆشکەکەدا شەڕێکی گەرمو خوێنـاوی دەسـتی پێکرد، ئودیسـیوسو یاوەرەکـانی چـنگ لەسـەر شـان راویـان

دەناین‌و بە چەپ‌و بە راستا، بێدەست پاراستنن لێیان دەکوشتین، هاوارو ناڵە دەگەییە ئاسمان، هەر سەر بوو، دەپەڕی بەبێ ناز دەکەوتە عاردی، وای لێهات خوێن بەسەر عاردەکەدا جۆگەلەی بەست. ئەمە حاڵ‌وحیکایەتی مردنەکەی ئێمەیە ئەی ئاگامەمنون. تاکو ئێستا جەستەی ئێمە بەبێ گۆڕ لە ماڵەکەی ئودیسیوسدا لەو گۆڕە کەوتوون: چونکە کەسوکاری ئێمە لە ماڵی خۆیانن‌و ئاگایان لە هیچ شتێك نیە، ئەو کەسوکارەی کە دەیانتوانی بمانشۆن‌و لە خوێن‌و خوڕ پاکمان بکەنەوەو بۆمان بگرین‌و پرسەمان بۆ بگێڕن‌و بە خاکمان بسپێرن، کە ئەمە هەقی ئاسایی هەر مردوویەکە.

هەنگێ روحی کوڕەکەی ئوتریوس هاواری کرد:

"خۆش بە حاڵت ئەی کوڕی لایرتیس، خەنی لە خۆت ئەی ئودیسیوسی فاماوجوامێر، ئافەرین بۆ ئەو ژنە داوێنپاك‌و دڵسۆزو ئەمەکدارەی هەڵت بژارد. بەڕاستی پنلۆپی بێ وێنە، کیژە داوێنپاکەکەی ئیکاروس، نموونەی بەرزی وەفاداری بوو، بە هیچ جۆرێ ئودیسیوسی مێردی فەرامۆش نەکرد، بۆیە ناوبانگ‌وپارسایی‌و پاکی‌وپاکیزەیی ئەو هەرگیز لە بیر ناچێت، و خواوەندانی نەمر، گۆرانی‌و داستانانی جوان لە ستایشی پنلوپی ئەقڵمەندا، دەخەنە ناو دڵ‌و سەرزاری بنیادەمان‌و وەفاداری پنلۆپی دەبێ بە داستان‌و دەکەوێتە سەر زاران. رێك بە پێچەوانەی کیژەکەی (تیندریوس)ەوە کە زەمینەی بۆ لە نێو بردنی مێردەکەی خۆش کردو کوشتی، خیانەت‌و بێوەفایی ئەو، هەتا هەتایە بە داستان دەگێڕدرێتەوەو تەنانەت ژنانی پاکداوێن‌و وەفاداریش بە بیستنی خەمبارو شەرمەزار دەبن!"

بەڵێ ئەو جووتە، لە خانەی هادیس دا، لە قوڵایی ژێر زەوی دا، بە پێوە ئەو قسانەیان بۆ یەکتر کرد

## ئودیسیوس بابی تاقی دەکاتەوە

ئودیسیوس‌و یاوەرەکانی لە شار وەدەرکەوتن. دوای ماوەیەکی کەم گەییشتنە مەزرایەکی جوان کە لایرتیس، بە دڵ‌و بە گیان پاسەوانیو پارێزگاری کردبوو وکاتی خۆی بە رەنجی شان‌و هەوڵ‌و تەقەلای زۆر بە دەستی هێنا بوو. خانوو ماڵەکەی لەوێدا بوو. دالانێکی گەورەشی بە چوار دەوریا دروست کردبوو، نۆکەرو خولام‌و کۆیلەکانی، کە بە دڵ‌و بە گیان خزمەتیان دەکردو بە روح لە ئەمرو رای ئەودا بوون، لەو دالانانەدا نانیان دەخوارد، هەڵدەستان‌و دادەنیشتن‌و دەخەوتن. لایرتیس، پیرەژنێکی سیسیلی لەگەڵدا دەژیا کە یەجگار گوێڕایەڵی پیرەمێرد بوو، و لەم قەڵەمڕەوو مەزرایەدا، دوور لە شار، پێی ڕادەگەیی‌و خزمەتی دەکرد.

کە ئودیسیوس‌و هاوڕێکانی گەییشتنە ئەوێندەر، بەرەنجبەرەکان‌و کوڕەکەی گوت:

"ئێستا ئێوە بچنە ژوورەوەو باشترین بەراز بۆ شێوی ئێواریێ بکوژنەوە، منیش دەچم بۆ لای بابم، تاقی دەکەمەوە بزانم ئاخۆ دەمناسێتەوە یان لەبەر ئەوەی دەمێکە رۆییشتووم، نامناسێتەوە".

بەدەم ئەو قسانەوە جەنگەوزارەکانی لە خۆ داماڵی‌و دانیە دەستی نۆکەرەکانی. ئەوان بە پەلە بۆ ماڵەکە رۆییشتن. ئودیسیوس-ش بۆ تاقیکردنەوەی بابی چوو بۆ ناو رەزو باخاتە گەورەو پڕ

میوەکە، کە گەییە ئەویٚ نە دولیوسی لیٚ بوو و نە هیچ یەکێك لە کوڕانیو خولاٌمو نۆکەرەکانی دی. ئەوی ڕاستی بیٚ هەموویان بە سەرپەرشتی دولیوس، خزمەتکاری پیر چووبوون دڕکەزی بکەنو بیهێنەوەو بیکەن بە پەرژینی باخەکە. بۆیە ئودیسیوس بابی بە تاقی تەنیا لە ڕەزە جوانو خزمەتکراوەکەیدا بینی. عەبایەکی چڵکنی، پینە پیناوی، کۆنی لەبەر بوو، لەبن درەختێکدا خەریکی بێڵکاری بوو. بەلەکەکانی بە پێستی خۆشەکراوی گا پێچا بوو تا دڕكو چقلاٌنی پێدا نەچێتو بریندار نەبێت. دەستکێشی لە دەست کردبوو، تا دڕکیان پێدا نەچێت، شەپقەیەکی پێستەبزنی لەسەر نابوو، ئەم جلکە شڕوشەپڕێوو سەیرە، ڕەنگدانەوەی خەمباری ئەو بوون. کە ئودیسیوسی مەزن، نموونەی سەبرو حەوسەڵەو بەردەباری، سەیری کرد پیری زۆری بۆ هێناوەو لە ژێر باری خەما پشتی چەماوە، بە بێدەنگی لە ژێر دار هەرمێیەکی بەرزا وەستاو دەستی بە گریانو فرمێسك ڕشتن کرد. دوو دڵو حەیران تیا مابوو ئایا بچیٚ دەست لە ملی بابی بکاتو ماچی بکاتو هەموو شتێکی بۆ بگێڕێتەوەو پێی بڵیٚ کە چۆن گەڕاوەتەوەو ئەنجام گەییووەتەوە ولاٌتی خۆی؟ یان خۆی لێبکات بە نەناسو بەپرسیاران بۆی بچێتو تاقی بکاتەوە؟ دوای ئەوەی سیٚو دووی دڵی خۆی کرد، وای بە باش زانی کە بە پرسیاری سوعبەت ئامێزەوە لەگەڵی بکەوێتە قسانو تاقیبکاتەوە. ئەوسا ئودیسیوسی موبارەك ڕاست بەرەو لای بابی ڕۆیی، کە بە کووڕە کووڕ خەریك بوو بە بێڵێك دەوری درەختێکی هەڵدەکەنیو خاکەکەی شی دەکردەوە. هەنگیٚ کوڕە مەزنەکەی لێی نزیك بووەوەو گوتی:

"ئەی پیرەمێرد! تۆ لە کاری باخەوانیدا دەست سپیو دەستەوەستان نیت، بیٚ ئەزموون نیت. هەموو کارێکی ئێرە بەرێكو پێکی ئەنجام دراوەو مەعلانی پێوە دیارە. هەموو شتێکی ئێرە بە باشی بە خێوو سەرپەرشتی کراوە: لە بنچکە گیاو دەوەنێکەوە بیگرەو بە بنە هەنجیرو مێوەکاندا پێیدا وەرە تا دەگاتە زەیتونو هەرمیٚوسەوزەجاتو هەر شتێکی باخو باخداری لەم مەزرایەدا بایەخی خۆی پێدراوەو پشت گویٚ نەخراوە. بەلاٌم حەزدەکەم شتێکت پێبڵێم کە ئومێدەوارم لە دڵی خۆتدا پێی قەڵس نەبیت: تۆ ئەوەندەی بە باخەکەدا ڕادەگەیو خەمی باخەکەتە ئەوەندە بە خەمی خۆتەوە نیتو بە خۆتدا ڕاناگەی. سەرباری پیری، خۆت چڵکنو پڵکن ڕاگرتووە، جلو بەرگەکەت شڕوشەپڕێوە! پێناچێت تۆ یەکێك بی لەو ڕەنجبەرو کۆیلەو نۆکەرانەی، کە لەبەر تەمەڵیو تەوەزەلی ئاغاکەی فەرامۆشی کردبیٚو هیچ بایەخێکی پیٚ نەدات. هیچ نیشانەیەکی کۆیلەیەتی لە تۆدا نابینریٚ، نە سەروسیمات، نە روو و روخسارت، نە بەژنو بالاٌت لە هی کۆیلەو نۆکەران ناچن، بە پێچەوانەوە زیاتر لە خانەدانو سەردارو پاشا دەچیت. پێدەچێت تۆ لەو پیاوانە بیت کە پاش خۆشتنو نان خواردن بۆ خۆ پاڵبکەونو بەرە بەرە خەو بیان باتەوە، کە ئەمە هەقی هەر پیرەمێردێکە. بەلاٌم وەرە پێمبڵیٚ، ڕێكو ڕاست وەلاٌم بدەوە، تۆ کرێکاری کێیت،و ئەم ڕەزو باخەی کە کاری لەسەر دەکەی هی کێیە؟ هەروەها حەزدەکەم ئەوەشم پیٚ بڵێیو دڵنیام بکەی کە ئایا ئێرە، ئەم شوێنەی کە ئێستا بۆی هاتووین شاری ئیتاکایە؟ چونکە تۆزیٚ لەمەپێش کابرایەکی نەناسم بینیو لێم پرسی، گوتی بەڵیٚ ئیتاکایە... بەلاٌم لە پیاوێکی زۆر ئاقڵ نەدەچوو: ئامادە نەبوو وەلاٌمی هەموو پرسیارەکانم بداتەوەو گوێم لێبگرێت، کە

پرسیاری برادەرێکم لێکرد کە کاتی خۆی هاتبووە میوانی من، دەمویست بزانم ئایا ماوە، لە ژیانایە یان مردووەو چووەتە خانەی هادیس. خۆی لە گێلی داو وەڵامی نەدامەوە. جا حەز دەکەم باش گوێم لێبگریتو ئەو چیرۆکە بۆ تۆ بگێڕمەوە. پرسیاری من دەربارەی پیاوێکە، کە ساڵانێك لەوە پێش هاتە ماڵەکەمو لە وڵاتو زاگەی خۆما میوانداریم کرد: هەرگیز هیچ بیانییەکی لەو بەڕێزترو ئازیزتر رووی نەکردووەتە ماڵەکەمو پێڵاوی غەریبی لە ماڵی مندا دانەکەندووەو لە سایەی ماڵی مندا نەخەوتووەو نە حەساوەتەوە. بەڵێ ئەو میوانە دەیگوت خەڵکی ئیتاکایە،و کوڕی لایرتیس-ی کوڕی ئەرکیسیوس-ە. ئیدی بردمە ماڵی خۆم، زۆرم خزمەتکرد، نانو خوانو زیافەتی شاهانەم بۆ رازاندەوە، چونکە دەوڵەمەند بوومو لە ماڵەوە لە هیچم کەم نەبوو، ئەوەی بۆ ژیانو بژێوی پێویست بوو بە زیادەوە هەمبوو. ئیدی دیاریو سەوقاتییەکی زۆرم، وەکو رێورەسمی میوانداریو میوانپەروەری پێشکەش کرد کە بریتی بوو لە: حەوت تالان زێڕی خالیسە، سوارحیەکی بادە تیاگرتنەوە کە یەکپارچە زیوی خالیسە بوو و بە نیگاری گوڵان نەخشێنرا بوو، دوانزە عەبای یەك بەر، دوانزە فەرش، دوانزە سەر جێگای جوان، دوانزە چاکەت،ودوانزە کراس، و لە هەموو ئەمانەش بترازێ، چوار ژنی جوانی دەستڕەنگین بوو کە بە خۆی هەڵی بژاردن".

## لایرتیس، بە دەم خەم وگریانەوە باسی کوڕەکەی دەکات

هەنگێ بابی، بە دەم روندك رشتنەوە بەرسڤی دایەوەوگوتی:

"ئەی رێبوار، تۆ رێك گەییویتە ئەو شوێنەی کە مەبەستت بووە، گەییویتە مەزڵی خۆت. بەڵام ئێستا شار بە دەستی خەڵکانێکی سەر شێتوخۆسەرو ستەمکارەوەیە. ئەو دیاریو سەوقاتیە زۆرو زەبەندەی تۆ پێشکەشت کردوون، بەخەسار چوونو جێی هیچیان نەگرتووەتەوە. چونکە تۆ جارێکی دی ئەو کەسەی کە تاقیبی دەکەی لێرە، لە خاکی ئیتاکادا نابینیتەوە. خۆ ئەگەر جارەکی دی دیباتەوە بێگومان بەگەرمی پێشوازی دەکردیت، وهەرگیز رێی نەدەدایت بە دەستی بەتاڵ بگەڕێیتەوە. وتۆ چەندت دیاری پێشکەش کردبوون ئەو زیاتری پێشکەش دەکردیت،و منەتباریشت دەبوو. چونکە سوننەتی ژیان وایە ئەوەی ئەمڕۆ بە دەستێك دەیبەخشی دەبێ سبەینێ بە دەستەکەی دی شتێکی لەبری وەربگریتەوە. بەڵام تو وەرە راستم پێبڵێو هیچم لێ مەشارەوە: چەند ساڵ لەمە پێش، تۆ لە ماڵی خۆتا، ئەو پیاوەت بینی؟ ئەو پیاوەی کە میوانی تۆ بووە، کوڕی منیش بووە، ئەو نەگبەتە، ئەو بەلەنگازە، کە لەم دنیایەدا، نەگبەتو بەدبەختێکی دیکەی وەکو ئەم نەبووەو نابێتەوە، کە لەگینە دوور لە کەسوکار،ودورو لە زاگەو وڵات، لە دەریادا بوویێ بە خۆراکی ماسیان، یان قەلو داڵو درندە لە دەشتو دەرا خواردبێتیان. نە دایکی توانی کفنی بکات، وتێر بە سەریا بگری،و نە منی باوك. ئێمە کە هێنامانە ژیانەوە، ئەوەندەمان پێنەبرا بەسەریا بگرینو کوڵی گریانمان لە جۆش بخەین. نەك ئێمە بەڵکو هاوسەرەکەشی، پنلوپی ئەقڵمەندو سەنگینیش، نەیتوانی لەسەر جەنازەی مێردەکەی بگری، لە کاتی ئاوزینگدا، دڵسۆزانە پێڵوەکانی لێك بنێ کە ئەمە فەرزو واجبە بۆ مردووان بکرێت. بە هەرحاڵ، با واز لەمە بێنین، وەرە رێكو راست پێم بڵێ بزانم تۆ چیت دەوێ؟

کێی؟ کوێندەریت؟ خەڵکی چ شارێکی؟ دایك‌و بابت لە کوێن؟ ئەو کەشتییە خۆشڕەوەی کە خۆت‌و هاوڕێ خوائاساکانی بۆ ئێرە هێناون، لەکوێ لەنگەری گرتووە؟ یان وەکو نەفەرو گەڕیدە بە کەشتی خەڵکی دیکە هاتوویت، لێرە دایان گرتوویت‌و رۆییشتوون؟"

هەنگێ ئودیسیوسی سالۆر بەرسڤی دایەوە:

"کە وای لێهات، هەموو شتیکت پێدەڵێم، هیچت لێناشارمەوە، من خەڵکی (ئالیباس)م ماڵێکی زۆر گەورەو فاخیرم لەوێ هەیە، کوڕی شا(ئافیداس)م کە ئەویش کوڕی (پولیپمون)ـە، بەخۆیشم نێوم (ئیپریتوس)ـە. بەڵام خواوەندێك لێم چووە بە قیناو لە (سیکانیا)ی دوور خستوومەتەوە، بەبێ ویستی خۆم رەهەندەی ئێرەی کردووم. کەشتییەکەم لەم نزیکانە، لە نزیکی ئەم مەزرایەو دوور لە شار لەنگەری گرتووە. بەڵام سەبارەت بە ئودیسیوس، ئەمساڵ، سەری پێنجەمین ساڵە، کە لە لای ئێمە کەوتە رێ، ئەو بەدبەختە لە وڵاتی ئێمە دەرچوو، بەڵام وەختێ کە کەوتە رێ، هەموو نیشانەکان مژدەی خۆشیان دەنواند، باڵندان بەلای راستی ئەودا هەڵدەفڕین، بۆیە کە بەڕێم دەکرد، زۆر بەو دیمەنە خۆشحاڵ بووم، ئەویش زۆر بە شادی بە رێکەوت، هەردووکمان شادمان‌و گەش بین، بە ئومێد بووین، کە پەیوەندیمان بەردەوام بێت،و دیاری‌وسەوقاتی جوان پێشکەش بە یەکدی بکەین"

## ئودیسیوس دەست لە ملی بابی

## دەکات‌و نیشانەیەکی پیشان دەدات

لایرتیس کە گوێی لەو قسانە بوو، تەمی خەمێکی بەسوێ نیشتە سەر سیمای، بە هەردوو دەستان چنگێ خۆڵی رەشی هەڵگرت‌و کردی بەسەر سەرە ماش‌وبرنجییەکەیدا، دەستی بە گریانێکی بەکوڵ کرد. ئودیسیوس، کە بابە ئازیزەکەی بەو شێوەیە بینی دڵی پڕ بوو، پەڕەی کەپوی لە حەژمەتاندا کەوتنە لەرزین، گریان ئەوکی گرت، بەرەو پیری تاوی دا، باوەشی پێداکرد، تەوێڵی ماچ کردوگوتی:

"باوکە گیان، من ئەو کەسەم کە لێی دەپرسیت، دوای بیست ساڵان دووری ئەوەتام، گەڕاومەتەوە ئاخی وڵات‌و زاگەی خۆم! تکات لێدەکەم دەستبەرداری گریان ببە، وەختی گریەو زاری نیە. زۆرم پەلەیە، سرێکم پێیە دەمەوێ پێتی بڵێم: خوازگارەکانم لە ماڵەکەی خۆمدا کوشتوون، داخی زۆریان کردبووە دڵمەوە، تۆڵەی خۆم لێسەندنەوە، دڵی خۆم کرد بە تەرزە. بە سزای کرێتکاری‌و نامەردییەکانی خۆیانم گەیاند".

هەنگێ لایرتیس هەڵیدایەو گوتی:

"ئەگەر راستەو تۆ ئودیسیوسی کوڕی منیت‌و بۆ ئیتاك گەڕاویتەوە، بەڵگەو نیشانەیەکی بێ چەندو چوونم بدەیە تا دڵنیا ببم‌و گومانم لەلا نەمێنێ".

ئودیسیوسی فاما بەرسڤی دایەوە:

"جارێ پێش هەموو شتێك فەرموو بە چاوی خۆت ئەم جێ زامەی سەر لاقم ببینە، ئەمە جێ شفرەی سپی ئەو بەرازەیە کە لە چیای پارناسوس پەلاماری دام. بیرتە کە خۆت‌ودایکی بەڕێزو سەرفرازم بۆ ئەوێتان ناردم کە بچمە لای ئوتولیکوس–ی باپیرم، بابی دایکم، کە کاتی خۆی

هاتبووه ماڵی خۆمان و بەڵێنی کۆمەڵێك دیاری و سەوقاتی دابوومێ. ناردبووتانم تا ئەو دیاریانە بێنمەوە، بە هەرحاڵ با واز لەمە بێنین و بێینە سەر باسی ئەو درەختانەی ناو ئەم باخە جوان و خزمەتکراوە، کە کاتی خۆی دابووتن بە من: ئەو سەردەمە من منداڵ بووم، بە نێو باخەکەدا دووت کەوتبووم و دەگەییشتینە هەر دارێك ناوەکەیم لێدەپرسیت، بە سەرانسەری باخەکەدا سوڕاینەوە، تۆ ناوی درەختەکان و تەبیعەت و سروشتیانت پێدەگوتم، ئێستاش لە بیرمە کۆمەڵێ دارو درەختت دامێ، لەوانە: دوانزە بنە هەرمێ، دە دارسێو، بیست بنە هەنجیر، هەروەها بەڵێنت دامێ کە چەند ریزە مێوێکم بدەیتێ. لە بیرمە پەنجا بنە مێو بوو، لە ساڵێکدا چەند جارێك بەریان دەداو لەگەڵ سوڕانەوەی هەر وەرزێکدا زیوس گیانێکی تازەی دەخستنەوە بەر، وبەری تازەیان دەدا".

لایرتیس کە گوێی لەو قسانە بوو، لاقی شل بوون، دڵی خاو بووەوە، هەموو نیشانەو بەڵگەکانی ئودیسیوس-ی بیرکەوتنەوەو ناسینەوە. هیچ گومانێکیان هەڵنەدەگرت. خەریك بوو دەبورایەوە، باوەشی بە کوڕەکەیدا کرد، ئودیسیوسی نموونەی سەبروحەوسەڵە، پیرەمێردی لە باوەش گرت، بە سینگی خۆیەوەی نووساند،کاتێ کە لایرتیس وەهۆش هاتەوەوگوڕی وەبەر کەوتەوە، هەڵیدایەو گوتی:

"ئەی بابە زیوس، زێوسی مەزن و بە توانا، ئەگەر راست بێ و خوازگارەکان بە سزای بێ ئەدەبی و گۆساخی شێتانەی خۆ گەیەنرا بن، مانای وایە هێشتا خواوەندانێك لەو سەرەوە، لە ئولەمپدا هەن. بەڵام ئێستا ترسێکی گەورەم لە دڵدایەو نیگەرانم دەکات: دەترسم لە پڕێکا هەر هەموو خەڵکی ئیتاکا روو بکەنە ئێرەو هێرشمان بکەنە سەر، و تەتەرو جارچیان بۆ هەموو شارانی سفالونیان بنێرن و جاڕی شەڕمان لێبدەن".

ئودیسیوسی فاماو بەردەبار بەرسڤی دایەوە:

"گوێ مەدەیە، هیچ خەمت نەبێ، ودڵی خۆت سەغڵەت مەکە: باشتر وایە بڕۆین بۆ ماڵەوە، ماڵەکەی نزیکی ئەم رەزو باخە، چونکە تیلیماخۆس و گاوان و بەرازەوانەکەم پێشتر بۆ ئەوێ ناردوون کە بەپەلە نان و خوانمان بۆ ئامادە بکەن".

بەدەم ئەو قسانەوە بەرەو ماڵە گەورەو بەشکۆکە پەل بوونەوە. کە گەییشتنە کۆشکە گەورەو جوانەکە، سەیریان کرد تیلیماخۆس و گاوان و بەرازەوانەکە گۆشتێکی زۆر زۆریان لەبەر دەستدایەو بە سێ قۆڵی دەی جنن و چاکی دەکەن، و بادەو شەراب-ی ئاڵ دەگرنەوە. ئەوسا پیرەژنە سیسیلییەکە، لایرتیسی بردە ژوورەوە، بردیە گەرماو، پاك شتی و ئازای بەزەیت چەور کرد. دەستێ جلکی تازەی لەبەر کرد، عەبایەکی یەجگار جوان و نایابی دا بە شانیا. هەنگێ ئەتینا هات، ئەویش لەلای خۆیەوە رەنگ و روویەکی گەش و هەیبەت و تین و تاووگوڕێکی ئەوتۆی بەم شێرە پیاوە، بەم پاشایە بەخشی کە جوانترو گەورەتر لە حەقیقەتی خۆی دەهاتە بەرچاو. لایرتیس لە گەرماو هاتە دەرێ، کە کوڕەکەی بەو هەموو جوانی و هەیبەتە خواییەوە دیتی سەری سوڕما، هەڵیدایەو گوتی:

"بابۆ، ماشەڵلا لەم سەروسیما جوانە، لەم بەژن‌و باڵا بەرزە، لەم هەموو هەیبەت‌و سام‌و شکۆیە بەڕاستی چاو دەخاتە ڕێشکەو پێشکە، وا دیارە خواوەندێك پێترا گەییووە".

لایرتیسی دنیادیدە بەرسڤی دایەوە:

"هێی دنیا، بە زاتی زیوسی موبارەك،و قەسەم بە ئەتیناو بە ئەپولو، پڕ بە دڵ حەزم دەکرد، هەمان هێزو توانای ئەو ڕۆژگارو سەردەمەم هەبوایە کە وەکو سەرکردەو پێشەنگی سفالینیان، پەلاماری شارە قایمەکەی نیریکوس، ئەو قەڵا مکومەی قەراخ وشکانیم داو گرتم. ئەگەر ئەو هێزو توانایەم هەبوایە، دوێکە چەك بە دەست شان بە شانی تۆ دەوەستام‌و بەدڵ‌و بەگیان شەڕی خوازگارەکانم دەکردو چەندین مێرم لێدەخستن، ودڵی تۆم خۆشدەکرد".

باب‌و کوڕ سەرگەرمی ئەو قسانە بوون، لەو بەینەدا ئەوانی دی کاری خۆیان تەواو کردو نان‌و خوانیان ئامادەکرد. لە ریزی یەکترا، لەسەر کورسی دانیشتن، هێشتا بە تەواوەتی دەستیان بۆ خواردنەکە نەبردبوو، کە دولیوسی پیر خۆی وەژوورا کردو بەرەو روویان چوو: کوڕەکانیشی لەگەڵ بوون، زۆر ماندوو بوون، لە کاری مەزرایە دەگەڕانەوە. دایکیان، پیرەژنە سیسیلییەکە بە دوویاندا چوو بوو، ئەم پیرەژنە سەرپەرشتی نان‌و ئاوی ئەوانی دەکردو هەم سەرپەرشتی‌و خزمەتی ئاغای دەکرد کە لە مێژ بوو گیرۆدەی باری گرانی پیری بوو بوو. کە چاویان بە ئودیسیوس کەوت‌و لە دڵی خۆدا ناسیانەوە، بە واقی وڕەوە لە ژوورەوە وەستان. بەڵام ئودیسیوس بەوپەڕی میهرەبانی‌و رووخۆشی گوتی:

"پیرەمێر، بۆچی حەپەساوی! وەرە دانیشە، وەختی حەپەسان نیە، دەمێکە چاوەڕوانین، هەر چەندە زۆرمان برسییە، بەڵام چاوەڕوانی ئێوە بووین‌و هەر دیارتان نەبوو!".

## دولیوس خێر هاتنەوەی ئودیسیوس دەکات

دوای ئەو قسانە، دولیوس، بە باوەشی کراوەوە، یەکڕاست بەرەو رووی ئودیسیوس چوو، دەستی خستە نێو دەستی ئەوو قۆڵی ماچ کرد، وخێرا گوتی:

"ئەزبەنی باوەڕبکە زۆر بەتاسەوە بووین کە بگەڕێیتەوە بۆ وڵات‌و زاگەی خۆت. بەڵام چەندمان بیر دەکردەوە تروسکەی هیوامان بەدی نەدەکرد، جا ئێستا کە بە حەوڵ‌و قوەتی خواوەندان گەڕاویتەوە، یاخوا بەخێر بێیتەوە، زۆرمان پێ خۆشە، لە خواوەندان دەپاڕێینەوە دەست بە باڵتەوە بگرن، هەر شادبیت‌و هیچ ناخۆشیەکی ترت نەیەننە رێ! بەڵام راستم پێبڵێ، ئایا پنلوپی ئاقڵ‌و ئاغر لە گەڕانەوەت ئاگادارە، یان پێویستە پەیکێکی بە دووا بنێرین‌و ئاگاداری بکاتەوە؟"

ئودیسیوسی سالۆر بەرسڤی دایەوەوگوتی:

"پیرەمێرد، پنلوپی ئاگادارە، خەمی ئەوت نەبێ"

ئەوسا، دولیوس، لەسەر کورسییەکی جوان دانیشت. کوڕەکانی لە دەوری ئودیسیوس-ی سەرفراز خڕبوونەوەو بە گەرمی خێرهاتنەوەیان کردو تەوقەیان دەگەڵ کرد. ئەوسا بەریز لەم شان‌و لەو شانی بابیان، دولیوس دانیشتن.

## هەواڵی کوشتاری سامناکی

## خوازگارەکان لە شاردا بڵاودەبێتەوە

لەو کاتەدا کە ئەوان لە کۆشکە گەورەکەی لایرتیس دا خەریکی نانخواردن بوون، روموری – Rumvur پەیامبەرو جارچی بەپەلە کەوتە ناو شارو هەواڵی مەرگو کوشتاری سامناکی خوازگارەکانی بڵاوکردەوە. خەڵکی شار کە گوێیان لەو هەواڵە دڵتەزێنو بیٚ پێشینەیە بوو، لە هەموو لایەکەوە بە هەشتاو، و بە دەم هاوارو گریانەوە بەرەو کۆشکو سەراکەی ئودیسیوس دەهاتن. هەرکەسەو جەنازەی مردووی خۆی دەناسییەوەو لە ژوورەوە دەیان هێنایە دەریٚو بە خەمو پەژارەوە بە خاکیان دەسپاردن. بەڵام جەنازەی ئەوانی تریان، کە لە شارانو شوێنانی ترەوە هاتبوون، لە کەشتیانی تیژڕەو بارکردو بە ماسیگرانیان سپارد، تا هەر یەکەیان بۆ شارو زێدی خۆی بەرنەوە. ئەوجا ئیتاکیان، بە کۆمەڵ، وبە دڵی خەمناکەوە، چوون بۆ مەیدانی کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی شار. پاش ئەوەی ئاپۆڕایەکی زۆر لەوێندەر خڕبوونەوە یوپیتیس، بە نیازی قسەکردن هەستا. چونکە زۆر دڵ بریندارو تازیەبار بوو: ئەنتینوسی کوڕی یەکەم کەس بوو کە بە دەستی ئودیسیوسی موبارەك کوژرا بوو. بە دەم روندك رشتنو گریانەوە رووی کردە ئاپۆڕاکەو گوتی:

"براینۆ! بەڕاستی ئەو پیاوە تاوانێکی گەورەی دەرهەق بە ئاخاییان کردووە، نەهەقی لەوە گەورەتر نابێت. کە رۆیی عەگیدترین پیاوانی لە کەشیتان ناو لەگەڵ خۆی بردنی، کەس نەیزانی چیان بەسەرهات، چۆن فەوتان، نە سەرو سۆراخی خۆیان بوو، و نە هی کەشتییەکانیان. ئێستاش کە هاتووەتەوە، لە جیاتی هەموو چاکەیەك بەناو کەوتووەو کۆمەڵێکی قڕکردووە کە سەرتۆپو بژاردەی ماڵباتی سفالینیان بوون. بە هەرحاڵ با واز لەمە بێنین، ئەگەر ناتانەویٚ هەتا هەتایە سەرشۆڕو شەرمەزاربین، با بەر لەوەی ئەو کابرایە بۆ پیلوس یان ئیلیس–ی قەڵەمڕەوی ئیپانیان هەڵێتو خۆی دەرباز بکات، با بەپەلە بکەوینە خۆو ڕێی پێبگرین، چونکە ئەگەر تۆڵەی کوڕانو براکانمان نەسەنینەوە، تووشی سەر شۆڕیو شەرمەزاریو عەیبەیەکی ئەوتۆ دەبین، کە خەڵکانی دوای ئێمە بە داستان بیگێڕنەوە.دەبینە بنێشتە خۆشەی ژێر دانان.. ئەگەر وابیٚ من بەش بە حاڵی خۆم هیچ دڵێکم بە ژیان خۆش نابێت، مردنم پیٚ خۆشتر دەبێت لە ژیانی سەر شۆڕی، حەزدەکەم بمرمو بچمە ریزی ئەوانەی کە مردوونو لەم دنیایەدا نین. دەی بە خۆ بکەون، با دەرفەتیان نەدەین، لە ڕێگەی دەریاوە هەڵێن!".

## میدون شایەدییەکی باش دەدات

چ بە قسەو چ بە گریان، ئاپۆڕای خەڵکەکەی تەواو پڕکرد، جۆشیدانو هاڕوژاندنی. ئەوسا میدونو شایەرو هۆنەرە موبارەکەکە، کە تۆزیٚ لەوە پێش لە خەو رابوو بوون، لە ماڵ و کۆشکەکەی ئودیسیوسەوە هاتبوونە دەریٚ، بەرەو ئاپۆڕاکە چوون. لە ناوەندی حەشاماتەکەدا وەستان.خەڵکەکە سەریان لە دیتنی ئەو جووتە سوڕما. هەنگیٚ میدونی فامیدە رووی تێکردنو گوتی:

"خەڵکی ئیتاك، گوێبگرن، ئودیسیوس بەبێ ڕەزاو خواستی خواوەندانی جاویدان ئەم کارانەی نەکردووە. من کە لێرە وەستاوم، بە چاوی خۆم یەکێك لە خواوەندانی جاویدانم بینی کە لە نزیکی ئودیسیوسەوە وەستا بوو، وەدەقاو دەق وەکو مەنتور وابوو. ئەم خواوەندە نەمرە هەندێجار خۆی نیشانی ئودیسیوس دەداو هانی دەداو بۆ شەڕو کوشتار جۆشی دەدا، و هەندێجار دەکەوتە ناو کۆشکەکەو بە نەعرەتەو هاوار خوازگارەکانی پەریشان دەکردو هێرشی دەکردنە سەر، و بە کۆمەڵ لێی دەکوشتن‌وەدەیدان بەسەر یەکدا".

کە گوێیان لەو قسانە بوو، هەموو لە ترسا ڕەنگیان زەرد هەڵگەڕا.

## هالیتێرسیس پیاوانی ئیتاك مەحکوم دەکا

هەنگێ پاڵەوانی پیر، هالیتێرسیس، کوڕی ماستور، کە لە هەموویان دنیادیدەترو دووربین‌ترو ئایندەبین تر بوو هەستا، ڕووی تێکردن، و بەوپەڕی نیازپاکی‌و نیەت چاکییەوە گوتی:

"خەڵکی ئیتاك گوێبگرن، ئەم وەزعە خەمناك‌و ناڵەبارەی بەسەرتان هاتووە، زادەو ئەنجامی خەمساردی‌و بێ موبالاتی‌و ترسنۆکی خۆتانە، زادەی هەڵەی ئێوەیە، ئێوە بە گوێی من‌و مەنتوری سەردارو گەورەی گەلتان نەکرد کە پێمان گوتن، سنوورێك بۆ سەرکێشی‌و ملهوڕی کوڕەکانتان دابنەن. کوڕەکانتان هەموو سنوورێکیان بەزاندووە، دەستیان داوەتە بێدادی‌و غەدر، زۆر غەڕا بوون، سەروەت‌وسامانی پیاوێکی پایەبەرزو گەورە، بە ناهەق دەخۆن‌و بە فیڕۆی دەدەن، بە درەفتاری‌و بێ ئەدەبی بەرانبەر بە خانمە سەلارو سەنگینەکەی دەکەن، ئازاری روحی دەدەن. گاڵتەیان بە قسەکانی ئێمە دەهات‌و وایان وێنا دەکرد کە جارێکی دی ناگەڕێتەوە! ئەوە بوو بە چاوی خۆتان ئاکامەکەیتان بینی. ئێستاش وەك دەڵێن زەرەر لەنیوەش بگەڕێتەوە هەر قازانجە، پیاوی چا بن بە قسەم بکەن، چیتان پێدەڵێم وابکەن، با دژی ئودیسیوس نەوەستین، با شەڕی ئەو پیاوە نەکەین، با کەس بەڵاو نەگبەتی بەسەر خۆی نەیەنێت!"

دوای ئەو قسانە، نیوەی حەشاماتەکە، بەپەلەو بەدەم غەڵبە غەڵبەوە کۆبوونەوەکەیان بەجێهێشت‌و ڕۆییشتن. ئەوانی دی لە جێی خۆ نەجوڵان، چونکە قسەکانی (هالیتێرسیس)یان بە دڵ نەبوو. دوای قسەی یوپیتیس کەوتن، بەپەلە ڕۆییشتن چەك هەڵگرن، دوای ئەوەی جەنگەوزاریان لە خۆدا، سەراپایان لە برونزدا دەدرەوشایەوە، هەموو لە دەرێی شارا خڕ بوونەوە. یوپیتیس، گەوج گەوج پێشیان کەوت، بە خەیاڵی خاوی خۆی وایدەزانی تۆڵەی مەرگی کوڕەکەی دەستێنێ، غافڵ بوو لەوەی کە دەبێ لەوێدا ڕووبەڕووی چارەنووس‌و ئەجەلی خۆی ببێتەوەو جارێکی دی بۆ شار نەگەڕێتەوە.

## زیوس، بەڵێنی یارمەتی هەتاسەری ئودیسیوس، دەدا

ئەتینا، لەم بەینەدا بە زیوسی کوڕی کرونوسی گوت:

"ئەی کوڕی کرونوس، ئەی بابی هەموومان، ئەی پاشای پایەبەرز، پێم بڵێ بزانم چیت لە خەیاڵ‌و مێشکدایە، ئایا بە نیازی ئەم شەڕە شوومە، ئەم جەنگە ترسناکە درێژە بکێشێت، یان دەتەوێ، ئاشتی بخەیتە نێوان هەردوو دەستەکەوە؟"

زیوسی، هەورەوان بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"ڕۆڵەکەم، بۆچی ئەو پرسیارە لە من دەکەی؟ تۆ بەخۆت نەخشەی ئەوەت نەکێشا کە ئودیسیوس بگەڕێتەوە بۆ ئیتاکاو تۆڵە لە دژمنەکانی بسێنیٚ؟ بڕۆ بە کەیفی دڵی خۆت بکە. بەڵام بەڕای من باشتر وایە، مادامێکی ئودیسیوسی ئەسڵزادە تۆڵەی خۆی لە خوازگارەکان سەندووەتەوە، کارێکی وەها بکە هەردوو لایان سوێندی گەورە بخۆن و پەیمانێك ببەستن،و ئودیسیوس فەرمانڕەوا بێت! ئێمەش لەلای خۆمانەوە یادی کوڕو برا کوژراوەکانیان لە دڵیان دەردەکەین. با وەکو جاری جاران خۆشەویستی و دۆستایەتی و تەبایی بکەوێتە بەینی خەڵکی شارەوەو بە خۆشی و دەوڵەمەندی و ئاشتی بژین و ڕەوایی و ئاوەدانی ڕەونەق پەیدا بکات و برەو بسەنیٚ!"

ئەتینا خواخوای قسەیەکی ئاوها بوو، بۆیە بەوپەڕی جۆش و خرۆشەوە هەستا، وبەهەشتاو لە لوتکە بەرزەکانی ئولەمپەوە داگەڕا.

## ئودیسیوس بەرەنگاری دژمنەکانی دەبێتەوە

دوای ئەوەی ئودیسیوس و کەسەکانی لە نانخواردن بوونەوەو کفت و کۆی دڵیان لە خواردنی بەلەزەت دامرکاندەوە، ئودیسیوسی ڕەسەن زادە، نموونەی سەبروحەسەڵەو بەردەباری، ڕوویکردە جماعەتەکەی و گوتی:

"یەکێکتان بڕوا تەماشایەك بکات بزانیٚ ئاخۆ دژمن نزیك بوونەتەوە یان نا."

یەکێك لە کوڕەکانی دولیوس، دەمو دەست، وەکو ئودیسیوس گوتبووی، لە ژوور وەدەرکەوت. لەبەرماڵەکەدا وەستا. هەڵیڕوانی، سەیری کرد دژمن نزیك دەبنەوە. بە پەلە وەژوورکەوت و بە ئودیسیوسی گوت: "وا دێن، زۆر نزیك بوونەتەوە، خێراکەن با دەست بدەینە چەك."

هەرکە گوێیان لەو قسەیە بوو، هەموو بەپەلە هەستان، جەنگەوزاریان لە خۆدا، ئامادەو تەیار بوون. ژمارەیان دە کەس بوو: ئودیسیوس و هەر سیٚ هاوڕێکەی، لەگەڵ هەر شەش کوڕەکەی دولیوسدا. لایرتیس ودولیوس-ش، ئەو دوو جەنگاوەرە سەر سپییە، لە ناچاریدا، چەکیان لە خۆدا، پاش ئەوەی تەیار بوون، سەراپایان لە چەکدا بریقەی دەهات دەرگایان کردەوە، لە ژوور وەدەرکەوتن، وکەوتنە ڕیٚ: ئودیسیوس لە پێشیانەوە ڕێی دەکرد.

## تیلیماخۆس بەڵێن بە بابی دەدا کە کۆ لە هیچ نەکاتەوە

ئەوسا ئەتینا، کیژی زیوس، بە دەنگ و ڕەنگی مینتورەوە خۆی نیشان دان. ئودیسیوسی بەردەبارو نموونەی مرۆڤی بەسەبرو حەوسەڵە بەدیتنی زۆر خۆشحاڵ بوو، یەکسەر ڕوویکردە تیلیماخۆسی کوڕی وگوتی:

"ئەی تیلیماخۆس قسەیەکت پێدەڵێم، بیکە بەئاڵقەو لە گوێی بکە. ئێستا کە بە خۆت هاتویتە مەیدانی شەڕ، چاك بزانە شەڕوشەڕگە تاقیگەیە، ئازایەتی و ئازایان لەوێدا دەردەکەون. نەخەڵەتابی شەرمەزاری بەسەر ماڵباتی باب و باپیرانتدا بێنی، چونکە ئێمە تا ئەمڕۆ، لە سەرانسەری دنیادا، لە شەڕو نەبەردانددا، لە ئازایەتی و بوێریدا بیٚ هەڤڕك و ئەنگوست نما بووین".

تیلیماخۆسی فامیدە بەرسڤی بابی دایەوە:

"خـەمت نـەبێ بـابی ئـازیزم، کەسـێ نـەمرێ، بـە چـاوی خـۆت دەمبـینی کـە چـتۆ گـەڕناس و شەڕڤانێکم. شەرت بێ بە شەرتی پیاوان، کە شەرمەزاری بەسەر ماڵباتە ڕەسەنەکەتدا نەهێنم"
لایرتیس کە گوێی لەو قسانەی تیلیماخۆس بوو، لە خۆشیاندا هاواری کرد: "ئەی خواوەندانی میهرەبان، لێتـان بـەزیاد بێ کـە ئـەم ڕۆژەتـان بـە نسیبی مـن کـرد. ئـەمڕۆ ڕۆژی بەختـەوەری منـە، بەڕاستی شادم کە دەبینم کوڕوکوڕەزاکەم، لەسەر ئازایەتی و بوێری ململانێیانە".

## ئەتینا دەردەکەوێ و ئودیسیوس هێرش دەباتە سەر دژمنەکانی

لەو کاتەدا، ئەتینا، خوابانۆی چاوگەش لێی نزیک بووەوەو گوتی:
"ئەی کوڕی ئارکیسیوس، ئەی لە هەموو دۆستەکانم ئازیزتر، نوێـژێ بۆ کیژەکەی زیوس، بۆ ئەتینا، خوابانۆی چاوگەش بکەو ئەوسا نیشانە بگرەوەو ڕمە درێژوکوشندەکەت بهاوێژە."
لایرتیس، بەو قسانەی ئەتینا. جۆش وخرۆش و تین وتاوێکی تازەی کەوتە بەر، ئەوسا نوێژێکی بـەدڵ و بـەگیان و ڕاسـتگۆیانەی بـۆ کیژەکـەی زیوسـی مـەزن کـرد، نێـزە درێژەکـەی بـەرزکردەوە، نیشـانەی گرتـەوەو تـا هێـز لەبازوویـدا بـوو هاویشـتی، ڕێـك بـەر سـەری یـوپیتیس کـەوت، کڵاوخودەکەی کە گۆناپۆشی برونزی پێوە بوو، دادی نەدا. نێزەکەی گل نەدایەوە، پیرە نێزە دیواودەر سەری کونکرد! یوپیتیس کـەوت، سپەروجەنگەوزارەکانی کردیان بە تـەقوهوڕ. ئەوسا ئودیسیوس و کوڕە دلێرو سـەرفرازەکەی وەکو پلینگ پـەلاماری شـەڕڤانەکانی ڕیـزی پێشـەوەیان دا. بـە شمشـێری دوو دەم و نێـزەی نـووك تیـژ تێیـان کـەوتن. خـۆ ئەگـەر ئـەتینا کیـژی زیوسـی سپەردار، فریـا نەکـەوتباو بـە هاوارێـك هـەموویانی لـە شـەڕ ڕانـەگرتبا، لـەوە بـوو ئودیسـیوس و جماعەتەکـەی، هـەر هـەموویان بکـوژن و شـتاقیان جـارێکی دی بـۆ مـاڵی خـۆ نەگەڕێنـەوە. بـەڵام ئەتینا لە نەعرەتەی دا:
"هۆ خەڵکی ئیتاك، بە پەلە ئەم شەڕە ترسناکە رابگرن، لـەوەی پتر خوێن مەڕێژن، خێرا لێکدی جیا بنەوەو بڵاوەی لێبکەن، هەڕن بۆ خۆ بسوڵحێن و ڕێك بکەون"

## ئاشتی بەرقەرار دەبێت

کە گوێیان لـەو نەعرەتەیە بوو، هـەموو لـە ترسـاندا ڕەنگیـان زەرد هەڵگـەرا، لاقیـان سسـت بـوو، چەکەکانیان لە دەست کەوت. نەعرەتەکەی خوابانۆ هێندە ترسناك بوو کە دژمنانی ئودیسیوس، هەموو بـەرەو شـار پێیـان وەغارێوەنـا، هـەی لـەوەی زوو بگاتـەوەو گیـانی خـۆی ڕزگـار بکـات. لـەم کاتـەدا ئودیسیوسـی ئەسـڵزادە، نموونـەی سەبروحەوسـەڵە، گـوڕی بەسـتەوەو لـە نەعرەتەیـەکی سامناکی داو هەڵۆ ئاسا بۆیان داکشاو پەلاماری دان.
بـەڵام کوڕەکـەی کرونـوس، بەپەلـە چـەخماخەیەکی هاویشـت و لـە بـەردەم خوابـانۆی چـاوگەش، ئەتینادا خستییەوە. ئەوسا، ئەتینای چاوگەش، ڕووی کردە ئودیسیوس و گوتی:
"ئەی کوڕە ڕەسەن وخانەدانەکەی لایرتیس، ئەی ئودیسیوسی فامـاو سـالۆرو چارەساز، دەست لەم شەڕە سەخت و قورسە هەڵگرە، نەبادا زیوس-ی دەنگ دلێر، کوڕی کرونوس لێت بچێت بە قیناو غەوری غەزەبت بکات".

ئودیسیوس، له ناخی دڵەوه بەو قسانەی ئەتینا خۆشحاڵ بوو، بۆیه یەکسەرو بیّ چەندوچوون به گوێی کرد. پاشان به سەرپەرشتی ئەتینا، کیژی زیوسی سپەردار، که به ڕەنگ‌ودەنگ، شێوەو هەیئەتی مەنتوری لەخۆ گرتبوو پەیمانی ئاشتی هەتا هەتایی و یەکجارەکی له نێوان هەردوو لایەنی شەڕو کوشتارەکەدا بەسترا.

***

## پەراوێز:

*- ئارکیسیوس:

بابی لایرتیسه.

*- سیلن، سیلینی:

هیرمیس له ئەشکەوتێك دا، له چیای سیلینی له دایك بووه، بۆیه هەندێجار پێی گوتراوه سیلینیوس یان هیرمیسی سیلینی.

*- ئەخیل:

کوڕی شا پیلیوسه، یەکەم قارەمانی شەری تەروادە بوو

*- پاتروکلوس:

کوڕی مینویتیوسه، هێشتا منداڵ بوو، له نەزانسته کوڕەکەی ئەمینادامامسی کوشت و ناچار لوکریسی بەجێهێشت و رۆیی بۆ پیلیوس له فیتا. لەوێ لەگەڵ ئەخیل دا گەوره بوو، دۆستایەتیەکی راستەقینەی نموونەییان له بەینا چێبوو.

*- ئەنتیلوخوس:

کوڕی نەستوره. توانی به هۆی ئازایەتی و بوێری و زیرەکی و قۆزی خۆی، له شەڕی تەروادەدا، شۆرەت و ناوبانگێکی فره پەیدا بکات.

*- ئەجاکس:

کوڕی شاتیلامون، شای سلامیسه، یەکێك بوو له فەرماندەکانی گریك که بەشداری شەڕی تەروادەی کرد. له ئازایەتی وناوبانگدا پلەیەك له دوای ئەخیلەوه بوو. له ئازایەتیدا نموونه بوو.

*- تیتیس:

خوابانۆی دەریایه. هیرا بەخێوی کرد بوو. ئەنجام شووی به پیلیوس که له تیرەی بەشەر بوو، کرد، و ئەخیلی لێی بوو. واته دایکی ئەخیله.

*- تینداروس:

کوڕی ئوبالوس و گورگوفونه. ئوبالوس پاشای ئەسپارته بوو. پاش مردنی ئوبالوس، هیپوکونی کوڕی دەستی بەسەر عەرەشی ئەسپارتەدا گرت، هەردوو براکەی خۆی، ئیکاروس وتینداروسی دەرکرد. تینداروس پەنای بردە بەر تستیوسی پاشای ئەتولیا که له ئەنجامدا لیدا-ی کیژی خۆی دایه. له ئەنجامدا تینداروس توانی به یارمەتی هەرقل عەرشی ئەسپارته وەربگرێتەوەو کۆمەڵێك منداڵی له لیدا بوو که یەکێکیان کلوتمینیسترایه.

*- ئەلیپاس:

واتە گەڕان یان وڕێنە کە لێرەدا ئاماژەیە بۆ ئاوارەیی و دەربەدەری و مەینەتیەکانی ئودیسیوس.

*- ئەفیداس:

واتە بێ بەزەیی، نا دلۆڤان

*- پولیپمیون:

دەوڵەمەند، خاوەن موڵکی زۆر

*- ئیپریتوس:

واتە هەوڵ و تەقەلاو تێکۆشان و خەبتین و کۆڵ نەدان، دیارە ئەمە ئاماژەیە بۆ مانای ناوی (ئودیسیوس)= (پیاوی توڕەیی و تەنگانە).

## تێبینی:

سەعات نۆو نیوی سەر لە بەیانی رۆژی چوارشەممەی رێکەوتی ١٥/١٢/٢٠١٠، لە شاری سلێمانی، گەڕەکی رزگاری، لە ماڵی خۆم، لە پاچڤەی ئەم داستانە بوومەوە.

ح.ع

# واتا نامه

## ئــ

ئاشق:بەوکەسانە دەڵێن
کەخۆیان بۆ بەیتوبەیتخوانی
وداستانبێژیتەرخان دەکەن و
بە گوندان ومەجلیسانەوە
دەگەرێنوداستان وبەیت و
بەندان بە تار ژەنینەوە دەگێرنەوە.
ئاپۆرا:قەرەباڵغی،کۆمەڵە خەڵك،حەشامات.
ئاریشە:کێشەو ئاستەنگ
ئاورگە:وەجاخ،کوانو،ئاگردان
ئاریشە:کێشەو ئاستەنگ
ئاژۆتن:لێخورین
ئاخ:خاك
ئافتاوە:مەسینە
ئاسیو:زیان،زەرەر،بەلاَ،ئازار
ئاوەز:ئەقڵ
ئامباز:دەست لە ملان
ئاوزینگ:گیانەڵلاَ،سەرەمەرگ،ئاویلکە
ئاویلکە:دوادەمی مەرگ،ئاوزینگ
ئاکنجی:نیشتەجێ
ئاغـەڵ:گـەوڕ،جێی داکردنـی مـەڕو بـزن لـە دەمـی سەرمادا
ئامان:دەفروقاپ،ئیربار،قاپوقاچاغ
ئال:لا
ئەنگۆ:ئێوە
ئەستەم:زەحمەت
ئەزبەنی:قوربان،گەورەم
ئەرخایەن:دڵنیا
ئەمەك:وەفا
ئەهریمەن:شەیتان،دێو
ئەفسوون:سیحر،جادوو
ئەوك:قوڕگ،گەروو
ئۆردوو:لەشکر،سوپا.لەشکرگە
ئۆین:فێڵ،مەکرو حیلە
ئیلاقە کردن:سواربوون

## ب

باسریشك:بەفرو باران وبا پێکەوە
بادە:شەراب،مەی
بادیە:کاسەی چێوین
باشار:خۆراگرتن،دەربردن
بانەگر:شەێنیٚ با نەیگرێتەوە
بـانگڕەس:شـەێنیٚ دەنـگ بیگـایٚ،مـەودای بڕکردنـی دەنگ
بادی هەوا:لووتبەرز، بەفیزو دەعیە
باگر:شوێنیٚ با بیگرێتەوە
بەهرە:بەش،سوود
بژوێن:زەمەند،زەوی پڕ گیاو لەوەڕ
بین بێزار: زۆر بێزار،هەزارجار بێزار
بەردهاوێژ:مەودای بڕکردنی هاویشتنی بەرد
بوری:تێپەڕی
بەردەبار:پیاوی زاناو بە تەگبیر
بزڤڕێتەوە:بگەرێتەوە
بەرسڤ:وەلاَم
بزر:ون،نەدیار،پێوار،بەرزە
بفامن: تێبگەن
بویەر: رووداو
بەڵەد:شارەزا
بەزر: تۆو،نوتفە
بەدخوا:دڵپیس،لە چاکە بەدوور
بەرخوردار:کامڕەوا،مراد حاسڵ
بـۆدڕن:بـۆنی تونـدی ماسـی وتەگـە،بۆنی ئارەقـەی بنهەنگڵ وقاچ
بڕکەبڕکە:کۆمەڵ کۆمەڵ،بڕبڕ
بێنەزیر:بیٚ هاوتا،بێوێنە
بەوئاوایە:بەو شێوەیە
بەلەنگاز:بێنەوا،هەژار،کڵۆڵ
بێمروەت:بیٚ ئینساف
بەزم:سووروئاهەنگی نانخواردن
بەگەن کردن:پەسندکردن

بەتڵ: بەش

## پ

پاچڤە:وەرگێڕان

پارچە:قوماش

پەروەرشتگە:شوێنی پەروەردەکردن

پەز:مێگەلە مەڕوبزن

پەرتەوازە:پەرەوازە،ئاوارە

پەرجو:مویزات

پەزیرایی: پێشوازی

پەیك:تەتەر

پوازنـاو:دارێکـە وەبـەر شـتی قورسـی دەدەن بـۆ بڵندکردنی

پشکۆ:پەنگر،سکڵ،پەرەنگ،پۆلو

پێشخزمەت:نۆکەری بەردەستان

پیّ حەسیان: هەست پێکردن

پروش: اوی کەم بین و نەخۆش

پێتاو: پێپۆش،کاڵەوزەنگاڵ،پاتاوە

پێڕ:دەستە،تاقم

پێل: شەپۆل

پیو: چەورایی ناوزگ،پیڤ

## ت

تاسەمەند:ئارەزوومەند،تامەزرۆ

تاین:ناوبراو،ناڤبری

تـالان: پێوانەیـەکی کـۆنی یۆنانییە،دەکاتـە نزیکـەی ٢٦کلغم

تابان: پرشنگدار

تاشت:نانی بەانی،بەرقلیان

تاقەتکردن:هەڵگرتن، شاردنەوە

تەژی کردن: پڕکردن

تەختە خەو:تەختی لەسەر نووستن

تەمتومان: مژ،دومان

تەشەر: تانە،پەلارو توانج

تەڕزمان: تەڕدەم،زارشیرینی قسە زان

تەڕن: فێڵ

تەڕفام: بە زەوق

تەمەشاڤان:بینەر،تەمەشاکەر

تەژە: کەتەی ناقۆلاّ

تەڵفیزی: گاڵتەپێکردن

تەوازۆ:تەوازی،عوزرخوایی

توێشو: نان وزادی ڕێگە

توێ توێ: لەت لەت

تولەك: تازە لاوی بیّ موو

تونگە: دەفری مل باریك بۆ ترو،گۆزە،جەڕە،تونگ

تووك:دوعای شەڕ،نزای خراپ،نەفرین

تێر: بەش

تیسکن: توکنی نەرم

## ج

جەنگەوزار: ئەسپابی شەڕ

جەریمە:سزا،غەرامە

جەرباندن: تاقیکرنەوە

جۆلاّتەنە: داوی جاڵجاڵۆکە

جۆشانە: دەرمانی لە ناو ئاواکولاّو

جۆڕك: تورەکە

جیاز: کەلوپەلی بووك

## چ

چاو لە میلدان: چاو دەرهێنان

چاو هەتەرکردن:بڕکردنی بینینی چاو

چوارنکال: هەرچوارلا

چرین:وتن(بۆ گۆرانی)

چوغورد:جەنگەڵ وبێشەی چڕ

چەنگ: ئامێرێکی مۆزیکە

چێڵ: مانگا

## خ

خانە خویّ: خاوەنی ماّی بە میوان

خاپینۆك: فریبۆك، خەڵەتێنەر

خانەزا: نۆکەر کە لە ماڵی ئاغەکەی لە دایك بوو بیّ

خازۆك: خوازەلۆك

خەرار: جەوالّ

خەڵك پەسند: جەماوەری، مایەی پەسندی خەڵکی

خەرگـە: خێـوەتی زۆر گـەورەی پیـاوی گەورە،لـە جیاتی دیوەخان وبارەگا

خەڵقەندە: گووراو، زیرۆخ

خڕ: هەموو،گشت

خوابانۆ: ئالیهە،مێچکە خواوەند

خورت: بەهێزو توانا

خۆشبەز: ئەسپی تیژڕۆ

خودان: خاوەن

خۆڕسك: سروشتی، خۆی روابێت

خۆڵە کەوە:خۆڵەمێش، مشكی

خشت:تەواو، بێ کەم وزیاد

خوناو: خوناڤ،شەونم، ئاونگ

خوانسالار:بەرپرسی خوان وسفرە، سفرەچی

خشیك: خشکۆك،دەلال،جوانکیلە،قەشەنگ

خیزەڵان: شوێنێ کە زیخ وچەوی زۆرە

خێفزانی: غەیبزانی

## د

دانامرێتەوە: ناکوژێتەوە

دغمە: مۆر، تەمغە

دالآش: سیســـــارکە کەچـــــەڵە،داڵە کەرخۆرە،داڵ،خەرتل

داخافت: دەدوا

داپشکنین: قسە لێدەرهێنان

داربناڤ: داربناو،زوان مەلیچك

دەڵەچەیی: رووبینی،ریابازی،کلکە سووتێ

دەمە قاڵە: شەرە دەم

دەڤەر:ئاقار،شوێن، جێ

دەنگۆ: بانگەشە،مقۆمقۆ

دەف: جەم،نك،کن،لا

دەم بۆڵە:دەمەقاڵێ،شەڕەدەم

دەماغە: لوتە،لوتکە

دژوار:سەخت،ئەستەم،زەحمەت

دڵشێر: بوێرو ئازا

دنەدان:هاندان

دۆتمیر: کیە میر

دکارێت: دەتوانێت

دێرباوەڕ: کەسێ زوو باوەر نەکات

دیلان: شایی، گۆڤەند

## ر

راشکاوی: رێکوڕاست،بێ پەردە،بێ پێچ وپەنا

راز:نهێنی

رابن: هەستن

رادەست: دانە دەستەوە

ران: مێگەل

رامووسی: ماچکرد

رەخشان:تابان،پرشنگدار،درەخشان

رەهەندە: ئاوارە،عەوداڵ ،ماڵ بەکۆڵ

رەهوان: خۆشرەو،خۆشبەز

رەخ: قەراخ،کەنار

رەدا: قەناعەت

رەهاکردن:ئازادکردن،رێگەدان

رمووده: ئالودە،هۆگر

رۆنیشتبوو: دانیشتبوو

رووقایم:گۆساخ،بێ ئەدەب

ڕم: نێزە

روختە: رەختە، قایم، مکوم

روندك: ئەشك، عەسر،فرمێسك

رێژاو: مصب

رێژاڤ: رێژاو،مصب

ڕك: هەورازی سەخت و کووڕ،ڕژد

رکونی:بوغزنی،رق لە سکی

ریشاژۆ: ریشە داکوتان،رەگ داکوتان

ریسك: سەرکێشی،مغامەرە

ریشخەن: گاڵتە پێکردن

## ز

زاگە: شوێنی لە دایکبوون،ولآت، زێد

زات: جورئەت، غیرە

زار: دەم

زاکونی: زەبت ورەبت، رێکوپێکی

زەڕخرێ: کۆیلەی بە پارەکرداو

زورهان: زۆر پی

زۆرەبانی:زۆرانی،زۆرانبازی

زڤرینەوە: گەرانەوە

زرانی: ئەژنۆ، ژنۆ، چۆك

زیونیشان: زیوکفت

زریسك:دارێکی کورتەبالأیە،بەرێکی رەش وسووری ترش دەگریّ،بەکالّی و کولأوی دەخوریّ

زینهار: دەخیل،ئامان،داواکردنی ئەمان و پەنادان

زێرکفت:زێراوکراو،لە ئاوی زێرگیراو

زیوسا: ئەی زیوس

ژنەوت: بیست

## س

سالۆر: ژیر،بە ئاوەز

ساقی: مەیگێڕ

سارەزی: سوزی،سبەی زوو

سەندەلّ: کەوشی لە دار،قاپقاپ،تەقتەقیلە

سەمت: لا،ئالی،رەخ،ئاراستە

سەرڕێژ: پڕ بە رادەیەك كە لەسەری بروات

سەفدڕ: بوێر،نەترس،بەجەرگ، ئازا لە شەڕا

سەراپەردە: خێوەتی گەورە، دیوانی میر

سەولّەجان: گۆچان،گۆچانی پاشایەتی

سەلّت: بێژن

سەلبەند:بەردرێژ، رێگەی بەردتێگیراو،سەنگفەرش

سەرتۆپ: یەکەم، بیّ هاوتا

سەرۆ: ئیلهام

سەوقاتی: دیاریی

ستران: لاوژە، گۆرانی

ستێر: ئەستێرە

سۆزی:سبەی زوو

سۆزدان: پەیمان و بەلّێن دان

سویّ: داخ، سوو، داخ وعەزرەت

سووروبەزم: جەژن و ئاهەنگی نانخواردن

سەنگەسار: بەردباران

سیرەمۆزە: سوورەمۆزە، جۆریّ مێشە كە بەرەشە ولأخەوەدەدات

سیقالکراو: ساف ولووس کرو،مشت و مالّدراو

سیخوار: زوقوم،خوسار،سیخار

## ش

شاخ: قۆچ

شاخوڕ:کەلّەکە بەرد،تەپۆلکەی بەردین

شەڕاشۆ: شەڕانی،جنگن،جینگن

شەوەکی: شەبەقی،بەرەبەیان

شەڤشەڤۆك:شەمشەمەکۆرە

شەرگە: بەرەی شەڕ

شەرت: کرێی رەنجبەرو شوان و گاوان

شەڤنەم: شەونم،ئاونگ

شەبەنگ: تاپۆ،شەبەح

شەڕڤان: جەنگاوەر

شنگ: تاقەت

شتاقیان: هیچیان

شکەفت: ئەشکەوت، دەخمە

شێردلّ: بە جەرگ،زۆر ئازا

شیڤ: شێو،شام، خواردنی ئێواریّ

شیرەتکار: راوێژکار

## غ

غافلّکوژ:کوشتنی نهێنی و لە ناکاو

غەوارە: غەریب، بێگانە

غەلیز: خەست

غەڕایی: غروور،لەخۆبایی بوون

غوڕاب: خەوی قورس، شیریە خەو

## ف

فاما:فامیدە،فامی،زۆر زیرەك،تێگەییشتوو

فالّبین:کتێبگرەوە،فالّچی،پێشگۆ،نجومگەر

فەرزانە: فرەزان،ئاقل و بە ئاوەز،

فەخرفرۆش:فیشالّبازی خۆهەلّکێش

فراڤین: نیوەرۆژە، نانی نیوەرۆ

فزونکاری: دەستدرێژی، تەعەدا

ڤریّ کردن: بەرێکردن

ڤەبیّ: بکرێتەوە

## ق

قاتر: هێستر

قەڵغان:مەتاڵ،سپەر،
قەڕابە: دەفری گەورەی ئارەق و شەراب
قەوغا: قەرەباڵغی
قەرەواش: کارەکەر،کڵفەتی ماڵێ
قەرەشە: ناخۆشی و شەڕ
قەتاندن: بەسەربردن
قرێر: بریار،قەرار
قڕکردن:کوشتن و لە نێوبردن
قۆرەدەماغ: بەفیزو دەعیە
قوڵکە: چاڵ
قۆچــاغ: چــالاك،ەش ســووك، خێــرا لــە ڕێکردندا
قولاخ: شوێنەوار،نیشانە، بەڵگە

ك

کارکەر:بە ئافرەتی خزمەتکار دەگوترێ
کاڵفام: بێ ئەقڵ،ساویلکە
کەرگەز:سیسارکە کەچەڵە،دالاش،کەرکەس
کەزی: پرچ،زڵف
کەپو: لووت،دفن
کەسەردار:داخدار،خەفەتبار
کـــەنیز: کەنیزەك،قـــەرەواش،ژنـــی بـــە پارەکردراو
کەشکەلان:کاکێشان،بەرزایی ئاسمان
کەنـدوو:کـوار،دەفرێکی گـەورەی گڵێنـە بـۆ دەغڵ وئارد
کەڤر: بەرد
کەودەن:گەوج
کرکوژ: ژاڵە
کــۆز: ئاغــەڵی بــەرخ و کارژۆلان،تامــانی جێگەی بەرخ و کار
کەندەکاری:کەندنی نەخش لە دار
کەوی: ماڵی

کڵاوخود: کڵاوی ئاسنینی شەڕڤانان
کڵاوکردنە سەر: خاپاندن
کڵفەت: کارەکەر
کندڕ: حەبل، پەت
کسۆك: سەگ
کوت ومت: دەقاودەق
کۆجاڕ:کۆسار،چیای زۆر
کوانگــــــــــــــــــــــــــــــــە:
کوانو،کوانگ،وەجاخ،ئاگردان،ئاورگە
کونجکاوی:فزوڵی،لاپرەسەنی
کوشتنەوە: سەربڕین
کۆنەکردنەوە:سڵ نەکردنەوە

گ

گاوەخان:بەشی رۆژەجووتێ لە زەوی
گاوس:مەشکەی زۆر گەورە،پێستی چێڵ کە دەکرێ بە مەشکە
گالیسکە:عەرەبانە،فایتوون
گازکردن: بانگ کردن
گەڵۆز:ناوگەڵ
گەوارا: خۆش، بەلەزەت
گەنگەشە: مناەشە،مشتومڕ
گژەبا:بای توندی پایزی
گرانقەدر:بەرێز،هەژی،سەنگین
گۆساخ: رووقایم،بێ شەرم،بێ ئەدەب
گۆڕین:ناڤبری،ناوبراو
گوێپچڕ گوێپچڕ: بە زەحمەت
گۆهداران:گوێگران
گڵێنە:دەفری لە سواڵەت
گێسوو: پرچ، کەزی

ل

لاپرەسەنی:فزوڵی

لەزگ بوو:نزیك بوو
لەزی: خێرایی
لەنگــەرگا: شــوێنی وەســتانی کەشــتی و پاپۆڕان
لەگینە: لە گوینە،لەوانەیە
لەبان:گیای حەسیر لێدروستکردن
لە عۆدەگرت: لە ئەستۆگرت
لمەلآن: شەێنیێ کە لمی زۆر بێت
لێبڕا: بڕیاری دا
لۆمە:سەرزەنشت،سەرکۆنە
لێڕ: بێشە،جەنگەڵ،دارستان
لێ: بەلاّم
لینگەی نەبوو: هاوتای نەبوو،تاکی نەبوو

م
ماڵخۆ:خاوەن ماڵ، خانەخوێ
مالۆس:بەرازی مێچکە.یەکانە:بەرازی نێرە
مەفتەن:وەتەن،نیشتیمان
مەرزوبۆ:ولآت،سەرزەمینی جێگەی ژیان
مەرز:سنوور،کەوشەن
مەرەد: حاڵ
مەتاڵ:سپەر،قەڵغان
مەعلان:لێزان،پسپۆڕ
مەردەمێر: وامێر،پیاوی ئازاو دلآوا
مەنقەل: مقەلی،مەقەلی
مەتە: ئامرازی دارسمین
مز: هەق، کرێ
مشکی:خۆڵەمێش
مشتاخ نانەوە:ترێ لەبەر هەتاو هەڵخستن بۆ وشکبوونەوە
مژ:تەم
مشە:فرە،زۆر
میناکی: وەکو
مێر: پیاو،ئازا لە شەڕا
مینا: شووشە

ن
ناحەز:دژ،نادۆست
ناکامی:نامرادی
ناڤبری:نێوبراو
ناخەلەسێت:رزگار نابێت
نابەکار:زاڵم، بەدکار
ناچیز:خوێڕی،ناجسن
نەیچەزار:قامیشەلآن
نەڕەڤی: رای نەکرد،هەڵنەهات،نەڕۆیی
نەیدەحوباند:خۆشی نەدەویست
نەترە:ورە
نموود: دیمەن،قەلآفات
نشیمەن:نیشتمان،جێی دانیشتن
نکال:لا، تەرەف
نك: جەم،لا،کن،دەف
نوقلآنە:نوخشانەی باش
نۆشخواری: نۆش،نەخب
نهو:ئیستا
نێرە حەیتە:زەبەلاح و تەژەی ناقۆلآ
نیهاد پیس:دڵ ودەروون پیس

و
وان: ئەوان
وادارکردن:ناچارکرن
واریقات:بەسەرهات،رووداو
وجاخ:کوانو
وەچاخزادە:رەسەن، خانەدان
وەشێرن: بشارنەوە
وەمێنە: بێنەوە

**ه**

**هاودەست:چەند کەسی شەریك لە کەین وبەیندا**

**هانەسار:سەرچاوەوکانیاوان**

**هەنیە:تەوێڵ،نێوچەوان،توێڵ**

**هەپەی دەنێت:سواری دەبێت(دەیگێت)**

**هەڤسال:هاوتەمەن**

**هاورەزم:هاوسەنگەر،هاورێی جەنگ**

**هەیڤ: مانگ**

**هەردەگێڵ:چۆلگەڕ**

**هەمێز: باوش، ئامێز**

**هەیڤۆك:مانگی یەکشەوە،هیلال**

**هەنگێ: ئەوسا**

**هەنبەر: بەرانبەر**

**هەیئەت: شێوە،بیچم**

**هەڕە:بچۆ،برۆ،هەرۆ**

**هزرین:بیرکرنەوە،تێفکرین**

**هەشتاو: لەز،پەلە،خێرا**

**هەژی:بەرکەتی، شایت**

**هەڤڕکی:ڕکابەری**

**هەقکردن:تۆڵەسەندن**

**هەڵایساو: داگیرساو**

**هەڤخەو:هاوجێ،هاوسەر،شەوباخەڵ**

**هۆڤی: کێوی، وەحشی**

**هۆگانە:خەتی جووت لەمسەر تا ئەوسەر**

**هێڕ: گێژو وڕ**

**هیشك: وشك**

**هیمداد:کۆمەك، هاوکاری**